# دیوانی سالم

## عەبدوڕڕەحمان بەگی صاحێبقڕان



بەرگی یەکەم

ساغکردنەوە و لێکدانەوە
مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس
فاتیح عەبدولکەریم
محەمەدی مەلا کەریم

ئامادەکردن
سدیقساڵح

# ديوانی سالم

## عەبدوڕڕەحمان بەگی صاحێبقڕان

ساغکردنەوە و لێکدانەوە

مەلا عەبدولکەریمی مودەڕریس

فاتیح عەبدولکەریم

محەمەدی مەلا کەریم

ئامادەکردن

سدیق ساڵح

## بنکەی ژین


**سەرپەرشتی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق ساڵح**

زنجیرە: ١٧٤

کتێب: دیوانی سالم، عەبدوڕڕەحمان بەگی صاحێبقڕان

ساغکردنەوە و لێکدانەوە: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، فاتیح عەبدولکەریم و محەمەدی مەلا کەریم

ئامادەکردن: سدیق ساڵح

بەرگ: یەکەم

پیتچنین: سیروان خەلیل

لەقاڵبدانی ناوەڕۆك: لاس

ئامادەکردنی کۆمپیووتەریی دەستنووس: ساڵح بێچار

لەقاڵبدانی دەستنووس: یادگار ئەوڕەحمان

ڕووبەرگ: قادر میرخان

خەتی ڕووبەرگ: ئەحمەد سەعید

ژمارەی سپاردن: ١٨٥٤ی ساڵی ٢٠١٥ی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان





## بنکەی ژین

**بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی**

عیراق: هەرێمی کوردستان، سلێمانی: شەقامی ١١ پیرەمەگروون، گەڕەکی ١٠٧ بەرانان، تەلاری ژین- تەنیشتی مزگەوتی شێخ فەرید

تەلەفۆن: ١- ٠٥٣٣٣٠١٢٩٢ ئاسیا: ٠٧٧٠١٤٨٤٦٣٣ یان ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤ کۆرەك: ٠٧٥٠١١٢٨٣٠٩ ژ. سندوقی پۆست: ١٤ بەختیاری

پێگە: www.binkeyjin.com ئاونیشانی ئەلکترۆنی: info@binkeyjin.com

**بەڕێز خاتوو هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەد هاوکاریی لەچاپدانی ئەم کتێبەی کردووە**

## بەسەرهاتی ئەم (دیوانی سالم)ـە

بڵاوبوونەوەی (دیوانی سالم) -هەرچۆنێك بێ- درێژەی کێشا و لە (٢٠٠٩) بەدوایشەوە کە زانراوە ئامادە دەکرێ بۆ چاپ، خەڵکێکی زۆری ئێرە و ئەوێی کوردستان بە پەرۆشەوە بە پێوشوێنی هەواڵیدا چوون و لێیان پرسیوەتەوە، تا بزانن کەی بڵاودەبێتەوە. چەند کتێبخانە و دەزگایەکی چاپی ئێرە و ڕۆژهەڵاتیش ئامادەگییان نیشان داوە بۆ لەچاپدانی. هەمووان جێی سوپاس و پێزانینن. لەبەرئەوە پێویستی دەبینم سەرپۆتێکی بەسەرهاتی ئەم دیوانە بۆ مێژوو بنووسمەوە.

ڕەحمەتی کاکە فاتیحم لە پێشەکیی (دیوانی نالی، ل٥-٦)دا نووسیویە:

((دەمێك بوو خولیای لێکۆڵینەوەی دیوانی "نالی" و "سالم"م لە کەللەدا بوو. بەدڵ حەزم ئەکرد بەرهەمی ئەم شاعیرە هەڵکەوتووانە بە شێوەیەکی پاك و پوختە و ڕێکخراو بخرێتە بەردەستی خوێندەوارانی بەرێزی کورد و ڕۆشنبیرانی تازەپێگەیشتووی ئەم بەرەیە زیاتر لە کەلەپووری پڕشانازیی ڕابوردوومان بزانن. تا لەبەر ڕووناکیی ڕابوردوودا و بە سوودوەرگرتن لە ڕابوردوو، لە دارشتن و نووسینی تازەدا سەرکەوتووتر بن و لە هەنگاونانیاندا بەرەو ئەدەبی پێشکەوتووی دوارۆژ جێپێیان پتەوتر بێ. دیارە سامانی هەر نەتەوەیەك لە هەر سووچێکەوە بیگری، بریتییە لە کەلەپووری ڕابوردوو و دەسمایەی ئەمڕۆ و ڕوونی ئاسۆی بەرەو دوارۆژی. پشت گوێخستنی هەر یەك لەم سیانە مانای پشت گوێخستنی ڕێبازی زانیارییە و لە ڕێهەڵەکردن و سەرەسوورە بەولاوە، هیچی تیا نابێ.

چەند ساڵێك لەمەوبەر ڕۆژێکیان لەگەڵ باوکم باسی کەلەپووری ئەدەبی کوردمان ئەکرد، تا باس هاتە سەر باسی نالی و سالم و کوردی و ئەو وەچەیەی شاعیرانی کورد. پێشنیارم لا کرد کە خەریکی دیوانەکەی نالی بێ. باوکم لەگەڵ ئەوەشدا کە وەختی ئەوەندە نەبوو و زیاتر بە دەرزوتنەوەی فەقێکانەوە خەریك بوو، گفتی دامێ. زۆری نەبرد لەسەر بناخەی نوسخە چاپکراوەکان دەستی بەکار کرد و شەرحێکی لەسەر کۆکراوەی هەموو نوسخەکان نووسی، دارشتنەوە و ڕێکخستنیشی خستە ئەستۆی من)).

بەو پێیە کە (دیوانی نالی) لە ساڵی ١٩٧٦دا لەچاپ دراوە، دەبێ ئەم پڕۆژەیە لە کۆتایی ساڵانی شەست، یا سەرەتای ساڵانی حەفتاوە، ئەووەڵجار بە دیوانی نالی دەستی پێکردبێ. پاشان باوکم هاتووەتە سەر (دیوانی سالم) و دوو دەفتەری گەورەی لە شیعرەکانی و لێکدانەوەیان نووسیوەتەوە؛ یەکەمیان ٢٠٠ لاپەڕەیە و ١٤ پەڕەی زیادی تێهەڵکێش کردووە، دووەمیان ٣٠٠ لاپەڕەیە و ١٧ پەڕەی گەورە و بچووکیتری -بە هەمان شێوە- تێهەڵکێشی تێدایە. لە لاپەڕە (٢١٠)ی دەفتەری یەکەمدا نووسیویە:

((الحمد لله لە عەصری رۆژی دووشەممەی ئاخری ذیلقەعدەی هەزار و سێصەد و هەشتاویەکی هیجریی موصادیفی ۱۹۷۲/۱/۱۷ی میلادی رزگار بووم لە نووسینەوەی شەرحی دیوانی سالم لە مەدرەسەی پیری گەیلانیدا لە بەغدا– عەبدولکەریم ئەلمودەرریس [ئیمزا])).

واتە باوکم لە ۱۹۷۲/۱/۱۷دا لە لێکدانەوەی دیوانەکە بووەتەوە و خۆیشی ئاماژەی بۆ نەکردووە کە کاری لەسەر چ نوسخەیەك کردووە، بەڵام پاش بەراوردکردن و پێداچوونەوەی نوسخەکان، دەرکەوت شیعرەکانی نوسخە لەچاپدراوەکەی (کوردی – مەریوانی)ی نووسیوەتەوە و لێكداوەتەوە. پاشان کە ساڵی ۱۹۸٤ وێنەی دوو دەستنووسەکەی (بەرلین) –بە سپاسەوە– لە رێی بەرێز "فەریاد فازیل عومەر"ەوە گەیشتووەتە دەستی، لەتەك وێنەی شیعرەکانی "سالم" بە دەستخەتی نەجمەدین مەلا، ئەو شیعرانە کە لە چاپەکەدا نەبوون، لە پاشماوەی دەفتەری یەکەم و دەفتەری دووەمدا نووسیونیەوە و لێکیداونەتەوە. ئەمە لە کاتێکدا شیعرەکانی هەجووی دەست لێ نەداوە. نازانرێ کەی ئەم بەشی دووەمەی کارەکەی تەواو کردووە و خۆیشی هیچ مێژوویەکی وەك دەفتەری یەکەمی لە دەفتەری دووەم نەداوە.

پاش ئەوەی کارەکەی باوکم کەوتووەتە لای کاکە فاتیحم، دیارە پاش لێوردبوونەوە، نوسخەی دەستنووسی یەکەمی بەرلینی، کە بە تایبەتی بۆ سالم نووسراوەتەوە، کردووە بە نوسخەی سەرەکی و بنچینەیی و نوسخەکانی هەردوو چاپی (کوردی – مەریوانی) و "گیوی موکریانی" و نەجمەدین مەلا و دەستنووسی دووەمی بەرلینی لەگەڵ بەراورد کردووە و جیاوازییەکانی دەستنیشان کردووە و دەقی شیعرەکانی رێكخستووەتەوە و دووبارە لە بەر رۆشنایی دەستنووسەکەی باوکمدا فراوانتر و وردتر شەرحی کردوونەتەوە. لەپاڵ ئەوەدا، فەرهەنگۆکێکی (۱۳٦۰) وشەیی بۆ برێکی زاراوە و وشەی شیعرەکان ساز کردووە و لەسەر فیشە رێکیخستوون. بەداخەوە، فریانەکەوتووە نە شیعرەکانی هەردوو پیتی (هـ) و (ی) لێكبداتەوە و نە ئەم فەرهەنگەیش گەورەتر بکا. ئەو چەند شیعر و بەیت و وشانەی پیتەکانیتریشی کە بۆ ساغ نەبوونەتەوە، بەجێیهێشتوون، تا پاشتر بچێتەوە سەریان و چارەسەریان بکا. بەڵام مەرگ مەودای نەدا تەواویان بکا و لە پاشنیوەرۆی پێنجشەممەی رێکەوتی ۱۹۹۱/٥/۱٦دا بە نەخۆشیی دڵ لە بەغدا کۆچی دواییی کرد و پرۆژەکە بە ناتەواوی راگیرا.

دوابەدوای ئەوە، خاتوو "رەعنای مەلا قادری سۆفی محەمەدی بانیخێڵانی"ی هاوسەری کاکەفاتیحم –خودا لەویش خۆش بێ– هەموو دەستنووسی کارەکەی بە نوسخەکانەوە خستە بەردەستم، تا بەندە کاری تێدا بکەم و بە تەواوبوونی بگەیێنم. پێیشی راگەیاندم: کاکەم لە ژیاندا بووە کە پێی وتووە: ئەگەر ساغکردنەوە و لێکدانەوەی شیعرەکانی "سالم"م بەهۆی نەخۆشییەکەیەوە پێ تەواو نەکرا، با حەمەی برام ئەو ئەرکە بگرێتە ئەستۆ و ئەوەی دەمێنێتەوە جێبەجێی بکا. خاتوو

ڕەعنا بە ئاواتەوە بوو، وەك یادگار و سەبووریی مەرگی ناوادەی کاکەم، چاپی دیوانەکە ببینێ، بەڵام بەداخەوە مەرگ ئەو دەرفەتەی لەویش سەند. دەبێ بڵێم: خاتوو ڕەعنا هەمیشە و لە هەموو ڕوویەکەوە پاڵپشتێکی گەورەی کاکەفاتیحم بوو، یادی بەخێر.

ئیتر -ڕاستییەکەی- منیش لەبەر سەرقاڵیم بە پرۆژەیترەوە نەپەرژام بچمەوە سەری و هەروا مایەوە. کە پاش ڕووخانی ڕژێمی بەعسیش بە ماڵەوە هاتمەوە بۆ سلێمانی، ڕۆژی ٢٠٠٩/٤/١٦ کاتێك لەناو کتێبخانەکەمدا خەریکی تاووتوێی کتێبەکانم بووم، ئازار بە پشتم گەیی و خستمی. پەکم کەوت و لە جێدا کەوتم، تێنوتوانی جووڵە و دەروزووورم نەما. پرۆژەی (دیوانی سالم)ەکەیش بە دەستلێنەدراوی مایەوە و پەکی کەوت. کۆتاییی ئەو ساڵە کاك سدیق ساڵح خۆبەخۆ پێشنیای کرد هاوکاریم بکا و ڕۆژانە بێتە لام تا پێکەوە بە گەلاڵەی کارەکەی باوکم و کاکمدا بچینەوە و تەواوی بکەین. ڕازی بووم و ئەوە بوو پتر لە ساڵێك‌ونیو پاش‌نیوەڕوانی زۆربەی ڕۆژەکان دەهاتە ماڵمان و تا درەنگانێکی شەو دەمایەوە، پێکەوە خەریکی دیوانەکە دەبووین.

سەرەتا هاتینە سەر لێکدانەوەی پارچەشیعرەکانی هەردوو پیتی (ه) و (ی) و پاشان بە پارچەشیعرە لێکدراوەکانی هەموو پیتە تەواوکراوەکاندا چووینەوە. دوایی هەر کاك سدیق خۆی جارێکیتر نوسخەکانی لەگەڵ دەقە ئامادەکراوەکە بەراورد کردەوە، تا هەر کەموکورتی و شتێکی بێنەزانراو هەبێ، چارەسەریان بکەین؛ هەم دەقەکانمان بۆ یەکجاری دروستتر نووسییەوە و هەم لێکدانەوەکانمان بەراورد کردەوە و هەر ناتەواوییەك هەبوویێ، چارمان کردەوە. ئەمجا هەر خۆی شەرحی شیعرەکانی سەرلەنوێ و بە شێوازی نووسینی خۆی دارشتەوە، تا یەك‌دەست بێ. بەو شێوەیە توانیمان نوسخەیەکی تا ڕادەیەکی باش چارەسەرکراوی کەم کەموکووڕی ئامادە بکەین. پاشتر دەست کرا بە پیتچنینی شیعرەکان لە (بنکەی ژین)، کە پێی خۆش بوو شەرەفی لەچاپدانی ئەم دیوانەی پێ ببڕێ و هەر کاك سدیق خۆیشی هەڵەبڕیی کردن بۆ دڵنیایی و وردتر و دروستتر بەڕێوەچوونی کارەکە.

ساڵۆنیو - دووساڵێك لەوەبەدوا کە بەهۆی چارەسەری فیزیۆتەراپییەوە باری لەشم باشتر بوو و توانیم بجووڵێم و بچمە سەر مێزی نووسین، بە پێشنیای کاك سدیق قایل بووم کە شیعرەکانی هەر پیتێکم ناو بە ناو بە پیتچنراوی بخاتە بەردەست، تا خۆیشم بە زمان و لێکدانەوەیاندا بچمەوە و هەر هەڵە و چەوت‌وچەوێڵییەك هەبێ و بەسەرماندا تێپەڕیبێ، دیاری بکرێن و ڕاست بکرێنەوە. ئیتر ئەو ماوەیە تا کۆتاییی ٢٠١٤ تێکڕا شەش جار لاپەڕەکانی هەموو دیوانەکە ڕاکێشرانەوە لەسەر کاغەز و هەموو جارێکیش هەڵەکانی -بە زۆری چاپ- لە لایەن کاك سدیقەوە ڕاست کرانەوە و هەر خۆیشی شیعرەکان و لێکدانەوەکانی لەقاڵب دان.

ڕەنگە هۆیەکی دواکەوتنی بڵاوبوونەوەی ئەم دیوانە، ئەوە بێ کە ئەوەتی کەوتووم و لە ماڵەوەم، هەم چاوەکانم کزتر بوون و بە ئاسانی و بەبێ زەرەبین نووسینم بۆ ناخوێنرێتەوە و هەم توانایی کاری بەردەوامم نییە و ماندوو دەبم، بەتایبەتی ئەم ساڵانەی دوایی کە لە ڕۆژێکدا لە یەك یا دوو سەعات زیاتر کارم پێ ناکرێ، ڕۆژی وایش هەبووە هیچم پێ نەکراوە. جگە لەوە، هەر ئەو ماوەیە جاروبار ڕوویان لێ ناوم بۆ پێداچوونەوەی کتێب و نووسینی هێندێ دۆست و ناچار کاتێکم بۆ ئەو مەبەستە تەرخان کردووە. لەپاڵ ئەوەیشدا، جاریوایش بووە بابەتی ڕۆژنامەوانیم بۆ گۆڤار و ڕۆژنامەکان نووسیوە.

دواجار و لە سەرەتای ٢٠١٥دا بڕیارمان دا کۆتایی بە ئامادەکردنی ئەم دیوانە بێنین. بەڵام کاك سدیق پێی باش و پێویست بوو، لەبەر زۆر خایاندنی کارەکە و بۆ دڵنیایی پتر، هەر خۆی سەرجەمی نوسخەکان لەگەڵ دوایندەقی بەردەست بەراورد بکاتەوە. ئەوەیش کرا، بەتایبەتی کە پێشتر –جگە لەو نوسخە ناوبراوانە– نوسخەی "محەممەدصادقی حسەینی" لە ڕێی بەڕێز "صەباح حسەینی"یەوە لەبەردەستدا بوو، هیچ کاری لەسەر نەکرابوو. ئەم دواییەیش نوسخەکانی "حاجی تۆفیقی پیرەمێرد" لە ڕێی خوالێخۆشبوو "دوکتۆر مارف خەزنەدار"ەوە، حاجی مەحموود یاروەیس لە ڕێی بەڕێز "عەلی بەگی جاف"ەوە، مەلا فەتاحی کاگردەڵیی نەورۆڵی و ئەحمەد ئاغا و مەلا عەبدوڵڵای قزڵجی لە ڕێی بەڕێز "محەممەدعەلی قەرەداخی"یەوە، نوسخەی "ڕەفیق سالح" لە ڕێی (بنکەی ژین)ەوە و نوسخەی "نافیع مەزهەر" لە ڕێی بەڕێز "عەبدوڵڵا حەبیبی"یەوە خرانە بەردەست و بەکارهێنران. هەردوو بەرگی (دیوانی کوردی)ی ئامادەکراوی خوالێخۆشبوو "حەمەبۆر مستەفا"یش لەو جێیانەدا کە پێوەندیان بە "سالم"ەوە هەیە، کەڵکیان لێ وەرگیرا.

جێی باسە، سێ ساڵێك زیاتر لەمەوبەر ئەو نوسخەیەی دیوانەکە کە ئامادە کرابوو، یەکەم و دوایینبەیتی هەر پارچەشیعرێکی خرایە بەردەستی بەڕێز "دوکتۆر عەزیز گەردی"، تا کێشی عەرووزیان دیاری بکا، ئەویش بە سوپاسێکی زۆرەوە ئەم ڕاسپێرییەی بەجێهێنا. ئەم دوادواییەیش کە دیوانەکە لە دوایینقۆناغی ئامادەکردندا بوو، دەقی هەموو پارچەشیعرەکان جارێکیتر خرایەوە بەردەستی بەڕێزیان، لەپاڵ ڕاستکردنەوە و پێداچوونەوەی کێشی عەرووزیاندا، هێندێ سەرنجی دروستی خستە بەردەست سەبارەت بە خوێندنەوە و نووسینی ئەو بەیتانە کە گرفتی کێشیان هەیە، ڕەچاو کران. مانای هێندێ وشە و زاراوەیش کە پێویستی بە فەرهەنگ بوو، فەرهەنگەکانی: (خاڵ، هەنبانە بۆرینە، اساطیر، عمید، معین، سخن)یان بۆ بەکارهێنرا. هەرچی دیاریکردنی هونەرەکانی ڕەوانبێژیشە لەم دیوانەدا، بەجێهێڵرا بۆ شارەزایانی ئەدەبیاتی کوردی تا دواتر خۆیان ئەو کارە بکەن.

پارچەشیعرەکان، وەك نەریتی ئامادەکردنی دیوانی شاعیرانی کۆن، بەپێی دوایینپیتی سەروای بەیتەکان پۆلێن و ڕیز کران، تەنانەت ئەوانەی هەردوو پیتی (ۆ، ێ)یش کە پێشتر –لەبەر نەبوونی

نیشانه و وێنەی نووسراویان- تێکەڵ بە -بەرودوا- جووتەپیتی (و، ی) دەکران، لێرە بە شێوەیەکی سەربەخۆ جویّ کرانەوە و دانران.

بەپێی ئەم (١٣) نوسخەیەی شیعرەکانی سالمیش کە بۆ ئامادەکردنی ئەم دیوانە یەكخراون و بەکارهێنراون، پاش وردکردنەوە دەرکەوت سالم تا ئێستا (٣٧٣) پارچەشیعر و (٣) چوارین و (٢) تاکەشیعری کوردی و (١) تاکەشیعری فارسیی لە بەردەستدان، لەوانە (٣٥٤) پارچەیان کوردی و (١٩)یان فارسییە. نوسخەکانی لای خوارەوەیش ئەم ژمارە دیاریکراوەی پارچەشیعریان تێدایە، کە لە نوسخەکانیتردا نین:

(مان)- ٢٩ پارچەی کوردی، ٤ی فارسی، ١ چوارینی کوردی، ١ تاکی کوردی.

(نم)- ١٩ پارچەی کوردی.

(عا)- ٧ پارچەی کوردی.

(پ)- ٤ پارچەی کوردی.

(غ)- ٣ پارچەی کوردی -کە یەکێکیان ناتەواوە- و ٥ی فارسی.

(کم)- ١ پارچەی کوردی.

(گم)- ١ پارچەی کوردیی ٤ بەیتی.

(مان، عا)- ٢ پارچەی کوردی و ٢ چوارین.

(مان، ن)- ٧ پارچەی کوردی و ١ی فارسی.

(مان، نم)- ٣ پارچەی کوردی.

(مان، ق)- ٨ پارچەی کوردی.

(غ، نم)- ٣ پارچەی فارسی.

(مان، حا)- ١ پارچەی کوردی.

(نم، گم)- ١ پارچەی کوردی.

(نم، پ)- ٩ پارچەی کوردی.

(نم، عا)- ٢ پارچەی کوردی

(نم، غ)- ٣ پارچەی فارسی.

(عا، غ)- ٢ پارچەی کوردی و ١ چوارین.

(مان، هـ)- ٢ پارچەی فارسی.

(مان، هـ، ج)- ٣ پارچەی فارسی.

(کم، گم)- ١٥ پارچەی کوردی.

(دیوانی کوردی)- ۱ پارچەشیعری کوردی.

بەوە شێوەیە، ئەم ژمارەیە -بەگشتی- ڕەنگە زۆرترین شیعری پارێزراوی شاعیرێکی زوومان بێ و "سالم"یش بەختەوەر بووە کە دیوانێکی لە ژیانی خۆیدا بە چاودێریی خۆی بۆ نووسراوەتەوە.

شایانی وتنە، نوسخە تایبەتییەکەی "سالم" (مان)، لەبەرئەوەی کۆنترین نوسخە و هێی سەردەمی ژیانی شاعیرە و زۆرترین پارچەشیعریی تێدا کۆکراوەتەوە، کراوەتە نوسخەی سەرەکی و بناغە و نوسخەکانیتری لەگەڵ بەراورد کراون و هەر جیاوازی و خاڵێکی جێی سەرنجیش هەبووبێ، دوابەدوای لێکدانەوەی وشە و بەیتەکان، دیاری کراون. ئەو پارچەشیعرانەیش کە لە (مان)دا نەبوون، هەمان ڕێچکەی نوسخەی کۆنتری بەپێی ڕێوشوێنی پێشوو بۆ گیراوەتە بەر و هەوڵیش دراوە سەرەنجام نوسخەیەکی تا ڕادەیەکی زۆر کەم کەموکووڕیی شیعرەکانی "سالم"یان لێ بەرهەم بهێنرێ.

شاعیرانی کۆنمان هەموویان ئەدەبیاتی بێگانە و -بەتایبەتی- فارسی کاری تێکردوون. لەوانەیە ئەو کاریگەرییە لای سالم، لەچاو ئەوانەی هاوزەمانی خۆیدا، زیاتر هەستی پێ بکرێ و لە شیعرەکانیدا ڕەنگی دابێتەوە؛ ئیتر هەر لە بەکارهێنانی زاراوە و دەستەواژەی فارسییەوە بگرە وەك خۆیان، تا دەربڕینی بە دارشتن فارسی و نموونەی ئەوانەیش لێرەولەوێی شیعرەکانیدا بە زەقی دیارن. تێهەڵکێشەکانی لەگەڵ شیعری بەتایبەتی "حافظ" و "سەعدی" و "جامی"، بەڵگەیەکی بەرچاوی ئەم ڕاستییەن. ئەم لایەنەی شیعری سالم بابەتێکە هەڵدەگرێ شارەزایان لێی بکۆڵنەوە.

خاڵێك کە پێویست وایە سەبارەت بە دەستنووسەکان ئاماژەی بۆ بکرێ، ئەوەیە کە ئەگەرچی نووسەرەوەی دەستنووسەکان گەنجینەکی گرانبەهایان بە نووسینەوەی ئەو دیوان و کەشکۆڵانە -بەگشتی- بۆ پاراستووین، کەمجار هەڵکەوتووە خوێندەواری بەرز و مەلای گەورە بووبن، چونکە مەلای چاك و مامۆستای زانا لەبەر سەرقاڵی و دەرزوتنەوە و دانان و نووسین و گرانیی ئەرکەکەی، زۆر کەم ڕێکەوتووە دەرفەتی هەبووبێ کتێب بنووسێتەوە. بۆیە بە زۆری فەقێ و خەتخۆش و خوێندەوار و مەلای ئاسایی ئەم کارەیان ڕاپەڕاندووە. ئەوانەیش، جگە لە هەڵەکردن لە نووسینەوەدا کە -بە ڕەچاوکردنی هەلومەرجی نووسینەوەیان- ڕاستکردنەوەیان زەحمەت بووە، بە حوکمی ئەوەیش کە ڕەنگە شاعیرەکان کەمتر دەسەڵاتیان بەسەریاندا هەبووبێ، جاروبار بەپێی ناوچەکانی خۆیان دەستکاریی هێندێ بەیت و وشەیان کردووە و گۆڕیویانن، یان بەیتیان لێ زیاد کردووە، یان لەبیر چووە بینووسنەوە و بەسەریاندا تێپەڕیوە. ئەم سەرنجە، بە هیچ جۆرێك لە گەورەیی کارەکانیان و دڵسۆزییان بۆ ئەو ئەرکە -بە زۆری- خۆبەخشانەیەیان کەم ناکاتەوە.

**ناساندنی نوسخەکان:**

ئێمە لە کاتێکدا ئەم نوسخانەی (دیوانی سالم)مان، بە چاپ و دەستنووسەوە، لە خوارەوە بە کورتی ناساندووە و هەڵسەنگاندووە، مەبەستمان تەنها نیشاندانی ڕادەی سوودلێوەرگرتن و بایەخیانە لە بەرهەمهێنانی ئەم دیوانەدا. دەنا ئەو زاتانە -یادیان بەخێر و گیانیان بە بەهەشتی بەرین شاد بێ- بە ڕەچاوکردنی ئەو هەلومەرجە ناهەموارە کە تێیدا ژیاون و ئەو دڵسۆزی و لەخۆبوردوویییە کە نواندوویانە بۆ ئامادەکردن و نووسینەوە یا لەچاپدانی شیعرەکانی سالم، خزمەتێکی گەورەیان بە ئەدەبیاتی کوردی کردووە و گەنجینەیەکی گرانبەهایان لە فەوتان بۆ ڕزگار کردووین.

**١. دوو دەستنووسەکەی بەرلین:**

ئەم دوو دەستنووسە، لەناو کۆمەڵە کۆکراوەکەی ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانیایی "ئۆسکار مان"دایە لە (بەرلین)، کاتی خۆی کە ساڵانی ١٩٠١-١٩٠٧ لە ئێران بووە، بە هەوڵی خۆی پەیدای کردوون و بردوونیەوە بۆ وڵاتی خۆی و ئێستا لە ئەرشیڤێکی شاری (بەرلین) پارێزراون.

**٤- ١. دەستنووسی یەکەم:**

ئەم نوسخەیە کە بە (مان) ئاماژەی بۆ کراوە، (٢١٤) لاپەڕەی پێوانە (١١,٨×٢٠,٩ سم)ـە. شیعرەکانی بەپێی ئەلف‌وبێی دواپیتی بەیتەکان ڕێك‌خراون. بەڵام ئەم دەفتەرە لە دەزووبەندکردندا لاپەرەکانی پاش و پێشیان پێ کراوە: (٥) لاپەڕەی (غزلهای فارسی جدیده) و (١٥) لاپەڕەی (غزلهای جدیده) کە کوردین، هێنراونەتە پێشەوە و سەرەتای دیوانەکە کە بە شیعرەکانی پیتی (ئەلف) دەست پێ دەکا، خراوەتە پاشەوە. پاش ئەو شیعرە ڕێکخراوانە تا پیتی (ی)، تەرجیعبەند (ترجیعات) و پێنج‌خشتەکی (مخمسات) و تێهەڵکێش (ملمعات) و شیعرە درێژەکانی تایبەت بە بابان و شیعرەکانی هەجوو دانراون. بەو پێیە، دەبێ (غزلهای فارسی جدیده) کە (٩) پارچە و (١) تاکە شیعری فارسییە و (غزلهای جدیده) کە (٢١) پارچەی نوێی کوردییە، پاش نووسینەوەی دیوانەکە خرابنە پاشەوە، بەوەدا کە پێش ئەم دوو بەشەی دوایی لە (ل١٩٤)دا نووسراوە: ((بدرجه اتمام رسید در شب یکشنبه بیست و دوم شهر شعبان المعظم ١٢٧٨ حسب الخواهش مخدوم مکرم عبدالرحمن الکردی که الحق در فن شعرسازی سحربازی مینماید. اللهم اغفر له ولکاتبه ولسائر جمیع المسلمین بحرمه محمد الخاتم النبیین آمین آمین آمین)). واتە ڕوونووسکەرەوە شەوی یەکشەممەی ڕێکەوتی ١٨٦٢/٢/٢١ لە نووسینەوەی نوسخەکە بووەتەوە، ئەو دوو بەشەیش پاشتر زیاد کراون.

ئەم دەستنووسە بە خەتێکی جوان و خۆشخوێنی نەستەعلیقی فارسی نووسراوەتەوە. پارچەشیعرەکان بە شێوەیەکی بەرزی هونەری و دوو ڕیز ڕێك‌خراون و کەمترین هەڵەیان تێدا کراوە. بایەخی گەورەیشی لەوەدایە کە -بەتایبەتی- بۆ ئەوڕەحمان بەگی صاحێبقڕان "سالم" خۆی

نووسراوەتەوە و کۆنترین و متمانەپێکراوترین نوسخەی بەردەست و هێی سەردەمی ژیانی شاعیر خۆیەتی، بۆیە کرایە بناغەی ئەم دیوانە.

لەبەرئەوەی دەستخەتەکە شاکارێکی نووسینە، وەك وەفادارییەك بۆ ڕوونووسکەرەوەکەی، کە -بەداخەوە- ناوی خۆی نەنووسیوە، تەواوی وێنەکەی خرایە پاشکۆی ئەم کتێبە. هیچ بە دوور نازانرێ ڕوونووسکەرەوە کوردێکی خەتخۆشی ڕۆژگاری خۆی و خەڵکی (سنە) بووبێ، چونکە سالم لە ڕۆژانی ئاوارەیی پاش ڕووخانی میرایەتیی باباندا، جگە لە (تاران)، ماوەیەکی درێژیش لە (سنە) ماوەتەوە و شیعری زۆری لەو شارە داناوە و ناویی تێدا هێناوە و شیعری هەجوویشی زۆرە کە بۆ کەسانێکی سنەیی نووسیوە. ئەم دەستنووسە لە (٢١٨ پارچەشیعری کوردی، ٤ تەرجیعبەند، ٣ پێنجخشتەکی، ٣ چوارینی کوردی، ١ تاکەشیعری کوردی، ١٠ پارچەشیعری فارسی، ١ تاکە شیعری فارسی، ٢١ پارچە تێهەڵکێش (مولەممەع)، ٥ چامەی درێژ، ١٣ پارچەی هەجوو، ١ تاکی هەجوو، ٢١ پارچەشیعری تازە) پێكهاتووە. واتە سەرجەم (٢٩٥) پارچە شیعر، ٣ چوارین و ٣ تاکەشیعری کوردی و فارسییە.

پرسیار ئەوەیە: ئەو (٧٨) پارچەشیعرەیتر کە لە دەستنووسەکانیتردا هەن، بۆچی لەم دەستنووسەدا نین؟! ڕەنگە وەڵام ئەوە بێ: سا یا هێندێ لەو شیعرانە بێهێزوپێز و هێی سەرەتای ژیانی شاعیریی سالم بوون، لەوانەیش هێی ئەو کاتە کە ناسناوی -گوایە- "بیمار" بووە، خۆی نەیویستووە لەم دیوانەدا جێیان بکاتەوە، یان هێی پاش ڕۆژی (١٨٦٢/٢/٢١)ی تەواوبوونی نووسینەوەی ئەم دەستنووسە تایبەتەن، لە هەلومەرجێکیتردا کە ژیانی شاعیری تێدا نالەبار بووە، نەلوواوە بخرێنە پاڵ شیعرەکانی ئەم دیوانە. بەڵام بێڕاگەیوە هێندێ شیعریتر بە ناوی (عزلیات فارسی جدیده) و (غزلهای جدیده)وە بخاتە پاشکۆی دەستنووسەکە. (غزلیات فارسی جدیده)یش گومانی ئەوەمان لا پەیدا دەکا کە دیوانەکەی شیعری کۆنی فارسیشی تێدا بووە، ئەم چەند پارچە تازەیەیشی سەر خستووە، لە کاتێکدا ئەم دیوانە، جگە لە مولەممەعات و موخەممەسات، شیعریتری فارسیی تێدا نییە. ئەی دەبێ ئەو شیعرە فارسییە کۆنانە لە کوێ بن؟! دیارە جارێ هیچ وەڵامێك لە بەردەستدا نییە.

پرسیارێکیتر سەبارەت بەم دەستنووسە ئەوەیە: بۆچی لە ئێران بووە و لەوێ کەوتووەتە دەستی ئۆسکار مان؟! لە کاتێکدا بۆ "سالم" نووسراوەتەوە و سالمیش -گوایە- پاش ڕووخانی میرایەتیی بابان و هەڵاتنە ئێران، گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و لێرە سەری ناوەتەوە! تۆ بڵێی ڕوونووسکەرەوە لە نووسینەوەی دیوانەکە نەبووبێتەوە و سالمی بەسەردا مردبێ و ئیتر لەو دیوانە نەپرسرابێتەوە و لە ئێران مابێتەوە؟! یا سالم خۆی هەر لە ئێران ماوەتەوە و لەبەرئەوەیش دەستنووسەکە هەر لەوێ بووە؟ هیچ بە دوور نازانرێ "ئۆسکار مان" باسی چۆنیەتیی دەستکەوتنی ئەم دەستنووسەی لە بیرەوەریی

ڕۆژانەیدا کردبێ و ڕەنگە ناوی ئەو کەسەیشی نووسیبێ کە لێی وەرگرتووە. بەڵام وا جارێ ئەم زانیارییە پێویستانە لە ئێمە ونن، بە هیوای ئەوەی ئەمەودوا کەسانێك پەیدا بن کار لە بەرهەمی کۆکراوەی ئۆسکار ماندا بکەن و گرێی ئەم نهێنییە بکەنەوە.

١. ٢. نوسخەی دووەمی بەرلین:

ئەم نوسخەیە کە بە (عا) ئاماژەی بۆ کراوە، (١٤٤) لاپەڕەی پێوانە (١٤,٧×٢٠,١ سم)ـە، لە کۆتاییدا نووسراوە: ((هو الله تعالی تمت شد این کتاب کرماجی و کردی از گفتهٔ سالم و بعضی شاعرهای دیگر از دست حقیر سراپا تقصیر علی اکبر ساکن ولایت سندج در حالت عجز و پریشانی حسب الفرمایش جناب جلالتمآب صاحب و دکتار مسیو من سیّاح المانی دام اقباله العالی در تاریخ هجدەهم شهر ربیع الاول سنه ١٣٢١ شأنه هو العزیز)). واتە "عەلی ئەکبەر"ی خەڵکی (سنە)، کە بەپێی ڕۆژگارەکەی هەر دەبێ "عەلی ئەکبەری وەقایعنیگاری کوردستانی"[1] بێ، ڕۆژی ١٨ی ڕەبیعول ئەووەلی ١٣٢١ك/١٩٠٣/٦/١٤ لە نووسینەوەی بووەتەوە. ئەم نوسخەیە هەڵەی کەمە، ڕوونووسکەرەوە شیعرەکانی بەپێی ئەلفوبێی دوا پیتی بەیتەکان ڕیزکنەخستووە. خەتەکە نەستەعلیق و خۆشخوێنە. (١٥٦) پارچە شیعری کوردی هەر لەم نوسخەیەدا هەن. بە هەڵەیەیش پارچە شیعری ((بەدا نەحواڵی ئەشخاصێ کە خاصصەی مولکی بابانن))ی داوەتە پاڵ "نالی"ی شاعیر، لە کاتێکدا ئەو پارچەیە لە نوسخەی یەکەمی بەرلیندا —کە بەتایبەتی بۆ "سالم" نووسراوەتەوە— هەیە.

٢. نوسخەی "نافیع مەزهەر":

ئەم نوسخەیە کە بە (ن) ئاماژەی بۆ کراوە، —وەك بە مۆری سەر یەکەم لاپەڕەیدا دەردەکەوێ— کەوتووەتە ئەرشیڤێکی شاری (بەرلین)، (٩٥) لاپەڕەی پێوانە (١١×١٧,٥ سم)ە. سەرەتا و کۆتایی فەوتاوە و ناوی ڕوونووسکەرەوە و ساڵی نووسینەوەی دیار نین. ئەم دەستنووسەیش دیسان هەر بە خەتێکی خۆشی نەستەعلیق نووسراوەتەوە. شیعرەکانی پیتی (ن، و، هـ، ی)ی تێدایە. یەك شیعری پیتی (م) و دواینبەیتی شیعرێکی ئەو پیتەیش هەن. چوار پارچەشیعری پیتی (ی) و ٩ نۆ بەیتی شیعرێکیتری

---

[1] "عەلی ئەکبەر" بە "وەقایعنیگار" ناسراوە و کوڕی "میرزا عەبدوڵڵای مونشیاشی (ڕەونەق)ی کوڕی محەممەد ئاغا"یە، بە یەکێك لە ئەدیبان و شاعیران و میرزایانی سەردەمی خۆی دەژمێردرێ. ناوبراو، خاوەنی ئەم بەرهەمانەیە: حدیقەی ناصریە ١٣٦٤، مرآت الظفر ١٣٨٤، عشایر وایلات و طوایف کرد ١٣٨١، بدایع اللغە- فرهنگ کردی- فارسی ١٣٨٨ و دیوانی شیعری لەچاپنەدراو (بدایع اللغە فرهنگ کردی- فارسی، بە کوشش محمد رئوف توکلی، ١٣٨٨، ص٦-٧).

هەمان پێتیش کەوتوون. خوالێخۆشبوو نافیع مەزهەر[٢]، کە ئەم دەستنووسەی لا بووە، ڕۆژی ١٣٢٥/٦/٥ی هەتاوی (١٩٤٦/٨/٢٧) لە شەش لاپەڕەی پێشەوەیدا نووسیویە: ساڵی ١٣٢٠ی هەتاوی (١٩٤٠) ئەم دەستنووسەی لە "مەلا سەعید" ناوێکی پێشنوێژی مزگەوتی دێی (سەیداوا)ی ناوچەی (سەقز) وەرگرتووە بەرامبەر بە کتێبی فارسیی (قصص الانبیاء). ڕۆژی ١٣٤١/٨/١٨ی هەتاوی (١٩٦٢/١١/٩)یش نووسیویە: ئەم دەستنووسەی پێشکەشی ئیدارەخانەی ڕۆژنامەی "کوردستان" کردووە، کە ئەو سەروەختە لە (تاران) دەردەچوو. سەبارەت بەوەیش کە چۆن گەیشتووەتە وڵاتی ئەڵمانیا، کاك صەباح حسەینی –لە زمانی خاتوو حەمیدەی کچی نافیع مەزهەرەوە– وتوویە: دکتۆر فەیزی نەژاد گەیاندوویەتە ئەوێ.

بە سەرنجدانی جۆری ڕیزکردن و ڕێکخستنی ئەم دەستنووسە، بۆمان دەرکەوت شیعرەکان دەقاودەق بە هەمان زنجیرەی یەك لەدوای یەکی نوسخەی (مان) ئامادە کراون و پاش تەواوبوونی پیتی (ی)، بە شێوەی (تەرجیعات)، (مولەممەعات)، (موخەممەسات)، ئەمجا پێنج پارچەشیعرە درێژەکە و ١٣ پارچەشیعری هەجوو دانراون. بەو پێیە، دەبێ ئەم نوسخەیە یا لە بەر نوسخەی (مان)، یان ئەو نوسخەیەدا کە ئەوی (مان)ی لە بەردا ئامادە کراوە، یان نوسخەیەکیتری بنەڕەت نووسرابێتەوە و لە ڕووی تەمەنەوە –کەموزۆر– هاوزەمانی ئەوەی (مان) بێ. کێ ناڵێ ئەم نوسخە ماندووە، هەر دەستخەتی "سالم" خۆیشی نییە؟! نوسخەکە –بەگشتی– هەڵەی نووسینەوەی کەمە و کەڵکی بۆ ڕاستکردنەوە و ساغکردنەوەی هێندێ وشە و دەستەواژەی شیعرەکان هەبوو.

**٣. نوسخەی کەشکۆڵی حاجی مەحموودی یاروەیس:**

ئەم کەشکۆڵە کە بە (حا) ئاماژەی بۆ کراوە، (٢٩٧) لاپەڕەی پێوانە (٧,٠١×٢١ سم)ە. نوسخەی ئەسڵیی دیار نییە، وێنەیەکی کۆپیکراوی سەرەتای ساڵانی حەفتای لای بەڕێز "عەلی بەگی حسێن بەگی جاف"ە لە هەولێر، بە سوپاسەوە دووجار بە هاوکاریی بەڕێز "محەمەد حەمەباقی" لێی

---

[٢] نافیع شۆرەتی مەزهەر و ناسناوی شیعریی "شپرزە"یە، کوڕی حاجی شێخ مەحموودی حاجی شێخ برایم و لە بنەماڵەی کەسنەزانی سەرشیوی سەقزە. ١٩١٣ لە سەقز لەدایك بووە. بە منداڵی خراوەتە مەدرەسەی دینی لای مەلا شێخ حەمەصادقی عارفی و کاکی و شێخ حەمەکامیلی جوانڕۆیی و شێخ محەمەدی مەردۆخیی قزلّبلاّخی. پاشان هاتووتە سلێمانی و کەرکووك و چەند ساڵێك بە وەزیفەی سەربازی ماوەتەوە. ١٩٤١ گەڕاوەتەوە بۆ سەقز. ١٩٤٢ بە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی دانراوە و لە وەزیفەدا ماوەتەوە تا لە ١٩٦٢دا خانەنشین بووە. ١٩٩٨ کۆچی دوایی کردووە. نافیع دەستی شیعرنووسین و وەرگێڕانی هەبووە (بڕوانە: نافع مەزهەر "شپرزە"، دیوانی شیعر: گردوکۆ، سوید، ١٩٩٥، ل٥، ٦، ١٣، ١٤، ٢٤، ٢٧، ٣١، ٣٢، ٣٥، ٣٦، ٣٨).

سپاس بۆ هاوکاریی کاك صەباح حسەینی کە ئەم زانیاریانەی بۆ ناردین.

وەرگیرا. "عەلی بەگ" لە یەکەم لاپەڕەیدا نووسیویە: ((وەکوو "عوثمان هۆمەر" ئەڵێت: ئەم نووسینانەی ئەم کەشکۆڵە بە پێنووسی "مەحموودی یاروەیس"ی باپیری و "حەمەی مەنسووری یاروەیس"ی مامەیەتی– ۱۹۷۲/۸/۲٦)). لە (ل٦۸)یشدا دەستخەتی "محەمەد ڕەشید" ناوێك هەیە: ((تمت شد از دست سید محمد رشید)).

بەو پێیە، ئەم کەشکۆڵە کە هیی حاجی مەحموودی یاروەیس"[3]ە، سێ کەسێك دەستخەتی بەم کەشکۆڵەوە هەیە، کە شیعری شاعیرانیتری وەك: نالی، مەولەوی، وەلی دێوانە، ڕەنجووری.. تێدا کۆکراوەتەوە. (۱۰۲) پارچە شیعری سالم لە (۸٦–۹۰، ۱۰۹–۱٤٤)ی ئەم کەشکۆڵەدا هەیە. دەستخەتەکەی نەستەعلیق وخۆشخوێنە، بە سێ ستوونی لار یا دووی لار و ۲ی درێژایی لاپەڕەکە نووسراوەتەوە. لە (ل۷۲)دا نووسراوە: ((تمت غره جمادی الاول سنه ۱۲۸۷ از منزل توارخ تپه ایلاق ..)). واتە کۆتایی تەمووزی ۱۸۷۰ لە (تۆراخ‌تەپە) نووسراوەتەوە، دوور نییە ئەو دەمە سالم لە ژیاندا بووبێ. ئەم نوسخەیە دووەم نوسخەی سەردەمی سالم خۆی، یا زۆر نزیکی سەردەمەکەیە.

جێی باسە، بەشێکی شیعری شاعیرانی ناو ئەم دەستنووسە، بەتایبەتی سالم، پێشتر بە کتێبێك لەچاپ دراوە[4]. لەبەرئەوەی دەستنووسەکە لە بەردەستدا بوو، پێویستمان نەبینی بچینەوە سەر لەچاپدراوەکە.

٤. نوسخەی سەیید محەمەدصادقی حسەینی:

ئەم نوسخەیە کە بە (هـ) ئاماژەی بۆ کراوە، بەڕێز "صەباح حسەینی" –بەسوپاسەوە– ناردوویە، (۳۰) لاپەڕەی خۆشخوێنی پێوانە –کەموزۆر– (۱۲×۱۹ سم)ە. شیعرەکان (٥۹) پارچەی کوردی و (۸)ی فارسین. "سەیید محەمەدصادقی حسەینی[5]ی ڕوونووسکەرەوەکەی لە یەکەم لاپەڕەدا نووسیویە:

---

[3] حاجی مەحموود، سەرکردە و خوێندەوارێکی دیاری هۆزی جاف و موڵك وماڵێکی زۆر و چەند جۆگەئاوێکی لە ناوچەی شارەزوور بووە. شیعری بە کوردی و فارسی نووسیوە و دۆستایەتی لەتەك "مەولەوی"ی شاعیردا خۆش بووە. دوو دەستنووسی لەپاش بەجێ ماوە: یەکیان (بەیاز)ێك بووە، لە ۱۹٦۳دا ون بووە، دووەمیشیان ئەم کەشکۆڵەیەتی کە نوسخە نەسڵییەکەی دیار نیە (بڕوانە: کەشکۆڵی مەحموودی یاروەیس، لێکۆڵینەوە و ساخکردنەوەی عوسمان محەممەد هەورامی، سلێمانی، ۱۹۹۸، ل۱٥–۱۸).

[4] بڕوانە: کەشکۆڵی حاجی مەحموود یاروەیش، لێکۆڵینەوە و ساخکردنەوەی عوسمان محەممەد هەورامی، چاپخانەی ئۆفسێتی بابان، سلێمانی، ۱۹۹۸.

[5] سەیید محەمەدصادقی حسەینی ناسراو بە "هەیبەت" کوڕی سەیید ڕەزا کوڕی سەیید مەحموودە و دەچێتەوە سەر سەیید شوکروڵڵای ناسراو بە (کەوڵزەرد). ۱۸۷۷/٥/۷ لە دێی (قەڵاگا)ی ناوچەی سارالّی دەوری شارستانی دیواندەرەی باکووری شاری سنە لەدایك بووە. خوێندنی لە زێدی خۆی دەست پێ‌کردووە و چووەتە سنە و تا ۱۸۹۸ لە مەدرەسە دینییەکانی ئەوێ خوێندوویە. پاشان لە دێهاتی (کوچك چەرمگ) و (کەسنەزان) و (عەبابەیلێ) و ئەمجا (بانە) و (سابلاخ)

((جمع دادن این دیوان به ترتیب حروف هجا از این حقیر سید محمد صادق "هیبت" تخلص است)). واته سەید محەمەد صادقی ناسناو "هەیبەت" نووسیویەتیەوە. لە دوا لاپەڕەیشدا نووسیویە: ((تم دیوان السالم بعون رازق الجاهل و العالم فی سنه ۱۳۳۱)). واتە ساڵی ۱۹۱۳ نووسراوەتەوە. نوسخەکە بە خەتی نەستەعلیق نووسراوەتەوە و هەڵەی کەمە.

٥. ئەم دواییە بەڕێز "محەمەدعەلی قەرەداخی" -بە سوپاسەوە- وێنەی سێ دەستنووسی‌تری شیعرەکانی "سالم"ی خستە بەردەست:

**٥. ١. نوسخەی کەشکۆڵی مەلا فەتاحی کاگردەڵی:**

ئەم نوسخەیە کە بە (ف) ئاماژەی بۆ کراوە، (۲۳) لاپەڕەی (۱۳۷-۱٦۰)ی ناو کەشکۆڵێکی (۷٦۸) لاپەڕەیی پێوانە (۱۹×۳۰ سم)ە. کەشکۆڵەکە شیعری چەند شاعیرێکی‌تریشی تێدا کۆکراوەتەوە و کاتی خۆیشی نوسخەیەکی ساخکردنەوەی (دیوانی نالی) بوو. (۸۸) پارچە شیعری "سالم" لە کەشکۆڵەکەدا هەیە و بەپێی ڕیزی ئەلفوبێ ڕێکخراون.

شیعرەکان کە مەلا فەتاحی کاگردەڵی نەورۆڵی[٦] نووسیویەتیەوە، بە شێوەیەکی بەرزی هونەری و -بەگشتی- بە چوار ستوون یا پێنج ستوون و زیاتریش نووسراونەتەوە و خەتەکەیشی نەستەعلیقی خۆشخوێن و کەمهەڵەیە. "مەلا فەتاح" کە لە کۆتایی کۆمەڵەشیعری هەر شاعیرێکدا ڕۆژی نووسینەوەی لێداوە، لەمەی "سالم"دا وای نەکردووە. ئەوە نەبێ کە لە دوای شەشەم پارچەشیعرەوە (حیکایەتخوانە طوطیی دڵ لە دەوری دامی گێسوودا) نووسیویە: ((تم بید عبدالفتاح سنه ۱۳۲٤)). واتە ساڵی ۱۹۰٦، بەو شێوەیە دەبێ ئەم شیعرانەی سالمی ئەو ساڵە یا دواتر تەواوکردبێ.

---

و دیسان سنە و کوردستانی عیراق و کوردستانی تورکیا درێژەی بە خوێندن داوە و دواجار لە (بیارە) ئیجازەی لە مەلا عەبدولقادری کانی کەوەیی وەرگرتووە. دوایی سیازدە ساڵ مەلایەتی و مامۆستایەتیی لە دێی (کەرەفتوو) کردووە. ۱۹۳٤ چووەتە دێی (ئالکەلوو)ی نزیکی (سەقز)، تا لە ۱۹۳٦/٤/۲٤دا کۆچی دوایی کردووە. سەید محەمەدصادق، سەرباری بەجێهێنانی دەرزوتنەوە و پێشنوێژی، کتێب و نامیلکە و دەستنووسێکی زۆری لەپاش بەجێ ماوە (بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: علامه سیّد محمد صادق حسینی متخلّص به "هیبت"، منشآت، مقدمه، تصحیح وتعلیقات سیّد صباح حسینی، سقز، ۱۳۹۲، ص۱۰-۲٥).

[٦] مەلا فەتاح کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی ئەحمەدی کاگردەڵیی نەورۆڵییە. بە فەقێیەتی یا مامۆستایی زۆر شوێنی وەك قزلرەبات، شمێران، کەلار، حاجی قەرە، عەبابەیلێ، خانەقین و بەرلووت و جێی دیکە گەڕاوە و تێیاندا ماوەتەوە. بەرهەمی زۆر شاعیری لە کەشکۆڵەکەیدا، کە سیازدە ساڵ خەریکی بووە، کۆکردووەتەوە و پاراستووە. لە ڕووداوێکی خێڵەکیدا کوژراوە (بڕوانە: محمد علی قەرەداغی، مەلا فەتاحی کاگردەڵی و ۱۳ ساڵ گوڵبژێری لە باخچەی ئەدەبی کوردیدا، ڕۆژنامەی "پاشکۆی عیراق"، بەغدا، ژ ۱۲-۱۳، شوبات و ئاداری ۱۹۷۸، ل۱۸، ۲۳).

**٥. ٢. نوسخەی مەلا عەبدوڵڵای قزڵجی:**

ئەم نوسخەیە کە بە (ق) ئاماژەی بۆ کراوە، "مەلا عەبدوڵڵای قزڵجی"[٧] لەناو دەفتەرێکی (١٦٣) لاپەڕەیی خەتداری پێوانە (١٥,٥×٢٤ سم)دا، کە شیعری چەند شاعیرێکی‌تریشی تێدا کۆکردووەتەوە، لە بەغدا نووسیویەتەوە. (٤٥) لاپەڕەی ئەم کەشکۆڵە (ل٥٩-١٠٣) بۆ (١٢٥) پارچە شیعری "سالم" تەرخان کراوە. "مەلا عەبدوڵڵا" نووسینەوەی شیعرەکانی "نالی"ی لەو دەفتەرەدا لە ٦ی جومادیلثانیی ١٣٤١ (١٩٢٣/١/٢٣)دا تەواو کردووە. دوابەدوای ئەوە دەستی بە شیعرەکانی "سالم" کردووە و هیچ مێژوویەکی سەر نەخستووە، بۆیە نازانرێ کەی لە نووسینەوەی بووەتەوە. خەتەکەی خۆشخوێن و ڕەوان و هەڵەیشی کەمە، شیعرەکانیشی بە دوو ستوون نووسیوەتەوە. نایشزانرێ ئەم شیعرانەی لەبەر چ نوسخەیەکی‌تردا ڕوونووس کردووەتەوە.

**٥. ٣. نوسخەی ئەحمەد ئاغا:**

ئەم نوسخەیە کە بە (غ) ئاماژەی بۆ کراوە، (١٥١) لاپەڕەی پێوانە (١٢×١٧سم)ە، بە خەتێکی نەستەعلیقی جوان و شێوەیەکی هونەری و -بەگشتی- بە سێ ستوون لە هەردوو سەری لاپەڕەوە بە لاری و ڕیزی ناوەڕاست بەیتێك بە درێژیی لاپەڕەکە نووسراوەتەوە. دەستنووسەکە سەرەتای دیار نییە و لە چەند جێیەکدا پەڕەی لێ کەوتووە. شیعرەکان بە تێکەڵوپێکەڵی نووسراون و زنجیرەی پیتەکانی ئەلفوبێیان تێدا ڕەچاو نەکراوە. نە مێژووی نووسینەوە و نە ناوی ڕوونووسکەرەوە زانراو نین، ئەوەندە هەیە بۆ "ئەحمەد ئاغا" ناوێك نووسراوەتەوە: ((بحمد الله باتمام رسید ونجا تمت انجامید دیوان کردی سالم جهه ارجمندی احمد آغا تحریر ...)) (ل١٥١).

شیعرەکان بەم شێوەیەن: ١٤٥ پارچەشیعری کوردی، ٢ چوارینی کوردی، ٧ پارچەشیعری فارسی کە (٥)یان لە نوسخەکانی‌تردا نین، ٩ پارچەی کوردیی ناتەواو کە بەهۆی کەوتنی پەڕەوە کەموکورتییان لێ پەیدا بووە. سێ پارچەی کوردیشیان، کە یەکیان ناتەواوە، لە هیچ نوسخەیەکی‌تردا نین.

جێی باسە، محەممەدعەلی قەرەداخی شیعرە کوردییەکانی ئەم دەستنووسەی بە کتێبی (بەرکوتێك لە خەرمانی شیعری سالم: چەپکێك شیعری بڵاونەکراوەی سالم، پاشکۆیەکی دیوانی نالی، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠، ٢٦١ل) بڵاوکردووەتەوە.

**٦. نوسخەی کتێبخانەی مەجلیسی شوورای ئیسلامیی ئێران:**

ئەم نوسخەیە کە بە (ج) ئاماژەی بۆ کراوە و بەڕێز کاروان عوسمان خەیات وێنەیەکی پێشکەشی (بنکەی ژین) کردووە، (٨٣) لاپەڕەی پێوانە (١٢×٢٠ سم)ە، "سەید عەلی" ناوێك بۆ "ئەحمەد

---

[٧] بەداخەوە زانیاری سەبارەت بە ژیاننامەی ئەم مامۆستا بەڕێزە دەست نەکەوت.

موختار بەگ"ی نووسیوەتەوە و مێژووی نووسینەوەیشی لێ نەداوە. لە (ل۸۳)دا نووسراوە: ((تمام شد کلیّات سالم جهه سرکار احمد مختار بگ دام اقباله الی [العالی] مدیر زمان یا ربّ مبارکش بادا. بمنّه آمین بدست سید علی)).

"ئەحمەد موختار بەگ"، هەر دەبێ "ئەحمەد موختار جاف"ی شاعیر بێ، کە بە (مودیری زەمان) پەسنی داوە، لە کاتێکدا سالانی (۱۹۲۲-۱۹۲۵) ڕاست قایمقامی قەزای هەڵەبجە و پاشتریش نائیبی سلێمانیش بووە لە یەکەم خول (۱۹۲۸/۷/۱٦) و سێیەم خول (۱۹۳۰/۱۱/۱-۱۹۳۱/۱۱/٤)ی پەرلەمانی عێراقدا. هەرچی "سەیید عەلی"ی ڕوونووسکەرەوەیشە، بە بەراوردی دەستخەتەکەی لەگەڵ دەستخەتی-تری "عەلی کەمال باپیر"ی شاعیر، لەوە دەچێ هاوشێوە بن. بۆیە هیچ بە دووری نازانین هەر ئەو زاتە بۆ "ئەحمەد موختار جاف"ی نووسیبێتەوە، بەتایبەتی کە لە ۱۹۲٤ بەدواوە تا ۱۹۲٦ کارمەندی مالییە (دارایی) بووە لە هەڵەبجە و لە ۱۹۳۰ یشەوە، پاش گەڕانەوەی لە لای "شێخ مەحموود حەفید" لە (پیران)، تا ۱۹٥۰ لەوێ نیشتەجێ بووە و ژیاوە. خاڵێکیتریش کە ئەم لایەنە جەخت دەکاتەوە، ئەوەیە -وەك پاشتر ئاماژەی بۆ دەکرێ- عەلی کەمال باپیر پێشتر شیعرەکانی "سالم"ی کۆکردووەتەوە و گۆڤاری "دیاریی کوردستان" فۆرمەفۆرمە لەچاپی داوە بەو نیازە کە لە دواهاتوودا بیکاتە کتێب. ئەم نوسخەیە (۹٥) پارچە شیعری کوردی و (۳)ی فارسیی تێدایە، دەستخەتەکە نەستەعلیقی خۆشخوێنە، بە دوو ستوونی لار و -بەگشتی- ستوونێکی پانیی لاپەڕە نووسراوەتەوە و هەڵەیشی کەمە.

۷. **نوسخەی ڕەفیق سالح:**

ئەم نوسخەیە کە لە (بنکەی ژین) پارێزراوە و بە (ڕ) ئاماژەی بۆ کراوە، لەناو کەشکۆڵێکی (۱۹٦) لاپەڕەیی پێوانە (۱۲×۱۸,٥ سم)دایە، کە شیعری شاعیرانیتری وەك: نالی، کوردی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، فائق، ...ی تێدایە و ئەوی "سالم" (٥۷) لاپەڕەی (ل۷۹-۱۳٦)ی لێ گرتووەتەوە. سەرجەم (۸۱) پارچە شیعری "سالم" نووسراوەتەوە. دەستخەتەکە نەستەعلیق وخۆشخوێنە و هەڵەی نووسینەوەیشی هەیە. شیعرەکان، کە بە تێکەڵی ڕیزکراون، بە تەرزێکی جوان و بە زۆری لە شێوەی دوو ستوونی لار یا دوو ستوونی لار و ستوونێکی ناوەڕاست یا لاتەنیشتدا بە درێژیی لاپەڕەکە ڕێكخراون. مێژووی نووسینەوە بەسەر کۆتاییی شیعرەکانەوە نییە و ناوی ڕوونووسکەرەوەیش ونە.

۸. **دیوانی سالم، چاپخانەی ئەیتام، بەغدا، ۱۹۳۳، بڵاوکراوەی ژمارە (۳)ی (نەشرییاتی کوردی- مەریوانی):**

ئەم نوسخەیە کە بە (کم) ئاماژەی بۆ کراوە، (نەشریاتی کوردی- مەریوانی) لە بەغدا، لەچاپی داوە. ئەمە یەکەم دیوانی لەچاپدراوی "سالم"ە، (۱۰٦) لاپەڕەی پێوانە (۱٦,٥ × ۲۱سم)ە و (۲۲۱) پارچە شیعری تێدا جێکراوەتەوە. لە (ئیعتیذار)ی دوا لاپەڕەیدا نووسراوە: ((سەبەبی تەئخیری کتێبی (یاری) و

(دیوانی سالم) به کورتی مومکین نییه. ئەگەر بمانەوێ به تەواوی بینووسین، ئەبێ به چیرۆکێکی ۱۰۰ سەد لاپەڕەیی. جارێ با بمێنێ تا ڕۆژی خۆی، ئەوا دووروودرێژ ئەیگێڕینەوه بۆ خوێندەواره خۆشەویستەکانمان– ۱۹۳٤/٥/۱)). مخابن، ((ڕۆژی خۆی))یان نەدی و ئەم چیرۆکەیش وەك هەزاران چیرۆکیتر و بگره زیاتریش، برایه ژێر گڵ!

خزمەتەکانی مستەفا صائیب[8] و تاهیر بەهجەت مەریوانی[9] که خاوەنی پرۆژەی (نەشریاتی کوردی– مەریوانی) بوون، لەو قاتوقڕییەی ڕۆشنبیری و خوێندەواریی کوردیدا، که (نەشریاتی کوردی– مەریوانی)یان لەسەر گیرفان و کات و توانایی خۆیان دامەزراندووه و کۆمەڵێك کتێب و نامیلکەی کوردییان بەچاپ گەیاندووه، لەوانه (دیوانی سالم)، بۆ ئەو زەمانه و بۆ بووژاندنەوەی ئەدەبیاتی ڕەسەنی کوردی جێی ڕێزلێنان و ستایشه. هێندەی پێوەندیشی بەم دیوانەوه هەبێ، ئەوەیه که هەڵەی چاپی تێدا کەم نییه، ڕەنگه هۆیەکی ئەوەبێ که ئەوسا پیتچنی کورد له چاپخانەکانی بەغدادا نەبووه، له دەقی کوردی تێبگا و به هەڵه لەچاپی نەدا. لێرەولەوێیش شیعرەکان هەڵەیان تێکەوتووه، چونکه ئەو دەستنووسه که شیعرەکانی له بەردا نووسراوەتەوه، یا خۆی هەڵەی نووسینەوەی تێدا بووه، یان به دروستی نەخوێنراوەتەوه و نەنووسراوەتەوه، چونکه هەست دەکرێ جاروبار دەستکاریی هێندێ وشه و شێوەی نووسینیان کراوه. هەندێ جاریش –وا دیاره– شکڵنووسی وشەکان کراوه. ئەمه جگه لەوەی که دەستکاریی فیعلەکانی ڕانەبوردوو کراوه و (دە)یەکانی –بەگشتی– کراون به (ئه). ئەو دەمه باو بوو

---

[8] مستەفا کوڕی مەلائەحمەد صائیب کوڕی مەلاقادری قەرەداخییه، ۱۹۰٤/۸/۲۳ له کفری لەدایك بووه. به شەش ساڵی قۆناغی سەرەتایی له سلێمانی و ناوەندیی له کەرکووك و ۱۹۲٦ قوتابخانەی ئەندازه (هندسة)ی له بەغدا تەواو کردووه. ئەمجا به ئەندازیار له دائیرەی ئەشغالی سلێمانی دامەزراوه. متمانەپێکراو (معتمد)ی (کۆمەڵی لاوانی کورد)، (جەمعیەتی زەردەشتی– ۱۹۲٦)، لقی سلێمانیی (جەمعیەتی خۆییوون) و ئەندامی دامەزرێنی (کۆمەڵی پێشکەوتنی کوردان–۱۹۲۹) بووه. ۱۹۲۹ لەبەر چالاکیی سیاسی دوور خراوەتەوه بۆ ڕەواندز و مووسڵ و بەسره و حیللە و کەربەلا و بەغدا. لەو ساڵانه پرۆژەی (نەشریاتی کوردی– مەریوانی)ی لەتەك تاهیر بەهجەت مەریوانیدا دامەزراندووه، که ۱۳ کتێب و نامیلکەی لەچاپ داوه. له ۱۹٥۰ بەدواوه دەستی له سیاسەت هەڵگرتووه. ۱۹۸۰/۱۲/۹ کۆچی دوایی کردووه. بەڕێز کەمال ڕەئووف محەمەد هەموو نوسینەکانی کۆکردووەتەوه و به کتێبێك لەچاپی داوه (ڕۆژنامەی ژیان، یەکەم بەرگ، ژماره (۱– ۸۱)، ئامادەکردنی ڕەفیق ساڵح و سدیق ساڵح، دەزگای سەردەم، سلێمانی، ۲۰۰۲، ل٤٠–٤١).

[9] تاهیر بەهجەت کوڕی مەلامەحموود کوڕی مەلامحەممەدئەمینی مەریوانییه، ۱۹۰۲ له سلێمانی لەدایك بووه. وەزیفەی له بەیتالخانه دیوه. به کۆششی محەممەدئەمین زەکی بەگ، نێردراوه بۆ ئەمریکا بۆ خوێندنی پزیشکی. لەوێ ماوەتەوه و ۱۹۷۱/۱۰/۳۰ کۆچی دوایی کردووه. له ۱۹٤۸ بەدواوه بابەتی پزیشکیی له "گەلاوێژ" و "نزار" و "ژین"دا بڵاوکردووەتەوه (بڕوانه: گۆڤاری نزار ۱۹٤۸–۱۹٤۹، ئامادەکردنی ڕەفیق ساڵح و سدیق ساڵح، دەزگای سەردەم، سلێمانی، ۲۰۰۰، ل١٤–١٥).

لیستی چەوت و ڕاست بۆ هەڵەکانی کتێب ڕێك دەخرا و لە کۆتاییی کتێبدا دادەنرا، بەداخەوە لێرە هەڵەکان ڕاست نەکراونەتەوە و ئەم لیستەی بۆ نەکراوە.

نازانرێ ئەم دیوانە لە بەر چ دەستنووسێکدا ئامادەکراوە؟ ئەوەندە هەیە پێشتر هەر لەو ڕۆژگارەدا گۆڤاری "دیاریی کوردستان" ساڵی ١٩٢٥، لە چوارچێوەی پرۆژەیەکی فراواندا بۆ لەچاپدانەوەی دیوانی شاعیرانی کۆنمان، دەستپێشخەریی کردووە و بە دیوانی سالم، کە خوالێخۆشبوو "عەلیی باپیر ئاغا"ی شاعیر شیعرەکانیی کۆکردووەتەوە، دەستی پێکردووە و لە ژمارە (١٠)ی خۆیەوە فۆرمە فۆرمە (مەلزەمە) لەگەڵ هەر ژمارەیەکی بە ناوی (مولحەقی دیاریی کوردستان)ەوە بڵاوی کردووەتەوە، تا دواییی هەمووی بە کتێبێك بڵاو بکاتەوە. بەڵام -ئەگەرچی ئێمە هیچ مولحەقێکی ئەو گۆڤارەمان نەدیوە- وەستانی گۆڤارەکە لە ژمارە (١٦)ی ١ی مایسی ١٩٢٦ بەدواوە -جێی داخە- ئەم نیازەی پەكخستووە[10]. تۆ بڵێی ئەم نوسخەیەی (کم) لەسەر ئەو کۆکراوەیە ئامادە کرابێ؟!

ڕاستییەکیتریش ئەوەیە ئەو کاتە کە بارودۆخی کوردستان ئەوەندە نەشێوابوو، هەم نوسخەیتر لە ئارادا بوو، تا نوسخەیەکی بێ کەموکووڕی لە ئەنجامی بەراوردکردندا ئامادە بکرێ و هەم ئەو کەسانەیش کەم نەبوون کە شارەزای بە ئاسانی خوێندنەوەی دەستخەتی کۆن بوون، تا ڕێ نەدرێ هەڵەی زۆر بکەوێتە ئەم دیوانە.

**٩. نوسخەی (مینای شکستە)ی نەجمەدین مەلا:**

ئەم نوسخەیە کە بە (نم) ئاماژەی بۆ کراوە، سێیەم بەرگی کەشکۆڵی (مینای شکستە)یە، کە شیعر و ژیاننامەی زۆر شاعیری تێدا کۆکراوەتەوە. شیعرەکان (٨٨) پارچەن و (٤١) لاپەڕە (ل١٣٢-١٧٣)ی پێوانە (١٩,٧×٣١,٣ سم)یان گرتووەتەوە، لەوانە (٨٦) پارچەی کوردی و (٤)ی فارسیی تێدایە کە لە نوسخەکانیتردا نین و بە (چ، ن) دیاری کراون و ئەو کاتە (٨٤) پارچە بووە. خوالێخۆشبوو نەجمەدین مەلا[11]ی ئامادەکەری کەشکۆڵەکە وەك خۆی نووسیویە: ((زۆری

[10] بڕوانە: دیاری کوردستان ١٩٢٥-١٩٢٦، ئامادەکردنی ڕەفیق ساڵح، لێکۆڵینەوەی نەوشیروان مستەفا ئەمین و سدیق ساڵح، دەزگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠١- (ژمارە ١٠، ل٨).

[11] نەجمەدین کوڕی مەلا عەبدولغەفوور کوڕی مەلا عەلی کوڕی مەلا ئیبراهیمە و دەچێتەوە سەر پیرخدری شاهۆ. ١٩٠٢ لەدایك بووە. هەم قۆناغی سەرەتاییی قوتابخانە و هەم مەدرەسەی دینیی خوێندووە. عەرەبی و تورکی و فارسیی زانیون. خوێندەوارێکی چالاکی ڕۆژگاری خۆی بووە، لەپاڵ دەرزوتنەوە لە قوتابخانەی خۆماڵیی (کەشتیی نووح)دا، گەلێك دیوان و شیعری شاعیرانی کۆکردووەتەوە و نووسیوەتەوە، دیارترینیان (مینای شکستە) و (سۆزی نیشتمان)ە. نیسانی ١٩٦٢ کۆچی دواییی کردووە و سەرەتا لە گردی مامەیارە نێژراوە، پاشان لە ١٩٧٠دا براوەتە سەر چیای ئەزمڕ (جمال بابان، أعلام الکرد، ج١، ط٢، دار آراس- أربیل، ٢٠١٢، ص٥٩٢-٥٩٤).

ئەشعاری سالم کە لە دیوانە چاپکراوەکەیدا نییە [مەبەست ئەوەی کوردی - مەریوانییە]، لە کەشکۆڵێك وەرم‌گرتووە کە مەحموود پاشای جاف بە خەطی خۆی نووسیویەتیەوە. ئێستا ئەو کەشکۆڵە لای جەنابی مودیری جەریدەی "ژیان" حاجی تۆفیق بەگە- ۱۹٤۰/٤/۲٤)).

واتە ئەم شیعرانە لە ۱۹٤۰دا نووسراونەتەوە. بەڵام پاش تەماشاکردنی هەردوو بەرگی (کەشکۆڵی مەحموود پاشای جاف) کە (بنکەی ژین) ساڵی ۲۰۱٤ لەچاپی داوە، هیچ شیعرێکی "سالم"ی بە دەستخەتی مەحموود پاشا خۆی تێدا نەبینرا. بۆیە زیاتر ڕێی تێدەچێ مەحموود پاشا کەشکۆڵێکی‌تریشی هەبووبێ و ئەو شیعرانە لەوێدا نووسرابنەوە. ئەم نوسخەیە لەسەر پەڕەی خەتداری خورشیدیی پێوانە (۲۰,٥×۳۰,٥ سم) بەپێی زنجیرەی ئەلفوبێی دوا پیتی بەیتەکان نووسراوەتەوە. خەتەکەی خۆشخوێنە، بەڵام هەڵەی نووسین و چەوت خوێندنەوە و دەستکاریشی کەم نین.

**۱۰. نوسخەی پیرەمێرد:**

ئەم نوسخەیە کە بە (پ) ئاماژەی بۆ کراوە، هەر چاپەکەی (کم)ـە، (۳۱) پارچە شیعری‌تری "سالم" لە قەراغەکانی چەند لاپەڕەیەکیدا بە خەتێکی جوانی خۆشخوێن نووسراوەتەوە، لە چاپەکەدا نین. نوسخەکە لای خوالێخۆشبوو "دکتۆر مارف خەزنەدار" بوو، وێنەیەکی بۆ لێ‌گرتینەوە و ۲۰۰۹/۱۲/۲ بە سوپاسەوە بۆی ناردین. لە نامەیەکی ڕۆژی ۲۰۰۹/۱۲/۲یشیدا نووسیویە: ((دەستنووسینەکان بە خەتی پیرەمێردە، یادگارێکی ڕۆشنبیری دەگمەنە)). دەستخەتی ئەم شیعرانە لەتەك دەستخەتی‌تری حاجی تۆفیقی مەحموود ئاغای هەمزە ئاغای مەسرەف "پیرەمێرد"[۱۲] خۆی بەراورد کرا، دەرکەوت هەر "پیرەمێرد" ئەم شیعرانەی نووسیوەتەوە.

شایانی وتنە، ئەم نوسخەیە پێشتر لای بەڕێز "ئەحمەد حسێن ئەحمەد" بووە. ۱۹۷۲ داویەتە خوالێخۆشبوو "کاکەی فەللاح" کە شیعرە زیادەکانی نووسیوەتەوە و ئەمجا پێشکەشی "دکتۆر مارف خەزنەدار"ی کردووە. ساڵی ۱۹۷٤ "کاکەی فەللاح" ئەو شیعرانەی بە زنجیرە لە ژمارەکانی ڕۆژنامەی

---

[۱۲] حاجی تۆفیق "پیرەمێرد" (۱۸٦۷-۱۹/٦/۱۹٥۰): دەرچووی مەکتەبی حوقووقی ئەستەموولی بووە و وەزیفەی وەك قایمقامیتی و موتەسەریفیی دیوە. خاوەنی ئیمتیازی گۆڤاری "کورد تەعاون وە تەرەقی غەزەتەسی" و بەڕێوەبەری خولی چوارەمی ڕۆژنامەی "ژیان" و پاشان "ژین" بووە. نەخشی بەرچاوی لە زیندووکردنەوەی جەژنی نەورۆز و خزمەت‌کردنی قوتابخانەی (زانستی)دا بووە. دیوانەکەی و (دوانزە سوارەی مەریوان) و (مەم و زین) و (گاڵتەوگەپ) و (کەمانچەژەن) و (پەندی پێشنیان) و (پیەسی تەمثیلی مەحموود ئاغای شیوەکەڵ) و (ئاوەڕەشەی ڕووسی سوور) لە بەرهەمەکانی ئەون (جمال بابان، أعلام الكرد، الجزء الأول، دار آراس- أربيل، ۲۰۱۲، ص۱۳۳-۱۳٦).

"ڕۆشنبیری نوێ"دا بلاو کردووەتەوە[13]. لەبەرئەوەی وێنەی ئەم نوسخەیە کەوتە بەردەستمان، پێویست نەبینرا، بچینەوە سەر ئەوەی "کاکەی فەللاح".

جگە لەوە، "پیرەمێرد" شیعری "سالم"ی لە (٦٠) شەست ژمارەی ڕۆژنامەی "ژین"دا (نێوان سالانی ١٩٤٠-١٩٥٠) بەچاپ گەیاندووە. جاری وا بووە زیاد لە شیعرێکی لە ژمارەیەکدا، یا دوو یان سێ جار شیعرێکی دیاریکراوی هەر جارەی بە شێوەیەکی جیاواز بلاوکردووەتەوە. خالی جێی سەرنج ئەوەیە، کە پیرەمێرد بە ئەمانەتەوە ئەو شیعرانەی جێنەکردووەتەوە، بەلکوو دەستکاریی کردوون؛ هەر وشە و زاراوەیەك، یان بەیتێك، یاخۆ نیوەبەیتێکی بەدل نەبووە، گۆڕیویە و بە شێوازی خۆی دایڕشتووەتەوە و شیعری خۆیی بە هەمان مانا و ناوەڕۆکەوە خستووەتە جێ. بۆیە ئەم کۆمەلەی ناو ڕۆژنامەکە، ئەوانەیان نەبێ کە لە نوسخەکانیتردا نین، بە پێویست نەزانرا بەکاربهێنرێن، چونکە هیچ نەخشێکیان لە ساغکردنەوە و دەولەمەندکردنی (دیوانی سالم)دا نەدەبوو.

**١١. دیوانی سالم، عەبدولرەحمان بەگی صاحبقران، چاپی دووەم، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٧٢:**

ئەم نوسخەیە کە بە (گم) ئاماژەی بۆ کراوە، وەك دەردەکەوێ بە پلەی یەکەم پشتبەستوو بە چاپەکەی (کوردی- مەریوانی) ئامادە کراوە. کتێبەکە (١٧٠) لاپەڕەی پێوانە (١٦,٧×٢٣,٨٩سم)ە و (٢٢٤) پارچەشیعری لە دووتوێدایە، یانێ سێ پارچەی نوێی خستووەتە سەر ئەوانەی (کم). بەشی زۆری هەلەکانی چاپی (کم)ی دووبارە کراونەتەوە و -هەر لەوەبەتر- نوسخەیتری شیعرەکانی سالم لەم چاپەدا بەکارنەهێنراوە، تا لەو ڕێیەوە هەلەکانی پێشوو ڕاست بکرێنەوە. ڕەنگە تەنیابالێی خوالێخۆشبوو "گیوی موکریانی"[14]ی ئامادەکەری دیوانەکە، کە هەر

---

[13] بۆ درێژەی بەسەرهاتی ئەم نوسخەیە، بڕوانە: ئەحمەد حسێن ئەحمەد، دیوانی سالم و بۆنکڕووزی هەناسەیەك، گۆڤاری "پەیك"، سلێمانی، ژ١، ١٩٩٩، ل٨٩-٩٢.

[14] ناوی عەبدوڕڕەحمان کوڕی عەبدوللەتیفە، ١٩٠٠ لە شاری (مەهاباد) لەدایك بووە. خوێندنی سەرەتایی لە (حەلەب) تەواو کردووە و فێری عەرەبی و فەرەنسەیی بووە. بەشداریی دەرچوونی گۆڤاری "زاری کرمانجی"ی کردووە و لە ١٩٢٦ بەدواوە بووەتە بەڕێوەبەری ئیدارەخانەکەی. ١٩٢٩ گەڕاوەتەوە بۆ مەهاباد و کەوتووەتە کاری وێنەگری و وتنەوەی دەرسی فەرەنسەیی و ماوەیەك بەند کراوە. ١٩٣٣ هاتووتەوە ڕەواندز و ڕێ نەدراوە بمێنێتەوە، گەڕاوەتەوە بۆ مەهاباد. ١٩٣٨ دیسان هاتووەتە هەولێر و خەریکی وێنەگری بووە. پاشان (چاپخانەی کوردستان)ی دامەزراندووە و دەیان کتێبی کوردیی پێ لەچاپ داوە. سالانی ١٩٦٠، ١٩٦١ و ١٩٦٣ لەسەر چالاکیی کوردایەتی گیراوە و خراوەتە زیندان. ١٩٧٧/٧/٢٤ کۆچی دوایی کردووە. گیو، ١٥ بەرهەمی لەچاپدراوی هەن، کە زۆریان فەرهەنگن. ١٤ دیوانی شاعیرانی کۆنیشی بلاو کردووەتەوە. جگە لەوە، هەر خۆیشی گۆڤاری "هەتاو"ی سالانی ١٩٥٤-١٩٦٠ دەرکردووە و (١٨٨) ژمارەی لێ بلاو

خۆی ئەم کتێبە و کتێبەکانیتریشی ئامادە کردووە و چاپخانەکەیشی هەڵسووڕاندووە، هۆیەکی بەرچاوی ئەم ناتەواوییە بێ و نەپەرژابێ دیوانەکە دەڵەمەند بکا. سەرباری ئەوە، دەستکاریی هەندێ وشە و زاراوەیش لە ئەنجامی بە هەڵە خوێندنەوە و نووسینەوەیانەوە بەدی دەکرێ.

**١٢. دیوانی کوردی: مستەفا بەگی "کوردی"ی ساحێبقڕان، لێکۆڵینەوەی محەمەد مستەفا "حەمەبۆر"، بەرگی یەکەم و دووەم، دەزگای ئاراس– هەولێر، ٢٠١٠:**

ئەم دیوانە چەند پارچەشیعرێکی "سالم"ی تێدا بڵاو بووەتەوە، بە هەڵە بە ناوی "کوردی"یەوە تۆمار کراوە؛ ئەمانەن:

ئـ. قەوسی ئەبرۆوو موژەت تیر و کەمانە بە عومەر

نیگەهت قەیدی دڵ و نافەیی جانە بە عومەر ... تاد (ب١، ل١٤٦)

بەڵگەی خاوەنایەتیی "سالم" ئەوەیە کە لە نوسخەی (مان)دا هەیە، ئەوەی وا بەتایبەتی بۆ سالم خۆی نووسراوەتەوە. لە نوسخەکانی (ف، ق، کم، گم)یشدا هەیە.

ب. ئەی حاریث، ئەگەر دەوڵەت و جاه و حەشەمت بوو

دوڕڕ و گوهەر و لوئلوو و لەعل و درەمت بوو ... تاد (ب١، ل٤٣١–٤٣٢)

ئەم پارچەیە لە نوسخەی (مان) و نوسخەکانی (ن، حا، غ، کم، گم)یشدا هەیە.

پ. تا ڕەقیب حاضرە، بۆ من حەذەرە نەك سەفەرە

ئەو سەگە تا لە کەمین بێ، حەضەرم هەر سەفەرە ... تاد (ب١، ل٥٩٢)

نوسخەی (عا) هەر بە «از گفتهٔ سالم» نووسیویە و ئەو جۆرە داشۆرین و هەجووە لە شیعرەکانی "سالم"دا هەیە و شێوازی داڕشتن و وتنەکەیشی هەر لە هیی "سالم" دەچێ تا "کوردی".

ت. لە نووری لامیعی تەشتێکی ڕاگرت و وتی ڕوومە

بە دۆشا ئەژدەهای پڕنێشی ڕاکێشا، وتی موومە ... تاد (ب٢، ل٥٧–٥٨)

لە کاتێکدا ئەم پارچەیە لە نوسخەکەی (مان) و (عا، هـ، غ، ج، کم، نم، گم)ی لای ئێمەیشدا هەیە. گوایە ئەو پارچە شیعرە وەڵامی ئەم شیعرەی "سالم"ە، کە سەرەتاکەی ئەمەیە:

سەوادی قیرگوونشەبها لە نوسخەی عەنبەرینمووتە

سەراسەر ڕەونەقی دونیا لە عەکسی ئاینەی ڕووتە ... تاد (ب٢، ل٦٦)

ئەم پارچەیەیش جگە لە نوسخەی (مان)، لە (حا، عا، غ، ج، ق، کم، گم)یشدا هەیە.

---

کردووەتەوە (د. کوردستان موکریانی، گۆڤاری "هەتاو" پێشەکی و لێکۆڵینەوە، گۆڤاری "هەتاو"، بەرگی یەکەم/ بەشی ١، بنکەی ژین و دەزگای موکریانی، هەولێر، ٢٠١٠، ل٣٢–٣٥).

ج. دەك ڕەقیب تووشی بەڵایێ بی، نەجاتت قەت نەبێ

مانیعی وەصڵ و حەیاتم تۆی، حەیاتت قەت نەبێ ... تاد (ب۲، ل۲٦۷)

هەر چوار بەیتی لەو دیوانەدا هەیە، لە کاتێکدا سەرجەمی شیعرەکە هەر لە نوسخە تایبەتییەکەی "سالم" (مان) و نوسخەی (عا)یشدا هەیە.

جگە لەوە، ئەم دیوانە پارچەشیعرێکی ۹ بەیتیی تێدایە، کە لە هیچ نوسخەیەکی لای ئێمەدا نییە، وەك نووسراوە، وەڵامی شیعرێکی "کوردی"یە، لە کاتێکدا "سالم" لە زینداندا بووە. سەرەتاکەی بەمە دەستی پێ کردووە:

لە زیندانا کە بێهەمدەردم ئەمڕۆ

ئەسیری ناکەس و دڵبەردم ئەمڕۆ ... تاد (ب۱، ل٤۷۷-٤۷۸)

شیعرەکەی "کوردی"ش بەمە دەستی پێ کردووە:

لە کونجی بێکەسیدا فەردم ئەمڕۆ

زەلیل و زار و بێهەمدەردم ئەمڕۆ ... تاد (ب۱، ل٤۷۲)

لەپاڵ ئەوانەدا، ئەم دیوانە بۆنەی وتنی چەند شیعرێکی "سالم"یشی ڕوون کردووەتەوە کە وەڵامەشیعری بە هەمان کێش و سەروای "کوردی"یە:

چ. کوردی لە سلێمانییەوە ئەم شیعرەی ناردووە بۆ سالم لە (شێوەکەڵ)ی ناوچەی شارباژێڕ لە سلێمانی:

موشتاقە دڵم لەو دەمەوە چۆڵە مەقامت

بۆ بیستنی ئەشعاری پڕ و خۆشی کەلامت ... تاد (ب۱، ل۷۷)

وەڵامەکەی سالم بەم بەیتە دەستی پێ کردووە:

ئەی طاسی بەدەن، پڕ فەرەحی لەذذەتی نامت

وەی داغی دڵی خەستە نەمەكسوودی کەلامت ... تاد (ب۱، ل۸۰)

ح. سالم لە تارانەوە ئەم نامەشیعرییەی بۆ کوردی ناردووە، سەرەتاکەی ئەمەیە:

طەریقی عیشقت ئەر ون کەم، تەریقی دەشتی مەحشەر بم

قیامەت نامەوێ جەننەت، بەبێ تۆ گەر موخەییەر بم ... تاد (ب۱، ۳۰۱)

"کوردی"یش بەم شیعرە وەڵامی داوەتەوە، کە سەرەتاکەی ئەمەیە:

ئەگەر مەیلت لە دڵ دەرکەم، غەریبی کۆیی دولبەر بم

وەگەر ساتێ لە یادم چی، هیلاکی ئاهی ئەژدەر بم ... تا (ب۱، ۲۹٤)

خ. نامەیەکی شیعریی "کوردی" بۆ "سالم" کە لە سلێمانییەوە ناردوویە بۆ تاران و بەمە دەستی پێ کردووە:

ڕەفیقی کونجی میحنەت عاجزن هەر شەو لە نالێنم

گوریزانن لە بەر لێشاوی مەوجی بەحری ئەسرینم ... تاد (ب١، ٣٣٨)

وەڵامەکەی "سالم" کە لە تارانەوە ناردوویە بۆ سلێمانی، وا دەستی پێ کردووە:

ڕەفیقی گۆشەیی غوربەت هەراسانن لە نالینم

لە ئەشکی دیدە ئەمشەو باز لە خوێنا مەوجە بالینم ... تاد (ب١، ٣٤٢)

د. وەڵامی سالم بۆ هەواڵپرسییەکی "کوردی" بە شیعر:

جانانە حاڵی ئەم دڵە گەر جوستوجۆ دەکەی

مەشغووڵی ناڵەیە لە جودایی بە میثلی نەی

شیعرەکەی "کوردی"ش ئەمەیە:

شيّختني بهجرك والله يا صُبى

ڕەحمت برالە بۆ کەی و جەورت هەتا بە کەی؟! ... تاد (ب٢، ل٢٥٦)

مایەوە بزانین "سالم" کێیە؟

بەداخەوە ژیاننامەی بەشی هەرەزۆری شاعیران و ئەدیبان و زانایانی زوومان، نە لە کاتی خۆیدا خۆیان یا کەسانیتر نووسیویانە، نە دوای خۆیشیان کەسانێك هەبوون بیر لە شتێکی وەها بکەنەوە و دڵسۆزانە مشووری بخۆن. بۆیە کە دێینە سەر ئەو لایەنەیان، سەرنج دەدەین هیچێکی ئەتۆ لە بەردەستدا نییە کەلێنێکی ئەو ناتەواوییە بگرێتەوە و دەستبەتاڵ دەمێنینەوە. ژیاننامەی "سالم"یش بە هەمان دەرد چووە. ئەوەی هەیە، هەر ئەو کەمە زانیارییەیە کە (کوردی- مەریوانی) لە پێشەکیی چاپی (دیوانی سالم)دا نووسیویانە و دڵێش ئاوی پێ ناخواتەوە. ئەوان ئەم زانیارییانەیان لەبارەوە لە (لC-D)ی دیوانەکەیدا تۆمار کردووە:

«سالم، عەبدوڕڕەحمان بەگە، کوڕی محەممەد بەگی قەرەجەهەننەم کوڕی ئەحمەد بەگی صاحێبقڕان و ئامۆزای [مستەفا بەگی] "کوردی"یە. ئەڵێن لە پێشا لەقەبی "ڕەنجوور" و یەکێ ئەڵێ "بیمار" بووە. گوایە لەسەر تەکلیفی دوکتۆر لەقەبەکەی گۆڕیوە و کردوویە بە "سالم"، کە عەلامەتی ساغ‌وسەلیمیی بێ، چونکە سالم پیاوێکی لاواز و بێتاقەت و مات و بێدەنگ بووە و قەنگەکێش بووە.

وەکوو خزمەکانی ئەڵێن: "سالم" لە ساڵی ١٢٢٠ی هیجری [١٨٠٥-١٨٠٦] تەوەللودی بووە و لە ساڵی ١٢٨٦ی هیجری [١٨٦٩-١٨٧٠] وەفاتی کردووە. مەنشەئی فامیلیای صاحێبقڕان کوردستانی ئێرانە. فامیلیای "سالم" لەگەڵ "سالم"دا ئەغلەب ئەچوون بۆ ئێران بۆ سەردان

لە خزمەکانیان. بەڵام لەپاش ڕووخانی حکوومەتی بابان، لەگەڵ فامیلیاکەیا ئەچنە ئێران و لە تاران زۆر ئەمێننەوە. سالم وەڕس و بێزار ئەبێ لە تاران.

ئێمە شیعرمان بە ناوی "ڕەنجوور"ەوە نەدی، بەڵام بە ناوی "بیمار"ەوە هەیە، چونکە باش لێمان موحەققەق نەبوو، ئەم جارە عەلاوەی ئەم کتێبەمان نەکرد. کە بۆمان ساغ بووەوە، لە چاپی دووەمدا عەلاوەی ئەکەین. دایکی "سالم"، کچی "سلێمان ئاغای ئەلیاس ئاغا" بووە و پوورێکی ئەبێ، ناوی "ئاتەخان" ئەبێ، زۆر شاعیرەیەکی مەشهوور و پڕذەوق ئەبێ، وەکوو ئەڵێن: "سالم" لە سلێمانی وەفاتی کردووە و لای قەبری "مصطفا بەگی کوردی"یەوە نێژراوە)).

"نەجمەدین مەلا"یش لە دەستنووسی (مینای شکستە، بەرگی سێیەم، ل۱۳۲)دا نووسیویە: ((لەپاش ڕووخانی حکوومەتی بابان، سالم بە مەئمووریيەت لە لایەن حکوومەتی تورکەوە نێرراوە بۆ شاری (حیللە)، چەند زەمانێك لەوێ ڕایبواردووە و لەوێش وەفاتی کردووە و هەڵبەستێکی دووروودرێژیشی لەوێ وتووە، کە لەم کتێبەدا لە ئاتی نووسراوە، گلەیی لە ماڵە عارەبێك کردووە کە چۆتە ماڵیان و خزمەتیان نەکردووە)).

خاڵی جێی سەرنج ئەوەیە، وەك چۆن زانیاری سەبارەت بە ساڵانی ژیانی سالم لە وڵات و لە ئاوارەیی (تاران) و (سنە) لە بەردەستدا نییە، هیچ بەڵگەیەکی بێچەندوچۆنیش شك نابرێ ساڵی هاتنەدنیا و مەرگی سالم دیاری بکا. بۆیە ئەو مێژووانە کە (کەم) و سەرچاوەکانی دوایی نووسیویانە، زیاتر مەزەندە و لەیەکتروەرگرتن و متمانەی تەواویان پێ ناکرێ.

لە کۆتاییدا جارێکیتر سوپاسی هەموو ئەم دۆست و بەڕێزانە دەکەین کە بە هەر شێوەیەك بووە، بەدەنگمانەوە هاتوون و دڵسۆزانە هاوکارییان کردووین تا ئەم دیوانە بە ناوەڕۆکێکی بێکەموکووڕی و بە شێوەیەکی بەرزی هونەری بکەوێتە بەردەستی خوێنەواران.

محەمەدی مەلا کەریم

ئابی ۲۰۱۵

# پیتی (ئەلف)

## -١- (*)

هەر بە عەمدەن یاری من، بێپەردە، قامەت دەردەخا
مەحضی کیذبی موددەعای دەهری، قیامەت دەردەخا (١)
سیڕڕی عیشق و دڵبەخوێنبوونم بەسێ نۆشی، وەلێ
ئەشکی ئالوودەم لە ڕوودا بەس عەلامەت دەردەخا (٢)
تەرکی مەی بۆ من، بە جوز ئەفسوردەگی، نەفعی چ بوو؟
کاری بێمەعنا، چ زوو، شێوەی نەدامەت دەردەخا؟! (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە بەشی (غزلهای جدیدە)ی (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووفە.

(١) عەمدەن: عمداً، دەستەنقەست. قامەت: بالاّ. بێپەردە: بە ئاشکرا. مەحض: تەنیا بۆ ئەوە. دەهری: ئەوی باوەڕی بە ڕۆژی قیامەت نییە.

واتە: یارم بە ئەنقەست و بە ئاشکرا بەژن و بالاّی خۆی دەنوێنێ، بۆ ئەوەی لاف و گەزافی ئەو دەهرییانە دەربخا کە دەڵێن: قیامەت نییە. دەرکەوتنی بالاّی یار بە بەرپابوونی ڕۆژی قیامەت شوبهێنراوە، لەوەدا کە خەڵك هەموو دێنێتە جۆش و خورۆش.

(٢) بەسێ: زۆر. نۆشی: خواردەوە. وەلێ: بەلاّم. ئەشك: فرمێسك. ئالوودە: تێکەڵ بە شتیتر، لێڵ. بەس: تەنیا. عەلامەت: نیشانە.

واتە: من زۆر تالاّوی نهێنییەکانی عیشقم چەشتووە و دڵم خوێنی زۆری لەو پێناوەدا لێ تکاوە، بەلاّم فرمێسکی خوێنینم کە بە چاوەکانمدا دێتە خوارێ، تەنها نیشانەیەکی ئەو نهێنی و دەرد و ئازارانەم پیشان دەدا و ناتوانێ پەردە لە ڕووی هەمووی هەڵداتەوە و بیخاتە بەرچاو.

(٣) مەی: شەراب. بە جوز: جگە لە. ئەفسوردەگی: خەمباری، دڵتەنگی. نەدامەت: پەشیمانی.

واتە: نەخواردنەوەی مەی و وازلێهێنانی، لە خەمباری و دڵتەنگی بەولاوە، چ سوودێکی بۆ من هەبوو؟ بڕوانە کاری بێهوودە، چ زوو شێوەی پەشیمانی دەردەخا کە خەمبارییە.

**موقتەضای خوونڕێزییە چاوت کە بیمارە ئەبەد**
**خاصصە بۆ قاتیل، لە دونیا، حەق شەئامەت دەردەخا (٤)**
**من وتم: تیغی برۆت ساو دا بە قەصدی، ئەو وتی:**
**پیری عیشقە "سالم" و یەك یەك کەرامەت دەردەخا (٥)**

(٤) موقتەضا: ئەنجام، پێویست. خوونڕێزی: خوێنڕشتن. خاصصە: بەتایبەتی. بیمار: نەخۆش، مەبەستی بیماریی چاوی مەستی یارە. ئەبەد: هەمیشە. حەق: ڕاستی، خودا. شەئامەت: نەگبەتی.

واتە: هەمیشە لەبەر خوێنڕێژیتە وا خوێن بەری چاوتی گرتووە. ئەوی یەکێکی کوشتبێ، یا نیازی کوشتنیی هەبێ، لە کوردەواریدا لە بارەیەوە دەڵێن: خوێن بەری چاوی گرتووە. لەبەرئەوە خودا لە دنیادا -بەتایبەتی- نەگبەتی بەسەر بکوژدا دەهێنێ.

(٥) ساو دا: لە هەسانی دا، تیژی کرد. بە قەصدی: بە دەستئەنقەست. پیر: شێخی تەریقەت. کەرامەت: ئەو کارە لەعادەتبەدەرەیە کە پیرانی تەریقەت پیشانی دەدەن.

واتە: بە یارم وت؛ تۆ بەتایبەتی شیری برۆت تیژکردووە و ئامادەی شەڕی. لە وەڵامدا وتی: دیارە "سالم" شێخی تەریقەتە و کەرامەتی هەیە؛ ڕاست دەکا.

## -٢- (*)

**دەزانی باغی بەختی ئەهلی دڵ بۆ قەت ثەمەر نادا؟**
**فەلەك هەرگیز موورادی مەردومی صاحێبهونەر نادا! (١)**
**دەزانم تا لە شیشەی دیدەما بێ، ئەشکی ئالوودەم**
**شەرابی (جەی) لە جاما ڕەونەقی خوێنی جگەر نادا (٢)**
**نەکەن تا لەتلەتم، بۆسەی نیهانت، ڕاسْتی نالێم**
**بەڵێ، قەفقەف هەتا نەی نەیبڕی، حاصڵ شەکەر نادا (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، غ، ق، کم، نم، گم)دا هەیە.
کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.
(١) ثەمەر: بەری درەخت. فەلەك: چەرخی گەردوون. مەردوم: خەڵك. صاحێب: خاوەن.
واتە: تۆ دەزانی باخی بەختی خاوەنددڵان، یانێ دڵداران، بۆچی هەرگیز بەرناگرێ و ئەوانە مرازیان بەدی نایێ کە گەیشتنیانە بە یارەکانیان؟ چونکە خاوەنددڵان هونەرمەندن و چەرخی گەردوونیش هەرگیز نیاز و ئارەزووی هونەرمەندان ناهێنێتە دی.
دەزانی (نم): ئەزانی.
(٢) ئەشك: فرمێسك. ئالوودە: تێکەڵ، لێڵ. جەی: گەرەکێکی شاری ئەسفەهانە، بە دروستکردنی شەرابی نایاب بەناووبانگە، ڕەونەق: گەشی و جوانی.
واتە: تا فرمێسکی خوێنینم لەناو پیاڵەی چاومدا بێ، شەرابی نایابی گەرەکی (جەی)ی شاری (ئەسفەهان) لەناو جامدا ڕەنگی خوێنی جگەر نادا و بە ڕەنگی خۆی دەرناکەوێ، چونکە ڕەنگی جامەکە وەردەگرێ.
تا (کم، گم): تۆ. دیدەما (ق): دیدە و. بێ (نم): بی. ئەشکی (گم): ئەشك. جەی (نم، گم): حوب (کم): حبی.
(٣) بۆسە: ماچ. نیهان: نهێنی. نەی: قامیشی شەکر. حاصڵ: بەر.
واتە: تا لەتوپەتم نەکەن، ڕاستیی ماچی نهێنیت نادرکێنم. من وەك قامیشی شەکر وام، کە تا قەفقەف نەبڕێ، شەکری لێ وەرناگیرێ. جوانە، ماچە پەنهانەکەیی شوبهاندووە بە شەکری ناو قامیشی شەکر.
نیهانت (ق): نیهانیت.

**له من دانا نه‌پرسێ، باڕه‌وْش، هه‌رگیز له ڕێی عیشقا**
**بزانێ کیمْیا هه‌ر که‌س، سه‌ری ببڕن خه‌به‌ر نادا (٤)**
**ڕه‌گی دڵ دێته جونبوش گاهی فه‌صدی لێوی مه‌رجانت**
**ده‌له‌رزێ ده‌ستی فه‌صصاد و نه‌مه‌ك ڕێی نێشته‌ر نادا (٥)**
**له‌بی تیشنه‌ی کوهه‌نزه‌خمم به خوێنی تازه که‌ی ته‌ڕ بێ؟**
**حه‌یا بۆ ماهی مه‌ستوورم که ده‌ستووری نه‌ظه‌ر نادا (٦)**
**له پایا کۆمه‌ڵی لوولوویی ئه‌شك، ئه‌ر تا که‌مه‌ر بێنم**
**ڕه‌هی ده‌ستی خه‌یاڵیشم به قه‌دیا، وه‌ك که‌مه‌ر، نادا (٧)**

(٤) دانا: ژیر. باڕه‌وش: تیژڕۆی وه‌ك با.

واته: پیاوی ژیر و زانا که ڕێی عیشقی گرتووه‌ته به‌ر و ده‌یه‌وێ وه‌ك بای تیژڕۆ بێت، ڕاز و نیازی عیشق له من بپرسێ و بزانێ، با نه‌یێ له‌و باره‌وه پرسیارم لێ بکا، چونکه ڕاز و نیازی عیشق وه‌ك زانستی کیمیا وایه، که ده‌ڵێن: ئه‌وی بیزانێ، ده‌توانێ مه‌عده‌نه ناچیزه‌کان بکا به زێڕ. ئه‌وی کیمیاگه‌ر بێ و کیمیا بزانێ، سه‌ریشی ببڕن ئه‌و ڕاز و نیازانه بۆ که‌س ده‌رناخا، بۆیه منیش ڕاز و نیازی عیشق به‌و ناڵێم.

باڕه‌وش (نم): یاڕه‌وش. هه‌ڵه‌یه. له ڕێی عیشقا (ق): له سیڕڕی عیشق.

(٥) جونبوش: له‌رزین. گاهـ: کات. فه‌صد: خوێن‌گرتن، که‌ڵه‌شاخ‌گرتن، مه‌به‌ست له مژینی لێوی یاره! مه‌رجان: گه‌وهه‌رێکی ڕه‌نگ‌سووره. فه‌صصاد: خوێنگر، مه‌به‌ستی عاشقه. نه‌مه‌ك: خوێ، یاخۆ سوێر و سوێرییه، ئه‌ڵبه‌ت خوێ ڕێی خوێن ده‌گرێ.

واته: عاشق بیه‌وێ لێوی ئاڵی یار بمژێ، ڕه‌گی دڵی دێته له‌رزین. ده‌ستی که‌ڵه‌شاخگر، عاشق، له ترساندا ده‌له‌رزێ و خوێ ڕێی نه‌شته‌ری لێ ده‌گرێ. به‌و پێیه، لێوی یار له‌به‌ر ناسکی خوێنی لێ دێ؛ له‌بریتیی ئه‌وه‌ی ده‌می عاشق شیرین بکا، سوێریی پێ ده‌به‌خشێ.

فه‌صدی (کم، نم، گم): قه‌صدی. مه‌رجانت (ق): مه‌رجانی.

(٦) له‌ب: لێو. تیشنه: تینوو. کوهه‌نزه‌خم: له کۆنه‌وه زامدار، کۆنه‌برین. حه‌یا: شه‌رم. ماه: مانگ. مه‌ستوور: داپۆشراو. ده‌ستوور: فه‌رمان، ڕێگادان.

واته: که شه‌رم وه‌ك هه‌ور ڕوومه‌تی به شێوه‌مانگی یار داپۆشێ و ڕێی نه‌دا نیگایه‌کی تازه‌م لێ بکا، که‌ی لێوی تینووی له کۆنه‌وه زامداری من جارێکی‌تر به خوێنی تازه ته‌ڕ ده‌بێته‌وه؟!

تازه که‌ی (نم، گم): تازه‌گی.

(٧) له پایا: له به‌رپێدا، له پێناویدا. لوولووی ئه‌شك: دڵۆپه فرمێسکی وه‌ك دانه‌ی مرواری.

**به حاڵی نامورادیی من وەها موشتاقە مەعشووقم،**
**لە طوڕڕە بۆ نەوا بێنێ، ڕەهی بادی سەحەر نادا (٨)**
**لە فیکری پاسی عیصمەتدا بە ظاهیر دوورْبینێکە**
**لە حوکمی دوورْبینا قەد بە من ڕێگەی گوزەر نادا (٩)**
**سییەهبەختی جودا ناکا دڵی "سالم" لە طوڕڕەی تۆ**
**بە مەحضی کەشمەکەش سەرڕشتەیی ئەم کارە بەرنادا (١٠)**

ئەر: ئەگەر. کەمەر: پشتێن، ناوقەد. ڕەهـ: ڕێ.

واتە: ئەگەر ئەوەندەیش فرمێسکی بەنرخ لە بەرپێی یاردا، یا لـە پێناویدا، برێژم کە بگاتـە ناوقـەدی، هێشتا ڕێی دەستی نەك هەر ڕاستەقینەم، تەنانەت دەستی خەیاڵیشم، نادا وەك پشتێن بە قەدیدا بێتەوە!

لـە پایا (ق): بە گریە. لوولوی (حا، غ): لوئلووی.

(٨) ئەم بەیتە لـە (حا، نم)دا نییە.

نامورادی: بەهیوانەگەیشتن. بۆ: بۆنوبەرامە. نەوا: نەبادا، نەوەکا. ڕەهـ: ڕێ.

واتە: دڵبەرەکەم ئەوەندە بە تاسەوەیە بۆ نامورادی و بەدبەختیی من، ڕێی بـای بـەیانیانیش نـادا بەلایدا گوزەر بکا، نەوەکا بۆنی ئەگریجەیم لـەگەڵ خۆیدا بۆ بهێنێ.

لـە طوڕڕە (غ): لـە طوڕڕەی.

(٩) ئەم بەیتە لـە (حا، کم، نم، گم)دا نییە.

عیصمەت: داوێنپاکی. (دووربـین)ی یەکـەم: دنیادیـدە و شـت زۆر لێکـدەرەوە. (دووربـین)ی دووەم: ئەو ئامێرەیە کە دوور نزیك دەخاتـەوە بـۆ چـاوی مـرۆڤ. قـەد: قـەت، هـەرگیز. حـوکم: کارکردن و بڕشت.

واتە: یار بە ڕواڵەت زۆر بە وردی پاسی داوێنپاکی دەکا، بەقەدەر ئەوەی کە دووربـین بڕدەکـا و ناهێڵێ بە لایدا گوزەر بکا و لێی نزیك ببێتەوە.

باسی (ق): پاسی.

(١٠) سییەهـ: سیا، ڕەش. سیـەهبەختی: چارەڕەشـی، بەدبـەختی. جـودا: جیـا. طـوڕڕە: زوڵـف، ئەگریجە. سەرڕشتە: سەرەداو، جەمسەر.

واتە: چارەڕەشی هەرگیز دڵی سالم لــە ئەگریجـەی ڕەشـی تـۆ جیـا ناکاتـەوە، بـەختی ڕەشـە و گیرۆدەی داوی ڕەشە، سەرەداوی ئـەم عیـشقە تـەنیا بـە بگرەوبـەردە و ڕەنجێکـی ڕووت بـەرنادا؛ سەرێکە هێناویەتی و نایگێڕێتە دواوە!

## -٣- (*)

لە ڕازی دڵ، ئەگەر تیرت خەبەر دا
دەدەی دەستی نیگارینت بە سەردا (١)
شەطی خوێن دێ بە ڕووما، گەر لەتی جەرگ
دەمی ڕێگەی پلووسکی دیدە بەردا (٢)
قوبووڵ نابێ حەجی کەعبەی ویصالت
ئەگەر دڵ حەلقەیی ئەو زوڵفە بەردا (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، ف، غ، ق، ڕ، کم، نم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) ڕاز: نهێنی. تیرت: تیری چاوت، یا تیری برژانگت. نیگارین: ڕەنگین، مەبەست ڕەنگی ئاڵە.

واتە: ئەو تیرەی تۆ گرتتە دڵی من و گلاندمی، ئەگەر نهێنی دڵسۆزیی دڵمت پێ بلێ و ئاگادارت بکاتەوە کە چ دڵێکت کوشتووە، دەستی بە خوێن ڕەنگینت بە سەردا دەدەی و دەڵێی: ئای! چیم بە خۆم کرد و چ یارێکم لەدەست خۆم دا؟ ئای چ کۆستێکم کەوت؟!

ڕازی (عا): ڕەزای.

(٢) پلووسك: ئاو کە لە بەرزاییەکەوە بە لوولەیەکی دار یا تەنەکە یا هەر شتێکی وادا بێتە خوار، بۆ ئاوەکەیش و بۆ لوولەکەیش بەکاردەهێنرێ. بەردا: بەربدا.

واتە: ئەگەر لەتی جەرگی پارچەپارچەبووم دەمی پلووسکی گریانی خوێناویی چاوم نەگرێ، جۆگەی خوێن بە چاومدا دێ. زۆر جوانە؛ هەم جەرگی لەت‌لەتە و هەم خوێن لە ڕێیەکیترەوە بە چاویدا دێت و دەبێتە ئاوی ڕەوان.

گەر لەتی (حا، کم، گم): لەت‌لەتی. دەمی (کم، گم): دەبێ.

(٣) ئەم بەیتە لە (حا)دا نییە.

ویصال: بەیارگەیشتن. حەلقە: ئەڵقە، قوڵف.

واتە: وەك چۆن دەبێ موسوڵمان لە حەجیماڵی خودادا دەست بە ئەڵقەی دەرگای کەعبەوە بگرێ، چونکە لای وایە -ئەگەر وا نەکا- حەجەکەی قوبووڵ نابێ. دەبێ منیش دەست بە ئەڵقەی ئەگریجەی یارەوە بگرم، تا پێی بگەم و عیشقەکەم قوبووڵ بێ.

نابێ (ف): ناکا.

ئەوەند عوقدەی نیهانم کەوتە ناو دڵ
دەترسم مایەیی ئەم دەردە دەردا (٤)
لە جێی تیرت دڵم دەردێ لە سینەم
بە ئیستیقبالی تۆ، گەر بێی لە دەردا (٥)
دەڵێم وەك قامەتت دڵگیرە سەرویش
ئەگەر سێب و گول و سونبول ثەمەر دا! (٦)
لە بیمی جەور و ئومێدی تەرەحوم
دەلەرزێ دڵ لە حالاتی نەظەردا (٧)

(٤) عوقدە: گرێ، گرێی دڵ. نیهان: پەنهان، نەدرکاو. مایە: مەهەك؛ پاشـماوەی هەندێ نـەخۆشی بە شێوەی برین لـە لـەشی مرۆ دەردەچـێ، لـە کوردەواریدا بەو برینە دەڵێن (مەهـەك). دەرد: نەخۆشـی. دەردا: دەربدا، بیداتە دەر.

واتە: ئەوەندە گرێکوێرەی نهێنی لـە دڵمدایە، دەترسم لـە ئەنجامدا مەهەکەکەی ببێتە برین و دەربێ.

نیهانم (ف): نەهاتم. ناو (ق): سەر.

(٥) لە دەردا: لـە دەرەوە، لـە دەرگاوە یا لـە کاتی دەرد و ئازاردا.

واتە: ئەگەر لـە دەرەوە بێی، یا لـە کاتی دەرددا بێی بۆ سـەرلێدانم، دڵم لــە جێتیرەکانتــەوە کــە وان بە سنگمەوە، بۆ پێشوازیلێکردنت دێتەدەر، چونکە ئەوەندە تـیرت گرتووەتــە سـنگم، لــەتت کردووە و دڵم بەدەرەوەیە. ئای چ وەفایەکە؟!

تیرت (غ): دەردت.

(٦) سێب: سێو، یانێ مەمکی یار. قامەت: بەژن و باڵا. سونبول: گیایەکی بۆنخۆشە. مەبەسـت لـە گوڵ ڕوومەت و کوڵم و لـە سونبول زوڵفی یارە.

واتە: دەڵێم: سەرو وەك بەژن و باڵات دڵگیر دەبوو، ئەگەر ئەویش وەك باڵای تـۆ سـێو و گـوڵی ڕوومەت و سونبولی زوڵفتی پێوە بووایە! بەڵام کوا، حەددی چییە؟

(٧) بیم: ترس. ئومێد: هیوا.

واتە: کە نیگای چاوی جادووتم تێدەگری، دڵم لـە ترسی ستەم و بە هیوای بەزەییت دێتە لــەرزین؛ نازانم کامیان دەبێ، بەو پێیە کەوتوومەتە نێوان هەردوو حاڵەتی ترس (خوف) و تکا (رجا)وە.

جەور (ف): لوطف. لە حالاتی (عا): کالاتی. هەڵەی نووسینە.

**ڕەوانم بێ نیثاری بەرقی شەمشێر**
**ئەگەر بۆ کوشتنی "سالم" خەبەر دا (٨)**

(٨) ڕەوان: گیان. نیثار: نثار، پایەنداز، پێشکەش، شتێکی بەنرخ کە کاتی هاتنی کەسی بەڕێز و خۆشەویست لە بەرپێدا فڕێدەدرێ یا دەڕژێنرێ.

واتە: گیانم پایەندازی برووسکەی شمشێری دەست بێ، ئەگەر خەبەری کوشتنی خۆمم بداتێ. زۆر جوانە؛ شمشێرەکە برۆی ڕەشی بریسکەداری یارە! لێرەدا خۆی برووسکەی مژدەی کوشتنەکە دێنێ و هەر خۆیشی دەیکوژێ.

نیثاری (عا): مساری. هەڵەیە. کوشتنی (کم، گم): کوژتنی.

-٤- (*)

**مایلە، وەك سەری زوڵفت، سەری من بۆ بەری پا**

**بە جەفا مەیخەرە لا، سا صەنەما! تووبی خودا (١)**

**زێوەری حوسنی دڵارامە، سەوادی خەمی زوڵف**

**نانوێنێ، کە نەبێ ظوڵمەتی شەو، شەوقی چرا (٢)**

**عوذری مەسمووعە، عەیادەت نییە گەر عادەتی ئەو**

**پێی نیگارینی لە بەندایە بە زەنجیری حەیا (٣)**

**عوجبە ئاهیستەخەرامی بە طەرەف ئێمەوە، یا**

**بارە بۆ پەنجەیی پێی نازکی تۆ، ڕەنگی حەنا؟! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لـە (مان، حا، عا، ف، غ، ج، ق، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) واتە: وەك چۆن سەری ئەگریجەت شۆڕ دەبێتەوە و مەیلی بەرەوخوار دەکا، سـەری منـیش وا خوار دەبێتەوە، بەڵام بۆ بەری پێت، حەز دەکا بکەوێتە ژێری پێت. سا تـووبی خـودا، ئـەی بتـە شۆخەکەم! بە ستەم سەرم لـە بەرپێی خۆت لامەدە و بە دوورخستنەوە ئازاری پێ مەگەیێنە.

پا (عا): پات. هەڵەیە. (کم): با. هەڵەیە. مەیخەرە (غ): مەمخەرە. تووبی (ق): بەهری. (گم): تۆبی.

(٢) دڵارام: دڵئارامکەرەوە، یار. خەم: پێچولوول.

واتە: پێچی ئەگریجەی ڕەشی یار جوانییەکەی زیاد دەکا و دەیرازێنێتـەوە و ڕوخـساری جـوانتر دەنوێنـێ. بـەڵێ، ئەگـەر تـاریکیی شـەو نـەبێ، شـەوقی چـرا کـەی دەنوێنـێ؟! چـرا لـە ڕۆژدا ترووسکاییەکی زۆر کزی هەیە.

زوڵف (عا): زوڵفت. نیوەبەیتەکەی پێ لەنگ دەبێ. خـەمی (ق): سـەری. دڵارامـە (ف، ج): دڵئارایە. واتە دڵڕازێنەوەیە، جوانترە.

(٣) عوذر: بەهانە. عەیادەت: سەردانی نەخۆش. نیگارین: نەخشێنراو. بەند: زیندانی، گیراو.

واتە: یار، ئەگەر نەریتی ئەوەی نییە سەر لە نەخۆش بـدا، لێـی مـەگرن؛ بەهانـەی هەیـە، پێـی نەخشینی بە زنجیری شەرم بەند کراوە و شەرم دەکا خەڵك پێی بە خەنەوە ببینن!

عەیادەت (گم): عیبادەت. ئەو (ق): ڕوو. گەر عـادەتی (غ): گـەرتی. هەڵـەی نووسـینە. لـە بەندایە (ق): لە بنیایە.

(٤) عوجب: لەخۆبایی‌بوون. ئاهیستە: ئارام، لەسەرخۆ. خەرام: لەنجە. حەنا: خەنە.

**بووە، ئەزبەسکی نەزارم لە فیراقی مەهی ڕووت**
**وەکوو ئەبرۆیی هیلالت، قەدم، ئەنگوشتْنوما! (٥)**
**میهری جانانە هوەیدایە لەسەر خاکی لەحەد**
**لە موقابیل دڵی "سالم"، دەڕْوێ میهری گیا (٦)**

واتە: ئەوە چییە کە ئارام و لەسەرخۆ بە لارولەنجە بەرەو لای ئێمە دێی؟ خۆت بە گەورە دەزانی؟ لە خۆت بایی بووی؟ یا ڕەنگی خەنە بارێکی قورسە بەسەر پەنجەی پێتەوە، ناتوانی خێرا بێی؟!

عوجب (گم): عەجەب! خەرامی (گم): خەرامێ. ئێمەوە، یا (کم): ئێمە و یا. (گم): ئێمەوە با. (بە طەرەف) لە (غ)دا کەوتووە. تۆ (ج، غ، ڕ): ئەو.

(٥) ئەزبەسکی: (ازبس‌کە-ازبسکە)ی فارسییە، لەبەر زۆری. نەزار: لاواز. مەه: مانگ. هیلال: مانگی یەکشەوە. قەدم: باڵام. ئەنگوشت‌نوما: پەنجەبۆڕاکێشراو، بە پەنجە ئیشارەت بۆکراو، لە فارسیدا -وەك بورهانی قاطیع دەڵێ- زیاتر بۆ بەدناوی بەکار دەهێنرێ، بەڵام سالم لەگەڵ هیلالدا بەکاری هێناوە: وەك چۆن بە پەنجە ئیشارەت بۆ مانگی یەکشەوە دەکرێ و ئەوەندە باریکە بە هەزارحاڵ بەرچاو دەکەوێ.

ئەگەر بەیتەکە بکەینەوە بە پەخشان وای لێ دێ: قەدم بووە وەکوو ئەبرۆی هیلالت، ئەنگوشت‌نوما ئەزبەسکی لە فیراقی مەهی ڕووت نەزارم!

واتە: باڵام ئەوەندە لە دەردی جیابوونەوەی ڕوخساری وەك مانگت چەماوە و لاواز بووە، وەك هیلالی برۆت چەماوە و باریکم و بە پەنجە ئیشارەتم بۆ دەکرێ و دەدۆزرێمەوە!

بووە (گم): بۆیە. هەڵەیە. قەدم (ق): قەدەم.

(٦) میهر: خۆشەویستی. جانانە: یار. هوەیدا: ئاشکرا و دیاری. لەحەد: گۆڕ. دەڕوێ: سەوز دەبێ.

واتە: نیشانەی خۆش‌ویستنی یار لە گۆڕیشدا لێم جیا نابێتەوە، خۆشویستن لە عاستی دڵم لەسەر گۆڕەکەم دەڕوێ و دەبێتە سەوزە!

دەڕوێ (کم): ئەڕوێ. کێشەکە (لەحەد)ی پێ دەوێ، دەنا (لەحد) ڕاستە.

-٥- (*)

گەر بە بۆ نیسبەتی طوڕڕەت بدەمە میشکی (خەتا)
بۆ (خەتا) فەخرە بەسا، بۆ منە بەس خەبط و خەطا (١)
شێوەیی ئەبرۆیی طاقت، هەمە جا، دێتە نەظەر
دەگەڕێ دڵ بە طەرەف تۆوە وەکوو قیبلەنوما (٢)
کەی بە چەنگاڵی هەڵۆی غەم دەکەوێ، طایری دڵ
تا لە زاغی خەمی زوڵفت هەیەتی، ظیللی هوما (٣)
ئەبەدەن ڕەنگی عەدەم نایێتە ڕووی کوشتەیی عیشق
بە دەمی تیغی ستەمدا دەڕژێ، ئابی بەقا (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) بەسا: زۆر. خەبط: سەرلێتێکچوون و سەرەڕۆیی. خەتا: چینی باکوور کە (ناوچەکانی مەنگۆلیا و مەغۆلستان و تورکستانی ڕۆژهەڵات) دەگرێتەوە. خەطا: خەتا، هەڵە.

واتە: ئەگەر لە بۆنخۆشیدا بەراوردی بۆنی ئەگریجەت لەگەڵ بۆنی میسکی خەتا بکەم، زۆر شانازییە بۆ وڵاتی خەتا، بەڵام بۆ من هەڵەیە و سەرلێتێکچوون.

(٢) طاق: تاق، مەبەستی شێوەی کەوانەیی (هیلالی)یە. هەمە جا: لە هەموو شوێنێکدا.

واتە: شێوەی کەوانەیی برۆت لە هەموو شوێنێکدا لە بەرچاومە. بەڵێ، وەك میلی قیبلەنوما چۆن هەمیشە ڕوو لە قیبلە دەکا، دڵی منیش هەمیشە ڕووی لە برۆی تۆیە. میحرابی نوێژیش کەوانەییە.

طاقت (ق): جادووت.

(٣) زاغ: قەلەڕەش. خەم: پێچ. ظیل: سێبەر. هوما: پیرۆزە، باڵندەیەکە -گوایە- سێبەر بەسەر هەر یەکێکەوە بکا، دەبێتە پادشا!

واتە: دڵم، تا لەژێر سێبەری هومای ئەگریجەی ڕەشتدا بێ، هەڵۆی خەم نایگاتێ و چنگی لێ گیر ناکا. جێی هەمیشەیی دڵی "سالم" پێچولوولی ئەگریجەی یارە، خۆی تێدا شاردووەتەوە! ڕەشیی ئەگریجەی یاری شوبهاندووە بە ڕەشیی قەلەڕەش، کە نەگۆڕ و تاسەرە.

طایری دڵ (کم، گم): طائیری دڵ. ظیللی هوما (کم): ظیلل و هوما.

(٤) عەدەم: نەبوون، لێرەدا مەبەست مردنە. ئابی بەقا: ئاوی زیندەگانی کە -دەڵێن- ئەوی لێی بخواتەوە، نامرێ!

**له دو لا زوڵفی بەلاجۆ که به (لا) دەنوێنێ**
**نەفی مانەندی لەطیفیی ڕوخی جانانه دەکا (٥)**
**کەی، لەبەر طوڕڕە، دەگا دەستی خەیاڵم به ڕوخت؟**
**تۆ نەبی کێیه بکا دەستەیی سونبول به قەڵا (٦)**
**مورغی پڕوەحشەتی دڵ، ئەو شەوە، ئەمنییەتی بێ**
**له ڕوخ و طوڕڕەیی تۆ دەردەکەوێ دام و چرا (٧)**

واته: کوژراوی دەستی عیشق هەرگیز ڕەنگی مردن لـه ڕووی نانیشێ، چونکه ئاوی زینـدەگانی به دەمی تیغی ستەمی دەستی یاردا دادەچۆڕێ. خوێنەکه ئاوی زیندەگانییه. دیاره کوژران به دەستی یار، لـه لای عاشق نەمردنی هەمیشەییەتی. زۆر جوانه.

نایێته (گم): نایەته. ئابی (ق، کم، گم): ئاوی.

(٥) له دو لا: لــه دوو دیـوەوە، لــه دوو لاوە. بـەلاجۆ: بـەلاخواز، لــه دووی بـەلا گـەڕاو، نەگبەتیی خەڵکی مەبەسته. مانەند: هاوچەشن. جانانه: یار.

واته: ئەگریجەی شەڕفرۆش، که به هەردوو لای سەرەوە بۆ خوار تێی بڕوانی، وەك (لا)ی نـەفی دەنوێنێ. دەڵێ وێنەی ڕوخساری من لـه جوانی و ناسکیدا لـه دنیادا تاکه! ئەوە ڕەت دەکاتـەوە کـه ڕووی جوانی ئەو نموونەیەکی وەك خۆی لـه جوانیدا هەبێ.

زوڵفی (کم، گم): زوڵف. که (کم، گم): گه.

(٦) واته: کەی ئەگریجەت ڕێ دەدا، تەنانەت دەستی خەیاڵ و بیرم، نەك دەسـتی ئاسـایم، بـه ڕوخسارت بگا؟ کێیه لـه دنیادا، جگه لـه تۆ، ئەگریجـەی وەك دەسـتەگوڵی سـونبولی خـۆی بکاتـه قەڵای سەخت بۆ پارێزگاریی ڕوخساری؟!

بکا (کم): پکا. هەڵەی نووسینه.

(٧) ئەم بەیته لـه (ق)دا نییه.

مورغ: پەلـەوەر. وەحشـەت: تەنیایی. دام: داو. چرا: ڕوخساری یار.

واته: دڵی پڕ لـه هەستی تەنیاییم مەگەر ئەو شەوە ئەمین بێ و لـه داو نەترسێ، کـه ڕوومـەت و ئەگریجەی تۆ پێکەوە دەربکەون، چـونکه ڕوخسـارت چـرا و ئەگریجـەت داوە و لـەبـەر چـراکەدا دەبینرێ، ئەڵـبەت خۆی لـه قەرەی نادا!!

**نەقدی جان و دڵ و دین، پێشکەشی یەك نیگەهت،**
**گەر قوبووڵ کەی لە منی سووخْتەدڵ، ڕۆیی نەما (٨)**
**وەرە سا پەنجە لە خوێنی دڵی "سالم" بگْرە**
**ثەبتە ئەم ڕەنگە بە دایم، نییە وەك ڕەنگی حەنا (٩)**

بە دوور نازانرێ (چرا) هەر (چەرا)ی شوێنی لەوەڕان و مەبەستی دانەی خاڵ بێ. دیارە دانە و داو لەگەڵ ڕووناکیی ڕوخساریدا دەردەکەون.

بێ (حا، کم، گم): بوو. ئەگەر (بوو) بێ، دەبێ (دەردەکەوێ)یش (دەرکەوت) بێ! دام و چرا (کم، گم): دامی چرا.

(٨) واتە: ئەگەر دراوی گیان و دڵ و دین لە منی دڵسووتاو قوبووڵ بکەی، ئەوە دەمێکە پێشکەشی یەك نیگاتە، پێش ئەوەی لێمی وەربگری، ڕۆیی و بە فەتەراتدا چوو!

ڕۆیی (کم، گم): ڕووی. نەما (گم): نما. شێوەنووسی (مان): روی.

(٩) واتە: دەسا وەرە پەنجەت لە خوێنی دڵی سالم بگرە، بەوی بنەخشێنە، لە خەنەی مەگرە. یانێ بە خەنەی ڕەنگ مەکە، چونکە ڕەنگی خەنە تاسەر نییە و دەچێتەوە! جوانە.

سا (حا): سالم. بگرە (کم، گم): بکە ڕەنگ، یانێ: ڕەنگ بکە.

-٦- (*)

**هەر سەحەر دێنێتە یادم، کۆیی تۆ، موڵکی خەتا**
**نەفحەها دێنێ لە موشکینزوڵفی تۆ، بادی صەبا (١)**
**نەهری ئەشك ئەمشەو لە دیدەم وا بە خوڕ دەڕژایە ڕوو**
**دڵ لە سینەم تا سەحەر سەنگئاسیائاسا گەڕا (٢)**
**بەسکی هەر جا کوشتەیی تیغی مەحەببەت کەوتوون**
**کۆی دڵارامم لە خوێنا بوو بە دەشتی نەینەوا (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، غ، ق، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) کۆ: مەنزڵ و دەوروبەری. نەفحەها: بۆنە خۆشەکان.

واتە: هەموو بەرەبەیانێك، کە بای سەبا بۆنە خۆشەکانم لە ئەگریجەی میسکداری تۆوە بۆ دێنێ، مەنزڵ و دەوروبەری مەنزڵی تۆ وڵاتی خەتام دێنە یاد، دەڵێی بۆنوبەرامەی ئەوێیە.

دێنێتە (ڕ): دێتە. موڵکی تۆ (غ): کۆیی تۆ. خەتا (مان، عا، کم): خطا= خەطا، هەر (گم) (خەتا)ی نووسیوە. نەفحەها (ق، کم): نەفخەها. هەڵەیە. (پ): بێنی خۆش. موشکین (غ): موشکی. هەڵەیە.

(٢) سەنگئاسیا: بەرداش. ئاسا: وەك. سەنگئاسیائاسا: وەك بەرداش.

واتە: جۆگەی فرمێسکم ئەمشەو وەها بە خوڕ دەڕژایە سەر ڕوومەتم، دڵ لەناو سنگمدا وەك بەرداش بەو جۆگەیە دەگەڕا و دەسووڕایەوە!

نەهری ئەشك .. تاد (ق): نەهری ئەشك .. دەڕژا لە ڕووم. (کم): نەهری نەشك ئەمشەو لە دیدەمدا بە خوڕڕەم دەڕژێتە ڕوو. لەنگە. (گم): نەهری نەشك ... دەڕژێتە ڕوو.

(٣) بەسکی (بسکە): ئەوەندە زۆر. هەر جا: لە هەموو شوێن. نەینەوا: مووسڵ، لەمێژە بە شاری دوو بەهار (أم الربیعین) ناوی دەرکردووە، چونکە پایز زوو دەبارێ و گیا و گوڵ شین دەبن. ئەوە بەهارێك و بەهاری پاش زستانیش دووەم بەهارە. لەبەرئەوەی مەبەست کوشت و کوشتارە، (کەربەلا) لە (نەینەوا) گونجاوترە، چونکە بە شوێنی شەهیدان ناسراوە.

واتە: کوژراوەکانی تیغی عیشق ئەوەندە زۆرن و لە هەموو لایەك کەوتوون، دەوروبەری مەنزڵی یارم وەك دەشتی کەربەلا بە خوێنی کوژراوان هەمیشەبەهارە و بە گوڵی سوور ڕازاوەتەوە.

بەسکی هەر جا .. تاد (پ): هێند برینداری مەحەببەت وا لە ڕێدا کەوتووە. لە خوێنا بوو (ق): لە خوێندا بوو. (ڕ): لە خۆیا بوو. (پ): بە ناڵە بوو. نەینەوا (کم، گم): کەربەلا.

**چەسپە هەر جا ڕیشەیی جەرگم لەگەڵ ڕیشەی خەدەنگ**
**چەند بە چوستی تیری موژگانت لەناو دڵما ڕووا (٤)**
**نائُوێنێ، گەر بەسەرما بێ موصیبەتهایی چەرخ**
**تا لەسەر سەرمە، لە سایەی زوڵفی تۆ، پەڕڕی هوما (٥)**
**بێت و سەیری چینی زوڵفت کا لە دەوری عاریضت**
**هەر کەسێ نەیدیوە تاریکی لەبەر شەوقی چرا (٦)**
**من دەمێکە خۆ لە خووی یاری قەدیمم شارەزام،**
**دوشمنی یارانی دێرینە و بە دوشمن ئاشنا! (٧)**

(٤) خەدەنگ: تیرێکە لە داری سەختی خەدەنگ دروست دەکرێ. بە چوستی: بە گورجی، زوو.

واتە: ڕیشەی تیرت لە هەموو لایەکەوە لەگەڵ ڕیشەی جەرگمدا چەسپە و پێکەوە لکاون. تیری برژانگت چ گورج ڕەگی لە دڵمدا داکوتا و سەوز بوو؟!

بە چوستی .. تاد (ق): چەند بە چوستی تیری موژگانت لەنێو دڵما ڕووا.

(٥) ئەم بەیتە لە (ق)دا حەوتەمە.

موصیبەتها: کۆی موصیبەت، نەهامەتی و نەگبەتیی زۆر.

واتە: تا لە سایەی ئەگریجەی تۆوە پەڕی پیرۆزە لەسەر سەرم بێ و بەختیار بم، ئەگەر هەموو دەرد و بەڵای دنیا بەسەرمدا بارێ، هیچ نانوێنێ و باکم نییە.

گەر بەسەرما (عا، غ، ڕ، کم، گم): بەسەرما گەر. موصیبەتهایی (عا، ڕ): موسیبەتهایی. سەرمە (غ، ق): دڵمە. زوڵفی تۆ (ق): زوڵفتا. پەڕڕی (غ، ق، ڕ، کم، گم): باڵی. گونجاوترە.

(٦) عاریض: ڕوخسار.

واتە: هەر کەسێك تاریکیی لەبەر شەوقی چرادا نەدیوە، لە کاتێکدا تاریکی و شەوق پێکەوە نایانکرێ؟! با بێت و بڕوانێتە چینچینی ئەگریجەی ڕەشت، کە چۆن دەوراندەوری ڕوخساری پرشنگدارتی داوە.

بێت و سەیری چینی زوڵفت کا (کم، گم): بێت و سەیری حوسنی زوڵفت کا.

(٧) واتە: لای من شتێکی سەیر نییە، دەمێکە شارەزای خوو و ڕەوشتی دۆستی دێرینی خۆمم، کە دوژمنی یارە دێرینەکانی و دۆستی ناحەزەکانیەتی.

دەمێکە (عا): دیکە. هەڵەی نووسینە. دوشمنی (کم، گم): دوژمنی. یارانی (عا): یاری! دوشمن (کم، گم): دوژمن.

**غەرقی بەحری عیشقە "سالم"، دەست و پای جوهدی نییە**
**قەد شەنا ناکا لە دەریادا کەسی بێدەستوپا (٨)**

(٨) قەد: قەت، هەرگیز. شەنا: مەلە.

واتە: سالم لە دەریای عیشقدا نوقم بوو و تێداچوو، چونکە دەست و پێی لە کار کەوتووە و هێزی تێدا نەماوە. بەڵێ، ئەوی دەست و پێی نەبێ، ناتوانێ لە دەریادا مەلە بکا.

بەحری عیشقە (کم، گم): بەحری فیکرە. قەد شەنا ناکا .. تاد (کم، گم): قەت .. تاد.

## (*) -٧-

**شەهیدی دیدەیی مەخمووری شۆخێکم، منی شەیدا**
**لە خاکی مەشهەدم نەزدیکە بڕوێ، نێرگسی شەهلا (١)**
**بە مەحضی ئیمتیحان دەستم بنێنە باخەڵت یەکدەم**
**لە بندا بیبڕن ڕاضیم، ئەگەر نەمبوو یەدی بەیضا (٢)**
**بە ئوممێدی وەفای گوڵ، کۆششی بولبول چ سوودی بوو؟**
**بلا! بە ڕامی عاشق، کەی دەبێ مەعشووقی بێپەروا (٣)**
**بە فیکری مووشکاف ئەمشەو قیاسم کرد لە ڕووی زوڵفت**
**بە تاریشی، بە طوولیشی، بەقەد تاری نەبوو یەلدا (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) مەشهەد: گۆڕ.

واتە: منی دێوانە شەهیدی تیری نیگای چاوی مەستی نازدارێکم، لەوانەیە لەسەر خاکی گۆڕم نێرگزی چاومەست بڕوێ، چونکە نێرگزی شەهلای چاوی یارم لە گۆڕیشدا هاوڕێمە!

بڕوێ (کم): دەڕێ.

(٢) واتە: با خەڵك بۆ تاقیکردنەوەی ڕاستیی قسەم یەك هەناسە دەستم بنێنە باخەڵت! پاش ئەوە ئەگەر نەبووە دەستە سپییەکەی مووسا (یەدی بەیضا)، ڕازیم لەبندا بیبڕن. ئای ماڵی باخەڵی یاری کاول بێ، چ جۆرە تیشکدانەوەیەکی هەیە!

بنێنە (ق، کم، گم): بنێرە.

(٣) بلا: وازی لێ بێنە! با. ڕام: دەستەمۆ، ماڵی. پەروا: ترس، مەیل، توانایی.

واتە: کۆشش و چریکەی بولبول بە هیوای ئەوەی گوڵ وەفای هەبێ، هیچ سوودی نییە، دوای کڵاوی بابردوو کەوتنە! دە لێی بگەڕێ، کەی یاری بێمەیل یا بێترس، دەستەمۆ و ماڵی بووە بۆ عاشق؟!

کۆششی بولبول (گم): بولبولی مسکین. بلا بە (کم، گم): بەلایە. جوانە، یانێ یار بەلایە.. تاد

بە ڕامی (ق): با ڕامی. دەبێ (کم، گم): ئەبێ.

(٤) مووشکاف: مووقڵێش، کینایەیە لە وردبینی و زیرەکی. قیاس: ئەندازەگرتن، بەراوردکردن. تاری: تاریکی. طوول: درێژی. تار: تاڵی موو. یەلدا: درێژترین و تاریکترین شەوی دواین ڕۆژی پایز.

**له پەستی بۆ دەکێشن زاهیدی غافڵ چلەی خەڵوەت؟!**
**بچن عاشق بە باڵا بن، بچن بۆ مەرتەبەی باڵا (٥)**
**حەدیثی نەنگ و نامم زوو، شوکر مەشهووری عالەم بوو**
**لە حەرفی موددەعیی ناکەس، نەما باکم منی ڕیسوا (٦)**
**لە کاری هایل و صەعبا، گوریزە چارەیی مەردوم!**
**وەلێکین "سالم"ی یەکدڵ لە عیشقا ماوە پابەرجا (٧)**

واتە: شەوی تاریکم، بە بیر و زیرەکیی مووقلێشم، لەگەڵ ئەگریجەت بەراورد کرد، ئەنجام شەوەزەنگەکە نە بە تاریکی و نە بە درێژی نەگەیشتە تەنها تاڵێکی ئەگریجەت!

قیاسم (کم، گم): قیامم. لە ڕووی (کم): گرەی! زوڵفت (ق): زوڵفی.

(٥) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (کم، گم)دا پاش و پێشن، لە (ق)یشدا نییە.

واتە: زاهیدانی لەدنیابێئاگا بۆچی دەچنە شوێنی نزم و کون و قوژبن و گۆشە، خەڵوەت دەکێشن و خۆیان دەشارنەوە؟ با بچن عاشقی بالآی بەرز بن، تا بگەنە پایەی بەرز و باڵا!

چلەی (کم، گم): چلە و. (بچن)ی دووەم (کم، گم): بڕۆن.

(٦) نەنگ: عار، شوورەیی. حەرف: قسە.

واتە: دەنگوباسی عەیب و شوورەیی من، سوپاس بۆ خودا، زوو لەناو خەڵکدا بڵاو بووەوە. ئیتر لە قسەی بەدکاری نامەرد ناترسم.

نەنگ و نامم (ق): نام و نەنگم. زوو (ق، گم): زۆر.

(٧) هایل: هائیل، بەسام. وەلێکین: بەڵام. پابەرجا: پێداگر و سوور، پێی لە شوێنی خۆیدا.

واتە: چاری خەڵك بەرامبەر بە کاری سامناك و سەختی لەوزەنەهاتوو هەڵاتنە، بەڵام "سالم"ی یەکدڵ و نەگۆڕ لە مەیدانی عیشقدا لە جێی خۆی نەجووڵاو و پێداکوتاوە!

چارەیی (کم): خارەیی. وەلێکین "سالم"ی یەکدڵ (کم، گم): ڕەها کەن سالمی بێدڵ. ڕەها کەن: بەرەڵڵاکەن. یەکدڵ (ق): بێدڵ. پابەرجا (کم، گم): بێپەروا.

(*) -٨-

**زەورەقە دڵ، دیدەیە دەریاوو مەردوم ناخودا**
**جۆشی خاطر وەك شەپۆل و غەم نەهەنگ، لەنگەر جەفا (١)**
**جان موسافیر، تاجیرە، ئاهم بوخار و تەن مەتاع**
**گەمیە غەرقە، دوورە ساحیل، دڵ لە ڕێی بیم و بەلا (٢)**
**وایە دەرکی خەم بە ڕووی دڵما، هەتا دونیا هەیە**
**دەربچەی شادی بە وەعدەی تا قیامەت داخرا (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، غ، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) مەردوم: گلێنەی چاو. ناخودا: کەشتییەوان.

واتە: چاوی پڕ لە فرمێسکم دەریا و دڵم کەشتی و گلێنەی چاوم کەشتییەوانە. جۆش و خورۆشی دڵم، کە پڕ دەبێ، شەپۆل و خەم نەهەنگە و کەشتی لەسەر ستەم لەنگەر دەگرێ، ئیتر کەشتیی دڵم چۆن ڕزگار بێ؟! چۆن خۆی لە شەپۆلی جۆش دەرباز بکا، یا خۆی لە نەهەنگی خەم لابدا، یان بڕوا بە ستەم بکا و پشتی پێ ببەستێ؟!

دیدەیە (مان): دیدەی. ئەم وشەیە لە (عا)دا کەوتووە.

(٢) جان: گیان. مەتاع: کەلوپەل، کالا. گەمیە: کەشتی. ساحیل: کەنار. بیم: ترس.

واتە: لەم حاڵەدا، گیان ڕێبوارە و خەریکی بازرگانییە، کەشتی نوقوم دەبێ و کەناری دەریایش دوورە، لەوانە نییە بیگاتێ. دڵ بە ڕێی ترس و بەڵاوەیە.

بوخار و (کم، گم): توجار و. تەن (عا): شەن! (مەتاع) لە (مان)دا بە هەڵە (مطاع)ە. غەرقە (غ): عەوقە. (کم، گم): عەوق و. عەوق: قەتیس و چواردەورگیراو، گیرخواردوو. زۆر گونجاوترە، چونکە ئەگەر گەمیە (غەرق) بێ، ساحیل نزیکیش بێ، سوودی نییە!

(٣) وا: کراوە. دەرك: دەرگا. دوور نییە (دەرکەی) بووبێ. خەم: خەفەت، پەژارە. "سالم" کەم جار لەباتیی غەم خەمی بەکار هێناوە. دەربچە: دەرگای بچووك، دەریچە (پەنجەرە).

واتە: دەرگای خەم و پەژارە، تا دنیا دنیایە، لە ڕووی دڵمدا کراوەتەوە، بەڵام دەرگای بچکۆلەی شادی تا ڕۆژی قیامەت داخراوە.

وایە (عا، کم، گم): دایە! خەم (عا، غ، ق، کم، گم): غەم. دەربچە (عا، کم): دەریچە. (گم): دەرگەیی.

**شوعلەوەر نابێ چرای شادی لەبەر بادی فیراق**
**ئاگری میحنەت لە خەرمانی وجوودم هەڵگڕا (٤)**
**شەوقی دانەی خاڵی تۆ خستمیە ناو داوی خەطەر**
**بەم گوناهە، ئادەمیش وەك من لە جەننەت دەرکرا! (٥)**
**جەذبی کرد تەئثیری ناڵەم، دەردەدارانی ضەعیف!**
**باوجوودی ڕەنگی کاهی، بوومە ڕەنگی کەهرڕوبا (٦)**
**عومر و دڵ دیسان بەباد چوو، شانە هاتە ڕوویی کار!**
**بۆیی زوڵفت خاکی صەحرای کرد، سەراسەر، موشکسا (٧)**

(٤) شوعلەوەر: تیشکدار، داگیرساو. هەڵگڕا: هەڵگیرسا.

واتە: بای دووری ناهێڵێ چرای شادیم دابگیرسێ و تیشك بدا و دڵ ڕووناك بکاتەوە، بەڵام ئاگری دەرد و مەینەت بەربووە خەرمانی بوونم و سەر تا خواری سووتاند. لە ڕاستیدا، دەبوو هەر بای فیراقی بکردایەتە هۆی کوژاندنەوەی چرای شادی و ئاگربەربوون لە خەرمانی تەمەن!

لەبەر بادی (کم، گم): بە بەر یادی. شوعلەوەر (عا): شوعلەی دەر. هەڵەیە.

(٥) واتە: شەوق و ئارەزووی گەیشتن بە دانەی خاڵی ڕوخسارت، تووشی داوی ئەگریجەی کردم، یا خستمیە داوی عیشق. بەڵام من یەکەم کەس نیم بەم دەردە چووبم، ئادەمیش بەم تاوانە لە بەهەشت دەرکرا!

تۆ خستمیە (کم): تۆیە خستوومیە. (گم): تۆ خستوومیە. خەطەر (عا): خەتەر.

(٦) ئەم بەیتە تەنیا لە (کم، گم)دا هەیە.

ڕەنگی کەهرڕوبا: وەك کارەبا.

واتە: کاری ناڵەم دەردەدارە بێهێزەکانی هاودەردمی ڕاکیشا بۆ لام، لەگەڵ ئەوە کە ڕەنگم وەك ڕەنگی کایە و دەبوو من ڕابکێشرامایە، وەك کارەبای بەهێز و ڕاکێشم لێ هات.

ڕەنگی (غ): ئەصڵی. کەهرڕوبا (کم، گم): کارەبا.

(٧) بەباد چوو: بەبا چوو. موشکسا: وەك میسك بۆنخۆش.

واتە: تەمەن و دڵم جارێکیتر بە با چوون، لەناوچوون، بە دەم باوە دران، چونکە جێی دڵی سالم پێچی ئەگریجەی یارە. کە شانە بکەوێتە کار، دڵ نامێنێ. بۆنی ئەگریجەت، کە شانە دەکرێ، هەموو خاکی دەشتی وەك میسك بۆندار کردووە.

عومر و دڵ (کم، گم): عومری دل ئەگەرچی (عومر و دڵ)یش بە زۆر دەگونجێنرێ، (عومری دڵ)

هەر کە غایب بم لە فیکرا، دڵ دەچێتە پەردەیێ
پەی بەوێ نابات و ناگا، تا ببێ، پەیکی صەبا (٨)
زوڵفی حەیپەروەردەیە "سالم"! ئەبەد ئەیمەن مەبە
بەم قەرارە، شێتییە بازی بە حەلقەی ئەژدەها (٩)

تـــەواوترە، نەك (عـــومر و دڵ). ئـــەگەر وا بووایە، دەبـــوو بیـــوتایە: بەبا چوون. بەباد چوو، شانە هاتە (ق): بە با چوو، شانە هاتە. (کم): بە پاجو شانە هاتە. (گم): بە پـا جۆشـا نەهاتە ڕووی کار! صەحرا (عا): سەحرا. بۆیی (کم، گم): بـۆنی. میـشكسـا (ق): موشـكبـار. هەڵەیە. (کم، گم): مشکبا. لە فارسیدا مشکبار هەیە، بەڵام (مشکبا) نە کوردییە و نە فارسی.

(٨) پەیك: تەتەر، نامەبەر، ڕاسپێردراو. تا ببێ: تا حاڵەکە وا بێ.

واتە: کە نوقمی دەریای بیرکردنەوە دەبم، دڵم بە هەڵی دەزانـێ لـە پەردەیـەکی وەهـادا خـۆی دەشارێتەوە کە نامەبەر و تەتەری وەك بای سەبایش، تا حاڵوبارەکە وا بێ و دڵ لەو پەردەیەدا بێ، پەیی پێ نابەن و نایگەنێ!

پەردەیێ (ق، کم): پەردەوە. پەی بەوێ.. تاد (کم، گم): پەی بـەوی نابـا ئـەوی ناگاتـە پـەی پەیکی صەبا. تا ببێ (عا): نایبی. هەڵەیە.

(٩) حەی: مار. ئەیمەن: دڵنیا. بازی: یاری.

واتە: سالم! ئەگریجەی یار وەك مار پەروەردە کراوە، بێئامانە و هـەرگیز لێـی ئـەمین مەبـە، چـونکە یاریکردن بە حەلقەی ئەژدەها کە بە دەوری خۆیدا پەپکەی خواردبێ، شێتییە.

حەیپەروەردەیە (کم): حـەی پـەروەرە. (گـم): حەییەپـەروەرە. هەڵـەن. شـێتییە بـازی (غ): شیشەبازی. لەنگ دەبێ. (کم): قەت مەکە بازی.

### -٩- (*)

**به خاریج، تا به کەی سازندە بم بۆ جیفەیی دونیا؟!**
**لە بامی بێنەوایی لێ بدەم، با تەبڵی ئیستیغنا (١)**
**فەواقی بێئیفاقەی من یەکایەك نزگەرەی حیرصە!**
**تەکانی فەقر و بێبەرگی، مەگەر ئەم عیللەتە دەرکا (٢)**
**درشتە لوقمەیی حیرصم، فرۆناچێت و ئازادم**
**مەراقی بێنەوایی، گەر بە من ئەم سەددەیە قەی کا (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە بەشی (غزلهای جدیدە)ی (مان)دا هەیە. بابەتەکەی ئاینییە، شێوەیەکە لە گەڕانەوە بۆ لای خودا.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) خاریج: دەرەوە، دەرەوەی نیشتمان. سازندە: زورناژەن، سازلێدەر، جاران پێی دەوترا شایەر و لۆتی، بێشەرم و زماندرێژ. جیفە: لاکی تۆپیو. بام: بان. بێنەوایی: هەژاری. ئیستیغنا: قەناعەتکردن.

واتە: تا کەی لە غەریبیداماڵەوماڵ بکەم و لە پێناوی پەیداکردنی ماڵی دنیادا کە وەك لاکی تۆپیو بێنرخ و ئایەخە، ئاهەنگساز یا بێشەرم بم و زماندرێژی بکەم؟ با لە بانی هەژارییەوە دەست بۆ کەس نەگرمەوە و تەپڵی قەناعەت لێ بدەم و بیرێتەوە.

(به خاریج)، دەبوو (لە خاریج) بووایە، بەڵام ساڵم کارتێکراوی شێوەی فارسی بووە و ڕەنگی فارسی بە زۆر لە شیعرەکانیەوە دیارە.

(٢) فەواق: نزگەرە و قوڕگەگیرەی سەرەمەرگ. بێئیفاقە: چاکەوەنەبوو، بێشیفا.

واتە: گیانەلاوی سەرەمەرگ و گیاندەرنەچوونم، کە هەرگیز چاك نابێتەوە، هەمووی نزگەرەی هەڵپە و چاوبڕینە ماڵی دنیایە، مەگەر تەکان و هێزی هەژاری و بێبەرگی ئەم دەردەم لە کۆڵ بکاتەوە و بمرم!

(٣) درشت: زبر، گەورە. حیرص: پەرۆشی، چاوچنۆکی، چاوتێرنەبوون. فرۆناچێت: ناچێتە خوار. قەی: قێ، ڕشانەوە.

واتە: پارووی تەماعم گەورەیە، بۆم قووت نادرێ و لە بینم گیراوە. مەگەر خەفەتی هەژاری و بێسامانی -یانێ تەماع خۆی- بمڕشێنێتەوە و ئەم بەربەستە برووخێنێ، ئازاد بم لەم بەردڵگیرانە. ئەڵبەت مەبەستی ئاواتەخوازیی مردنە، گەیشتووەتە گیانی و دەیەوێ بە مردن لەو چاوبرسێتییە ڕزگار بێ!

**حەریصانی ئەمەل هەرگیز بە ئاوی جیفە پڕ نابن**

**تەمووزی حیرصە پڕتابش، طەمەع لەبخوشکی ئیستیسقا (٤)**

**لەناو ظەرفی قەناعەتدا طەعامی دیگی دەروێشی**

**نەخۆی، تا دەست نەشۆی ئەووەڵ لە چرکی جیفەیی دونیا (٥)**

**تەنیدەتەنمە سەرتاپا، طەمەع تەنپۆشی زیشتێکە**

**وەلیٚ ڕەملی ئەمەل کردوویە دیدەی زیشتبین ئەعما (٦)**

**لە بەینی بوخل و بەخششدا، تەفاوت هەر لە کویٚ تا کویٚ!**

**دەبەستیٚ ئەم دەری نیعمەت، دەکا ئەو بابی ڕەحمەت وا (٧)**

(٤) پڕتابش: زۆر گەرم و بەتاو. لەبخوشك: لێووشك. ئیستیسقا: ئاوبەند، ئیسقا، نەخۆشییەکە شانەکانی لەشی پێ پڕئاو دەبن و نەخۆش هەرگیز تێراو نابێ و هەمیشە تینوویەتی.

واتە: ئەوانەی وا هیوادرێژن و بەرچاوتەنگن، لەبەر هەڵپە و چەپوگوویی زۆر هەرگیز بە ئاوی بۆگەنی ماڵی دنیا، کە هەمیشە دەیخۆنەوە، تێراو نابن. تەمووزی تەماع زۆر گەرمە و تەماعیش لێووشکیی دەردی ئاوبەندکردنە! بەو پێیە، ئەوی ئاوبەندی کردبێ، هەر ئاو دەخواتەوە و تێراو نابێ.

(٥) ظەرف: دەفر، قاپی چێشت تێداخواردن. دیگ: مەنجەڵ. چرك: چڵك.

واتە: چێشتی لە مەنجەڵی دەروێشیدا کوڵاو، لەناو دەفری قەناعەت و بەرچاوفراوانیدا نەخۆی، تا لەپێش هەموو شتێکدا دەستت لە چڵکی لاکی تۆپیوی دنیا نەشۆی؛ واز لە دنیا بێنە، ئەمجا ڕوو بکەرە ڕێبازی دەروێشی.

ظەرفی لە (مان)دا (ضەرفی)یە، هەڵەیە.

(٦) تەنیدە: تەنراو. تەن: لەش. تەنپۆش: لەشداپۆش. زیشت: ناشیرین. وەلیٚ: بەڵام. ڕەمل: لم و زیخ. زیشتبین: دزێوبین، ناشیرینبین. ئەعما: کوێر.

واتە: لەشمە کە سەرتاپا تەنراوە، تەماع لەشپۆشێکی ناشیرینە و زبر و دیارییە، بەڵام لم و زیخی هیوا چاوی بەدبینی کوێر کردووە و نابینێ.

(٧) وا: کراوە، واڵا.

واتە: جیاوازی لەنێوان ڕژدی و بەخشندەییدا زۆرە، ڕژدی دەرگای خێر و ڕۆزی دادەخا، بەخشش و دڵفراوانی دەرگای ڕەحمەت دەکاتەوە.

**هەوەس کێشامی بۆ عوزلەت، ئەمەل گرتوومی، نایێڵێ!**
**چ غوولێکە لە ڕێگەی ڕاستی هەر لامئەدا عەمدا (٨)**
**خەرابی، مەردومی بوومی نەتیجە دا بە وێرانی**
**لە شوومیی ئەم بەروبوومە صیفەتنایابە وەك عەنقا (٩)**
**لەتاو ضیعفی نەداریی، گەدا ئاهێ کە دەیکێشێ**
**خەدەنگی زەهرئالوودە بە قەصدی سینەیی دارا (١٠)**
**قەبایی ئەطڵەسی ظاڵم لە وەرعا چەندە مەهتووکە!**
**پەڵاسی چاکی مەظڵوومی دەبێتە زینەتی باڵا (١١)**
**بە پووڵی مەردومئازاری مەپۆشە تورمە پا تا سەر**
**بە شاڵی پەشمی دەروێشی بدە تەشریفی سەرتاپا (١٢)**

(٨) غوول: دێو، بوونەوەرێکی ئەفسانەیی کەتە و ناقۆڵایە لە شاخ و دۆڵی دوور لە ئاوەدانیدا دەژی و ڕێبوار لە ڕێ لادەدا و سەری لێ دەشێوێنێ. عەمدەن (عمدا): دەستئەنقەست.

واتە: ئارەزووی دوورەپەرێزیم بوو، بەڵام هیوا گرتوومی و ناهێڵێ کەنارەگیر بم! ئای ئەم تەماعە چ دێوێکە بە دەستئەنقەست لە ڕاستەڕێ لام دەدا و ڕێم لێ ون دەکا!

(٩) بوومی: کوندەپەپوو، خۆوڵاتی. شوومی: نەگبەتی. بەروبووم: خاك، وڵات. عەنقا: سیمورغ کە پەلەوەرێکی ئەفسانەییە.

واتە: خرابی و بەدکاریی خەڵکی وڵات، یا خەڵکی وەك کوندەپەپوو، کێشایەوە بۆ وێرانیی مەملەکەت. سیفەتی چاکە بۆ نەگبەتیی ئەم وڵات و خاکە، وەك عەنقا نایابە، هەر ناوە و ناوەڕۆکی نییە.

(١٠) واتە: ئاهێکی ساردی نائومێدی کە مرۆی بێدەست لەتاو دەردی هەژاری هەڵیدەکێشێ، تیری ژەهراویی دارگەزە بۆ سنگی دەوڵەمەند.

(١١) قەبا: کەوا. ئەطڵەس: بەرگی ئاوریشمین. وەرع: لە خوداترسی و خۆلەگوناه پاراستن. پەڵاس: جلی لە ڕێسراوی زبر تەنراو کە ئەستوورە و هەژار لەبەری دەکا. چاك: پارچەپارچە و دادڕاو.

واتە: کەوای نایابی ستەمکار لە جیهانی لەخوداترسیدا بێزی لێ دەکرێتەوە و سووك و بێنرخە، پەڵاسی دڕاوی مرۆی ستەملێکراو دەبێتە مایەی جوانی و ڕازاندنەوەی بەژن و باڵا.

(١٢) تورمە: قوماشێکی شاڵی دەوڵەمەندپۆشە. شاڵ: تەنراوی خوریی وەك بەرماڵ و پەشتەماڵ. پەشم: خوری.

**دڵم دایم لە سەیری کارْوانی زاد و مەرگایە**
**بە میثلی جادەیی بەندەر، موادم ئەم دێت و ئەو دەڕوا! (١٣)**
**بە سەنگی تەوبە دوندانی طەمەع بشکێنە، پەس بیخۆ**
**بە دوندانی قەناعەت نانی سوڵـطانیی "ئووەیس"ئاسا (١٤)**
**سەگی نەفست لەسەر ڕێی تەوبەتا ئامادەیی جەنگە،**
**بە قەصدی قەتلی ئەو، چابوك بکێشە تیغی ((بسم الله)) (١٥)**
**بە خەمیازەی صەفای مەستی، مەدە تەن بۆ خەوی غەفڵەت**
**بە ئەندازەی هەوای هەستی، مەدە سەر بۆ شەڕی ئەعدا (١٦)**
**بە میثلی خرسی لۆتی بۆ طەمەع هەردەم لە ماڵێکی!**
**مەهاری کردْوی شەیطان و دەدگێڕێ بە ئیستیهزا (١٧)**

واتە: سەرتاپای خۆت بە پارەیەك كە لە ڕێی ئازاردانی خەڵكەوە دەستت كەوتبێ، لە تورمە مەگرە، حەرامە. سەرتاپای خۆت بە شاڵی دەروێشانەی لەخوریتەنراو شەرەفمەند بكە.

(١٣) زاد: لەدایكبوون. مەرگ: مردن. بەندەر: كـەناری دەریـا كـە كەشـتی و پـاپۆڕی تێـدا دەوەستێ. مودام: هەمیشە.

واتە: دڵم هەمیشە دەڕوانێتە كاروانی زاد و مەرگ، لـە سـاتێكدا یـەكێك لـەدایك دەبـێ و یەكێك دەمرێ. دنیا دەڵێـی بەنـدەرە و كەشـتیی تێـدا وەسـتاوە، ئـەم دێـت و ئـەو دەڕوا! ئـەو دادەبەزێ و ئەم سوار دەبێ.

(١٤) سەنگ: بەرد. پەس: پاشان. سوڵـــطانی: شاهانە. ئووەیس: وەیسی قەرەنی كـە "وەیـسی مایدەشتی"ی پێ دەڵێن، یەكێك بووە لە پیاوچاكانی لەخوداترس (تابعین).

واتە: بە بەردی تۆبە ددانی چاوبرسێتی بشكێنە و لـە كەڵكی بخە. پاش ئەوە بـە ددانـی قەناعـەت و بەرچاوفراوانی وەك وەیسی قەرەنی (خ. ر) نانی شاهانە و لەخوداترسانە بخۆ.

(١٥) واتە: سەگی نەفست ڕێی تۆبەی لێ گرتووی و ئامادەی جەنگە، تۆیش گورج تیغی ((بسم الله)) بۆ كوشتن و لەناوبردنی هەڵكێشە و ناوی خودای لێ بێنە، مەهێڵە بەسەرتدا زاڵ بێ.

(١٦) خەمیازە: باوێشك. صەفا: نەشئە و خۆشی. تەن: لەش. هەستی: بوون.

واتە: وریا بە، باوێشكی مەستی تووشی بێئاگایـت نـەكا. هێنـدەی هەسـت بـە بـوونی خـۆت دەكەی، مەچۆرە شەڕی دوژمنانەوە و لـە خۆت بایی مەبە.

(١٧) خرس: ورچ. مەهار: دارێكە دەكرێتە لووتی وشـتر و پەتێكی پێوە دەبەسـترێ، لە لغاوی

**لە کەس ڕۆزیت نەوێ، جوز ڕازیقت، گەر مەردی دەروێشی**
**زەمین گەر قەحطی قووتە، بۆت دەبارێ مەنن و هەم سەلوا (١٨)**
**پلەی چەرخ و فەلەك بگرە، قیاسی بەرز و نزمی کە:**
**بوڵەندی سوویی پەستی بێ، کە پەستی هەستە بۆ باڵا (١٩)**
**تەرەققی چەند بە تەعجیلە، تەنەززول وا بە سیرعەت دێ،**
**بە فەووارەی بدە نیسبەت، بوڵەندی و پەستیی دونیا (٢٠)**

ئەسپ بەکارترە بۆ ڕامکردن. دەدگێڕێ: دەتگێڕێ، دەتسووڕێنێتەوە. ئیستیهزاء: گاڵتەپێکردن.

واتە: وەك ورچی لۆتی بۆ تەماعی دنیا هەر ساتە لە ماڵێکی، شەیتان پەتی کردووەتە لووتت و بۆ گاڵتەپێکردنت دەتگێڕێ، یا دەرگا لە خەڵك دەگری.

(لۆطی) لە (مان)دا هەڵەیە و (لۆتی) ڕاستە.

(١٨) مەن: گەزۆ. سەلوا: شۆکە- هەردوو شیرینیی خوداکردن.

واتە: ڕۆزی لە کەس داوا مەکە، چاوت لە دەستی کەس نەبێ، تەنیا خودا ڕۆزیدەرە، ئەگەر زەوییش قاتوقڕی بێ، گەزۆ و شۆکەت لە ئاسمانەوە بۆ دەبارێ. هەرچەند وتراوە، گەزۆ و شۆکە لە ئاسمانەوە دەبارێن، بەڵام -لە ڕاستیدا- دەردراوی ئەو درەختانە خۆین کە بەسەریانەوە پەیدا دەبن. مەسەلەی گەزۆ و شۆکە، ئاماژەیە بۆ لە ئاسمانەوە هاتنەخوارەوەی خواردن بۆ بەنی ئیسرائیل کاتێك لە بیایاندا بوون.

(١٩) سوویی: بەرەو. پەستی: نزمی.

واتە: بەراوردی بەرزی و نزمیی چەرخ و ڕۆژگار بکە، تا بۆت دەربکەوێ ئەگەر بەرزیت دەوێ، نزم بەرەوە و خاکینە بە. ئەگەر نزمییشت دەوێ، بەرز بەرەوە و لە خۆت بایی بە؛ یا ئەگەر بەرزیت، خاکینە و خوداپەرست بە. ئەگەر نزم و کلۆڵیشیت، ڕوو بکەرە خودا، تا بەزەیی پێتدا بێتەوە.

(٢٠) تەرەققی: بەرزبوونەوە، هەڵکشان. تەعجیل: خێرایی و پەلەکردن. تەنەززول: نزمبوونەوە، بارلاربوون.

واتە: مرۆڤ چەند زوو بەرز بێتەوە، وەهایش بە زوویی نزم دەبێتەوە. بڕوانە فوارە و لەگەڵ بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی دنیایدا بەراوردی بکە. دەبینی چۆن ئاوەکە بە پەلە و توند بەرز دەبێتەوە، کەچی بە هەمان پەلە و توندی نزم دەبێتەوە. کەواتە بەرزی و نزمیی دنیایی هیچ نرخێکی نییە.

(طەرەققی) لە (مان)دا هەڵەیە و (تەرەققی) ڕاستە.

**ذەلیلی نەفسی ئەممارە، شکستی بیمی ئەم مارە!**
**پەناهت بۆ "عەلی" بێنە، مەڕۆ بۆ "بووعەلی سینا" (٢١)**
**بە تاجی فەقر، ئەگەر "ئەدهەم"صیفەت، جۆیایی سوڵطانی**
**لە تەختی سەڵـطەنەت هەڵسە، وەرە ژێر خەرقەیی مەولا (٢٢)**
**دڵا! هەر کەس دەپرسێ لێت: لە "مەولا" کێیە مەقصوودت؟**
**بڵێ: مەولایی دەروێشان، عەلییی عالییی ئەعلا (٢٣)**
**صەڵابەت دەمگرێ هەنگامی شەرحی هەیبەتی وەصفی،**
**قەڵەم نایێتە سەر کاغەذ لە ڕەشحەی جونبوشی ئەعضا (٢٤)**

(٢١) ذەلیلی: داماوی. نەفس: دەروون. ئەممارە: فریودەر. شکست: تێشکان. بیم: ترس. بووعەلی سینا: بە (شیخ الرئیس) ناسراو بووە. زانا، فەیلەسووف، پزیشك، ئەستێرەناس و بیرکاری گەورەی ئێرانییە، کە لە (خەرمەیثەن)ی دەوری (بوخارا) لەدایك بووە و لە (هەمەدان) کۆچی دوایی کردووە.

واتە: ئەگەر داماو و بەیدەستی دەروونی گلاو و فریودەری خۆتی و دەترسی لە بەردەمی ئەم مارە بێئیجازەیەدا تێك‌بشکێی، پەنا بۆ ئیمامی عەلیی خاکینەی لە ناخەوە خوداپەرست بێنە، ڕوو مەکەرە حەکیمی دنیایی وەك ئەبووعەلی سینای وەزیر و حەکیم و زانا.

(٢٢) ئەدهەم: ئیبراهیمی ئەدهەم پیاوچاکێکی ئێرانی و لە میرزادەکانی بەلخ بووە. جۆیا: داواکەر، بەدوای هەر شتێکدا گەڕاو. خەرقە: جبە، باڵاپۆشی دەروێش. مەولا: خاوەن و سەروەر.

واتە: ئەگەر دەتەوێ وەك ئیبراهیمی ئەدهەم (خ. ڕ) تاجی هەژاری لەسەر بنێی و بگەیتە پایەی سوڵتانی و بێنیازی بە خەڵك، لە تەختی پادشایەتی دابەزە و وەرە ژێر جبەی مەولای خودادۆست.

(٢٣) واتە: ئەی دڵ، ئەگەر لێیان پرسیت: مەبەستت لە "مەولا" کێیە؟ بڵێ: مەبەستم مەولای دەروێشانە کە حەزرەتی عەلیی پایەبەرزە. ئاماژەیە بۆ فەرموودەی ((مَنْ كُنت مَوْلاَه، فعَلي مَولاَه)).

(٢٤) صەلابەت: ڕەقی، مەبەستی وشك‌بوون و نەبزووتنە. هەنگام: کات. ڕەشحە: ئارەق، جواناو. جونبوش: لەرزە. ئەعضا: ئەندامەکان.

واتە: کە دێمە سەر باسی گەورەیی سیفەتی عەلی (خ. ڕ)، دەستم وشك دەبێ و قەڵەمەکەم لەبەر ئارەقی لەرزینی ئەندامم نایێتە سەر کاغەز تا بنووسم.

بە داخەوە ناسناوی "سالم" بەم پارچەشیعرەوە نییە، بەڵام بێگومان هی ئەوە، چونکە نوسخەی (مان) کە پارچەکە هەر لەوێدا هەیە، بە داوای سالم و بۆ خۆی نووسراوەتەوە. ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی‌تریشەوە شیعری‌تریشی هەیە ناسناوی ئەویان پێوە نییە.

## -١٠- (*)

## (در هجو اسپ حمهٔ احمد)

**غەم وەکوو یەم هاتە جۆش و کەوتمە گێژاوی بەڵا**
**ئاوی هایل زایە کەشتی، هاتمە حاڵی حەلوەلا (١)**
**شەططی میحنەت هات لە سەردا، سەددی هۆشی ڕاڕفاند**
**بادی غەم لێم بوو بە شەرکێ، جیسری شادیم تێکشکا (٢)**
**گەمیە کەوتە گێژی نەمروود، تەن وەکوو ئاش هاتە خول**
**بای موراد کەی دێ، خەبەر دە، توو خودا ئەی ناخودا؟ (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، ف، کم، گم)دا هەیە. سەرناوەکەی لە (مان، ن)دا (در هجو اسپ حمهٔ احمد)، واتە لە هەجووی ئەسپی حەمەی ئەحمەدە. ناسناوی "سالم"یشی -وەك شیعرە داشۆرینبابەتەکانیتر- بەسەرەوە نییە. ئیتر نازانرێ ئەم حەمەی ئەحمەدە کێیە؟! دوور نییە سالم کاتی ئاوارەیی لە (سنە) نووسیبێتی، وەك چۆن چەند شیعرێکیتری هەجووی لەوێ وتووە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) یەم: دەریا. هایل (هائیل): سامناك. حەلوەلا: تەنگانە و پەرێشانی، لە ((لاحول ولاقوة الا بالله))ەوە وەرگیراوە.

واتە: پەژارە وەك دەریا هاتە جۆش و خورۆش و کەوتمە ناو گێژاوی پەرێشانی، کەشتییەکەم ئاوێکی بە لێشاو و سامناکی تێزا، خۆیشم دوچاری لێقەومان هاتم و پەرێشان مامەوە.

هاتمە (کم، گم): کەوتمە.

(٢) شەط: زێ و چەمی گەورە. سەد: بەربەست، بەنداو. ڕاڕفاند: فڕاندی و ڕایمالّی. شەرك: شەرەك، داوی ڕاوکەر. جیسر: پرد.

واتە: شەتاوی نەگبەتی لە سەردا هات، لێشاوی هێنا و بەربەستی بیر و هۆشی داڕووخاند و بردی. بای خەفەت بوو بە داوێك، پردی شادیم شکا و لێكپچڕا.

سەددی (گم): کەشتی. ڕاڕفاند (کم): ڕاڕفان. شەرکێ (کم، گم): شورطە. دروست نییە، چونکە (شورطە) یا موافیق بای هەڵکردوو بە هەمان ڕووی ڕێی کەشتیە، نەك بای (موخالیف)ی پێچەوانەی ڕێی کەشتی کە بۆ ئێرە گونجاو بوو.

(٣) گەمیە: کەشتی. نەمروود: لە وەچەی حامی کوڕی نووحە، بە سەرکێشی و ملهوڕی بەرامبەر

**دادی دەریای میحنەت و طـۆفانی غەم، با بەس بدەم**
**بێمە شەرحی بەدفیعالیی بۆزەیی دامەنسیا! (٤)**
**ئەی ڕەفیق کۆزیلکەیە، بێن، وەك حەصار دەورم بدەن**
**بێجڵەو سوارم، وەرن سەیرکەن لە بارگیری قەضا! (٥)**
**ئەسپێکی بۆز و ترووسك و سەرکەش و توند و شیڕەت**
**وا سڵە، گەر خشپە بێ، جووتە لە کلکی خۆی ئەدا! (٦)**
**سپیە سەرپاك موو و بژانگ و ژێرقەپۆز و یاڵ و دووی**
**گەندە باخەڵ، جووتە پێشانی، چەپ و ڕاست دەست و پا (٧)**

بە ئیبراهیم خەلیل ناوی ڕۆیشتووە و بانگەوازی خودایەتیی کردووە. گێژی نـەمروود: دەبـێ ئەو گێژ و خول و سەرئێشەیـە بێ کە نەمروود تووشی خۆیی کردن و هیچی لێ بەدەست نەهێنان.

واتە: کەشتیەکەم کەوتە گێژاوی نەمروود، دەرچوونی نییە، بەرەو ناخ دەچێ. لەشم وەك بـەرداش هاتە خول. تووخودا ئەی کەشتیەوان! بای موراد، بای موافیق، کەی هەڵدەکا؟!

خول (کم، گم): گەڕ. خەبەر دە (کم، گم): خەبەر دا، واتە: خەبەر بدا! توو (گم): تۆ.

(٤) واتە: با داد و بێداد لـەدەست دەریای مەینەت و لافاوی خەفەت بەس بـێ! بـا بێمـە سـەر باسی بەدکرداریی ئەسپە بۆزەی چوارپەل ڕەش.

ئەگەر بیوتایە: «بێمە سەر شەرحی فیعالی بۆزەیی دامەنسیا» ڕەوانـتر و جـوانتر دەبـوو، کـورد «بێمە سەر» دەڵێ.

سیا (ن): سیاه.

(٥) کۆزیلکەیە: خڕبوونەوەیە، کۆبوونەوەیە. حەصار: شوورا. بێجڵەو: جڵەونەکراو. بارگیر: هێستر. قەضا: لێرەدا مەبەست بەڵایە، قەزا و قەدەر.

واتە: ئەی هاوڕێکانم، بێن کۆببنەوە، وەرن وەك شوورە دەورم بدەن، فریام بکەون، بڕوانن چۆن بەبێ جڵەو سواری هێستری بەڵا بووم و گیرم خواردووە.

ئەی ڕەفیق کۆزیلکەیە بێن (ف): ئەی ڕەفیق کۆزیکەیی. (کم، گـم): ئـەی ڕەفیقـی کـۆن لــە کوێن، سا. دیارە بۆ ڕوونووسکەرەوەکە ساغ نەبووەتەوە، بۆیە وای نووسیوەتەوە.

(٦) ترووسك: چالاك. شیڕەت: چەمووش، تووش و شەڕانی، ئەسپی هار و بەگوڕەگوڕ.

واتە: ئەسپەکەی ژێرم بۆز و تووڕە و شەڕەنگێزە، ئەوەندە سڵە لـە هەموو شـتێك دەسـڵەمێتەوە و ڕادەچڵەکێ. ئەگەر دەنگی خشپەیەك بەر گوێی بکەوێ، بە جووتە بەردەبێتە کلکی خۆی و شەڕی

گەر زرنگەی پلپلە و حەلقەیی زەنگ بگرێتە گوێی
جووت لەسەر پاشوو دەوەستێ، میثلی ورچ دێتە سەما (٨)
دەست ئەبەم زینی بکەم، چونکە لە سواری عاجزە
بۆ لەقە خۆی خۆش دەکات و مۆڕ دەبێ لێم لابەلا! (٩)

لەگەڵ دەکا، ئەڵبەت وا دەزانێ خشپەکە لە کلکییەوەیە!

ئەسپێکی بۆز و تترووسك و سەرکەش و تونـد و شـیڕەت (کم): ئەسـپەکەی بـۆز و ترسـنۆك و سەرکەش و توند و شڕەت. لەنگە (گم): ئەسپەکەی بۆز ترسەنۆك و سەرکەش و توند شیڕەتە. ئـەمیش هەروا لەنگە. ئەدا (ن، ف): دەدا. لەبەرئەوەی کێشـەکە ڕەمەلە (فاعیلاتن)، دەبێ بڕگەی دووەم کورت بێ، یان (ئەسپێکی) وەك (ئەسپیکی) بخوێنرێتەوە.

(٧) سەرپاك: هەموو. بژانگ: برژانگ. یاڵ: تووکی ملی یەکسم. دوو: کلك.

واتە: هەموو مووی بـرژانگ و ژێرقـەپۆز و یـاڵ و کلکـی سـپییە و بـندەسـتی بۆگەنـە، ناوچـاوانی دووڕەنگە، لایەکی ڕەش و لایەکی سپی. دەست و پێشی دووڕەنگن، بـەڵام چـەپ و ڕاسـت؛ یانـێ پێـی چـەپی سـپی و دەسـتی ڕاسـتی ڕەش و دەسـتی چـەپی سپی و پێـی ڕاسـتی ڕەشـە. ڕەنگیـشە مەبەسـت گێڕوگەوێڕیی بۆزە بێ، ڕاستی بەرەو چەپ و چەپی بەرەو ڕاستە.

سەرپاك موو و بژانگ (کم): سەرپاکی مووی شەبڕەنگ. (گم): سـەرپاك موویی شـەبڕەنگ. یاڵ (گم): پاڵ. دووی (مان، ن): ڕووی، هەر (یاڵ و دوو) وتراوە. گەندە (کم، گم): گەندی.

(٨) واتە: ئەگەر گوێی لە زرنگەی پلپلە و ئەڵقەی زەنگ بێ، لەسەر جووتەپێی ڕادەوەستێ و وەك ورچی لۆتی دێتە سەما! سالم دەڵێی (سێرك)ی ئەم زەمانـەی وێنـە کێـشاوە! دوور نییـە، کـاتی ئاوارەیی لە ئێران دیمەنی‌وای دیبێ.

زرنگەی پلپلە و حەلقەیی زەنگ بگرێتە گوێی (ف): زرنگە و پلپلەی حەلقـەیی ڕەنـگ بگرێتـە گوێ. (کم، گم): زرنگەی پلپلەی زەنگ و جەرەس بگەیێتە گـوێی. چـت لــە (مـان)دا چـووت یـا چوست بووە. هەڵەی نووسینە، (جووت) ڕاستە.

(٩) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا بەیتی دوازدەیەمە.

واتە: کە دەمەوێ زینی بکەم، چونکە ڕقی لە سوارییە، خەریکە لەقە بوەشێنێ و لابەلایش لـێم مۆڕ دەبێتەوە.

ئەبەم (ن): دەبەم. (سواری) بەپێی شێوەنووسی (مان)، (سواریی)ش هەڵدەگرێ. چـونکە (گـم): چونکو. دەکات (کم، گم): ئەکات. دەبێ (کم، گم): ئەبێ.

گەر لە لایێ دابەزم، باز نییەتم بێ سواری بم،
ئاوزەنگی نادا، لە دەورم دێتە خول وەك ئاشی با (١٠)
گەی لە گوێ جۆگە کە بگرێ، دێم بە توندی لێخوڕم
طاق و جووت جووتە ئەوەند داوێژێ، پاڵوو هەڵدەکا (١١)
کاوو جۆی گەر بێنمە پێش، وەك کەر دەلووشکێ و هێدییە!
گەر لەغاوی بۆ بەرم، بۆ جووتە پاشووم تێدەکا! (١٢)

(١٠) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا نۆیەمە. دووەم نیوەی ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەیش لە (ف)دا پاش و پێشن.

باز: دووبارە، جارێکیتر.

واتە: ئەگەر جارێك بەپێی پێویست دابەزم و دووبارە بمەوێ سوار بم، ماوەی ئەوەم نادا پێ بنێمە ئاوزەنگی، چونکە وەك ئاشی بەبائیشکردوو دەخولێتەوە!

لایێ (کم، گم): لایەك. سواری بم (ف): سوار ببم. باز نییەتم (گم): با زینەتم، هەڵەیە.

(١١) لەم بەیتە بەدواوە لە (ن)دا نییە، چونکە لاپەڕەکانی دوایی فەوتاون.

گەی: مانگرتنی وڵاخی بەرزە، پێچەقاندن. پاڵوو: پارچەیەکی کورتان دەدرێتە ژێر کلکی وڵاخ. هەڵدەکا: فڕێ دەدا، دەبەزێنێ.

واتە: ئەگەر لە گوێ جۆگەدا مان بگرێ، بە توندی تێوەی دەژەنم و لێیدەخوڕم. ئەوەندە جووتە دەهاوێژێ، پاڵووی سەر ساتان و کەفەڵی بەرز دەبێتەوە.

گەی لە گوێ جۆگە کە بگرێ (ف): گەی لە گوێ جۆگە کە دەگرێ. (کم): گەی لە گوێ جۆگە دەگرێ. لەنگە. (گم): کەی لە گوێی جۆگە دەگەڕێ. طاق و جووت جووتە ئەوەند داوێژێ (کم، گم): تاق و جووت ئەبن و داوێژێ. هەڵدەکا (کم، گم): هەڵئەکا. «داوێژێ»، دەبێ بڕگەیەکی کورت بێ، بۆیە وەك «داوێژی» دەخوێنرێتەوە.

(١٢) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا بەیتی سیازدەهەمە.

دەلووشکێ: دەلووشکێنێ، لووشکە: دەنگی وڵاخی یەکسم کاتی ئالیكپێدان یا ئاوبۆبردن یان بینینی بێچووی خۆی. هێدی: ئارام.

واتە: کە کا و جۆی دەنێمە بەر، وەك گوێدرێژ لووشکەلووشکیەتی و ئارامە. کە دەیشمەوێ لغاوی بکەم، لەبەر ئەوەی دەزانێ نیازی سواریم هەیە، خۆی بۆ جووتەوەشاندن ئامادە دەکا.

بێنمە (کم): بیخەمە. (گم): بێنییە. دەلووشکێ و هێدییە (کم، گم): دەلووشکێنێ بە تاو، لەنگە.

**وەختی ئالیك، ڕووبەڕووی ماڵ، وەك شەماڵ شیرین‌دەوە**
**بۆ ڕێگەی تەعجیل ئەوەند سستە، دەڵێی وا داوەشا (١٣)**
**وەك کەری دێز فەوتی خۆی و ڕەنجشی خێوی دەوێ**
**هەر لە ناکادا، بە عەمدەن، خۆی لە خمخۆرك دەخا (١٤)**
**وەك سەگێکی پەت‌پسێن بێ و صەد سنك ببڕێ بە دەم،**
**دەم دەبا، کەڵبەی لە پێچکەی لالەغاوی گیر دەکا (١٥)**

دەکا (کم): ئەکا.

(١٣) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا بەیتی شازدەهەمە.

دەو: غار، ڕاکردن. شیرین‌دەو: خۆش‌ڕەوت و خۆش‌غار. داوەشا: دارزا و کەڵکی هیچی پێوە نەما.

واتە: کە ئالیکی دەدەمێ، یا دەیبەمەوە ماڵ، نەرم و لەسەرخۆیە. کەچی لە ڕۆییندا سستە و کەم‌پێیی دەکا، دەڵێی لەشی داوەشاوە.

وەختی ئالیك ڕووبەڕووی ماڵ، وەك شەماڵ شیرین‌دەوە (کم، گم): وەختی ئالیك ڕوو بە ماڵ وەك بای شەماڵ شیرین‌ڕەوە. بۆ ڕێگەی تەعجیل ئەوەند سستە، دەڵێی وا داوەشا (کم): بۆ ڕێگەی تەعجیل ئەوەند سستە، ئەڵێی وا داوەشا.

(١٤) ڕەنجش: ئازاردان. خێو: خاوەن. عەمدەن: دەست‌ئەنقەست. خمخۆرك: درز و کەلێن و قلێشی ڕووی زەوی.

واتە: وەك کەری دێز تۆپینی خۆی و زیانی خاوەنیی دەوێ، بۆیە لە ناکاودا پێی لە درز و قلێشی ئەرز گیر دەکا، تا سەرسم بدا و بکەوێ.

فەوتی خۆی و ڕەنجشی خێوی دەدێ (کم): فەوتی خۆی و میحنەتی خێوی ئەوێ. (گم): فەوتی خۆی و میحنەتی خەڵکی دەوێ. (دَدَی– دەدی) لە (مان)دا هەڵەی نووسینە. هەر لە ناکادا بە عەمدەن (ف): هەر لە ناکاودا بە عەمدەن. (کم، گم): هەر لە ناکاوا بە عەمدەن. خمخۆرك دەخا (کم): خومخوردا ئەخا. (گم) خەوخوڕ دادەخا. هەردووکیان هەڵەن.

(١٥) پەت‌پسێن: پەت‌پچڕێن، بێ‌شەرم. سنك: پەتی ملی سەگ کە پێی دەبەسترێتەوە. دیارە بۆزە لە سەگ چەتوونترە، ئەم پەت‌پسێنە، بەڵام بۆزە لغاوشکێنە! کەڵبە: ددانی پێشەوەی سەگ و دڕندە. پێچکە: دەست و پێ. لالەغاو: سووچی دەم.

وەك سەگێکی پەت پسێن بێ و صەد سنك ببڕێ بە دەم (ف): وەك سەگێکی پەت‌پسێن بێ و صەد سنك ببڕێ بە فێڵ. (کم، گم): پەت‌پسێنی بێ سەنەك ببڕێ بە فێڵ. دەکا (کم): ئەکا.

**گەر حەمەی ئەحمەد بڵێ: بۆز خۆشبەزە، باوەڕ مەکەن**
**ئیمتیحانم کرد لە (مەرگە)، واقیعی بلّح ڕادەکا (١٦)**
**گوایە ئیظهاری غورووری خۆی دەکا، دێم زینی کەم**
**هەڵدەتووڕێنێ، وەکوو گای بارنەبەر خۆی شێت دەکا (١٧)**
**گەر لە بازاڕ بیفرۆشن، دۆم نەبێ کەس نایکڕێ!**
**بۆ بنی هێڵەك، لە لای من، کلك و یاڵی دەستئەدا (١٨)**

(لە پێچکەی لالەغاوی)، ڕاستتر وابوو (پێچکە و لالەغاوی) بێ، چونکە (لالەغاو) پێچکەی نییە. (پێچکە) لە (مان)دا بە (پچیکەی) نووسراوە و نوختەکانی ژێر (ـچپـ) کەوتوون.

(١٦) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا حەڤدەیەمە.

خۆشبەز: خۆشڕەوت. مەرگە: ئەوسا دێیەکی ناوچەی پشدەری سەر بە سلێمانی بووە. واقیعی: ڕاست و دروست. بلّح: گەوج، نەزان، ئاکار ناپەسەند و بێکەڵك.

واتە: ئەگەر حەمەی ئەحمەد بڵێ ئەم ئەسپە خۆشڕەوتە، بڕوا مەکە، چونکە لە (مەرگە) تاقیم کردەوە لە ڕاکرندا بلّحە.

خۆشبەزە (کم، گم): خۆشڕەوە. مەکەن (ف، کم، گم): مەکە. واقیعی بلّح (کم، گم): واقیعەن قوڕ. ڕادەکا (کم): ڕائەکا.

(١٧) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا یازدەیەمە.

ئیظهار: نیشاندان. غوروور: لووتبەرزی. هەڵدەتووڕێنێ: بە جووتەوەشاندنەوە ڕادەکا، دەکەوێتە بەلەفیڕە و زگی دەچێ.

واتە: کە دێم زینی بکەم، غەڕابی دەیگرێ و هەڵدەتیزێنێ، وەك گای تەمەڵی بارنەبەر خۆیم لێ شێت دەکا.

(دەکا)ی یەکەم (کم): ئەکا. (دەکا)ی دووەم (کم، گم): ئەکا.

(١٨) دۆم: خەڵکانی -کاتی خۆی- کلاشی پەڕۆ و بێژنگ و هێڵەك دروستکەر کە کاریان بە چەرم دەبوو.

واتە: ئەگەر لە بازاڕدا بفرۆشرێ، مەگەر هەر دۆم کڕیاری بێ، ئەویش لەبەر مووی یاڵ و کلکی بۆ بنی هێڵەك.

بیفرۆشن (کم، گم): بیفرۆشی. لە لای من، کلك و یاڵی دەست ئەدا (کم، گم): لە کن من. سەیرە، لە (مان)دا (ئە) بەکارهێنراوە!

**دوو قرۆش بۆ ناڵی، شایی کلکی، چەرمی دوو ڕیاڵ**
**پێنج قرۆش و شاییەکە نرخی بۆزەی کەمبەها! (١٩)**
**وەك "خدر قوشچی"، چەقەڵ فێربوون حیسابی فارسی!**
**ئەستێرە دەژمێرن، ئاخۆ لاکی بۆز کەی دێتە لا؟ (٢٠)**

(١٩) ئەم بەیتە لە (مان)دا نییە.

قرۆش: دراوێکی مەعدەنیی هاوتای چل پارەی تورکی بووە. شایی: شاهی، دراوێکی سەردەمی قاجاریی پەنجا دیناری بووە. ڕیاڵ: دراوێکی زیویی قاجاریی هاوتای ١٢٥ دینار بووە، لە ئاخروئۆخری حوکمی قاجاریدا کردوویەتیە قرانێك و پێنج شاهی.

واتە: هەر کەسێك بیکڕێ، دوو قرۆش بۆ ناڵەکەی دادەنێ، کە پاش تۆپینی لێی بکێشرێتەوە و شاییەك بۆ کلکی، بۆ هەموو چەرمەکەیشی دوو ڕیاڵ. لەوەیش دەچێ دوو ڕیاڵ کردبێتیە (٣) قرۆش! بۆیە دەڵێ: ((پێنج قرۆش و شاییەکە نرخی بۆزەی کەم بەها)).

دوو قرۆش (کم): دوو قرۆشی. پێنج قرۆش و شاییەکە (کم): پێنج قرۆش شاییەك. (گم): پێنج قرۆش و شایی. هەردووکیان لەنگن. (ناڵی)، (یاڵی) بووایە باشتر دەبوو. (بو)ی (بۆزەی) بڕگەیەکی کورتە، لەبەرئەوە بە (بوزەی) دەخوێنرێتەوە.

(٢٠) قوشچی: بازچی، بازەوان. دێتە لا: بەلادا دێ، دەتۆپێ.

واتە: چەقەڵ مرخیان لە لاکی بۆزە خۆش کردووە، وەك خدری بازەوان حیسابی ئەستێرەژمێریی بۆ دەکەن، تا بزانن کەی بەلادا دێ و دەتۆپێ.

ناسناوی "سالم" لەم پارچەشیعرەیشدا نییە. بەڵێ، وەك بیرمان بێ، لە هەجووەکانیدا، یا هەر ناوی خۆی نەهێناوە، یان کەم!

ئاخۆ (کم): داخۆ (گم): داخوا. (تێ)ی (ئەستێرە)یش کورتە، بۆیە بە (ئەستیرە) دەخوێنرێتەوە.

## (*) -١١-

ئیبتیدا بۆز له (سنه)ی کردوه چەرا
بوویەتی، چونکە لەوێ، نەشئونوما (١)
باوجوودی عەلەفی دەشت و زەلی
ئارەزووی هیچی نییە، غەیری کەما (٢)
گوو بە گۆڕی پودەری خێوی بەرووی
چونکە دوورە لە کەما، هێزی نەما! (٣)
گەر موقیمی (سنە) بێ، ئەسپی عەرەب
عاقیبەت ئاوی ئەوێ حیزی دەکا! (٤)
کاشْکی دادەدڕا، سفرەصیفەت،
مادەری ئەم سەگە، وەختێ کە دەزا (٥)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لـە (مان، ن، نم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) ئیبتیدا: لـە سەرەتاوە. بۆز: ئەسپەکەیە. سنە: شارێکی گەورەی کوردنشینە لـە کوردستانی ئێران. چەرا: لەوەڕان.

لە سنەی کردوە چەرا (نم): لـە سنە کردوویە چەرا.

(٢) عەلەف: ئـالف، ئالیـك. زەل: قـامیش. کـەما: گیایـەکی کێـویی کوێـستانییە، هـاوین وشـك دەکرێتەوە و هەڵدەگیرێ بۆ وەرزی ساردی زستان و دەدرێتە وڵاخ.

واتای هەردوو بەیتەکە: ئەو، لـە سەرەتاوە لـە (سنە) لەوەڕاوە! چونکە لـەوێ پێ‌گەیشتووە. جـا لـەبەرئەوە، ئەگەرچی ئالیکی ئالیك‌پێ‌دان و زەلی دەشت و دەر زۆرن، چونکە فێری کەمایـە، کـەما نەبێ ئارەزووی خواردنی هیچی‌تر ناکا!

(دشت زلی) لە (مان)دا، دەشێ بە (دەشت و زەلی) یـا (دەشـتی زەڵـێ)یـش بخوێنرێتـەوە. لـە (ن)دا (دەشتی ذەڵێ)یە، دەشتی زەڵێ: دەشتێکی ناوچەی (بەرزنجە)یە لە سلێمانی.

(٣) پدەر: باوك. خێو: خاوەن. بەروو: پێشوو.

واتە: خاوەنەکەی پێشووی خراپی فێر کردووە، بە کەما نەبێ داناکەوێ، بۆیە بێ‌هێزە.

(٤) واتە: تەنانەت ئەسپی عەرەبیش بێ، ئەگەر لە شاری (سنە) بمێنێتەوە، ئاوی ئەوێ حیزی دەکا!

(٥) واتە: خۆزگە دایکی ئەم‌سـەگە لـەو وەختەدا کە دەزا و ئەمی لێ دەبوو، سکی وەك سفرە پان و

**بەسکی بێقووەت و بێتاوە لە دەو**
**ناشْکێنێ لە ڕەها بەیضە بە پا (٦)**
**شیڕەت و شەیهەکەر و عیننینە**
**نییە، ئیللا لە سنە، فەحلی وەها! (٧)**
**طـەبعْکەر، خووگْدەم و فیلخوراك،**
**پۆزەگا، لچشوتور و ڕەعدْصەدا! (٨)**
**تۆزە ڕێی گاهی گلانی لە دەوا،**
**هەرەسئاسا لەسەرا هاژە دەکا (٩)**

یەکالاّ بووایەتەوە و ئەم عیبرەتەی نەبووایە!

(دادرّا) لە (مان)دا هەڵەی نووسینە و (دادەدرا) بووە.

(٦) دەو: ڕاکردن، غار. ڕەه: ڕێ. بەیضە: هێلکە. پا: پێ.

واتە: لە غار و ڕاکردندا ئەوەندە بێهێز و بێتینە، ئەگەر هێلکە لەژێر پێیدا بێ، ناشکێ!

(٧) شـەیهە: حیلـەی ئەسـپ. شـەیهەکەر: حیلـەکردوو. عینـنین: شـلەپەتە، نێرەمـووك و لەپیاوەتیکەوتوو.

واتە: شتێکی سەیروسەمەرەیە، تووڕەیە، حیلەی دەڵێی زەڕەی کەرە، هیچی لەباردا نییە! نێـری وەها نێرەمووك، لەو شارە نەبێ، لە هیچ لایەك نییە!

شەیهەکەر و عیننینە (م): شەیهە و عیننییە. هەڵە و لەنگە. (شەهیەکەر) لە (مـان)دا هەڵەیـە و (شەیهەکەر) ڕاستە.

(٨) خووگ: بەراز. دەم: زار، دەمی بێخواردن. خوراك: خواردن. فیلخوراك: خـواردنی هێنـدەی خواردنی فیل! پۆز: قەپۆز، دەمولەوس. لچ: لێو. ڕەعد: چەخماخە. صەدا: دەنگ.

واتە: خووی خووی کەر، دەم و قەپۆزی وەك هی بەراز، پرخەی وەك هی فیلە، قەپۆزی وەك هـی گا ئەستوور و ناقۆڵایە، لچی وەك لچی وشتر شۆڕبووەتەوە، ئاوازی وەك ناڵەی هەورە تریشقەیە!

(٩) واتە: لە کاتی غاردا کـە دەگلـێ، ڕێگـەوبان هـەمووی دەبێتـە تـەپوتۆز، وەك هـەرەس لەسەردا گل دەبێتەوە و هاژە دەکا! لافاو نەبی و ئەمە حاڵت بێ؟!

تۆزی ڕێی گاهی گلانی لە دەوا (ن): تۆزە .. تاد. تۆزە ڕێگایی گلانی لە دووە.

**پشتی یەك میل و ملی یەك وەجەبە**
**زگی قامیش و خورش خەرمەنی کا! (١٠)**
**مەحوە گۆشتی بەدەنی ئەو بە دەمێ**
**گاهی زینکردنی وەك خیگەیی با! (١١)**
**مەقصەد ئەر دەه قەدەمە، بۆزە دەڵێ:**
**من کوجا، مەنزڵی ئەمشەو لە کوجا (١٢)**
**من گیاهم لە کەفایە و عەزە زین،**
**ڕوو دەکاتە من و لەو جووتە دەدا! (١٣)**

(١٠) وەجەب: درێژایی بستێ. خورش: خواردن. خەرمەن: خەرمان.

واتە: پشتی بەقەد میلێ کە لە ڕێگای دەشتەکاندا دایدەچەقێنن، درێژە. درێژایی ملی بەقەد بستێکە! زگی وەك قامیش باریکە، کەچی خۆراکی خەرمانی کایە!

(١١) مەحوو: نەماو. دەم: هەناسە. خیگە: هیزە، پێستەی حەیوان کە بە تایبەتی بۆ ڕۆن تێکردن خۆشە دەکرێ، ئەوسا بەکارهێنانی ئەم دەفرە باو بووە. خیگەی با: هیزەی پڕ لە با، نەك ڕۆن!

واتە: کاتی زینکردن، هەرچی گۆشتی لەشیەتی بە بایەك! لە دەمیەوە یا لە شوێنێکیتریەوە! دەردەچێ، وەك هیزەی پڕ با کە خاڵیکردنەوەی ماندووبوونی ناوێ! یا لەوانەیە دەم بە واتای هەناسە نەبێ، بەڵکوو مەبەست دەمی کابرا بێ.

خیگەیی با (نم): خیگەیی کا. دیارە هەڵەیە، چونکە هەرگیز خیگە بۆ کا بەکارنەهێنراوە.

(١٢) مەقصەد: جێی مەبەست، ئەو شوێنەی وا ڕێبوار دەیەوێ بیگاتێ. دەه: دە. قەدەم: پێ. کوجا: کوێ.

واتە: ئەگەر ڕێی بۆزە دە پێ بێ، دەڵێ: من لە کوێ و مەنزڵی ئەمشەو لە کوێ؟ کەی دەیگەمێ!

دەڵێ (مان): وەڵێ. من کوجا (نم): من کوجاوو.

(١٣) گیاه: گیا. کەف: بەری دەست. لێرە مەبەست دەستە. عەزە: عەزیز.

واتە: بۆزە ڕوودەکاتە من کە گیام بە دەستەوەیە، بەڵام خەریکە جووتە بگرێتە عەزیز کە زینی بۆ ئامادە کردووە لێی بکا.

ڕوو دەکاتە من و (نم، پ): دەشنێ بۆ من و. جوانترە.

**ناشْنیٚ بۆزە، مەگەر بۆ گـزرە**
**گەردنی ناگْـریٚ، جوز توربەیی کا (١٤)**
**ساعەتیٚ، لۆدەییٚ کا سەهلە بخوا**
**فەرسەخیٚ، صاحێبی خۆی صەعبە ببا! (١٥)**
**بۆ ڕەهیٚ لازمە، ناچیٚ بە کوتەك**
**ڕووبەڕووی پووش و گـْیا دیٚ بە سەما (١٦)**
**وەختیٚ ساغەونی(؟) لە تەعلیمی عەزیز**
**جایی ڕەوت و دەوی هەر لۆقە دەکا (١٧)**

(١٤) ناشنیٚ: ناجووڵیٚ، ئارەزووی نابزویٚ. گـزرە: پووش و پەڵاشی کۆکراوە. جوز: جگە لـە. توربە: توورەکە.

واتە: بۆزە، هەر بە گزرە کەیفی ساز دەبیٚ. تەنیا توورەکەی کا پڕبەپڕی ملیەتی.

گەردنی ناگریٚ جوز توربەیی (نم): گەردنی ناگریٚ حیز توربەیی. هەڵەیە. (گزرە) لە (مان)دا بە (گـــذرە) نووسراوە. دیارە هەڵەیە، چونکە وشـەکە کوردییە. (یٚ)ی (ناگریٚ) کورتە و لـەبـەر کـێش وەك (ی) دەخوێنرێتەوە.

(١٥) لۆدە: کادانێکی درێژە، تا پشتێنەیەك لـە قوڕ بەرز دەکرێتەوە. پڕ دەکریٚ لـە کـا و قەسـەڵی لـەسەر دادەنریٚ و سـەرەکەی بە قـۆقزی سـواخ دەدریٚ. سـەرتیلـەی لـە دوولاوە هەیـە و تـا زسـتان نایشکێنن. فەرسەخ: سیٚ میل یا دوازدە هەزار یاردە (باڵ). صەعب: گران.

واتە: ئاسانە بەلایەوە لۆدەیەك کا بە سەعاتێك بخوا، بەڵام ناتوانیٚ فەرسەخێك ڕیٚ بکا.

(سەهلە) و (صەعبە)، لـە (نم)دا بەرودوا بە (مهلـە) و (طبغە) نووسراون. (بیٚ)ی (لۆدەیـیٚ) کورتـە و لـەبەر کێش بە (لۆدەیی) دەخوێنرێتەوە. (صاحێبی)ش، کورتە و بە (صاحیبی) دەخوێنرێتەوە.

(١٦) ڕەهیٚ: ڕێیەك. ڕەهیٚ (ڕەهی)ش هەڵدەگریٚ.

واتە: کوتەکیش بە سەریدا بکێشی، ناچیٚ بۆ شوێنی پێویست. کەچی بە سەماوە بەرەو پووش و گیا دیٚ.

(١٧) ساغەونی: ساغ نەبووەوە چییە؟ دەشیٚ (ساغە و دیٚ) بیٚ. تەعلیم: مەشق و فێرکردن. جا: جیٚ. دەو: غار و ڕاکردن. لۆقە: هەنگاوی گەورە.

ئەگەر (ساغە و دیٚ) بیٚ، کە ڕێی تیٚدەچیٚ، واتە: کاتیٚ ساغە و پاش مەشـق و ڕاهێـنـانی عـەزیز دێتەوە، لـە جێی ڕەوت و غاریدا هەر لۆقە دەکا.

**دەشْـكێنیٚ دەهەنی سەنگی زەمین**
**بەس بە سەرسم، لە ڕەها سوجدە دەبا (١٨)**
**گاهی دەو، خووگْصیفەت، گەر شەقی کەی**
**لە عەقەب، ناگەڕیٚ ئەستۆی بە قەفا (١٩)**
**بە حەقیقەت نییە جوز کوڕڕەیی شێخ**
**لە هەموو ڕوویی زەمین، عیبرەتی وا (٢٠)**
**بەسە "سالم!"، مەکە لەم سەبکە خەیاڵ**
**لادە لەم فیکرە، حەیای بۆزە نەما (٢١)**

عەزیز (نم): سنە. (تیٚ)ی (وەختیٚ) کورتە و بە (وەختی) دەخوێنرێتەوە.

(١٨) دەهەن: دەم. سەنگ: بەرد. بەس: ئەوەندە زۆر. سەرسم: هەڵنووتان، بەسەرداکەوتن. سوجدە: کڕنووش.

واتە: لە ڕێدا ئەوەندە زۆر سەرسم دەدا و کڕنووش دەبا، بەردی زەوی دەم و ددانی دەشکێنیٚ.

بە سەرسم، لە ڕەها (ن): لە سەرسمدا بە سەر.

(١٩) گاه: کات. خووگ‌صیفەت: سیفەت وەك بەراز. عەقەب: دوا. ئەستۆ: گەردن. قەفا: پشت.

واتە: لە کاتی غاردا وەك بەرازە، ئەگەر لە دواوە لەتوپەتی بکەی، ملی بەرەو پشتی هەڵناگەڕێتەوە. ئەگەر وەربگەڕێتەوە، تیرەی قنگی دەپچڕیٚ!

لە عەقەب، ناگەڕیٚ ئەستۆی بە قەفا (ن): لە عەقەب، ناگەڕیٚ ئەستۆی لە قەفا. (نم): گەردنی ناگەڕیٚ بۆ سوویی قەضا.

(ئەستۆ)ی شێوەنووسی (مان) (اسطو)یە، دیارە هەڵەیەکی زەقە.

(٢٠) جوز: جگە لە. کوڕڕە: بێچووی ولاخ. عیبرەت: پەند.

واتە: لە ڕاستیدا هەموو ڕووی زەمین بێچووە ولاخێکی وەك ئەمەی شێخ بەپەندبووی تێدا نییە.

بە حەقیقەت نییە جوز کوڕڕەیی (نم): بە حەقیقەت نییە جر کردەیی. هەڵەیە.

(٢١) سەبك: دارشتن، لێرە شیعردانانە بەم شێوە هەجوە.

واتە: سالم، بیر لەم جۆرە دارشتنەی شیعر مەکەرەوە، چونکە بۆزە ئابڕووی چووە.

## -١٢- (*)

**موعجیزەی یاری پەریچیهرەی دڵارامم شکا**
**شەططی ساوا، تاقی کیسرا، ئاگری یەزدان فەنا (١)**
**ڕووی جیهان بێڕەونەقە، یاران بڵێن با دەرکەوێ**
**سەرْووقەددی جامەنەسرین، ماهْـڕوویی گوڵقەبا (٢)**
**هۆش لە کوێ؟ ئارام لە کوێ؟ ئەی قوڕبەسەر خۆم و خیرەد**
**چاوی پڕئەفسوونی مەیگوونی بە ئیما دڵ دەبا (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (نم، پ، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) پەریچیهرە: ڕوخسار شێوەپەری، ساوا: ساوە، دەریاچەیەکە لای شاری (سەماوە)ی خـوارووی عیراق؛ دەڵێن –گوایە– هەموو ساڵێك زەلامێکی تێدا خنکێندراوە، تا لـە لافـاو ڕزگـار بـبن. ئاوەکـە، شەوی لەدایکبوونی پێغەمبەر (د.خ) ڕۆچووە و دەریاچەکە وشك بووە. هەر ئەو شەوە، تاقی کیـسرا کـە نیشانەی دەسەڵاتی فارس بووە، لـەت بووە و ئاگری ئاگرپەرستان، ئەگەرچی پاسەوانی بە دیارەوە بووە تا نەکوژێتەوە، کوژاوەتەوە. ئەم ڕووداوانـە بـە نیـشانەی گـەورەیی پێغەمبـەر (د.خ) دانـراون و ئـەوەیان گەیاندووە کە ستەم و بێدینی بە پەیدابوونی ئەو نامێنن و دەپێچرێنەوە. ساوە، شوێنێکی خوراسانیشە.

واتە: سالم ئێستا دەڵێ؛ موعجیزەی یاری ڕوومەتپەریی من، ئـەم کـارە گەورانـە دەکـا و ئـەو شتانەی وا باس کران، لەناویان دەبا.

شەططی ساوا (گم): ئاوی (ساوە). ئاگری یەزدان (پ): ئاتەشی نیران. (گم): ئاگری زەردەشت.

(٢) سەروقەد: باڵا وەك سـەرو. جامە: کراس. نەسرین: گوڵێکی جـوانی بـچووکی فرەپەڕەیـە، کراسی یاری سالم لـە ڕەنگی جۆراوجۆری ئەو گوڵەیە! ماهڕوو: ڕوخسـار وەك مانگ. قەبا: کەوا.

واتە: یاران، با باڵای وەك سەرو و کراسی وەك گوڵی نەسرین و ڕووی وەك مـانگ و کـەوای وەك گوڵی یار دەربکەون.

یاران بڵێن (نم): بارێ بڵێن. گوڵ قەبا (گم): مەخمەڵ قەبا.

(٣) خیرەد: عەقڵ. ئەفسوون: سیحر، فێڵ. مەیگوون: شێوەی مەی. ئیما: ئیشارەتکردن.

واتە: کە چاوی پڕ لـە سیحر و خوماری یار بە ئیشارەت دڵ بۆ خۆی بەرێ، ئیتر وێرانەماڵ خۆم کە هۆش و ئارامم نامێنن.

بەخ بەخ ئەی یاران! تەماشای شەوکەتی ئەم جیلوە کەن
دیدەئاهوو، عەنبەرینموو، موشکبوو، حۆریلیقا (٤)
ڕووی دڵارامم بەهەشتێکە لە ئیمکانی خوڵوود
ئارێ، ئارێ! مەنعی نەسلی ئادەمی بۆیە دەکا (٥)
دڵ بە لەمحە ناسرەوێ، هەرگیز لە پەیکانی موژەی
دەم بە دەم، ئیما بە ئیما، دێ وەکوو تیری قەضا (٦)
ڕەشکی نافەی، بۆیی زوڵفی، نافی غونچەی کرد بە خوێن
وا لە گەردنیا خەراجی گەردنی ئاهووی خەتا (٧)

ئەی (پ): هەی. پڕئەفسوونی مەیگوونی (گم): پڕ ئەفسوونی من ...

(٤) بەخ بەخ: هەی هەی. جیلوە: جوانی و ورشە. دیدەئاهوو: چاوئاسك. عەنبەرینموو: موو بۆندار وەك عەنبەر. موشكبوو: بۆنی میسك پێوە. حۆریلیقا: پەری شێوە و ڕوخسار.

واتە: هەی هەی یاران، بە خۆشییەوە بڕواننە دەرکەوتنی ئەم شۆخە، کە ئەو نیشانانەی سەرەوەی هەن.

بەخ بەخ ئەی یاران (گم): بەخ و بەخ یاران. شەوکەتی ئەم جیلوە کەن (گم): جیلوەی ئەم شیرینە کەن.

(٥) ئیمکان: لەکردنهاتوو. خولوود: نەمری. مەنع: قەدەغەکردن. نەسل: نەوە، وەچە.

واتە: ڕوخساری یارم لە باریدایە وەك بەهەشت ببێتە مایەی نەمری. بەڵێ، بۆیە ئەمیش وەك ئەو سێوە کە لە ئادەم قەدەغە کرا، لە من قەدەغە کراوە.

ئارێ ئارێ (پ): ئار ئارێ. هەڵەی نووسینە. (ڕێ)ی (ئارێ) کورتە و لەبەر کێش بە (ئاری) دەخوێنرێتەوە. مەنعی نەسلی (گم): عیشقی نەسلی. بۆیە (پ): بە دەی. دەی، یەکەم مانگی زستان بە حیسابیساڵی هەتاوی.

(٦) لەمحە: چاوتروو کاندنێك. پەیکان: سەرەتیر. موژە: برژانگ. دەم بە دەم: هەناسە بە هەناسە، سات بە سات. ئیما بە ئیما: ئیشارەت دوای ئیشارەت. تیری قەضا: تیری قەدەر (چارەنووس).

واتە: دڵ، لەبەر سەرەتیری برژانگی یار، تەنانەت بۆ چاوتروو کانێکیش سرەوتی نییە. نیگا و ئیشارەتی چاوی، هەناسە بە هەناسە یا سات بە سات یەکبینە وەك تیری قەدەر دێ.

بە لەمحە ناسرەوێ (گم): هەمیشە ناسرەوێ. موژەی (پ): موژە.

(٧) ڕەشك: بەخیلیپێبردن. نافە: ناوك، میسکی بۆنخۆشی بنناوکی ئاسك. ناف: ناوسك،

**گەر لە سایەی ئاسْتانەی دڵبەرم جێم دەستکەوێ**
**قەت شەرەف ناکەم هەوەس ئیتر لەژێر پەڕی هوما (٨)**
**جان موحەققەر، نەقدبەرکەف، سەرفْگەندە و مونتەظیر**
**خوسرەوی خووبان بڵێن: "سالم" ئەوا پێشکەش دەکا (٩)**

ناوجەرگ. وا لە گەردنیا: ئۆباڵی لە ئەستۆیدایە. خەراج: داهات و باج. ئاهوو: ئاسك. خەتا: شاری خەتا.

واتە: یاری ئاسكشێوەم بە بۆنی ئەگریجەی خۆی دڵی خونچەگوڵی بریندار کرد، چونکە بازاڕی بۆنی خونچە لە ئاستی ئەو بۆنەدا شکا. ئاسکی خەتایش کە –بە هەمان شێوە– بە هۆی میسکی ناوکی یارەوە باوی نەما، ئۆباڵ و باجەکەی لە ئەستۆی ئەودان.

نافەی (گم): نازی. بۆیی (گم): بۆنی. نافی غونچەی (گم): قەلبی خونچەی. قەلب ڕاستە.

(٨) ئاستانە: بەردەرگا، کەوشکەن. هوما: باڵندەی هوما، پیرۆزە.

واتە: ئەگەر جێیەکم لە بەردەرگای ماڵی یاردا دەست بکەوێ تێیدا بکەوم، هەرگیز ئارەزوو ناکەم شەرەفی ئەوەم پێ ببڕێ بچمە ژێر باڵی هوما و پایەی پادشاییم بە نسیب بێ.

جێم (پ): جێ. قەت شەرەف ناکەم هەوەس (پ): ئارەزوو ناکەم شەرەف. (گم): قەت هەوەس ناکەم ئەمن. پەڕری (پ): باڵی. دروستترە.

(٩) جان: گیان. موحەققەر: ناچیز و بێنرخ. نەقد: دراو، کینایەیە لە دڵ. بەرکەف: لەسەر لەپی دەست. سەرفگەندە: زەبوون و سەرداخستوو. خوسرەوی خووبان: شای جوانان.

واتە: سالم، گیانی بێنرخ و ناچیزە، دڵی لەسەر بەری دەست زەبوون و چاوەڕوانە. بە شای جوانان بڵێن: گیان و دڵی پێشکەش دەکا.

نەقدە بەرکەف (نم، گم): نەقد دەرکەف. مونتەظیر (گم): چاوەڕێ. دەکا (نم، گم): ئەکا.

## -١٣- (*)

**حەسرەتا دڵ غافڵە، نازانێ قیسمەت چی دەکا؟**
**ئەمڕۆ ئێرەم بوو بە مەسکەن، ئاخۆ فەردا کوێم دەبا؟!** (١)
**بەدرەقەی میحنەتنومایە، شاطری تەقدیر مودام**
**دەستکەشمە و پێشڕەو، دەمبا بە مەنزڵگای بەڵا!** (٢)
**نابەڵەد بێچارە بوو دڵ، ئارەزووی ئارامیی کرد**
**هات و نەیزانی، لەپڕدا کەوتە ناو چاهی جەفا!** (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (نم، گم)دا هەیە. لە (نم)دا نووسراوە: ((ئەوەی ئاتی ئەو هەڵبەستەیە کە "عەبدوڕڕەحمان سالم" فەرموویەتی کە چووەتە شاری (حیللە)، لە ماڵە عارەبێك میوان بووە، خزمەتیان نەکردووە)).

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) حەسرەتا: بەداخەوە. مەسکەن: خانوو، جێی دانیشتن. فەردا: سبەی. کوێم دەبا: بۆ کوێم دەبا.

واتە: دڵ بێئاگایە لەوە کە چارەنووس چی بەسەر مرۆڤدا دێنێ. ئەمڕۆ جێوڕێی لێرەیە، سبەی نازانێ بەرەو کوێی دەبا.

حەسرەتا (گم): ئاخ و داخ. ئەمڕۆ لێرەم بوو بە مەسکەن، ئاخۆ فەردا.. (گم): ئەمڕۆ وا لێرەم، بەڵام ئاخۆ بەیانی.. (نم)یش (ئێرەم)ی بە هەڵە بە (لێرەم) نووسیوە.

(٢) بەدرەقە: ڕابەر، ڕێنیشاندەر. میحنەتنوما: نیشاندەری مەینەت. شاطر: پێشڕەوی کاروان، تەتەر. تەقدیر: چارەنووس. مودام: هەمیشە. دەستکەش: دەستڕاکێش، دەستگر.

واتە: مەینەت ئاشکرا دیارە، چونکە تەتەری چارەنووس هەمیشە دەستم ڕادەکێشێ و پێشڕەو و چاوساغمە، بەرەو مەڵبەندی نەهامەتی و بەڵام دەبا.

(دەستکەشمە) لە (نم)دا بە هەڵە بە (دەستی کەشمە) نووسراوە. ئەم بەیتە لە (گم)دا بەم شێوەیەیە:

شاتری تەقدیر کە پێش‌کەوت، ڕاتەکێشێ و تۆ دەڕۆی
کاتێ دەیزانی کەوا خستوتیە ناو دامی بەڵا

(٣) ئەم بەیتە لە (گم)دا نییە.

نابەڵەد: ناشارەزا. چاه: چاڵ.

واتە: دڵ کە هەوڵی ئارامگرتن دەدا، ناچار بە ناشارەزایی ملی نا و کوتوپڕ کەوتە ناو چاڵی مەینەت و دەردەسەری.

**(حیلله) خورمایه، منیش مێش، جیسری دامی عەنکەبووت**
**نەفسی سەرکەش دامنەدیوە، ڕوو لە شیرینی دەکا (٤)**
**گەردشی دەوران جڵەوکێش بردمیەماڵی عارەبێ**
**چووم و دیم، ئەمما نەچوومایە، دریغا، حەسرەتا! (٥)**
**تەڵـخْکام و تەڵـخْوەقت و تەڵـخْڕووم کرد ساعەتەن**
**تەڵخییێکم خستە ڕووی، زەهریش بە ئینسانی نەکا (٦)**

(٤) حیللـە: شـاری (حیللـە)ی ناوەڕاسـتی عـێراق. جیـسر: پـرد. دام: داو. عەنکـەبووت: جاڵجاڵۆکە. سـەرکەش: سەرکێش.

واتە: حیللـە شاری شیرینیی خورمایە و منیش وەك مێش ڕوو لـەو شیرینییە دەکەم. بەڵام ناچـارم بەو پردەدا بپەڕمەوە کە وەك تەونی جاڵجاڵۆکە وایە. نەفسی سەرکێـشم ئـەو تەونـە نابینـێ و تێـی دەکەوێ. یانێ ڕێم کەوتە ئەو شارە و لێی مامەوە.

(شیرینی) لـە (نم)دا بە هەڵە بە (شیرنە) نووسراوە. حیللـە (گم): چڵە. هەڵەیـە. منـیش مـێش، جیسری دامی عەنکەبووت (گم): منیش مێشێکی زۆر شیرین پەرست. دامنەدیوە، ڕوو لـە شـیرینی دەکا (گم): ڕوو لـە خورمای کوردکوژی بەدفەڕ دەکا.

(٥) گەردش: سووڕان. دەوران: ڕۆژگار.

واتە: گێژ و خولی ڕۆژگار گەیاندمیە ماڵە عەرەبێك، خۆزگە ڕێم تێنەکەوتایە و هیچم نەبینیایە.

گەردشی دەوران (گم): ڕەهبەری قیسمەت. بردمیە ماڵی عارەبێ (گم): بردیە مـاڵی .. . چـووم و دیم، ئەمما نەچوومایە، دریغا، حەسرەتا (گم): کاشکی هەرگیز من نەچوومایە، بەڵام چارم نەما.

(٦) ئەم بەیتە و سێ بەیتی پاشەوەی لـە (گم)دا نین.

تەڵـخ: تاڵ. کام: ئارەزوو. ساعەتەن: لـەو ئانوساتەدا، هاوکات.

دەبوو ئەم بەیتە بەو پێیە کە هەر ئەو ماڵە عەرەبە مایەی ناڕەحەتیی ئەم بوون، وا بووبێ:

تەڵخکام و تەڵخوەقت و تەڵخڕووی کرد ساعەتەن

تەڵخییێکی خستە ڕووم، زەهریش بە ئینسانی نەکا

واتە: دەمودەست ئارەزوو و کات و ڕوخسارێکی تاڵی نیشان دام، ڕوخساری منیشی تاڵ و دڵـی تەنگ کردم، وەك چۆن ژەهر کار لـە مرۆڤ دەکا.

**عالەمی ئینسانییەت لاچوو لە لای ئەمن و ئەوی،**
**من لەتاو عیجزی ضەمیری، ئەو لەبەر فەقدی وەفا (٧)**
**لای یەساری دیدەوو گوێ، بۆی نەما سەمع و بەصەر**
**ئەهلی دەستی چەپ لە یومنی من ئومێدیان لێ بڕا (٨)**
**هێندە مات دانیشتم و نەیپرسی، ئەژنۆم هاتە ژان**
**ناعیلاج وەك پووش لە مەوجی نابەڵەد خۆم گرتە لا (٩)**
**حوجرەیێکم کەوتە دەست و چوومە ناوی وەك قەفەس**
**کەبکی جەنگئاسا لە برسان دڵ لە سینەم سەر دەدا (١٠)**
**خۆم چەپۆکم دا بەسەردا، ئەسپەکەم شیوەنیەتی**
**تازەمان کرد هەردو لا شینی شەهیدی کەربەلا! (١١)**

(٧) عیجز: لەکارکەوتن. ضەمیر: ویژدان. فەقد: لەدەستدان.

واتە: ئیتر مرۆدۆستی لە نێوانمانـدا هـەڵگیرا، مـن لەبەرئـەوەی ئـەو ویـژدانی نـەبوو، ئـەویش لەبەرئەوەی من بێوەفا بووم.

(٨) یەسار: چەپ. سەمع: بیستن. بەصەر: بینین. یومن: ڕاست.

واتە: لە بێزاریدا، چاو و گوێی لای چەپ، نەبین و نەبیست بوون. ئەوانەی لە لای ڕاستیشەوە بوون، هیوایان نەما.

(٩) مەوج: شەپۆل. خۆم گرتەلا: خۆم خستە لایەکەوە، گۆشەیەکم گرت.

واتە: ئەوەندە مات و کز دانیشتم و ئەو لێی نەپرسیمەوە، ئەژنۆم کەوتە ئازار. وەك چۆن پووش دەکەوێتە بەر شەپۆلی بێئامانی ئاو، ئاوا کەنارم گرت.

(١٠) حوجرە: ژوور، هۆدە. کەبکی جەنگئاسا: وەك کەوی شەڕەکەو. سەر دەدا: سەری پێدا دەکێشێ.

واتە: چوومە ناو ژوورێکی وەك قەفەس، وەك کەوێکی شەڕکردووی ماندوو لـە برسـاندا بێئارام بووم، دڵم لـە سینەمدا هەدای نەدەدا.

قەفەس (گم): قەفەز. کەبکی جەنگئاسا لـە برسان (گم): وەك کەوی تۆڕ دڵ لـە برسانا. ئـەدا (گم): دەدا. لـە (نم)دا بە هەڵە (چەنگئاسا) نووسراوە.

(١١) واتە: خۆم بە چەپۆك بە سەردا دەکێشم و ئەسپەکەم شیوەن دەکا. هـەردووکمان شـینی شەهیدی کەربەلامان تازە کردەوە.

**ئەهلی کووفە فەقدی ئاویان کرد لە میهمانی عەزیز،**
**خانەخوێی من مەنعی نان و قووت و جێگەوڕێ دەکا! (١٢)**
**خانەخوێم میهماننەوازە، وەرنە سەیری حورمەتم،**
**دۆشەکی خۆ خاك و خۆڵە، سەرکەشی ئەسپم سەما! (١٣)**
**شیشی سوور بێنن، وەرن خاڵیگەمان داغ کەن بە جووت**
**چونکە ژانمانە، من و ئەسپم، لەبەر سەردیی هەوا! (١٤)**
**توورەکەی ئەسپم زەمین و موتتەکای خۆم زانووە**
**قووتی من خوێنی جگەر، خۆراکی ئەو تەصویری کا! (١٥)**

خۆم چەپۆکم دا بەسەردا (گم): من چەپۆکم دا بەسەرما. شیوەنیەتی (گم): سمکۆڵی کرد.

(١٢) فەقدی ئاویان کرد: ئاویان نەدایێ. میهمان: میوان.

واتە: خەڵکی کووفە لە کاتی شەڕی "حسەین"ی شەهیددا، ئاویان لە میوانی خانەدان و خۆشەویست بڕی، خانەخوێی من ئاو و نان و جێ‌وڕێشم لێ قەدەغە دەکا.

فەقدی ئاویان کرد (گم): ئاوبڕیان کردووە. میهمان (گم): میوان. قووت و جێگە و ڕێ دەکا (گم): ئاو و ڕێ‌وجێم لێ دەکا.

(١٣) میهماننەواز: میواندۆست. دۆشەك: ژێڕڕاخەری لە خوری، لۆکە یا پەڕۆ. سەرکەش: لێفە، ئەوەی بەسەردا دەکێشرێ.

واتە: خانەخوێم میواندۆستە، بڕوانن چۆن ڕێزی لێ ناوم؛ خۆم خاك‌وخۆڵ دۆشەکمە، لێفەی ئەسپەکەیشم ئاسمانە.

میهماننەوازە (گم): میواننەوازە. حورمەتم (گم): پیاوەتی. سەرکەشی (گم): سەر ڕاخەری.

(١٤) خاڵیگە: لاکەلەکە، قەبرغە، خوار پەراسوو.

واتە: من و ئەسپەکەم بە هۆی سەرمای شەوەوە کوڵنج و برکمان کردووە. چارمان ئەوەیە لاقەبرغەمان بە شیشی سوورەوەکراو داخ بکەن، تا ژانمان نەمێنێ.

ژانمانە (گم): ژانمان کرد.

(١٥) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (گم)دا نین.

موتتەکا: ڕاگر، ئەوەی خۆی بەسەردا بدەی و ڕای‌بگرێ. زانوو: ئەژنۆ.

واتە: ئەسپەکەم هیچ نییە بیخوا، مەگەر وێنەی کا خۆراکی بێ. خۆیشم سەرم کردووەتە سەر ئەژنۆ و خوێنی جگەری خۆم خۆراکمە.

کورکەکورکیە ئەسپەکەم، خۆشم دەناڵم جاربەجار
ئەو لە داخی ئاخوڕ و جۆ، من لە حەسرەت جێ و چرا! (١٦)
با من و بارگیری کوێت هەردوو بنووین، بەشکم بە خەو
من ببینم ڕووی طەعام و ئەو ببینێ ڕووی چەرا! (١٧)
ئاخوڕی ئەسپم هەوایە، خوانی خۆراکم خەیاڵ
لازمە بۆ ڕەفعی جووع هەردوو بکەین دەممان لە با (١٨)
ئاهی خۆم بۆ نانی جۆ، سمکۆڵی ئەسپم بۆ حەشیش
ئەم گەیشتە پشتی ماهی، ئەو گەیشتە ڕووی سەما (١٩)
چاوی قووچاند ئەسپەکەم، باقڵ تەویلەی هاتە یاد
دڵ لە سینەم ماتە، تەحقیق، یادی جێگەی خەو ئەکا (٢٠)

(١٦) کورکەکورك: گریان و لالانەوە. ئاخوڕ: جێی ئالیکدان بە وڵاخ.

واتە: ئەسپەکەم دەلالێتەوە بۆ ئاخوڕ و جۆ، منیش ناڵەناڵمە بۆ جێیەکی نوستن و چرایەکی ڕووناکی.

(١٧) خەو: خەوبینین. طەعام: خواردەمەنی. چەرا: لەوەڕ.

واتە: تا من بە خەو چێشت و خواردن و ئەو لەوەڕ ببینێ، باشتر وایە هەردووکمان بخەوین.

با من و (گم): ئەمن و. طەعام (گم): خۆراك. ڕووی چەرا (گم): ڕوویی کا.

(١٨) لازمە: پێویستە. ڕەفعی جووع: نەهێشتنی برسێتی، خۆتێرکردن.

واتە: لەبەرئەوەی هەوا ئاخوڕی ئەسپمە و خۆیشم خوانی خواردن بە خەیاڵ دەبینم، دەبێ هەردووکمان دەم بکەینە هەوا تا برسێتیمان لە بیر بچێتەوە.

لازمە بۆ ڕەفعی جووع هەردوو بکەین دەممان لە با (گم): هەردوو برسی ماینەوە، وا چاکە ڕوو بکەینە هەوا.

(١٩) حەشیش: گژوگیا. ماهی: ماسی، ئەو ماسییەی کە گاکەی لەسەر پشتە و دنیایش لەسەر شاخی گاکەیە. سەما: ئاسمان.

واتە: من بە عەزرەتی نانێکی جۆوەم، کە بە ناخی ئەرزدا چووە و نایگەمێ، ئەسپەکەیشم سمکۆڵ دەکا بۆ گژوگیا کە لە بەردەستدا نییە و لە ئاسماندایە.

ئەم گەیشتە پشتی (گم): ئەو گەیشتە پشتی. ئەو گەیشتە ڕووی (گم): ئەم گەیشتە ڕووی.

(٢٠) قووچاند: نووقاند. باقڵ: پێم وابێ، بە عەقڵی من.

واتە: ئەسپەکەم چاوی نووقاند تا تەویلەی بیر بێتەوە. دڵی منیش سست بوو، لەوە دەچێ یادی جێی

**لووتی داژەند ئەسپەکەم، خۆم دەستەئەژنۆ، ماتی غەم**
**من لە فیکری حاڵی ئەو، ئەو شینی حاڵی من دەکا (٢١)**
**ئەمن و ئەسپ ئوستاد و شاگردین لە تەصویری خەیاڵ**
**ئەو لە نەقشی توورەکە، ئەمنیش لە صونعی بۆرییا (٢٢)**
**شاممە میغناطیسە بۆ بۆنی کەبابی سەرگوزەر**
**لێوی ئەسپم جاذیبی پووشە بە میثلی کەهرَوبا (٢٣)**

خەو بکاتەوە.

قووچاند (نم): قووچان. باقڵ تەویلەی هاتە یاد (گم): باقڵم تەویلەی کەوتە یاد. ماتە، تەحقیق (گم): هات و ڕەنگە. ئەکا (گم): بکا. دەبێ (دەکا) بووبێ و گۆڕدرابێ.

(٢١) لووتی داژەند: لە بێزاریدا سەری شۆڕ کردەوە.

واتە: ئەسپەکەم نائومێد بوو و سەریی داخست. منیش دەستەوئەژنۆ خەمبارم. هەر یەکەیشمان خەفەت بۆ حاڵی ئەوی‌تر دەخوا.

داژەند (نم): داژەن. ماتی غەم (گم): شۆڕەمل.

(٢٢) ئوستاد: مامۆستا. تەصویر: وێنەکێشان. صونع: دروستکردن. بۆرییا: حەسیر کە لە قامیشی باریك دەتەنرێ و لە ناچاریدا وەك ڕایەخ بەکار دەهێنرێ.

واتە: من و ئەسپەکەم لە وێنەی خەیاڵکردندا وەك مامۆستا و قوتابی واین؛ ئەو وێنەی توورەکە دەکێشێ، منیش وێنەی حەسیرێکی ڕاخەر دەکێشم.

ئوستاد و شاگردین لە تەصویری خەیاڵ (گم): هەردوو بە جووت ئوستاد و شاگردی خەیاڵ. ئەمنیش لە صونعی بۆرییا (گم): من بۆ حەسیری بووریا.

(٢٣) شاممە: ئەندامی بۆنکردن، لووت. میغناطیس: موقناتیس، ئاسنڕاکێش. سەرگوزەر: سەرکۆڵان، سەرەتای شوێن. جاذیب: ڕاکێش. کەهرَوبا: کاڕاکێش، بەردێکی بەنرخە هێزی ڕاکێشانی کا و پووشی تێدایە.

واتە: ئەندامی بۆنکردن، وەك چۆن موگناتیس ئاسن ڕادەکێشێ، ئاوا بۆنی کەبابی سەرکۆڵان دەکا و ئەو بۆنوبەرامەیە ڕادەکێشێ. لێوی ئەسپەکەیشم، وەك کاڕاکێش، کا ڕادەکێشێ.

ئەسپم جاذیبی پووشە (گم): ئەسپ بۆ جاذیبەی پووشێ.

**مورژده بێ یاران! له برسانا ددانی ئەسپەکەم**
**بۆ بژارەی پووشی ناو خشت کاری دیواربڕ دەکا! (٢٤)**
**سەنگکرۆژێکه له برسانا ددانی گردەکوێت**
**هەر دەڵێی مێبازی ناوشاره و خەیاری نەو دەخوا! (٢٥)**
**زۆر دەترسم تا سەحەر دووبڕصیفەت بێ تەوسەنم**
**وا له حەسرەت پووشی خورما دەم له کلکی خۆی ئەدا (٢٦)**
**وا دەزانێ زینەکەی پالانی پووشه، گردەکوێت**
**وەك مقاش جارجار لەلاوه لچ له لاپێچکەی دەخا (٢٧)**
**ثانیی عەنقایه وەیا گۆگردی ئەحمەر، پیاوەتی**
**لەم دەره میوانی مەظلووم ئەر نەچێ، چۆن دەردەبا؟ (٢٨)**

(٢٤) دیواربڕ: هەر کەس یا ئامرازێك دیوار ببڕێ و کونی بکا.
واته: یاران ئەسپەکەم هێنده برسییه، وا ناچار دیوار دەبڕێ، تا پووشی ناو خشتی دیوار دەربهێنێ بۆ خواردن.
مورژده بێ یاران (گم): سەیری کەن یاران.
(٢٥) سەنگکرۆژ: بەردکرۆژ، بەرددادکرمێن، بەردخۆر. گردە: خڕە. نەو: نوێ، تازە.
واته: ئەم ئەسپه بەرد له برساندا دادەکرۆژێ، وا به ئاووتاوەوه دەیخوا، دەڵێی مێبازه به ناو شاردا وەربووه، لێره و لەوێ خەیار دەخوا.
مێبازی (گم): بازاڕی. نەو (گم): نوێ. دەخوا (نم): ئەخوا.
(٢٦) ئەم بەیته له (گم)دا نییه.
سەحەر: بەرەبەیان. دووپەڕصیفەت: مانایەکی ئەوتۆی نییه، دەبێ (دووبڕ) بێ، به مانای ئەسپی دووساڵ تەمەن بڕیو، یا (دۆبڕ)ە ناشوکوره و دزی بڕیوه. تەوسەن: ئەسپی سەرکێش و ڕامنەکراو.
واته: ئەم ئەسپه دوو ساڵ تەمەنی تەواو کردووه، بۆیه سەرکێشه. دەترسم تا بەرەبەیان به داخی پووشی خورماوه کلکی خۆی بخوا.
(٢٧) پالان: پێش و پاشی کورتانی کەر که کای تێدەکرێ تا تووشی پشتەڕێشه نەبێ. کوێت: ئەسپی سووری ئامالڕەش. مقاش: ماشەی پشکۆگرتن. لاپێچکه: ئەملاوئەولای دەست و پێ.
واته: ئەسپەکەم پێی وایه زینەکەی پالانی کورتانه که پووشی تێدایه، بۆیه جاروبار دەمی بۆ دەبا.
(٢٨) ئەم بەیته و بەیتی پاشەوەی له (گم)دا نین.

مەجلیسێ بۆ زیب و زینەت (جیم و ڕێ)ی پێ لازمە
ئیبتیدای ئیسمی لەسەر (ڕێ) (ئەلف و نوون)ی موقتەضا (٢٩)
گەر عەرەب بەم نەوعە بن، با شیری وشتر بێتە ناو
وەر زەبیبطەبعن، هەزاران مەرحەبا، ئەهلی صەفا (٣٠)
من لە فیکری حاڵی خۆمدا، ئەسپەکەش ((هذا القیاس))
تۆی خودایا قادر و تۆی ((رَبَّنا)) موشکیلگوشا (٣١)

ثانی: دووەم. عەنقا: سیمورغ، پەلـەوەرێکی ئەفسانەییە، نـاوە و نـاوەڕۆکی نییـە. ئەحمـەر: سـوور. مەظـڵووم: زوڵمڵێکراو. لەم دەرە: لەم ناوە. ئەر: ئەگەر. دەردەبا: تەحەمول دەکا.

واتە: پیاوەتی، یا عەنقای دووەمە کە هەر ناوە و ناوەڕۆکی نییە، یان گۆگردی سووری بۆنناخۆش. میوانی زۆرلێکراو لەم ناوەدا، ئەگەر نەڕوا، چۆن دەردەبا؟! گـۆگردی سـوور کینایەیـە لـە وەلیـەکی گەورە کە گەفی کردووە، بە گەفلێکـراوی نوانـدووە. بـەو پێیـە، وا دەگـەیێنێ کـە پیـاوەتی لایەنـە باشەکەی نەماوە و بووە بە خراپییەکی تەواو، وەك وەلیـەکی تووڕە هەر لـە خۆوە زیانت لێ دەدا.

(٢٩) زیب: جوانی. زینەت: ڕازاندنەوە. موقتەضا: پێویست.

واتە: مەجلیس و کۆڕی جوان و ڕازاوە، کۆکردنەوەی پیتەکانی (ج، ی، ر، ا، ن)، واتە جیران، (دراوسێ)ی پێویستە کە دراوسێیەتی بفامێ و خوڵقی میوان بکا.

(٣٠) زەبیب: مێوژ. زەبیبطـەبع: تەبیعەتمێـوژی، کـە مێـوژ بەرهـەمێکی کوردەوارییـە. وەر: وە ئەگەر. طەبع: تەبیعەت، مۆرك و شەقڵ. ئەهلی صەفا: دڵپاکان.

واتە: ئەگەر ئەمە تەبیعەتی عەرەب بێ، با هەر شیری حوشتریان لـە ئارادا بێ. ئەگەر مێوژتەبیعەتیشن، کە میوژ نیشانەی کوردە –یانێ دەبێ تەبیعەتیان لـە کورد بچێ– ئەوا هەزار سڵاو لـە دڵپاکان.

زەبیب (نم): شەبیب. دیارە هەڵەیە. (ئەهلی صـەفا) بە (ئەهلـەن صـەفا) نووسـراوە. (عـەرەب) و (وشتر) لـە (گم)دا نوختەیان لـە جێ دانراوە.

(٣١) ئەم بەیتە لـە (گم)دا نییە.

هـذا القیـاس: بـەم پێوانەیـە. قـادر: توانـا. مـوشـکیلگوشـا: چارەسـەرکەری گیروگرفـت، گرێکوێرەکەرەوە، خۆشەوەکەرە.

واتە: من و ئەسپەکەم بە هەمان شێوە بیر لـە حاڵی خۆمان دەکەینەوە. هەر خودای گەورەیشمان خۆشەوەکەرەیە و توانی چارەسەرکردنی گیروگرفتی هەیە.

**هەمنشینم قەد نەبێ ئیتر عەرەب تا حاڵی مەرگ**
**ئاینە کەسبی جەلا، حەیفە، لە خاکیستەر بکا! (٣٢)**

(٣٢) هەمنشین: هاونشین، هاوماڵ. جەلا: ڕوونی، دەرکەوتن. خاکستەر: خۆڵەمێش.
واتە: تا مردن عەرەب نەبێتە هاوماڵم. حەیفە ئاوێنە ڕوونی و سافی و دەرکەوتنەکەی لە خۆڵەمێشەوە کە تۆزاویی دەکا و لێی دەنیشێ، پەیدا ببێ.
هەمنشینم قەد نەبێ ئیتر عەرەب (گم): یاخووا تووشم نەبێ ئیتر .. تاد.

## -١٤- (*)

**نوسخەیی ئەحواڵی ڕۆژی عاشقان ئینشا دەکا:**

**طوڕڕەیی تۆماری زوڵفت، موو بە موو، سەر تا بە پا (١)**
**چار فەرد هەریەك بە ڕەنگێ بوون لە یاری بەهرەوەر:**
**مول لە نەشئە، گول لە بۆ، سونبول لە پێچ و مەه ضیا (٢)**
**دوور لە تۆ سەهلە، بە شەرطێ دەست و دڵ یارم ببن**
**گەر بکەم ئاخر لە قەبرا جامەیی عوقبا قەبا (٣)**
**باوجوود ئەڵبەت یەقینە دوژمنی خوێنت منم**
**قەد قوبووڵ ناکا بە غەیرەز تۆ دڵی من ئاشنا (٤)**
**موو بە موو زوڵفی سیات ئەسبابە بۆ قەیدی غەریب**
**تا قیامەت مورغی دڵ لەم داوە قەت نابێ ڕەها (٥)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (م، پ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) واتە: پێچولوولی موو بە مووی تۆماری ئەگریجەت، سەرتاسەر حاڵوباری ڕۆژانەی عاشقان دەگێڕێتەوە.

(٢) فەرد: شتی تاقانەی بێوێنە. مول: شەراب، مەی. مەه: مانگ. ضیا: ڕووناکی.

واتە: چوار شت هەریەکە بە جۆرێك لە یاری بەهرەوەردا هەبوون: شەراب لە نەشئەیدا، گوڵ لە بۆنیدا، سونبول لە پێچی ئەگریجەیدا و مانگ لە ڕووناکی و شەوقدا.

بە ڕەنگێ بوون لە یارم (پ): بە ڕەنگ دەبوون لە یاری.

(٣) یار: یاریدەدەر. جامەیی عوقبا: کراسی دوارۆژ، مەبەست کفنە. قەبا: کەوا.

واتە: بە مەرجێك هێزی دەست و دڵم هەبێ، ئەگەر لە تۆ دوور و لەناو گۆڕیشدا بم، دەتوانم زیندوو ببمەوە و کفنەکەم بکەمە کەوای بەرم و بێمە دەرێ.

(٤) باوجوود: هەرچەندە.

واتە: هەرچەندە ئاشکرایە کە من دوژمنی خوێنەخوێتم، بەڵام دڵم لە تۆ زیاتر کەسی بە ئاشنا قوبووڵ نییە و لە تۆ بەو لاوە لەگەڵ کەسیتردا ئاشنایەتی ناگرێ.

قەد (پ): قەت.

(٥) واتە: مووی بە مووی ئەگریجەی ڕەشت هۆی زنجیرکردن و بەستنەوەی بێگانەی وەك منە.

**وەھ چ صەڕڕافێکی قەللابی، پەناھم برد بە حەق**
**دات بەسەر مندا ڕەواجی موددەعی وەك شەھرەوا (٦)**
**غەم وەکوو دەریایی قولزوم، ئەشْك مەوج و خۆم حوباب**
**سەیری "سالم" کەن لە دەریای بێپەیا کەوتە شەنا (٧)**

پەلەوەری دڵیشم تا قیامەت لەم داوە ڕزگاری نابێ.

قەت (پ): قەد.

(٦) صەڕڕاف: پارەگۆڕەوە. قەلّلاب: فێڵباز، بارگۆڕ. حەق: خودا. شەھرەوا: پارەی قەڵب کە شای دەوڵەت بە زۆر ڕەواجی پێ بدا.

واتە: ئای کە پارەگۆڕەوەیەکی بێباری، پەنا بە خودا، پارەی قەڵبی وەك بەدکارت بەسەر مندا ساغ کردەوە و ڕەواجت پێدا.

(٧) قولزوم: شارێکی نێوان (میسر) و (مەککە)یە نزیك بە کێوی توور. (دەریای سوور)یش، لەبەر ئەم شارە، ناوی بە (دەریای قولزوم) ڕۆیشتووە، بۆیە مانای سوور دەدا. مەوج: شەپۆل. حوباب: بڵقی ئاو. شەنا: مەلە.

واتە: خەم و خەفەت وەك دەریای سوور وایە، فرمێسکی خوێنین شەپۆلی تێدا دەدا و خۆیشم بڵقی ئاوم. بڕوانن، "سالم" لە دەریای بێبنی ئەو فرمێسکەدا کەوتووەتە مەلە.

## -١٥- (*)

**یەکی‌خست ڕۆژی ئەزەل دەستی قەضا،**
**چیهرەیی بەختی من و زوڵفی سیا (١)**
**گەر وەها عیشوەگەرە شاهیدی بەخت**
**بۆ کەفی بەختی غەریب، نیلە حەنا (٢)**
**کەوتە دەست قامەتی سەرْوت بە طەرەب**
**لە خیابانی ئیرەم، نەشئونوما (٣)**
**عاریضی صەیقەلی میرئاتی دڵە**
**عەکسی ڕووت، داویە بە ئایینە جەلا (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (م)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) ئەزەل: ئەوی نەبوونی لێ پێش نەکەوتبێ. چیهرە: چارە، ڕوخسار.

واتە: دەستی قەزا و قەدەر هەر لە ڕۆژی ئەزەلەوە چارەی بەختی ڕەشی من و ئەگریجەی ڕەشی یاری یەك‌خستووە. ئەوانە لە دنیا و پێش دنیایشدا وەك دوو شتی هاولف هۆگری یەکتر بوون.

(٢) کەف: لەپی دەست. نیل: شین. حەنا: خەنە.

واتە: ئەگەر یاری بەختگرەوە ئەوەندە فێڵباز و نازفرۆشە، بۆچی خەنە بە لەپی دەستی غەریبێکی وەك منەوە ڕەنگی شینە، نیشانەی ماتەم و ناخۆشییە؟ یانێ بەخت پێچەوانەی مەبەستە.

(٣) قامەت: بەژن و باڵا. طەرەب: کەیف و شادی. خیابان: شەقام. ئیرەم: بەهەشتەکەی شەدداد کوڕی عاد. نەشئونوما: گەشە و نەشە.

واتە: نەشوغاکردن لە شەقامی (ئیرەم)دا بوو بە نسیبی باڵای وەك سەرو بەرزی یار.

(٤) عاریض: ڕوومەت. صەیقەل: ژەنگ پاککەرەوە. میرئات: ئاوێنە. جەلا: ڕۆشنایی.

واتە: ڕوومەتی یار پاککەرەوەی ژەنگی ئاوێنەی دڵە. ڕەنگدانەوەی ڕووت ڕۆشنایی داوە بە ئاوێنە.

(ئایینە)، لە دەستنووسەکەی بەردەستماندا (ئاوینە)یە، دەبێ لە نووسینەوەی دەستنووسەکەدا بە هەڵە کرابێتە (ئاوێنە)، سالم بەم شێوەیە بەکاری نەهێناوە.

**وەکو من پیرەهەنیش بەدبەختە**
**یا دەبێتە کەفەنم، یا بە کەوا (٥)**
**چونکە نەوعێکە وەفای یار و حوباب**
**لە ئەزەل هەردو ڕجووعن بە هەوا (٦)**
**لە کەمین قەلبی دڵە تیپی موژەت**
**حیلەجۆ بۆ یێرشن ڕووو بە قەفا (٧)**
**مەکە "سالم" لە یەما جوهدی نەجات**
**قولزومی غەم نییە مەیدانی شەنا (٨)**

(٥) پیرەهەن: کراس.

واتە: کراسیشم وەك خۆم بەدبەختە، یا دەبێتە کفنم، یا بە کەوای بەرم.

(کەوا)، دەبێ (قەبا) بووبێ و گۆڕرابێ.

(٦) حوباب: بڵقی ئاو. ڕجووع: گەڕانەوە. ڕجووعن بە هەوا: بە با دەچن، بە فیڕۆ دەڕۆن.

واتە: وەفای یار و بڵقی ئاو لە یەکبابەتن، هەردووکیان کورتخایێن و هەر لە ئەووەڵەوە بێسوودن و بەبا دەچن.

(٧) کەمین: بۆسە. قەلبی دڵ: ناوجەرگەی دڵ. حیلەجۆ: فێڵباز. یێرش: هێرش. قەفا: پشت.

واتە: تیپی براژنگت لە بۆسەدایە بۆ تیرگرتنە ناوجەرگەی دڵم، خەریکی فڕوفێڵە، تا لە پشتەوە ناخافڵ پەلامار بدا.

(٨) یەم: دەریا. جوهد: کۆشش. قولزوم: دەریای سوور. شەنا: مەلە.

واتە: "سالم"! لە دەریادا هەوڵی ڕزگاربوون مەدە. دەریای سووری خەم بواری مەلەی نییە، دەبێ شوێنێکی باشتر بۆ مەلە بدۆزیتەوە.

(*) -١٦-

**دڵم شادە لە بەندی سیلسیلەی گێسوویی دڵبەردا**
**لە شانە خۆفناکم، دەفعەیێ، لەم بەندە دڵ بەردا! (١)**
**لە دونیادا دڵم گەر تەرکی طوڕڕەی تۆ نەکا، سەهلە**
**بیرون نایێ لە شۆر و زمزەمەی غەوغایی مەحشەردا (٢)**
**بەسەر سەرتا بپێکێ چەتری طاووسی، ئەگەر طوڕڕەت**
**دەکا بیروون لە فەرقی پادشەه، زینەت لە ئەفسەردا (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، ف، غ، ق، کم، نم، گم)دا هەیە.
کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.
(١) هەردوو (بەند)ەکە: بەندیخانە یا داوی گرفتاری. گێسوو: زوڵف، ئەگریجە.
واتە: دڵم زۆر شادمانە کە لە بەندیخانە یا لەناو داوی زنجیری ئەگریجەی دڵبەردا نیشتەجێیە، نەك تەنیا شادمان، بەڵکوو دەیشترسم کەرەتێك کە شانەی ئارایشدەر ئەگریجەی یار دادەهێنێ، دڵم لەم داوە بەربدا و ئاوارەی بکا و ئەم شادییەم لێ تێکبچێ.
لە باری بەند بە واتای بەندیخانەدا، بۆنەیەکیتریش هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئەگریجەی یاریش وەك ئەودیوی بەندیخانە ڕەش و تارە! ئەگەرچی دوو ڕەشیی زۆر لەیەك جیان.
خۆفناکم (کم، نم، گم): خۆفناکە. بەندە (نم): داوە. جێی وتنە، (کم، گم) هەموو (دڵبەر)ەکانی (دیوانی سالم)یان بە (دولبەر) نووسیوە.
(٢) شۆر: هەرا و ئاشووب.
واتە: دڵم، ئەگەر لە دنیای ڕۆشندا واز لە داوی ئەگریجەت نەهێنێ، شتێکی ئاسانە. ئەو لە هەرا و ئاشووبی ڕۆژی حەشریشدا، کە کەس کەس ناناسێتەوە، دەست لە داوی ئەگریجەت هەڵناگرێ و لێی جیا نابێتەوە! ئیتر چۆن لە دنیادا دەستی لێ هەڵگرێ؟!
(تۆ) لە (غ)دا کەوتووە. نایێ (نم، گم): نایە. زەمزەمەی (کم، نم، گم): زەمزەمە و.
(٣) واتە: ئەگەر ئەگریجەت کە وەك پەڕی ڕەنگاوڕەنگی تاوس دەدرەوشێتەوە، بکەیتە چەتر بەسەر سەرتەوە، ئەوەندە جوان دەنوێنێ، پادشا لە شەرمدا ئارایشتی تاجەکەی لە تەوقی سەری دەکاتەوە. مانای وایە لەچاو ئەگریجەی بەچەترکراوی تۆدا خۆی نانوێنێ. یان: ئەگریجەت ئارایشتی تاجی سەری شا ناهێڵێ، وای لێ دەکا شەرمی لێ بێ ئەو ئارایشتە بەسەر تاجەکەی سەریەوە بێ.

**گڕی بەست دڵ لە سینەمدا لە حەسرەت سەردیی میهری تۆ**
**هەتا کەی ئاگری پڕ گڕ دەسووتێنی لە مەجمەردا؟! (٤)**
**تەحەممول کە، زەمانی کوشتنی من سیرعەتی ناوێ**
**لە دڵمایە بگێڕم خۆم بە دەوری دەستوخەنجەردا (٥)**
**نە "فەرهاد" کەوتە شۆری من، نە "شیرین" گەییە حوسنی تۆ**
**لە دڵ من نەقشی تۆم هەڵکەند و ئەو کێشای بە ڕووی بەردا (٦)**

بێکێ (عا): پێکێ. (نم): یێکی. هەڵەی نووسینن. دەکا (کم، نم): ئەکا.

(٤) میهر: مەیل و خۆشەویستی. مەجمەر: پشکۆدان، ئاگردان، مەقەڵی، مەبەست سینەیە.

واتە: دڵ لە خەم و خەفەتی ساردیی مەیلی تۆدا بەرامبەر بە من، لە سنگمدا گڕی گرتووە. تا کەی خەفەت بە قوڕگمدا دەکەی و ئاگری پڕ گڕ لە سینەمدا دەکەیتەوە؟

گڕی (کم، نم، گم): گڕەی. لە سینەمدا (عا): بە سینەمدا. سەردی (نم): سەرووی. هەتا کەی (کم، نم، گم): کە حەتتا. دەسووتێنی (نم): ئەسووتێی. (گم): دەسووتێنێ.

(٥) تەحەممول کە: سەبرت بێ و ئارام بگرە. سیرعەت: پەلە.

واتە: کەمێك ئارام بگرە، کوشتنی من ئاسانە و پەلەی ناوێ، تەنانەت ماندووبوونیشی ناوێ، چونکە لە دڵمدایە و بڕیارم داوە خۆم بکەمە قوربانی دەستوخەنجەرت، ناهێڵم ئەوانیش ماندوو بن.

کوشتنی (گم): کوژتنی. خۆم بە دەوری (عا): خۆی بە دەردی. هەڵەیە. (ف): خۆم بە دەورەی.

(٦) شۆر: مەبەستی عیشقە.

واتە: نە "فەرهاد" عیشقی منی هەبوو و نە "شیرین"یش جوانیی تۆ! ئەو نیگارەی وا فەرهاد بە شاخی (بێستون)ەوە هەڵیکەندووە، نەخشی وێنەی تۆی جوانە، من لە دڵمدا هەڵمکەندبوو، فەرهاد بردی، دای بەسەر ڕووی تاشەبەردەکانی بێستووندا و بە ناوی ئەوەوە بوو بەو نەخشە نەمرە!

حوسنی (ف، ج، غ، کم، نم، گم): ڕوتبەی. نیوەی دووەمی ئەم بەیتە لە (کم، نم)دا: ((نییە ڕەحمت بە "سالم"دا دڵی و ئەویش لە تۆ بەردا)) و لە (گم)یشدا: ((نییە ڕەحمت بە "سالم"دا و ئەویش لە تۆ بەردا))یە. هەرچەند ناسناوی "سالم"ی تێدایە، دوو سەرنج هەڵدەگرێ:

١. لە کوردیدا ناوترێ: نییە ڕەحمت بە فلانە کەسدا، بەڵکوو دەوترێ: ڕەحمت بەرامبەر یا لەسەر فلانە کەس نییە، یان ڕەحم بە فلانەکەس ناکەی.

٢. سالم –وەك خۆی چەندین جار وتوویەتی– لە ڕۆژی مەحشەریشدا واز لە یار ناهێنێ و ئەمەی لە چەند شیعریدا دووبارە کردووەتەوە، ئیتر چۆن لێرەدا دەستی لێ بەردەدا؟!

(*) -١٧-

**طەریقی عیشقت ئەر بەردەم، خەجاڵەت بم لە مەحشەردا**
**نەنووسرابم لە پێتا، گەر ئەزەل، حەك بم لە دەفتەردا (١)**
**قوبووڵ ناکەم خەیاڵیشت لەناو دڵما موقیمی بێ**
**نەوا پەژموردە بێ گوڵدەستەیی حوسنت لە مەجمەردا (٢)**
**موحەصصیل بێ، ئەگەر بۆ نەقدی جانت، قابیضی قودرەت**
**ڕەضامەندم لە بالینت ئەمن بگرێت و تۆ بەردا (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، غ، ق، کم، نم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) لە پێتا: لە پێناوتا، لە بەرپێتا. حەك: کوژاندنەوە، مەبەستی کوژاوەیە.

واتە: ئەگەر ڕێی عیشقی تۆ بەردەم، لە ڕۆژی مەحشەردا خەجاڵەت و شەرمەزار بم. ئەگەر لە ڕۆژی ئەزەلدا وەها نەنووسرابم کە لە بەرپێتدا، یا لە پێناوتدا بمرم، خودایە ئەو ناوەم لە دەفتەری ژیاندا بسڕێتەوە.

(٢) ئەم بەیتە لە (غ)دا سێیەمە.

موقیمی: نیشتەجێ. پەژموردە: سیس و ژاکاو. گوڵدەستە: چەپکەگوڵ. مەجمەر: پشکۆدان.

واتە: ڕازی نابم تەنانەت شێوە خەیاڵییەکەیشت لەناو دڵی گڕگرتوومدا نیشتەجێ بێ، نەبادا چەپکەگوڵی جوانیت لە پشکۆدانی دڵمدا هەڵپرووزێ.

ناکەم (حا): ناکەی.

(٣) ئەم بەیتە هەر لە (مان)دا هەیە.

موحەصصیل: باجگر. نەقد: پارە. جان: گیان. قابیضی قودرەت: فریشتەی گیانکێشان. ڕەضامەندم: ڕازیم. بالین: سەرین، لای سەرین، لای سەر.

واتە: ئەگەر فریشتەی گیانکێشان وەك باجگر بێت بۆ گیانکێشانت، من لای سەرینەکەت یا لای سەرتەوە ئامادەم و ڕازیم گیانی من بکێشێ و واز لە تۆ بهێنێ. دەیشگونجێ بەیتەکە بەم جۆرە مەعنای لێ بدرێتەوە: ئەگەر فریشتەی گیانکێشان باجگر بێ و بێت بۆ وەرگرتنی پارەی نرخی گیانی تۆ و من لای سەرتەوە بم، ئامادەم گیانی من بکێشێ و واز لە تۆ بهێنێ و دەستبەردارت بێ.

جیاوازیی ئەم مەعنایە لە مەعنای پێشوو ئەوەیە، وشەی (بێ) بە مەعنای پێشوو لە (هاتن)ەوە هاتووە، بەڵام بەپێی مەعنای دووهەم لە (بوون) وەرگیراوە.

**له دەستم بەرمەدە دامەن، مەبادا بمکوژێ هیجرت**
**چ حاجەت خوێنێ ناحەق دامەنت بگرێ لە مەحشەردا (٤)**
**تەوانایی بەسەر ضیعفا دەبێ فائیق، ئەگەر گاهێ**
**صەبا بێنێ، سەحەر، بۆی تۆ بەسەر مندا لە دەم دەردا (٥)**
**حەلاوەت تا قیامەت نابڕێ، "سالم!"، لەناو دەمما**
**ئەگەر نەخلی مورادم دەفعەیێ یەکبۆسە نەوبەردا (٦)**

(٤) دامەن: داوێن. مەبادا: نەوەکا. هیجر: دووری. حاجەت: پێویستی.

واتە: دەستم لە داوێنت بەرمەدە، نەوەکا دووریت بمکوژێ، چیت داوە لەوەی کە لە ڕۆژی جەزادا خوێنی بە ناحەق ڕێژراوی من داوێنت بگرێ و داوای هەقی خۆیت لێ بکا؟

چ حاجەت (کم، نم، گم): مەبادا.

(٥) فائیق: سەرکەوتوو. گاهێ: کاتێ. صەبا: بای سەبا، ئەو بایەی کە لەنێوان ڕۆژهەڵات و باکوورەوە هەڵدەکا.

واتە: ئەگەر بای سەبا جارێك لە بەرەبەیاندا بۆنی تۆ بەسەر مندا بێنێ، هێز و توانام لە کاتی دەرد و نەخۆشیمدا بەسەر بێهێزیدا زاڵ دەبێ.

تەوانایی (غ): تەوانا بێ. وشەی (تۆ) لە (حا)دا کەوتووە.

(٦) حەلاوەت: شیرینی. نەخلی مورادم: دارخورمای هیوام، نەخل بووەتە نموونە لە کوردی و فارسیدا، چونکە هەم بەرزە و هەم شیرینە، ئەگینا هەموو داریکی بەردار بۆ مەبەستەکە دەست دەدا.

بۆسە: ماچ. نەوبەر: نۆبەرە، یەکەم بەری زووڕەس.

واتە: تا ڕۆژی قیامەت شیرینی لە دەمم نابڕێ، ئەگەر دارخورمای هیوام تاقە جارێك بەر بگرێ و یار ماچێکم بە نۆبەرە بداتێ.

نەوبەر (نم): ئەوبەر.

## -١٨- (*)

**حیکایەتخوانە تووتیی دڵ بە دەوری دامی گێسوودا**

**مەظەننە عەکسی خۆی دیبێ لەناو ئاییینەیی ڕوودا (١)**

**لەبت بوو دارْوی جێنێشی ماری زوڵفەکەت، نەددا**

**هەتا دەمرم، لە حەسرەت، با بدەم دەستم بە زانوودا (٢)**

**تەمام بوو حەلقە کەم دەستم لە قەددت، زوڵفت ئاڵۆزا**

**نیهان بوو مەطلەبم، وا کەوتە سەر یەك موو بەسەر موودا (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، ف، غ، ج، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) دام: داو. گێسوو: زوڵف. مەظەننە: بە گومان، بە مەزەندە، وا بزانم. عەکس: وێنە.

واتە: تووتیی دڵم بە دەوری داوی ئەگریجەتدا هاتووەتە قسە و خەریکی حیکایەتخوێنییە. وا بزانم وێنەی خۆی لە ئاوێنەی بێگەردی ڕوخسارتدا دیوە و قسەی لەگەڵ دەکا.

دیبێ (ج، کم، نم، گم): دیوە. ئاییینەیی (کم، نم، گم): ئاوێنەیی. (تووتی) لە (مان)دا بە شێوەی (طوطی) نووسراوە.

(٢) داروو: دەرمان. نێش: هەر نووکێکی تیژ کە ئازار بگەیێنێ. زانوو: ئەژنۆ.

واتە: دەرمانی چاری جێگەستنی ئەگریجە وەك مارەکەت، ماچێکی لێوت بوو، نەتدامێ! کەواتە با تا ئەو کاتەی لە داخاندا دەمرم، دەستی خەم و پەژارە بە ئەژنۆدا بکێشم.

لەبت بوو (ف): لەبت بۆ. دەمرم (کم، نم، گم): ئەمرم. زوڵفەکەت، نەددا (حا، ف، غ، ج، کم، گم): نەتدا. (ف): زوڵفەکەت، خۆ نەتداوە. (ج، غ): طوڕڕە، خۆ نەددا. لە حەسرەت (حا، غ، ق): بە حەسرەت.

(٣) حەلقە کەم: بکەمە ئەڵقە. نیهان: پەنهان.

واتە: بەتەما بووم دەست لە ناوقەدت هەڵبپێکم و بیکەمە ئەڵقەی کەمەرت، کەچی ئەوەی من مەبەستم بوو کە کەمەرتە، ون بوو و شاررایەوە؛ چونکە کەمەرت وەك موو باریکە و ئەوەندە مووی پەرێشانی ئەگریجەت بەسەر مووی کەمەرتدا کەوتووە، لێم تێكچوو و کەمەرت ون بوو، دەستم لە هیچ گیر نەبوو.

**دڵی تووتی، له پەرووازا، لەسەر گوڵ لەنگەری ڕاگرت**
**که یاری شۆخ و شیرینم، سەحەر وسمەی له ئەبروو دا (٤)**
**طەڵەبکارم بدا ڕوتبەم بە دامەنبۆسییی خاڵت**
**شەهنشاهێ که شاهیی کیشوەری ڕوومی بە هیندوو دا (٥)**
**له صیدقم، شانەوو بادی سەحەرگەهـ شاهیدن هەردوو**
**غوباری طوڕڕەیی موشکینی تۆ نافەی بە ئاهوو دا (٦)**

(٤) پەرواز: فڕین.

واتە: کە یاری نازدارم لـە بەرەبەیاندا وسمەی لـە برۆی دا و ئەوەندەیتر جوانی کرد، دڵـی وەك تووتیم لـەسەر گوڵی ڕوومەتی نیشتەوە و لـەنگەری گرت.

لـە پەرووازا (ق): لـە پەروازدا. (پە)ی (پەرووازا) لـە (عا)دا کەوتووە.

ڕاگرت (ف): داگرت.

(٥) ئەم بەیتە لـە (ق)دا شـەشـەمە.

دامەنبۆسی: داوێن ماچکردن. شاهی: پادشایەتی. شەهەنشاهـ: پادشای پادشایان، مەبەسـت خـودای گەورەیە. کیشوەر: وڵات: ڕووم: ڕۆم، وڵاتی ڕۆم، ڕۆمی سپین، مەبەستی ڕوخساری یارە کە سپییە.

واتە: تکاکارم لـەو خودایە کە پایەی پادشاهیی ڕۆمی ڕوخساری درەخشانی تۆی داوە بە ئەگریجـەی ڕەشت، پایەی ماچکردنی داوێنی خاڵی ڕەشیشت بە من ببەخشێ. مەبەست لـە داوێنی خاڵ لێـوی یـارە کە دەکەوێتە داوێنی خاڵەکەی سەر لێوی.

پوختەی مەبەست: کاتێك خودا پادشایەتیی وڵاتی ڕۆمی ڕوخسـاری درەخشـانی تۆی دا بە ئەگریجەی ڕەش، کە ڕەش نیشانەی کۆیلـەی ڕەشە و بۆ پادشایەتی ناشێ، بە ئاواتەوە بووم پایەی داوێن ماچکردنـی خاڵی ڕەشیشت بە من ببەخشێ، ئەگەرچی شایانی ئەوە نیم!

دامەنبۆسیی (کم، ئم، گم): دامەنبوسەیی. کیشوەری (ق): کیشوەر و. هەڵەیە.

(٦) موشکین: وەك میسك بۆنخۆش. سەحەرگەهـ: بەرەبەیان. ناف: ناوك. ئاهوو: ئاسك.

واتە: شانە کە ئەگریجەت دادەهێنێ و بای بەرەبەیان کە لێی دەدا، دوو شایەتی تـەواون لـەسـەر ڕاستیی قسەم، کە دەڵێم: تۆزی ئەگریجەی وەك میسـك بۆنخۆشـی تـۆ، کـە شـانە لای دەبـا و بـای بەرەبەیان لـەگەڵ خۆیدا دەیبا، بۆنخۆشیی گەیاندە ناوکی ئاسکی تەتار و بۆنی خۆش کرد. میسك لـە بنەڕەتدا هیی تۆیە و هیی ئەو نییە!

**له عەهدی دیدەیی یارا دڵ و صیححەت بەسێ ضیددن**
**بە "سالم" کەی دەمێنێ باز، ئەگەر چنگی لە تەیهوو دا (٧)**

(٧) عەهد: سەردەم، دەسەڵات. بەسێ: زۆر. سالم: سەلامەتی. تەیهوو: سوێسکە، باڵندەیەکی لە کەو بچووکترە.

واتە: دڵی من و سەلامەتی، لە سەردەم و دەسەڵاتی چاوی مەستی یاردا، زۆر دژی یەکترن و پێکەوە نایانکرێ. دیارە سوێسکەی هەژار کە کەوتە بەر چنگی تیژی خوێناویی باز، کەی بە سەلامەتی دەرباز دەبێ؟!

بەسێ (کم، نم، گم): گەلێ. ضیددن (مان، عا): زیددن. دەمێنێ (عا): دێنێ. هەڵەی نووسینە. (کم، نم، گم): ئەمێنێ. چنگی (ج، غ): چەنگڵ. (ق): پەنجەی. تەیهوو (حا): طەیهوو.

## -١٩- (*)

## (در وصف عزيز بگ بابان)

دەکا دونیایی پڕشۆڕش، بە دایم، فیتنەها پەیدا
بە نەیڕەنگ و فسوونی ئەو، لە هەر سوویێ وەغا پەیدا (١)
عەجەب ماخۆلیاییێ بۆ دڵی دونیا موسەللەط بوو
لە سەودای موقتەضای طەبعی، بە موختەص، ماجەرا پەیدا (٢)
تەماشای جەوری کەن دونیا، چ ظوڵمێکی لە خوسرەو کرد
نە بۆ تاجی نیشانێ ما، نە بۆ تەختی نییا پەیدا! (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، غ، کم، نم، پ، گم)دا هەیە. ئەم ناوونیشانە فارسییە هیی (مان)ـە، واتە (لە ستایشی عەزیز بەگی باباندا).

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) شۆڕش: هەرا و ئاژاوە. فیتنەها: ئاژاوەی زۆر. نەیڕەنگ: فێڵ و جادوو. فسوون: حیلە و تەڵەکە و ساختەبازی. سوو: لا. وەغا: جەنگ.

واتە: ئەم جیهانە پڕ لە هەرا و ئاژاوەیە هەمیشە چەندین جۆر فیتنە بەرپا دەکا. بە فڕوفێڵ و ساختەکاریی ئەو لە هەر لایێ شەڕێ بەرپا دەبێ.

دەکا (کم، نم): ئەکا. فسوونی ئەو (کم، نم، گم): فسوون هەردەم.

(٢) ئەم بەیتە هەر لە (مان، ن)دا هەیە.

ماخۆلیا: ماخۆلان، تێکچوونی مێشك و سەوداسەری. موسەللەط: زاڵ، باڵادەست. سەودا: خولیا، مامەڵە. موقتەضای طەبعی: ئەو خووەی کە لەگەڵ سروشتی مرۆیە. موختەص: تایبەت. ماجەرا: ڕووداو، کارەسات. یانێ ئەوەی ڕووی دا، چاك بێ یا خراپ.

واتە: چ ماخۆلانێك بەسەر دڵی دنیادا زاڵ بوو کە بە خولیای شێتانەی خۆی، ئەم هەموو کارەساتانەی بە تایبەتی هێنایە ڕووی کار؟

(٣) جەور: ستەم. کەن: بکەن. خوسرەو: هەر پادشایەکی دادپەروەر، ناوی پادشایەکی کەیانیان بووە. نییا: نەوە، بە تایبەتی کوڕەزا، مەبەست جێنشینە، بە واتای گەورەییش هاتووە.

واتە: ئێوە سەرتان سووڕ نەمێنێ لە ستەمی ڕۆم و داگیرکردنی خاکی بابان کە ئەمڕۆ ڕوودەدا. بڕواننە مێژوو، گەردوون هەر وەها ستەمکار بووە؛ خوسرەو بەو گەورەیی و ناودارییە کە بووی، نە

به میٹلی خوویی دڵبەرمە، دڵی دونیا لەگەڵ مەردوم
به دوشمن نیعمەت و لوطف و جەفای بۆ ئاشنا پەیدا (٤)
خوداوەند چادری دونیای به دوونیییەت سەراپا کرد
بیرون سوو سوور و ئایینە، دەروون ڕەنگی عەزا پەیدا (٥)
جیهان گەر ڕووبەڕووی من بێ، به خوونڕێزی ظەفەر نابا
دەکەم بۆ حیرزی جان و دڵ به چالاکی پەنا پەیدا (٦)

نیشـانەی تاجی ما و نە نەوەیەك شوێنی بگرێتەوە! دوور نییـە مەبەسـت لـە خوسـرەو، خوسـرەوی پەروێز بێ کە لـە سەرەتای هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیـسلامدا بـە دەسـتی شـێرۆیەی کـوڕی کـوژرا و ڕەچەڵەکیان بڕایەوە!

کەن دونیا (کم، نم، گم): دونیا کەن. ظوڵمێکی (غ، کم، نم، گم): قەهرێکی. کـرد (کـم، نم، گم) گرت. (نە)ی دووەم (ن): بە. هەڵەی نووسینە.

(٤) واتە: خووی دونیا لـەگەڵ خەڵك وەك خووی یارمە لـەگەڵیان؛ لـەگەڵ دوژمنانی نەوازشـی هەیە و لـەگەڵ دۆست و ئاشنا جەفا و دڵشکاندن.

دڵبەرمە (کم، نم، گم): مەعشووقە. مـەردوم (کـم، نم، گـم): خـەڵکی. دوشـمن (کـم، گـم): دوژمن. لـوطف و (کم، نم، گم): لوطفی.

(٥) ئەم بەیتە هەر لە (مان، ن)دا هەیە.

دوونییەت: پەستی و بێباری، یا دوو نییەت، واتە: دوو نیاز، دوو ئامانج. سەراپا: هەموو. کرد: دروست کرد. بیروون: دەر، دیوی دەر. سوو: لا. میثل: وێنە، وەك. سوور: شـایی. ئـایین: جـەژن. دەروون: ناو، دیوی ناوەوە. عەزا: ماتەم.

واتە: خودای گەورە چادری ئەم دنیایەی سەرتاخوار بە نزم و بێبار دروست کرد؛ دیوی دەری –ڕواڵـەتەکەی– شایی و خۆشییە، دیوی ناوەوەی –ناوەڕۆکەکەی و ئەنجامەکەی– شین و ماتەمە. یا بە دوو نیاز دروستی کرد، بۆ خۆشی و ناخۆشـی. یـان: لـە دەرەوە لای عوسمانییـەکان ئاهـەنگ و شادیی نەمانی میرنشینی بابانە و لـەناو وڵاتی بابانیشدا کە ڕووخاوە، ماتەم و شینە.

دونیای (غ): چەرخی.

(٦) جیهان: عالـەم، دنیا. خوونڕێزی: خوێنڕێژی. ظەفەر: سەرکەوتن. حیرز: پاراستن، پەنا. جان: گیان.

واتە: ئەگەر هەموو جیهان ڕووبـەڕووم ببێتـەوە بـە نیـازی کوشـتنم ، دەسـتی لـێم گـیر نـابێ و سەرناکەوێ، پەنایەکی ئازا و لێهاتوو بۆ پاراسـتنی خۆم پەیدا دەکەم. مەبەستی عەزیز بەگی بابانە.

**پەناهم شەهْسەوارێکە، گوزەر کا گەر بە ئەلبورزا**
**دەکا ضەربی سمی ئەسپی لە خارا تووتْیا پەیدا (٧)**
**ئەگەر خورشیدی تیغی بێ، بەسەر شەودا شەبەیخوون کا**
**دەکا بەرقی بە یەك پەرتەو لە یەلدادا ضیا پەیدا (٨)**
**بە هەر لادا بکا جەولان، لە بادی سممی ڕەهواری**
**چرای عومری عەدوو، وەك صوبحْدەم، وەضعی فەنا پەیدا (٩)**

خوونڕێژی (کم، گم) خوێن ڕێژی. دەکەم (کم، نم): ئەکەم. پەنا (کم، نم، گم): نیا.

(٧) شەهسەوار: سوارچاك و چالاك و ئازا. ئەلبورز: زنجیرەکێوێکی باکووری ئێرانە، لە بەری ڕۆژاوای دەریای خەزەرەوە کەوانئاسا بە دەوری کەنارەکانی باشوور و باشووری ڕۆژاوای دەریاکەدا پێچ دەکاتەوە و لە باکووری ڕۆژاوای ئوستانی خوراساندا دەگاتەوە بە کێوەکانی لای باکووری. ضەرب: لێدان. خارا: سەنگی سەخت. تووتیا: کل، جۆرە بەردێکە وەك کلی هاڕراوە بۆ چاوپێڕشتن.

واتە: پشت و پەنام سوارچاکێکی تا ئەو ڕادەیە ئازا و بەهێزە، ئەگەر بە کێوی ئەلبورزدا تێپەڕێ، سمی ئەسپەکەی ئەوەندە بە توندی لە زەوی دەدا، ئەگەر سەنگی سەخت بکەوێتە ژێر پێی، وەك تووتیا وردوخاشی دەکا؛ یا تووتیای بەنرخ لە بەردێکی ڕەقی بێبایەخ دروست دەکا.

گوزەر کا گەر (ن): کە دەرکا گەر ڕەھ. لەنگە. دەکا (کم): ئەکا.

(٨) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی هەر لە (مان، ن)دا هەن.

خورشید: خۆر. تیغ: شمشێر، خەنجەر، قەمە. شەبەیخوون: هێرشی غافڵگیرانە بۆ سەر دوژمن. پەرتەو: ڕووناکییەکی تیژ. یەلدا: شەوی تاریك و نوتەك. ضیا: ڕووناکی.

واتە: ئەگەر تیغی وەك خۆری دەستی عەزیز لەپڕ بەسەر هێزی شەودا بدا، چەخماخەیەکی ئەو تیغەی، شەوەزەنگ دەکاتە چرا و چراخان.

(٩) جەولان: جموجووڵ و بە گورجی هاتوچۆی بەملاوبەولادا. باد: با. ڕەهوار: ئەسپی خۆشڕەوت و هەنگاو گەورە. وەك صوبحدەم: چرای ڕۆنی یا نەوتی لە بەرەبەیاندا هەم ڕۆن و نەوتی کەم دەبێتەوە و هەم لە ڕووناکیی بەرەبەیاندا ئەوەندە نانوێنێ و وەك نەبووی لێ دێ، یا مەبەست ماوەی بەرەبەیانە کە کورتە و هەر کاتێکی کەم دەخایێنێ. وەضع: حاڵ، بار. فەنا: نەمان.

واتە: بە هەر لایەکدا سوارچاکی بنوێنێ و هەڵمەت بەرێ، تەمەنی دوژمنەکەی بە هۆی توندیی بای ژێرسمی ئەسپە خۆشڕەوەکەیەوە، وەك چرای بەرەبەیانی لێ دێ، یا وەك بەربەیان ماوەکەی کورت دەبێ و بەرەو نەمان دەچێ.

**به حوججەت نێزە گەر لێدا، سیپەر وەك كاغەذی قەندە**
**بە هەر وەضعێ لەگەڵ بازوویی ئەو حوكمی قەضا پەیدا (١٠)**
**هەماوەردی عەرووسی قەبر و تیغی ماشیطەی مەرگە**
**لە زەخمی موردەگان، بۆ دەست و پا، ڕەنگی حەنا پەیدا (١١)**
**لە مەیدانا بە ڕەسمی ڕەزم، ئەگەر مەركەب بدا جەولان**
**لە ناڵەی گاوو ماهی، دێ لە ژێر خاكا صەدا پەیدا (١٢)**

(١٠) بە حوججەت: بە هێز و توند. سیپەر: قەڵغان. كاغەزی قەند: ئەو كاغەزەیە كە لە كەللەی شەكر دەپێچرێ، مەبەستی سووكی و بەرگەنەگرتنە. بازوو: قۆڵ، باسك. حوكمی قەضا: كاری قەزا و قەدەر، مەبەستی مەرگە.

واتە: ئەگەر بە توندی نێزە بخاتە كار، قەڵغانی لە ئاسن دروستكراوی دوژمن وەك كاغەزی شەكر بە ئاسانی لەت دەكا و مەرگ بە هەموو بارێكدا لەگەڵ بازووی ئەو یەخەی دوژمن دەگرێ.

سیپەر (ن): بەسەر. كاغەزی (كم، گم): قاقەزی. وەضعێ (غ، كم، نم، گم): ضەربێ، جوانە.

(١١) ئەم بەیتە و سێ بەیتی پاشەوەی هەر لە (مان، ن)دا هەن.

هەماوەرد: هەمئاوەرد، هەر یەكە لەو دوو كەسەی وا بەرامبەر بە یەك دەجەنگن، پێی دەوترێ هەماوەردی ئەویتریان. عەرووس: بووك. ماشیطە: ئارایشتكەر. موردەگان: مردووان. حەنا: خەنە.

واتە: بەرامبەرەكەی، لەجیاتیی ئەوەی سەركەوتن بەدەست بهێنێ، ئەم دەیكا بە بووك و دەیگوێزێتەوە. تیغی عەزیز ئارایشكەری بووكە، واتە برینی زۆر دەكاتە جەستەی دوژمن و بەو برینانەوە بۆ مەرگی دەڕازێنێتەوە. دیارە خەنەیش لە كاتی ئارایشتی بووكدا پێویستە بۆ بووك و بەربووك و دەستەوبەستە، ڕەنگی خەنەی خوێنی زامی مردووانی بەرەی دوژمنیش بۆ ئەم مەبەستە زۆرە.

حەنا (غ): خەنا.

(١٢) ڕەسم: نەریت و شێوە. ڕەزم: جەنگ. مەركەب: ئەسپ. گاو و ماهی: گا و ماسی، كە وتوویانە: دونیا لەسەر شاخی گایەكە و گاكەیش لەسەر پشتی ماسییەكە!

واتە: ئەگەر بە پێی شێوەی باوی جەنگ، ئەسپی لە مەیداندا تاو بدا، زەوی دێنێتە لەرزە و گا و ماسی لە ژێرەوە دێنە ناڵەناڵ و خەڵك ناڵەیان دەبیستن.

بە ڕەسمی ڕەزم ئەگەر مەركەب بدا جەولان (پ): مەگەر ئەسپی گرانمایەی دەئاخێوێ. دێ (پ): بوو.

**غوباری سممی ئەسپی ئەو، مەگەر ئەجزایی ئیکسیرە**
**لە چیهرەی دوشمنی ئەودا هەموو ڕەنگی طەلا پەیدا؟ (١٣)**
**بەرابەر ڕوویی ئەو ڕەنگی عەدوو سیمابْگوون سیمە**
**دەکا ئەجزایی تیغی ئەو لە قەلبا کیمْیا پەیدا (١٤)**
**سفیدە چاوی بەدخواهی لە حەسرەت حەلقەیی دیرعی**
**دەکا بەرقی سینانی بۆ عەدوو ڕۆژی سْیا پەیدا (١٥)**

(١٣) غوبار: تۆز. ئیکسیر: ماددەیەکە مەعدەنیتر دەکاتە ئاڵتوون. چیهرە: ڕوخساری بنیادەم.

واتە: بۆچی تۆزێك کە بە هۆی سمی ئەسپەکەیەوە بەرز دەبێتەوە، ئیکسیرە وا ڕوخساری دوژمنی وەك ئاڵتوون زەرد کردووە؟!

ئیکسیرە (ن): ئیکثیرە. هەڵەیە. دوشمنی ئەودا هەموو ڕەنگی (پ): دوژمنی بێخود صەف ئەندەر صەف.

(١٤) عەدوو: دوژمن. سیماب: جیوە. گوون: جۆر. سیمابگوون: وەك جیوە، کینایەیە لە پەشۆکان و ڕەنگپەڕین. سیم: زیو، مەبەست سپێتییە. قەڵب: سککەی بێڕەواج، هەڵیشدەگرێ (قەلب بێ بە واتای دڵ یا ناوەڕاستی سوپا.

واتە: ڕەنگی ڕوخساری دوژمن بەرامبەر بە ڕووی عەزیز، لەبەر شڵەژان و پەشۆکان، وەك زیو سپی هەڵگەڕاوە، تنۆکێك خوێنی لە ترساندا تێدا نەماوە. دیارە ئەجزای تیغی عەزیز کیمیا لە ماددەی قەڵبی وەك ڕووی دوژمن پەیدا دەکا و کاری کیمیا دەکا.

شایانی باسە، (عەدوو) لە (مان، ن)دا ئەگەر (عەدووی) بووایە، لەبارتر دەبوو. ڕەنگە هەڵەی نووسینەوە بێ.

بەرابەر ڕوویی ئەو (پ): بە پیشاپیشی ئەو. سیمابگوون (غ): سیمابنیگوون.

(١٥) سفیدە: سپییە. بەدخواه: ناحەز. حەلقە: ئەڵقە. دیرع: کراسی زرێی جەنگ. بەرق: چەخماخە. سینان: سەری ڕم. سیا: ڕەش.

واتە: چاوی دوژمن، لە داخی جوانی و پتەویی ئەڵقەی کراسزرێیەکەی عەزیز، سپی بووە و مردووە. چەخماخەی سەرەڕمەکانی، ڕۆژی دوژمنان تاریك و ڕەش دەکا.

سفیدە (کم، گم): سفیدەی. حەلقەیی دیرعی (کم، نم، گم): نێزە و دەستی. دەکا بەرقی سینانی بۆ عەدوو (کم، نم، گم): ضیای درعی ئەکا بۆ دوژمنان.

نەهەنگ‌ئاسا، لە دەریای خاطرا، قەهری کە گەردش کا
لە کەشتیی عومری بەدخواهی، سەراسەر ڕەخنەها پەیدا (١٦)
لە گەرمیی ڕۆژی مەیدانا، عەدوو لەب‌تیشنە، سێراون
لە ئاوی تیغی جەوهەرداری ئەو، کاری سەقا پەیدا (١٧)
بە تیغی ئەو لە خوێنی ڕوومییان شەططێ بە ڕووما دێ
تەنی ئوفتادە زەورەق، سەر لە جێگەی ناخودا پەیدا (١٨)

(١٦) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی هەر لە (مان، ن)دا هەن.

نەهەنگ: ماسیی هەرە گەورە، حووت. خـاطر: دڵ. گەردش: جموجووڵ. سەراسەر: هەموو. ڕەخنە: کون و کەلـەبەر و شکست.

واتە: کە ڕق و قینـی گـەورەی وەك نەهـەنگی عـەزیز لـە دەریـای دەروونیـدا بێتـە جـۆش و خورۆش، کەشتیی تەمەنی دوژمنەکەی هەمووی دەبێتە کون و کەلـەبەر و لـە ئاودا نوقم دەبـێ. ڕق خووی خۆیەتی و دوژمنەکەیشی کە مەبەستیەتی بیفەوتێنێ، هەمیشە لە دەروونیدایە تا لـەناوی دەبا.

(١٧) لـەب: لێو. تیشنە: تینوو. سێراو: تێراو. سەقا: ئاوگێڕ.

واتە: دوژمنی لێو وشك و تینوو، بە هۆی گەرمیی ڕۆژی جەنگەوە، یا لـە گەرمەی جەنگـدا، تێـراو دەبێ و ئاوی تیغی شەپۆڵـداری عەزیز دەوری ئاوگێڕ دەبینێ، لەباتیی ئاو خوێنیان پێ دەخواتەوە.

(عەدوو) ئەگەر (عـەدووی) بووایـە، بەیتەکـە لـەبارتر دەبـوو. وا دەزانـین بـە هـۆی نـاوردیی نووسینەوەوە وا نووسراوەتەوە. (گەرمیی)ی (مـان، ن)، کـە بـە (گرمـی) نووسـراوە، (گەرمـەی)ش هەڵدەگرێ. لـە گەرمیی ڕۆژی مەیدانا (پ): بە گـەرمیی ڕۆژی مەیـدانی. سـێراون (پ): نایێڵـێ
ئاوی (غ): ئابی. کاری (پ): داری.

(١٨) ڕوومییان: ڕۆمییەکان، تورکان. بە ڕووما دێ: ڕووبـەڕووم دێ. تـەن: لاشـە. ئوفتـادە: کەوتوو. زەورەق: کەشتیی بچووك. ناخودا: کەشتییەوان.

واتە: تیغی تیژی عەزیز ئەوەندەی لـە سوپای تورکان کوشتووە و خوێنیان هێندە ڕژاوە، چەمێکی گەورەی پێك‌هێناوە، لـە بەرچاومە و ڕووبەڕووم دێ. لاشەی کـەوتووان، لـە کـوژراو و برینـدار، دەڵێی کەشتین و سەری کوژراو و بریندار بووەتە کەشتییەوان!

بە تیغی ئەو (غ): بە تیغ. لـەنگە. لـە خوێنی: (کم، گم): بە خوێنی. تەنی (نم): انی. هەڵەیە.

**له بەحری ڕۆژی ڕەزما گەر نەهەنگی تیغی سەرهەڵدا**
**لەناو کەشتییی ئەتراکا، دەبێ شین و صەدا پەیدا (١٩)**
**لە سەهمی حەملەیی ئەو بۆ عەدوو، هەر جا حەذەر لازم**
**لەدەست ئەو بۆ کراسی ڕۆمییان، شێوەی قەبا پەیدا (٢٠)**
**دەبێ، گەر بێتە ڕووی مەیدان، وەکوو بەبری بەیان یەکدەم**
**لیباسی ڕووبەهی دەردەم لە ئەندامی کییا پەیدا (٢١)**
**ئەگەر ئاوی بەقای نۆشیبێ دوشمن، فایدە نادا**
**لە مەوجی جەوهەری تیغی، حورووفی لابەقا پەیدا (٢٢)**

(١٩) ڕەزم: جەنگ و هەرا. صەدا: هاوار.

سالم ڕۆژی جەنگی لەم بەیتەدا کردووە بە دەریا، تیغی عەزیزی کردووە بە نەهەنگ و دانیشتووانی کەشتیەکەیش سوپای تورکن. واتە: ئەگەر تیغی وەك نەهەنگی دەستی عەزیز لە دەریای ڕۆژی جەنگدا لەناو دەریاوە سەر هەڵبدا و بێتە جووڵە و خورۆش، دەبێتە هاوار و ناڵە لەناو دانیشتووانی کەشتی تورکاندا، چونکە نەهەنگ مایەی مەترسییە بۆ کەشتی.

نیوە بەیتی یەکەم لە (کم، نم، گم)دا بەم جۆرەیە: لە دەریای مەعرەکەی تیغی نەهەنگی گەر نومایان بێ. کەشتیی ئەتراکا (کم، گم): ئۆردووی تورکانا.

(٢٠) سەهم: سام، ترس. حەملە: هێرش و هەڵمەت. جا: جێ. حەذەر: خۆپاراستن. قەبا: کەوا.

واتە: پێویستە دوژمن، لە ترسی هێرشی عەزیز، لە هەموو جێیەك بترسێ. کراسی تورکان لە ترسی دەستوەشاندنی ئەو دادڕاوە و وەك کەوای لێهاتووە، کە لە ڕاکردندا با لێی بدا و باڵی پێ بگرێتەوە!

سەهمی (کم، نم، گم): سامی. دەست (کم، گم): دەس. حەذەر (گم): حەزم. لازم (غ): واجیب. بۆ کراسی (گم): بوو کراسی. قەبا (نم، گم): کەوا.

(٢١) ئەم بەیتە هەر لە (مان، ن)دا هەیە.

بەبری بەیان: گیانلەبەرێکی دڕندەی چابوکە، دەڵێن دوژمنی شێرە. ڕووبەهی: ڕێوییەتی. دەردەم: گورج، دەمودەست. کییا: گەورەپیاو.

واتە: ئەگەر عەزیز وەك بەبری بەیان بێتە ڕووی مەیدان، یەکسەر بەرگی ڕێوییەتی بە بەر سەرکردەی سوپای تورکاندا دەکێشرێ، شێوەیان دەگۆڕێ و وەك ڕێوییان لێ دێ!

دەبێ (پ): دەمێ. دروستترە. وەکوو بەبری بەیان یەکدەم (غ): وەکو شێری شکارئەفگەن.

(٢٢) ئاوی بەقا: ئاوی زیندەگانی، کە دەڵێن هەر کەس بیخواتەوە نامرێ! مەوج: شەپۆل. لێرەدا

**به پەستی، دوشمنی سەرکەش عەجایب سەرفەرازێکە**
**بەسەر هەر گەردەنە و شاخا، لە پێتا وەك لیوا پەیدا (٢٣)**
**ئەگەر وەك کێوی قاف مەحکەم بێ، دوشمن گاهی حەملەی ئەو**
**لە مەیدانی گورێزا دێتەوە ڕووبەرقەفا پەیدا (٢٤)**

مەبەستی شەپۆلی گۆلی تیغی جەنگاوەرانی عەزیز بەگی بابانە.

واتە: دوژمن ئەگەر ئاوی زیندەگانیشی خواردبێتەوە، فریای ناکەوێ و هەر دەمرێ. ئەگەر لە شەپۆلی گۆلی تیغی دەستی عەزیز ورد ببێتەوە، پیتەکانی وشەی (لابەقا)، نەمان، دەخوێنێتەوە، یانێ دوژمن لەناودەبا.

دوشمن (گم): دوژمن. فائیدە (غ، گم): فائیدەی، جوانە. لامان وایە شاعیریش هەر ئەوەی مەبەست بووە، بەڵام ناتەواویی شێوەنووسینی ئەو سەردەمەی کوردی تێکیداوە. (نۆشیێ) لەبەرئەوەی کورتە، بە (نوشیبی) دەخوێنرێتەوە.

(٢٣) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی هەر لە (مان، ن)دا هەن.

پەستی: زەلیلی، خواردەستی. سەرکەش: سەرکێش، یاخی. سەرفەراز: بەختیار، ڕزگاربوو. گەردەنە: ملە. لە پێتا: لە بەرپێتا. لیوا: ئاڵا.

واتە: دوژمنی یاخی چەند بەختیارە کە لە مەرگ ڕزگار بووە و دیلی ژێردەستتە، لە هەر ملە و شاخێکدا لە بەرپێتدا وەك ئاڵا چەقیوە.

دوشمنی سەرکەش (پ): موددەعیی بەدخوو. (دوشمنی) لە (غ)دا کەوتووە. گەردەنە (پ): گەردەن. لە پێتا (ن): لە پێدا. (غ، پ): لە تیپا.

(٢٤) کێوی قاف: ئەفسانە دەڵێ– کێوێکە دەوراندەوری جیهانی داوە. گاه: کات. حەملە: هێرش. گورێز: هەڵاتن. قەفا: پشت. ڕووبەرقەفا: ڕوو بۆ پشتەوە وەرگەڕاو!

واتە: ئەگەر دوژمن لە کاتی هێرشی عەزیزدا وەك کێوی قاف ئەستوور و لەجێنەجووڵاو بێ، ناتوانێ بە شێوەیەکی ئاسایی لە مەیدان هەڵبێ و ڕووی لەپێشەوە بێ، بەڵکوو ناچارە لە ترسی پێکران ڕووی لەپشتەوە بێ، ئەمجا ڕابکا.

گاهی (پ): تاوی. لە مەیدانی گورێزا (پ): لە مەیدانا گورێزان. (بێ)، لەبەرئەوەی کورتە، بە (بی) دەخوێنرێتەوە.

**له خاكا خوێنی مەرجانی دەبێ مەخلووط و بێحورمەت**
**دەكا ئەڵماسی دەشنەی ئەو، لە گەردندا سەنا پەیدا (٢٥)**
**لە ضەربی زەرگی ئەو، دوشمن وەكوو پووشە بەدەم باوە**
**لە میقناطیسی زووپینی فونوونی كەهرەبا پەیدا (٢٦)**
**چ حاصڵ دوشمنی، وەختی هەزیمەت، گەر موحصەصەن بێ؟**
**لە فەتحی هیممەتی ئەودا كلیدی دەرگوشا پەیدا (٢٧)**
**لە بەحری جەنگی مەغلووبا كە تیغی مەوجی خوێن بێنێ**
**دەبێ بۆ دەست و پای ئوفتادەگان، هەر سوو شەنا پەیدا (٢٨)**

(٢٥) ئەم بەیتە هەر لە (پ)دا هەیە.

مەرجانی: سوور. مەخلووط: تێكەڵ. دیشنە: خەنجەر. سەنا: ڕۆشنایی، بریقە.

واتە: كاتی شەڕ خوێنی سوور دەڕژێ و بە بێبابەخی تێكەڵ بە خاك دەبێ. خەنجەری وەك ئەڵماس برندەی ئەو، لە كاتی دەستبەكاربووندا بریقە و ڕۆشنایی لە گەردندا پەیدا دەكا.

(٢٦) ضەرب: لێدان. میقناطیس: ئاسنڕاكێش، وەك كارەبای تەزبیح و ملوانكە كە پووش ڕادەكێشێ. فونوون: جۆراوجۆر. زووپین: نێزەی بچووكی دوودەم، كۆن لە جەنگدا بەكارهێنراوە.

واتە: كە عەزیز نێزە دەوەشێنێ، دوژمن بە دەمی نێزەكەیەوە وەك پووشە بەدەم باوە! كاری تەزبیحی كارەبا دەكا كە دەنكەكانی پووش ڕادەكێشن.

لە ضەربی (كم، پ، نم، گم): بە ضەربی. دوشمن (كم، نم، گم): دوژمن. زووپینی (كم، نم، گم): دووربینی. كەهرەبا (نم، گم): كارەبا.

(٢٧) ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی هەر لە (مان، ن، پ)دا هەن.

چ حاصڵ: چ سوودێكی هەیە، چی دەست دەكەوێ؟ هەزیمەت: هەڵاتن. موحەصەن: پارێزراو، شوێنقایم. فەتح: گرتن، داگیركردن. كلید: كلیل. دەرگوشا: دەرگاكەرەوە.

واتە: دوژمن چی دەست دەكەوێ ئەگەر شوێنەكەی سەخت بێ، لەناوچوونی هەر مسۆگەرە. بەڵام ئەگەر عەزیز بە ئازایەتیی خۆی بیگرێ، دوژمن كلیلی ئەوەی دەبێ دەرگا بكرێتەوە و هەڵبێ! یا: دوژمن كاتی هەڵاتن سەختیی شوێن فریای ناكەوێ و لەناوچوونی مسۆگەرە، عەزیز دەیگرێ و دەرگا دەكرێتەوە و قەڵاچۆ دەكرێن.

وەختی (پ): وەقتی. موحەصەن (ن): موشەخخەص.

(٢٨) ئوفتادەگان: لەپێكەوتووان، كوژراو و بریندار. هەر سوو: هەر لا. شەنا: مەلە.

**ئەگەر یەك لەمحە طوولی بێ، لە قەلبی لەشكرا قەهری**
**لە صەحرادا، دەبێ بۆ جانەوەر سوور و غەزا پەیدا (٢٩)**
**عەصای مووسایە مەر نێزەی لە ڕەغمی مشتی فیرعەونی**
**بە بەرقی ئاتەشئەفشان و بە شەكڵی ئەژدەها پەیدا (٣٠)**
**وەلێ طالیع نەبوو، پۆشیدەیە جەوهەر لە ڕووی دونیا**
**بە مەردانی دلاوەر، حاصڵی كۆشش، جەفا پەیدا (٣١)**

واتە: كە دوژمن لە دەریای جەنگدا بەزیوە، ئەگەر گۆلی تیغی عەزیز شەپۆلی خوێن بهێنێ، دەست و پێی لەبێكەوتووان، كوژراوان و بریندارانی، دەكەونە مەلە.

(٢٩) لەمحە: چاوبەیەكدادانێك، چاوترووكاندنێك. قەلبی لەشكر: ناوەڕاستی سوپا. قەهر: ڕق و قین. جانەوەر: گیانلەبەر. سوور: شایی. غەزا: بە فارسی وا دەبێژرێ، غەذا، خواردەمەنی.

واتە: ڕق و قینی عەزیز لە ناوەڕاستی سوپای خۆیدا هەر ئەوەندەی چاوترووكاندنێك درێژە بكێشێ، لەو دەشتەدا دەبێتە شایی و گۆشت و خواردەمەنی بۆ جرِوجانەوەر زۆر دەبن.

غەزا (پ): غەذا. (غ): عەزا.

(٣٠) مەر: مەگەر. مشتی فیرعەونی: چنگی زۆردار و ستەمكار. ئاتەشئەفشان: ئاگرپژێن. شەكڵ: ڕواڵەت و شێوە.

واتە: مەگەر نێزەی دەستی عەزیز عاساكەی مووسایە، كە سەرباری زۆر و دەسەڵاتی ڕۆمییانی ستەمكار، لە داخی ئەو بە چەخماخەكەی ئاگری لێ دەبێتەوە و بە شێوە و ڕەنگیشی دەڵێی ئەژدەهایە و جادووی جادووگەرانی فیرعەون پووچ دەكاتەوە؟ ئاماژەیە بە ئایەتی ژمارە ١٠٤ی سوورەتی (أعراف): ((فألقى عصاه، فاذا هي ثعبان مبين))، كە مووسا عاساكەی فڕێدایە سەر زەوی و بوو بە ئەژدەها و ماری جادووگەرانی قووت دا.

مەر (گم): سەر.

(٣١) وەلێ: بەڵام. طالیع: بەخت. پۆشیدە: داپۆشراو. دلاوەر: ئازا و لێهاتوو.

واتە: لەگەڵ ئەم هەموو ئازایەتییەیشدا كە بەخت و ناوچاو نەیهێنا، گەوهەر و جوامێری لە دنیادا بە شاراوەیی دەمێننەوە و ئەنجامی تەقەلای پیاوی ئازا و دڵسۆز هەر سزا و ئازارە. سالم هەر ئەوەندەی ویستووە بیڵێ، ئەگینا دەبێ زۆر چاكی زانیبێ هۆی شكستی عەزیز و بابانەكان بەدبەختی نەبووە!

نەبوو (كم، نم): نەبێ.

**"عەزیز"ە وا لەناو چاهە، خوداوەندا! نەجاتی دە**
**لە چیهرەی ئەو بکا "یەعقووب" دڵی شێوەی صەفا پەیدا (٣٢)**
**خودایە! موڵکی (بابان) بێڕەواج و قەڵبە، سا لوطفێ**
**بە ئیکسیری وجوودی ئەو بکا وەك موو بەها پەیدا (٣٣)**

(٣٢) ئەم بەیتە و بەیتی پاشـەوەی لـە (مان، ن، غ)دا نین، تەنیا لـە (کـم، نم، گـم)دا هـەن و جێـی خۆیشیانە بن، چونکە هەر لـە سەرەتای پارچەشیعرەکەوە تا دوایی هەمووی هـەر باسـی سەرلـەشـکریی عەزیزە، بەڵام بە داخەوە ناسناوی "سالم" نە لـە (مان) و نە لـە (کم، گم)دا نییە.

چاه: چاڵ، بیر، مەبەست زیندانە. چیهرە: ڕوخسار.

واتە: عەزیز خۆشەویستە و دیلە و لـەناو چاڵدایە، وەك حەزرەتی یووسف کە خرایە بیر یا بەندیخانە. خودایە ڕزگاری بکە، بەڵکوو یەعقووبی دڵی دۆستانی خۆشی و ڕووناکی بە بینینی ڕوخساری پەیدا بکا. جا ئەگەرچی یووسـف عەزیزی میسر نەبوو، یەکێکیتـر عەزیز بوو کە لـە بیر و زینداندا نەبوو، بەڵام لـە نیگای دڵی حەزرەتی یەعقووبەوە (د. خ) عەزیز و خۆشەویست بووە. هەرچۆنێك بێ، سالم لێـرەدا وای داناوە دڵی دۆستانی عەزیز بەگی بابان، وەك یـەعقووبی بـاوکی یووسـف خـەمبارە و چـاویان لێڵایـی داهاتووە، بە دەرچوونی لـە دیلی و بینینی، دڵیان خۆش و چاویان ڕوون دەبێتەوە.

(٣٣) واتە: موڵکی بابان بەبێ عەزیز سکەی قەڵب و بێڕەواجە. سا خودایـە! لوتفێکمـان لـەگەڵ بنوێنە و ڕزگاری بکە، بەڵکوو ئەم موڵکە بەهۆی بوونی ئەوەوە کە وەك ئیکسیرە، ڕەواج پەیدا بکاتەوە.

لـە (نم)دا، لـە جێی (موو)ی نیوەدێڕی دووەم (مس) هـاتووە، کـە دروسـتترە و تـەواوە، چـونکە ئیکسیر مس دەکا بە ئاڵتوون و زیو، نەك موو.

دوو سەرنجیتریش پێویستە بخرێنە بەرچاو:

ئـ. ناسناوی "سالم" لـە پارچەشیعرەکەدا نییە، کە لـەوانەیە لـەبەر خۆپاراستن و ناو نەکەوتنـە نـاو ناوان و دوچاری سەرئێشەنەبوون وای کردبێ.

ب. ڕەنگە سالم ئەم پارچەشیعرەی دوابەدوای شەڕەکەی عەزیز بەگی بابان و ئیـسماعیل پاشـای ڕۆمی، کە عەزیز بەگی تێدا گیراوە، وتبێ.

## -٢٠- (*)

**ئەگەر ئوممێدی دڵ بێنێتە جێ، ماهی جیهانئارا**
**«بە خال هندوش بخشم سمرقند و بخارا را» (١)**
**لەبن خاری موغەیلان وەصڵ، ئەگەر بێ، ئارەزوو ناکەم**
**«کنار آب رکن آباد و گلگشت مُصَلاّ را» (٢)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، هـ، ف، غ، ڕ، کم، نم، گم)دا هەیە، بەڵام لە (مان، ن)دا یەکێکە لە ٢١ پارچەشیعری یەك لەدوای یەکی پیتی جیاجیا، لە ناونیشانی یەکەمیاندا نووسراوە: «ملمّعات است» واتە: ئەم پارچەشیعرانە لە چەشنی تێهەڵکێش (مولەممەعات)ن. جێی وتنە، مولەممەعات کۆی (مولەممەعە)یە و بە پارچەشیعرێك دەڵێن بەیتێك یا نیوەبەیتێکی بە زمانی خۆماڵی و بەیتێك یا نیوەبەیتێکیتری بە زمانێکی وەك فارسی یا عەرەبی یا تورکی یان زمانێکیتر بێ (بڕوانە: د. محمد معین، فرهنگ فارسی، جلد چهارم، تهران، ١٣٥٧، ص٤٣٥١).

ئەم جۆرە پارچەشیعر یا بەیتانە ڕەنگی جیاجیایان هەیە، (ملمّع)یش لە عەرەبیدا بە مانای پارچەی تەنراوی ڕەنگاوڕەنگ هاتووە. ئاشکرایە نیوە کوردییەکانی ئەم پارچەشیعرانە -بێسێودوو- هی "سالم"ن و ئەو تەلیعی کردوون. نیوە فارسییەکانیشیان، یا هی خۆینی، یان هی شاعیرانیترن. ئەم پارچەیە تێهەڵکێشە لەگەڵ شیعرێکی "حافظ شیرازی".

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) ماه: مانگ. جیهانئارا: جیهانڕازێنەوە. هندو: ڕەش. بخشم: دەبەخشم. سمرقند و بخارا: دوو شاری ئۆزبەکستانن.

واتە: ئەگەر یار، کە مانگە و دنیای ڕازاندووەتەوە، ئاواتی دڵم بهێنێتەدی، دوو شاری ناوداری (سەمەرقەند و بوخارا)ی بەرامبەر بە خاڵی ڕەشی ئەو پێشکەش دەکەم.

سمرقند (عا): ثمرقند.

(٢) خار: دڕك. موغەیلان: دارێکی کورتەباڵای دڕکاوییە لە دەشتە بێئاوەکاندا دەڕوێ، جێی دانیشتنی کەسی لەژێردا نابێتەوە. کنار: قەراخ، لێوار. آب: ئاو. رکن آباد، مصلاّ: دوو گەڕەکی خۆشی پڕ لە کانی و ئاو و باخاتی شاری (شیراز)ن. گلگشت: گەڕان بەناو گوڵ و گوڵزاردا.

واتە: ئەگەر لە دەشتێکی وشك و بێئاودا، لەبن سێبەری کەموکووڕی داری دڕکاویی موغەیلاندا، لەگەڵ یار بم، هەرگیز ئارەزووی قەراغی ئاوی ڕوکنئاباد و گەشتی گوڵزاری موصەللا ناکەم.

**نەصیحەت بگرە گویێ قوربان! لە لایان زۆر بە تەعظیمە**

**«جوانان سعادتمند، پند پیر دانا را» (٣)**

**دوصەد جار، گەر بە گوێی خۆم حەرفی سەردت بشنەوم، شادم**

**«جَوابِ تلخ میزیبد لبِ لعلِ شکرخا را» (٤)**

**ئەگەر حۆری لە کەوثەر شوستوشۆی خۆی دا، بە تۆ نابێ**

**«بە آب و رنگ و خال و خط، چە حاجت روی زیبا را؟!» (٥)**

**لە ئیدراکی شکەنج و عوقدەیی زوڵفت پەرێشانم**

**«کە کس نگشود و نگشاید بە حکمت این معمّا را» (٦)**

ئارەزوو (نم): ئارەزووی.

(٣) ئەم بەیتە لە (هـ)دا چوارەمە.

سعادتمند: بەختیار. پند: ئامۆژگاری. دانا: ژیر و زانا.

واتە: تۆ کە هێشتا گەنجی ئامۆژگاری بگرە گوێ، چونکە گەنجی بەختەوەر ئامۆژگاریی کۆنەساڵی ژیری زۆر بەلاوە گرنگ و بەجێیە.

قوربان (هـ، کم، نم، گم): جانا! یانێ گیانەکەم، بە قوربانت بم.

(٤) ئەم بەیتە لە (ف)دا نییە.

حەرف: لێرەدا مەبەست قسەیە. بشنەوم: ببیستم. تلخ: تاڵ. میزیبد: لایەقیەتی، لێی دەوەشێتەوە، جوانی لێ دێ. لب: لێو. شکرخار: نازشیرین، مانایەکی (خار) نازە. شکرخارا، (شکرخاررا) بووە و کورت کراوەتەوە، یا (شەکرخۆر، شەکرکرۆژ) کە کینایەیە لە قسەی جوان و شیرین وتن.

واتە: دووسەد جاریش قسەی تاڵ و تفتت ببیستم، من هەر شادمانم، چونکە لێوی شەکرنازت، یا قسەی شیرینوێژی وەك شەکرت، وەڵامی تاڵی جوان لێ دێ، کە ناز شیرین بێ، چش با وەڵام تاڵ بێ!

(دوصەد) (عا): دو، (صەد) کەوتووە. سەردت (کم، نم، گم): ساردت.

(٥) آب و رنگ: ڕەونەق و ڕەنگینی، ڕەنگ و ڕوو. زیبا: جوان.

واتە: ئەگەر پەری خۆی لە ئاوی حەوزی کەوسەریشدا باش بشۆرێ، جوانییەکەی ناگاتە جوانیی تۆ، ڕووی جوانی تۆ کەی پێویستی بە خەت و خاڵ و ڕەونەق و ڕەنگینییە.

خۆی دا (هـ): خۆی کا. هەڵەیە.

(٦) ئەم بەیتە لە (هـ)دا سێیەمە.

ئیدراك: تێگەیشتن. شکەنج: پێچ و چینی ئەگریجە. عوقدە: گرێ. نگشود: نەیکردووەتەوە.

**که شوعلەی طەلعەتی یووسف طولووعی کرد، بە چی زانیم؟**
**«که عشق از پردهٔ ظلمت، برون آرد زلیخا را» (٧)**
**کەلامت حافظا! دڵسەنجە، بۆ "سالم" وەها چاکە**
**«که بر نظم تو افشانَد فلَك عِقد ثریّا را» (٨)**

نگوشاید: نایکاتەوە. معما: مەتەڵ، قسەیەکە مانا و مەبەستەکەی شاراوە بێ و بە ئاسانی نەزانرێ و هەڵنەهێنرێ.

واتە: لە تێگەیشتنی واتای چین و پێچی ئەگریجەتدا داماو و پەرێشانم. بەڵێ، ئەم مەتەڵەی تۆ کەس بە ژیری هەڵینەهێناوە و کەسیش هەڵیناهێنێ.

شکەنج و (ف): سکەنجی. هەڵەیە. (کم): شکەنج (نم): شکەنجی. عوقدەیی (ف): حەلقەیی.

(٧) ئەم بەیتە لە (عا)دا نییە.

بیرون آرد: دەهێنێتە دەرێ.

واتە: بە چیدا زانیم بڵێسەی ڕوخساری جوانی یووسف وەك خۆر هەڵهات؟ بەوەدا کە زولەیخا لە پەردەی تاریکی هاتە دەرێ، لە کاتێکدا دەرچوون لە پەردەی تاریکی بۆ یەکێکی وەك ئەو ئاسان نەبوو. دیارە هێزی عیشق بوو وا لە هەزار سەراپەردەوە دەریهێنا.

بەیتەکەی "حافظ" لە ئەسڵدا بەم جۆرەیە: «من از آن حسن روزافزون که یوسف داشت دانستم ** که عشق از پردهٔ عصمت بیرون آرد زلیخارا».

واتە: من لەو جوانییەوە کە یووسف هەیبوو و لە خۆر جوانتر بوو، زانیم زولەیخا لە پەردەسەرای پاکیزەیی دەردەهێنێ.

بەیتەکە تێکڕا لای حافظ زۆر جوانترە، جگە لەوە، نازانرێ سالم بۆچی وشەی (عیصمەت)ی کردووە بە (ظوڵمەت)؟ بەڵێ، مانای دێ، بەڵام (عیصمەت) بەهێزترە.

بە چی (ف، ن، کم): لە چی. ظلمت (غ): عیصمەت.

(٨) دڵسەنج: بەدڵ کێشراو و هەڵسەنگێنراو و نرخێنراو. نظم: هۆنراوە، شیعر. افشاند: دەپرژێنێ. عقد: گەردنبەند، ملوانکە. ثریا: کۆ، پێروو، کۆمەڵە ئەستێرەیەکی زۆر جوان و ڕێکوپێکە ملوانکەی جوانی پێ دەشوبهێنرێ.

واتە: حافظ! قسەت بە دڵ کێشراوە و بە باری "سالم"دا کەوتووە، وەها چاکە چەرخ ملوانکەی ئەستێرەی کۆ بەسەر شیعرەکانتدا پەخش بکاتەوە.

حافظا (نم): حافظ.

## -٢١- (*)

**کشا گێسوو بە گۆشەی ڕوویی یارا**
**چ جینسێ بێ لە مارا، بێ بە نارا؟! (١)**
**پەزێرای ڕەنگی من بوو ئاینەی ڕووت،**
**خەزانم دی لە ئاغۆشی بەهارا!(٢)**
**تەزەروی دڵ دەخوازێ بازی چاوت**
**کە گەردش کا لە طەیرانی شکارا (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) گێسوو: ئەگریجە، زوڵف. نار: ئاگر. (بێ)ی یەکەم: هەبێ. (بێ)ی دووەم: بێت و بڕوا.

واتە: ئەگریجەی ڕەش بە گۆشەیەکی ڕوومەتی یاردا کشا، سەیرە کە نەسووتا، یا هەڵنەپڕووزا؟ کەی جۆری وا لە ڕەگەزی ماردا هەیە بەسەر ئاگردا بڕوا و هیچی لێ نەیێ؟! دیارە ئەگریجەی یاری شوبهاندووە بە ڕەشمار و ڕوخساریشی بە ئاگری گڕدار.

کشا (کم): کیشا. گێسوو (گم): یەك سوو. یارا (کم): مارا. چ جینسێ.. تاد (کم): چ جنس بیکار ئەبی بنمارا. هەڵەیە.

(٢) پەزیرا: قوبووڵکراو، پەسەند. ئاینە: ئاوێنە. ئاغۆش: باوەش.

واتە: ئاوێنەی ڕووی جوانی وەك بەهاری تۆ قوبووڵی کرد ڕووی زەردی وەك گەڵای خەزانی من خۆی تێدا ببینێ. سەیرە، کێ دیویە وەرزی خەزان لە باوەشی وەرزی بەهاردا کبێ؟ ئەم دوانە چۆن کۆدەبنەوە؟

(گم): خەزانی. بوو (گم): بۆ. ئاینە (کم): ئاوێنە. (پەزێرای)، (پەذێرای) بووە و گۆڕراوە.

(٣) تەزەروو: مەلێکی سارانشینی وەك کەڵەشێرە، پەڕی جوانە. دەخوازێ: دەوێ. گەردش: سووڕانەوە. طەیران: فڕین.

واتە: تەزەرووی ناتوانای دڵی من، چاوە بازە جوانەکانی تۆیان لە کاتی باڵگرتنەوەی ڕاودا دەوێ، بەسەریدا بدەن و لە پەلوپۆی بخەن.

(تەزەروو)، لە بنەڕەتدا (تەذەروو) بووە و گۆڕراوە. دەخوازێ (کم): ئەخوازێ.

**به تەحصیل مەطڵەبی چەندێ بەری دا**
**کە بگرێ دامەنی دارا، نەدارا (٤)**
**دەسا چۆن دامەنت بگرم، کە مەیلت**
**ئەوەند ساردە، نەما پەنجەم لە کارا؟! (٥)**
**سەری تەسلیمی داوە، نێرگسی مەست**
**بە دیدەی تۆ، لە هەنگامی خومارا (٦)**
**لە ئەشکی سوور و سوێری خۆم دەبینم**
**گوڵستانێ لە خاکی شۆرەزارا! (٧)**
**دڵی دڵبەر کە مایل بێ بە ئەغیار**
**نییە تەدبیری، "سالم"! جوز مودارا (٨)**

(٤) تەحصیل: ئەنجام. بەری دا: سوودی بەخشی، یا دەستی لێ بەردا. دامەن: داوێن. دارا: دەوڵەمەند. نەدارا: گەدا.

واتە: کە نەدار (عاشق) داوێنی دارا (یار) بگرێ، سەرەنجام چەندە سوودی دەبێ؟!

چەندێ بەری دا (گم): چەندی بە ڕێ دا.

(٥) واتە: دەی ئیتر من چۆن داوێنت بگرم و داوای یارمەتیت لێ بکەم؟ تۆ ئەوەندە بێمەیل و لەگەڵ مندا ساردی، دەستم سەرما بردوویە و پەنجەکانم لە گۆچوون و سڕبوون، هێزی داوێن‌گرتنی تۆیان نییە! وا دیارە مەیلی یار لەگەڵ "سالم" سەهۆڵبەندان بووە.

(٦) دیدە: چاو. هەنگام: کات. خومار: مەستی.

واتە: نێرگزی چاومەست سەری ملکەچیی بۆ چاوی بەخوماری تۆ دانەواندووە، چ ڕای دەکەوێ خۆی بنوێنێ و بڵێ: من جوانم و چاومەستم؟!

سەری (کم): پەری یا پەڕی.

(٧) ئەشك: فرمێسك. شۆرەزار: زەویی خوێیاوی کە هیچی لێ سەوز نەبێ، شۆرەکات.

واتە: شتێکی زۆر سەیرە فرمێسکی وەك خوێن سوور و وەك خوێ سوێری خۆم دەبینم، هەر دەڵێی گوڵزارە و لە شۆرەخاکدا ڕوواوە!

(٨) ئەغیار: کۆی غەیر، بێگانە. جوز: جگە لە. مودارا: دڵڕاگرتن، ڕازیبوون.

واتە: کە دڵی یار هەر بۆ بێگانە لێ بدا، سالمی بێچارە چیی لەدەست دێ؟! لە دڵڕاگرتن و نەرمونیانی نواندن بەولاوە، هیچ ڕێیەکی‌تری لە بەردەمدا نییە.

## -٢٢- (*)

**پڕچینی زوڵف و پەرچەم نەقشن لە ڕوویی یارا**
**وەك میللەتی مەجووسی، هەر دێن بە دەوری نارا (١)**
**طوڕڕەت کە دێ بە ڕوودا، گەر عەینی کوفرە، حوسنە**
**بۆ ڕەونەقی کلێسا، یا هەر ببن نەصارا (٢)**
**غەمزەت کە تیری باراند، زوڵفت دڵی پەنا دا**
**بەم ڕەنگە حوسنی ئەخلاق، کێ دیی لە جینسی مارا؟! (٣)**
**مەی، گەر حەرام و تەڵخە، ساقی! بە چاوی مەستت**
**«أشْهی لنا واحْلی مِنْ قُبْلةِ العَذاری» (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ه، کم، گم)دا هەیە، لە (مان)دا لە بەشی «غزلهای جدیده»دایە.
کێشی عەرووز: موزاریعی هەشتیی ئەخرەب.

(١) واتە: پێچپێچی زۆری ئەگریجە و پەرچەمی یارم نەخش و نیگارن بە دەوری ڕوخساریدا. لەو خەڵکە ئاگرپەرستە دەچن کە هەر بە دەوری ئاگردا دێن و دەچن.

پڕچینی (کم): بوچینی. (گم): پڕچینە. زوڵف و پەرچەم (کم): زوڵفی پڕ خەم. نەقشن (کم، گم): نەقشە. بە دەوری (ه): بە ڕوویی.

(٢) طوڕڕە: ئەگریجە، زوڵف. کلێسا: کلێسە، پەرستگای گاورەکان. نەصارا: گاوران.
واتە: ئەگریجەت کە بەسەر ڕوخسارتدا پەخش دەبێتەوە، دەقاودەق جوانی و قەشەنگییە، ئەگەرچی وەك کوفر ڕەشە، یا ئەگەرچی کارەکەی کوفرە کە ڕوخسارت دادەپۆشێ، لێی گەڕێ با بێ، با بۆ جوانی و ڕەواجی کلێسە زۆر بێ. لێرەدا کلێسەکە ڕوخساری یارە و گاوریش ئەگریجە و پەرچەمی چینچینی.

گەر عەینی کوفرە (کم، گم): وەك عەینی کوفری.

(٣) غەمزە: ئاماژەیە بە برژانگ، لەیەکدانی چاو و برژانگ بە نیازی نازکردن.
واتە: کە غەمزە و نازت دڵی تیرباران کردم، ئەگریجەت پەنای دڵمی دا و پاراستی! کێ ڕەوشتی وەها جوان و مەردانەی دیوە لە ڕەگەزی مار بوەشێتەوە؟! ئەگریجەی یاری بە ڕەشمار شوبهاندووە.

کە تیری باراند (کم، گم): لە تیرەباران. ئەخلاق (کم): ئیخلاص.

(٤) ساقی: مەیگێڕ، یار. أشهی: حەزلێکراوتر. أحلی: شیرینتر. قُبلة: ماچ. عذاری: کۆی

**ئەی ئەو کەسە کە شەوها یادت ئەنیسی دڵمە!**
**یەك لەحظە دێمە یادت، داخۆ، لە ڕۆژگارا؟! (٥)**
**تۆ ناتەوان و میسکین، دوشمن قەویی و مونعیم**
**"سالم"! لە عەهدی وادا، کوا چارە، جوز مودارا؟! (٦)**

(عەذراء)ە، کچی شوونەکردوو.

واتە: بادە، ئەگەرچی هەم حەرامە و هەم تاڵ، ئەی مەیگێڕ! بە چاوی مەستت قەسەم، کە هەر خۆی بادەکەیە، لە ماچی کچ بەتامتر و شیرینترە. نیوەی بەیتە عەرەبییەکە هی "حافظ شیرازی"یە.

تەڵخە (کم، گم): تاڵە.

(٥) شەوها: چەندین شەو. ئەنیس: هاودەم و هاوڕێ. ڕۆزگار: ڕۆژگار.

واتە: ئەی ئەو خۆشەویستەی کە دڵم لە شەوانی تەنیاییمدا هاودەم و هاوڕێی یاد و بیری تۆیە، ئاخۆ ڕۆژێك لە ڕۆژان هەر هێندەی چاوبەیەکدادانێك منت بە بیردا دێ؟!

ئەو کەسە (کم، گم): ئەو کەسەی. شەوها (کم، گم): شەو هات. یەك لەحظە ... ڕۆزگارا (کم): داخۆ من دێمە یادت لەحظێ لە ڕۆژگارا (گم): یەك لەحظە دێمە یادت داخوا لە ڕۆژگارا.

(٦) ناتەوان: ناتوانا، بێهێز. مونعیم: خاوەنڕۆزی، خوداپێداو. جوز: جگە لە.

واتە: ئەی سالم! تۆ بێهێز و هەژار، دوژمنیشت بەهێز و خاوەنڕۆزی، ئیتر لە ڕۆژی وادا، جگە لە دڵڕاگرتن و پێکەوەسازان، چار چییە؟! هەر دوژمن لە ناز و نیعمەتدایە.

دوشمن (گم): دوژمن. مونعیم (کم، گم) بێدین. وادا (کم، گم): ئەودا.

## -٢٣- (*)

ئاشوفتە کەناری گرت، گێسوو بە ڕوخی یارا
ئاریٚ نییە حەددی مار، ڕابووریٚ بەسەر نارا (١)
عەزمی دڵی پڕشۆرم بۆ دامەنی صەحرایە
بێزار و هەراسانم بەم نەوعە لەناو شارا (٢)
مەجنوونی بیابانی زوو ڕاهی نەجاتی دی
ناڵینی منی بەدبەخت جاویدە لە کۆهسارا (٣)
بۆ شادییی دوشمن، یار، تا من لە غەما بمرم،
مەلفووفەیی نەومیدی ناردوویە بە ئەغیارا (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، ق)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی ئەخرەب.

(١) ئاشوفتە: پەرێشان و تێکچوو. گێسوو: ئەگریجە. ڕوخ: ڕوومەت. ئاریٚ: بەڵێ. نار: ئاگر.

واتە: ئەگریجەی یار بە دەوری ڕوخساریدا پەخش و پەرێشان و تێکچووە، ناتوانیٚ بەسەریدا بڕوا. بەڵێ، مار ڕای ناکەویٚ بەسەر ئاگردا بڕوا. مەبەست لە مار ئەگریجە و لە ئاگر ڕوخسارە.

بە ڕوخی (عا، ق): لە ڕوخی.

(٢) عەزم: نیاز. شۆر: شۆڕش، عیشق. دامەن: داوێن. هەراسان: وەڕس، بێتاقەت.

واتە: وەڕسم لەم جۆرە ژیانی بێکەسییەی ناو شار، دڵی پڕشۆڕشم بڕیاری داوە بچێتە دامێنی دەشت و سارا و چۆڵەوانی.

صەحرایە (عا) سەحرایە.

(٣) مەجنوون: قەیسی عامیری. بیابانی: سەحرایی، چۆڵگەڕ. جاوید: هەمیشەیی. کۆهسار: شاخوداخ.

واتە: مەجنوون بەختەوەرە کە ڕێی خۆی لە دەشت و بیاباندا دۆزییەوە، بەڵام ناڵە و هاواری منی بێبەخت لە شاخ و کێوان هەمیشەییە و بڕانەوەی نییە.

(نەجاتی) لە (عا)دا کەوتووە. بەدبەخت (ق): بێکەس.

(٤) مەلفووفە: پێچراوە، نامە یا قەباڵەی پێچراوە. نەومیدی: نائومێدی. ئەغیار: کۆی غەیر، بێگانە و ناحەز.

**ئاشوفتەوو غەمگینە یارم لە قسەی ناصیح**
**وەك تازەگوڵی باغە، پەژموردە لەناو خارا (٥)**
**عاشق بە قەد و ڕووتە، صۆفی بە نیهان وەك من**
**دزپیشەیە سا قوربان! گوێی بوکتە بە بزمارا (٦)**
**جانانە لەگەڵ "سالم" نەزدیکە تەرەحوم کا**
**بەم نەوعە لە گریانی خوێن دێ لە دڵی خارا (٧)**

واتە: یاری دڵڕەق بۆئەوەی دڵی دوژمن خۆش بکا، نامەی نائومێدیی بە بێگانەدا بـۆ نـاردم؛ تـا گیانم لـە خەفەت و پەژارەدا دەربچێ! بێگانەکەیش هەر دوژمنەکەیەتی.

سەرنج: سالم (یە)ی (ناردوویە)ی هەر بۆ ڕاستکردنەوەی کێـشی بەیتەکـە بـەکارهێناوە، ئـەگینا دەبوو (ناردووە) بێ.

(٥) ئاشوفتە: پەرێشان و تێکچوو. پەژموردە: سیس و ڕەنگپەڕیو. خار: دڕك. خارا: خاردا.

واتە: دڵی یارم، بە قسەی ئامۆژگاریکەر، وەك گوڵی تازەی باخ کە لـەناو دڕکدا سـیس دەبـێ، ژاکاو و خەمبارە. دیارە ئامۆژگارییەکەی بە دڕك داناوە.

(قسـە) لـە هەرسێ نوسخەکەدا بە (قصە) نووسراوە.

(٦) ئەم بەیتە هەر لـە (عا، ق)دا هەیە.

نیهان: پەنهان، نهێنی.

واتە: بۆچی هەر من بەدناو بم؟ خۆ سۆفیی —بە دیمەن— لـەخوداترسیش ژێربەژێر گیرۆدەی باڵا و ڕوخسارتە و وەك من عاشقتە! بە نهێنی ئیشکردن پیشـەی دزە، دەسا قوربان بیگرە و بە بزمار گوێی بە دیواردا دابکوتە. بەوەدا کە گوێی بە شوێنی سزا داناوە، لـەباتیی دەسـت، ئـەم سـۆفییە ڕەقیبـە و سیخوڕی لـەسەر سالم دەکا.

(بوکتە) دەبوو (بکوتە) بێ، بەڵام لـەبەر ڕاگیرکردنی کێشی شیعرەکە وای وتووە.

(٧) جانانە: دڵـبەر. تەرەحوم: بەزەیی پێداهاتنەوە. خارا: بەردی سەخت، ڕەق.

واتە: سالم بەم جۆرە ئەوەندە بەکوڵ دەگری، دڵی وەك بەردی سـەخت خـوێنی لێ دێ بـۆ یـار، نزیکە ئەویش بەزەییـەکی پێدا بێتەوە!

-٢٤- (*)

زوڵفی جانانە بە دەوری کەمەرا
وەك سیەهمارە بە قەد نەیشەکەرا (١)
دەوری ڕووی داوە، خەمی سونبولی موو
هەروەکو هالە بە گەردی قەمەرا (٢)
تیری تۆ، ڕەنگە لە سینەم بْـڕوێ
غەرقە پەیکانی لە ڕیشەی جگەرا (٣)
گەردن ئارایشە بە طوڕڕەیی تۆ
شەبە خۆشڕەنگە لە پەهلووی گوهەرا (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لـە (مان، عا، هـ، ف، غ، ق، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) جانانە: دڵبەر. سیەهمار: ڕەشمار.

واتە: زوڵفی ڕەشی یار بە دەوری پشتێنەیدا، دەڵێی ڕەشمارە و لـە قامیشی شەکر ئاڵاوە.

بە (عا، ڕ، کم، گم): لـە، بەڵام (بە)ی (مان) جوانترە.

(٢) خەم: پێچ. هالـە: خەرمانەی دەوری مانگ. گەرد: وا دەزانین هەر وایـشە، بـەڵام نـەبوونی شێوەنووسینی ڕاست کردوویە بە گرد، دەوراندەور. قەمەر: مانگ.

واتە: پێچپێچی مووی وەك سونبول دەوری ڕوخساری جوانتی داوە، هەر دەڵێـی خەرمانەیـە بـە دەوری مانگدا. لێرەدا جوانییەکە زیاتر دەدرێتە پاڵ ڕوخسار، وەك لـە خەرمانەدا کـە زیـاتر مـانگ ڕەچاو دەکرێ. مانگ و خەرمانە لە مانگی خەرمانەداودا دوو شـتن لـە یـەك جیـا دەبنـەوە، بـەڵام ڕوخساری یار و ئەگریجەی هەمیشە پێکەوەن، بەو پێیە شوبهێنراو بەهێزترە!

دەوری ڕووی داوە (ف): دەورەیی ڕووی. (کم): دورروی گوڵی و. (داوە) لـە (غ)دا کـەوتووە.

بە گەردی (کم): بە دەوری (گم): لـە دەوری.

(٣) بڕوێ: سەوز بێ. پەیکان: سەرەتیر.

واتە: خەریکە تیرەکەت لـە سنگمدا سەوز بێ، چونکە سـەرەکەی لـە ڕیشەی جگەرمدا نوقمە و لـە خوێنی ئەو ئاو دەخواتەوە.

غەرقە پەیکانی (هـ، گم): غەرقی پەیکانە. (تۆ) لـە (ڕ)دا کەوتووە.

(٤) ئـارایش: ڕازانەوە و جوانی، مەبەست ڕازاوەیە. طوڕڕە: زوڵف. شەبە: سووککراوی (شەبەهـ)ە،

دەبمە ئەو ئاشە کە ئاوی بْـبڕن
شۆری عیشقم کە نەمێنێ لە سەرا (٥)
لە هەناسەی منی مەظـڵوومی غەریب
خۆت بپارێزە، لە وەختی سەحەرا (٦)
حورمەتی تۆ لە زەمانەی "سالم"
بە قەدەر دینە لە عەهدی "عومەر"ا (٧)

شەوە کە مووررووەبەردێکی بریقەداری ڕەشی بەنرخە. پەهلوو: پاڵ، تەنیشت. گوهەر: گەوهەر.

واتە: گەردنی بلوورینت بەو ئەگریجە ڕەشەت کە دەوری داوە، ڕازاوەتەوە و زیاتر جوان بوون. دیارە کە شەوە لەپاڵ گەوهەردا بێ، هەردوکیان جوان دەنوێنن.

بە (عا): بۆ. (کم): بەو. شەبە (ﻫ، غ): شەوە. گوهەرا (گم): کەمەرا.

(٥) ئەم بەیتە جوانە هەر لە (کم، گم)دا هەیە.

شۆر: کەڵکەڵە.

واتە: کە خولیا و کەڵکەڵەی ئەوینم لە سەردا نەمێنێ، وەك ئاشی ئاوکەوتووم لێ دێ.

دەبمە (ف، غ): دێمە.

(٦) واتە: بەرەبەیانان خۆت بپارێزە لە ئاھ و هەناسەی ساردی منی ستەمدیوی نامۆ، نەبادا ئاهم بگاتە ئاسمان و کارت لێ بکا.

(٧) واتە: من زۆر بەکەڵکم بۆ تۆ، بە بێقەدری تێم مەڕوانە؛ تۆ لە زەمانی منـدا بـەرێز و لـە دڵدا جێگیری وەك ئایینی ئیسلام، کە لە سەردەمی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب (خ. ڕ)دا زۆر بەهێز و جێگرتوو بوو.

بە قەدەر (گم): هەر وەکو.

## -٢٥- (*)

**شەڕیانە لە ئەندێشەیی موو، موئمین و تەرسا**
**کێشاویە لەسەر مەصحەفی ڕوو، شەکڵی چەلیپا (١)**
**ئەم کیشە کە گێسوو هەیەتی، کامی کەشیشە**
**بگرن بە جەدەل، با عولەما، ڕیشی سوکووبا (٢)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

(١) ئەندیشە: بیر و خەیاڵ. ترس. موئمین: موسوڵمان. تەرسا: گاور. چەلیپا: خاچ، ڕەمزی مەسیحییەکانە، کە بەدارداکردنی حەزرەتی عیسایان بیر دەخاتەوە. کینایەیشە لە ئەگریجەی یار، بە هەموو هێڵێکی چەماوەیش دەوترێ.

واتە: گاور و موسوڵمان لەسەر بیر و خەیاڵی ئەگریجەی یار شەڕیانە، چونکە ئەگریجەی یار وێنەی خاچی لەسەر قورئانی ڕوومەتی یار کێشاوە. ئەڵبەت کە ئەگریجەی وەك خاچ ڕوومەتی وەك قورئانی یاری داپۆشیوە، ئەمە گاور پێی خۆشە و لای موسوڵمان گرانە. چۆن خاچ قورئان داپۆشێ؟ بەڵام سەرنجڕاکێش ئەوەیە، ئەگەر مەبەست لە خاچ تەنیا هێڵی لار بێ، ئەوا ئەو ڕەمزە نابێ کە گاورەکان لایان پیرۆزە. مەبەستیش خاچی ڕاستەقینە بێ، وەها نییە، چونکە ئەگریجە، بە خاوی و بە لوولی و هەموو ڕوخسار داپۆشێ یا داینەپۆشێ، وێنەی خاچی نییە؛ مەگەر تەنیا لەبەرئەوەی عاشقی پێ لە دار دەدرێ، پێی بوترێ خاچ کە -بە قسەی گاورەکان- عیسای پێ لە دار دراوە. دەیشگونجێ واتای بەیتەکە، بەم جۆرە بێ: موسوڵمان و گاور بەهۆی بیرکردنەوەیانەوە کەوتنە گێرە و کێشە، چونکە ئەگریجەی یار کە ڕوخساری وەك قورئانی داپۆشیوە، وەك ئەوەیە سێدارەی دانابێ و ئەوانەی پێ بترسێنێ کە لەو قورئانە نزیك دەبنەوە! یا: ڕەنگە مەبەست ئەوە بێ موسوڵمان و گاور، لەبەرئەوەی مووی ئەگریجە بە شێوەی خاچ لەسەر قورئانی ڕوومەتی یار وەستاوە، کەوتوونە کێشمەکێش لەسەر ئەوەی کە ئەو قورئانی ڕوومەتی یارە موڵکی کامیانە.

شەڕیانە (گم): شەڕیە. لە ئەندێشەیی موو (حا): لە ئەندێشەیی ئەو. (کم، گم): لەسەر ئەندیشەی ئەو. بەیتەکە لەنگ دەبێ.

(٢) کیش: ئایین. گێسوو: ئەگریجە، زوڵف. کام: ئارەزوو. کەشیش: قەشە، پیاوی ئایینی گاورەکان. سوکووبا: پێشەوای دینیی مەسیحی، بە عەرەبی (أسقف).

**جێی هیندوویی خاڵت نییه، جوز خورشیدی جەمالت**
**ئەم مەرتەبەیە قابیلە بۆ حەضرەتی عیسا (٣)**
**هەرچی نییەتت بوو، نیگەهت دڵمی بەڵەد کرد**
**هەرچی نییەتم بوو، بە موژەت دڵ خەبەری دا (٤)**
**مەجنوون غەمی کوا: پردی سیراط ئەر وەکوو موو بێ؟**
**دەیکێشێ لەوێشا کەششی طوڕڕەیی لەیلا!! (٥)**

واتە: ئەم ئایینە کە ئەگریجە هەیەتی، بە ئارەزوو و دڵی قەشەیە کە خاچ قورئان داپۆشێ. با زاناکانی ئیسلام بڕۆن یەخە و ڕیشی سوکووبا بگرن و گفتوگۆی لەتەکدا بکەن، کە بۆچی ئەگریجە ئەم دەستدرێژییەی کردووە؟

کیشە (گم): کێشە. گێسوو (کم، گم): گیسووت، جوانترە. کامی (مان): کام، ئەویش بە نووسینی ئەوسا (کامی) هەڵدەگرێ. سوکووبا (ق): سوکووپا.

(٣) واتە: ڕوخساری وەك خۆری پرشنگدارت جێی خاڵی ڕەش نیە. شوێنی وا بەرز و پرشنگدار، لایەقی حەزرەتی عیسایە (د. خ). ڕەنگە ئاماژە بێ بەوە کە حەزرەتی عیسا خودا هەڵیبڕیوە بۆ ئاسمان و خۆریش لە ئاسمانە.

ئەم مەرتەبەیە قابیلە (ق): ئەم مەرتەبە قابیل بووە.

(٤) واتە: نە تۆ دەتوانی نیازی دڵتم لێ بشاریتەوە کە کوشتنی منە، نە من دەتوانم خۆم لە تۆ و لە تیری نیگات بشارمەوە. تۆ دڵت هەر نیازێکی هەبێ، نیگای چاوت وا دەخوێنمەوە کە دڵمی لێ ئاگادار دەکاتەوە. منیش هەرچەند بمەوێ خۆم لە تیرت بپارێزم، دڵم کە نیشانەی تیرەکانتە، بە برژانگەکانت دەڵێ: هەر من بە هەموو شێوەیەك زیانبارم.

(٥) دەیکێشێ: ڕایدەکێشێ. کەشش: هێزی ڕاکێشان، جاذبة.

واتە: مەجنوون چ خەمێکی ئەوەی هەیە کە ڕۆژی قیامەت لە پردی (سیرات) نەپەڕێتەوە، هێزی ڕاکێشانی ئەگریجەی لەیلا لەوێش ڕایدەکێشێ و بێماندوێتی دەیپەڕێنێتەوە، ئیتر خودای دەکرد سیرات لە موو باریکتریش دەبوو؛ یا مەجنوون کەی بیر لە پردی سیرات دەکاتەوە؟ ئەو لە قیامەتیشدا سەرقاڵی داوی ئەگریجەی لەیلایە و سیراتی بە خەیاڵدا نایێ.

(سیراط) لە (مان، حا)دا (صیراط)ە و هەڵەیە.

**وەصفی بەدەنی کافییە "سالم"! کە بە مەعنا**

**ڕۆحێکی موجەسسەم لە کراسایە، سەراپا (٦)**

(٦) ئەم بەیتە هەر لـە (مان)دا هەیە.

واتە: بۆ وەسفی جوانیی لەشولاری یار، ئەوەندە بەسە کە یار گیانـە و شـتێکی نوورانییـە، لـە لەشولارێکی سەراپا پۆشراوی کراسدا خۆی دەنوێنێ.

## -٢٦- (*)

**به مەحضی جەوری دڵبەر، هەر کەسێ تەرکی مەحەببەت کا**
**لە قەبریشا، بە میحنەت، تا قیامەت گریە عادەت کا (١)**
**قوبووڵ ناکا ببێ غەیرەز پەرێشانی لە عالەمدا**
**فەلەك، گەر پێڕەویی کرداری یاری بێمرووەت کا (٢)**
**لە بێئینصافییا دەکوژێ بە ئیما، سەییدی خەڵوەت**
**بە مەضموونی عەفوو، گەر نامەیی قابیض بە حوججەت کا (٣)**
**دەزانی چۆن فەرەحناکم بە بۆسەی لێوی شیرینت**
**بە موفلیس مەردی مونعیم وەك صەدا بۆ خوانی نیعمەت کا (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ف، ج، غ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) بە مەحضی: تەنیا بەوە. جەور: ستەم. گریە: گریان.

واتە: هەر عاشقێك تەنیا لەبەر ستەمی دڵبەر واز لە خۆشەویستی بهێنێ، خودایە نەك تا مردن، لە گۆڕیشدا تا ڕۆژی قیامەت گریان پیشەی بێ.

(٢) غەیرەز: غیر از، جگە لە. بێمرووەت: نامەرد.

واتە: ئەگەر گەردوون دوای کردەوەی یاری نامەرد بکەوێ و وەك ئەو دەیەوێ وا بجووڵێتەوە، ڕازی نابێ -جگە لە پەرێشانی و ناخۆشی- هیچیتری لە جیهاندا هەبێ.

(٣) مەضموون: واتا، ناوەڕۆك. قابیض: گیانکێش، ئیزرائیل. حوججەت: بەڵگە.

واتە: ئەو سەییدە کە گۆشەنشینی ڕوخساری یارە، یا ئەو سەییدەی کە خەڵوەتنشینی لەخوداترسییە، ئەگەر نامەی ئیزرائیلیش وەك بەڵگە بۆ مەبەستی لێبوردن بهێنێ تا کوشتنی دوابخا، یار ئەوەندە بێبەزەییە بە تەنیا ئیشارەتێك ساردی دەکاتەوە و دەیکوژێ!!

لە بێئینصافییا (غ): لە بێئینفاقییا. دەکوژێ (کم، گم): نەکوژێ. (عا): دەگری!

(٤) فەرەحناك: شاد. بۆسە: ماچ. موفلیس: نابووت، هەژار. مونعیم: خاوەنماڵی بەدەهەندە. صەدا: بانگکردن.

واتە: دەزانی چۆن بە ماچی لێوی شیرینت شاد دەبم؟ وەك شادیی ئەو هەژارە کە دەوڵەمەندی دەهەندە بانگی بکاتە سەر خوانی پڕ لە نان و نیعمەت!

**بە مەحضی کەشمەکەش دامانی عیشقت بەر بدەم، نابێ**
**دەمی تیغی موصیبەت، گەر کەفی فیکرم هەموو لەت کا (٥)**
**سەراسەر کاری "سالم" عیشقی تۆیە، ئەووەڵ و ئاخر**
**خەجاڵەت بێ قیامەت، گەر بەبێ تۆ مەیلی جەننەت کا (٦)**

دەزانی (کم): ئەزانی. وەك صەدا بۆ (غ): بۆ صەدا وەك.

(٥) کەشمەکەش: بگرەوبەردە، کێشمەکێش. دامان: داوێن. کەف: بەری دەست، ناولەپ.

واتە: دەستم لە داوێنی خۆشەویستیت گیرکردووە. ئەگەر دەمی تیغی بەلاّ و نەهامەتی ناولەپی بیر و هۆشیشم لەتلەت بکا، بۆ ئەوەی ئەو داوێنە بەربدەم، ڕەوا نییە و نابێ تەنیا بە هۆی کێشمەکێشی نێوانمانەوە دەستی لێ بەربدەم.

عیشقت (کم): عیشق. (گم): عیشقێ. بەربدەم (ج): بەرنەدەم. موصیبەت (عا): موسیبەت.

(٦) واتە: کاری سالم تێکڕا و لە سەرەتاوە تا کۆتایی خۆشەویستیی تۆیە. دەك لە ڕۆژی حەشردا شەرمەزار بێ ئەگەر ئارەزووی بێ بەبێ تۆ بچێتە بەهەشت.

## -٢٧- (*)

فەلەك زەحمەت لە دڵ مەیلت بەدەر کا
بینای هەستیم ئەگەر زیروزەبەر کا (١)
تەلاشی عیشقی بێ، هەر کەس لە دڵدا
دەبێ سینەی سیپەر بێ و تەرکی سەر کا (٢)
کە سوڵــطانی خەیاڵت بێتە خاطر
دەبێ شاهی خیرەد مەیلی سەفەر کا (٣)
دەڵێی "بەهرامی گوورِ"ە تورکی چاوت
لە دڵ نەمدیوە قەت تیری خەطەر کا! (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، غ، ق، ر، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) هەستی: بوون، (کیان). زیر: ژێر. زەبەر: سەر، دژی ژێـر. زیروزەبـەر کـا: سـەروبن بکـا، ژێروژوور بکا.

واتە: ئەگەر چەرخی گەردوون سەرەوژێرم بکا و لەناوم‌بەرێ، گرانە بتوانێ خۆشەویستیت لــە دڵم دەربکا و هەر دەمێنێتەوە.

زەحمەت لە دڵ (ق): ئەر زەحمەت. لەنگە.

(٢) تەلاش: هەوڵ. سیـپەر: قەڵغان.

واتە: ئەوی عیشق لە دڵیدا جێگیر بووبێ، دەبێ سنگی بکاتە قەڵغانی تیری نیگای یار و لەم رێیەدا واز لە سەری خۆی بهێنێ.

بێ و (عا): بێ.

(٣) خیرەد: عەقڵ و هۆش.

واتە: ئەگەر سوڵتانی خەیاڵت بێتە ناو دڵم، دەبێ پادشای عـەقڵ و هـۆش رابکـا. دوو پادشـا، سەعدی واتەنی، لە وڵاتێکدا پێکەوە نایانکرێ! کورت و پەتی، کە تـۆم دێتــە خـەیاڵ، عـەقڵم لــە سەردا نامێنێ.

بێتە (عا، غ): بێنە. هەڵەی نووسینە. مەیلی (ق): عەزمی.

(٤) بەهرامی گوور: پازدەیەمین پادشای ساسانی و جێنشین و کورِی یەزدگوردی یەکەمە، کە پاش مردنی باوکی، بە هاوکاریی لەشکری مونذیری کوری نوعمان، شازادە خوسرەوی لەسەر تەخت

**مەتاعی جانە پایەندازی غەمزەت**
**ئەگەر بۆ شاهڕاهی دڵ گوزەر کا (٥)**
**دەنێمە ظەرفی خاطر، یادی بۆسەت**
**ئەگەر طەبعم تەمەننای گوڵشەکەر کا (٦)**
**پەرێشانم دەکا وەك موڵکی بێشاه**
**لە قامەت هەر سەحەر گێسوو کەمەر کا (٧)**
**حەلاڵی کرد بە مەردوم، دڵ لە قوربا**
**نەظەر کا، غەمزەت ئەر خوێنی هەدەر کا (٨)**

لابرد و خۆی چووە جێی. تورك: جوان، ڕاوچی، تالانکەر.

واتە: چاوی جوانت لە ئەنگاوتن و دەستڕاستیدا دەڵێی بەهرامی گوورە، هەرگیز نەمدیوە تیری لە دڵم سەر بکا و نەپێکێ!

بەهرامی (کم، گم): بارامی. خەتەر (حا، کم، گم): خەطەر.

(٥) مەتاع: شتومەکی فرۆشتن. جان: گیان. پایەنداز: ئەوەی وا دەخرێتە بەر پێی خۆشەویستان و بەرێزان، پێشکەش. غەمزە: نیگا و ڕوانینی بەنازی چاو. شاهڕاه: شارێ، شەقامی گەورە و پان. گوزەر: تێپەڕین.

واتە: ئەگەر نیگای چاوت بە شارێی دڵمدا تێبپەڕێ، گیانم دەکەمە پێشکەشی و لە بەرپێتدا دایدەنێم.

(مەطاعی) لە (مان، حا، عا، ڕ)دا هەڵەیە و (مەتاعی)یە. جانە (حا، ڕ، کم، گم): خانە. هەڵەیە.

(٦) ظەرف: دەفر. بۆسە: ماچ. گوڵشەکەر: شیرینییەکە لە شەکر و پەڕەی گوڵی سوور دروست دەکرێ.

واتە: یادی ماچت لە دەفری دڵمدا هەڵدەگرم بۆ کاتێك تەبیعەتم حەز لە گوڵی وەك شەکر شیرین بکا و ئاواتەخوازی بێ، ئەو دەمە دەیهێنمەوە خەیاڵم. یانێ یادی ماچەکەت زۆر شیرینە!

ظەرفی (عا): ضەرفی. هەڵەی نووسینە. (ڕ): صەرفی.

(٧) واتە: یار هەر بەرەبەیانێك ئەگریجەی بکاتە پشتێنی باڵای وەك مەملەکەتی بێپادشا، سەرگەردان و پەرێشان دەبم.

دەکا (کم): ئەکا.

(٨) مەردوم: گلێنەی چاو. هەدەر: فیڕۆ، خوێن بەخۆڕایی ڕژان.

**ویصالت پایەیی میعراجە بۆ من**
**لە ڕووتا، گەر لەبم ((شَقّ القَمر)) کا (٩)**
**دەکا تەسخیری دڵ، چاوت بە ئیما**
**سەراسەر ئیسمی ئەعظەم، گەر لەبەر کا (١٠)**
**بەدڵ وا بگرە دڵ تیریّ لە غەمزەت**
**لە موهرەی پشتی "سالم" سەر بەدەر کا (١١)**

ئەگەر شیعرەکە بکەین بە پەخشان وای لیّ دیّت: ئەگەر لە قوربا غەمزەت نەظەر کا، حەلاّلّی کرد بە مەردوم خویّنی هەدەر کا. واتە: ئەگەر غەمزەت لە نزیکەوە بۆم بڕوانیّ، دڵ حەلاّلّی دەکا بۆ گلیّنەی چاوت، خویّنی بە خۆڕایی بڕژیّنیّ! تۆ تەنیا غەمزەیەکم تیّبگرە، ئیتر ژیانم لەم دنیایەدا ناویّ!

قوربا (گم): قورِ با.

(٩) ئەم بەیتە لە (غ)دا نییە.

میعراج: بەرزبوونەوە، میعراجی حەزرەتی پیّغەمبەر (د.خ). شقّ القمر: مانگ دوولەتکردن، ئەمەیش یەکیّك بووە لە موعجیزەکانی.

واتە: ئەگەر بۆم هەڵکەویّ بە لیّو ماچی ڕوومەتت بکەم و ڕوومەتت لەبەر ناسکی بەو ماچە دوولەت بیّ، ئەوە بۆ من موعجیزەی گەیشتنە بە تۆ و پایەی میعراجم پیّ دەبەخشیّ.

پایەیی (ق، ڕ): موعجیزەی.

(١٠) واتە: دڵم ئەگەر هەرچی ناوە پیرۆزەکانی خودا هەیە، لەبەریان بکا و بیانخویّنیّ، ڕزگار نابیّ و چاوت بە ئیشارەتیّکی دڵبەرانە داگیری دەکا!

دەکا تەسخیری دڵ، چاوت (ڕ): دەکا تەسخیری چاوت، دڵ. (گم): دەسا تەسخیری دڵ، چاوت.

(١١) بەدڵ: بە هەموو دڵیّکتەوە، لە قووڵاییی دڵتەوە. بگرە دڵ: بهاویّژە بۆ دڵ. موهرە: مووراغەی پشت، ناوەڕاست.

واتە: بە هەموو دڵیّکتەوە تیریّکی وەها لە غەمزەی چاوتەوە بهاویّژە بۆ پەڕەی دڵم کە بیسمیّ و لە مووراغەی پشتمەوە سەر دەربکا و دەربچیّ، کوناودەری بکا.

## -٢٨- (*)

**شەهدی لەبی لەعلی یار، قیمەتی شەککەر شکا**
**دیدەیی مەستی نواند، ساغەری عەبهەر شکا (١)**
**تیژییی تیری موژەی گەییە مەقامێ لە دڵ**
**بۆ کەفی ڕەزمازوما حورمەتی خەنجەر شکا (٢)**
**شوعلەیی ئەنواری ڕووی، پەرتەوی وا کرد عەیان**
**ئێستە لە بازاڕی شەو ڕەونەقی گەوهەر شکا (٣)**
**ڕوویی دڵارامی من پڕیە لە خشڵ و حولی**
**خانەیی زەڕگەر خەراب، قیمەتی زێوەر شکا (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (م، پ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: بەسیتی هەشتیی مەتوی.

(١) عەهد: سەردەم. لەعل: سوور. ساغەر: پیاڵەی مەی. عەبهەر: نێرگز.

واتە: بە شیرینیی لێوی سووری یار، قیمەتی شەکر شکا و دایە کزی. کە چاوە مەستەکانیشی نیشان دا، پیاڵەی شەراب لەت بوو.

شەهدی (م): عەهدی.

(٢) موژە: برژانگ. مەقام: پلە و شوێن. کەف: بەری دەست. ڕەزمازوما: رزم آزما، شەڕ تاقیکردووەوە.

واتە: تیری نووکتیژی دڵی گەیشتە شوێنێکی وا لە دڵمدا، کە ڕێز و شکۆی خەنجەر بۆ دەستێکی فێرەشەڕ نەمایەوە.

(٣) پەرتەو: شەوق و ڕووناکی. عەیان: ئاشکرا.

واتە: گەوهەر لە بازاڕی شەودا کە چەند ڕەونەقی هەیە، لەبەر ڕووناکیی ڕووی یاردا هیچ بەهایەکی نەما.

بازاڕی شەو (پ): بازوویی شەه.

(٤) حولی: خشڵ. زێوەر: وەستای زیو. خانە: ماڵ. زەڕگەر: زەڕەنگەر، زێڕنگەر.

واتە: جوانیی هەر شوێنێکی ڕووی یارم ئەوەندەی خشڵ تێدایە، ماڵی زێڕنگەر وێران بوو و وەستای زیویش نرخی بۆ نەمایەوە.

**دوێنێ لە صەحنی چەمەن دڵبەری من هات و چوو**
**بۆ قەدی وەك سەرْوی ئەو، قامەتی عەرعەر شکا (٥)**
**موشکی جودا کرد لە چین، شەبڕەوی بادی سەحەر**
**وەه، لە دەماغا بە بۆ نەفخەیی عەنبەر شکا (٦)**
**ناری غەمی عیشقی یار گەییە مەقامی عورووج**
**پێشی تەب و تابی دڵ جۆششی مەجمەر شکا (٧)**
**شاهیدی شەهر و فەلەك کەوتنە مەقامی جەدەل**
**وەختێ موقابیل لە دوور خوسرەوی خاوەر شکا (٨)**

خەراب (نم): خەراپ.

(٥) صەحن: حەوشە، مەیدان. چەمەن: گوڵزار.

واتە: دوێنێ کە یار لەناو باخچەدا هاتوچۆی دەکرد، باڵای عەرعەر لەبەر بەژنی بەرزی ئەودا شکستی خوارد.

(٦) موشك: میسك. شەبڕەو: شەوڕۆ، شەوڕێکردوو. بادی سەحەر: بای بەرەبەیان. وەه: وای، ماشەڵڵا. نەفخە: بۆ ئێرە دەست نادا و دەبێ (نەفحە) بێ بە مانای بۆنی خۆش. عەنبەر: ماددەیەکی بۆنخۆشە.

واتە: بای بە شەو ڕێکردووی بەیانی، میسکی لە وڵاتی (چین) جیا کردەوە و نەیهێشت. سەیرە! بۆنی عەنبەر لە دەماغیشدا بڕا.

(٧) نار: ئاگر. عورووج: بەرزبوونەوە. تەب و تاب: تین و تاو. مەجمەر: ئاگردان.

واتە: ئاگری خەمی خۆشەویستیی یار بەرز بووەوە بۆ ئاسمان. پێش ئەوەی تین و تاوی دڵ دابمرێتەوە، ئاگردان جۆشی نەما.

تەب و تاب (نم): تەڤ و تاب.

(٨) خوسرەوی خاوەر: خۆر.

واتە: کاتێك خۆر لە دوورەوە و بەرامبەر بە یار ڕەونەقی نەما و بازاڕی شکا، خەڵکانی شایەتحاڵی وڵات و ڕۆژگار کەوتنە مشتومڕ و گفتوگۆکردن لەسەر ئەم مەسەلەیە.

مەقامی جەدەل (پ): جەدەل ڕووبەڕوو. (وەختێ) کورتە و بە (وەختی) دەخوێنرێتەوە.

**عیشوه به ئیمایی چاو تیپی موژەی دا نیظام**
**قەلبی دڵی زاری من وەقتێ بەرابەر شکا (٩)**
**لوججەیی ئەشکم لە خوێن عەکسی وەها کرد ظوهوور**
**بۆ (فلك الأطلس)ی شێوەیی ئەحمەر شکا (١٠)**
**گەرچی، بە جان و بە دڵ، لەم دەرە هەر تۆی خەلیل**
**خاطری "سالم" لە ڕووت وەك بتی ئاذەر شکا (١١)**

(٩) ئیما: ئیشارەت، تیلە.

واتە: یار تیپی موژەی بە عیشوە و نازی تیلەی چاوی ڕێكخست. ئەو کاتە دڵی زاری من بەرامبەر بەوە شکا، چونکە تیپی موژە هێرشی بردە سەری.

دا نیظام (پ): خستە سان. وەختێ (م): وەقتێ. (وەقتێ) کورتە و لەبەر کێش بە (وەقتی) دەخوێنرێتەوە.

(١٠) لوججە: لافاو، ئاوی نێرینەی ڕووبار. ئەشك: فرمێسك. عەکس: ڕەنگدانەوە. ظوهوور: دەرکەوتن. فلك الاطلس: چەرخی گەردوون، دەیەم فەلەکە دەوری دونیا و نۆ فەلەکەکەی‌تری گرتووە. ئەحمەر: سوور.

واتە: لافاوی فرمێسکی سووری خوێنیم بە جۆرێکی وا سوور دەرکەوت، ڕەنگی سوور تا (فلك الاطلس)، لە هەر کوێیەك بێ، لەبەر شەوقدانەوەی سووریی فرمێسکی من، سوور نەنوێنێ. وەك چۆن کە خۆر هەڵهات، ئیتر ئەستێرە شەوقی نامێنێ! زیادەڕۆیی (موبالەغە)یەکی سەیری تێدایە، پێوەندیشی بە زانستی (هیئة تشریح الأفلاك)ەوە هەیە و ڕەنگە ئاماژەیەکیش بێ بۆ مەلایەتیی سالم.

کرد ظوهوور (پ): کەوتە دەر. بۆ (فلك الأطلس) ئەو (پ): بۆ (فلك الأطلس)ی.

(١١) خەلیل: دۆست. بتی ئاذەر: بتەکەی ئازەری باوکی حەزرەتی ئیبراهیم.

واتە: ئەگەرچی هەر تۆ لەم دەوروبەرەدا دۆستمی، بەڵام ئەوەندە بێزارم، دڵم وەك بتەکەی ئازەری باوکی حەزرەتی ئیبراهیم شکاوە.

لەم دەرە (پ): لەم دەمە.

## (*) -٢٩-

**کاتیبی فیکرم لە دڵدا دیققەتێ ئینشا دەکا**
**جوستوجۆ بۆ سەطْربەندیی کاغەذی میرزا دەکا (١)**
**ئەحمەقە لەقلەق، ئەگەر تەرکیبی نیسبەت دا بە ئەو**
**وشتر ئەر بێت و بڵێ: ((وەك ئەو دەڕۆم))، بێجا دەکا (٢)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، ف، کم، گم)دا هەیە. ناسناوی "سالم"یش دیار نییە، بەڵام لە (مان)دا لە پێشەوە نووسراوە ((وَلـهُ ایـضاً)) کە ڕستەیەکی عەرەبییە، یانێ ئەمەیش هیی ئەوە. شیعرەکە تێکڕا هەجوی "میرزا" ناوێکە، چونکە وەك دوو جار ناوی میرزای تێدا هاتووە، ناوونیشانی شیعرێکی پێش ئەم پارچەشیعرە لە (مان)دا: (در وصف میرزای سنندجی)یە. هەر لەپاڵ ئەم دەستەواژەیەدا وەك حاشیە نووسراوە: (یعنی عبدالله بیگ حواشی)، واتە شیعرەکە وەسفی میرزای سنەیییە، ئەم میرزایەیش عەبدوڵڵا بەگە. وا دەزانرێ، ئەگەر ئەم (حواشی)یە ناسناوی میرزا نەبێ، مەبەست ئەوەیە بڵێ: ئەم ڕستەی (یعنی عبدالله بیگ)ە لەو ڕەشنووسەدا کە دیوانەکەی لەبەر پاکنووس کردووە، لە پەراوێزدا نووسراوە، یان ئەم میرزایە دەستی وەرداوەتە نامەی ئەم و ئەو و دەستکاریی کردوون. جا بە دوور نازانرێ، بە تایبەت کە وشەی ((ایضا)) هەیە، ئەم شیعرەیش هەر بۆ وەسف و هەجوی میرزا عەبدوڵڵا بەگی سنەیی بێ.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) دیققەت: وردەکاری نوواندن و قسەی پڕواتا. ئینشا: داڕشتن و دانانی وتار یا شیعر یا پەخشان. جوستوجۆ: گەڕان بەدوای شتدا. سەطربەندی: دێڕبەندی، ڕیزکردنی دێڕ.

واتە: بیری قەڵەمبەدەستم لە دەروونێدا دەیەوێ دەستەواژەیەکی ورد و پتەو و پڕمانا دابنێ، بەدوای وشە و ڕستەی بەهێزدا دەگەڕێ تا دێڕ بە دێڕ ڕیزی بکا و بۆ میرزای بنێرێ!

هەموو (دەکا)کانی ئەم پارچەشیعرە لە (کم)دا دەستکاری کراون و بوونەتە (ئەکا).

(٢) ئەم بەیتە لە (ف، کم، گم)دا پێنجەمە.

واتە: ئەگەر لەقلەق بڵێ- منیش وەك میرزا دروست کراوم، زۆر گەوج و کەللەپووچە. ناقۆڵاییی ئەندامی ئەو لە کوێ و هیی میرزا لە کوێ؟! یا وشتری بە لۆقە ناودەرکردوو، ئەگەر بڵێ- وەك میرزا دەڕۆم و لۆقە دەکەم، قسەیەکی بێجێ دەکا و سەری دا لە بەردا!

دا بە ئەو (ف، کم، گم): کا بە تۆ. وشتر (کم، گم): حوشتر. دەڕۆم (کم، گم): ئەڕۆم.

**زۆر نییە گەر ساقی عووجیان کرد بە جیسری ئاوی نیل**
**ئیستیخوانی دەستی میرزا، پول لەسەر دەریا دەکا! (٣)**
**ناکەوێتە سەر سەری سایەی هوما، تا وا نەبێ**
**لووتی پاپاخی لەگەڵ سەقفی فەلەك دەعوا دەکا (٤)**
**گەر لە لای زەوجەی لە شەودا بێت و هەستێ بۆ عەمەل!**
**قامەتی میلیٚ لە دەرگانەی حەرەم بەرپا دەکا (٥)**

(٣) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا نییە.

ساق: لوولاقی قاچ. عووج: عووجی کوڕی عەنەق، زەلامێکی زۆر درێژی ئەفسانەییە. جیسر: پرد. نیل: ڕووبارە بەناووبانگەکەی میسر. ئیستیخوان: ئێسقان. پول: پرد.

واتە: شتێکی سەیر نییە کە -وەك دەڵێن- لوولاقی عووجی کوڕی عەنەقیان بەسەر ڕووباری نیلدا کردبێ بە پرد، چونکە ئێسقانی دەستی میرزا، نەك لوولاقی قاچی، بۆ پردی سەر دەریا دەشێ.

وشەی (کرد) لە (مان، ن)دا کەوتووە. زۆر نییە (ف): ڕۆژنەیی. هەڵەیە.

(٤) ئەم بەیتە لە (ف)دا دووەمە.

هوما: پیرۆزە، باڵندەیەکە لە ئەفسانەدا بە پیرۆز و بەفەڕ ناوی هاتووە، وتراوە سێبەر لەسەر سەری هەر کەسێك بکا، دەبێتە پادشا!! وا: وەها. پاپاخ: کڵاوی گەورەی پەشمین.

واتە: تا وەها درێژ و قووچ نەبێ کە لووتی کڵاوی لەگەڵ بنمیچی ئاسماندا شەڕ بکا، هوما سێبەری لەسەر ناکا، چونکە هوما بەرز دەفڕێ! یا ئەگەر ئەوەندە بێعەقڵ نەبێ، هوما ڕێی لێ ناکەوێ و بەخت یاری نابێ، چونکە -وەك دەڵێن- عەقڵ و بەخت ئاشنایەتییان نییە!

ناکەوێتە (کم، گم): تاکوو بێتە. تا وا (کم، گم): ئاوا. (لووتی) لە (مان)دا (لوطی)یە! دیارە هەڵەیەکی زەقە. دەکا (ف): ئەکا.

(٥) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا دووەم بەیتە.

زەوجە: هاوسەر. عەمەل: لێرەدا مەبەست لە کاری خێرە! میل: نیشان یا بینایەك بۆ دیاریکردنی ماوەی ڕێ دادەنرێ و زۆر بەرز و دیارییە. حەرەم: حەرەمسەرا، ژووری تایبەتی ژن و مێرد.

واتە: ئەگەر شەو لە لای خێزانی نوستبێ و هەستێ بۆ کاری خێر، لە دەرگای ژووری حەرەمدا دەڵێی میلە و چەقێنراوە!

(لخواشتا) لە (مان، ن)دا هەڵەیە. (ف): لە خەودا. (کم، گم): لە شەودا. ڕاستە. هەستێ (کم، گم): هەڵسێ. قامەتی (گم): قیامەتی. میلیٚ (کم، گم): مەیلی. بەرپا: (کم): بەربا!

## -٣٠- (*)

**توركی پڕئەفسوونی چاوی کاری صەد جادوو دەکا**
**ساعەتەن تەسخیر دەبێ بۆ هەر مەکانێ ڕوو دەکا (١)**
**هەرچی "نادر" قەبض و بەسطی کرد بە شەمشێر و سوپا**
**ئەم بە تیغی جەوهەرئالوودی خەمی ئەبروو دەکا (٢)**
**خاڵی سەر صەفحەی ڕوخی جانان، چ نادر کەوتووە ؟**
**حیکمەتی، (دار الخلافە)ی گورجییان هیندوو دەکا (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) تورك: مەبەستی دڵبەرە. ئەفسوون: فێڵ و چاوبەست. جادوو: سیحرباز. ساعەتەن: ساعةً، گورج، دەمودەست.

واتە: چاوی پڕ فێڵی دڵبەرم حوکمی سەد سیحربازی هەیە، ڕوو بکاتە هەر شوێنێك، گورج و بێدەنگ داگیری دەکا.

ساعەتەن تەسخیر دەبێ (کم): ساعەتەن تەسخیر ئەبێ. ڕوو (کم، گم): ڕەو. (ڕوو) بەجێترە، چونکە هەم سەروای شیعرەکە وای دەوێ، هەم لە کوردیدا ڕەوکردن واتە بارکردن و هەڵاتنی خێڵ یا کۆمەڵی بەزیو. لێرەدا دڵبەر یا چاوی دڵبەر ڕەو ناکا، بەڵکوو ڕوو دەکاتە موڵکی عاشقان!

(٢) نادر: مەبەستی نادرشای ئەفشارە. قەبض: گرتن. بەسط: بەرەڵڵاکردن. ئالوودە: تێکەڵ. جەوهەرئالوود: جەوهەردار. خەم: کەوانی، چەماوە.

واتە: ئەوەی نادرشا بە شمشێر و بە سوپا کردی، شمشێری بە دەستەوە گرت و سوپایەکی گەورەی بەردایە گیانی خەڵك، دڵبەر بە تیغی برۆی کەوانیی جەوهەرداری خۆی بە ئێمەی دەکا؛ جارێ دەیگرێ و دەیهێنێتە یەك و گرژی دەکا، جارێکیتر دەیکاتەوە، لە هەردوو حاڵدا دڵی عاشقانی پێ داگیر دەکا!

ئەبروو (کم، گم): ئەبرۆ.

(٣) ڕوخ: ڕوخسار. جانان: سووککراوەی جانانەیە، دڵبەر. نادر: نایاب. حیکمەت: ئەڵبەت مەبەستی پزیشکییە یا حوکمە. (دار الخلافە): لەوانەیە مەبەستی (ئاستانە)ی عوسمانییان بێ. گورجیان: گورجستانییەکان، گورجی پێستسپییە. هیندوو: خاڵی ڕەش، بەندەی هیندی.

**ڕیشوەیی گەردنکەچیی ئەو گەردنە، حوکمی قەضا**
**بۆ خەراجی بەندەگیی سەر گەردەنی ئاهوو دەکا (٤)**
**ئێستە بۆ مەللاحی دەریای عیشق و ئەهلی مەعریفەت**
**قەطرە قەطرە ئەشکی چاوم قیمەتی لوولوو دەکا (٥)**
**سەهلە گەر مووسا عەصای کردە حەی و سەهمی نوواند**
**موعجیزەی وا دڵبەرم هەردەم بە مووی گێسوو دەکا (٦)**
**ڕوویی دونیا تارە، تا شەمعی جەبینی دوورە لێم**
**ناصییەی پڕچینی من دایم هەوای زانوو دەکا (٧)**

واتە: خاڵی ڕەشی ڕوومەتی پرشنگداری دڵبەر چ نایاب هەڵکەوتووە، بە حیکمەتی خۆی (دار الخلافە)ی موسوڵمانانی گورجستان دەکاتە وڵاتی هیندی و لە دینیان وەردەگێڕێ و دەیانکاتە کافر. مەبەست جوانی و سەرنجڕاکێشیی خاڵەکەی یارە.

جانان (گم): جانا. بەم بارە دەبێ (جانا!) بێ و بانگکراو (موناداا) بێ، واتە: گیانەکەم!

(٤) ڕیشوە: بەرتیل.

هەرچەندە (سەر) لە هەردوو نوسخەکەدا لە نیوەبەیتی دووەمدا هاتووە، بەڵام ئێمە پێمان وایە (صەد) بێ. بەو پێیە، ماناکەی وای لێ دێتەوە: حوکمی قەزای خودایی یا دادگا گەردنی سەد ئاهوو دەکا بە بەرتیلی گەردنکەچی بۆ گەردنی یار، یان ناچاری ڕاوکردنی سەد ئاهووە تا بیکاتە بەرتیلی ڕوانینێکی بەنازانە لە ڕووی یارەوە.

(٥) مەللاح: مەلەوان، کەشتیەوان. لوولوو: مرواری.

واتە: دڵۆپ دڵۆپی فرمێسکی چاوم لە لای مەلەوان یا کەشتیەوانی دەریای عیشق، نرخی مرواریی هەیە.

(٦) حەی: مار. سەهم: سام و ترس. گێسوو: زوڵف، ئەگریجە.

واتە: ئەگەر حەزرەتی مووسا (د.خ) عاساکەی دەستی بۆ بوو بە مار و جادووگەردکانی فیرعەونی ترساند، دڵبەری من موعجیزەی وەها بە تاڵتاڵی ئەگریجەی ڕەشی دەنوێنێ!

وا (گم): دا.

(٧) تار: تاریك. جەبین: تەوێڵ، ناوچاوان. ناصیە: ناوچاوان. زانوو: ئەژنۆ.

واتە: تا ناوچاوانی وەك مۆمی درەخشانی دڵبەرم لێوە دوور بێ، جیهان لە بەرچاوم تاریکە و تەوێڵی پڕ لە چرچولۆچی خەفەتاویم هەمیشە حەز لە سەردانەواندن بو ئەژنۆ دەکا. دیارە مرۆی

**گەر بە موژدەی مەرحەمەت جانی ڕەقیبم تازە کەی**
**میثلی طیفلی موردەمادەر دڵ بە شیوەن خوو دەکا (٨)**
**ئیسمی ((هو)) حەققە لە ڕێی حەق، دەستی ڕەددم لێ مەدەن**
**"سالم"ی میسکین وەکوو دەروێش لە دەرگەت هوو دەکا (٩)**

خەفەتبار سەربەئەژنۆیە.

(٨) جان: گیان. موردەمادەر: دایكمردوو.

واتە: ئەی دڵبەر! ئەگەر بە موژدەی نەوازش گیانی دوژمنەکەم تازە زیندوو بکەیتەوە، دڵی من وەك ساوای دایكمردوو خوو بە شیوەنەوە دەگرێ، دایکی لە بیر ناچێتەوە.

موردەمادەر دڵ بە (کم): موردەمارد. هەڵەیە. خوو (گم): خەو. هەڵەیە.

(٩) هوو: ئەو، مەبەست زاتی خودایە. لە ڕێی حەق: لە ڕێی خودادا. ڕەد: دەستبەڕووەوەنان و جێبەجێنەکردنی داخوازی.

واتە: سالمی بێچارە وەك دەروێش لە دەرگای ئێوەدا (یاهوو) دەکا. ناوی (هو)یش حەقە، خودایە. کەواتە لە ڕێی خودادا دەست بە ڕوویەوە مەنێ.

دەرگەت (کم): دەرگات.

جێی باسە، هەموو (دەکا)یەکی ئاخری بەیتەکان لە (کم)دا کراوە بە (ئەکا)!

## -٣١- (*)

**غەم لە دڵ بۆ فەوتی شادی مەیلی سەرخۆشی دەکا**
**صوبحی عیشقە، شەمعی عەقڵم ڕوو لە خامۆشی دەکا (١)**
**زوڵفی شەبڕەنگت وەکوو ڕۆژە، پەرێشان با نەبێ**
**وا سەحابئاسا لە ڕووتا قەصدی مەهپۆشی دەکا (٢)**
**بۆ ئەدایی تەعزییەی من، تورکی چاوی مەستی یار**
**بۆ طەرەب هەردەم لە بەزمی عیشوە مەینۆشی دەکا (٣)**
**داستانی عیشقی من فاشە لە هەر کووچە و سوقاق**
**عەقڵی دێوانەم لەپاش ئەم حاڵە سرپۆشی دەکا!! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (کم، پ، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) واتە: خەمی ئازاردەر حەزدەکا سەرخۆش بێ، تا لە هەموو لایەکەوە سزام بدا و شادیم نەهێڵێ؛ یا خەم لە خۆشیی ئەوەی وا شادیم نەماوە، مەیلی مەستی دەکا و بەکەیفە! دیارە بەرەبەیانی عیشق هێرشی هێناوە و مۆمی هۆش و فامم بەرەو کزی و کوژانەوە دەچێ. عیشق و ژیری ناگونجێن.

فەوتی (پ): ڕۆینی.

(٢) شەبڕەنگ: ڕەشی وەك شەو. سەحابئاسا: وەك هەور. مەهپۆشی: داپۆشینی مانگی ڕوو.

واتە: ئەگریجەی وەك شەو تاریکت کە بە وێنەی ڕۆژ ڕووناکە، دێتە سەر ڕووت، مەهێڵە پەرشوبڵاو ببێتەوە. ئەگریجەت وەك هەور خەریکە مانگی ڕووت دادەپۆشێ.

ڕۆژە (پ): ڕۆژم. لە ڕووتا (پ): کرە و تا؟ هەڵەیە. (بۆ)ی دووەم (پ): پڕ.

(٣) واتە: چاوی مەستی یار، پاش مردنم، لەباتیی ئەوەی پرسە دابنێ کە عاشقێکی وەفاداری وەك منی مردووە، خەریکی بەزم و ڕەزم و کەیف و ناز و مەینۆشییە!

بۆ طەرەب (گم): پڕ طەرەب.

(٤) داستان: حیکایەت، بەسەرهات. فاش: ئاشکرا، بڵاو. کووچە و سوقاق: کۆڵان و ڕێ.

واتە: حیکایەتی عیشقی من خەڵك لە هەموو کووچە و کۆڵانێکدا پێی زانیوە، کەچی عەقڵی شێتم -پاش ناوزڕانم- دەیەوێ بیشارێتەوە!

کەثرەتی ضیعفم لە هیجرانا گەیشتە مەرکەزێ
دڵ لە سینەمدا بە دایم مەشقی بێهۆشی دەکا (٥)
دڵبەری باڵابڵندم گەر خەرامان بێ بە ناز
سەرْوی گوڵزاری ئیرەم چۆن مەیلی هەمدۆشی دەکا؟! (٦)
گەر نەویدێ ڕێی سەگی قاپیت بەرن بۆ جێی غەریب
"سالم"ی میسکین لە دەرگا حەلقەدەرگۆشی دەکا (٧)

(٥) کەثرەت: زۆری. مەرکەز: ناوەڕاستی هەر شتێك، پایە و پلە.

واتە: بێهێزیی زۆرم بەهۆی دووریی یارەوە گەیشتووەتە ڕادە و پایەیەك، کە دڵ لە سنگمدا هەمیشە خەریکی فێربوونی بێهۆشییە و خۆی لەسەری ڕادەهێنێ!

کەثرەتی ضیعفم لە هیجرانا (پ): هێند ضەعیف ماوم لە دووریدا. (مەرکەزێ)، (مەرکەزی)ش هەڵدەگرێ. بە دایم (پ): هەمیشە.

(٦) خەرامان: لەنجەولار. دۆش: شان. هەمدۆش: هاوشان.

واتە: یاری باڵابەرزم ئەگەر بە لەنجەولار و نازەوە بە ڕێدا بێت، سەروی باغی ئیرەمی بەناووبانگ کەی دەبێتە هاوشانی؟ کەی لە جوانی و ڕێکیدا دەگاتە ئەو؟!

(٧) حەلقەدەرگۆشی: ئەڵقەلەگوێیی، پاسەوانی، نۆکەری.

پێمان وایە نیوەبەیتی یەکەم هەڵەی تێدایە و ڕاستییەکەی بەم شێوەیەیە: ((گەر نەویدێ ڕێی سەگی قاپیت بەرێ بۆ جێی غەریب))، واتە: ئەگەر مژدەیەك ببێتە هۆی ئەوەی وا ڕێی سەگی بەردەرگاکەت دوور بخاتەوە بۆ شوێنێکی نەزانراو، سالمی داماو ئامادەیە لە بەردەرگاتدا ببێ بە نۆکەر و پاسەوان.

نەویدێ (کم، گم): نەوێرێ. دەرگا (پ): دەرگات.

شایانی وتنە، هەموو (دەکا)یەکی ئەم شیعرە لە (کم)دا کراوەتە (ئەکا).

(*) -٣٢-

**پەنجە بۆ تەصویری ئەبرووت، پەیڕەویی "مانی" دەکا**
**خامە بۆ زەنجیری گێسووت، عەنبەرئەفشانی دەکا (١)**
**قووتی ڕۆحە لێوەکەت، یاقووت وەها ئاودار نییە**
**مەنعی بازاڕی عەقیق و لەعلی ڕوممانی دەکا (٢)**
**گەر لە پەردەی نازەوە ئاوازی تۆ بگرێتە گوێ**
**تووتییی شیرینسوخەن کەی مەیلی خۆشخوانی دەکا؟ (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، نم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) مانی: وێنەکێشێکی ناوداری کۆنی زەمانی خوسرەوی پەروێزی شای ئێران بووە، دەڵێن: گوایە لافی پێغەمبەریشی لێداوە! خامە: قەڵەم. عەنبەر: ماددەیەکی بۆنخۆشە، لە ناو گەدە یا ڕیخۆڵەی ماسی عەنبەردا دروست دەبێ و لەسەر ڕووی دەریا کۆدەبێتەوە. کاتێك ئەو ماسییە ڕاو دەکرێ، ئەو ماددەیە لە سکی دەردەهێنرێ. ئەفشانی: پرژاندن. عەنبەرئەفشانی: عەنبەرپژاندن، عەنبەر بڵاوکردنەوە.

واتە: پەنجەی من پێڕەویی "مانی"ی بەناووبانگ دەکا بۆ وێنەکێشانی تۆ، دەیەوێ وێنەکەت وەك خۆت نایاب بێ. قەڵەمی من بۆ ڕەنگرێژیی ئەڵقەئەڵقەی ئەگریجەت، لەباتیی مەرەکەب، عەنبەر بڵاو دەکاتەوە و دەوروبەر بۆنخۆش دەکا.

(٢) قووت: بژێو، ئەوەی گیانلەبەری پێ بژی. لەعلی ڕوممانی: لەعلی وەك دەنکە هەنار سوور.

واتە: لێوەکەت قووتی گیانمە و پێی دەژیم. یاقووتی بەنرخ هەرگیز ئەو ئاو و ڕەونەقەی نییە کە لێوت هەیەتی، یا بژێویی ژیان ئەوەندە ئاوی تێدا نییە. لێوت بازاڕی عەقیق و لەعلی شکاندووە و نرخی سووك کردوون.

ئاوی (عا، نم): ئاودار.

(٣) ئەم بەیتە لە (مان)دا نییە، لە (نم)دا چوارەمە.

شیرینسوخەن: قسەشیرین. خۆشخوانی: خۆشخوێنی.

واتە: تووتیی قسەخۆش، ئەگەر لە کاتی نازکردنتدا گوێ لە ئاوازت بگرێ، هەرگیز مەیلی خۆشئاوازیی خۆی ناکا، بەڵکوو شەرم لە ئاوازی خۆی دەکا!

**قامەتی نەوخێزی شیرینت نیهالی جەننەتە**
**سەرْوی ڕەعنا، کەی لە لات سا مەیلی هەمشانی دەکا؟ (٤)**
**دڵ بە نەشئەی حاڵی مەستیی چاوەکەت، ((لایَعقَل))ە**
**بۆ کەبابی جەرگی من، لێوت نەمەکدانی دەکا (٥)**
**سا هەزار جارت دەخیل بم، حەرفی بەدکار مەشنەوە**
**هەرچی دەربارەم بڵێ، بێپیرە؛ شەیطانی دەکا (٦)**
**لێوی یاقووتت نگینە، خاتەمی نادرظوهوور**
**مۆری دەستی "ئاصەف"ە و ئەمری "سولەیمان"ی دەکا (٧)**

شیرینسوخەن (نم): شیرین زوبان. مەیلی (نم): ئاوازی.

(٤) ئەم بەیتە لە (نم)دا نییە.

نەوخێز: تازەهەڵچوو. نیهال: نەونەمام.

واتە: باڵای تازەهەڵچووی جوانت نەونەمامی بەهەشتە، ئیتر سەرو کەی لای تۆ دەتوانێ بیر لە هاوشانیت بکاتەوە؟!

کەی لە لات سا مەیلی (عا): سا لەلات کەی ئەزمی.

(٥) ئەم بەیتە لە (مان)دا نییە.

نەمەکدان: خوێدان، ئەو دەفرەی کە خوێی تێدەکرێ.

واتە: دڵ بە جۆرێك نەشئە گرتوویە، دۆخی مەستیی چاوەکەت دیاری ناکرێ و لەئەندازەبەدەرە. لێوت وەك خوێدان خوێ بە کەبابی جەرگی لەسەر ئاگری مندا دەکا!

نەشئەی (عا): نەشەی. حاڵی (نم): عەکسی. (دڵ) لە (عا)دا کەوتووە.

(٦) بێپیر: بێدین، یا مەبەستی ئەوەیە کە بەدکارەکەی پیر و شێخی نییە و لە خودا ناترسێ!

واتە: ئەی یاری ستەمکار! هەزار جار دەستم بە دامێنت، گوێ بۆ قسەی بەدکار مەگرە. ئەو ڕەقیبە لەخودانەترسە بێدینە و پیر و ڕابەری نییە، ئیشی بەدکاریە و کاری شەیتانی دەکا.

سا (عا): بێ. بەدکار (نم): ناکەس. هەرچی دەربارەم بڵێ بێپیرە (نم): هەرکەسێ باسم بکا بێشوبهە.

(٧) ئەم بەیتە هەر لە (عا)دا هەیە.

نگین: ئەو بەردە بەنرخانەن کە دەکرێنە نقێمی ئەنگوستیلە و یاقووت یەکێکە لەوانە. خاتەم: ئەنگوستیلە، مۆر. نادرظوهوور: بە دەگمەن دەرکەوتوو، دەرکەوتنی نایابە و دەست هەموو کەس ناکەوێ. ئاصەف: ئاصەفی کوڕی بەرخیای یەکێ لە زانایانی بەنیئیسرائیل و

**کەس نییە ئەو شۆخە حاڵی کا لە سۆزی ئاتەشم**
**پێی بڵێ: "سالم" لە عیشقت وا غەزەلخوانی دەکا (٨)**

وەزیری ئەفسانەیی سولەیمان پێغەمبەر، کە لەتەك سولەیمان سواری قالیچە بووە و تەختی بەلقیسی بە چرکەیەك کەمتر لە شاری سەبەئەوە هێناوەتە بەر دەرگای سولەیمان.

واتە: لێوی یاقووتیت نقێمی ئەو ئەنگوستیلەیەیە کە دەست هەموو کەس ناکەوێ، مۆرێکە لە پەنجەی ئاصەفی کوڕی بەرخیای وەزیری سولەیمان پێغەمبەردا کە وەك ئەو فەرمانی دەدا.

(نگینە)، ئەگەرچی شێوەنووسی (مان)ە، وا دەزانین (نگینی)یە و وایش مانای بەیتەکە لێدراوەتەوە.

(٨) ئاتەش: ئاگر. غەزەلخوانی: شیعروتن.

واتە: کەس نییە ئەو یارە نازدارە تێبگەیێنێ کە سۆزی ئاگری عیشقم چەند بەتینە، پێی بڵێ: سالم بە شەوقی عیشقی تۆوە خەریکی شیعر و غەزەل وتنە!

لە (نم)دا، لە باتی "سالم"، "بیمار" دانراوە و شیعرەکە بە هیی ئەو لەقەڵەم دراوە. بەڵام "سالم"یش لە سەرەتاوە ناسناوی شیعریی "بیمار"ی بووە. کەواتە ئەم پارچەشیعرە دەبێ هیی ئەو سەردەمەی بێ.

پێی بڵێ: "سالم" (نم): پێی بڵێن: "بیمار".

## -٣٣- (*)

چاوەکەت، وەختێ بە ئیما مەیلی جامی مەی دەکا،
هەرچی مەی دەیکا لەگەڵ تۆ، ئەو لەگەڵ ئێمەی دەکا! (١)
نەی، لە ناڵینا، چ گوستاخانە بۆ ئەربابی سەمع
بەحثی ئەییامی گوزەشتەی "کەیقوباد" و "کەی" دەکا (٢)
تا سوپاهی خوسرەوی عیشقت ئیحاطەی جانی دا
بۆ شەڕوشۆڕی موصیبەت، دڵ لە موڵکی (ڕەی) دەکا (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، ف، غ، ق، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) ئیما: ئاماژە بە چاو، لەباتیی زمان مەبەست بە چاو بگەیێنرێ.

واتە: چاوت کە بە ئیشارەت داوای جامی شەراب دەکا و دەیخۆیتەوە، شەرابەکە چیت بەسەردا دێنێ و چۆن سەرخۆشت دەکا، چاوەکەی تۆیش هەمان شت بە ئێمە دەکا.

تۆ (کم، گم): ئەو.

(٢) ئەم بەیتە لە (مان، ق)دا نییە.

گوستاخانە: بە ڕووقایمی، ئازایانە. ئەربابی سەمع: ئەوانەی حەز دەکەن گوێ لە گۆرانی و ئاواز بگرن. گوزەشتە: ڕابوردوو. کەیقوباد: یەکەمین پادشای کیانی. کەی: کەیخوسرەو یا کەیکاووس کە دوو پادشای ئێران بوون، مانای پادشای پادشایانیشی هەیە.

واتە: ئای لە شمشاڵ چۆن لە کاتی ناڵیندا بە ڕووقایمی باسی ڕۆژانی ڕابوردووی سەروەریی کەیقوباد و کەی بۆ گوێگران دەکا و دەریدەخا کۆڕی بەزم و ڕەزمیان چۆن بووە.

سەمع (غ): سیماع. بەحثی ئەییامی (کم): باسی ئەییامی.

(٣) ئەم بەیتە لە (مان)دا نییە.

خوسرەو: پادشا. ئیحاطە: چواردەورگرتن. جان: گیان. ڕەی: شارێکی کۆنی خوارووی ڕۆژهەڵاتی (تاران)ە.

واتە: دڵم وەك مەملەکەتی (ڕەی) بووەتە شوێنی ئاژاوە و شەڕوشۆڕ، چونکە سوپای پادشای عیشقت گەمارۆی گیانمی داوە.

جانی بۆ شەڕوشۆڕی موصیبەت (عا): بۆ شەڕ و موسیبەت. لەنگە. (ڕ): بۆ شەڕوشۆڕی موسیبەت.

**کارْوان ئەر سسترەو بێ، تا دەگاتە کۆیی لەیل**
**شەوقی بێپایانی دڵ ئوشتر بە مەجنوون پەی دەکا (٤)**
**حاڵی عیشق و تابشی هیجرت نیشانی دا بە من:**
**ئاگری سۆزەندە هەر کارێ بە بێشەی نەی دەکا (٥)**
**تا بەسەر باغی دڵا بێ، بای خەزانی فیرقەتت**
**عاریضم بۆ سێوی ڕوخسارت لە ڕەنگی بەی دەکا (٦)**
**جورعەنۆشی بۆ بکەم، ئیتر لە بەزمی مەیکەدە**
**چاوی مەخموورت بە عاشق کاری بادەی جەی دەکا (٧)**

(٤) ئەم بەیتە لە (ق)دا نییە.

سسترەو: خاو و هێواش ڕۆیشتوو. کۆ: مەنزڵ، دەوروبەری مەنزڵ. پەیکردن، دەست و قاچ بڕینەوەی حەیوانی بەرزە بە زیندوێتی، کینایەیە لە ماندووکردن و لەپێخستن.

واتە: ئەو کاروانەی کە مەجنوونی تێدایە و بەرەو ماڵی لەیل کەوتووەتە ڕێ، ئەگەر سست و خاو بێ، بە پەرۆشی و ئارەزووی لەڕادەبەدەری دڵی مەجنوون، ئەوەندە بە پەلە لێ دەخوڕێ، وشترەکەی کۆڵەوار دەکا تا دەیگاتێ، یا هەر بە ڕاستی وشترەکەی پەی دەکا و جێی دێڵێ و خۆی سەڵتەزەلام ملی بیابان دەگرێتە بەر!

سسترەو (گم): سسترۆ.

(٥) تابش: تین و تاو، گڕ، ڕووناکیی خۆر. سۆزەندە: مایەی سووتاندن. بێشەی نەی: نەیچەلان، قامیشەلان.

واتە: ئاگری تیژ و گڕدار کە بەربێتە نەیچەلان چی لێ دەکا، عیشقی تۆ و تین و تاوی دووریی تۆ ئەو کارەیان بە جەستەی خەستەی من کرد.

عیشق و (ق): عیشقت. تابشی هیجرت (ف): ئاتەشی هیجرت. بە من (ق): بە دڵ. ئاگری (ف): ئاتەشی.

(٦) عاریض: ڕوومەت.

واتە: تا بای خەزانی دووری و جیاییت بەسەر باخی دڵمدا بێت، ڕەنگی ڕوومەتم لە خەفەتی دەستنەکەوتنی سێوەسوورەی کوڵمت، لە زەردیی بەهێ دەچێ.

بەسەر (ف): لەسەر. فیرقەتت (عا): فیرقەنت. هەڵەی نووسینە. عاریضم (پ): ڕوومەتم.

(٧) جورعەنۆشی: قومقوم مەیخواردنەوە، پێکهەڵدان. مەیکەدە: مەیخانە. مەخموور: مەست. بادە: شەراب، خواردنەوەی شەراب. جەی: گەڕەکێکی شاری ئەسفەهان بووە، شەرابی نایابی لێ دروست کراوە.

**وەختی بەخشش گەر بنووسم داسْتانی هیممەتت،**
**مەردی دانا وەصفی جوودی حاتەمی طەی، کەی دەکا؟ (٨)**
**ئابْلّەی دەردا کەفی پێی طاقەتی، هەنگامی جوهد**
**"سالم"ی سەرگەشتە ئەزبەس ڕێی موصیبەت طەی دەکا (٩)**

واتە: من بۆچی بچمە مەیخانە و مەی بخۆمەوە بۆئەوەی مەست ببم؟ چاوی مەستت ئەو کارەم پێ دەکا کە شەرابی نایابی گەرەکی جەبی ئەسفەهان بە مەیخۆرەوەی دەکا.

بۆ (گم): تۆ. بکەم (ق): دەکەم. بادەی جەی (ف، ق): بادە و مەی. (گم): بادەی مەی.

(٨) داستان: حیکایەتی درێژی ئەفسانەیی. جوود: بەدەهەندەیی. مەرد: پیاو. دانا: ژیر.

واتە: ئەگەر لە کاتی بەخششی تۆدا بمەوێ حیکایەتی هیممەت و دەهەندەییت بگێڕمەوە، ناتوانم، پیاوی ژیر چۆن دەچێتە ژێر ئەو بارە گرانە کە وەسفی بەخشندەیی حاتەمی تەی بکا؟!

بەخشش (ڕ): هیممەت. گەر (کم): بۆ. کەی دەکا (ف): طەی دەکا.

(٩) ئابلّە: ئاوڵە. کەف: بەری پێ، بەری دەست. تاقەت: توانایی. هەنگام: کات. جوهد: ماندوویێتی، کۆشش. سەرگەشتە: سەرلێشێواو. ئەزبەس: ئەوەندە زۆر.

واتە: بەری پێی توانایی سالمی سەرلێشێواو لە کاتی کۆشش و ماندووبووندا ئەوەندە زۆر ڕێی بەلاّ و نەگبەتیی کوتا، هەمووی بوو بە بلۆق و ئاوڵەی دەردا!

لە (مان)دا دوو نوختەی پیتی (ی)ی (پێی) کەوتووە لەبیرچووە. ئەوەی نووسراوەتەوە هی (کم، گم)ە و تەواوە. پێی تاقەتی (ف): پای تاقەتی. (غ): بێتاقەتم. ئەزبەس (کم، گم): ئەر بەس، بە هەڵەی چاپ دەزانرێ. موصیبەت (عا): موسیبەت. (جوهد) لە (ڕ)دا کەوتووە.

-٣٤- (*)

**دیده بێ دیداری دڵبەر تارە، مەستووری نەکا**
**خۆیشی نەزدیکە لە نەزدیکم، بڵا دووری نەکا** (١)
**دەهری دوون ناپایەدار و نازەنینان بێخەبەر**
**بەم قەرارە، حەیفە، با مەعشووقە مەغرووری نەکا** (٢)
**عاشقی میسکین قوبووڵی طەبعی دڵبەر کەی دەبێ،**
**تا قوبووڵی غوربەت و ئەندووە و ڕەنجووری نەکا؟!** (٣)
**داخڵی بەزمی حەقیقەت کەی دەبێ، پیری سولووك**
**تا بە خوێنی دوختەری ڕەز خەرقەئەنگووری نەکا؟!** (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، عا)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) تار: تاریك. مەستوور: داپۆشراو. بڵا: با.

واتە: چاو کە چاوی بە یار دەکەوێ، هێشتا تاریکە و هیچ نابینێ، ئیتر پێویست بە خۆداپۆشین ناکا. یار لە منەوە نزیکە، ئیتر بۆچی خۆی بە دوور دەگرێ.

(٢) دەهر: چەرخی گەردوون، دنیا. دوون: نزم، بەدخوو. ناپایەدار: ناسەقامگیر، تاسەرنەبوو.

واتە: دنیای بەدکردار و بێوەفا بەردەوام و پایەدار نییە، تاسەر بۆ کەس نابێ. جوانان بە جوانی و شۆخیی خۆیان دەنازن، ئاگایان لەم ڕاستییە نییە. ئەمە ستەمە لە عاشقان دەکرێ. با یار بیرێك بکاتەوە و بەم سەرکەشییە نەمێنێتەوە.

(٣) ئەم بەیتە لە (عا)دا چوارەمە.

ئەندووە: خەم و خەفەت. ڕەنجووری: دەرد و نەخۆشی، دڵتەنگی.

واتە: دڵداری هەژار بە ئارەزووی دڵی دڵبەر نابێ و ناچێتە دڵیەوە تا ناخۆشی نامۆیی و خەفەت و دڵتەنگی قوبووڵ نەکا.

(٤) پیری سولووك: شێخی تەریقەت. دوختەر: کچ. ڕەز: دارمێو. دوختەری ڕەز: شەراب. خەرقە: عابا. ئەنگووری: ڕەنگ وەك ئاوی ترێ، ڕەنگی شەرابی.

واتە: شێخی تەریقەت، تا عاباکەی بە ڕەنگی شەراب ئالوودە نەکا و بەدمەست نەبێ، شایانی ئەوە نابێ بچێتە کۆڕ و بەزمی ڕاستییەوە! تا مەست نەبێ تێناگا!

**سیپڕی مەستانی عەیان کرد، مەه لە پەردەی تیرەشەو**
**چاوەکەت توهمەت بە شوعلەی شەمعی کافووری نەکا (٥)**
**ئاسمان، "سالم!" لەگەڵ یەك خەندە، صەد شیوەن دەدا**
**دڵ نەصیحەت کە: بلا قەد مەیلی مەغرووری نەکا (٦)**

لە خوێنی (عا): بە خوێنی.

(٥) ئەم بەیتە لە (عا)دا سێیەمە.

مەه: مانگ. تیرەشەو: تاریکەشەو. مەبەستی لە مەه ڕوومەتی یار و لە تیرەشەو ئەگریجەیەتی.

شەمعی کافووری: لە مۆمی سپی دروست دەکرێ، ئەڵبەت ڕووناکییەکەی زیاترە.

واتە: مانگی ڕوومەتت لە پەنای شەوی ڕەشی ئەگریجەتدا نهێنیی مەستانی ئاشکرا کرد، کە چاوەکانتە، کەچی تۆ شەمعی کافووری تاوانبار دەکەی! گوایە ئەو دەری‌خستووە!

تیرەشەو (عا): تیرەتەو. هەڵەیە.

(٦) بلا: با، واز بێنێ، یانی دڵ واز بێنێ، ئاگادار بێ.

سالم هێندە دەستەپاچە نەبووە لەو حەوت دێڕە شیعرەدا دووجار (مەغرووری) بێنێتەوە. ئەگەرچی ئەوە نەنگییەکی سەروایە و قابیلی ڕوودانە. لەوانەیە ئەوە کەمتر (مەغدووری) بێ، چونکە ئەگەر هەستکردن بە مەغدووری بووایە، نەك مەیلی مەغدووری، ڕێی تێدەچوو.

واتە: سالم! چەرخی گەردوون تا پێکەنینێك دەدا، سەد جار مرۆڤ دەگریێنێ، کەواتە ئامۆژگاریی دڵت بکە با بە کەمێك خۆشی بایی نەبێ!

دوور نیە (بلا) لە بنەڕەتدا (بلێ) بووبێ.

## (*) -٣٥-

سونبولی طورڕە کە پەرژینە بە پەهلوویی گوڵ
موو بە موو هەریەکە داوێکە لە ڕێی مورغی دڵ (١)
ڕۆشنیی داوە بە دڵ، ڕەوزەنی سینەم لە خەدەنگ
دەك ئیلاهی! نەڕزێ دەستی کەمانت لە گڵ (٢)
سپڕی نوکتەی دەهەنت، چاکە، نەزانن قەنناد
نەمەك ئالوودە نەکەن، با لە خەمیری نوقوڵ (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لـە (مان، حا، هـ، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) واتە: سونبولی ئەگریجەت، کە وەك پەرژینە لـە پاڵ یا بە دەوری گوڵی ڕوومەتـدا، مـوو بـە موو داوێکە بۆ گرتنی دڵ کە هەمیشە لەو نزیکەدایە.

هەریەکە (گم): هەرێکە.

(٢) ڕەوزەن: سووککراوەی ڕەوزەنەیە، ڕۆژنە، کون و کەلـەبەری پچووك لـە دیـوار یـا میـچی خانوودا ڕووناکیی لێوە بێتە ناوەوە. خەدەنگ: داری ڕاست و بەرز، تیر.

واتە: ئەو کونانەی کە تیری ڕاست و بەرزی نیگات کردوونیەتە سـنگم، ڕووناکییـان بـە دڵـم بەخشیوە، ئەوانە نەبوونایە هەر لـە تاریکیدا دەمایەوە! دەك خودایە هەرگیز دەستی کـەوانگرت لــە خاکدا نەڕزێ و هەر بەردەوام بێ.

(دەستی) ئەگەرچی بـە پێـی شێوەنووسـی (مـان)ـــە، لـە کوردەواریـدا بـەم شـێوەیەیش دەوتـرێ: دەستوخەنجەرت، دەستوتفەنگت، دەستومەقامت .. تاد، یانێ بە واوی پێوەندی، نەك یێی ئیزافە.

(٣) قەنناد: قەند سازکەر، شـیرینی دروسـتکەر، حەڵواچـی. دەهـەن: دەم. نەمـەك: خـوێ. خەمیر: هەویر.

واتە: وا چاکە شیرینی دروستکەران (حەڵواچییان) بە نهێنیی نوکتەی دەمت نەزانن، کـە چـەند سوێر و بەتامە، ئەگینا هەویری شیرینییەکانیان تێکەڵ بەو سوێرییە دەبێ کە ئەوان پێیان زانیوە! یا تـا لە چێژ و لـەزەتی ئەو سوێرییەوە خوێ نەکەنە شیرینییەکانیان؛ یا تا ئەو نهێنییە لـەگەڵ هەویرەکـەدا تێکەڵ نەبێ و سوێری نەکا. بە هەر حاڵ، تا نوقوڵەکە سوێر دەرنەچێ.

نوکتەی (گم): نیکتەی. نەزانن (گم): نەزانێ. قەنناد (مان): قەننات. (حا): قەنناط. هەڵەن.

**گەر لە ڕووی گوڵ، دڵی من، شادە بەبێ خەندەیی تۆ**
**با بدا دەستی قەضا، مەردومی دیدەم بە چلا (٤)**
**یار گلەی بوو لە دڵم، چونکە نەسووتا لە فیراق**
**لە قصەی بەرحەقی ئەو، "سالم"ی میسکین خەجلا (٥)**

لە خەمیری نوقولا (ق): بە خەمیری نوقەلا، نوقەلا (نقلاء) بە مانای کەسانی قسەهێن و قسەبەر.

(٤) واتە: ئەگەر دڵ بەبێ پێکەنینی تۆ لە ڕووی گوڵدا شاد بێ، خودایە دەستی قەزا گلێنەی چاوم بە چڵدا بدا و کوێر ببم.

بە چلا (ق): وە چلا.

(٥) قسەی بەرحەق: قسەی ڕەوا و ڕاست. خەجلا: شەرم گرتی یا داما، یا خەجاڵەت بوو.

واتە: یار گلەیی لە دڵم کرد کە بۆچی بە ئاگری جیایی نەسووتا؟ سالم، لەم قسە ڕەوایە خەجاڵەت گرتی!

لە فیراق (ق): بە فیراق. بەرحەقی (کم، گم): ناحەقی.

(*) -٣٦-

دەستی من تەعویذە بۆ ڕەددی بەلا،
با حەمایەڵ بێ لە ملتا، بێڵە سا (١)
نیسبەتی ڕووم دا بە گوڵ، گێسوو بە موشك
سەهوە حەرفی ئەووەڵم، ثانی خەطا (٢)
دڵ بە نادیدەت لە جێی دڵ چی بەرێ؟
کەهـ نەکێشێ، چی بکێشێ کەهرڕوبا؟ (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشیی مەحزووف.

(١) تەعویذ: نوشتە، چاوەزار. حەمایەڵ: ئەوی ڕاست و چەپ لە مل کرابێ، وەك فیشەکلغ و شمشێر و شتی وا، یا دوعای لەکیفگیراو. بێڵە: بهێڵە، لێ گەڕێ.

واتە: دەستی من گەر چەپ و ڕاست لە گەردنتدا بێ، وەك نوشتە و چاوەزاری لەملکراوە، لە بەلا و چاوی پیس دەتپارێزێ. دەسا لێم گەڕێ، با هەمیشە دەستم وەك حەمایەڵ لە ملتدا بێ!

تەعویذ (عا): تەعویز.

(٢) موشك: میسك. ثانی: دووەم. خەطا: هەڵە.

واتە: من لای خۆم ویستم وەسفت بکەم، وتم: ڕوخسارت گوڵە و ئەگریجەت میسکە! قسەی یەکەمم سەهوە و لەبیرچوون، قسەی دووەمیش هەڵە یا (خەتا)ی مەڵبەندی میسکی بۆنخۆشە. ئەمەی دوایی بەکارهێنانی بێژەی هاوبەشە بە هەردوو ماناکەیەوە.

ڕووم دا بە گوڵ، گێسوو بە (کم): ڕوومە لەگەڵ گیسووی. ثانی (ق): ئاخر.

(٣) ئەم بەیتە لە (ق)دا نیە.

نادیدە: نەبینراو، لە بەرچاو دانەنراو. کەهـ: سووککراوەی (کاه)ە، کا. کەهرڕوبا: کارەبا، جۆرە بەردێکی بەنرخە، کا بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ و پێیەوە دەنووسێ.

واتە: کە تۆ دەبینم، لەوە زیاتر کە دڵت بۆ خۆم بەرم، چیم پێ دەکرێ. کەهرڕوبا کە کا ڕانەکێشێ، چی ڕابکێشێ!

کەهـ (کم، ): کا. بکێشێ (مان): نەکیشی، هەڵەیە. کەهرڕوبا (کم، گم): کارەبا.

**گەر بزانی چۆنە حاڵی ئیحتیاج**
**دەستی ڕەد نانێیە بەر سینەی گەدا (٤)**
**سەربەسەر پێچیدە بوو، تۆماری عومر**
**شەرحی تۆ بوو، ئیبتیدا تا ئینتیها!! (٥)**
**کاشیفی ئەسرارە بولبول، حەقیەتی**
**وا، لە جەوری گوڵ، لە دڵیا خارەها (٦)**
**دەوڵەتی دونیا لەدەست نامەرد و دوون**
**طوولی نابێ قەد بەقەد ڕەنگی حەنا (٧)**

(٤) واتە: ئەگەر بزانی ئیحتیاجی چەند تاڵە، هەرگیز دەست نانێی بە ڕووی گەدایەکی وەك منەوە و بە نائومێدی نامگێڕیتەوە.

چۆنە (کم، گم): جەوری، یانێ ستەمی. ڕەد نانێیە (کم، گم): ڕوو نانێتە!

(٥) پێچیدە: پێچراوە وەك قەباڵەی جاران. تۆمار: کۆمەڵە نامەیەك یا هەر کۆمەڵە نووسراوێکی‌تر کە بدرێنە دەم یەك و وەك قەباڵە لوول بکرێن.

واتە: تۆماری تەمەنم هەمووی پێچرایەوە، ئەووەڵ و ئاخری باس‌وخواسی دووریی تۆ و ستەمی تۆ و جوانیی تۆ بوو!

تۆ بوو (کم، گم): عیشقە.

(٦) ئەم بەیتە و سێ بەیتی پاشەوەی لە (کم، گم)دا نین.

خارەها: کۆی خارە، واتە دڕك.

واتە: گلەیی لە بولبول مەکەن کە دەچریکێنێ و نهێنییەکانی عیشق ئاشکرا دەکا، چونکە دڵی پڕە لە دڕکی گوڵ و بریندارە!

بولبول کینایەیە لە شاعیر خۆی، گوڵیش کینایەیە لە یار.

(٧) ئەم بەیتە لە (مان)دا نییە.

(قەد)ی یەکەم= قەت: هەرگیز. (قەد)ی دووەم: ئەوەندە، ئەندازە.

واتە: سامانی دونیا لای نامەردی ناپیاو هەرگیز بەقەدەر ڕەنگی خەنە نامێنێتەوە. یا مەبەستی ئەوەیە: خەفەت مەخۆ کە دەوڵەت و سامان لای دوژمنی هیچ‌وپووچە، چونکە سامانی دنیا تاسەر نامێنێتەوە.

بۆ ((صباح الخیر))ی دڵ، غەم هاتەوە!
مەرحەبا بێ، مەرحەبا بێ، مەرحەبا! (٨)
سیحری فیکری من قەڵەم دێنێتە چەرخ
موعجیزەی عیسا بوو، چالاکیی عەسا (٩)
زەڕڕەسان ئەعضایی "سالم" دێتە ڕەقص
هەر سەحەر میهری ڕوخت پەرتەو دەخا (١٠)

(٨) واتە: خەم جارێکیتر تەشریفی هێنا بۆ مەرحەبایی‌لێکردنم. وەرە، سێ جار مەرحەبا! زیادەڕۆیی (إطناب) لێرەدا بۆ بایەخ‌پێدان و دووپات‌کردنەوەی دەردەدڵە.

(٩) چەرخ: سووڕانەوە.

واتە: بیری من هێز و توانێکی تێدایە، وەك چۆن عیسا بە موعجیزە مردووی بە فوو زیندوو دەکردەوە، ئاوا بە دەم قەڵەم هەڵدەسووڕێنێ و شیعری پێ دەنووسێ. موعجیزەی مووسایش کە عاساکەی بوو، لە قەڵەمەکەمدا هەیە. سیحری حەڵاڵی قەڵەمی من وەك ئەو عاسایە سیحری حەرامی جادووگەران بەتاڵ دەکاتەوە. هونەری چنین (إحتباك) لێرەدا هەیە، کە ئەوەیە وشەیەك بە قەرینەی باس‌کردنی لە جێیەکیتردا، لە جێیەك لابراوە. کەواتە مووسا بە قەرینەی ((سیحری فیکری من...)) لابراوە. (زیندووکردنەوە)یش بە قەرینەی عیسا لابراوە.

واتە: جادووی بیری منە کە قەڵەم دێنێتە سووڕ و ئەم هەموو شتە ورد و جوانانە دەنووسێ. بەڵێ، عاساکەی دەستی حەزرەتی مووسا دارێکی ڕەق‌وتەق بوو، موعجیزەی مووسا بوو کردی بە ئەژدیها و جادووی سیحربازەکانی پێ بەتاڵ کردەوە. ئاشکرایە "مووسا" لەگەڵ عاسا دەگونجێ، نەك عیسا، کەواتە عیسا هەڵەیە. زیاتر لەوانەیە هەڵەی ڕوونووسکەرەوە بێ.

(عاسا) لە (مان، عا)دا بە (عاصا) نووسراوە.

(١٠) زەڕڕەسان: وەك گەرد و تۆز. میهر: خۆر.

واتە: هەر بەیانییەك کە خۆری ڕوخسارت هەڵدێت و تیشك پەخش دەکاتەوە، هەموو ئەندامی جەستەی سالم وەك گەردی بەر هەتاو دێنە سەما. زۆر جوانە.

زەڕڕەسان (کم، گم): زەڕڕەئاسا.

## -٣٧- (*)

### (در وصف استاد اسماعیل سنندجی خیّاط)

**بە هەیوولا شوتوری نەوتە، مەلا**
**لەقلەقئاسا لەق و بەدڕەوتە، مەلا (١)**
**دەیبەمە مەدرەسە تەنخواهی مەنار**
**قامەتی شاهیدی مزگەوتە، مەلا (٢)**
**پەیڕەویی سەبعەیی قوڕڕا نییە بۆی**
**بە نەوا خاریجی هەر حەوتە، مەلا (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ن، غ)دا هەیە. شیعرەکە داشۆرینبابەتە، سەرناوەکەی لە (مان، ن)دا (در وصف استاد اسماعیل سنندجی خیّاط)ە، یانێ لە وەسفی وەستا سمایلی سنەیی بەرگدروودا وتراوە. ڕەنگە ئەم وەستایە مەلایش بووبێ، بۆیە بە مەلا ناویی هێناوە. جگە لەوە، وەك ئەم جۆرە شیعرەی شاعیر، ناسناوی "سالم"ی تێدا نییە. هەموو (مەلا)کان لە (غ)دا کراون بە (فلان).

کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (غ)دا پاش و پێشن.

هەیوولا: پەیکەر، خود (ذات). شوتوری نەوت: وشتری گەڕ کە نەوت و زفتی لێ درابێ، لە عەرەبیدا دەڵێن: کالبعیر الأجرب، أي المقیّر. بەدڕەوت: بەخراپی ڕۆیشتوو. لەقلەقئاسا: وەك لەقلەق. مەلا خۆبەخۆ وەك (خود- ذات) و وەك وێنە (صورة- عرض) ناتەواوە.

واتە: مەلا بە پەیکەر لە حوشتری نەوتکێش دەچێ، وەك حاجی لەقلەق لەقەلەقیەتی و ڕەوتی خراپە.

(٢) مەنار: منارەی مزگەوت. تەنخواه: لەباتی. شاهید: نیشانە، بەڵگە.

واتە: لەباتیی منارە، دەیبەمە مەدرەسەی فەقێیان. باڵای بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو شوێنە مزگەوتە. بەو پێیە، دەبێتە نیشانە.

(٣) سەبعەیی قوڕڕا (القّراء السبعة): حەوت مامۆستاکەی قورئانخوێنیی سەرەتای ئیسلامەتی کە لە تەجوید و خوێندنەوەی قورئاندا ئاماژەیان پێدەدرێ. نەوا: ئاواز.

واتە: وەستا سمایل پێڕەویی هیچ کام لەو حەوت جۆرە قورئانخوێندنەوەیە ناکا. جۆری قورئانخوێندنەوەی ئەم لە جۆری قورئانخوێندنەوەی ئەو حەوتە بەدەرە!

**عیززەتی هەرچی ئوصووڵاتە نەما**
**بەسکی بەدلەهجەوو بەدصەوتە، مەلا (٤)**
**جامەدارانی حەمامن شاهید:**
**کونی پشتی وەکوو ئەشکەوتە، مەلا!! (٥)**
**یەك تەویلە کەر، ئەگەر هەمڕەهی بێ**
**هەمە جا قایم و بەرکەوتە، مەلا!! (٦)**
**وەك درەختی ڕەشەبا ڕیشەکەنیو،**
**هەر لە سەر تا بە قەدەم، چەوتە، مەلا (٧)**
**خایەیی گزگلییە و نەوسی بەڕوو**
**شکەمی کوندەیی پڕجەوتە، مەلا (٨)**

(٤) بەسکی: ئەوەندە زۆر.

واتە: ئەوەندە بەدزمان و دەنگناسازە، هەرچی شتی ئوسووڵی و ڕێکوپێکە تێکیداوە و نرخیی نەهێشتووە!

(٥) جامەداران: پەشتەماڵبەدەستان، ئەوانەی وا پارێزگاریی جلوبەرگی خەڵك لە حەمامدا دەکەن. شاهید: شایەت.

واتە: پەشتەماڵبەدەستانی حەمام شایەتن، کە کونی پاشەوەی ئەوەندە کاری تێدا کراوە وەك ئەشکەوت گەورە بووە.

(٦) تەویلە: ژوورێکی گەورە و درێژکارە وڵاخی بەرزە و گوێدرێژیشی تێدا دەبەستنەوە. یەك تەویلە: پڕی یەك تەویلە. هەمڕەه: هاوڕێ. هەمە جا: لە هەموو شوێنێك. قایم (قائیم): ڕاوەستاو. بەرکەوت: پێشکەوتوو، بەر هەموان کەوتوو.

واتە: ئەگەر ئەم هاوڕێی کەرگەلی ناو تەویلەیەك بێ، لە هەموو شوێنێك بۆیان دەوەستێ و بەر هەموویان دەکەوێ.

هەمڕەهی (غ): هەمڕاهی. تەویلە (غ): تەویلەی.

(٧) ڕەشەبا ڕیشەکەنیو: ئەو دارە کە ڕەشەبا لە ڕیشەوە لەقی کردبێ و هەڵیکەندبێ.

واتە: چۆن درەخت کە ڕەشەبا ڕیشەکێشی کردبێ، بەلادا هاتووە و لار بووەتەوە، ئەمیش لە سەریەوە تا پێی چەوت و خواروخێچە.

(٨) خایە: هێلکەگون! گزگل: بەرێکی سووك و ناوکلۆری دارمازووە. بەڕوو: بەری داربەڕوو.

نەوس: کینایەیە لـە دەعباکەی مەلا. شـــکەم: ورگ. کونـدە: کـــوندەی ئـاو. جـــەوت: کـلاَوی بەڕووە کە دەکوترێ و کوندەی ئاو و مەشکەی دۆی پێ خۆش دەکرێ.

واتە: هێلکەی گونی مەلا هێندەی گزگلێك و دەعباکەی بچووکە بە قەدەر بەڕوویـەك دەبـێ. ورگی وەك پێستەی کوندەی پڕ لـە جەوت کراوە کە هێشتا خۆشە نەبووبێ، بۆنیشی ناخۆشە.

-٣٨- (*)

**غولامی دیدەیی مەخمووری تۆیە، نێرگسی شەهلا**
**لە ئاب‌وتابی ڕووی تۆ داغْدارە، لالەیی حەمرا** (١)
**بەیاضی ناصییەی تۆ بوو، سفیدەی دا بە صوبحی عید**
**لە نوسخەی قیرگوونزوڵفت، سیاهیی برد شەوی یەلدا** (٢)
**عەقیم‌ئاسا لە زگ وەستایەوە، حەملی نەما ئیتر،**
**لەپاش تۆ دایەیی دونیا بە میثلی مادەری "عیسا"** (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، ف، غ، ج، ق، کم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) غولام: نۆکەر و خزمەتکار. مەخموور: مەست. ئاب‌وتاب: ئاووتاو، جوانی و ئارایش. لالە: گوڵەمێلاقە، شقائق النعمان، گیایەکی بچووکە لە جێی شێداردا دەڕوێ و لە بەهاردا پێ‌دەگا، کێوی و ماڵی و سێپەڕەیی و پێنج‌پەڕەیی هەن، جۆرە کێوییەکەی گوڵی سووری هەیە. شەهلا: چاوێ ڕەشییەکەی مەیلەوشین بێ. حەمرا (حەمراء): ئاڵ، سوور.

واتە: نێرگزی چاوجوانی بۆنخۆش خزمەتکاری چاوی مەستی تۆیە. گوڵی ئاڵی گوڵزاریش داخ‌لەدڵی شۆخیی ڕوخسارتە.

ئاب‌وتابی (غ): ئاب‌وتاب و.

(٢) بەیاض: سپێتی، دەفتەری سپی یا دەفتەری درێژکۆڵەی باخەڵ. ناصیە: تەوێڵ، ناوچاوان. سفیدە: ڕووناکیی بەرەبەیان. قیرگوون: قیرڕەنگ، ڕەشی قەترانی. سیاهی: ڕەشی. یەلدا: شەوەزەنگ. وشەیەکی سریانییە بە مانای لەدایک‌بوون، درێژترین شەوی ساڵە کە دوا شەوی دوا مانگی پایزە، حەزرەتی عیسا لەو شەوەدا لەدایک‌بووە.

واتە: ڕووناکیی بەرەبەیانی ڕۆژی جەژن تیشکی ناوچاوانی تۆ بوو. شەوەزەنگیش ڕەشیی لە ڕەشیی ئەگریجەی ڕەشی قەترانیت وەرگرتووە.

سفیدەی دا (ف): سفیدی دا. (بە)ی شێوەنووسی (مان) (لە)یش هەڵدەگرێ. برد (کم): بردی. هەڵەیە.

(٣) عەقیم: نەزۆک. ئاسا: وەك. عەقیم‌ئاسا: وەك ئافرەتی نەزۆك. زگ: سك‌وزا، سکپڕی. دایە: دایەن. مادەر: دایك.

**لە قوببەی نووری پوستانت، یەدی بەیضا نموودارە**
**ئەبەد ناگاتە دوگمەی جێبی جامەی تۆ، کەفی "مووسا" (٤)**
**خەزانی ڕەنگی زەردم باعیثی نەشئوونومای تۆیە**
**سیاهیی ڕۆزی "مەجنوون" سورمەیە بۆ دیدەیی "لەیلا" (٥)**
**لە صەیحەم هاتە لەرزش قەلبی گاوی ژێرزەمین ئەمشەو**
**دڵی کەیوان، لە ئاهی من، لە هەفتەم ئاسمان سووتا (٦)**

واتە: پاش لەدایكبوونی تۆ، ئیتر دنیا سكوزای نەكرد و جوانێكیتری نەبوو، هەروەك حەزرەتی مریەمی داوێنپاك كە پاش عیسا (د.خ) منداڵیتری نەبوو. جوانە!

(ئەستایەوە) لە (مان)دا هەڵەیە و (وەستایەوە)یە. هەڵەیە. (غ): وەستا و.

(٤) قوببە: گۆ. گۆیكە. پوستان: مەمك. یەدی بەیضا: دەستی سپی، ئەو دەستەی مووسا كە لە بەردەمی "فیرعەون"دا كردی بە باخەڵیدا و دەریهێنا، بوو بە ڕووناكی و بەرەو ئاسمان بەرز بووەوە. نموودار: دەركەوتوو. جێب: گیرفان، ژێرسوخمەی سەر سنگ. جامە: كراس.

سالم گۆی مەمكی تیشكداری یاری بە گۆیەكی ورشەدار شوبهاندووە. دیارە گۆ وەك قوببە خڕە، بەڵام سەر بچووك. وتوویە: یەدی بەیزا لە گۆیكەی لە ڕووناكی دروستكراوی مەمكەوە، كە لەژێر سوخمەدایە، دەردەكەوێ، بەڵام نەك یەدە بەیزاكەی حەزرەتی مووسا (د.خ)، چونكە دەستی ئەو هەرگیز ناگاتە دوگمەی یەخەی كراسی تۆ، تا بیكاتەوە و دەست بە باخەڵتدا بكا و ببێتە ڕووناكی!

(٥) ڕۆز: ڕۆژ. سورمە: كلی چاوڕشتن.

واتە: ڕەنگی زەردی وەرزی خەزانم هۆی گەشەكردن و نەشونمای تۆیە، ئەڵبەت نەونەمامی باڵای یار لە پایزدا پێدەگا. ئەمەیش شتێكی سەیر نییە، چونكە ڕۆژی ڕەشی مەجنوون و بەختی ڕەش و قیر شێوەی دەبێتە كلی چاوی لەیلا و پێی جوان دەبێ.

سیاهیی (ف): سیەه. ڕۆزی (عا، ج، ق، كم، گم): ڕۆژی. (ف): ڕۆژیی.

(٦) ئەم بەیتە لە (مان، ق)دا نییە.

صەیحە: هاوار. لەرزش: لەرزە. گاو: گا. كەیوان: ئەستێرەی زوحەل. هەفتەم: حەوتەم.

واتە: دڵی ئەو گایەی -كە دەڵێن- گۆی زەوی لەسەر شاخەكانی ڕاگیر بووە، لە بەرزیی ناڵەم هاتە لەرزین. دڵی ئەستێرەی زوحەلیش كە دەڵێن لە حەوتەم ئاسماندایە، بە گەرمیی ئاهم سووتا.

صەیحەم (گم): صەیحەی. لەرزش (عا): لەغزش، ئەمیش هەر واتای لەرزە دەگەیێنێ. لە ئاهی (عا، ف): بە ئاهی.

**دوصەد جار وەضعی چەرخی ئاسمان گۆڕا بە سەعد و شووم**
**ستارەی نەحسی من "سالم"! لە قەرنێکا نەبوو ئاوا (٧)**

(٧) سەعد: بەختیاری. شووم: نەگبەتی. ستارە: ئەستێرە. قەرن: سەد ساڵ، چەرخ.
واتە: ئای دووسەد جار باری ئاسمان و وەزعی دنیا بە چاکی و بە خراپی گـۆڕا، تـەنیا ئەسـتێرەی نەگبەتیی سالم جارێك ئاوا نەبوو!
نەحسـی (عا): بەختی. من سالم (ج): سالم بۆ. (كم، گم): سالم بوو.

## -٣٩- (*)

شەطی ئەشکم، دەبێ هەر بێ بە ڕووما
هەتا بێ بەحری (ئاغ دەنکن بە (ڕووم)ا (١)
دەزانی چۆنە ئەحواڵم لە هیجرت؟
وەکوو تیشنەم لەناو بەحری زەقووما (٢)
لە پیریشا عەرووسی یادی وەصڵت
بیروون نایێ لە خانەی ئارەزووما! (٣)
دەمی وەصفی دەمی تیغت دەلەرزێ
ڕەگی گەردن بەسەر تەختەی گەلووما (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، ق، کم، گم)دا هەیە، لە (حا، کم، گم)دا شەش بەیتە. کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) شەط: زێ و چەمی گەورە. بەحر: دەریا. ئاق دەنکز: وشەیەکی تورکییە بە شێوەنووسینی عوسمانی بە (آق دکز) نووسراوە و بە (ئاق دەنیز) خوێنراوەتەوە. ئاق: سپی. دەنیز: دەریا، دەریای سپی، ئەوەی کە ئەمڕۆ پێی دەوترێ دەریای سپی ناوەڕاست. ڕووم: وڵاتی ڕۆم (تورکیا).

واتە: تا دەریای سپی بە خاکی ڕۆمدا بێ، ڕووباری فرمێسکی منیش دەبێ بە ڕوومدا بێ. خۆ ئەو هەمیشەییە، کەواتە ڕووباری فرمێسکی منیش هەمیشەییە.

ئاق (مان، عا): ئاغ. دەنکز (کم، گم) دەنگز. بە ڕووما (عا): نە ڕووما. هەڵەیە.

(٢) تیشنە: تینوو. زەقووم: هەر خواردەمەنییەك مرۆڤ بکوژێ، ژەهری کوشندە.

واتە: حاڵی من، کە لە تۆ دوور بم، وەك ئەوەیە تینوو لەناو دەریای ژەهردا بێ، چی بکا تا تینوویتیی بشکێ؟ خۆ ناتوانێ لەو ژەهراوە بخواتەوە!

(٣) عەرووس: بووك. بیرون: دەر. بیرون نایێ: دەرناچێ.

واتە: بووکی یادی گەیشتن بە تۆ، تەنانەت لە تەمەنی پیریشدا لە یانەی ئارەزووم دەرناچێ. بە مانایەکیتر، تا دەمرم ئارەزوومە پێت بگەم!

لە پیریشا (کم، گم): لە بیریشدا. خانەی (کم، گم): پەردەی. زۆر جوانە، چونکە (پەردە) و (عەرووس) زۆر گونجاون. نایێ (گم): نایە.

(٤) "دەم"ی یەکەم: کات. گەلوو: گەروو، قورگ.

**به سیحری غەمزە مەغلووبم، ئەگەرچی**
**"ئەرەسطوو" بم لە ئیدراکی عولووما (٥)**
**لە کوورەی دڵ بیرون دێ، ئاهی سەردم**
**عەجەب یەخ بێ لەناو چاهی سەمووما! (٦)**
**تەجاوز کەی دەکا "سالم" لە ئەمرت؟**
**کەسێ نەیدیوە ڕووسەختی لە مووما (٧)**

واتە: کە وەسفی تیژیی دەمی تیغی بڕندەی برۆت دەکەم، لە ترساندا ڕەگی گەردنم لەسەر تەختەی قوڕگم دێتە لەرزین، دیارە قوڕگی بە تەختەی قەساب داناوە! دووریش نییە (تەخت) بووبێ، یانێ لەسەر تەخت و پانایی گەردنم.

دەمی وەصفی (ق): دەمی سەیفی. دەلەرزێ (کم): دەلەرزم.

(("ئەرەسطوو" بم لە ئیدراکی عولووما)) کە دووەم نیوەی بەیتی پێنجەمە، لە (حا، کم، گم)دا خراوەتە سەر یەکەم نیوەی ئەم بەیتە و دوو نیوەبەیتەکەی تریش کەوتووە. بەو پێیە شیعرەکە لەو نوسخانەدا شەش بەیتە، بەڵام لە (مان، عا)دا حەوتە.

(٥) واتە: ئەگەر بەقەدەر "ئەرەستوو" زیرەك و زانا و سەرامەد بم، بەرگەی غەمزەت ناگرم و جادووگەریی چاوت دەمبەزێنێ!

بە سیحری (ق): لە سیحری.

(٦) سەمووم: بای گڕەداری گەرم.

واتە: ئاهی ساردی سەهۆڵێن لە کوورەی دەروونی ئاگرینمەوە دەردەچێ! شتێکی زۆر سەیرە سەهۆڵ لەناو چاڵی سەموومدا هەبێ!

(٧) مووم: مۆم.

واتە: سالم چۆن لە فەرمانت دەردەچێ؟ کێ دیویە مۆم ئەوەندە سەرسەخت بێ کە داگیرسێنرێ، نەسووتێ و نەتوێتەوە؟! یا ڕەنگە مەبەستی ئەوە بێ کە سالم لە ئاستی یاردا مووی نەرم و ملکەچە.

-٤٠- (*)

**وەکوو فەووارە خوێن دەقوڵێ، دەمی ئاهم، لە حەلقووما**
**بە دڵ پەیوەستە تا سووراخی پەیکانت لە پەهلووما (١)**
**مەگەر وەختێ، لە سەیری خاڵی چیهرەت، دیدە فاریغ بێ**
**سیاهیی مەردومەك بتکێ، لەگەڵ ئەشکم، بەسەر ڕووما (٢)**
**لە هیجریشا موصیبەت نایێڵێ سەر هەڵبڕم یەك‌دەم**
**لە خوێنی ئەشکما چەسپاوە پێشانی بە زانووما (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) دەم: کات. حەلقووم: قوڕگ، گەروو. پەیوەستە: هەمیشە، بەردەوام، پێوە بەستراو و توندکراو. سووراخ: کون. پەهلوو: پاڵ، کەلەکە.

واتە: تا کونی پەیکانی نیگات هەمیشە لە کەلەکەمەوە لە دڵمدا بێ، یا تا کونی پەیکانت لە کەلەکەم بە دڵمەوە نووسابێ، خوێن لە کاتی هەناسەداگمدا وەك فوارە لە گەروومەوە هەڵدەقوڵێ؛ یان تا کونی پەیکانت لە کەلەکەمدا بە دڵ گیرابێ، دڵ کونەکەی گرتبێ و نەهێڵێ ئاسایی خوێنی لێ بڕوا، ئەو خوێنە لە گەروومەوە فوارە دەکا.

دەقوڵێ (کم، گم): دەکوڵێ. دەمی (عا): دەچی، هەڵەی نووسینە. ئاهم (کم): ئاهی! پەیوەستە تا (گم): پەیوەستەیە.

(٢) چیهرە: ڕوومەت. سیاهی: ڕەشی، ڕەشێنە.

واتە: وەختێك چاوم لە خاڵی ڕوومەتت خاڵی دەبێ، کە ڕەشینە و گلێنەی چاوم لەگەڵ فرمێسکمدا بەسەر ڕوومەتمدا بتکێن. بەوپێیە، تا هێزی بینین لە چاومدا بێ، خاڵی ڕوومەتی تۆی تێدا دەبێ! چەند جوانە: خاڵی ڕەشی ڕوخساری یار و ڕەشێنەی چاوی یەك‌خستوون، کە خاڵەکە نەمێنێ، ڕەشێنەکەیش نامێنێ.

وەختێ (ق): وەقتێ. موصیبەت (عا): موسیبەت. چەسپاوە (عا): چەسیاوە. هەڵەی نووسینە.

(٣) واتە: سەرەڕای دەردی جیایی لە یار، نەگبەتی و ئازار ناهێڵن یەك‌هەناسە سەر هەڵبڕم و کەمێك بحەسێمەوە، ناوچاوانم لە فرمێسکی خوێنینمدا بە ئەژنۆمەوە نووساوە.

نایێڵێ (کم، گم): نایەڵێ. (نایێڵێ) کورتە، لەبەرئەوە بە (نایەڵێ) دەخوێنرێتەوە.

**لەسەر ڕوو لادە تاری طوڕڕەیی موشکینی تاتارت**
**حەبەش دەستی تەطاول ڕانەکێشێ، با بەسەر ڕووما (٤)**
**ئەگەرچی کارییە دەردم، وەلێ نەزدیکە تەسکینم**
**بپرژێنێ حەکیم، ئەر ئارەقی چیهرەت بە دارووما (٥)**
**بە مەششاطەی دەوت دڵبەر: دڵی "سالم" مەڕەنجێنە**
**لەناو جەمعی پەرێشانا، لە حەلقەی چینی گێسووما (٦)**

(٤) تار: تاڵ. موشکی تاتار: میسکی وڵاتی تاتار کە لە بۆنخۆشیدا بەناووبانگە. تەطاول: دەستدرێژی. حەبەش: وڵاتێکە لە ئەفریقا خەڵکەکەی ڕەشپێستن. ڕووم: وڵاتی ڕۆم کە خەڵکەکەی سپی‌پێستن، مەبەست ڕوخسارم.

واتە: تاڵ‌تاڵی ئەگریجەی ڕەشی بۆنی میسك پێوەت لەسەر ڕوو لادە، با حەبەشی ئەگریجەت وڵاتی ڕۆمی ڕوخسارت داگیر نەکا.

ڕانەکێشێ با (گم): با نەکێشێ با.

(٥) داروو: دەرمان.

واتە: ئەگەرچی دەردم گرانە و لە چارکردن نایێ، ئەگەر بێت و پزیشکەکەم ئارەقی ڕوومەتت بەو دەرمانەدا بپرژێنێ کە بۆی داناوم، زۆر نزیکە ئارام ببم و لە ئازار ڕزگارم بێ.

شایانی باسە: نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە (عا)دا بەم جۆرەیە: ((دەمی مەرگم لە قەبرا دێنە ڕەقص ئەعضایی بێ‌ڕۆحم))، ئیتر ((ئەگەرچی ... هتد))ی بە یەك نیوە بە جیا نووسیوە، لەوانەیە لە ڕەشنووسەکەی ئەودا وا بووبێ. جا لەسەر ئەو دەقەی (عا)، کە زۆر جوانە، مەبەست لە (داروو) – وەك پێمان وایە– ئەو دەرمانە بۆنخۆشانەیە کە بە کفنی مردوودا دەکرێن. واتە: کە دەمرم و دەمخەنە گۆڕ، ئەندامی بێ‌گیانم دێتە سەما، ئەگەر پزیشك دەرمانی بۆنخۆشی پێدا بپرژێنێ .. تاد.

(٦) واتە: دڵبەر بەوەی دەوت کە ئارایشتی دەدا و ئەگریجەیی شانە دەکرد. دڵی سالم لە ناویدا خۆی حەشار داوە، مەیڕەنجێنە و لێی گەڕێ با لەناو ئەگریجەی پەرێشان و چین لەسەر چینی یاردا بمێنێتەوە.

دەوت (ق): دەگوت.

## -٤١- (*)

**بێ تەماشای خاڵی تۆ، خاڵی لە مەردوم دیدە ما**
**عەکسی ئەو بوو مەردومی دانا لە پەردەی دیدەما (١)**
**شوعلە نەیدا فرصەتی پەروانە مەطلەب کا بەیان**
**سیڕڕی سەربەستەی، لەپێی شەمعا، هەموو پۆشیدە ما (٢)**
**وا نەبوو لێوت بە سروەی بای خەیاڵی بۆسەیێ**
**غونچەیی سێرابی نەشکوفتەت چ بوو، ناچیدە ما (٣)**
**ڕوویی وەك لالەت لە خەشما یەك نیگەھ ڕەنگێکی ڕێت**
**داغی حەسرەت تا قیامەت بۆ دڵی ڕەنجیدە ما (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) (مەردوم)ی یەکەم: کەس، خەڵك. (مەردوم)ی دووەم: گلێنەی چاو. (دیدە ما)ی یەکەم: دیدە مایەوە. (دیدەما)ی دووەم: دیدەمدا.

واتە: ئەگەر نەڕوانمە خاڵی ڕووت، چاوم کەس نابینێ و هێزی بینینی نابێ. چاوم بە هێزی خاڵی ڕووت کە تێیدا ڕەنگ دەداتەوە، شت دەبینێ.

(٢) شوعلە: بلێسە. مەطلەب: مەبەست، داوا. بەیان: ڕوونکردنەوە. سەربەست: پەنهان، سەرداپۆشراو. لە پێی: لە بەرپێی، لە پێناوی. پۆشیدە: داپۆشراو.

واتە: گڕی مۆم ماوەی پەروانەی نەدا ڕازی دڵی خۆی بگێڕێتەوە. پەنامەکیی عیشقەکەی بە سەربەستراوی و نەکراوەیی، لەبەر پێی مۆمدا یا لە پێناوی عیشقدا، بە نەزانراوی مایەوە.

لەپێی (کم، گم): لەبی، هەڵەیە.

(٣) ئەم بەیتە و سێ بەیتی پاشەوەی لە (ق)دا نین.

وا نەبوو: نەکرایەوە. سێراب: تێراو. نەشکوفتە: نەپشکووتوو. ناچیدە: نەچنراو، لە لق نەکراوە.

واتە: ئەی یار! نەك تەنیا ماچ، بەڵکوو خەیاڵی ماچیش، بە لێوتدا گوزەر ناکا. بۆیە دەم ناکەیتەوە، تا لێوی خونچەت بە سروەی بای ئەو خەیاڵە بکرێتەوە!! چ بەڵایەك بوو خونچەی نەپشکووتوو بۆ کەس نەکرایەوە؟!

چ بوو (کم، گم): چوو، هەڵەیە.

(٤) لالە: گوڵەمێلاقە، گوڵێکە هەموو جۆرە ڕەنگێکی هەیە. خەشم: ڕق. ڕێت: ڕشت، دەردا.

**تا دەڵێم: مروەت کە، ڕەحمێ، جەوری تۆ ئەفزوون دەبێ**
**داد و بێدادی لە گوێتا هەر وەها نەشنیدە ما (٥)**
**کوا ترازوویێ قیاسی وەزنی حوببی پێبکەم؟**
**میهری سەنگینت لە کەففەی دڵ بە ناسەنجیدە ما (٦)**
**نەظمی سامانی لە کوێ بوو، عاشقی شۆریدەبەخت؟!**
**موویی ئاشوفتەی سەرم دەرهەم، هەموو ژوولیدە ما (٧)**
**تابی بێمیهریی نەبوو یەكدەم، وەکوو "سالم"، ڕەقیب**
**سەگ بە تۆپین چوو لە قەحطا، گورگی باراندیدە ما (٨)**

داغ: سووتاندن و نیشانەدارکردن، نیشانە. ڕەنجیدە: ئازاردار، خەمگین.

واتە: ڕووی وەك گوڵت لە ڕق و قیندا بە یەكئیگا ڕەنگێکی وەهای ڕشت، بوو بە هۆی داخ و نیشانەی خەفەت لە دڵی خەمگینمدا تا ڕۆژی قیامەت!

(٥) مروەت: پیاوەتی، مەردایەتی. جەور: ستەم. ئەفزوون: زیاد. داد و بێدادی: هاوار و پاڕانەوە. نەشنیدە: نەبیستراو، کەس گوێ بۆ شلنەکردوو.

واتە: تا داوای مەردایەتی و ڕەحمەت لێ بکەم، تۆ ستەمت زۆرتر دەبێ. هاوار و ناڵە بە نەبیستراوی مایەوە!

بێدادی (حا): بێداد. (کم، گم): بێدادم. جوانترە.

(٦) میهر: خۆشەویستی. کەففە: تای ترازوو. ناسەنجیدە: نەکێشراو، کێشنەزانراو.

واتە: ترازوویەکی وەها نییە خۆشەویستیی تۆی پێ بکێشم. خۆشەویستیی لەکێشنەهاتووت لە ترازووی دڵمدا بەبێ کێشانە مایەوە.

(٧) سامان: ڕێکخستن و ئارایش دان. شۆریدە: ئاڵۆز و بژ. ئاشوفتە: تێکچوو و ناڕێکوپێك. دەرهەم: شێواو و ژاکاو. ژوولیدە: تێکەڵوپێکەڵ.

واتە: عاشقی بەدبەخت لە کوێ دەتوانێ خۆی ڕێکوپێك بکا و ئارایشتی خۆی بدا؟ مووی بژ و تێکچووی سەرم هەموو ئاڵۆزاوە و بەیەکدا چووە، دەڵێی شێتم.

سامانی (کم): شانی. دەرهەم، هەموو (کم): وا دەرهەم و.

(٨) تاب: هێز و توان. بێمیهری: بێمەیلی و بێلوتفی. قەحط: گرانی و قاتوقڕی.

باراندیدە: مەبەست ستەمدیدە و قوڕ و چلپاو شێلە! گورك خاوەن و جێی نییە و باران لێی دەدا، تا شتێکی دەست دەکەوێ. لێرەدا سەگەکە ڕەقیبە، بەڵام سالم بۆچی گورگ بێ؟!

هەرچۆنێك بێ، واتە: بەدكار وەك سالم خۆگر و تینوتوانی بێمەیلیی یاری نەبوو، دیـارە بـارێكی گرانە، بەم جۆرە ڕەقیبی سەگ لـە قاتوقڕی و بێمەیلیی یاردا تۆپی، بەڵام گـورگی سـزادیو، سـالم، مایەوە و نەمردا!

(*) -٤٢-

**بۆ منی بێسەروپا، غەیری وەفا، پیشە نەما**

**بۆ دڵی تۆ، صەنەما! جوز ستەم، ئەندیشە نەما (١)**

**ئاب و ڕەنگم نییە، ئەزبەسکی تکا خوێنی سروشك**

**مەیی ئەحمەر کە ڕژا، خاصییەتی شیشە نەما (٢)**

**چ تەکانێکە، خودایا هەرەسی جەوری حەبیب؟**

**بۆ نیهالی ئەمەلم بەرگ و بەر و ڕیشە نەما (٣)**

**دامتراشیوە بە ناخون لە غەمت، سینەیی ڕێش**

**شوهرەتی کۆهْکەن و وەصفی دەمی تیشە نەما (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە تەنها لە (عا، غ، ق)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) صەنەما: ئەی بت! ئەی یار! جوز: جگە لە. ئەندیشە: بیر، خەیاڵ.

واتە: بۆ منی داماو و بێسەروپێ، جگە لە وەفا و دڵسۆزی بۆ تۆ، کار و پیشەیەك نەما. بۆ دڵی سەختی تۆیش، ئەی یارەکەم! جگە لە بیری ئازاردان هیچیتر نەما! لە من وەفا و لە تۆ ستەم!

(٢) ئەم بەیتە لە (ق)دا سێیەمە.

ئاب و ڕەنگ: ڕەونەق و جوانی. ئەزبەسکی: ئەوەندە زۆر.

واتە: ئەوەندە فرمێسکی خوێناویم ڕشتووە، هێز و ڕەنگ و جوانیم تێدا نەماوە. دیارە کە شەرابی سوور هەمووی ڕژا، شووشەکەی تەنیا قەوارەیەکی بۆشە و هیچ نامێنێ!

ئاب و ڕەنگم (ق): ئاب و ڕەنگ. کە ڕژا، خاصییەتی (غ): کە ڕەونەقی ڕووی.

(٣) ئەم بەیتە لە (ق)دا دووەمە.

تەکان: هەڵمەت، گوڕم. هەرەس: داڕووخان. نیهاڵ: نەونەمام.

واتە: خودایە چی بکەم؟ لافاوی ستەمی یار چ تەکان و هێرشێکی توندی هێنا؟ نەونەمامی هیوام، کە تازە خەریك بوو هەڵدەچوو، نە گەڵا، نە بەر، نە ڕەگ و ڕیشە، هیچی نەما، بەتەواوی شوێنەواری کوێر بووەوە.

جەوری (غ): هەجری.

(٤) دامتراشیوە: دامتاشیوە. ڕێش: بریندار. کۆهکەن: فەرهادی بێستوون هەڵکەن. تیشە: تەشوێ.

**بەس بسووتێنە لە غەم "سالم"ی میسکین بە جەفا**
**بۆ وجوودی سەروپا لەحم و دەم و پیشە نەما (٥)**

واتە: سینەی بریندارم لە خەم و خەفەتی تۆدا بە نینۆکی خۆم داتاشیوە. ئەوەندە کارەکەم سەخت و دژوارە، ناوی فەرهاد و کاری تەشوێکەی لەچاو ئەمدا هیچ نانوێنن!

دامتراشیوە (عا، غ): وام تراشیوە.

(٥) سەروپا: هەموو، سەروخوار، تێکڕا. لەحم: گۆشت. دەم: خوێن، هەناسە. پیشە: ئێسقان.

واتە: بەس بە خەم و پەژارە سالمی بێچارە بسووتێنە! چیی ماوە بسووتێ؟! تێکڕای گۆشت و خوێن و ئێسقانی لەناوچووە.

بۆ وجوودی (ق): بە وجوودی.

(*) -٤٣-

**لە عەرصەی ئەوجی عیشقت، بازی دڵ هەڵسا لە دەورانا**
**بە بەرقی پەرتەوی حوسنت، پەڕی سووتا لە طەیرانا (١)**
**لە ڕۆژی ئیمتیحانا دیم بەرابەر ڕوئیەتی مەعشووق**
**کەمەربەستەی هونەر هاتن لە تیپی عیشقبازانا (٢)**
**لە یەکلا "نالی"ی و "مەشوی"، لە لایێ "سالم" و "کوردی"**
**لە هەنگامەی هونەرگەرمی، تکاجۆ بوون لە "مەولانا" (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (کم، نم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) عەرصە: گۆڕەپان، مەیدان. ئەوج: بەرزی، دوورترین خاڵێکە کە مانگی تێدا لە زەوی دوور بکەوێتەوە. دەوران= دەوەران: سووڕانەوە. طەیران= طەیەران: فڕین، باڵگرتنەوە.

واتە: بازی دڵم، لە مەیدانی گەیشتن بە لوتکەی عیشقدا، هەستا و بە دەوری شەوقی ڕوومەتتدا سووڕایەوە، تیشکی جوانیت پەڕوباڵی لە کاتی باڵگرتنەوەدا سووتاند. ئەمەیش لوتکەی عیشق و گیانبەختکردنە!

(٢) ڕوئیەت: بینین. کەمەربەستە: ئامادە و ساز.

واتە: دیم هونەرمەندان، کە لە تیپی عیشقبازانن، لە ڕۆژی تاقیکردنەوەدا هاتنە مەیدان، بۆ وەرگرتنی پایەی خۆیان.

ڕوئیەتی (گم): طالیب. لە تیپی (کم، نم): بە تیپی. هاتن بە تیپی عیشقبازانا، یانێ کەوتنە ویژەیان و تێیانکەوتن، ئەمەیش بۆ ئێرە ناشێ.

(٣) تکاجۆ: تکاکار. هەنگامە: کۆبوونەوەی خەڵک بۆ تەماشاکردنی شەڕی یاریکەران.

واتە: نالی و مەشوی "مەحوی" و سالم و کوردی لە گەرمەی هونەرنوواندندا تکایان لە "مەولانا" دەکرد شیعریان هەڵبسەنگێنێ، پایە و نمرە بۆ هەریەکەیان بە قەدەر شایانی شانی دابنێ! ئەڵبەت مەبەست لە "مەولانا" پیری ڕێبازی نەقشبەندی مەولانا خالیدی میکایەلی نەقشبەندییە، کە بە وەخت لە هەموویان لەپێشتر بووە، لەوانەیشە مامۆستای ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆیان بووبێ. ڕەنگیشە «تکاجۆ بوون لە مەولانا»، لە بنەڕەتدا «تەکاپۆ بوون لە جەولانا» بووبێ و ڕوونووسکەرەوە هەڵەی تێدا کردبێ. زۆر ناوردەکاریی وا کراوە و سەیر نییە! بەو پێیە ماناکەی دەبێتە: ئەم شاعیرە سوارچاکانەی

**له مەیدانی بەلاغەتدا بە سواریی مەرکەبی مەضموون،**
**بە کوردی، هەر یەکە تازیسەواریْ بوون لە (بابان)ا (٤)**
**کە "نالی" تەوسەنی طەبعی بە طەرزیْ گەرمجوستەن بوو**
**بە چەوگانی خیرەد گۆی دانشی دەرکرد لە مەیدانا (٥)**
**کە ڕەخشی طەبعی ڕامی هاتە سەر میقراضەکی تەعلیم**
**ڕیکابی پایبۆسن "سالم" و "مەشوی" لە دەورانا (٦)**

بابان خەریکی ڕمبازی و پێشبڕکی بوون و لە مەیدانی شاعیریدا چالاکییان دەنوواند. دوایی "نالی" بە شۆڕەسوارترینیان دەرچوو.

لە لایێ (کم، نم): لەلایە. تکاجۆ بوون لە مەولانا (نم): تکاجۆن بە مەولانا. لەنگە.

(٤) مەرکەب: ئەسپ. مەضموون: مانا و ناوەڕۆك، بەرامبەری شێوە. تازی: ئەسپی عەرەبی کە چاپوك و بەناووبانگە. تازیسەوار: ئەوی ئەسپی عەرەبیی لە ژێردایە، کە دەبێ سوارچاك بێ. بابان: سەردەمی بابان، خاکی بابان.

واتە: ئەم چوارە لە مەیدانی ڕەوانبێژی و دانانی واتای جوان و پتەودا بە زمانی کوردی، هەر یەکەیان لە میرنشینیی باباندا سوارچاکێك بووە بۆ خۆی.

بوون (کم): بوو.

(٥) تەوسەن: سەرکێش و سرك. طەرز: جۆر، تەرز. جوستەن: غار، گورجڕۆیین. چەوگان: گۆچانی یاریی (گۆ و چەوگان). گۆ: گۆیەکی دارینە بە گۆچانەکە لێی دەدرێ و هەر کەسێك لە مەیدانەکە دەریکرد، ئەوە یارییەکە دەباتەوە. دانش: زانین، زانست.

واتە: نالی، کە تەبیعەتی سەرکێش و سرك و بزێوی گەرم بوو و دایە غاری تیژ، گۆی زانایی و بەرجەستەیی بە گۆچانی هونەرمەندی لە مەیدان دەرکرد، کەس نەیتوانی بەرهەڵستی بکا و یارییەکەی بردەوە.

(٦) ڕەخش: ئەسپەکەی ڕۆستەمی زاڵە، ئەڵبەت بەتین و ئارام و لەسەرخۆ و ڕام بووە. ڕیکاب: ئاوزەنگی. پایبۆس: پێماچکەر، کینایەیە لە زیارەتکەری گەورەپیاو. میقراضەك: جۆرە زۆرانبازییەکە، زۆرانگر هەردوو پێی تێدا لە مل یا ناوقەدی هاوزۆرانەکەی گیر دەکا و دەیگوشێتە یەك، تا دەیبەزێنێ. تەعلیم: فێرکردن، ڕاهێنان و مەشقپێکردن.

واتە: کە ئەسپی تەبیعەتی ڕامکراوی نالی هاتە سەر ئەو جۆرە زۆرانبازییە، ئەوسا سالم و مەشوی هەر ئەوەیان بۆ دەمێنێتەوە زیارەتی ئاوزەنگیی ئەسپەکەی بکەن، یا ئەو ئاوزەنگییە ماچ بکەن، چونکە

سەریان دەکەوێتە لای قاچی زۆرانبازەکەوە کە بە شێوەی (میقراضـەك) یـاری دەکـا. بـەیتی پێـشوو نیشانەیەکی تەبیعەتی سـەرکێشی سالم بوو، ئەم بەیتەیش نیشـانەی تەبیعەتی ئارامیەتی.

پای‌بۆسن (گم): پای بۆسی.

لایەنی مێژوویی ئەم شیعرە، کە جگە لەوەی لە نوسخە بنچینەییەکەی (مان)دا نییە، خالێکی جێـی تێرامان و وردبوونەوەیە، بەتایبەتی کە جیاوازییـەکی بەرچاو لـە نێوان تەمەن و ماوەی ژیانی مەولانا و نالی و سالم و کوردی لە لایەك و مەشوی "مەحوی" لە لایـەکی‌تـرەوە هەیـە. "مـەحوی" کـە لـە ١٩٠٤دا کۆچی دوایی کردووە، زۆر ڕێی تێ‌ناچێ ئەگەر سـەرەتای شاعیریشی لە سەردەمی ژیانی "مـەولانا"دا – کە ١٨٢٧/٦/٦دا سەری ناوەتەوە– دەرکەوتبێ، ئەو ناووبانگە دیارەی شاعیریی هەبووبێ بخرێتە ڕیـزی نالی و کوردی و سالم! یان لەوانەیە بلێین: سالم ئەم پارچەشـیعرەی لـە دواسـالانی تەمەنیـدا وتـووە کـە "مەحوی" ئەوسا ناوێکی زانراوی شاعیریی هەبووە! لەپاڵ ئەوەدا مەولانایش کە لە ژیاندا بـووە و پـاش مەرگیشی، لەپێش‌بوونەکەی نەبێ، پایەی –بەتایبـەتی– لـە شیعری کوردیـدا وەهـا نـەبووە ئـەم شـاعیرە گەورانە بۆ حوکمدان پەنای بۆ ببەن. ئێمە هەر ئەم چەند ڕاستییە مێژوویـیـە ناچـاری ڕاگرتنـی کـردین، ئەگینا پێمان وایە مەحوی لە هونەری شیعردا لـە سالم و "کـوردی"ش بەدەسـەڵاتتر بـووە و لـە شـیعری صۆفییانە و ئایینی و ڕەخنەی کۆمەڵایەتیدا لە "نالی"شی بردووەتەوە و هەرچـەندە لـە تێکـڕای هونـەری شیعردا نەگەیوەتە ئەو، بەڵام هێشتا بە بلیـمەتێکی قوتابخانەکەی دادەنرێ.

## -٤٤- (*)

**ساقی لە پەردە دەرهات، جامی شەرابی هێنا**
**دڵ خیرە ما لە حیرەت، ماه ئافتابی هێنا (١)**
**یەك ذەڕڕە عەکسی پەرتەو، دەرکەوت و طووری سووزاند**
**ئایینە سەختڕوو بوو، لەو عەکسە تابی هێنا (٢)**
**تیماری چاکی سینەم، ڕاجیع بە چاوی مەستە**
**بەختیش موافیقی عیشق، بۆ من خەرابی هێنا (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ف، ڕ، کم، گم)دا هەیە. لە (مان)دا لە بەشی (غزلهای جدیده)دایە.

کێشی عەرووز: موزاریعی هەشتیی ئەخرەب.

(١) ساقی: مەیگێڕ، یار. خیرە: سەرسام، سەرلێشێواو. حیرەت: واقوڕمان، سەرسامی. ماه: مانگ. ئافتاب: خۆر، کنایەیشە لە شەرابی ترێ!

واتە: کە یار لە پەردە هاتە دەرێ و پیاڵەی چاوی بەخوماری گێڕا، دڵ سەرسام بوو، چۆنە وا مانگ خۆری لەگەڵ خۆی هێناوە! ڕوومەتی یار مانگە، کەچی وەك خۆر سووتاندمی، یا یار خۆی مانگە و شەرابەکەی ئاگری تێبەردام، یان یار مانگە و شەرابی ترێی هێنا.

ماه (ف، ڕ، کم، گم): مەه. دروستترە و ئاهەنگی نیوەبەیتەکەی پێ ڕەوانتر دەبێ.

(٢) طوور: ئەو کێوەی کە خودا قسەی لەگەڵ حەزرەتی مووسا تێدا کرد و نووری خۆی لێ نیشان دا. سووزاند: سووتاند. تاب: تاو، گەرمی.

واتە: تۆزقاڵێك ڕووناکی دەرکەوت، کێوی (توور)ی لەمەڕ حەزرەتی مووسا (د.خ) سووتا و بوو بە کل! کەچی ئاوێنەی ڕووت بەو ڕووناکییە کە ڕەنگدانەوەی هەموو ڕووی تۆی تێدا دەرکەوت، ئەوەندە ڕووقایم بوو نەسووتا، تەنیا تاوی گرت و گەرم بوو!

سووزاند (ج، ڕ، کم، گم): سووتاند.

(٣) تیمار: دەرمانکردن. چاك: لەت لەت.

واتە: چارەسەر و دەرمانی سینەی لەتلەتم لای چاوی مەستتە، زۆر سەیرە بەختیشم، هەروەك عیشقم، خراپی لەگەڵمدا هێنا؛ زەدەی چاوی مەخموورم، هەر ئەویشە دوکتۆرم!

خەرابی (کم، گم): خەرابی.

**یارم لە دەر دەروون هات، دەستی ڕەقیب لە دەستا**
**غەمناك و شادمانم: ڕەحمەت عەذابی هێنا (٤)**
**بۆ تەوبە سوویی مەسجید، هاتم بچم، لە ڕێدا**
**بۆ کۆیی مەیفرۆشان، عەزمم شیتابی هێنا! (٥)**
**ڕوو هەر لە من دەپۆشێ، وا حاڵییە کە جیبریل**
**هەر خاصصە بۆ من و ئەو، ئایەی حیجابی هێنا! (٦)**
**وەه وەه چ مەجلیسێ بوو، دوێشەو لە دیدەوو دڵ؟!**
**دڵبەر شەرابی گێڕا، "سالم" کەبابی هێنا (٧)**

(٤) دەر: دەرگا، دەرەوە. دەروون هات: هاتە ژوورەوە.

واتە: یار لە دەرگاوە یا لە دەرەوە خۆی بە ژووردا کرد، دەستی بەدکاری گرتبوو! لە لایەکەوە خەمبارم کە بەدکاری ئێسكقورسی بە ڕێز و نەوازشەوە لەگەڵ خۆی هێنا و لە لایەکیترەوە، شادمانم کە هەر هیچ نەبێ خۆی هات و دیدەم بە دیداری ڕوون دەبێتەوە!

دەر دەروون (گم): ئەندەروون.

(٥) سوو: لا. کۆ: مەنزڵ و دەوروبەری. شیتاب: ڕاکردن، خێرا ڕۆیشتن.

واتە: هاتم بچم بۆ مزگەوت و تۆبە بکەم، کەچی ئیرادە و خواستم لە ڕێدا بەرەو خانەی مەیفرۆشانی بردم.

(٦) حاڵییە: تێدەگا، لای وایە. جیبریل: فریشتەی سرووش. خاصصە: تایبەت. ئایەی حیجاب: ئەو ئایەتەی قورئانی پیرۆز کە ڕوانینی پیاو و ژنی نامەحرەمی بۆ یەکتر قەدەغە کردووە و بڕیاری سەرپۆشدانانی بۆ ژنان داوە.

واتە: یار ڕووی خۆی هەر لە من دەپۆشێ، بۆ کەسیتر وا نییە. لەو وایە جیبرائیل ئایەتی تەماشا حەرامکردنی ژن و پیاوی نامەحرەمی هەر بۆ من و یار هێناوە.

ڕوو (گم): ڕووی. دەپۆشێ (کم): ئەپۆشێ. ئایەی (ڕ): ئاینەی. هەڵەیە.

(٧) وەه وەه: وەی وەی، وشەی سەرسامییە.

واتە: وەی وەی دوێشەو چ کۆڕێکی گەرم و سەیر بوو! یار لەنێوان چاوی خۆی و دڵی مندا شەرابی دەبەخشییەوە، چاوی مەستی دەگێڕا و سالمیش کەبابی دڵی برژاوی خۆیی دەهێنا، دیارە بۆ مەزەیە. مەزە بۆ کۆڕی وا نەبێ، بۆچی باشە؟!

وەه وەه (ف، ڕ، کم، گم): وەی وەی. دوێشەو (ف، ڕ): وەه وەه. (کم، گم): دوێنێ.

**-٤٥- (*)**

**بەدەل کەین، با بە نەشئەی مەی، خوماری میحنەتی دونیا**

**«ألا یا أَیُّها الساقي! أَدِرْ کأساً وناوِلْها» (١)**

**مەحەببەت زۆر بەئاشووبە، بە سەهلی تێمەگەن یاران!**

**«که عشق آسان نمود أوّل، ولی افتاد مشکلها» (٢)**

**کە بادی صوبحْدەم ئەفشان دەکا گێسوویی پڕچینی**

**«ز تاب جَعْد مشکینش چه خون افتاد در دلها؟» (٣)**

**دڵا! هەرچی بڵێ ناصیح، لە نیك و بەد، بەجێی بێنە**

**«که سالك بی‌خبر نبود ز راه و رسم منزلها» (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، ه، ف، غ، ر، کم، نم، گم،)دا هەیە، لە (مان، ن)دا لە بەشی (ملمّعات)دایە و فارسییەکەی هیی "حافظ شیرازی"یە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) واتە: ئەی مەیگێڕ! پێك بگێڕە و بە نۆرە بماندەرێ، با سەرخۆشیی سزای دنیای نالەبار بە سەرخۆشیی مەی بگۆڕینەوە. سەرخۆشیی مەی تاڵاوی دنیا لەبیر دەباتەوە!

خوماری (نم): غوباری. دونیا (حا): دلها.

(٢) ئەم بەیتە لە (ف)دا چوارەمە.

واتە: خۆشەویستی ئاشووبی لەدوایە، بە ئاسانی تێمەگە. ڕاستە عیشق لە سەرەتاوە خۆی بە ئاسان پیشان دا، بەڵام دوایی کەوتە داوی چەندین گێژاو!

نمود (گم): بوەد. هەڵەیە.

(٣) باد: با، شنە با. صوبحدەم: بەرەبەیان. ئەفشان: پەخش و بڵاو. تاب: لوولوپێچی ئەگریجە. جعد: مووی لوول و پێچ پێچ، دژی خاو. مشکین: تێکەڵ بە میسك، بۆنی میسك پێوە بوو. دلها: دڵان.

واتە: کە سروەی شنەبای بەرەبەیان ئەگریجەی چینچینی یار پەخش‌وبڵاو دەکاتەوە، چ خوێنێك لە پێچی ئەگریجەی لوولی بۆنخۆشیەوە زایە دڵان؟

دەبوو "سالم" لەباتیی (دەکا) (کرد)ی بوتایە، تا لەگەڵ (افتاد)دا بگونجایە، بەڵام ئێستا (دەکا)ی سالم دۆخی داهاتوو دەگەیێنێ و (ئوفتاد)ی حافظ ڕابووردووە!

دەکا (کم): ئەکا. افتاد (نم، گم): افتادە. هەڵەیە.

(٤) نیك: چاك. بەد: خراپ. سالیك: ڕێوار، لەوانەیە مەبەستی ئەهلی سولووك و سۆفیگەری

**مەحەللی ڕیحلەتە دونیا، ڕەفیق! ئیمڕۆز و فەردایە!**

**«جرس فریاد میدارد که بربندید محملها» (٥)**

**لە بیمی مەوجی دەریای ئەهلی دڵ، زاهید، خەبەردار نین**

**«کجا دانند حالِ ما سبکباران ساحلها؟!» (٦)**

**قصەی من شوهرەیی شەهرە، تەمامە تازە بیپۆشم!**

**«نهان کَیْ ماند آن رازی کزو سازند محفلها؟!» (٧)**

بێ. راه و رسم: ڕێوشوێن، ڕێ و نیشان. منزلها: ئەو شوێنانەی وا ڕێبواران وچانیان تێدا دەگرن، یا پایەکانی ئەهلی سولووك.

واتە: ئەی دڵ! ئامۆژگاریکەر چیت پێ دەڵێ، چاك و خراپ، لە قسەی دەرمەچۆ. ئەو شارەزای ڕێوشوێنی حەسانەوەیە! دوای بکەوە، وێڵ نابی.

بەجێی بێنە (هـ): لە گوێ بگرە.

(٥) محل: شوێن. ڕیحلەت: کۆچ‌کردن، ڕۆیشتن، گەشت‌کردن. ئیمڕۆز: ئەمڕۆ. فەردا: سبەینێ. جرس: زەنگ. فریاد می‌دارد: هاواری لێ بەرز دەبێتەوە. بربندید: ببەستن. محملها: بار و بنەکان.

واتە: هاوڕێ! دنیا جێی مانەوە نییە، قۆناغێکە و تەنیا ئەمڕۆ و سبەینێیەکە، لەوە زیاتر نییە. زەنگی کۆچ و کاروان لێ‌دەدا و دەڵێ: گورج کەن، بار و بنەتان بپێچنەوە و کار و کردەوەتان بکەنە توێشووی ڕێ و ئامادەی کۆچ بن، بەجێ‌دەمێنن!

(دونیا) لە (ڕ)دا نوختەکانی کەوتوون.

(٦) بیم: ترس. مەوج: شەپۆل. ئەهلی دڵ: عاشقان. کجا: لە کوێ. دانند: دەزانن. سبکباران: کەسانی بارسووك، سەرئازاد و ئاسوودە. ساحل: کەناری دەریا.

واتە: زاهیدەکان، کە هەر لە بڕی عیشق جیا ناکەنەوە، بێئاگان لە ترسی شەپۆلی دەریای عیشق! ئەوانە کە باریان سووکە، یا سەرئازاد و ئاسوودەن، لە نزیکی کەناری دەریا و وشکانییەوەن، چی لە حاڵی ئێمەی بارقورسی لە نێرینەی دەریادا گیرخواردووی لەگەڵ شەپۆل‌زۆرانگرتوو دەزانن؟!

(٧) شوهرە: شۆرەت، ناووبانگ. شەهر: شار. نهان: پەنهان، نهێنی. ماند: دەمێنێ. راز: نهێنی. سازند: دروست دەکەن، ئامادە دەکەن. محفلها: کۆڕ و ئەنجومەنەکان.

واتە: دەنگ‌وباسی عیشق و دێوانەیی من، هەموو شاری گرتووەتەوە، کەچی من تازە تەمامە پاش دەرکەوتنی ئەم ڕازانە بیانپۆشم!! ئەو ڕازە کە بوویێتە قسە و باسی کۆڕ و ئەنجومەنەکانی خەڵك و هەموو کەس پێی زانیبێ، کەی دەشاردرێتەوە. وەك دەڵێن: «قسە کەوتە زاری، دەکەوێتە شاری».

**ویصالی دڵبەرە "سالم"! موعەظظەمتر لە هەر مەطڵەب**
**«متی ما تَلْقَ مَنْ تَهْوى، دَعِ الدنيا وَأهْمِلْهَا»** (٨)

شوهرەیی شەهرە (ڕ): شوهرەیی شـەهرە و. (کـم، نم، گـم): شـوهرەتی شـارە. تەمامـە (هـ): طەمامە. هەڵەیە.

(٨) واتە: لە هەموو داخوازییەك گرنگتر و گەورەتر، گەیشتن بە یارە. کە بە یـار گەیـشتی، واز لە هەموو جیهان بهێنە و پشتگوێی بخە و بەرەڵڵای بکە.

## -٤٦- (*)

ڕووبەڕووی نەقش و نگینی موصطەفا
نەسخە تۆماری جەمیعی ئەنبییا (١)
((یا محمد))، تۆی شەفاعەتخواهی خەڵق
بەهرەیابی لوطفی تۆن، شاه و گەدا (٢)
بۆ طەوافی کەعبەیی تۆ، تا حەشر
حەلقەگێڕن، جانی کوللی ئەولییا (٣)
وەقتی کەشفی زەمزەمەی ئیعجازی تۆ
گوم دەکا مووسایی عیمرانی، عەصا (٤)
دادەتاشێ حەق لە شەوقی تۆ، نەبی
نووری مانگ و خۆر وەکوو سەنگئاسیا (٥)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (غ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشیی مەحزووف.

(١) نەقش و نگین: کینایەیە لە قورئانی پیرۆز. موصطەفا: ناوێکی پێغەمبەری ئیسلام محەممەدە (د.خ). نەسخ: سڕدراوە، کوژاوە.

واتە: تۆماری کارنامەی هەموو پێغەمبەران کە کتێبە ئاسمانییەکانیانە، بە قورئان کە پەیامی ئیسلامە و محەممەد هەڵگریەتی، سڕدراوەتەوە.

(٢) شەفاعەتخواه: تکاکار، داواکەری بەخشین لە گوناه. بەهرەیاب: سوودوەرگر، بەهرەمەند.

واتە: ئەی محەممەد، تۆ تکاکاری لێبوردنی لە گوناهی خەڵك، پادشا و هەژار کەڵکیان لە سۆز و لوتفی تۆ دیوە.

(٣) واتە: گیانی هەموو پیاوچاکان تا ڕۆژی حەشر بە دەوری کەعبەی تۆوە تەواف دەکەن و ئەڵقە دەگێڕن.

(٤) واتە: کاتێك ئاوازی موعجیزەی تۆ دەکەوێتە ڕوو، مووسا پێغەمبەر دەساکێ و عاساکەی دەستی -کە موعجیزەیەکیەتی- دەشارێتەوە. ئاماژەیە بە سوورەتەکانی ژمارە ١٧-٢١ی سوورەتی (طه): ((قال هي عصاي أتوكّؤا عليها وأهّش بها غنمي ولي فيها مآرب اخرى. قال القها يا موسى. فالقاها فاذا هي حيّة تسعى. قال خذها ولاتخف سنعيدها سيرتها الاولى)).

(٥) حەق: خودا. سەنگئاسیا: بەرداشی ئاش. نەبی: پێغەمبەر.

شەمعی دینت بیمی خامۆشیی نییە
تا حەشر بادی موخالیف لێی بدا (٦)
جەزبی تۆ ئاهەنڕوبا دێنێتە چەرخ
میهری تۆ وەك کەهـ دەکێشێ، کەهڕوبا (٧)
ئانگەهـ عیسا مورغی خۆی بێ ڕەهبەری
ئافْتابی موعجیزەت، گەر جیلوە کا (٨)
ڕووبەڕووی ئیحرامییانی کۆیی تۆ
عەطرها دێنێ هەموو صوبحێ، صەبا (٩)

واتە: ئەی پێغەمبەر، خودای گەورە وەکوو بەرداش ڕووناکیی مانگ و خۆر لە شەوق و درەوشانەوەی تۆ دادەتاشێ.

(٦) بادی موخالیف: بای پێچەوانە.

واتە: مۆمی ئایینەکەت ئەوەندە ڕووناك و گەشاوەیە، تا ڕۆژی حەشر ترسی ئەوەی نییە بای پێچەوانەی مەرام لـێی بدا و بیکوژێنێتەوە.

(٧) ئاهەنڕوبا: موگناتیس، ئاسنڕاکێش. کەهڕوبا: کاڕاکێش.

واتە: هێزی ڕاکێشانی تۆ موگناتیسیش دێنێتە سووڕ و خول. خۆشەویستی یا خۆری تۆ وەك چۆن کاڕاکێش کا بەلای خۆیدا ڕادەکێشێ، ئاوا تۆ بەرەو لای خۆی ڕادەکێشێ.

(جەزبی)، دەبوو (جەذبی) بووایە.

(٨) ئانگەهـ: ئەو کاتە. مورغی عیسا: شەمشەمەکوێرە. ئافتاب: هەتاو. جیلوە کا: خۆی بنوێنێ، دەربکەوێ.

واتە: ئەگەر هەتاوی موعجیزەت هەڵبێ و دەربکەوێ و دنیا ڕۆشن بکاتەوە، ئەو کاتە عیسا هەر شەمشەمەکوێرە دەبێتە ڕێنوێنی، کە دیارە لـە ڕووناکیدا چاوی نابینێ و ڕێی لێ ون دەبێ.

ئاماژەیە بە ئایەتی ژمارە ٤٩ی سوورەتی (آل عمران): ((اني أخلق لكم من الطين كهيئة الطير، فانفخ فيه، فيكون طيراً باذن الله)). کە عیسا بەسەر قوڕیدا خوێند و فووی پێدا کرد، وەك پەلـەوەرێکی لێ هات کە ئەمڕۆ بە شەمشەمەکوێرە ناسراوە.

(٩) ئیحرامییان: کەسانی پۆشاکی ڕێوڕەسمی حەج پۆشیو. کۆ: مەنزڵ. عەطرها: کۆی عەطر، بۆنوبەرامەکان.

واتە: سروەبای بەیان هەموو بەیانییـەك بەرامبەر بە حەجکەرانی بەردەرگای تۆ، جۆرەها بۆنوبەرامە

وا بە دڵ بۆ طەوفی کەعبەت موبتەلان
بوو بە خوێن، نافی غەزالانی خەتا (١٠)
ظوڵمەتێ بوو، ئوممەتی خۆت بردە دەر
مووسە ئەر بڕوا، لەوێ ڕێ ون دەکا (١١)
سەرْوی جەننەت هەر دەکا ئیدریسْ، گەز
تا بە ئەندازەی قەدت ببڕێ قەبا (١٢)
هەر کە ئیسمت بوو بە سککەی زەڕی دین
سائیری دین بوونە ضەربی شەهڕەوا (١٣)

لەگەڵ خۆی دێنێ.

(١٠) طەوف: تەواف، بەدەورداگەڕان. موبتەلا: گیرۆدە. ناف: ناوك. خەتا: وڵاتی خەتا.

واتە: ئەوانە وا بە گیان و بە دڵ سەراسیمە و گیرۆدەی تەوافی دەوری کەعبەی تۆن، تەنانەت ناوکی ئاسکەکانی وڵاتی (خەتا)یش بەو عەزرەتەوە بریندار بوو و خوێنی لێ هات.

(١١) ظوڵمەت: تاریکستان. ئوممەت: نەتەوە. مووسە: مووسا پێغەمبەر.

واتە: تۆ میللەتەکەت لە تاریکستانێکدا بوو، بەم ئایینە نوێیە هێناتە دەرێ و ڕزگارت کرد. ئەگەر مووسا پێغەمبەریش بەو تاریکستانەدا بڕوا، ڕێی لێ ون دەبێ.

(مووسا)، لەبەر کێشی شیعرەکە بە شێوەی (مووسە) نووسراوە.

(١٢) جەننەت: بەهەشت. ئیدریس: یەکەم پێغەمبەری پاش ئادەمە کە دەستی نووسینی هەبووە و بەرگی درووە. لەبەر زۆر دەرس‌وتنەوە، خاوەنی سیانەی حیکمەت بووە: پێغەمبەرایەتی، سەڵتەنەت و حیکمەت، لەبەرئەوە بە مامۆستای حەکیمان زانراوە. گەز: ئەندازەی پێوانی درێژی. گەزکردن: ئەندازەگرتن و پێوان. قەبا: کەوا.

واتە: ئیدریسی بەرگدروو، هەر ئەندازەی بەرزیی سەروی بەهەشت دەگرێ و دەپێوێ، تا کەوای پڕبەپڕی باڵای بەرزی تۆ ببڕێ و بدروێ.

(١٣) ئیسم: ناو. سککەی زەڕ: پارەی لە زێڕ دروستکراو. شەهڕەوا: پارەی قەڵب، یا پارەیەك تەنها لەو جێیە ڕەواجی هەیە کە لێ‌دەدرێ.

واتە: هەر کە ناوی تۆ بوو بە دراوی زێڕینی ئایین، ئیتر ئایینەکانیتر وەك پارەی بێڕەواج باویان نەما.

گەر نەهەنگی قولزومی ئیعجازی تۆ
بێتە ڕوو، ثوعبانی مووسا ڕەد دەبا (١٤)
هەرچی جان و جورمی بێ، مەعلوومە لێم
خاصصە بۆ تۆ ئافەریدەی کرد خودا (١٥)
ون دەبێ وەك گەنجی قاروون، زەڕڕی ناب
خاکی کەعبەت، گەر نەبێ بۆ کیمیا (١٦)
ڕووبەڕووی ڕەوضەی مونیرت، ئینس و جین
دێن وەکوو پەروانە بۆ شەوقی چرا (١٧)
ئیستیخوانی دەستی لەتلەت بێ بە تیغ
هەر کەسێ دامانی دینت بەربدا (١٨)

(١٤) قولزوم: دەریای سوور. ئیعجاز: کاری لەکردننەهاتوو. ثوعبان: مار. ڕەد دەبا: لەناودەچێ.

واتە: ئەگەر موعجیزەی تۆ کە لە گەورەییدا نەهەنگی دەریای سوورە، بێتە مەیدان، مارەکەی مووسا کە موعجیزەیەکیەتی، دەکشێتە دواوە و دوور دەکەوێتەوە و سەرەنگرێ دەبێ.

(١٥) جان: گیان. جورم: قەبارە. ئافەریدەی کرد: خولقاندی، دروستی کرد.

واتە: لێم ڕوونە خودا هەموو شتێکی گیاندار و بەقەبارەی بۆ تۆ خولقاند.

(١٦) گەنجی قاروون: ماڵ و سامانی زۆر وەك ئەوەی قاروونی زەمانی مووسا پێغەمبەر. زەڕ: زێڕ. ناب: پوخت و بێخەوش.

واتە: ئەگەر خاکی کەعبەت وەك کیمیا بەکارنەهێنرێ، زێڕی بێخەوشیش وەك گەنجی قاروون لەناو دەچێ و نامێنێ.

(١٧) ڕەوضە: گۆڕ. مونیر: ڕووناککەرەوە. ئینس: مرۆڤ. جین: جنۆکە.

واتە: مرۆڤ و جنۆکەیش لە ئاستی گۆڕە پیرۆزە پڕ لە ڕووناکییەکەی تۆدا وەك پەروانە وان، ڕوو لە شەوقی چراکەی دەکەن و دێن.

(١٨) ئیستیخوان: ئێسك.

واتە: ئەوی دەست لە ئایینەکەی تۆ بەربدا، ئێسکی دەستی بە شمشێر لەتلەت بێ.

**دوشمنی صیددیق و فارووقم به جان**
**غەیری تۆ گەر دڵ قوبووڵ کا ئاشنا (١٩)**
**بۆ ڕەواجی دین به شەمشێر و قەڵەم**
**کاتبت عوثمانه، شێرت مورتەضا (٢٠)**
**تیغی قەصصابی قەضا وەك گووسفەند**
**گەردی کەعبەت، جانی "سالم" کا فیدا (٢١)**

(١٩) صیددیق: ناسناوی خەلیفه ئەبووبەکری صیددیقه. فارووق: ناسناوی خەلیفه عومەری کوڕی خەتابه.

واته: ئەگەر دڵ لـه تۆ بەدەر یەکێکیتر به ئاشنا قوبووڵ بکا و باوەڕی پێ بهێنێ، به گیان دەبمه دوژمنی تەنانەت هەردوو خەلیفه ئەبووبەکر و عومەریش که ئەویان به ڕاستگۆیی و ئەمیان به جیاکردنەوەی هەق و ناهەق خزمەتی گەورەی ئیسلامیان کرد.

(٢٠) عوثمان: خەلیفه عوسمانی کوڕی عەففان که قورئان لـه سەردەمی ئەودا کۆکرایەوە. مورتەضا: ناسناوی خەلیفه عەلیی کوڕی ئەبووتالیبه که به ئازایی ناووبانگی ڕۆیشتووه.

واته: تۆ قەڵەمی کاتبێکی وەك حەزرەتی عوسمان و شمشێرێکی بڕندەی وەك شیرەکەی ئیمامی عەلیت بەدەستەوە بوو بۆ ڕەواجپێدانی ئیسلام و سەرەنجام پایەکانی ئەم ئایینەت به شمشێر و قەڵەم چەسپاند.

(٢١) گووسفەند: مەڕ. گەردی: دەوری.

واته: با کێردی قەسابی چارەنووس گیانی سالم لـەباتی مەڕ به دەوری کەعبەدا بکاته قوربانی. ئاماژەیه بۆ ئەو قوربانییه که حاجییان لـه جەژنی قوربان و کاتی حەجدا دەیکەن.

## -٤٧- (*)

## (تاك)

**بە غەیرەز میهری تۆ، گەر بێ لە دڵما**

**زڕەی زنجیری ظاڵم بێ لە ملما (١)**

(*) ئەم تاکە لە (عا، ف، ڕ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) بە غەیرەز: جگە لە، شێوەنووسەکەی (بغیراز) بوو. میهر: خۆشویستن.

واتە: ئەگەر جگە لە خۆشویستنی تۆ شتێکیتر لە دڵمدا هەبێ، خودایە زنجیری ستەمکار لە گەردنمدا زڕەی بێ. لەوانەیە ئاماژە بێ بە فەرموودەی ((قَلب المؤمن عرش الرّحمن))، کە یانێ دڵی مرۆڤی خاوەنباوەڕ عەرشی پەروەردگارە.

## پیتی (ب)

### -١- (*)

دوودی ئاهی سەحەرم ڕووی فەلەکی کردە سەحاب
بە قەراریٚ تەمی بەست، ماه و خۆری خستە حیجاب (١)
شەرەری ئاگری غەم بۆچەکی وا خستە دڵم
ڕائیحەی عەطری وەصڵ، نابْڕێ لێی بۆنی کەباب! (٢)
وام لەناو قولزومی عیشقا بە فەریبی دڵی شووم
دەگەڕێم هائیل و بێخود، بە مەثەل ظەرفی حوباب (٣)

(*) ئەم سێ بەیتە هەر لە (عا)دا هەیە.

دوور نییە ئەم سێ بەیتەیش بەشێك بێ لە پارچەشیعری «(طوڕرە بۆ ...)»، یا لە پارچەشیعرێکی لەناوچوو. ئیتر هەرسێکیان لەدوای کام بەیتەوە بووبن، یا هەر یەکی لای کامیانەوە بووبێ، ئەوە نازانرێ. ناسناوی "سالم"یش لەم سێ بەیتەدا نییە، کێش هەر کێشی پارچەی ناوبراوە، ناوەڕۆکیشیان زۆر لە یەکەوە نزیکە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەقسوور.

(١) دوود: دووکەڵ. سەحاب: هەور. ماه: مانگ. حیجاب: پەردە.

واتە: دووکەڵی ئاه و هەناسەی ساردم ڕووی ئاسمانی کردە هەور و بە جۆرێك تەم گرتی، مانگ و خۆر کەوتنە ژێر پەردەوە!

(سیماب) بۆ ئێرە دەست نادا و دەبێ (سەحاب) بووبێ.

(٢) شەرەر: گڕ. بۆچەك: بۆکرووز، بۆنی گۆشت و ئێسکی سووتاو. وا: ئەوەتە. ڕائیحە: بۆن.

واتە: ئەوەتا پریشکی ئاگری خەم و پەژارە دڵی سووتاندووم و بۆچرووکی تێبەرداوە. بەڵێ، عەتری کاتی بەیارگەیشتن، بۆنی کەبابی لێ نابڕێ، ناخۆشییەکە لە هەمان ساتی خۆشیدا، وەك مەرگ بەرامبەری وەستاوە!

(٣) قولزوم: دەریای سوور. فەریب: فریو، هەڵخەڵەتان. شووم: نەگبەت. هائیل: ترساو.

ئێمە وای بۆ دەچین ئەم وشەی (هائیل)ە لە ئەسڵی شیعرەکەدا (هائیم) بووبێ، واتە سەرگەردان و ئەوە بۆ ئەم شوێنە گونجاوە. بێخود: بێهۆش. بە مەثەل: وەك. ظەرفی حوباب: بڵقی سەر ئاو.

واتە: دڵ فریوی داوم و وەك بڵقی سەر ئاو لەناو دەریای سووری خوێناوی چاومدا بێهۆش و سەرگەردان دەگەڕێم.

-٢- (*)

**صوبحی نەورۆزە، وەختی بەزمی شەراب**

**((الصبوح، الصبوحَ، یا أصحاب!)) (١)**

**فەصڵی عەیش و نیشاطە، هەی ئامان!**

**((المدام، المدامَ، یا أحباب!)) (٢)**

**بولبولان مەست و گوڵ قەدەحدەرکەف**

**((پس بنوشید دائما مَیِ ناب)) (٣)**

**پیری من ئێستە قەد قوبووڵ ناکا**

**((کە ببندند میکدە بە شتِاب)) (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، ڕ، کم، گم)دا هەیە. لە (مان، ن)دا، لە بەشی (مولەممەعات)دایە و لەگەڵ شیعری "حافظ شیرازی" تێهەڵکێش کراوە.

کێشی عەرووز: خەفیفی شەشیی مەخبوونی ئەصڵەمی موسەبەغ.

(١) الصبوح: هەر شتێك بەیانیان بخورێ یا بخورێتەوە، لێرەدا مەبەستی ژەمەشەرابی بەیانیانە!

واتە: بەرەبەیانی جەژنی نەورۆزە و کاتی ئاهەنگ و خواردنەوەیە، هاوڕێیان فریا بکەون، ژەمی مەیەکەی بەیانیانتان بخۆنەوە، با لە کیستان نەچێ!

(٢) مودام: بارانی سەرومڕ و هەمیشەیی، شەراب.

واتە: دەستم بە دامێنتان یاران، وەرزی ڕابواردن و چالاکییە. خۆتان لە بارانی سەرومڕ بپارێزن، تا تێی نەکردووە بەردەوام بن و دەست بوەشێنن، بێپسانەوە پێکەکانتان هەڵدەن!

(٣) قەدەح دەرکەف: پیاڵە بەدەستەوە. پس: کەواتە. بنوشید: بخۆنەوە. می ناب: شەرابی ساف و ساغ و بێخڵتە.

واتە: بولبولان مەستی دەستی گوڵن، گوڵەکان پیاڵەیان بەدەستەوەیە و پێك دەگێڕن. چەند جوانە، کاسەی گوڵ پیاڵەیە! کەواتە ئێوەیش مەوەستن، بخۆنەوە.

دەر کەف (ه): بەر کەف. پس (کم، گم): بس، واتە زۆر. حافظ دەڵێ: ((هان بنوشید .. تاد)). دایما (حا): دائما.

(٤) پیر: شێخ، مورشید. قەد: هەرگیز. ببندید: ببەستن، کلیل بدەن. میکدە: مەیخانە. شتاب: پەلە.

واتە: شێخی من ئێستا هەرگیز قوبووڵ ناکا دەرگای مەیخانە بە پەلە دابخرێ.

**ئەی حەریف! هەفتەییێکە ئابی بەهار**
**«راحِ چون لعلِ آتشین دریاب»** (٥)
**دەری مەیخانە سەددە، ڕێگە نییە**
**«إفْتَتِح یا مُفَتَّحَ الأبواب!»** (٦)
**وەرە "سالم"! لە حاڵەتی عیْجزا**
**«همچو حافظ بنوش بادهٔ ناب»** (٧)

من (گم): مەی. ئێستە قەد قوبووڵ (هـ): بەستە قەد قوبووڵ. هەڵەیە. (ن): ئێستە قەت قوبووڵ. (کم): ئێستەکێ قبوولی. (گم): ئێستەکێ قبووڵ. بە هەڵە دەزانرێن.

(٥) حەریف: هاودەم، هاوپیاڵە. هەفتە: حەفتە. ئاب: ڕەونەق، برەو، درەوشانەوە. ڕاح: مەی. لعل: بەردێکی ڕەنگ‌سووری بەنرخە. آتشین: ئاگرین، مەبەستی ڕەنگی ئاگرە کە سوور و بە تین‌وتاوە. پێوەندیشی بە کاری مەیەوە هەیە کە ئاگر بەردەداتە گەدەی بخۆرەوە! دریاب: فریا کەوە، پەیدای کە.

واتە: هەڤاڵ گیان! ڕەونەق و برەو و درەوشانەوەی وەرزی بەهار هەر پێنج‌ودوو ڕۆژێکە! مەیی سووری ئاگرین پەیدا کە بۆ گەدەی ساردوسڕت!

ئابی بەهار (ڕ): آب بیار. (کم، گم): ئاوی بەهار.

(٦) دەر: دەرگا. سەددە: گیراوە.

واتە: لەم وەرزە نازدارەدا، کە هەمووشتێك مەستە، دەرگای مەیخانە بەستراوە! ئەی ئەو کەسەی کە هەموو گرێ‌کوێرەیەك دەکەیتەوە و چاری دەکەی، دەرگامان لێ بکەرەوە. دەبێ "سالم"یش وەك حافظ درمی سۆفیەتیی پێ گەیشتبێ و مەبەستی مەیخانەی ڕاستەقینە بێ.

سەددە (کم، گم): بەندە. افتتح یا (کم): افتح یا. (گم): افتح الباب یا. حافظ خۆی وا ناڵێ و بەم دوو جۆرەیش نیوەبەیتەکە لەنگ دەبێ.

(٧) همچو: وەك. بنوش: بخۆرەوە.

واتە: سالم! لە کاتی خەم و پەژارەدا وەرە، زویر و دەستەوەستان مەوەستە، وەك "حافظ" مەیی پاڵفتە و ساف هەڵدە!

بنوش بادهٔ ناب (کم): بنوشە می ناب (گم): بنوش ئەز مەیی ناب. ئەز: لە. هیچ کامیان وەك قسەکەی "حافظ" خۆی نین!

## -٣- (*)

**طوورِه، بۆ ئابی بەقای چیهره، دڵی برد بە شیتاب**
**بۆ دەلیلی ڕەهـ، ئەگەر کاری "خضر" بیٚ لە غوراب! (١)**
**وا بە دڵ چەسپە، جودا نابیٚ، پەڕی تیری نیگەهـ**
**کەی بیرون دیٚ، بە کەسیٚ، طوعمە لە چەنگاڵی عوقاب؟ (٢)**
**سیپڕی مەکشووفە شەهیدی گوڵی چیهرەت، لە مەزار**
**دیٚ لە سەنگی لەحەدی، تا بە حەشر، بۆیی گولاب (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لـە (مان، عا، ف، غ، نم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەقسوور.

(١) طوورِه: ئەگریجە. ئابی بەقا: ئاوی زیندەگانی، ئەو ئاوەی کە -دەڵێن- ئەوی لێی بخواتەوە نامریٚ. چیهرە: ڕوخسار. شیتاب: پەلـە. ڕەهـ: ڕیٚ. خضر: پێغەمبەرێك یا وەلـیـەك بووە، دەڵێن هەر ئەو شارەزای ئاوی زیندەگانی بووە و لێی خواردووەتەوە. بیٚ: لێی بوەشێتەوە، پێی بکریٚ. غوراب: قەلـەڕەش.

واتە: ئەگریجەی ڕەشی یار، کە دڵی سالم لـە ناو تاڵـەکانی ئەودایە، لـە کاتی جووڵانەوەدا بەرەو سەرچاوەی ئاوی زیندەگانی -کە ڕوخساریەتی- بە پەلـە ڕایدەکێشیٚ. جا ئیتر نازانریٚ ئاخۆ کاری خدری زیندە لـە قەلـەڕەش دیٚ، یا نە؟ مەبەست لـە غوراب ئەگریجەی ڕەشی یارە.

بۆ ئابی (عا): تۆ ئابی، هەڵـەیە.

(٢) جودا: جیا. بیرون دیٚ: دەردەچیٚ. طوعمە: نێچیر، یا چەشەی بۆ نێـچیر دانـراو. چـەنگاڵ: چنگ. عوقاب: هەڵۆ.

واتە: تیری نیگای یار وا بە دڵـەوە چەسپ بووە، هەرگیز لێـی نابێتـەوە و پـەڕی تیرێکـە. کـیٚ دەتوانیٚ نێچیر یا چەشەی نێچیر کە دڵـە، لـە چنگی هەڵۆ ڕزگار بکا؟!

چەسپە (نم): حەپسـە. تیری نیگەهـ (ف): سیرِەنگە، یانیٚ سیمورغە. (نم): تیرێکە. کەسیٚ (نم): کەس.

(٣) واتـە: شـەهیدی دەسـتی گـوڵی ڕوخـسارت، لـەسـەر گـۆڕیش نهێنییـەکـەی ئاشـکرایە و ناشاردرێتەوە، ئەوەتا تا ڕۆژی حەشر بۆنی گولاو لـە بەردی ئەلحەدەکەی دیٚ! "سالم" کوشتەی گوڵـە و بۆنی گولاوی لـیٚدیٚ و لێی جیا نابێتەوە!

کێشەکە (لـەحەد)ی پیٚ دەویٚ، دەنا هەر (لـەحد) ڕاستە.

**بۆ سەرەفرازیی دەمی صوڵحی نیگاری زووڕەنج**
**حاضرە ڕوتبەیی پەستی، هەمە جا، میثلی حوباب (٤)**
**هەر طەرەف ڕەملی بیابان و هەواگەرمیی تەمووز**
**تیشنەلەب، کەشمەکەشی داوە بە من، بەرقی سەراب (٥)**
**گونەهێکە بە قەدەر کوشتنی ئەولادی نەبی**
**عەفْوی "سالم"، دەمی کوشتن کە بزانیٚ بە صەواب! (٦)**

(٤) سەرەفرازی: سەربەرزی، بەختیاری. دەم: کات. نیگار: یار. زووڕەنج: زووتۆراو، گورج تووڕەبوو. هەمە جا: هەموو شوێن. حوباب: مار، بڵقی سەر ئاو.

واتە: من کاتی ئاشتبوونەوە لەگەڵ یاری زوو تۆراوی زویرمدا، سەربەرزی و بەختیاریم گەرەکە، کەچی -بۆ نەگبەتی- پایەنزمی و بەقوڕداچوون لە هەموو لایەکەوە وەك مار لێم ڕاست دەبنەوە! حوباب بەو قوڵتەی ئاویش دەوترێ کە لە کاتی فڕێدانی شتێك بۆ ناو ئاو، یا داکەوتنی دڵۆپی باران و شتی وادا بۆ ناو ئاوەکە، یەك لەدوای یەك پەیدا دەبێ. وشەکە لەم شوێنەدا بۆ هەردوو واتاکە دەست دەدا، بەڵام واتای یەکەم تێروتەسەلترە.

صوڵحی نیگاری زووڕەنج (نم): صوڵح نەکا زۆریی برنج. حاضرە (نم): حازرە.

(٥) هەر طەرەف: لە هەر لایەکەوە. ڕەمل: لم. تیشنەلەب: لێوتینوو. کەشمەکەش: کێشمەکێش، گێرە و کێشە و دەردەسەری. بەرقی سەراب: تیشکدانەوەی تراویلکە!

واتە: هەموو لایەك لم و زیخ، گڕە و هەوای ئاگرینی تەمووزە، منیش گەروو وشك و لێوتینووم و تیشکدانەوەی لە دوورەوەی تراویلکە تووشی دەردەسەریی کردووم.

ڕەملی بیابان و هەواگەرمیی تەمووز (نم): ئەهلی بیابان هەواگەرم و تەمووز.

(٦) واتە: ئەگەر کاتێك یار هەقی کوشتنی "سالم"ی هەبێ و بە ڕاستی بزانێ، لێی خۆش بێ و لێی ببوورێ، ئەوە نەك هەر خێر نییە، بەڵکوو ئەوەندەی کوشتنی ڕۆڵەکانی پێغەمبەر (د.خ) گوناهە! بەو پێیە: سالم ((فنا في العشق))ە و نایەوێ ببەخشرێ!

بە دووری نازانین (صواب) لە پێشدا (ثواب)، واتە پاداشتی چاکە بووبێ، ڕوونووسکەرەوەی ناشارەزا گۆڕیبێتی.

نەبی (نم): عەلی.

-٤- (*)

چوومە سەر ضیافەتی مەللا بەکری عالیجەناب
چ بڵێم خەڵکینە! بۆم نایەتە بەر مەددی حیساب (١)
خولاصە جێبەجێ بوون: ڕیزێ لە خوار، ڕیزێ لە ژوور
هێنایان هەر بە دو کەس سینییێ یاپراخ و کەباب (٢)
ئەوی مەقبوول بێ لای خەڵکی، ئێستە قسەی موختەصەرە
بوو بە هامسینی من، کەرە زۆرخۆرەکەی خانەخەراب (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (ف، کم، گم)دا هەیە، کێشەکەی ئاڵۆزە و ناسناوی "سالم"یشی تێدا نییە.
کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتی مەخبوونی مەقسوور.

(١) ضیافەت: میوانداری. عالیجەناب: پایەبەرز. مەددی حیساب: کێشانەی ئەندازە و بڕ.
واتە: مەلا بەکری پایەبەرز داوەتی کردم و بووم بە میوانی. خەڵکینە، قەرەباڵغییەکی وا بوو، بۆم حسێب ناکرێ.

خەڵکینە بۆم نایەتە (ف): خەڵقێکە بۆ نایێتە. (نایەتە) دەبێ بە شێوەی (نایێتە) بووبێ.

(٢) جێبەجێ بووین: دامەزراین. سینی: دەفرێکی پانی مەعدەنییە بۆ نان و خواردن لەسەر دانان. یاپراخ: دۆڵمە.

واتە: هەرچۆنێك بوو، جێی خۆمان گرت و بە دوو ڕیز دانیشتین. هەر دوو کەس و سینییەك یاپراخ و کەبابی خرایە بەردەم.

جێبەجێ بوون (کم، گم): جێبەجێ بووین. ڕیزێ لە خوار.. تاد (گم): ڕیز بە ڕیز ئێمە لە خوار و ژوور. بەیتەکە لەنگە، (و)یەکی نێوان (خوار) و (ڕیزێ)، نیوەی یەکەم ڕاست دەکاتەوە.

(٣) مەقبوول: پەسەند. موختەصەر: کورت و پوخت. هاوسینی: دوو کەس یا پتر کە لەسەر سینییەك نان بخۆن. خانەخەراب: ماڵوێران.

واتە: قسەی کورت بەجێیە، بۆیە درێژی ناکەمەوە. من کەرپیاوێکی زۆرخۆری ماڵوێران بووە هاوسینیم.

ئەوی مەقبوول بێ لای خەڵکی (کم، گم): مەقبوول و مەطبووعی طبعە. ئێستە قسەی .. تاد (گم): قسەی موختەسەرە. کێشەکەی باشترە! هامسینی (کم، گم): هاوسینی. کەرە زۆرخۆرەکەی (ف): کر ضحکی؟ هەڵەیە. (هامسینیی)، لەبەر کێش بە (هامسینی) دەخوێنرێتەوە.

**کۆلارەی لێوی کە زنی؟ ... ... ... سەر سینی بوو**
**لە تاوان جووجکی ژێر دەورییەکە بوو بە کەباب (٤)**
**هەمو جار چوارْدە یاپراخ و دووجووت نانی قەوی**
**بای دەدا، لوولی دەدا، قووتی دەدا، میثلی دەواب (٥)**
**چنگی گورگی کە بە یەك حەملە لە گۆشت ڕامالّی**
**هاتە یادم –ساعەتەن– زەحمەتی مەڕ، جەوری قەصاب (٦)**
**دەرونی هاتە جۆش و مەطـلّەبی دۆی ترشی دەکرد**
**کاسەدۆی نایە سەر و دوو قومی لیّ دا بە شیتاب (٧)**
**«القصة» ئەو شەوە بەدبەختە وەهای کرد بە خورش**
**وەختەبوو قیرتەبەقی نان لە مەلا بێتە جەواب (٨)**

(٤) ئەم بەیتە لـە (ف)دا نیـە.

کۆلارە: کورِکورِە، پەلـەوەرێکی جووچك و مریشك فڕێنـە. تـاوان: سـویّ و ئـارەزووی زۆر. دەوری: قاپی پەل.

نیوەی یەکەمی بەیتەکە ناتەواوە. لـە پێشـدا وتی: خواردنەکە یاپراخ و کەباب بوو، ئەی ئەم دوو جووجکە لـە کویّ جووقان.

«تاوان»، دەبیّ بە «تەوان» بخوێنرێتەوە، چونکە برِگەکە کورتە.

(٥) قەوی: ئەستوور. دەواب: چواریێ، ولاّخی بارکێش.

واتە: هەموو جارێك دوو نانی بە چواردە یاپراخەوە دەخوارد و وەك ڕەشەولاّخ قووتی دەدا.

(٦) حەملـە: هەلّمەت. جەور: ستەم.

واتە: کە چنگی گورگ‌ئاسای لـە گۆشتەکە گیرکرد، دەم‌ودەست قورِبەسـەریی مەڕ و ستەمی قەسابم بیر هاتـەوە.

لـە گۆشت (ف): بۆ گۆشت. سەعاتەن (گم): سەعەتی.

(٧) شیتاب: پەلـە.

واتە: ئەوەندەی خوارد، دەروونی گەرم داهات. داوای دۆی کرد و بە پەلـە دوو قومی لیّ‌دا.

مەطـــلّەبی (گم): طەلّەبی. کاسـەدۆی نایە سەر و (ف): مەنجەلّەدۆ لـەویّ بوو.

(٨) خــورش: خۆرشــت، جــۆرە پێخــۆرێکی شــلـە. قیرتەبــەق: نانەشــانەی لـەتوولّتــەنراوی بەقیرسواخ‌دراو.

واتە: حیکایەتەکە ئەوەیە؛ ئەو شەوە ئەو بەدبەختە کارێکی بە خواردن کرد، خەریك بوو نان و نانەشانەیش لێی بێنە دەنگ!

قیرتەبەقی نان (کم، گم): قیرطەبەق و نان.

## -٥- (*)

له ڕووی تیری موژەی خوونڕێژی مەحبووب
سەراسەر موڵکی دڵ پڕ بوو له ئاشووب (١)
سوپای بەرگەشتە بوو چاوت له موژگان
شکاندی غالیبی دڵها بە مەغلووب (٢)
بەسەر دڵما حەواڵەی غەمزە تا کەی؟!
دەبێ چی بێ خەراجی موڵکی مەخرووب؟! (٣)
بڵێن: با زیشتڕوو دێبا نەپۆشن
چ حاصڵ سورمەسا بێ، چاوی مەعیووب؟ (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لـە (مان، حا، عا، ق، غ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەقسوور.

(١) موژە: برژانگ. مەحبووب: خۆشەویست. ئاشووب: ئاژاوە و پشێوی.

واتە: وڵاتی دڵـم، لـە بەرانبەری تیری برژانگەکانی یاری خۆشەویستدا، سەرانسەری پڕ بووە لــە هەرا و ئاژاوە.

لـە ڕووی (ق): لـەبەر. تیری (غ): تیپی (طــیپی). خوونڕێزی (کم): خوونڕێژی.

(٢) بەرگەشتە: سـەرنگوون، شکاو، هەڵگەڕاوە. موژگان: کـۆی مـوژە. دڵهـا: دڵان. غـالیبی دڵها: دڵـە زاڵـەکان یا زۆرتریان.

واتە: چاوت کە کەوتووەتە دوای برژانگەکانتەوە، سوپایەکی پاشەکشەکردووە بەرانبەر بە لـەشکری برژانگەکانت. ئەو سوپای چاوە کە خـۆی بەرانبــەری سـوپای برژانگـەکانت شـکاوە و بـەزیوە، دڵــە زاڵـەکانی عاشقانی بە لـەشکری لـە بەرانبەری برژانگەکاندا بەزیوی خۆی، بەزاند و شکاندی.

(٣) حەواڵـە: پارە یا کاڵایەکە بە کەسێکدا نێررابێ بۆ کەسێکی‌تـر و ئـەو دوو کەسـە بـە یـەك بگەن و بۆنێرراوەکە لـە پێدانێرراوەکەی وەربگرێ.

واتە: تا کەی غەمزەی چاوت دەکەیتـە ســەرم و ڕای‌دەســپێری موڵکانــەم لێ بـستێنێ؟ دەبــێ دەرامەتی موڵکێکی وێرانەی وەك دڵـی من چی بـێ؟! من چیم مـاوە کـە تـۆ هەمیـشە بـە غـەمزەی چاوەکانت تیرم تێدەگری؟! کوژرام و بڕایەوە.

بەسـەر دڵـما (عا): بە سەردی. هەڵـەیە.

(٤) زیشتڕوو: ڕوخسارناشیرین. دێبا: قوماشێکی ئاوریشمینی ڕەنگینە. چ حاصڵ: چ سوودی

**لە ڕێی میهرا، بە ئیقدامی عەیادەت،**

**ئەگەر مەجرووحی یاد کا، یاری مەحجووب (٥)**

**موژەم باهەم بە ڕشتەی دڵ دەبەستم**

**دەکێشم ڕەهگوزاری جوملە، جاڕووب (٦)**

**گەیاندی بۆم صەبا بۆی عەطری گێسوو**

**وەکوو پیراهەنی یووسف بە یەعقووب (٧)**

**لە حەشریشا سەروکارم بە عیشقە،**

**ئەگەر دەستم بگاتە دەستی مەطڵووب (٨)**

هەیە؟ سورمەسا: وەك سورمە ڕەش. مەعیووب: عەیبدار، لەکەدار.

واتە: بڵێین با ڕوخسار ناشیرینەکان بەرگی ئاوریشمین نەپۆشن، پێی جوان نابن. چاوی مرومـووچ و کوتوکوێر، ئەگەر وەك سورمەیش ڕەش بکرێ، چ سوودێکی پـێ دەگا؟!

سورمەسا بـێ (کم، گم): سورمەسایی. لەوانەیە مەبەست سورمە تێسوین بـێ!

(٥) میهر: خۆشەویستی. ئیقدام: دەستپێشخەری، هاتنەپێشەوە. عەیادەت: سـەرلـەنەخۆشدان.

مەجرووح: بریندار. یاد کا: یادی بکاتەوە. مەحجووب: شەرمن.

واتاکەی لەگەڵ بەیتی پاشەوەیدا دێ.

لە ڕووی (غ، ق): لـە ڕێی.

(٦) باهەم: پێکەوە. ڕشتە: دەزوو. ڕەهگوزار: ڕێ. جوملە: هەموو. جاڕووب: گسك.

واتە: ئەگەر یاری شەرمنم لە ڕووی خۆشەویستـیـەوە، دەسـتپێـشخەری بکـا و بێتـە سـەردان و هەواڵپرسینی برینداری تیری چاوی، برژانگەکانم بە دەزووی دڵ پێکەوە دەبەستم و دەیانکەمـە گـسك، هەموو ڕێگەکەی یاری پـێ گسك دەدەم کە پێیدا تێدەپەڕێ.

(٧) ئەم بەیتە لـە (حا، عا)دا نییە.

صـەبا: بای بەرەبەیان. پیراهەن: کراس. یووسف: حەزرەتی یووسفی کوڕی یەعقووب.

واتە: حەزرەتی یەعقووب (د.خ) پێش گەیشتنی کراسەکەی یووسفی کوڕی (د.خ)، بـۆنی یووسـفی پـێ گەیشت! خودا دەفەرموێ: ((إني لأجد رِيحَ يُوسفَ لَوْلاَ أنْ تفنّـدون)) (سـوورەتی یووسـف، ئایـەتی ٩٤). واتە من بۆنی یووسف دێتە لووتم، ئەگەر قسەکەم بە درۆ ناخەنەوە.

صەبا (گم): سـەبا. گێسوو (ق): گێسـووی.

(٨) سەروکار: سـەروساخت، پێوەندی. مەطـڵووب: ئامانج، مەبەستی یارە.

**له عیشقا هەر منم هەمدەرسی مەجنوون**
**له صەبرا هەر منم ئوستادی ئەییووب (٩)**
**فەراغەت صەعبە بۆ عاشق له هیجرا**
**بە "سالم" زەهرە بێ تۆ ئەکل و مەشرووب (١٠)**

واتە: ئەگەر بە ئامانجی خۆم بگەم، لە ڕۆژی حەشریشدا هەر بە عیشقەوە خەریك دەبم.

بە عیشقە (گم): لە عیشقە.

(٩) هەمدەرس: هاودەرس. ئوستاد: مامۆستا. ئەییووب: حەزرەتی ئەییووب کە ئیبلیس حەسوودیی پێ برد. خودا لەبەرئەوە تاقیی کردەوە. نەدار و نەخۆش کەوت و کرم تێی دا و هیچ ئەندامێکی جەستەی کەڵکی نەما. حەوت ساڵ وا مایەوە، لە ویردی خواناسیی خۆی نەکەوت، هەر ددانی بەخۆدا گرت، ئیتر ئیبلیس کۆڵی دا. بۆیە خودا هێز و لەش‌ساغیی پێبەخشییەوە.

واتە: تەنها مـن هاودەرسـی مـەجنوونی لـەیلام لـە خوێنـدنی دەرزی عیـشقدا و تـەنها منیش مامۆستای حەزرەتی ئەییووبم لە سەبر و خۆڕاگرتندا.

هەمدەرسی (کم، گم): هامدەرسی. (ق): هاودەرسی.

(١٠) فەراغەت: دەستبەتاڵی. صەعب: گران. بە سالم: بۆ سالم، ئەکل: خـواردن. مەشـرووب: خواردنەوە.

واتە: بـێکاری و بـێیاری لە کاتی دووریی یاردا لەسەر شانی "سالم" گرانـە، چـونکە بـێ تـۆ هەموو خواردن و خواردنەوەیەکی ژەهری مارە!

(سالم)ی یەکەم (حا): عاشق. بە سالم (ق): بۆ سالم. بەکارهێنانی (بە) لەجیاتیی (بۆ) لە (بە سالم)دا، شێوەیەکی فارسییانەیە. زەهرە (گم): ژەهرە.

-٦- (*)

له زوڵف و ئەگریجەت بۆ کوڵم و غەبغەب
موهەییایە، لە ڕێی دڵ، مار و عەقرەب (١)
لە خاکی ئاسْتانەت تا موقیم بم،
کیفایەتمە لە جێی ئینعام و مەنصەب (٢)
لە لەوحی تەربییەت نەیخستە یادم
بەجوز ئەلفی قەدت، ئوستادی مەکتەب (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، ه، ف، غ، ج، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) غەبغەب: غەبغەبە، گۆشتی قەڵەوی ژێر چەناگەی نەختێك قەڵەوە کە بە زیاد دەبینرێ. موهەییا: ساز و ئامادە. عەقرەب: دووپشك.

واتە: دڵ ناتوانێ بگاتە نە کولمی یار و نە ژێرچەناگەی، چونکە ئەگریجەی دووپشکە و چزووی هەیە و ڕێی کولمی گرتووە، زوڵفیشی ماری سەر گەنجینەیە و ڕێی ژێرچەناگەیی بەستووە.

لە زوڵف و ئەگریجەت (ه): لە زوڵف و ئەگریجەکەت. لەنگ دەبێ. (کم، گم): لە زوڵف و پەرچەمت. سوارترە. (ق): بە زوڵف و ئەگریجە.

لە ڕاستیدا، دەبێ (ی) و (ئەگریجە) زۆر بە کورتی بخوێنرێتەوە.

(٢) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (غ)دا پاش و پێشن، لە (ج)یشدا سێیەمە.

ئاستانە: بەردەرگا، کەوشکەن. موقیم: نیشتەجێ. ئینعام: ڕۆزی بێبەخشین، نیعمەتپێدان. مەنصەب: پایە و شوێن.

واتە: تا ماوەم لە خاکی بەردەرگاتدا هەبێ تێیدا نیشتەجێ بم و کەس دەرم نەکا! ئەوەندەم بەسە و ڕۆزی و پایەم ناوێ!

ئاستانەت تا (ه): ئاستاندا گەر. موقیم بم (ف، ج، غ): موقیمم.

(٣) ئەم بەیتە لە (ف)دا دووەمە.

لەوحی تەربییەت: بەو لەوحەیان وتووە کە کاتی خۆی مەشقی بە منداڵان لەسەر کراوە بۆ فێرکردنی نووسین، تەختەڕەشی بەردەستی منداڵی بچکۆلە. نەیخستە یادم: فێری نەکردم، نەیخستە مێشکم. بە جوز: جگە لە.

بەریی حوسنە پەری، تا تۆ دیار بی
لە ڕووی مەه نائوێنێ، شەوقی کەوکەب (٤)
لەبی تیشنەم خەریکی ذیکری تۆیە
هەتا ڕۆحم لە تەندا دێتە سەر لەب (٥)
طەڵەب ناکەم لە قاپیی کردگارا،
بە غەیرەز وەصڵی دڵبەر، هیچْ مەطڵەب! (٦)
قەڵەم سەرخۆشە "سالم" بۆ تەرەددود
لە تەعلیمی بەلاغەت، میثلی مەرکەب! (٧)

واتە: مامۆستای قوتابخانە، جگە لە پیتی ئەلف کە لە بالآی تـۆ دەچـێ، هـیچ پیتێکـیتـری فێـر نەکردم. حافظ شیرازی دەڵێ:

«نیست بر لوح دلم جز الف قامت یار          چە کنم حرف دگر یاد نداد استادم؟!»

لەوحەکەی ئەم دڵـەتی و ئوستادەکەیشی –بە زۆری– خودایە.

(٤) بەریی حوسنە: لـە جوانی بێبەشە. مەه: مانگ. کەوکەب: ئەستێرە.

واتە: تا تۆ لـە ڕوو بی، پەری جوانییەکەی نانوێنێ، بگرە هەر نیشە! بەڵـێ، ورشـەی ئەسـتێرە لـەگەڵ مانگ ئەوەندە نانوێنـێ.

پەری، تا (ﻫ): لـە پەرتەو. دیار بی (عا، غ، کم): دیاری.

(٥) لـەبی تیشنە: لێوی تینوو. زیکر: ویرد، ناوهێنان. تەن: لـەش.

واتە: تا گیان لـە لـەشمەوە سـەردەکەوێ و دەگاتە سـەر لـێوم و دەیەوێ دەربـچێ، لـێوی تینـووم خەریکی زیکری تۆیە و هەر ناوی تۆ دەبا!

ذیکری (ﻫ): زوڵفی. هەڵەیە. لە تەندا (ﻫ): لـە تینوا.

(٦) کردگارا: کردگاردا.

واتە: کە لـە قاپیی کردگاردا ڕادەوەستم و دەپاڕێمەوە، گەیشتن بە یار نەبـێ، هیچیتر داوا ناکەم!

(٧) قەڵـەم سەرخۆشە سالم: وەك بڵێی سالم دڵخۆشە، یا "سالم" بانگکراو (مونـادا)ە. تـەرەددود: هاتوچۆ. مەرکەب: مەبەست ولآخی پێشوازییە!

واتە: سالم قەڵـەمەکەی بۆ ڕەوانبێژی فێری خـەڵك کـردن مەسـت و سەرخۆشـە، وەك ئەسـپی ڕەسەن لـە هاتوچۆدایە و مەشق دەکا، یا واتە: هۆ سالم! قەڵـەم .. تاد.

تەعلیمی (غ): ئیقلیمی.

-٧- (*)

**ئابی حەیاتی منە، بۆسەیی لێوی حەبیب**

**حاڵی مەماتی منە، دیدەنی ڕوویی ڕەقیب (١)**

**شانە لە زوڵفت مەدە، جێی دڵی ئاوارەیە**

**حەیفە، بلا تێکنەچێ مەنزڵی میسکینغەریب (٢)**

**غەیری لەبت، کێ دەکا چارەیی دەردی دڵم؟**

**نەبضی من و دەردی من، دوورە لە سەعْیی طەبیب (٣)**

**دیدەنی ئەبروویی تۆ، فیتنەیی شەهری صەفەر**

**دیدەیی جادوویی تۆ، مایەیی حیلە و فەریب (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، ه، غ، ج، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: بەسیتی هەشتیی مەتویی موززال.

(١) واتە: ئاوی حەیاتی من ماچکردنی لێوی یارە، ئەگەر ماچی بکەم نامرم و ژیانی بۆ دەنووسرێ. بەوەیش دەمرم کە چاوم بە ڕوخساری بەدکارەکەی نێوان خۆم و یار بکەوێ.

ئابی (کم، گم): ئاوی. لێوی حەبیب (گم): لێوی ڕەقیب.

(٢) ئەم بەیتە لە (ق)دا سێیەمە.

ئاوارە: بێجێوڕێ. بلا: با، لێگەڕێ، واز بێنە.

واتە: دیارە مادام شوێنی هەمیشەیی دڵی عاشق پێچولوولی ئەگریجەی یارە و لەوێ جێگیرە، حەز ناکا شانەی لێ بکەوێ، نەبادا دڵی بەدەم باوە بچێ و لانەی لێ بشێوێ و سەرگەردان بێ.

بلا تێکنەچێ (غ، کم، گم): مەشێوێنە سا. مەنزڵی (کم): مەسکەن. میسکین (گم): مسکینی. لەنگە.

(٣) ئەم بەیتە لە (ق)دا دووەمە.

نەبض: لێدانی دڵ.

واتە: لە ماچی لێوی تۆ بەولاوە، کێ چارەی دەردی دڵی من دەکا؟ من دەردم زۆر گرانە. بە هەوڵدانی پزیشکیش، نە نەبزی من دەگیرێ تا بزانرێ لە چ حاڵێکدام و نە چارەی دەردم دەکرێ.

دەکا (کم): ئەکا. نەبضی (ق): نەبظی. هەڵەیە. دەردی من (ه): ڕوویی من. (ج، غ): ڕەنگی من. سەعیی (ج، غ، کم، گم): فیکری.

(٤) دیدەن: بینین. شەهری صەفەر: مانگی صەفەر، گوایە مانگێکی شوومە، بەتایبەت

**ڕەونەقی گوڵشەن دەچێ، شاهیدی گوڵ ون دەبێ**
**ئاخری ماهی بەهار قوڕ بە سەری عەندەلیب (٥)**
**ئاخری دێ هەردولا، دەوڵەت و بێدەوڵەتی**
**پەیکی فەنا طەی دەکا، هەرچی فەراز و نەشیب (٦)**
**کوفرە ئەگەر دەرکەوێ! ڕەخنەیە بۆ دین و دڵ!**
**سوجدە لە ڕووی تۆ دەکەن، قاضیی و شێخ و نەقیب (٧)**

کوڵەچوارشەممەکەی دوای! حیلە: فێڵ. فەریب: فریو. سالم مەبەستیەتی بڕۆی کەوانەشێوەی یار لەگەڵ مانگی سەفەردا بگونجێنێ.

واتە: بینینی برۆی تۆ فیتنە و ئاشووبی مانگی شوومی سەفەرە کە یەکێکە لە مانگەکانی ساڵی کۆچی. هەروەها بینینی سیحرەکانی تۆ کە لە عاشقەکانتی دەکەی، فێڵلێکردن و فریودانیانە پێی.

دیدەنی ئەبروویی (ج): دیدەیی ئەبرۆیی. هەڵەیە. (کم، گم): دیدەوو ئەبروویی. شەهری (ج، کم، گم): ماهی.

(٥) ڕەونەق: ڕەنگ و ڕوو. گوڵشەن: باخ و گوڵزار. شاهید: یار، دۆست. ماه: مانگ، عەندەلیب: بولبول.

واتە: کۆتایی مانگی بەهار کە گوڵشەن ڕەنگ و ڕووی نەما، ئیتر گوڵیش وەك بەڵگەیەکی هەبوونی گوڵشەن نامێنێ و ون دەبێ. بۆیە قوڕ بە سەری بولبول کە گوڵی لە ئارادا بۆ نامێنێ.

دەچێ.. دەبێ (کم): ئەچێ.. ئەبێ.

(٦) دەوڵەت: دەسەڵات، سامان. بێدەوڵەتی: هەژاری، بێدەسەڵاتی. پەیك: نامەبەر، تەتەر. فەنا: مردن، لەناوچوون. طەی: پێچانەوە. فەراز: هەوراز، بەرزی، لەند. نەشیب: نزمی، کەند.

واتە: ئەوی دەسەڵاتی هەیە یا بێدەسەڵاتە، دوا جار هەر کۆتایی دێ. تەتەری لەناوبردن بەرزایی و نزمایی پێکەوە دەپێچێتەوە.

دێ (مان): وێ. (گم): دەی. هەڵەن. فەنا (هـ): هەموو. (غ، کم، گم): ئەجەل دەکا (کم): ئەکا.

(٧) ڕەخنە: شکست، کەلوکۆمی، عەیبداری. قاضی: دادوەری شەرع. نەقیب: سەرەك، سەرگەورە، سەرپەرشت، ئەوی بەدوای حاڵ و باری موسوڵماناندا دەچێ.

واتە: ئەگەر بۆ عاشقانت دەربکەوی و لایەکیان لێ بکەیتەوە، وای دادەنێی کوفرە و شکست و نوشوستییە بۆ دین و دڵ، کەچی قازی و شێخ و نەقیب، کە نوێنەری ئایینن، هەموو کڕنووشت بۆ دەبەن!

**ضیددی یەکن یەك بە یەك، نار و خەس، ئاب و نەمەك**
**شاهید و عەهد و وەفا، "سالم" و صەبر و شەکیب!** (٨)

دین و دڵ (ج): کاری من. (کم): کاری دین. دەکەن (عا، ه، ج): دەبەن. (کم): ئەکەن. (ق): دەکە. هەڵەی نووسینە.

ئەگەرچی نیوەدێڕی دووەم لەم بەیتەدا بەم شێوەیەیە: «سوجدە لە ڕووی تۆ دەکەن..»، ئێمە پێمان وایە ئەوە هەڵەی نووسینە و هەر دەبێ «سوجدە لە ڕووی تۆ دەبەن..» بێ.

(٨) ضید: دژ. نار: ئاگر. خەس: کا و پووش و پەڵاش. ئاب: ئاو. نەمەك: خوێ. شەکیب: ئۆقرە، خۆگری.

واتە: ئاگر و پووش و پەڵاش و ئاو و خوێ، یار و پەیمان و وەفا بەجێهێنان، سالم و خۆگری و ئۆقرەگرتن، دژی یەکن و پێکەوە نایانکرێ.

ضیددی (عا): زیددی. خەس، (کم): خەس و. نەمەك (عا): سەمەك. هەڵەیە، نوونی (نمك)ی لێ بووەتە سینی (سمك)!

(*) -٨-

ڕاسته دڵ حەبسە، وەلێ شادە، لە گێسوویی حەبیب
چونکە نەزدیکە بە دایم لە گوڵی ڕوویی حەبیب (١)
بە دوعا نابێ ڕەوا، حاجەتی ئەربابی نیاز
ڕوویی دڵ تا نەکەنە قیبلەیی ئەبروویی حەبیب (٢)
دیدە شیرینە کە پڕ بێ لە سروشکیی شۆرم،
چونکە تێیدایە لە عەکسا قەدی دڵجوویی حەبیب (٣)
لە طەوافی حەرەمی کەعبەیی ڕوو، حەلقەزەنن
وەکوو حوججاجی حەبەش، سیلسیلەیی موویی حەبیب (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتی مەخبوونی مەقسوور.

(١) حەبس: بەندی. حەبیب: خۆشەویست، یار. نەزدیکە: نزیکە.

واتە: دڵـی سـاڵم، ئەگەرچـی گـیرۆدەی داوی ئەگریجـەی یـارە و لـەوێ بەنـد کـراوە، بـەڵام لەبەرئەوەی کە لە ڕوخساری یارەوە نزیکە، شادمانە.

حەبسە (کم، گم): چەسپە.

(٢) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا چوارەم بەیتە، لە (ق)یشدا نییە.

ئەربابی نیاز: ئەوانەی کە خواستیان هەیە، داماوان. ئەبروو: کینایەیە لە میحراب.

واتە: داماوەکان کاریان بە نزا و پاڕانەوە مەیسەر نابـێ، بەڵکوو پێویـستە ڕووی دڵیـان بکەنـە قیبلەکەیان کە برۆی کەوانیی یارە، ئەمجا مرازیان دێتە دی.

نیاز (حا، کم، گم): وەفا.

(٣) ئەم بەیتە لە (حا)دا چوارەمە.

سروشك: فرمێسك. شۆر: پڕخوێ، سوێر. دڵجوو: دڵخواز، چی دڵ بە دوایدا بگەڕێ.

واتە: چاوم، کە پڕ بـێ لە فرمێسکی سوێر، شـیرین دەبــێ! سـەرتان سـوڕ نەمێنــێ، چـونکە وێنەی باڵای دڵخوازی یاری تێدایە، شیرینە!

(٤) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا سێیەمە.

حوججاج: کۆی (حاج)ە، واتە حاجی. حاجییانی حەبەشـەیی کە ڕەشپێـستن. حەلقەزەنن: ئەڵقەیان

**گەرچی خۆی جازیبە، هەنگامی تەوەججوه، دڵی شێخ**
**وەکوو من جەذبە لە ڕووی دیدەیی جادوویی حەبیب (٥)**
**بێ، بەسەر قیبلەیی دڵما وەرە، ئەی بادی صەبا!**
**بە دەمێ تازە کە ڕۆحم لە فەضای بوویی حەبیب (٦)**

داوە، وەك بازنە دەورەیان داوە.

واتە: چین‌چینی ئەگریجەی ڕەشی یار لە دەوری ڕوخساری نازداری، دەڵێی حاجیانی ڕەش‌پێستی حەبەشن ئەڵقەیان لە دەوری کەعبەی ڕوخساری داوە و تەواف دەکەن. وای بە حاڵی سالم، ئەگریجەی یار خۆی دەوری ڕوومەتی داوە و تەوافی دەکا، دەبێ ئیتر ئەو چی بکا و چۆن بیگاتێ؟!

ڕوو حەلقەزەنن (حا، کم، گم): ئەربابی وەفا. (ق): ڕووی حەلقەزەنن. سیلسیلەیی (کم): سیلسیلەهای.

(٥) تەوەججوه: ڕووتێ‌کردن، لە زاراوەی سۆفییانی نەقشبەندیدا بەوە دەڵێن کە شێخ لە بەردەمی سۆفیی موریدیدا لەسەر چۆك دادەنیشێ و سنگ بە سنگییەوە دەنێ و هەردووکیشیان چاویان دەنووقێنن، دیارە بۆ ئەوەی تەسکینی و خۆشی و خوداناسی بخاتە دەروونیانەوە. جارجاریش مورید لە حاڵی عادەتی دەردەچێ، هاواری لێ بەرز دەبێتەوە و حاڵی لێ دێت، بەم حاڵەتە دەڵێن (جەذبە)، دیارە جاذیب پیرە و مەجذووب موریدە! جاذیب: ڕاکێش، بەکێشکەر. جەذب: ڕاکێشران. جادوو: سیحرباز.

واتە: ئەگەرچی دڵی شێخی نەقشبەندی لە کاتی تەوەججوهدا دڵی موریدەکەی ڕادەکێشێ و حاڵی لێ دێنێ، شوکر ئەویش وەك من بەرامبەر بە چاوی جادووگەری یارم حاڵ گرتوویە! مەسەلە عیشقەکەیە لە هەر دیمەنێکدا بێ!

گەرچی خۆی (گم): گەر خۆی. جازیبە (حا، ق، کم، گم): جاذیبە. ئەم شێوەیە ڕاستە. جەذبە (عا): جەزبە.

(٦) تازە کە: تازە بکە، تازە بکەرەوە! فەضا: پانتایی. بوو: بۆن.

واتە: ئەی بای سەبا! مەردی خودا بە، بەسەر قیبلەی دڵمدا بێ، بەسەر مەنزڵ و دەوروبەری یاردا وەرە، کەمێك لە هەوا و بۆن و بەرامەی ئەوێ لەگەڵ خۆتدا بێنە و بە یەك‌هەناسە گیانم تازە بکەرەوە، مەسیح‌ئاسا گیانی مردووم زیندوو بکەرەوە.

فەضای (گم): قەضای.

**ئاگری جەوری لە خەرمانی وجوودم بەرْبوو**
**قورِ بە سەر "سالم"ی بێچارە لەدەست خوویی حەبیب (٧)**

(٧) وجوود: بوون.

واتە: ئاگری جەور و ستەمی یار لە خەرمانی گیانم بەربوو. ئەی قورِ بەسەر سالمی بێدەسەلاّت لە دەست جەور و ستەمی یار، کە نەیتوانی چارەیەك بۆ خۆی بدۆزێتەوە و خۆی لەو ئاگرە رزگار بکا.

ئەم پارچەیە یەکێکە لە شیعرە کوردییە جوانەکانی سالم.

دەست (کم، گم): دەس.

## پیتی (ت)

### -١- (*)

موحیطی عاریضی دڵبەر لە سەردا زوڵفی پڕچین هات
بە دەوری باغی گوڵدا، تەرزی سونبول، مەحضی پەرژین هات (١)
هەوای ماچی لەبت ڕێی بەندەری زوڵفی بە دڵ ون کرد
موسافیر بۆ سیاحەت سوویی (چین) چوو، تووشی (ماچین) هات (٢)
بە تەم کەللەی (دەماوەند) بوو لە ئاهم، گەردەنەی (ئەلبورز)
بە ڕێی (ڕەی)دا کە قیسمەت ڕۆژی ئەووەڵ بۆ (وەرامین) هات (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، هـ، ق، کم، نم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی موسەببەغ.

(١) موحیط: دەورەدەر. عاریض: ڕوخسار. تەرز: توولّی باریکی تازە.

واتە: ئەگریجەی پڕ چینی یار لە سەردا هاتە خوار و دەوری ڕوخساری گرت. گەندەتووکی ناسك و باریکیشی، هەر بۆ ئەوەی ببێ بە پەرژینی باخی ڕوخساری، بە دەوریدا ڕووا.

دڵبەر لە سەردا (هـ): بە سەردا. لەنگە. (کم، نم، گم): لەسەر ڕوو. تەرزی سونبول مەحضی (هـ): زوڵفی. لەنگە.

(٢) بەندەر: ئەو شوێنە کە کەشتی لەنگەری تێدا دەگرێ. چین: وڵاتی چین کە لە کۆندا بە شارەکانی دەوروبەری (کاشغەر) و (خوتەن) وتراوە، چینی ئەگریجە. ماچین: وڵاتی چینی گەورە، شوێنی ماچ‌کردن کە لێوە.

واتە: ڕێبوار -کە دڵە- چوو بۆ گەشت، تا بگاتە چینی ئەگریجە و بڕوانێتە گوڵزاری ڕوخساری یار، کەچی لە ڕێگا تووشی لێو بوو، هێزی هەوای ماچی لێوی یار سەری لە دڵ تێك دا و ئەو شوێنەی لێ ون کرد کە ئەگریجە لەنگەری تێدا گرتبوو. لە ئەنجامدا دڵ بێ‌شوێن مایەوە!

(بۆ سیاحەت) لە (هـ)دا کەوتووە.

(٣) دەماوەند: بەرزترین لوتکەی زنجیرەچیای ئەلبورزە لە ئێران. ڕەی: شارێکی کۆنی باشووری زنجیرەچیای ئەلبرز و نزیکی باشووری ڕۆژهەڵاتی (تاران)ە. وەرامین: یەکێکە لە شارەکانی سەر بە (ڕەی).

**کەلامی وەصفی حوسنی تۆم دەخۆند، دوێشەو بە تەنهایی**
**لە پەردەی غەیبەوە تا ڕۆژ بە گوێما دەنگی تەحسین هات (٤)**
**دوعام بۆ دەفعی چاوی بەد لە حوسنی تۆ دەکرد، ئەمشەو**
**لە دەم (روح الأمین) تا صوبحْدەم ئاوازی ((ئامین)) هات (٥)**
**حەدیثی کوشتنی "فەرهاد"ی بێکەس، پێت بڵێم: چۆن بوو؟**
**لە شەوقا دای بە سەریا تیشە، وەختێ دەنگی "شیرین" هات (٦)**

واتای ئەم بەیتەمان لا ئاڵۆز بوو. لەوانەیە مەبەستی سالم ئەوە بێ: کە قیسمەت و نسیبم لە ڕۆژی ئەزەلەوە (وەرامین) بوو، بە ڕێی (ڕەی)دا ملەی بەرزی (ئەلبورز) لە تەمدا بە ئاهی گەرمی من وەك لوتکەی (دەماوەند)ی لـێ هات.

بە ڕێی (ڕەی)دا (گم): بەری ڕێدا. هەڵەیە. (ڕۆژی ئەووەڵ) لە (ھ)دا کەوتووە. وەرامین (ھ، کم، نم، گم): دەرامین، هەڵەیە.

(٤) واتە: دوێشەو تا بەیانی بە تەنیا کتێبی جوانیی تۆم دەخوێندەوە، ئاوازی پەسەندکردن و ئافەرین لە پەردەی غەیبەوە دەهاتە گوێم.

دەخۆند (ھ): دەخوێن. (کم، ق، گم): دەخوێند. (دەخۆند) لە (مان)دا بە (دەخوێند)یش دەخوێنرێتەوە.

(٥) ئەم بەیتە لە (ھ)دا نییە.

روح الأمین: جوبرەئیل. ئامین: خودایە! قوبووڵی بکەی.

واتە: ئەمشەو دوعام بۆ کردی کە خودای گەورە لە چاوی پیس بتپارێزێ و بە چاوەوە نەبی. لە دەمی جوبرەئیلەوە تا بەرەبەیان ئاوازی ((ئامین)) دەهاتە گوێم، لە خودای گەورە دەپاڕایەوە نزاکەم قوبووڵ بکا و چاوی بەد کارت تێنەکا.

دەکرد (کم، نم): ئەکرد.

(٦) حەدیث: باس‌وخواس. تیشە: تەشوێ.

واتە: دەزانی چۆن بوو "فەرهاد" خۆی کوشت؟ کە دەنگی "شیرین"ی دڵداری هاتە بەر گوێی، لە عەزرەتدا ئاگای لە خۆی نەما، لەباتیی ئەوەی تەشوێیەکەی لە (بێستوون) بدا، دای بە سەری خۆیدا و بوو بە شەهیدی عیشق.

کوشتنی (گم): کوژتنی. بێکەس (ھ، کم، نم، گم): میسکین. لە شوقا (ق): لە شەوقی. بە سەریا (ھ): بە سەردا.

**هەمیسان کەوتە خوێن زەخمی دڵی "سالم" وەکوو جاران**
**لە سروەی بای سەحەر یەکدەم کە نەفحەی زوڵفی موشکین هات (٧)**

(٧) هەمیسان: دیسان، جارێکیتر. کەوتە خوێن: کەوتە سەر خوێن، تازەبووەوە و هەڵیدایەوە. واتە: سالمیش شتێکی لە فەرهاد گەڕاوەتەوە، کە بۆنی خۆشی ئەگریجەی میسکداری یار بە هۆی سروەی بای بەرەبەیانەوە بەسەریدا هات، زامی دڵی تازە بووەوە و کەوتەوە خوێنلێهاتن.

کەوتە خوێن (هـ، کم، نم، گم): هاتە سوێ. واتە تازە بووەوە. لە سروەی (گم، کم): بە سروەی. نەفحە (مان): نەفخە. هەڵەیە. (هـ): تەحفەی. هەڵەی نووسینە. نەفحە ڕاستە، نەك (نەفخە) کە بۆ ئەم شوێنە دەست نادا.

وا دیارە سالم ئەم پارچەشیعرەیشی هەر لە سەفەری (تاران)دا وتووە.

-٢- (*)

**سا بە زاری بۆ نەناڵێنم لە داغی فیرقەتت؟**

**بەندْ بەندم، نەی‌صیفەت، سووتا بە ناری میحنەتت (١)**

**کەی لە قەبرا، تا بە مەحشەر، دەردەچێ یادت لە دڵ؟**

**زەحمەتە بۆ عاشقی دڵدادە تەرکی صوحبەتت (٢)**

**دێتە خاطر تا لە خوانی حوسنی تۆ حەققی نمەك**

**قەد بە من پایانی نایێ، ذیکری شوکری نیعمەتت (٣)**

**ڕاستە دڵ بەندە لە طوڕڕەی ظوڵمەتی زوڵفت، وەلـێ**

**ڕۆشْنە کولبەم لەبەر شەوقی خەیاڵی ڕوومەتت (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لـە (مان، عا، غ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) زاری: بەکوڵ گریان. بەندبەندم: جومگەجومگەم. نەی‌صیفەت: وەك نەیجە.

واتە: جومگەجومگەی لـەشم بە ئاگری مەینەت، وەك نەیجەلان، سووتا و بوو بە قەرەبرووت. ئیتر چۆن لـە داخی دەردی جیاییت کە ئەمەی بەسەردا هێنام، بە کوڵ نەگریم؟

لـە داغی (کم، گم): لـە تاوی.

(٢) دڵدادە: ئەوەی دڵی داوە بە یار و کردوویەتیە قوربانیی ئەو.

واتە: هەر لـە گۆڕی تەنگ و تارەوە تا سارای مەحشەر، چۆن یادی تۆ لـە دڵم دەردەچێ؟ عاشقێك دڵی دابێ بە یار، هاوڕێیەتی‌نەکردن لـەگەڵ ئەو یارە گرانە. تازە دڵ ناگەڕێتەوە بۆ ناو لـەش، بووە بە سێبەری یار و لێی جیا نابێتەوە.

دەردەچێ (کم): دەرئەچێ. دڵدادە (عا): جاندادە.

(٣) خاطر: بیر. حوسن: جوانی. نمەك: نان و نمەك، یا هەر نمەکی ڕووت.

واتە: من زۆر تێمڕوانیوی و هاتوومەتە سەر خوانی جوانیی تۆ و نمەکگیرت بووم، حەقی نان و نمەکی تۆ -هێندەی لـە بیرمە- گرانە، ناوهێنان و شوکرانەبژێریی ڕۆزیی نیعمەتی تەماشاکردنت هەرگیز نابڕێنەوە و بە من تەواو ناکرێن.

دێتە خاطر تا (عا، غ): بێتە خاطر تا. (کم، گم) بێتە خاطر گەر. قەد (کم، گم): قەت.

(٤) بەند: گیراو، بەستراوە. طوڕڕە: پێچولوول. ظوڵمەت: تاریکی. وەلـێ: بەڵام. کولبە: کەلاوە.

واتە: ڕاستە دڵ لـە تاریکستانی پێچولوولی ئەگریجەتدا بەستراوەتەوە، بەڵام شـادمانە، چونکە کەلاوەی

سوجدەجۆن، وەك بیدی مەجنوون، سەروەها، ئەفگەندەسەر
بۆ تەفەڕڕوج، گەر خەرامان بێ لە باغا قامەتت (٥)
بێڕەمەق وا ئووفْتادەم، طاقەتی نالّەم نییە
ئەی تەوانا! بۆ ضەعیفان، کوانێ ئاخر مروەتت! (٦)
تەرکی دامەنگرتنی دلّبەر نەکەی "سالم" بە مەرگ!
نامەوێ بڕوێ گیای بێخار لە خاکی توربەتت (٧)

دلّی بە شەوقدانەوەی خەیالّی ڕوخسارت ڕووناکە! ئەی ئەگەر شەوقدانەوەی ڕوخسارەکە خۆی بێ، چۆن دەبێ؟ دیارە دەبێتە چراخان!

(٥) سوجدەجۆ: ئارەزوومەندی کوڕنووشبردن. بیدی مەجنوون: شۆڕەبی، ئەو جۆرە بییەی کە لقەکانی بەرەو زەوی شۆڕدەبنەوە. سەروەها: سەروەکان. ئەفگەندەسەر: سەردانەواندوو. تەفەڕڕوج: گەشت و سەیران. خەرامان: بەلارولەنجە، ئەوی بە لەنجە و ناز بە ڕێدا بڕوا.

واتە: ئەگەر بالآت بە لارولەنجە و نازەوە بێتە ناو باخ بۆ گەشت و سەیران، سەروە بالآرێکەکان وەك شۆڕەبی سەر دادەنەوێنن و کوڕنووشی بۆ دەبەن.

سوجدەجۆن (غ، کم، گم): سوجدەچۆن. گەر خەرامان بێ (عا): ئەر نومایان بێ. (کم، گم): گەر نمایان کەی.

(٦) بێڕەمەق: گیانتێدانەبوو. ئووفتادە: لەپێکەوتوو. تەوانا: بەهێز، بەدەسەلآت. مروەت: پیاوەتی، جوامێری.

واتە: تەنانەت بە بێتوانایی لـێکەوتووم و هێزی نالّینیشم نییە، تا کەسێك گوێی لێم بێ و بێ بە دەنگمەوە! ئەی یاری بەهێز و توانا! کوا جوامێریت لەگەلّ داماوان؟!

وا ئووفتادەم تاقەتی (کم، گم): وا کەوتووم من قووەتی. تەوانا (ج، کم، گم): نیگارا.

(٧) دامەنگرتن: دەستەوداوێنبوون، کینایەیە لە گرفتاری. خار: دڕك. توربەت: خاك، مەبەستی لە گۆڕە.

واتە: سالم! بە مەرگیش، یا تا مەرگیش، نەکەی دەست لە داوێنی دلّبەر بەربدەی، وەك دڕك پێیەوە بنووسێ و لێی مەبەرەوە. نامەوێ گیا و سەوزەی بێدڕك لەسەر گۆڕەکەت بڕوێ. زۆر جوانە، داوێنگیرییەکەی، عیشقە مالّوێرانکەرەکەی، دەبێ وەك دڕك بێ، تا شوێنەواری لەسەر گۆڕەکەت بمێنێ.

تەرکی دامەنگرتنی دلّبەر نەکەی (گم): هەرکی دامەن گرتنی دلّبەر نەکا. نامەوێ (گم): نایەوێ.

-٣- (*)

**چ بڵێم، برا!؟ بە قورئان، حەیرانە دڵ لە کارت**
**ڕیتی تەعەششوقی پوول پەیمانەیی قەرارت! (١)**
**پەڕ دەردەکەی لە شەوقا، پەروانەیی لە پێی پوول**
**بەرقی طەلایی مەسکووک شەمعی شەبانی تارت (٢)**
**تۆ بولبولی پەرێشان، گوڵ پوول و کیسە بوستان!**
**نیوقازەکانی (تاران)، نەوغونچەیی بەهارت (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ن)دا هەیە. سالم ئەمەی بۆ کێ نووسیوە؟ لە کوێ نووسیویە؟ دیار نین، ئەگەرچی لەوانەیە لە تاران وتبێتی و لەگەڵ یەکێك قسە بکا خەرجی بۆ "سالم" کردبێ و ژیانی خرابێتە ئەستۆی ئەو. ئەو زەلامە، وەك لە ناوەڕۆکی شیعرەکەیشەوە دەردەکەوێ، پارەپیس و دەستنووقاو بووە. پارچەشیعرەکە هیچ ناوونیشانێکیشی تێدا نییە، شوێنی ناوونیشانەکە لە دەستنووسەکەدا سپی بوو.

کێشی عەرووز: موزاریعی هەشتی ئەخرەب.

(١) ڕیتی: ڕشتی. تەعەششوقی پوول: حەزلەپارەکردن. پەیمانە: پیاڵەی پڕ لە شەراب، لێرە بە مەجاز بەکاریهێناوە بۆ بەڵێن و پەیمان. قەرار: بڕیار و گفت.

واتە: چ بڵێم؟ سەرسامم لە کارت، هیچ نەماوە بیڵێم، ئەوە نەبێ کە پارەپیسی و حەزلەپارەکردنت، وای کرد هەرچی پەیمان و بەڵێنێکت هەبوو، هەمووت شکاند، وەك ڕشتنی شەراب و ئاوی ناو پیاڵە.

(٢) پەڕ دەردەکەی لە شەوقا: ڕستەیەکە بۆ نیشاندانی ئەوپەڕی کەیفخۆشی، یانێ بە عەزرەتەوەی. لە پێی پووڵ: لە پێناوی پارەدا. بەرق: برووسکە. طەلایی: زێڕین، ئاڵتوونی. مەسکووك: سکەی لێدراو، پارە. شەمع: شەم، مۆم. شەبانی تارت: شەوانی تاریکت.

واتە: زۆر شادمان دەبی کە پارەت بەرچاو دەکەوێ، وەك پەروانە بە دەوری پارەدا دەسووڕێیتەوە. ورشەی سککەی ئاڵتوونی چرای شەوانی تاریکتە و دڵت ڕووناك دەکاتەوە، یا کە دەیانژمێری دڵت ڕوون دەبێتەوە!

(٣) نیوقاز: کەمترین پارەی سەردەمی قاجاری بووە، ١٠ قاز کردوویەتیە ١ شاهی و کۆنیش (غازێگی)ی پێ وتراوە.

واتە: تۆ بولبولی پەرێشانحاڵی و هەمیشە دەچریکێنی، بۆ پارە، نەك بۆ گوڵ! گوڵی تۆ پارەیە و باخ و گوڵزارت کیسەی پارەیە، نیوقازەکانی تاران تازەخونچەی بەهاری تۆن.

**مەعشووقە یەك تومانی، جانانە دووهەزاری**
**صاحێبقڕانە پیرت، مانووتە یاری غارت (٤)**
**پوولێ بەرابەری تۆ، کێشاویە دڵبەری تۆ**
**تا پوولە دڵبەری تۆ، چۆن من دەبم بە یارت (٥)**
**ڕووبەندەپۆشی کیسەت ئاغۆشی چەند کەسی دی؟!**
**وەك یاری من، هەتا سەر، موشکیل ببێ بە یارت (٦)**
**مەحجووبەکەی کە شەبها غەڵـطانی باخەڵت بوو،**
**باقڵ بە میلی بەققال خاڵی دەکا کەنارت (٧)**

(٤) تومان: گەورەترین پارەی زێڕی سەردەمی قاجاری. قڕان: پارەیەکی زیوی قاجاری، دەیەکی تومان و پێنج عەباسی یا بیست شاهی بووە. غار: ئەشکەوت.

واتە: یاری تۆ یەك تمەنییە، دڵبەری زۆر گەورە و گرنگت دووهەزار تمەنی و پیر و شێخت ئەوەیە کە خاوەنقڕان بێ. دۆستی هەرە نزیکت بە دەستتەوە ماندووە. (صاحێبقڕان) ناسناوی بنەماڵەکەی سالمیشە.

(٥) واتە: تۆ هەمیشە لە خەیاڵی پارە و پوولدای. ئیتر تا تۆ ئەمە بەزمت بێ، من چۆن بمە دۆستت!

(٦) ڕووبەندەپۆش: ئەوەی ڕووی پێ دادەپۆشرێ، چارشێو. ئاغۆش: باوەش. موشکیل: زەحمەت.

واتە: کیسە پارەکەت، کە چارشێوی پۆشیوە و خۆی شاردووەتەوە، باوەشی چەند کەسێکیتریشی دیوە؟ دیارە کیسەی پارە و پوول دەستاودەست دەکرێ و تاسەر لای کەس نامێنێتەوە. حیسابی ئاڵتوون و زیو، کۆن لە سەردەمی قاجاری و عوسمانیدا بە کیسە بووە. جا "سالم" دەڵێ: ئەو کیسەی پارەیەی تۆ زەحمەتە، وەك یاری من، تاسەر یارت بێ. یا: وەك یاری من بۆ من نییە، کیسەکەی تۆیش تاسەر بۆ تۆ نابێ. ڕووبەندەپۆش و باوەش بۆ ئافرەتی بێبار و خراپ گونجاوە، سالمیش کیسە پارەکەی کابرای بەوان شوبهاندووە.

(٧) مەحجووبە: ئافرەتی خۆپیشاننەدەری لەماڵدەرنەچوو. شەبها: شەوان، گەلێ شەو. غەڵتان: خەڵتان، تێکەڵ. باقڵ: وا بزانم. میلی بەققال: میلی ترازووی بەقاڵ، لێرەدا کینایەیشە لە دەعباکەی بەقاڵ! کەنار: باوەش، کۆش.

واتە: ئەو کیسە داپۆشراوەی لـەمەڕ تۆ، کە خەڵك ناوچاوانی نابینن و چەندەها شەو لە باخەڵتدا و تێکەڵت بوو، وابزانم بە هێزی میلی ترازووی بەقاڵ کە دەیکێشێ، یا بە ئارەزووی بەقاڵ کە پێت دەفرۆشێ، باوەشت چۆڵ دەکا. ئیتر نۆرەی باوەشی یەکێکیترە!!

داخۆ قەدیم چ ڕەندیٚ نیمدانگی بردبیٚ لێی؟
گوێی کەل بووە بە میقراض، مەستووری نازدارت! (٨)
ئیتر بە چاوی تەمکین مەیڕوانەریٚ لە وەزنا
صەڕراف بە سووکی هانی، سەنگینی باویقارت (٩)
سیٚ‌صەد نیقابی دێبا، گەر بۆی دروست کەی، ئاخر
بیٚ‌پەردە دێتە بازاڕ، خاتوونی پەردەدارت (١٠)
بازووتە هەردوو جێی پوول، زانیومە چەند عەزیزن؟!
(مودخەل) فیدای یەمینت، (ئەشعەث) فیدای یەسارت! (١١)

(٨) ڕەند: فێڵباز، زرنگ، بیٚ‌باك. نیمدانگ: نیودانگ، دانگ: شەشیەکی مسقاڵ، هەشت حەببە، بۆ کێشانەی زێڕ و زیو بەکاردەهێنریٚ، شەشیەکی موڵك یا پارەیشە. میقراض: مەقەست. مەستوور: داپۆشراو، مەبەست پارەکەیە لە کیسەدا.

واتە: داخۆ چ شۆخێکی زرنگ و فێڵباز کاتی کێشانە و مامەڵە نیودانگی لە پارەی ناو توورەکە داپۆشراوەکەتی دزییێ؟ ئێستا گوێی بە مەقەست کەل کراوە و نەختێکی لیٚ بڕراوە! ئاخۆ توورەکە کەل دەکریٚ؟ دەبیٚ ئەمە زاراوەی ئەوسای ئەربابی کیسە و پارە بوو‌بیٚ!

(٩) تەمکین: بەڕێز و دامەزراو. صەڕراف: پارەگۆڕەوە. سەنگین: قورس. باویقار: پایەبەرز، سەنگین، مەبەستی لە کیسەی پارەکەیەتی لە قاڵبێکی‌تردا!

واتە: بە چاوی ڕێز مەڕوانەرە کێشی کیسەکەت، ئەو قورسە نییە، پارەگۆڕەوە قورسە بەویقارەکە تۆی لە کاتی کێشانەدا بە سووك کێشا!

(هانی) لە (مان)دا نوختەی (ن)ەکەی نەنووسراوە.

(١٠) نیقاب: ڕووپۆش. دێبا: قوماشی ئاوریشمین. پەردەدار: ئافرەتێك دەرگاوانی هەبیٚ.

واتە: خانمی بەشکۆی کیسەی نامووبارەك، ئەگەر سیٚ‌سەد ڕووپۆشی ئاوریشمینی بۆ دروست بکەی، ئاخری هەر پەت دەپچڕیٚ و ئاشکرا و بە تەنیا دێتە بازاڕ! پارەی شوبهاندووە بە ئافرەتی بارگۆڕی سەربەدەرەوە.

(ئاخر) لە (ن)دا کەوتووە.

(١١) بازوو: باڵ. مودخەل: ڕژد و پارەپیس (ڕەنگە ناوی یەکێکی بەناووبانگیش بوو‌بیٚ). ئەشعەث: ناوی زەلامێکی کۆنی پارەپیس و پوولەکی بووە. یەمین: ڕاست. یەسار: چەپ.

**نەقڵی مەواجیبی کۆن هێناومە ناو، وتت: ئۆف!**
**ساڵێکە من دەکێشم، خەرجیی هەموو نەهارت (١٢)**
**دەموت: ئەرێ برادەر! ئەمساڵ مەواجیبم کوا؟!**
**دەدوت: بڵا حیساب کەم ئالیکی ئەسپی پارت! (١٣)**
**دەموت: لە پووڵی قوللوغ، قیسمەت بە ئێمە ناگا**
**دەدوت: ئەویش لەباتیی نان و پەنیری شارت! (١٤)**
**دەموت: لە قیسطی سەرطان نادەی حیسابی جەوزا؟**
**دەدوت: لەپێی چ بوو دام ئەو خەرجەکەی بەهارت؟! (١٥)**

ڕەنگە ئەو سەردەمە پارە و پووڵ وەك بازیەند بەستڕابێتە قۆڵ! بۆیە وتوویە: هەردوو بازووت جێی پارەکەتن و لەوێ قایمت کردوون، دەزانم لەبەرئەوە زۆر خۆشتدەوێن! منیش هەر ئەوەم لەدەست دێ بڵێم: (مودخەل) بە قوربانی بازووی ڕاستت و "ئەشعەث" بە قوربانی بازووی چەپت بێ، چونکە لە ڕژدی و پارەپیسیدا گرەوت لە هەردووکیان بردووەتەوە!

(١٢) نەقڵ: مەسەلە، بەسەرهات. مەواجیب: مووچە. نەهار: فراوین، نانی نیوەڕۆ.

واتە: مەسەلە و حیسابی مووچەی کۆنم باس کرد، ویستم بزانم چیت بۆ خەرج کردووم، وتت: ئۆف، خودا مەرگ، ساڵێکە من خەرجیی هەموو نانی نیوەڕۆتم کێشاوە، حیسابی چیم لەگەڵ دەکەی؟!

(١٣) بڵا: لــێگەڕێ، با.

واتە: کە لێتم دەپرسی و دەموت: برادەر! مووچەی ئەمساڵم کوا؟ دەتوت: با حیسابی خەرجیی ئالیکی پاری ئەسپەکەت بکەم و لێی دابشکێنم!

دەموت (ن): دەمگوت. دەدوت (ن): دەدگوت. ئەم دوو وشەیەی نوسخەی (ن) لە بەیتەکانیتریشدا بەو شێوەیەن.

(١٤) قوللوغ: قوللوق، بەرتیل، پارەیەك کە کارمەندی دەوڵەتی بەرامبەر بە ڕاییکردنی کارێك لە یەکێکی وەربگرێ. قیسمەت: بەش.

واتە: کە دەموت– ئەی لە پارەی بەرتیلی وەرگیراو هیچمان بەرناکەوێ؟ دەتوت– ئەویش لەباتیی نرخی نان و پەنیری پارت!

(بە ئێمە)، نوختەی پیتی (ب)ی لە (مان)دا کەوتووە.

(١٥) قیسط: بەش، پشك. سەرطان: چوارەم کەلوو (بورج)ی هەر دوازدە کەلووی ئاسمانە بەرامبەر بەچوارەممانگی ساڵی هەتاوی (پووشپەڕ– یەکەم مانگی هاوین). جەوزا: سێیەم کەلووی ئاسمانی کە بەرامبەر

پەشمەك دەبا وتم: دڵ، دەدوت: بە نۆشی جانت
دەموت: گرانە نرخی، دەدوت: بە زەهری مارت (١٦)
ئەو ڕۆژە پێم وتی: بێ، پوولێ بدەین بە شەربەت
دەدوت: منی تەواو کرد، تەکلیفی بێشومارت! (١٧)
باری حیسابی بێجا ناڵێم بە چنگی تۆ بوو
چەنگاڵی تەنگْچەشمی بردوویە ئیختیارت! (١٨)
سالم! کلیدە گریان بۆ قوفڵی مەخزەنی دڵ
سا دەی بڕێژە صەحرا لوولوویی شاهْوارت (١٩)

بە سێیەم مانگی ساڵی هەتاوی (جۆزەردان– دوا مانگی بەهار)یە.

واتە: کە دەموت– ئەی حیسابی کەلووی جەوزام لە بەشە مووچەی کەلووی سەرەتان نادەیتێ؟ دەتوت: ئەی خەرجییەکانی بەهاری پارت لەسەر چ حیسابێك بوون! یانێ هەر زوو حیسابی سەرەتانت وەرگرتووە.

(سەرطان) لەبەر ڕاستکردنەوەی کێش وا وتراوە، دەنا ڕاستەکەی (سەرەطان)ە.

(١٦) پەشمەك: جۆرە شیرینییەکە.

واتە: وتم: دڵم حەز لە پەشمەك دەکا، وتت: فەرموو، نۆشی گیانت بێ، وات دەزانی پارەم پێیە و خۆم دەیکڕم! کە وتم: نرخی گرانە، وتت: بە ژەهری مارت بێ، بۆ چیتە؟!

وتم (ن): گوتم.

(١٧) بێ: وەرە. بێشومار: لەڕادەبەدەر، زۆر.

واتە: کە ئەو ڕۆژە داوام لێ کردی بێی و پارەیەك بدەی بە شەربەت، دەتوت: تۆ ئەوەندە ڕووت لێ ناوم بۆ پارە خەرجکردن، نابووتت کردووم.

وتی (ن): گوتی.

(١٨) باری: کاروباری، یا بارێ: بارێك، جارێك (بە فارسی). بێجا: بێجێ و بێمانا. چەنگاڵ: چنگ و پەنجەی دڕندە. تەنگچەشمی (تنگچشمی): بەرچاوتەنگی (بە فارسی)، کینایەیە لە ڕژدی.

واتە: ناڵێم کاروباری، یا جارێك، یان بارێك، حیسابی بێمانا و ناڕێکوپێك بە دەستی تۆ بوو. نەخێر، چونکە چنگ و پەنجەی بەرچاوتەنگی و ڕژدیت دەسەڵاتیان لــێ سەندووی!

(١٩) کلید: کلیل. لوولوو: مرواری، مەبەستی فرمێسکیەتی. شاهوار: شاهانە، گرانبەها.

**ئەی دیدە! بێنە چابوك مەرجان و دوڕ بە دامەن**
**با هەڵگرن حەریصان ئوفتادەیی نیثارت (٢٠)**
**"سالم" ئەگەر طەڵەب کەی "ئەشعەث" بە کۆمەکی کار**
**وەك کیسەپوولی (مودخەل)، صەد عوقدە دێتە کارت! (٢١)**

واتە: سالم! کلیلی دەرگای کۆگای دڵ گریانە، گریان باری دڵ سووك دەکا و کەمێك دەیکاتەوە. دەسا فرمێسکی وەك مرواریت کە مرواریی شاهانەیە، بڕێژە دەشت و سارا.

لوولوویی (ن): لوئلوئی.

(٢٠) چابوك: گورج و چالاك. مەرجان و دوڕ: فرمێسکی سوور و سپی. حەریص: بەهەڵپە، تەماعکار. ئوفتادە: کەوتوو. نیثار: پایەنداز، پێشکەش.

واتە: تۆیش ئەی چاو! گورج پڕی داوێنم بکە لە مەرجانی سوور و گەوهەری سپی، با چاوبرسییان باخەڵیان لە پێشکەشیی بڵاوکراوەت پڕبکەن! مادام مەسەلە ڕژدیی کابرای مەسرەفچییە، قسەکەی بەجێیە. سەرەڕای ئەوە، ناحەزە ڕژدەکانی وەك خاوەنباخەڵی پڕ، بە گریانی ئەو شادمان دەبن.

(٢١) عوقدە: گرێ.

واتە: سالم! لەم ڕۆژە ڕەشەدا ڕوو لە کێ دەکەی؟ ئەگەر داوای یارمەتی لە هەر ئەشعەثێکی ئەم ڕۆژە بکەی، وەك کیسەپارە پڕ لە گرێکوێرەکەی (مودخەل)، هەزار گرێ دێتە ڕێت، کەواتە سەبر و سەربەرزی لە هەموو شتێك چاکترن.

ئێمە وای بۆ دەچین "سالم" ئەم پارچەشیعرەی، سەرەڕای ئاوارەیی و نامۆیی، لە حاڵێکی ماددیی شڕ و بارێکی دەروونیی تایبەتیدا لە سەفەرەکەی تارانیدا وتبێ، کە جارێکیتریش ئاماژەمان بۆ کردووە. هەر بۆیەیش زیاد لە شیعرەکانیتری وشەی فارسیی تێدایە، بەشێك لە قسەکانی لەگەڵ ئەو کابرایە دەردەخەن کە لەم پارچەشیعرەیدا قسەی لەگەڵ کردووە.

(*) -٤-

**هونەرمەندی نییە بۆ دام، ئەگەر یەکدەفعە ماهیی گرت**
**خەمی زوڵفی پەرێشانت بە موو صەددەفعە ماهی گرت (١)**
**هەمیسان ڕووی لە من پۆشی، دریغا، یاری مەحجووبم**
**بە قانوونی قەدیمی، ماهی دووهەفتە پەناهی گرت (٢)**
**تەرەححوم کە، بلا جەورت نەگاتە مەرکەزی ئاخر**
**بڵێن: عاشق لەدەست دڵبەر زەمامی پادشاهیی گرت (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی موسەببەغ.

(١) هونەرمەندی: هونەرنواندن. دام: داو. یەکدەفعە: یەکجار. ماهی: ماسی. خەم: پێچولوول. ماه: مانگ.

واتە: داو، ئەگەر جارێك ماسیی گرت، هونەری نەنواندووە. پێچولوولی ئەگریجەی ئاڵۆزی تۆ سەد جار مانگی گرتووە، واتە ڕوخسارتی داپۆشیوە و داگیری کردووە!

بەراوردەکە زۆر بەهێز نییە و زیاتر لە مەتەڵ دەچێ، چونکە نە داو تەنیا جارێك ماسیی گرتووە، نە پێچی ئەگریجەیش بە موو مانگی گرتووە و نە گرتنەکانیش یەکچەشنن، لە پێشەوە گرتنە و دوایی داپۆشین و داگیرکردن.

صەد (کم، گم): سەد.

(٢) هەمیسان: دووبارە. دریغا: داخەکەم. مەحجووب: شەرمن. ماهی دووهەفتە: مانگی چواردە.

واتە: داخەکەم جارێکیتر یاری شەرمنم ڕووی لە من شاردەوە! مانگی چواردە -بەپێی ئەفسانەی پێشینان- پەنای گرت. مانگەکە ڕوخساری یارە.

بەدەر لە بەهێزی و بێهێزیی ئەم بەراوردە، تەنیا ئەوەندە دەڵێین: مانگی چواردە مەگەر بە گیران پەنا بگرێ و پەناگرتنەکەیشی نایابە! بەڵام ڕوخساری یار، دەزانێ چەندەهەم جارە خۆی دەشارێتەوە!

(٣) ئەم بەیتە لە (کم)دا چوارەمە.

تەرەححوم: بەزەیی، ڕەحمکردن. بلا: با، واز بێنە. جەور: ستەم. مەرکەزی ئاخر: ئەوپەڕی، دوا پلەی. زەمام: جڵەو.

واتە: ڕەحم پێ بکە و وازم لێ بێنە، با ستەمت نەگاتە ئەوپەڕی و خەڵك بڵێن عاشق جڵەوی پادشای گرت و سکاڵای ستەمی تۆی لا کرد. ئەڵبەت پادشاکە هەر یار خۆیەتی. یانێ تا لای خۆی

**لە توهمەت، تا تەوانا بێ، ((حذر کن))، ئەی ڕەقیب ئامان!**
**لە دامەنپاکیی مووسا زەمین صاحێبگوناهی گرت (٤)**
**لە قوربی قافڵەی دونیا، موکەممەل، دوشمنە ئیبلیس**
**بە هوشیاری بڕۆ "سالم"، کە دوشمن دەوری ڕاهی گرت (٥)**

شکات لە خۆی دەکا! یا مەبەست ئەوەیە: عاشق، بە هۆی ستەمی زۆری دڵبەرەوە، جڵەوی پادشایەتیی لێ سەند و گرتیە دەستی خۆی!

دوور نییە (نەگاتە) (بگاتە) بووبێ، کە لەگەڵ (بلا) گونجاوە. ڕەنگە وشەی (ئاخر)یش لە ڕووی ماناوە لەسەر نیوەی دووەم بێ و لەباتیی (مەرکەزی) بێ و مەرکەزێ بخوێنینەوە.

بلا (کم، گم): بەلا و. ئاخر (گم): تاخیر. لە دەست دڵبەر (ق): لەتاو ظوڵمت.

(٤) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا بەیتی سێیەمە.

توهمەت: بوختان. حذر کن: ڕستەیەکی فارسییە، یانێ وریا بە، خۆت بپارێزە. تا تەوانا بێ: تا توانایی هەبێ، تا بکرێ. یا تا تەوانا بی: تا بتوانی. ڕەقیب: بەدکار.

واتە: ئامان سەد ئامان، ئەی بەدکار واز لە تاوان هەڵبەستن و بوختانکردن بێنە. نەتبیستووە ئەوەی بوختانی بۆ حەزرەتی مووسا هەڵبەست و وتی: دەستی بۆ کچێ بردووە، چۆن زەوی گرتی و بوختانەکەی دەرخست؟ سالم حەز ناکا ڕەقیبەکەی تووش بێ!

حذرکن (کون) (کم، گم): حذر کەن. هی (مان) بە تەواوتر دەزانرێ، چونکە قسەلەگەڵکراو یەکێکە، کۆ نییە. (ق): خودا کەی. ڕەقیب (کم، گم): ڕەفیق!

(٥) قورب: نزیکی. قافڵە: کاروان. موکەممەل: تەواوکراو. ئیبلیس: شەیتان. ڕاه: ڕێ.

واتە: مەترسی لە ڕێدایە، شەیتانی دوژمن بەتەواوی خۆی لە نزیکی کاروانی دیندا قایم کردووە. سالم بە وریایی بڕۆ! دوژمن دەوری ڕێی گرتووە.

ئەگەر مەبەست لە قافڵە کاروانی عاشقان و لە دین یار و لە ئیبلیس بەدکار نەبێ، بەیتەکە هیچ جۆرە پێوەندییەکی مەعنەویی لەگەڵ چوار بەیتەکانی پێشوو نابێ. سالم شتیوایشی لەدەست دێ، ئەگریجەی یار بکاتە شەیتان و ڕوخساری بە دین. ئەو، جاری وا هەیە کردوویەتیە قەلەڕەش! شەیتان -هەر هیچ نەبێ- چەردەیەك هەڵخەڵەتاندنی تێدایە و بۆ بابەتەکە لەبارە. ئەوا لێرەیش ئەگریجەی شەیتان گەمارۆی ڕوخساری داوە!

دونیا (کم،گم): عوقبا. دوشمنە (کم، گم): دوژمنە. دوشمن دەوری (کم، گم): دوژمن ئەصڵی.

## -٥- (*)

دڵی پڕوەحشەتم، جانا! لەبەر موژگانی وەك تیرت
حەصاری بوو، لە حەلقەی دەرهەمی گێسوویی زەنجیرت (١)
لە سەعیی هاتوچۆدای، ئەی خەیاڵی غەمزە! دەیزانم
نیهانی بۆ شەبەیخوونی دڵە، دووبارە تەدبیرت! (٢)
میانت بەستووە، تورکانە، بۆ قەتلم لە مەستیدا
تەحەممول کە زەمانێ، تا ببۆسم دەستوشەمشیرت (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، غ، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) موژگان: کۆی موژە، برژانگ. حەصاری: خۆلەشوورەدا قایمکردوو، کەسێك خۆی لە ترسی دوژمن قایم کردبێ. دەرهەم: تێکەڵ و ئاڵۆز. گێسوو: ئەگریجە، زوڵف.

واتە: گیانە، دڵی سالم تەنگ و تار و خەفەتبارە، لە ترسی تیری برژانگی یار خۆی لە پێچولوولی ئەگریجەی وەك زنجیریدا حەشار داوە. جاران دڵی سالم خۆی لەوێ مات دەکرد، تا تەماشای گوڵزاری ڕوخساری یار بکا، بە ئاواتەوە بوو شانە ئاوارەی نەکا و نەیدا بە دەم باوە! وا ئێستا لە ترسی تیری برژانگ، هەر لەوێ خۆی شاردووەتەوە!

حەصاری (عا، کم): حەساری. (گم): حەسارێ.

(٢) سەعی: کۆشش. نیهانی: بە نهێنی. شەبەیخوون: هێرشی لەپڕ و غافڵگیرانە.

واتە: ئەی خەیاڵ و نیازی نازی چاوی یار! دەزانم تۆ لە هاتوچۆدای و بە نهێنی خەریکی خۆئامادەکردنی هێرشێکی کوتوپڕی بۆ سەر دڵی ماڵوێرانم.

دوور نییە «خەیاڵی غەمزە» خستنەپاڵی سیفەت (صیفەت) بێ بۆ وەسفکراو (مەوصووف)، واتە: ئەی غەمزەخەیاڵی! ئەی غەمزەمەبەست! دیارە مەبەست یارە.

لە سەعیی هاتوچۆدای، ئەی (کم): لە سەعیی هاتوچۆدا، ئەی. (ق): لە سوی؟ هاتوچۆدایە. (ئەی) لە (غ)دا کەوتووە. دڵە (مان): دڵت، بە هەڵەی زانیوە و نوختەکانی تەواو نەکردووە.

(٣) میان: ناوقەد. میانبەستن: کینایەیە لە خۆئامادەکردن. تورکانە: دڵبەرانە. لە مەستیدا: لە دۆخی مەستیدا. ببۆسم: ماچ بکەم.

واتە: دەزانم خۆت ئامادە کردووە، لە دۆخی مەستیی چاوتدا بمکوژی. جا ئەگەر وایە، تاوێك بوەستە، تا پێش ئەوەی تۆ دەستی خۆت بوەشێنی، من دەستی خۆم بوەشێنم و دەستی شمشێرهەڵگرتووت،

ویداعی جان و دڵ ناکەم، وەلێکین غایلەم زۆرە
لە وەختی ضەربی شەمشێرا ببینم حاڵی تەئخیرت! (٤)
موفەڕڕەح بێ دەماغم، با لە نەفحەی طوڕڕەیی جانان
وەرە ئەی بادی شەبگیری! سەرم قوربانی تەئثیرت (٥)
بە تیرت جەرگم ئەر لەت کەی، ئەبەد تەرکی نەظەر ناکەم
لە مەرگا بۆ تەماشا بازە دایم، چاوی نەخچیرت! (٦)

یـا دەسـتوشمشێرەکەیشت، ماچ بکەم و سـوپاسی بکەم کە سەرفرازم دەکا!

بەستووە (عا): بەستەوە، جوانە. قەتڵم (عا): قەطـڵم! هەڵەیە. دەستوشەمشیرت (کم، گم): دەستیوشمشێرت. ئەوی (مان،عا) جوانترە، چونکە کورد دەڵێ: دەستوخەنجەرت، دەسـتوتفەنگت.

(٤) ویداع: ماڵاوایی. وەلێکین: بەڵام. غایلە: ترس، پەژارە. ضەرب: لێدان. تەئخیر: دواخستن.

واتە: کە دەمکوژی، گیان و دڵمم مەبەست نین، ماڵاوایـیان لـێ ناکەم. بەڵام خەم و پەژارەی ئەوەمە لـە کاتێکدا بتەوێ دەست بوەشێنی، دوا بکەوی و پەشیمان ببیتەوە و نەمکوژی! یا دەترسم دوا بکەوی و زۆر بە کوشتنمەوە خەریك بی و ماندوو ببی.

وەلێکین (کم، گم): وەلاکین. غایلەم (گم): غائیلەم. شمشێرا (غ): شمشێرت. حاڵی (غ، کم، گم): خاڵی. تەئخیرت (ج): تەئثیرت.

(٥) ئەم بەیتە لـە (ق)دا نییە.

موفەڕڕەح: شادکراو. نەفحە: بۆنی خۆش. طوڕڕە: ئەگریجە، زوڵف. جانان: جانانە: دڵبەر. بادی شەبگیری: بای دەمی بەرەبەیانی.

واتە: ئەی سروەی بەرەبەیان! بە قوربانی تین و تاوت بم، وەرە بەلامدا تێپەڕە، تا مێشکم بە بۆنی خۆشی ئەگریجەی یار شادان و ئاوەدان بێ.

نەفحەی (ج، کم): نەفخەی. تەئثیرت (عا): تەئسیرت.

(٦) ئەر: ئەگەر. نەظەر: ڕوانین. بازە: کراوەیە (فارسییە). باز: بازی ڕاو. هەردووکیان مەبەستن. نەخچیر: نێچیر.

واتە: ئەگەر جەرگم بە تیری نیگات لـەت بکەی و بمکوژی، من واز لـە پێداڕوانینت ناهێنم. تۆیش پێت سـەیر نەبێ، چونکە چاوی نێچیرەکەت لـە کاتی کوشتنیشیدا هەر کراوەیە و وەك چاوی باز تیژە. شایانی وتنە، نێچیر لە کاتی کوشتنیدا چاوی بە کراوەیی دەمێنێتەوە، کـەس نیـە چاوی بەیەکدا بنێ. بەڵام چاوەکەی سالم چاوی عاشقانەیە، دەیەوێ لـە کاتی گیاندەرچوونیشدا، کە یار دەیکوژێ، چاوی

**دەزانم فیعلی پەنهانت، ئەگەرچی موئمینی ظاهیر**
**فەریبی من مەدە زاهید! بە تەسبیحات و تەزویرت (٧)**
**بەتەنگ هات، ئەی شەوی ظوڵمەت! دڵی "سالم" لەدەست طوولت!**
**چ بوو نەدشوشت، بە ئاوی صوبحْدەم، ڕوخساری وەك قیرت؟ (٨)**

بە دیداری ئەو یارە نازدارەی ڕوون بیتەوە.

نەخچیرت (کم، گم): نێچیرت.

(٧) پەنهان: نهێنی، ژێربەژێر. مونمین: موسوڵمان. ظاهیر: بە ڕواڵەت. فەریب: فریو، لەخشتەبردن. تەزویر: درۆهەڵبەستن، ساختەکاری.

واتە: ئەی ئامۆژگاریکەری بەدیمەن موسوڵمانی وازلەدنیاهێناو! من بە ویردخوێندن و دووڕوویی و درۆهەڵبەستن لەخشتە مەبە. دەزانم کاری دەروونت چۆنە و لە ناوەوە چۆنی! دڵنیام لە من خراپتر سووتاوی عیشقی!

دەزانم (کم، گم): ئەزانم. موئمینی ظاهیر (کم، گم): موئمینی و عابید. تەذویر (مان، عا، غ): تەزویر، ئەمیان ڕاستە.

(٨) طوول: درێژی، نەبڕاوەیی. نەدشوشت: نەتشوشت، نەتشۆرد. صوبحدەم: کاتی بەرەبەیان.

واتە: ئەی شەوی تاریك! دڵی سالم لە درێژیت تەنگ بووە و گیری خواردووە، بۆچی ڕوخساری ڕەشی وەك قیری خۆت بە بەرەبەیانی وەك ئاوی ڕووناك نەشوشت!

لەدەست (عا): لەبەر. طوولت (ق): جەورت. نەدشوشت (کم، گم): نەتشوشت.

(*) -٦-

**دەست‌وبردی دڵبەری، ئێستە لە غەمزە و ڕووتە ڕاست**
**مەنصەبی شەمشێرداری، بۆ کەچیی ئەبرووتە ڕاست (١)**
**موویی موشکئەفشانی تۆیە باعیثی ئەحواڵی من**
**زەخمی ناسۆری دڵی مەحزوون لە بۆی گێسووتە ڕاست (٢)**
**دەورەیی «ماء الحیاة»ی لەب لە زوڵفی ظوڵمەتە**
**پاسەبانی ئاوی حەیوان خاڵەکەی هیندووتە ڕاست (٣)**
**قووەتی بازوو بەکار نایێ لە وادیی عیشقْتا**
**شێرگیری ناوەکئەفگەن دیدەیی ئاهووتە ڕاست (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، نم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەقسوور.

(١) واتە: دەست‌وبردی دڵبەری و مەشقی عاشقکوژی، تێکڕا لە غەمزە و نەزاکەتی ڕووی تۆوەن. ئەگەر هونەرنواندنی تۆ نەبووایە لە عاشقکوژیدا، هیچ دڵبەرێك وەك تۆ فێری ئەم بەزمە نەدەبوو. پایەی شمشێرداری و شمشێرهەڵگرتن، دیسان شایانی ئەو برۆ کەچانەی تۆیە.

مەنصەبی (نم): مەنبەعی. شەمشێرداری (نم): شەمشێروازی.

(٢) موشکئەفشان: بۆنی میسکبڵاوکەرەوە. باعیث: مایە. زەخم: برین. مەحزوون: خەمبار. بۆ: بۆن. گێسوو: ئەگریجە.

واتە: مووی ئەگریجەی بۆنی میسکبڵاوکەرەوەی تۆیە، بووە بە مایەی خراپیی حاڵی من. زامی ناسۆری خۆشەوەنەبووی دڵی زویرم، هەمووی لە بۆنوبەرامەی ئەگریجەی تۆوەیە.

موویی (نم): مەوجی. زەخمی ناسۆری (نم): زەخم و ناسۆری. (گێسوویە) لە (مان)دا هەڵەی نووسینە (گێسووتە) ڕاستە.

(٣) ئەم بەیتە هەر لە (نم)دا هەیە.

دەورە: خول، سوور. ماء الحیاة: ئاوی حەیوان، ئاوی ژیان. لەب: لێو. ظوڵمەت: تاریکی. پاسەبان: پاسەوان. هیندوو: ڕەش.

واتە: ئەگریجەی ڕەشت دەوری سەرچاوەی ئاوی ژیانی لێوتی داوە، کە لە تاریکیدایە. خاڵی ڕەشی سەر ڕوومەتیشت، پاسەوانی ئەو ئاوی ژیانەیە.

(٤) قووەت: هێز. وادی: دۆڵ، شیو. شێرگیر: شێرگر، دلێر و ئازا. ناوەکئەفگەن: تیرهاوێژ.

ئەژدەهای زوڵفت لە کوێری کەوتە سەر تیغی برۆ
خاڵی تۆ بۆ دیدەیی حەی دانەیی زمڕووتە ڕاست (٥)
عیشقی تۆ بۆ جانی عاشق وەك طەلیسمی بابلە
بۆ گرفتی دڵ، زەنەخدانت چەهی هارووتە ڕاست (٦)
"سالم"ی دێوانە هوشیارە لە بەحثی مەدحی تۆ
نوکتەنوکتە، یەك بە یەك، وەصفی هەمووی مەربووتە ڕاست (٧)

دیدە: چاو. ئاهوو: ئاسك.

واتە: هێزی شان و قۆڵ لە مەیدانی عیشقبازیدا بەکار نایێ. شێرگری تیرئەنداز کە تیر دەخاتە خوارەوە، چاوە زۆر ڕەشە جوانەکانی تۆیە کە لە هی ئاسك دەچن.

نایێ (نم): نایە. عیشقتا (نم): عیشقدا. ناوەكئەفگەن (نم): ناوەك ئەفگەنی. هەڵەیە.

(٥) حەی: مار. زمڕووت: بەردێکی گرانبەهای ڕەنگ‌سەوزە.

واتە: ئەوە ئەژدەهای ئەگریجەتە لەبەر کوێری کەوتە سەر تیغی برۆکانت. ئەگەر نازانی بۆچی ئەو ئەژدەهایە کوێر بووە، خاڵە ماوییە زمڕووتییەکانی سەر گۆنای تۆ بۆ چاوی مار وەك زمڕووت وان؛ وا باوە مار چاوی بە زمڕووت بکەوێ، کوێر دەبێ.

برۆ (نم): برۆت. دیدەیی حەی (نم): دیدە حەتتا.

(٦) طەلیسم: پارچەکاغەز یا مەعدەنێکە جادووگەر یا فاڵچی هێڵ یا خشتە یا پیت و وشەی لەسەر دەنووسێ و پێی وایە کەسێك یا شتێك دەپارێزێ، یان مرۆڤ لە بەلا و ئازار دوور دەخاتەوە. بابل: شارێکی خوارووی عێراقی کەناری ڕووباری فورات بووە، گوایە جادووگەر لەوێوە چووەتە ناو ئیسرائیلییەکان. شەیتانیش، لە زەمانی حەزرەتی سولەیماندا، خەڵکی فەلەستینی فێری سیحربازی کرد. بۆیە سیحری بابل و جادووگەریی بابل ناووبانگیان پەیدا کرد. گرفت: دەستگیرکردن. زەنەخدان: چەناگە. چەهی هارووت: چاڵی ناسراو بە دانیاڵ لە بابل، گوایە هارووت و مارووتیان تێدا زیندانی کراوە و ئەشکەنجە دراون.

واتە: عیشقی تۆ بۆ گیانی عاشق وەك تەلیسمی بابل وایە، هەر گیانی عاشقی تۆ بوو کەوتە ناو تەلیسم. چەناگەی تۆ بۆ دەستگیرکردنی دڵ وەك چاڵی هارووت وایە، هەر کەسێکی تێ‌کەوت و گیرۆدەی بوو، لێی ڕزگار نابێ.

(٧) بەحث: باس‌وخواس. مەدح: ستایش. نوکتە: خاڵ. مەربووط: پێکەوەبەستراو.

واته: سەرم لەوە سوورِ ماوە کە "سالم"، ئەگەرچی شێت و دێوانەیە، بە هۆشیارییەوە هاتووەتە سەر باس‌وخواسی ستایشی تۆ. بڕوانە هەموو وەسفێکی، خاڵ بە خاڵ و یەك بە یەك، پێکەوەبەستراو و ڕاست و دروستە.

مەدحی تۆ (نم): مەدحنت. هەڵەیە. (مەربووتە) لە (مان)دا هەڵەیە و (مەربووطە).

## -٧- (*)

## دڵە خەڵوەتسەرایی حەضرەتی دووست
((دیدە آیینەدار طلعت اوست)) (١)
## سیمْیای عیشق و کیمْیایی ویصال
((هرچە دارم ز یُمن همت اوست)) (٢)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، ھ، ف، غ، کم، گم)دا هەیە. لە(مان، ن)دا، لە بەشی (ملمعات)دایە. غەزەلەکە، ئەگەرچی سالم لە هیچ بەیتێکدا ناوی "حافظ شیرازی"ی نەهێناوە، تێهەڵکێشە لەگەڵ غەزەلێکی ئەو. لەوانەیە پێی وابووبێ هەموو کەسێك بە شیعری حافظ دەزانێ و وتنی ناوێ! ئەمە ئەگەر نەڵێین لەوانەیە بەیتێك هەبووبێ ناوی حافظی تێدا بووبێ، بەڵام کەوتبێ! شایانی باسە، سالم تەنیا بەیتێکی واز لێ هێناوە و تەلمیعی نەکردووە، کە ئەمەیە:

((من و دل گر فدا شدیم چە باك؟ غرض اندر میان سلامت اوست))

کێشی عەرووز: خەفیفی شەشی مەخبوونی مەقسوور.

(١) خەڵوەتسەرا: خەڵوەتخانە، شوێنی بەتەنیادانیشتن. دیدە: چاو. آیینەدار: ئاوێنەهەڵگری بووك، ئەوی لە پێش بووکەوە دەڕوا و ئاوێنەیەك لە پشتی سەریەوە هەڵدەگرێ، تا بووك و خەڵکەکانی دوای بووك خۆیانی تێدا ببینن، تەنیا ئەو خۆی تێدا نابینێ! طلعت: ڕوخسار. (اوست) لە هەموو بەیتەکاندا یانێ: ئەوە.

واتە: دڵم شوێنی بە تەنیا تێدا دانیشتنی حەزرەتی دڵبەرە، چاوم ئاوێنەداری ڕوخساریەتی، بەڵکوو هەر ئاوێنەکە خۆیەتی!

حەضرەتی (ھ): مەحەببەتی. لەنگ دەبێ.

(٢) ئەم بەیتە لە (حا)دا حەوتەمە.

سیمیا: زانستێکە -گوایە- مرۆڤ دەتوانێ بە هۆیەوە شتی ناعادەتی جێبەجێ بکا، یا ڕێ لە شتی عادەتی بگرێ و نەهێڵێ ببێ! ئەمە لە ئاییندا تەنیا بە موعجیزە دەکرێ. کیمیا: زانستێکە ئەوسا لایان وا بووە مرۆڤ بە هۆیەوە دەتوانێ ماددەی ناڕەسەن بکاتە ڕەسەن، بۆ نموونە: مس بکا بە زێڕ و زیو! ز: لە، سووککراوی (از)ی فارسییە.

واتە: ئەم سیمیای ئەوین و کیمیای بەیەکگەیشتنە، هەرچیم هەیە و نییە، گشتی لە فەڕ و بەرەکەتی یارەوەیە، خۆم خاوەنی هیچ نیم!

سیمیای .. تاد (ھ): کیمیای عیشقە، سیمیای فەقر.(ف، غ، ڕ، کم، گم): کیمیای عیشق سیمیای فەقر.

ڕێی دڵی داوە، چونکە طوڕڕەیی یار
«گردنم زیر بار منت اوست» (٣)
بە کەسێ عاشقم، منی ڕیسوا
«همە عالم گواه عصمت اوست» (٤)
دڵ بە خدمەت تەقەڕڕوبی دەستکەوت
«پردەدار حریم حرمت اوست» (٥)
هەرچی گوڵڕوخ کە جازیبی دڵ بن
«ز اثر رنگ و بوی صحبت اوست» (٦)
چ کەمە ئامەدی جیهانی خەراب،
«هر کسی پنجْ روْز نوبت اوست» (٧)

ژُ (مان): بە، "حافظ" خۆی وتوویە:

«ملکت عاشقی و گنج طرب     هرچەدارم ز یُمن همت اوست»

(٣) زیر: ژێر.

واتە: لەبەرئەوەی ئەگریجەی یار شوێنی دڵی ئاوارەمی کردووەتەوە، تا دەمێنم گەردنم لە ژێر باری منەتی جوامێریی ئەودایە.

(٤) همە: هەموو. گواه: شایەت. عصمت: داوێنپاکی و بێتاوانی.

واتە: منی ناوزڕاو شەیدای دڵبەرێکم، هەموو خەڵکی جیهان شایەتی داوێــنپاکیی ئەون.

بە کەسێ (کم، گم): بێکەس و. ڕیسوا (ه، ف، غ، ڕ، کم، گم): بەدناو.

(٥) تەقەڕڕوب: نزیككەوتنەوە. پەردەدار: دەرگاوان (حاجب). حەریم: حەرەمسەرا.

واتە: دڵی شەیدام بە خزمەتکردن و دڵسۆزی لە یار نزیك بووەوە، ئێستا دەرگاوانی حەرەمسەرایەتی.

خدمەت (کم، گم): خزمەت. دەست (کم، گم): دەس.

(٦) گوڵڕوخ: ڕوومەتگوڵ. جاذیب: ڕاکێش. اثر: شوێنەوار، نیشانە.

واتە: هەر ڕوومەتگوڵێك دڵ ڕابکێشێ، ئەو هێزی دڵڕاکێشانەی لە ڕەنگوبۆی هاوڕێیەتیی یارەوە دەست کەوتووە، ئەگینا خۆی خاوەنی هیچ نییە.

جازیب (حا، ه، ع، کم، گم): جاذیب، ئەمیان ڕاستە. (ز)ی (ز اثر)لە(مان، ن، غ، گم)دا کەوتووە.

(٧) ئامەد: دەرامەد و بەرهەم.

**بولبول و طەوفی گوڵ، من و ڕوویی یار**
**«فکر هر کس بقدر همت اوست» (٨)**
**دیدە نازانیٚ بۆ عەزیزە لە لام؟**
**«زانکە این گوشە خاص خلوت اوست» (٩)**
**لادە "سالم"! لە ڕاهی تیری نەظەر**
**«سینە گنجینهٔ محبت اوست» (١٠)**

واتە: ئای بەرهەم و ژیانی ئەم جیهانە وێرانە چەند کەم و کورتە. هەر کەس پێنج‌ودوو ڕۆژێکی تێدا دەژی، ئیتر نۆرەی تەواو دەبێ و ماڵئاوایی لــێ دەکا.

چ کەمە ئامەدی جیهانی خەراب (هـ): چ کسی آمد این جهان خراب. بە تەواوی کردوویە بە فارسی. (کم، گم): چە کنی اندرین: چ دەکەی لەم .. تاد. شیعرەکە مولەممەعە، نیوەی کوردییە و نیوەی فارسییە، نەك هەردوو نیوەکەی!

(٨) ئەم بەیتە لە (حا)دا نۆیەمە.

طەوف: سووڕانەوە بە دەورێ شتێکدا. یا طەرف: تەرەف، لا.

واتە: بولبول ئارەزووی سووڕانەوەی بە دەوری گوڵدا و منیش ئارەزووی تەماشاکردنی ڕوومەتی یارم هەیە. بیری هەر کەس بە ئەندازەی هیممەت‌نواندن و هاتنەدەستیەتی.

بولبول .. تاد (هـ): بولبول و طەرفی گوڵ، دڵ و ڕووی یار. (ف): بولبول و طەوفی گوڵ، دڵ و ڕوویی یار. (کم، گم): بولبول و طوطی دڵ و ڕوخی یار. من و (ن): منە. هەڵەیە.

(٩) زانکە: لەبەرئەوە، (فارسییە). گوشە: سووچ، گۆشە.

واتە: نازانی بۆچی چاومم زۆر خۆش‌دەوێ و ئازیزە لام؟ چونکە ئەم گۆشەی چاومە، شوێنی خەڵوەتی یارە؛ هەر وێنەی ڕوخساری ئەوی تێدایە و هیچی‌تر.

خاص (گم): خاصی!

(١٠) لادە: خۆت لابدە. تیری نەظەر: تیری چاوی یار، یا تیری چاوی بەد!

واتە: خۆت بپارێزە لە تیری ڕوانینی یار، چونکە سینە گەنجینەیەکە خۆشەویستیی ئەوی تێدا شاردراوەتەوە، با تووش نەبی. وا بزانین تیری ڕوانین بە مانای تیری چاوی یار خۆی بێ جوانترە، وەك لەوەی بە مانای تیری چاوی بەد بێ.

تیری (هـ، کم، گم): تیرە. بە مانای تاریك.

## -٨- (*)

**بێنە سا بادی صەبا! لەم حاڵەدا پەیغامی دووست**

**«تا کنم جان از سر رغبت فدای نام دوست» (١)**

**وەختە بونیادی وجوودم، نەی‌صیفەت، ئاگر بدا**

**«طوطی طبعم ز عشق شکّر و بادام دوست» (٢)**

**ئاوی کەوثەر قەت قوبووڵ ناکا لە دەست غیلمان و حوور**

**«هر که چون من در ازل یك جرعه خورد از جام دوست» (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، ج، ر، کم، نم، گم)دا هەیە. لە (مان، ن)دا، لە بەشی (ملمعات)دایە. تێهەڵکێشی غەزەلێکی "حافظ شیرازی"یە، بەڵام ناوی حافظی تێدا نەهێناوە، لەوانەیە بە زیادی زانیبێ ناوی بهێنێ. پاش و پێشی بەیتەکانی پارچەشیعرەکەی "حافظ"یشی تێدا ڕەچاو نەکراوە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەقسوور.

(١) پەیغام: پەیام.

واتە: ئەی بای سەبا! ئا لەم کات و بارەدا کە دڵ خەمبارە، پەیامی یارم پێ بگەیێنە، تا بە ئارەزووی خۆم و بێ‌ئەوەی کەس زۆرم لێ بکا، لە دەوری ناوی گەڕێم و ببم بە قوربانی.

"حافظ" دەڵێ: «مرحبا ای پیك مشتاقان! بده پیغام دوست

تا کنم جان از سر رغبت فدای نام دوست»

"سالم" شێوە وەرگێڕانێکی نیوەی یەکەمی بەیتەکەی حافظی کردووە، بەڵام شتێکی تازەی نەخستووەتە پاڵ!

لەم حاڵەدا (ج): لەم وەقتەدا. نام دوست (نم): نام اوست. دوا وشەی بەیتەکانی حافظ خۆی و لێرەیش هەر (دوست)ە، بۆیە (اواست) هەڵەیە.

(٢) بونیاد: بناغە. وجوود: بوون. نەی‌صیفەت: وەك نەیچەی وشك کە زوو ئاگر دەگرێ و زوویش دادەمرێتەوە.

واتە: تووتیی تەبیعەتم لە خۆشویستنی شەکری لێوی یار و بادەمی دەمیدا، لە سۆزی بەیارگەیشتندا، نزیکە ئاگر بەر بداتە گیانم و وەك بێشەی نەیچەلان بیسووتێنێ.

(نەی) لە (نم)دا کەوتووە. شکّر (گم): شەککەری.

(٣) غیلمان: کۆی غولامە، کوڕوکاڵ، بەندە. حوور: پەری.

**نالە بێتەئثیرە، ئەی دڵ، زەحمەتی خۆت بەس بدە**

**«دردِ سر باشد نمودن بیش ازین ابرام دوست»** (٤)

**قەصدی ئەو دوشنام و جەورە، مەیلی من بۆس و کەنار!**

**«ترك کام خود گرفتم تا برآید کام دوست»** (٥)

**دیدە کوحلی پێ دەوێ، بادی صەبا، سا بێنە زوو**

**«خاكِ راهی کان مشرّف گردد از اقدام دوست»** (٦)

واتە: ئەوی وەك من ڕۆژی ئەزەل قومێکی لە جامی دەستی یار خواردەوە و چەشتی، هەرگیز ئاوی حەوزی کەوسەر لە دەست خزمەتکار و پەریە جوانەکانی بەهەشت وەرناگرێ و دەمی لـێ نادا. مەبەست لە جام چاوی مەستی یارە.

بەش بە حاڵی "حافظ"ی سۆفی و عاشقی خودایی، دۆستەکەی خودای گەورەیە، کە بە قسەی خۆی، بەهەشت بۆ خوداناسانی ڕاست بەبێ نەوازشی خودا پوولێك ناهێنێ.

دەست (کم، گم): دەس. نمودن (ج): نمودند. هەڵەیە.

(٤) ئەم بەیتە لە (حا، نم)دا نییە.

ابرام: زۆر لەسەر شت ڕۆیشتن، تووڕەکردن.

واتە: ئەی دڵ! هاوار و ناڵین بێسوودە، خۆت ماندوو مەکە. دەردەسەری و یار تووڕەکردن لەمە زیاتر بێهوودەیە.

(٥) دشنام: جنێو. بۆس: ماچ. کەنار: باوەش، قەراغی ڕووبار. کام: ئارەزوو و حەز. خود: خۆم. برآید: بێتە دی.

واتە: ئارەزوو و حەزی یار سەبارەت بە من جنێوپێدان و ستەملێکردنە، ئارەزوو و حەزی منیش ماچ و لەباوەشگرتنیەتی. من واز لە حەزی خۆم دەهێنم، با حەزی ئەو بێتە دی و دڵی خۆش بێ.

جەورە (حا، نم): توندی. بۆس (ڕ): بۆسە.

(٦) کوحل: کل. کان– کە آن: (فارسییە)، کە ئەو.

واتە: چاوی من کلی دەوێ، دە ئەی بای سەبا! زووبەزوو خاکی ڕێی یارم فریا بخە، کە بە پێی ئەو پیرۆز بووە. کلەی چاوی منە با بیکەمە چاوم.

صەبا (گم): سەبا. خاك راهی کان (کم): خاك راکان (گم): خاك راکانی! گردد (کم): گەردە (گم): کەردە!

**تووشی دەردی ئادەمم، یاران! لە قەیدی خاڵەوە**

**«بر امید دانەای افتادەام در دام دوست» (٧)**

**مردنە یا صەبرە "سالم"، چارەیی ئەم عیللەتە**

**«زانکە درمانی ندارد دردِ بی‌آرام دوست!» (٨)**

(٧) قەید: کۆت و بەند.

واتە: بە هۆی خاڵی لێوی یارەوە تووشی دەرمەکەی باوکەئادەم بووم، کە بە خواردنی گەنم خۆی لە بەهەشت بەدەرکردن دا. منیش بە هیوای دەست‌کەوتنی دەنکە خاڵێك، کەوتمە داوی.

ئادەمم (ج): وا دەبم. (خالوە – خاڵەوە) شێوەنووسی (مان)ە، بەپێی شێوەزمانی سالم، ئەم (وە)یەمان لا سەیرە، بە دووری نازانین (خاڵی ئەو یا خال او) بووبێ.

(٨) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا نییە، جێی خۆیەتی لێرەدا هەیە، چونکە ناسناوی سالمی تێدایە.

زانکە: چونکە. ندارد: نییەتی.

واتە: چاری دەردی عیشق یا خۆگرتنە یان مردن. دیارە دەردی بێ‌وچان و هەمیشەیی دەستی یار، دەرمانی نییە.

ئەم عیللەتە (حا): هیجرانی یار. (ڕ): ئازاری تۆ. زانکە (مان، ن): گەرچی! بی درمان (مان، حا، ن، نم): بی آرام. هەڵەیە.

-٩- (*)

**ڕەنگی ڕووم ڕابورد، دریغا، باز لە حەسرەت ڕوویی دۆست**
**خەم بووە قەددم لە غەمدا هەر وەکوو ئەبروویی دۆست (١)**
**مەیلی عەطر و میسك و ڕەیحان و گوڵ و خاوم نییە**
**گەر سەحەر بادی صەبا بێنێ بە لاما بوویی دۆست (٢)**
**سەهلە گەر صەد خامی وەك من، مولحید و دەهری بن**
**سالیکی دین وەردەگێڕێ، دیدەیی جادوویی دۆست (٣)**
**کێ بوو دەیوت هیندییان ئەورەنگی زێب نین، سەهْوی کرد**
**پادشاهی موڵکی ڕوومە خاڵەکەی هیندوویی دۆست (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لـە (مان، نم، پ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەقسوور.

(١) ئەم بەیتە لـە (مان)دا نییە.

دریغا: بە داخەوە. باز: دووبارە. حەسرەت: داخ. خەم: چەماوە.

واتە: ڕوخسارم بە داخەوە، لـە داخی ڕووی یار، ڕەنگی پێوە نەماوە و زەرد بووە. بالآیشم بە خەمی تۆ وەك برۆت چەماوەتەوە.

حەسرەت (پ): حیرەت.

(٢) خاو: گوڵێکی بۆنخۆشە.

واتە: ئەگەر بای سەبا بەیانیان، لـە داخی یار، بۆنی دۆستم بۆ بێنێ، من ئارەزووی بۆنی عەتر و میسـك و ڕێحانە و گوڵ و خاو ناکەم.

(٣) خام: کاڵفام، کرچوکاڵ. مولحید: خودانەناس. دەهری: بێباوەڕ، شێتگیر. سالیکی دین: دیندار، ڕێی دیانەتگرتوو. جادوو: سیحرباز.

واتە: ئاسانە ئەگەر سەد کاڵفامی وەك من خودانەناس بن، چونکە چاوی سیحربازی یار کە شێتگیر بوو، دینداریش لـە دین وەردەگێڕێ.

مولحید و دەهری بن (نم): مولحیدە و دەهری بە من. هەڵەیە و ماناکەیی شێواندووە.

(٤) ئەم بەیتە لـە (مان)دا پێنجەمە.

ئەورەنگ: فەڕ و شکۆ، گەورەیی، فریو. زێب: ڕازاندنەوە و جوانی. ڕووم: وڵاتی ڕۆم، ڕوخسار.

**ئاگری جەوری دڵارامم هەتا دێ خۆش دەبێ**
**ناری زەردەشتی بە دائیم کەی دەگاتە خوویی دۆست (٥)**
**باڵ دەکاتە ئەڕڕە قومری، پەی دەکا سەرْوی چەمەن**
**گەر لە گوڵزارا ببینێ قامەتی دڵجوویی دۆست (٦)**
**زەحمەتە ئیتر نەجاتم بێ لەدەست شەبهایی هیجر**
**دەرهەم و طوولانیی و تاریکە میثلی موویی دۆست (٧)**

واتە: کێ بوو دەیوت هیندییەکان خاوەنی فەڕ و شکۆی جوانکردن و ڕازاندەنەوە نین، بە هەڵەدا چووە. خاڵی ڕەشی ڕووی یارم کە (هیندوو)ی پێ دەوترێ، هەر ئەوەندە پێوەندی بە (هیند)ەوە هەیە کە پادشای موڵکی ڕووی من یا موڵکی ڕۆمە.

زێب (پ): سێب.

(٥) ئەم بەیتە لە (مان)دا نییە.

نار: ئاگر. خوو: خوڵق و ڕەوشت، تەبیعەت.

واتە: ئاگری ستەمکاریی یارم تا دێ خۆشتر دەبێ. ئاگری زەردەشتیش کە بەردەوامە و دەگرێ، ناگاتە گەرمیی خوڵق و ڕەوشتی دۆست.

دەبێ (نم، پ): ئەبێ.

(٦) ئەڕڕە: مشار. پەی دەکا: دەبڕێتەوە. دڵجوو: دڵخواز.

واتە: قومری کە بەژن و باڵای دڵخوازی دۆست لەناو گوڵزاردا دەبینێ، باڵی دەکا بە مشار و سەروەکان لەبندا دەبڕێتەوە، چونکە ئیتر پێویستیی بە سەرو نامێنێ تا بە سەریەوە بنیشێتەوە. باڵای یار ململانێ لەگەڵ ئەو سەروانە دەکا.

ببینێ (مان): ببینن.

(٧) شەبها: شبها، شەوان. فیراق: لێکجیایی. دەرهەم: ئاڵۆزکاو و بەیەکداچوو. طوولانی: درێژ.

واتە: زەحمەتە لەدەست ئەم شەوانی جیاییە، کە وەك مووی یار بەیەکداچوو و ئاڵۆزکاو و درێژن، ڕزگارم بێ.

زەحمەتە ئیتر نەجاتم بێ لە دەست شەبهایی هیجر (نم): ئۆف خودا ڕۆ! چۆن نەجاتم بێ لە دەست شەبهای فیراق.

**ئاخ و داخ و حەسرەتا، خۆزگەم بە پار کە ڕۆژ و شەو**
**دادەنیشتم کامەران، پەیوەستە هەمزانوویی دۆست (٨)**
**بۆ دەوای مەحرووقدڵ، "سالم" مەچۆرە لای حەکیم**
**قەد دەوای تەبرید نییە بۆ تۆ، مەگەر لیموویی دۆست (٩)**

(٨) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (پ)دا نین.

پەیوەستە: هەمیشە، بەردەوام. هەمزانوو: ئەژنۆ بە ئەژنۆوە.

واتە: خۆزگە و داخ و خەفەتم بۆ ساڵی پار کە ڕۆژ و شەو بەردەوام ئەژنۆ بە ئەژنۆی یارەوە دادەنیشتم.

کە (نم): کا. هەڵەیە.

(٩) مەحرووقدڵ: دڵسووتاو. حەکیم: پزیشك. دەوا: دەرمان. تەبرید: ساردکردنەوە.

واتە: سالم، مەچۆرە لای پزیشك بۆ چارەسەری دەردی دڵی سووتاوی خۆت. لە لیمۆی مەمکی یار بەولاوە، شتێکیتر نییە فێنکی بەو دڵەت ببەخشێ و گەرمی و تینوتاوی کەم بکاتەوە. زانراوە کە لیمۆ تای لەش کەم دەکاتەوە.

دەوای (نم): شیفای. بە هەڵە دووبارە کراوەتەوە. مەحرووقدڵ (نم): مەحروومی دڵ. مەگەر (نم): بە جوز.

(*) -١٠-

**دەوری ئەم قەڕنە لەسەر من بە ستەم هات و گوزەشت**
**ساڵ و مەه، هەرچی حەیاتم بوو، بە غەم هات و گوزەشت (١)**
**لەنگەری طایری دەوڵەت لەسەرم طوولی نەبوو،**
**وەکوو هەورێ کە بخا سایە، بەهەم هات و گوزەشت (٢)**
**قافڵەی عومری گرانمایە لە ئیقلیمی وجوود**
**چەنْد چالاك و سەبوکڕەو، بە عەدەم هات و گوزەشت (٣)**
**جوستەنی تیری ڕەوانت بە نەفەس طوولی نەما**
**وەك کەمان قامەتی پیری کە بە خەم هات و گوزەشت (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە بەشی (غزلهای جدیدە)ی (مان)دا هەیە.
کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەقسوور.
(١) قەڕن: سەد ساڵ. مەه: مانگ.
واتە: خولی ئەم سەد ساڵەم هەر بە ستەمکردنی یارم لێ بەسەردا هات و تێپەڕی. چەند ساڵ و چەند مانگ لەم سەدەیەدا ژیام، هەمووی بە خەم و خەفەتەوە بەسەرمدا هات و بەسەرچوو.
(٢) لەنگەر: مەبەست وەستانە، وەك لەنگەرگرتنی کەشتی! طائیری دەوڵەت: باڵندەی بەخت، دەوڵەت و بەختی شوبهاندووە بە باڵندە، یا هەر مەبەستی باڵندەی بەختە کە لە عەرەبیشدا (طیر السعد)ی بۆ بەکار دێنن! طوول: درێژی. سایە: سێبەر. بەهەم: بەیەکدا.
واتە: باڵندەی بەختەوەری هەر ئەوەندە لە ڕاستی سەرم نەوەستا و درێژەی نەبوو، وەك هەورێك پارچەپارچە کۆببێتەوە و سێبەر دروست بکا، بێت و بڕوا!
(٣) قافڵە: کاروان. گرانمایە: بەنرخ، گرانبەها. ئیقلیم: وڵات، هەرێم. وجوود: بوون. چالاك: گورج. سەبوکڕەو: چابوك، تیژڕۆ. عەدەم: نەبوون.
واتە: کاروانی تەمەنی بەنرخم زۆر بە گورجی هاتە وڵاتی بوون و تیژ تێپەڕی، بەرەو جیهانی نەمان ئاوا بوو!
(٤) جوستەن: بزووتن و دەرپەڕین. تیر: باڵای ڕاستی سەردەمی لاوی. ڕەوان: ڕاست. بە نەفەس: بە هەناسەیەك، هێندەی هەناسەیەك. کەمان: کەوان. خەم: کەوانی، چەماوە.
واتە: ئەی سالم! کە باڵای تەمەنی پیریی وەك کەمان چەماوە هات و ڕۆیی، جموجووڵی باڵای ڕێکی سەردەمی گەنجیی وەك تیر ڕاستت، هێندەی هەناسەیەك درێژەی نەکێشا و ڕۆژی نەما! بگرە

**له گوزەرگاهی وجوودا به شیتابێکی تەواو**
**بۆ بیابانی عەدەم، مەوکیبی جەم هات و گوزەشت (٥)**
**بوو بە چین جوملە لە پێشانیی نامەردی بەخیل**
**لە کەفی مەردی سەخی، هەرچی درەم هات و گوزەشت (٦)**
**ئەشکی "سالم" کە لە جۆشا هەمو خوێناوی دڵە**
**وەه چ سەیلێ بوو کە وەك ڕەنگی بەقەم هات و گوزەشت! (٧)**

ڕۆژی پیریش نەما، ئەویش هات و ڕۆیی!

(٥) گوزەرگاه: ڕێڕەو. وجوود: جیهانی بوون. شیتاب: پەلە. عەدەم: جیهانی نەمان. مەوکیب: سوار یا پیادەکانی لە ڕۆیشتندا یاوەری پادشایانن. جەم: جەمشیدی خاوەن شکۆ و دەسەڵات.

واتە: بارگە و بنە و تەخت و تەلار و کەش‌وفشی "جەمشید"یش، لە ڕێڕەوی جیهانی بووندا، چ بە پەلە بەرەو بیابانی نەبوون هاتن و ڕۆیین. (سالم دڵخۆشیی خۆی داوەتەوە!)

(٦) چین: چین‌چینی چرچ‌ولۆچی ناوچاوان. جوملە: هەموو. پێشانی: ناوچاوان، تەوێڵ. کەف: بەری دەست. سەخی: نان‌بدە، دەست و دڵ فراوان. درەم: درهەم، پارە و پوول.

واتە: هەرچی پارە و پوولە لە دەستی پیاوی بەرچاوفراوانی دەهەندەدا هات و چوو. هەمووی لە ناوچاوانی پیاوانی ڕژد و پیسکەدا بوو بە چرچ‌ولۆچ! پیسکە، نەك تەنیا خۆی ڕژدە، داخیشی لێ دێ پیاوی دەهەندە دەستی خەڵك بگرێ.

(٧) ئەشك: فرمێسك. جۆش: کوڵان، بە دوور نازانرێ ئەم لە جۆشایە (دەجۆشا) بووبێ و هەڵەی ڕوونووسکەرەوە کردبێتی بە (لە جۆشا). وەه: وشەی سەرسامییە، یانێ ئای! بەقەم: درەختێکی بەرز و قایمە، بەرێکی خڕ و سووری هەیە، دارەکەیشی ڕەنگ‌سوورە و ڕەنگێکی سووری لێ دەردەهێنرێ بۆ ڕەنگ‌کردنی خوری و ئاوریشم. وشەکە لە بنەڕەتدا (بەققەم)ـە، سالم لەبەر کێش سووکی کردووەتەوە.

واتە: فرمێسکی "سالم" لە حاڵی کوڵان و گەرمیدا هەمووی خوێناوی دڵە، ئای هاوار چ لافاوێکی سوور بوو هات و تێپەڕی؟!

-١١- (*)

لە چەمەن سەرْوی ڕەوانم کە عەیان هات و گوزەشت
لە سروشْکم بە ڕوخا جۆیی ڕەوان هات و گوزەشت (١)
مەدد و طوولێکی نەبوو شەعشەعەیی ئامەدی بەخت
وەکو بەرقی فەلەکی، جیلوەکونان هات و گوزەشت (٢)
وەکو شادی نەبوو ئیستی لەسەرم، یاری عەزیز
موددەعی، وەك غەمی دێرینە، گران هات و گوزەشت (٣)
یار و ئەغیاری منن هەردو کە ڕۆیین پەس و پێش
بە عەقەب فەصڵی بەهارا سەرەطان هات و گوزەشت (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە بەشی (غزلهای جدیدە)ی (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەقسوور.

(١) (ڕەوان)ی یەکەم: مەبەستی ڕێکە. عەیان: ئاشکرا. گوزەشت: تێپەڕی. سروشك: فرمێسك. ڕوخ: ڕوومەت. جۆ: جۆگە. (ڕەوان)ی دووەم: لەبەرڕۆیشتوو، جاری.

واتە: کە سەروی ڕێکی باڵای یارم لە چەمەندا ئاشکرا هات و ڕۆیی، فرمێسکی چاوم وەك ڕووبار هات و ڕۆیی. دیارە سەرو، وەك هەر درەختێك، ئاوی دەوێ.

(٢) مەد: درێژی، ماوە. شەعشەعە: ڕەونەق و درەوشانەوە. ئامەدی بەخت: مەبەستی ئامەدەنی بەختە، هاتنی بەخت، یا ئامەد هەر خۆی بە مانای بەختە. بەرق: برووسکە. جیلوەکونان: بە درەوشاوەیی، بە خۆنواندنەوە.

واتە: بە داخەوە شەوق و شادیی بەخت و هاتم ئەوەندەی نەخایاند، وەك برووسکەی هەورەتریشقەی ئاسمان بە خۆنواندن و ورشەوپرشەوە هات و گورج لە چاو ون بوو.

(٣) ئیست: ڕاوەستان، مۆڵەت. دێرینە: کۆن.

واتە: یاری خۆشەویستم، هەر وەك خۆشی و شادی، ئەوەندە لەسەرم نەوەستا و لەگەڵم نەمایەوە. دوژمنیش، وەك خەمی کۆن، بە گران هات و ڕۆیی و زۆر لەسەر دڵم مایەوە!

(٤) پەس: دوایی. عەقەب: پاش، دوای. سەرەطان: چوارەم کەلووی ئاسمان، سەرەتای هاوین.

واتە: وەرزی نازداری بەهار و کەلووی گەرمیی تاوداری سەرەتان، دۆست و دوژمنی منن، وەك چۆن دۆست دێت و گورج دەڕوا، دوابەدوای ئەویش بەدکار دێت و دەچێ.

**ئەشکی من، چونکە طەراوەتدەهە بۆ باغی ڕوخت**
**ئەی بەسا شەو لە دو دیدەم سەیەلان هات و گوزەشت (٥)**
**زۆرْ نیکت لە صەفای سینە بە هەر کەس کە نُوواند**
**جامەیی صەبری دڕی، سینەزەنان هات و گوزەشت (٦)**
**دڵ وەکوو نوقطەیی ثابیت لە میانبەستەییی تۆ**
**چەرخی پەڕگارْصیفەت بەس دەوەران هات و گوزەشت (٧)**
**یێرشی تیپی موژەی دی، کە دڵم، ڕوو بە قەفا**
**لە پەنای سایەیی زوڵفت، بە ئەمان هات و گوزەشت (٨)**

(٥) ئەشك: فرمێسك. طەراوەتدەهـ: ڕەونەقدەر، جوانیبەخش، وەك ئاو گوڵی تینوو دەگەشێنێتەوە. ئەی بەسا: ئای چەند. سەیەلان: لافاو.

واتە: لەبەرئەوەی فرمێسکی من باخی ڕوومەتت دەگەشێنێتەوە، گریانی من دڵی تۆ خۆش دەکا، ئای چەند شەو فرمێسك بە لێشاو دەهات و دەڕۆیی.

(٦) نیك: چاکە. جامەی صەبر: کراسی سەبر و ئارامگرتن، لە کوردەواریدا دەڵێن: یەخەی خۆی دادڕی، کە کینایەیە لە خۆنەگرتن. سینەزەنان: بەسنگ‌کوتان.

واتە: کە چاکەیەکی زۆرت لە بێغەڵوغەشی و بێگەردیی سنگت نیشانی هەر کەسێك دا، کراسی ئۆقرە و ئارامی دادڕی و بە سنگ‌کوتانەوە دێت و دەڕوا.

ئێمە وای بۆ دەچین ئەم وشەی (نیك)ە لە ڕاستیدا (نیکی) بێ و بەیتەکە وا بووبێ ((زۆر نیکیت بە صەفای سینە .. تاد)) و بە هەڵەی ڕوونووسکەرەوە بووبێ بە (نیکت)، چونکە وا نەبێ بە باشی واتای شیعرەکە بە دەستەوە نایێ.

(٧) میانبەستەیی: کەمەربەستەیی، ئامادەیی بۆ خزمەتگوزاری. پەڕگارصیفەت: خوو وەك پەڕگار کە دەسوورێتەوە. دەوەران: سووڕانەوە، بێباری.

واتە: دڵی من، وەك خاڵی ناوەڕاستی بازنە، نەگۆڕاو و ئامادەی خزمەتگوزاری بوو بۆ تۆ. بەڵام چەرخی گەردوون، وەك پەڕگار، هات و ڕۆیی و سووڕاندمیەوە و هەر جارە لە شوێنێك دایانم؛ یا مەبەستی ئەوەیە، ئەگەرچی چەرخی نامەردی بێبار هەمیشە لەسەر سەرمە، من هەر ئامادەی خزمەتگوزاریم بۆ تۆ و ناگۆڕێم و لە جێی خۆمم.

(٨) یێرش: هێرش. تیپ: تیپی سوپا. ڕووبەقەفا: ڕوو بەرەوپشت، هەڵگەڕاوە وەك سوپای هەڵاتوو!

**شوێنی هەر باقییە ئێستەش لە لەطیفیی لەبی تۆ**
**دەفعەیێ بوو، لە خەیالاّ، بە دەهان هات و گوزەشت (٩)**
**خوونبەهای ماچی خەیاڵیتە، ئەگەر هەر سەری من،**
**بوو بە پا، سەر لە ڕەهی تۆ بە دەوان هات و گوزەشت (١٠)**
**دڵ کە "سالم" بو، لە ڕووی زێوەرْ، طوڕڕەیی نەدەبەست!**
**ئێستە مەجرووحە، لە موو موشکفْشان هات و گوزەشت (١١)**

واتە: کە دڵم هێرشـی سـوپای برژانگی یاری دی، ڕوو لـەسەر پشـتە و هەڵگەڕایەوە بە نیازی هێرش، لـە پەنای سێبەری ئەگریجەتدا هات و تێپەڕی و تووشی نەبوو. جوانە، برژانگ بەرەودوا وەك لـەشکری شکاو و هەڵاتوو هەڵدەگەڕێتەوە، کەچی هێرش دەبا و ماڵی عاشق کاول دەکا.

(تیبی) بە شێوەی (طـــیبی) نووسـراوە کە هەڵەیە.

(٩) لـەطیفیی لـەب: لێوناسکی. دەهان: دەم.

واتە: تاقە یەكجار بوو، بە خەیاڵ، نەك بە ڕاستی، لێوی تۆ گەیشتە دەمی من و تێپەڕی، ئەو لێوەت ئەوەندە ناسك بوو، ئێستایش شوێن و نیشـانی ماوە.

(شوێنی) بە شێوەی (شونی) نووسراوە.

(١٠) خوونبەها: خوێنبایی، نرخ. پا: پێ. ڕەه: ڕێ. دەوان: ڕاکردن، غار.

واتە: ئەگەر تەنها سـەرم خوێنبایی و نرخی ماچی بە خەیاڵـت بێ و بە هیچیتر ڕازی نەبی، ئەوا سەرم بە سـەری نەما و بوو بە پێ و لـە پێناوتدا هات و چوو، بڕایەوە!

(١١) زێوەر: ئارایشت و ڕازاندنەوە. طوڕڕە: ئەگریجە. مەجرووح: بریندار. موشکفشان: بۆنی میـسك بڵاوکەرەوە.

واتە: ئەوسا کە دڵ سـاغ بوو، یار ڕووی خۆی بە جوانکاری و ئەگریجە ئارایشت نەدەکرد و نەیدەڕازاندەوە. ئێستا کە بریندارە، مووی ئەگریجەی بۆنی میسك بڵاو دەکاتەوە و دێت و دەڕوا. مەبەستیە بڵێ: من کاتێك سـاغ بووم، نەك ئێستا کە بریندارم، پێویستیم بە بۆنوبەرامە و جوانی بوو.

-١٢- (*)

**وەك دوڕڕ و عەقیق نەقشە، دوندان و لەبی ئاڵت**
**میثلی بەڕەزا پەخشە، ئەگریجە لەسەر خاڵت (١)**
**نارنجی زولەیخایە، گۆی چاهی زەنەخدانت**
**طەوقی ملی شیرینە، پاوانەوو خڕخاڵت (٢)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، نم، گم)دا هەیە. لە (عا، نم)دا شەش بەیتە، بەیتی شەشەمی لەوانیتردا نییە. لە (مان)دا پێنج بەیتە، سەرەتاکەی ((وەك دوڕڕ و عەقیق... تاد))ە و دوا بەیتی ((گەر بێت و نیقاب لادەی... تاد))ە. بەڵام لە (گم)دا نۆ بەیتە و تێکەڵ بە چوار بەیتی پارچەشیعرێکیتری "سالم" کراوە، کە -بە داخەوە- هەمووی لە بەردەستدا نییە. (گم) خۆیشی ئاماژەی بەوە داوە کە ئەو پارچەشیعرە ناتەواوە. بۆیە پشتبەستوو بە (مان) و لەبەرئەوەی دوا پیتی نیوەی دووەمی ئەو چوار بەیتە (نوون)ە، دەبێ لە بنەڕەتدا دوو غەزەل بووبێ، ئیتر لێی جوێ کرایەوە و سەربەخۆ دانرا. دەبێ بوترێ: ناسناوی "سالم"یش لە هیچیاندا نییە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی ئەخرەب.

(١) واتە: ددانی سپیی درەخشانت، لەگەڵ لێوی ئاڵت، وەك مرواریی ورشەدار و یاقیقی سووری گرانبەهان، جوان کەوتوونەتە یەك و بوونەتە نەخش و نیگار. ئەگریجەی تاڵ تاڵ و جوانت وەك بەرەزای تەڵتەڵی کوێستان بە دەوری خاڵی کوڵمتدا پەخش و بڵاو بووەتەوە، بنیادەم نازانێ بڕوانێتە کامیان؟!

عەقیق (عا): فوهە (فُوَه) کە ئاڵتوون و زیوە، ئەمیش واتا دەدا، بەڵام عەقیقەکە -بەتایبەتی جۆری سووری- بۆ شوێنەکە زۆر لەبارترە. نەقشە (عا): نەخشە.

(٢) ئەم بەیتە لە (عا)دا سێیەمە.

نارنجی زولەیخا: کە زولەیخای ژنی عەزیزی میسر ژنەکانی دەوروبەری خۆی خڕکردەوە و یووسفی نارده ناویان تا بزانن چ شۆخێکە، لەوانەیە نارنجی بە یەکی چەقۆیەکەوە دابێتە دەستی ژنەکان، مەبەست لەم نارنجە ئەوە بووبێ! یا نارنجی زولەیخا جۆرێکی تایبەت و جوان بووە، یان کینایەیە لە مەمکی زولەیخا، بێگومان ئەویش کەم نەبووە!! چاه: چاڵ. زەنەخدان: چەناگە. طەوق: ملوانکە، گەردنبەند، گەردانە. شیرین: شیرینی لەمەڕ فەرهاد!

واتە: ئەو گۆی چەناگەتە کە چاڵەکەی تێدایە، نارنجی زولەیخایە؛ پاوانەی پێت و بازنی دەستت گەردانەی ملی شیرینی فەرهادە. دوور نیە ئەوەیشی مەبەست بێ کە خڕخاڵ و بازنی یارەکەی دەبێتە

**پەنجەت لە حەنا مەگرە، سوورێکی تەڵخڕەنگە**
**خوێنی دڵی من ئاڵە بۆ پەنجەیی شمشاڵت (٣)**
**بەخ بەخ لە قەدی سەرْوت، چەند دڵبەر و مەوزوونە؟!**
**سەیری کە چ شیرینە فێست و گوڵی دەسماڵت (٤)**
**گەر بێت و نیقاب لادەی، فیلجوملە، دەبن دەردەم**
**مەحزوونی سییەهچەشمان، مەجزووبی دیدەی کاڵت (٥)**

تەوقی نەفرەتی و دەچێتە گەردنی شیرین، کە هەر جارێ تەماشای ملی بکا و ئەو گەردانەیە ببینێ، یارەکەی "سالم"ی بێتەوە یاد و خۆی لە بەرچاو بیزرێ!

خڕخاڵت (گم): خەڵخاڵت.

(٣) ئەم بەیتە لە (نم)دا چوارەمە.

حەنا: خەنە. تەڵخ: دیز. سووری تەڵخڕەنگ: سووری لیڵ.

واتە: پەنجەی جوانت لە خەنە مەگرە، خەنە سوورێکی ڕەنگ‌لیڵە، بەڵام خوێنی دڵی من سووری وەك عەقیقە و شایانی پەنجەی ڕێکی وەك شمشاڵی تۆیە.

سوورێکی (نم): شۆرێکە. شمشاڵت (نم): شمشادت.

(٤) ئەم بەیتە لە (عا)دا دووەمە.

مەوزوون: ڕێك و ڕاست. فێست یا فێس: کڵاوی ئافرەت کە ئەوسا لیرە و قرانی زیوی پێدا دادەکوترا، بەتایبەت لەگەڵ سەرپێچ و دەسماڵ جوانیان لێ دەهات!

واتە: ئای باڵای وەك سەرو ڕێکت چەند دڵفرێن و ڕێکوپێکە. بڕوانە چەند شیرین و لەزەتبەخشە و چەندت لێ جوانە فێس و گوڵی دەسماڵت.

بەخ بەخ (عا): وەه وەه. (نم): نەخ نەخ. هەڵەیە. فێست و گوڵی دەسماڵت فێست و گوڵی (عا): فێس و گوڵ و دەسماڵت. (گم): پاوانەوو خەڵخاڵت. دەبێتە دووبارەکردنەوە.

(٥) نیقاب: ڕووپۆش، پەچە. فیلجوملە: کەمێك، نەك هەموو. دەردەم: کوتوپڕ، لە هەمان کاتدا. مەحزوون: خەمبار. مەجذووب: ڕاکێشراو، وەك سۆفیی جەزبەلێهاتوو. لەوە دەچێ یارەکەی "سالم" ئەم جارە چاوکاڵ بێ، نەك چاوڕەش.

واتە: ئەگەر بێت و کەمێك ڕووپۆش لا بدەی و چاوی کاڵت دەربکەوێ، کوتوپڕ ئەوانەی وا خەمبار و گیرۆدەی چاوی ڕەشن، واز لە چاوی ڕەش دێنن، بگرە لە بیریان دەچێتەوە و وەك سۆفی جەزبەیان لێ دێ بۆ چاوی کاڵت.

## بێ ڕەحم و جەفاکاری بۆ کۆهکەنی غەمگین
## "شیرین"ی زەمان! ئامان، ڕەحمێ بە پەشێوحاڵت (٦)

فیلجوملە، دەبن (نم): مینجوملە ئەبن. دەردەم (عا): یەکدەم: یەکهەناســـە و یەککات، گورج. مەحزوونی (عا): مەفتونی. (نم): مەجزووبی. (گم): مەحـرووومی!(نم مەجزووبی (نم): مەجرووحی. (مەجزووبی) لە (مان)دا هەڵەیە و (مەجذووبی) ڕاستە. دیدەی کاڵت (نم): دو موژگانت.

(٦) ئەم بەیتە هەر لە (عا)دا هەیە و دوایینبەیتە.

کۆهکەن: کێوهەڵکەن، ناسناوی "فەرهاد"ی بەدبەختە.

واتە: ئەی "شیرین"ی سەردەم! تۆ بێبەزەیی و ستەمکاری دەرهەق بە منی وەك فەرهادی کێوهەڵکەن و خەمبار! ئامان سەد ئامان بەزەییەکت بەم پەشێوحاڵەدا بێتەوە.

دواینبەیت لە (نم)دا ئەمەیە:

بیماری غولامی خۆت، لوطفت لێ قوبووڵ ناکا
بۆ ڕەسمی عبوودییەت، سا بگرە گۆیی خاڵت

## -١٣- (*)

**ئەی طاسی بەدەن پڕ فەرەحی لەذذەتی نامت!**
**وەی داغی دڵی خەستە، نەمەکسوودی کەلامت! (١)**
**ئەی سونبولی زوڵفت هەمەدەم عەطری مەشامم!**
**وەی زێوەری سەرچەشمەیی چەم، قەددی نەمامت! (٢)**
**ئەی گەردنی جانم بە ئەبەد حەبسی کەمەندت!**
**وەی مورغی دڵی شێفْتە پەڕبەستەیی دامت! (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ق)دا هەیە. بەپێی (دیوانی کوردی، بەرگی یەکەم، ل٧٧-٨٠)، ئەمە وەڵامی سالمە بۆ شیعرێکی مستەفا بەگی "کوردی" کە لە سلێمانییەوە بۆی ناردووەتە دێی (شیوەکەڵ)ی ناوچەی شارباژێڕ و بەمە دەستی پێکردووە:

موشتاقە دڵم، لەو دەمەوە چۆڵە مەقامت
بۆ بیستنی ئەشعاری پڕ و خۆشی کەلامت

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

(١) طاس: کاسە. نام: ناو. خەستە: نەخۆش. نەمەکسوود: هەر شتێك خوێی تێسووراب‌ێ، گۆشتی کەباب کە خوێ کرابێ و هەڵگیرابێ. کەلام: ئاخاوتن.

واتە: ئەی ئەو یارە خۆشەویستەم کە دەفری بەدەنی پڕە لە خۆشی و شادمانیی بەتام و لەزەتی ناوی شیرینت! ئەی ئەو یارەی کە داخی دڵی بریندارم خوێتێهەڵسووراوی قسەتە؛ قسە و ئاخاوتنت خوێیە، سووراوەتە داخی دڵی خەستەم. قسەکەی سالم ئازار و خۆشییش هەڵدەگرێ.

(٢) هەمەدەم: هەموو کات. مەشام (مشامّ): ئەندامی بۆنکردن، لووت و دەماخ. وەی: ئەی. زێوەر: زینەت و ئارایشت. چەشمە: سەرچاوە. چەم: چاو.

واتە: ئەی ئەوەی کە ئەگریجەی وەك سونبول جوانت هەمیشە عەتری دەماخە و بۆنی خۆشم هەر لەوەوەیە، جوانی و ڕازانەوەی سەرچاوەی چاوی هەمیشە گریاوم قەدی نەمامی باڵای عەرعەرتە، تۆ سەرچاوەی و چاوم دەڕازێنیتەوە.

(٣) جان: گیان. شێفتە: شێواو. پەڕبەستە: باڵبەستراو، دیل. دام: داو.

واتە: ئەی ئەو یارەی کە گەردنی گیانم هەمیشە بەندی کەمەندی خۆشەویستیتە، ئەی ئەو یارەی کە پەلەوەری دڵی لانەشێواوی سەرلێشێواوم باڵبەستەی داوی ئەگریجەتە.

**قاصید لە طەرەف تۆوە سەلامێکی گەیاندم**
**قوربانی وەفای دەم بە دەم و جەوری مودامت (٤)**
**ئەی جان بە فیدای نوکتەیی شیرینی دەهانت!**
**وەی سەر بە نیثاری قەدەمی پەیکی پەیامت! (٥)**
**قاصید نییە ئەم پەیکە، یەقین "خضر"ی نەجاتە**
**بەخشیی بە منی موردە حەیاتێ لە سەلامت! (٦)**
**تۆ نیتە مەگەر ئارەزویی دیدەنی مەهجوور**
**سا دەی وەرە ئەم مەردومەکەی دیدە مەقامت (٧)**
**با سوجدەی بەرێ کەبکی دەری، نەقشی بەری پێت**
**سا هەڵسە بکەن خۆشڕەوشان مەشقی خەرامت (٨)**

(٤) دەهان: دەم. نیثار: پایەنداز، دیاریی لە بەرپێی کەسی بەڕێز و خۆشەویستدا فڕێدراو. قەدەم: پێ، هاتن. پەیك: تەتەر. پەیام: نامە، ڕاسپێری.

واتە: ئەی ئەوەی کە گیان بە قوربانی ئاخاوتنی شیرینتە، سەر پێشکەش و لەبەرپێفڕێدراوی ئەو کەسەیە کە نامەی تۆ دەهێنێ.

(٥) قاصید: نامەبەر. دەم بە دەم: جارجار، تاوتاو، جاروبار. جەور: ستەم. مودام: هەمیشەیی.

واتە: تەتەر سڵاوێکی لە لای تۆوە پێگەیاندم، قوربانی وەفای جارجار و ستەمی هەمیشەییت بم. بەڵێ، وەفای یار بۆ عاشق کەم و ستەمیشی بەردەوامە!

گەیاندم: ئێمە وای بۆ دەچین ئەم وشەی (گەیاندم)ە، هەڵەی ڕوونووسکەرەوەیە و ڕاستەکەی (گەیاندمێ)یە.

(٦) یەقین: بێچەندوچۆن، بە دڵنیاییەوە. خضر: خدری زیندە (د.خ). موردە: مردوو.

واتە: ئەم تەتەرە نامەهێنی ئاسایی نییە، خدری زیندەیە، گیانی مردوومی بەو سڵاوەی وا لە لای تۆوە بۆی هێنام، وەك ئاوی زیندەگانی زیندوو کردەوە.

(٧) مەهجوور: وازلێهێنراو، دوورلەیار، مەردومەك: گلێنەی چاو. مەقام: جێ و ئارامگە.

واتە: ئەگەر نیازی ئەوەت نییە ئەم دوورەیارە وازلێهێنراوە ببینی، وەرە مەمبینە، لە گلارەی چاومدا بحەسێرەوە. یا ئەگەر تۆ ئەوەندە بێبەزەییت و ناتەوێ دیدەنیی منی دەربەدەر بکەی، من وەك تۆ نیم، ئامادەم گلارەی چاوم بکەمە شوێنی حەسانەوەت.

(٨) کەبکی دەری: باڵندەیەکی وەك کەوە، لەشی سێ ئەوەندە گەورەتر و دەنووکی درێژ و

**کوشتت کە هەموو مونتەظیری شۆڕشی حەشرن**
**قەد دەرخە؛ هووەیدا کە قیامەت لە قیامت (٩)**
**تەئسیری تەعەششوقتە، وەیا وەصفی فلانی؟**
**"سالم"! کە تکا شەهدی چەکیدە لە کەلامت (١٠)**

چنگۆڵەی بەهێزە، زیاتر لە ئێران و چین و ئەفغانستان دەبینرێ. نەقشی بەری پێت: مەبەست شوێنپێی یارە. خۆشڕەوش: خۆشڕەوت و بەلارولەنجە.

واتە: سا هەستە بجوولێ، تا خۆشڕەوتان، لارولەنجەداران، مەشقی لارولەنجە لەسەر ڕەوتی تۆ بکەن و فێری بن. هەستە بجوولێ، با کەوی دەری کڕنووش بۆ نەخش و نیگاری جێپێت بەرێ.

سوجدەی: ئێمە لامان وایە ڕاستەکەی (سوجدە)یە.

(٩) هووەیدا: ئاشکرا. قیامەت: ڕۆژی قیامەت. قیامت: هەڵسانت.

واتە: کە هەموو دڵدارانت کوشت و کەس بە زیندوویی نەمایەوە، ئیتر کاتی ڕۆژی حەشرە و کوژراوانی دەستت چاوەڕێن. بالآت ڕاست کەرەوە تا قیامەت بەرپا بێ، بەڵکوو ئەمە خودایە بە بێخەتا کوژراوان بە هەقی خۆیان بگەن. سالم مانای لە ڕووداوی ڕۆژی قیامەت خواستووە، وەك لە ئایینda هەیە دووجار فوو بە کەڕەنا (صوور)دا دەکرێ؛ لە جاری یەکەمیاندا هەرچی گیانلەبەرە دەمرێ و دنیا تەخت دەبێ، لە دووەمیشیاندا خەڵك هەموو زیندوو دەکرێنەوە و حیساب و کیتاب دەست پێدەکا. یاری "سالم" بە چاو و بە ناز هەمووانی کوشتووە، جا داوای لێ دەکا بالآیشی بنوێنێ، تا قیامەتەکەیشی بەرپا بێ.

کوشتت: ئێمە پێمان وایە (کوشتەت) ڕاستە، واتە کوژراوەکانت هەموو بە هەستانەوەت ڕاست بنەوە و ڕۆژی قیامەتت بێ.

(١٠) شەهد: هەنگوین، چەکیدە: ڕینگاڵ.

واتە: ئەرێ سالم! ئەوە مەسەلە چییە کە ڕینگاڵی هەنگوین لە قسەت دەتکێ؟! کاری عیشقەکەتە، یا کاری وەسفی یارە کە قسەتی کردووە بە ڕینگاڵی هەنگوین؟! ئێمە دەڵێین: هی هەردووکیانە. شیعرەکە تێکڕا ناسکە.

تەئسیری (ق): تەئثیری.

## -١٤- (*)

**تالآنی سەر و ماڵم چاوی ڕەشی فەتتانت**
**پابەندی دڵ و دینم گێسوویی پەرێشانت (١)**
**وەك خەنجەری ذیجەوشەن تا ڕۆژی حەشر دەتکێ**
**خوێنی دڵی مەظلوومان بەو خەنجەری موژگانت (٢)**
**بۆچم دەوێ ئەو قیبلە، گەر نەیکەمە خاکی ڕێت**
**ڕۆحم بە چ مەصرەف دێ، گەر نەیکەمە قوربانت؟! (٣)**
**لەب تیشنەیی ماچێکە لەو دامەنی پاکی تۆ،**
**مانیع مەبە لەم خێرە، دەستی من و دامانت (٤)**

(*) ئەم چوار بەیتە هەر لە (گم)دا هەیە، -وەك وترا- تێکەڵی پارچەشیعری پێشووتر کراوە.

**کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی ئەخرەب.**

(١) فەتتان: فیتنەباز، ئاژاوەگێڕ. پابەند: پێوەبەستراو، ئەوەی کە پێی پێ ببەسترێتەوە. کورد دەڵێ: پێوەند، کە زیاتر بۆ وڵاخی بەرزە بەکاردەهێنرێ.

واتە: تالآنکەری سەر و ماڵم چاوی ڕەشی ئاژاوەگێڕتە. زنجیری دڵ و دینم تاتای ئەگریجەی ئاڵۆز و پەرێشانتە.

(٢) ذیجەوشەن یا (ذي الجوشن): خاوەن کراسی زرێدار کە لە جەنگدا بیپۆشێ. جەوشەن: کراسی زرێدار.

واتە: تا ڕۆژی قیامەت خوێنی دڵی ستەمدیوەکان لە خەنجەری برژانگت، کە وەك خەنجەری پیاوی جەنگی کراسی زرێلەبەر تیژ و جەرگبڕە، دەتکێ.

(بەو خەنجەرەی)، ئەگەر (لەو خەنجەرەی) بووایە، تەواوتر دەبوو.

(٣) واتە: من ئەو قیبلەیەم بۆچییە؟ بۆچی ڕووی تێدەکەم، ئەگەر نەیکەمە ڕاگوزار و خاکی بەری پێت؟! گیانم بەکەڵکی چ جۆرە خەرجییەك دێت، ئەگەر نەیکەمە قوربانیی ڕێی تۆ؟! بەڕاستی، کە لە (قیبلە) دووردڵین، بە دوور نازانرێ (قەبرە) بووبێ، واتە: من ئەو قەبرەم بۆ ئەوەیە ببێتە ڕاگوزەرت .. تاد.

(٤) واتە: لێو تینووی ماچێکی داوێنی پاکی تۆیە. دەستم بە دامێنت، ڕێ لەم خێرە مەگرە، نەبادا لە تینوواندا بمرم و خوێنم بێتە ملت!

(لەو دامەنی پاکی تۆ)، ئەگەر (لەو دامەنە پاکەی تۆ) بووایە، جوانتر دەبوو.

-١٥- (*)

ڕایگرت بە ستەم دیسان چاوی ڕەشی فەتتانت
بۆ قەلبی دڵی زارم صەفصەف صەفی موژگانت (١)
ئاشوفتەگییی دەوران کوللەن لە دڵم قەیدە
سەودایی پەرێشانم بۆ زوڵفی پەریشانت (٢)
تیری موژە قاتیلمە، خۆت دوور بە لە نەزدیکم
وا چاکە نەبێ خوێنم ئالوودە بە دامانت (٣)
دڵ ساکینی گێسووتە، ڕەهجۆیە لەناو ظوڵمەت
تا ئابی بەقا مابێ لەو چاهی زەنەخدانت (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (نم، پ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی ئەخرەب.

(١) فەتتان: فیتنەباز. قەلبی دڵ: ناوجەرگەی دڵ. صەف صەف: ڕیز ڕیز. موژگان: برژانگ.

واتە: دیسان چاوی ڕەشی فیتنەبازت بە ستەمکاری تیری برژانگەکانتی بۆ دڵی پەرێشانم ڕاگرت، تا تیربارانی بکا.

(دیسان)ی نیوەبەیتی یەکەم لە (نم)دا کەوتووە.

(٢) ئاشوفتەگی: شێواوی و شپرزەیی. دەوران: سەردەم و زەمانە. کوللەن: بەتەواوی. قەیدە: نووسراوە. سەودا: گرفتاریی ئەوین.

واتە: بەسەرهاتی شێواویی دەور و زەمانە، سەرپاکی لە دڵمدا تۆمار کراوە. گرفتار و پەرێشانی ئەگریجەی شێواوی تۆم.

کوللەن (نم): یەکسەر. سەودایی (پ): سەوداوو. دروستترە.

(٣) موژە: برژانگ. قاتیل: بکوژ. ئالوودە: تێکەڵ. دامان: داوێن.

واتە: تیری برژانگی تۆ کوشتوومی. لەبەرئەوە خۆتم لێ بەدوور بگرە، تا ئۆباڵی خوێنڕشتنی من نەکەوێتە ئەستۆت.

(٤) ساکین: دانیشتوو. گێسوو: ئەگریجە، زوڵف. ڕەهجۆ: بەدوایڕێداگەڕاو. ظوڵمەت: تاریکی. ئابی بەقا: ئاوی ژیان. چاه: چاڵ. زەنەخدان: چەناگە.

واتە: دڵ لەناو تاڵەکانی ئەگریجەتدا جێگیرە، لەناو تاریکیی مووەکانتدا خەریکی گەڕانە بەدوای ڕێدا، تا بگاتە ئاوی ژیانی ناو چاڵی چەناگەت.

**دووهەفتەمەهی من تۆی، دوو هەفتەیە مەستووری**

**بێ، چاکی نیقاب لادە بۆ عاشقی حەیرانت (٥)**

**بەدگۆ! بە بەدی کردمت بەدنامی هەموو عالەم**

**سا لادە لە من ئیتر، توو مەصحەف و ئیمانت (٦)**

**وەك بولبولی شۆریدەم بۆ لێوی وەکوو غونچەت**

**پەروانەیی بێپەروام بۆ عاریضی ڕەخشانت (٧)**

**سا حەرفی دوعاخوانت گوێ بگرە، بڵێ ئامین**

**جان و دڵی "سالم" بێ، قوربانی دڵ و جانت (٨)**

لە ظوڵمەتدا (پ): لەناو ظوڵمەت.

(٥) دووهەفتەمەه: مانگی چواردە. مەستووری: داپۆشراوی. بێ: وەرە. چاك: چمك، لا. نیقاب: سەرپۆش، ڕووپۆش.

واتە: تۆ مانگی چواردەی منی، دوو حەفتەی سەرەتای مانگە تۆ دیار نیت و داپۆشراوی. وەرە لایەکی ڕووپۆشەکەت بۆ عاشقی سەوداسەری خۆت لا بدە.

(٦) بەدگۆ: دووزمان، زمانخراپ. بەدنام: بەدناو و دەمپیس. مەصحەف: قورئان.

واتە: ئەی بەدکاری دووزمان، تۆ ناومت بە خراپەکاری و بەد لەبارەوە وتن لەناو خەڵکدا زڕاند. توو قورئان و باوەڕت خۆتم لێ لا بدە.

کردمت (پ): کردم. سا لادە لە من ئیتر (پ): سا لادە ئیتر لێمان. مەصحەف (پ): مەذهەب. (و)ی پێوەندیی نێوان (مەصحەف) و (ئیمانت) لە (م)دا کەتووە.

(٧) شۆریدە: پەرێشان و شێواو. عاریض: ڕوومەت. ڕەخشان: درەوشاوە و ڕازاوە.

واتە: وەك بولبولی سەرلێشێواوم لێ هاتووە بۆ مژینی خونچەی دەمت، وەك پەروانەیەکی بێباك بە دەوری مۆمی درەوشاوەی ڕوومەتتدا دەخولێمەوە.

عاریضی ڕەخشانت (پ): شوعلەیی ڕوخسارت. دروستترە.

ئێمە لامان وایە ئەم وشەی (ڕەخشانت)ە لە ئاخری ئەم بەیتەوە جێی خۆی نییە و وشەیەکیتر بووە، بە (...انت) دوایی هاتووە بۆ هاوجووتی لەگەڵ ئاخری بەیتەکانیتر و بە هۆی هەڵەی ڕوونووسکەرەوەوە گۆڕاوە.

(٨) حەرف: قسە. دوعاخوان: دوعاخوێن، دوعای خێر کەر. جان: گیان.

واتە: گوێ بگرە لە دوعا و پاڕانەوەی من و بڵێ ئامین. گیان و دڵی سالم ببنە قوربانی دڵ و گیانی تۆ.

## -١٦- (*)

**دەناسی قاتیلی دڵ، گەر نیگەهـ کەی سوویی موژگانت**
**ئەدا کە خوونبەها، سا بۆسەیێ، دەستم بە دامانت (١)**
**تەواو نابێ لە سەودای عاریضت بۆ دڵ، گرفتاری**
**لە داوی طوڕڕە بەربوو، کەوتە نێو چاهی زەنەخدانت (٢)**
**کەفەن پیراهەنم بێت و مەشۆن زەخمم، وەصییەت بێ**
**بەخوونئالوودە ئازادن لە مەحشەردا، شەهیدانت (٣)**
**سەرم، ئەووەڵ قەدەم، دانا لەسەر کووچەی ڕەهی عیشقت**
**دڵ و دینم بە یەغما چوو لە سیحری چاوی فەتتانت (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، ف، غ، کم، ق، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) نیگەهـ: تەماشا، لاکردنەوە. سوو: لا. موژگان: برژانگ. ئەدا کە: جێبەجێ بکە. خوونبەها: خوێنبایی. بۆسە: ماچ. سا: دەی سا، کەواتە.

واتە: تەماشایەکی برژانگەکانی خۆت بکەی، دەزانی کێ دڵمی کوشتووە و بردوویە؟ دەی سا دەستم بە دامێنت، خوێنبایی دڵمم بدەرێ کە ماچێکە. بەڵام چۆن دەتوانێ بروانێتە برژانگی خۆی. لەوانەیە (تەعلیق بە موستەحیل) بێ.

قاتیلی (گم): قەتڵی. سا بۆسەیێ (عا): بۆسەیی، لەنگ دەبێ! (ق): یەك بۆسە. بە دامانت (گم): دامانت. لەنگ دەبێ.

(٢) سەودا: عیشق. عاریض: ڕوومەت. طوڕڕە: ئەگریجە، زوڵف. چاهـ: چاڵ. زەنەخدان: چەناگە.

واتە: دڵ هەرگیز لە گیرۆدەیی عیشق و سەودای ڕوخسارت ڕزگار نابێ، کە لە داوی ئەگریجەت بەردەبێ، دەکەوێتە چاڵی چەناگەتەوە!

(٣) پیراهەن: کراس. بەخوونئالوودە: خەڵتانی خوێن.

واتە: وەسیەت بێ، با هەر کراسە خوێناوییەکەم کفنم بێ و برینەکەم مەشۆن. ئەوانەی کە خەڵتانی خوێن و شەهیدی عیشقن، ڕۆژی حەشر ئازادن و کەس حەقی بەسەریانەوە نییە.

وەصییەت بێ (غ): دەمی مەرگم. خوون (گم): خوێن.

(٤) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (عا، غ)دا پاش و پێشن، لە (ج)یشدا شەشەمە.

یەغما: تاڵان. فەتتان: ئاژاوەگێڕ، فیتنەباز.

**بەریم یەکسەر لە نیعمەتهایی فیردەوسی، لە دونیادا**
**کەرەم کەی گەر بە من لیمۆیی پوستانت لە بوستانت (٥)**
**دەپرسی گەر لە مەهجوورت؟ بە پەیکانی موژەت سەوگەند:**
**خەمیدەقامەتە "سالم"، کەمانئاسا، لە هیجرانت (٦)**

واتە: یەکەم هەنگاوی ژیانم سەرم لە ڕێی کۆڵانی عیشقتدا دانا، دڵ و دینم بە هۆی جادووی چاوی ئاژاوەگێڕتەوە بە تاڵان چوون.

عیشقت (ف، ج، غ، ق): عیشقا.

(٥) ئەم بەیتە لە (مان، ق)دا نییە.

بەری: بێبەش. نیعمەتها: کۆی نیعمەتە، ڕۆزی. فیردەوس: بەهەشت.

واتە: ئەگەر لەم دنیایەدا لیمۆیەکی مەمکتم لە باخی سنگت پێ ببەخشی، هەرچی ناز و نیعمەتی بەهەشتە نامەوێ و لێی بەری دەبم!

بەریم یەکسەر لە نیعمەتهای (ف، ج، کم): بەریم مەحشەر لە نیعمەتهای. (گم): پەریم مەحشەر لە نەغمەتهای. کەرەم کەی .. تاد (عا، ف، ج، غ): کەرەم کەی گەر بە من لیمۆیی بوستانی لە پوستانت. (کم): کەرەم نەکەی ئەگەر بە من لیمۆیی پوستانی لە بوستانت. نە مانایە و نە کێش! (گم): کەرەم گەر پێم نەکەی لیمۆیی پوستانی لە بوستانت. ماناکەی ناتەواوە.

(٦) سەوگەند: سوێند. خەمیدە: چەمیوە. کەمانئاسا: وەك کەوان.

واتە: ئەگەر لە حاڵی عاشقی دوورت دەپرسی، سوێند بە تیری برژانگت، باڵای "سالم" بە دووریت وەك کەوان چەماوەیە.

دەپرسی (کم): ئەپرسی. سەوگەند (گم): سەوگەنە.

## -١٧- (*)

**هەمیسان لەتلەتە جەرگم، بە یادی تیری موژگانت**
**سەراسیمەم لەبەر فیکری ئیشارەی چاوی فەتتانت (١)**
**سییەهڕۆژ و پەرێشانم لە قەیدی سیلسیلەی زوڵفت**
**گڕی خستە دڵم، دیسان، خەیاڵی لەعلی خەندانت (٢)**
**بە شەرحی میحنەتی دووری، دڵی سەختت دەسووتێنم**
**لەپاش دەردی جودایی، گەر ببم یەك شەو بە میهمانت (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ق، نم، پ)دا هەیە. لە (مان، ق)دا، هەر پێنج بەیتە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) نیوەی دووەمی بەیتی دووەم لە (مان، ق)دا خراوەتە سەر نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە و دوو نیوەکەیتر کەوتووە.

سەراسیمە: سەرگەردان.

واتە: دیسان جەرگم بە یادی تیری برژانگەکانت لەتلەت بووە. ئەوەندە بیرم لە نیگای چاوی فیتنەگێڕت کردووەتەوە، سەرگەردان بووم.

(٢) سییەهڕۆژ: ڕۆژڕەش، بەختڕەش. قەید: زنجیر. سیلسیلە: زنجیرە. لەعل: لێو، کینایەیە لە لێوی سووری یار. خەندان: بەپێکەنین.

واتە: لەناو زنجیری پێچولوولی ئەگریجەتدا پەرێشانم و ڕۆژم لێ تاریك بووە. خەیاڵی لێوی بەخەندەت ئاگری بەرداوەتە دڵم.

دەشێ (گڕی) بە (گری)یش بخوێنرێتەوە، واتە ئاڵۆزی و پەشێویی خستە دڵمەوە.

(٣) ئەم بەیتە لە (مان)دا چوارەمە و لە (ق)یشدا نییە.

شەرح: لێکدانەوە. میحنەت: مەینەت. شەبها: شەوان. هیجران: لێکدووری. میهمان: میوان.

واتە: ئەگەر شەوێك، پاش شەوانێکی زۆری لێکدووریمان، ببمە میوانت. وەك چۆن دڵی خۆم سووتاوە، دڵی تۆیش بە باس‌وخواسی مەینەتی دووریی تۆ دەسووتێنم.

دڵی سەختت دەسووتێنم (پ): دڵت وەك خۆم دەسووتێنم. (نم): دڵی سەختت ئەسووتێنم. دەردی جودایی (پ): شەبهایی هیجران. ببم یەكشەو بە میهمانت (پ): ببم یەكشەب بە میهمانت.

**لەگەڵ من جەوری خۆت کەم بوو، ڕەقیبیش بوو بە هەمڕازت!**
**دەخیل فیرعەونی عەصری خۆت! مەکە سا گوێ لە هامانت (٤)**
**لە هەر سوو حاصیڵە ظوڵمەت، ڕەهـ ئەندەر ڕەهـ لە گێسووتا**
**دەسا ئاوی حەیاتیش وا لەناو چاهی زەنەخدانت (٥)**
**ئەگەر خوێن ئاسْتینت تەڕ نەکا، ئەی خوسرەوی خووبان!**
**دەزیبێ سەر لە مەیدانا بە بازیی گۆیی چەوگانت (٦)**
**دڵی پەروانەوارم، حەسرەتا، عومری چ کۆتا بوو؟**
**بە ئەووەڵ شوعلە سووتاندی، چراغی ڕوویی ڕەخشانت (٧)**

(٤) ئەم بەیتە لـە (مان، ق)دا نییە.

هەمڕاز: هاوڕاز. هامان: وەزیرێکی خراپەکاری فیرعەون بوو، بە لاڕێدا دەیبرد و خراپەی پێ دەکرد.

واتە: سزا و ئازاری خۆت بەرامبەر بە من کەم بوو، وا هیی بەدکاریشت کردە سەرباری. دەخیلتم، تۆ فیرعەونی سەردەمی خۆتی، گوێ لە "هامان" مەگرە کە دەتخاتە ناو داوی خراپەکاری.

مەکە سا (نم): لـەکە سا. هەڵـەی نووسینە.

(٥) هەر سوو: هەر لایەك. ظوڵمەت: تاریکی. ڕەهـ ئەندەر ڕەهـ: ڕێ بەناو ڕێدا. گێسوو: زوڵف.

واتە: ڕێگە بەناویەکداچووەکانی ناو ئەگریجەت، لـە ئەنجامدا لـە هەموو لایەکەوە بە تاریکی دەگەن. ئاوی ژیانیش لـەناو چاڵی چەناگەتدایە.

(٦) ئاستین: قوڵـی کراس و کەوا. خوسرەوی خووبان: شای جوانان. دەزیبێ: دەڕازێتەوە و جوان دەبێ. بازیی چەوگان: یاریی گۆچان.

واتە: ئەگەر بەر لـە سەربڕینم قۆڵـی کراس و کەواکەت هەڵـنەکەی، خوێناوی دەبن و یاریت پێ ناکرێ بە سەرم. جا چونکە منیش دەمەوێ لـە مەیدانی یاریی گۆ و گۆچاندا یاری بە سەرم بکەی، پێشتر قۆڵـەکانت هەڵـکە با خوێناوی نەبن.

بە بازیی (ق): بە یادی. (پ): بببێتە.

(٧) ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی لـە (مان، ق)دا نین.

پەروانەوار: وەك پەروانە. حەسرەت: داخەکەم. کۆتا: کورت. چراغ: چرا. ڕەخشان: درەوشاوە.

واتە: بە داخەوە، تەمەنی دڵـی وەك پەروانە سووتاوم زۆر کورت بوو! چرای ڕووی گەش و درەوشاوەت بە یەکەم بڵێسە و گڕ هەڵـیپڕووزاند و سووتاندی.

دوباره زەخمی دڵ موشتاقە بۆ تیری نیگاهت، دەی
لە عیشوەت ئاوی زەهری چێشتبێ، گەر نووکی پەیکانت (٨)
بەبێ تۆ زیندەگیم ناوێ، لە دووریی تۆ حەیات مەرگە
لە دەستم بەرمەدە دامەن، وەرە دەستم بە دامانت (٩)
مەرامی خاطری ئەغیارە ڕەفتارت لەگەڵ "سالم"
بە میثلی عەهدی دونیایە وەفاوو عەهد و پەیمانت (١٠)

(٨) زەخم: زام، برین. موشتاق: پەرۆش. پەیکان: سەرەتیر.

واتە: ئەگەر نووکی سەرەتیری ڕوانینت ژەهراوی لە عیشوە و نازی تۆ چێشتبێ، برینی دڵ دیسان پەرۆشی ئەوەیە لای لێ بکەیتەوە و بیکولێنیتەوە.

(٩) زیندەگی: ژیان.

واتە: ژیانم مەرگە ئەگەر تۆم لێ دوور بی، بۆیە ژیانی وام ناوێ. سا دەستم بە داوێنت، دەستم لە داوێنت مەکەرەوە. ژیانم بەبێ تۆ ناوێ، لە کاتێکدا ژیان و هەڵکردن بەبێ تۆ ئەستەم و مردنە. پەنام بۆ تۆ هێناوە، دەستم لە داوێنت مەکەرەوە.

حەیات (پ): ژیان. بەرمەدە دامەن، وەرە (م): بەرمەدە دامان، وەرە. (پ): دامەنم پێ بەرمەدە.

(١٠) مەرام: مەبەست، ئامانج. خاطر: دڵ.

واتە: ڕەفتاری تۆ لەتەك "سالم" وای نیشان دەدا کە ناحەز و بێگانە چییان دەوێ، تۆ وا دەکەی. وەفا و بەڵێن و پەیمانی تۆ، وەك هیی دنیا وەهایە.

ئەغیارە (م): ئەغیار بە. هەڵەیە. وەفاوو عەهدی (ق): وەفاوو طەبعی. (پ): وەفا و پەیوەندی.

## -١٨- (*)

**موسەلسەل هاتە سەر دۆشت، بە بازی، زوڵفی چەوگانت**
**لە حەلقەی جەدوەلی خەمیا، دەڵێی گۆی عاجە پوستانت (١)**
**نیشانەی فەتحییە وەختی هەزیمەت لەشکری غەمزەت**
**شکستە بۆ دڵی عاشق صەفی بەرگەشتەموژگانت (٢)**
**لە باغا غونچە دڵتەنگە لە حەسرەت غونچەیی لێوت**
**گەریبانچاك ڕوواوە گوڵ لە بەر شەوقی گەریبانت (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ق، نم، پ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) موسەلسەل: بە زنجیرە. دۆش: شان. بازی: یاری، گەمە. چەوگان: گۆچان. قەید: زنجیر. خەمیا: چەماوەیدا. عاج: ئێسقانی فیل. پوستان: مەمك.

واتە: ئەگریجەت، چین چین بە یاری و دەستبازی هاتە سەر شانت. گۆی مەمکت لەناو زنجیری پێچ و لوولی ئەگریجەتدا دەڵێی گۆیەکە لە عاج دروست کراوە.

لە حەلقەی جەدوەلی (پ): لە قەیدی حەلقەیی.

(٢) فەتحییە: سەرکەوتنیەتی. هەزیمەت: بەزین، شکان. شکست: شکان. صەف: ڕیز. بەرگەشتە: کشاوەدواوە، هەڵگەڕاوە. موژگان: برژانگەکان.

واتە: لەشکری غەمزە و نیگای چاوت نیشانەی سەرکەوتنی لە کاتی بەزیندا پێوە دیارە. ڕیزی برژانگی گەڕاوەدواوەت، مایەی تێشکانە بۆ دڵی عاشق.

شکستە بۆ (پ): شکا تیبی. صەفی بەرگەشتەموژگانت (پ): کە وەرگەڕیاوە موژگانت.

(٣) ئەم بەیتە لە (نم)دا چوارەمە.

گەریبانچاك: یەخەدادڕاو. چاکی: کراوەیی.

واتە: خونچەی باخ لە داخی خونچەی لێوی تۆ کە گۆی هونەری لێ بردووەتەوە، دڵی تەنگە. گوڵ، لە بەر ڕووناکیی یەخەی کراوە و بەدەرەوەی تۆدا کە تووکی ڕووواوی سەر سینەتی دەرخستووە، لەتلەت بووە. مەبەستی، یەخەی کراوە و لەتلەتی گوڵ و لێكجیایی پەڕەکانیەتی.

گەریبانچاك ڕوواوە (نم): گەریبان چاکە هەر سوو. شەوقی (نم): چاکی.

له لای من زوڵفی تۆیە باعیثی ئاشوفتەگیی دونیا
نەماوە فیتنە بۆ عالەم، بە غەیرەز چاوی فەتتانت (٤)
ئومێدی دڵ نەماوە تا حەشر ئازادی قەیدت بێ
طەلیسمی بابلە، جانا!، مەگەر چاهی زەنەخدانت؟! (٥)
حوبابی ئاو موبەددەل بوو بە ئەصڵی بەیضەیی قومری
لە حەسرەت عەکسی سایەی قامەتی سەروی خەرامانت (٦)
سولەیمان نەیدەکرد ئەسراری خاتەم قەت لەگەڵ سوخرە
ئەگەر لەو وەختەدا ظاهیر دەبوو، لەعلی بەدەخشانت (٧)

(٤) باعیث: مایە، هۆ. ئاشوفتەگی: شێواوی. غەیرەز: جگە لە. فەتتان: فیتنەگێڕ.
واتە: من پێم وایە ئەگریجەی تۆ بووەتە هۆی شێواویی دنیا. جیهان، لە چاوی فیتنەگێڕی تۆ بەولاوە، هیچ شتێکی‌تری مایەی ئاشووب‌نانەوەی تێدا نەماوە.
(٥) طەلیسم: تەلیسم، پارچەکاغەز یا مەعدەنێکە جادووگەر یا فاڵچی هێڵ یا خشتە یا پیت و وشەی لەسەر دەنووسێ و پێی وایە کەسێك یا شتێك دەپارێزێ، یان مرۆڤ لە بەڵا و ئازار دوور دەخاتەوە. جانا: گیانە. چاه: چاڵ. زەنەخدان: چەناگە.
واتە: دڵ ئومێدی ئەوەی نییە تا ڕۆژی حەشر لە کۆت و بەندی تۆ دەرباز بێ. گیانە چاڵی چەناگەی تۆ تەلیسمی بابلە، ئەوی تێ‌بکەوێ، لێی ڕزگار نابێ.
حەشر (پ): بە حەشر. لەنگ دەبێ.
(٦) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (مان، ق)دا نین.
حوباب: بڵقی ئاو. موبەددەل بوو: گۆڕا. بەیضە: هێلکە. خەرامان: بەلەنجەولار.
واتە: بڵقی ئاو لە داخ و عەزرەتی سێبەردانەوەی باڵای سەرو شێوە و بەلەنجەولاری یار، گۆڕا بە هێلکەی قومری کە لەسەر سەروی باڵای یار دەنیشێتەوە.
(٧) سولەیمان: حەزرەتی سولەیمان کە پایەی پێغەمبەریی هەبووە و خودا بای خستووەتە خزمەتی و لە زمانی ئاژەڵان تێ‌گەیشتووە. ئەموستیلەیەکی بووە، ناویی لەسەر نەخش کراوە و بەو هۆیەوە حوکمی بەسەر مرۆڤ و پەری و باڵندە و دڕندەدا کردووە. ئەسرار: کۆی سیڕ، نهێنی. خاتەم: ئەموستیلە. قەت: هەرگیز. سوخرە: بێگاری پێ‌کراو. ظاهیر دەبوو: دەردەکەوت. لەعلی بەدەخشان: کینایەیە لە لێوی سوور.
واتە: حەزرەتی سولەیمان، ئەگەر لێوی سووری تۆ دەربکەوتایە، حوکمی ئەنگوستیلەکەیی لەگەڵ

**به غەیرەز جان‌فشانی، فیکری هیچ ناکا دڵی "سالم"**
**به عەفوا بەرمەدە، تووبی و خودا، دەستم لە دامانت (٨)**

داماوان نەدەخستە کار.

نەیدەکرد (نم): نەیئەکرد. وەختەدا (نم): وەخبەدا. هەڵەی نووسینە. (پ): حینەدا. دەبوو (نم): ئەبوو.

(٨) به عەفوا: بە خۆڕایی.

واتە: سالم، لە گیان‌بەخت‌کردن بەولاوە، بیر لە هیچی‌تر ناکاتەوە. لە ڕێی خودادا بە خۆڕایی دەستی لە کەمەرت بەرمەدە.

بە عەفوا (ق، نم): بە ئەفوا. هەڵەیە. تووبی و خودا (نم): تووبی خوا.

(*) -١٩-

**میرزا! وەرە لێم لادە، دەستی من و دامانت**
**ئەیمەن مەبە لێم، نەك بێم یەك دەفعە بە مەیدانت (١)**
**تۆ قاژیی و من شاهێن، مەقرێنە بە دەورمدا**
**نەك حەملە بەرم، ڕۆبەم چەنگەڵ لە چیقڵدانت (٢)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەجووبابەتە لە (مان، ف، کم، گم)دا هەیە. سەرباسەکەی لە (مان)دا: ((رقعەایست بمیرزا سلیمان سرّاج نوشتەام))ە، یانێ پارچەیەکە بۆ میرزا سلێمانی زیندرووم نووسیوە. ناسناوی "سالم" لەم پارچەشیعرە داشۆرینەیشدا نییە. "گیوی موکریانی" لە چاپەکەی خۆیدا نووسیویە: (("سالم" ئەمەی خوارەوەشی لە بارەی میرزا "سلێمان"ی زیندرووی هەستیار داناوە))، ئاماژەیەکی وای تێدایە کە کابرا شاعیر بووبێ. ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی، ژ٢٢، ١٩١٨/٤/١، ل٢-٣) لە بابەتی (ئەدەبیاتی کورد: سالم)دا نووسیویە: ((سالم لەگەڵ میرزا محەمەد سەرڕاج کە ئەویش لە شوعەرای کوردە، موشاعەرەیەکی ڕەندانەی خۆشی هەیە)) (بڕوانە: ڕۆژنامەی تێگەیشتنی ڕاستی ١٩١٨-١٩١٩ یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی لە عیراق، ئامادەکردنی ڕەفیق ساڵح و سدیق ساڵح، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٥٦-٥٧، پرۆژەی هاوبەشی بنکەی ژین و دەزگای ئاراس).

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی ئەخرەب.

(١) ئەیمەن: ئەمین، دڵنیا و بێترس.

واتە: میرزا -دەستم بە داوێنت- خۆتم لێ لادە، ئەمین مەبە لێم و وا مەزانە لێت بێدەنگ دەبم. نەوەك جارێکیان ڕقم هەستێ و بێمە مەیدانت، بە داشۆرینێکی لەمە خەستوخۆڵتر داتشۆرم.

(٢) قاژ: قەلەڕەش. شاهێن: بازی شکاری. ڕۆبەم: ببەمە ناو. چەنگەڵ: چنگاڵ، چنگ. چیقڵدان: چیکڵدان، ئەندامی دان تێدا کۆکردنەوەی باڵندە.

واتە: تۆ ناتوانی خۆت لەبەر شالآوی مندا بگری، مەردی ئەم مەیدانە نیت. تۆ قەلەڕەشی و من بازی شکاری، بە دەورمدا مەقرێنە و تووڕەم مەکە، نەبادا لە ناکاودا پەلامارت بدەم و بە چنگ چیکڵدانەت دەربهێنم!

تۆ قاژی و من (کم): تۆ قاژ و ئەمن (گم): تۆ قاز و ئەمن. ((مەقرێنە)) زۆرتر بۆ قەل لەبارە. جگە لەوە، قاز بێوەیە، بۆ ململانێی باز ناشێ، بەڵام قاژ بێشەرمە، لەوانەیە بتوانێ تووڕەی بکا! بە دەورمدا (گم): بە دەورەمدا! ڕۆبەم چەنگەڵ (ف، کم، گم): گیرکەم چنگێ.

**من طوغرول و تو صەعوە، قەصدم ئەمەتە ناگاه**
**میخلەب لەسەرت گیر کەم، دەرچێ لە عەقەب جانت (٣)**
**من شێرم و تۆ گاوی، شەڕڕاڕیی و ناترسی!**
**جوستەن کەم و بشکێنم، وەك نەی هەمو ئێسقانت (٤)**
**بۆ من قەڵەمە نێزە، بۆ تۆ سیپەرە دەستگا!**
**بۆ تەجرەبە، با لێدەم یەك حەربە لە قەڵغانت (٥)**
**نووکی قەڵەمم تیژە وەك نێشی درەفشی تۆ**
**سووهانزەدەیە فیکرم وەك گازنی بوڕڕانت (٦)**

(٣) ئەم بەیتە لە (ف)دا چوارەمە.

طوغرول: جۆرە باڵندەیەکی شکاریی لە توخمی بازە. صەعوە: چۆلەکەی بچووك (فیسقە). ناگاه: لە ناوەختدا، یا ناکا: نەکا، نەوەکا، نەبادا. میخلەب: چڕنووك، چنگ. عەقەب: دوا، مەبەستی پاشیەتی!

واتە: من بازی شکاریم و تۆ چۆلەکەیەکی بچووك، مەبەستم ئەوەیە خۆتم لێ لادە، نەبادا چنگ لە سەرت گیر بکەم و گیانت لە پاشتەوە دەربچێ و جیقوفیقت دەربهێنم.

ناگاه (گم): ناگا. سەرت (ف): بەرت. (کم، گم): بەزت! هەڵەی نووسینە. جانت (کم): گیانت.

(٤) ئەم بەیتە لە (ف)دا سێیەمە.

شەڕڕاڕی: شەڕانیی و چەتوونی. جوستەن: ڕاپەڕین، هەڵمەتی گورج. نەی: نەیچە، قامیش.

واتە: من شێرم و تۆ گای شەڕانی، ناترسی لێت ڕاپەڕم و وەك نەیچەی وشك ئێسكوپرووسكت وردوخاش بکەم؟!

(٥) دەستگاه: دەزگا، ئاسنێکی سەرپانی نیمچە چەماوەیە، زیندروو و کەوشدروو و کڵاشکەر لە بەردەستی خۆیاندا دایدەکوتن و تیلمەقایش و شتی وای لەسەر دەبڕن و ڕێکیدەکەن. حەربە: نێزە، سونگی.

"سالم" دەڵێ: قەڵەمی من نێزەی جەنگە و قەڵغانی تۆ دەزگا هیچەکەتە! یانێ من شاعیری ڕاستەقینە و قەڵەمبەدەستم، جەنابیشت زیندرووی، نەك شاعیر. تۆ دەزگا و من قەڵەم! هەر بۆ تاقیکردنەوە، با نێزەیەك بگرمە قەڵغانەکەت، بزانم چی ڕوودەدا؟! بێگومان قسەکەی "سالم" تونێکڵدارە!

نێزە (کم): نێزە و. دەستگاه (کم، گم): دەزگا. حەربە (کم، گم): ضەربە.

(٦) نێش: نووك. درەفش: درەوش، کە لە چەرمکاریدا بەکاردەهێنرێ و یارمەتیی دەرزی دەدا! سووهان: بڕبەن. سووهانزەدە: بە بڕبەن ڕنراو و سافکراو. گازن: شفرەی زیندروو. بوڕڕان: زۆر

ڕەنگینە هەموو شیعرم وەك نەقشی تەکەڵتووی زین
مەضموونکەشە فیکرم وەك قوللاپی دروومانت (٧)
سەرڕاجیی و هەم شاعیر، هەم ڕۆبەم و هەم داشۆم
دەفتەر لە تەغاراوت، دەرزی لە بنی ڕانت (٨)
ڕەنگدۆمی و ڕەنگزیندۆز، هەم لێدەم و هەم بەندکەم
کشتەك لە کونی لووتت، مشتەت لە دەفەی شانت (٩)

تیژ و بڕندە.

واتە: نووکی قەڵەمی من وەك نووکی درەوشی تۆ تیژە. بیرتیژم، بیر و هۆشم ساف و بێگەردە و وەك گازنەکەی تۆ تیژە!

نیشی درەفشی (ف): نووکی سینانی تۆ. (کم، گم): نووکی درەوشی.

(٧) تەکەڵتوو: نمەدزین، نەرمەزین، کە لە ژێر زینەوە بەسەر پشتی ئەسپ و مایندا دەدرێ. مەضموونکەش: ماناکێش، واتادار و قووڵ!

"سالم" بەراورد لەنێوان چەکی خۆی و چەکی میرزای زیندروودا دەکا، دەڵێ: شیعرم ڕەنگین و پڕ نەخش و نیگارە، وەك نمەدزینی جوان و نەخشێنراو. هەروەها بیرم تیژ و بەهێزە، شتی پرواتا دەخاتە ڕوو. قسەم، وەك قولاپی دروومانت کە دەزوو و کشتەکی بەهێز و درێژ ڕادەکێشێ! مانای زۆر دەدا.

قوللاپی (ف، گم): قوللابی.

(٨) سەرڕاج: وەستای زیندروو. ئەوسا پیشەیەکی بەبرەو بوو! ڕۆبەم: ببەمە ناو، تێخەم بەرەو ناو. داشۆم: بشۆم، پاك بکەمەوە، داشۆردنی ئاسایی، نەك هەجوو کە زیاتر بۆ پاككردنەوەی جلوبەرگ لە پیسایی دەوترێ! تەغاراو: دەفری ئاوی پینەچی، کە ئاوی تێدەکا بۆ خووساندنەوەی چەرم و شتی وا.

واتا نادیارەکەیشی، دەبێ پاش و بەرەو ژووری میرزا بێ! هەروەها دەبێ «دەرزی لە بنی ڕانت» تێسرەواندن بێ!! بەم جۆرە واتە: تۆ میرزا!! هەم زیندروو و هەم شاعیر، خاوەنی دەرزی و خاوەنی دەفتەری، من لە کۆڵت نابمەوە! دەرزی بە بنڕانتدا دەکەم و دەفتەری شیعرم کە بە تەغاراوت (پاشت) پیس دەبێ، دایدەشۆم!!

ڕۆبەم و (کم، گم): ڕۆیم و. تەغاراوت (کم، گم): تەغار ئاووت. دەرزی (گم): دەڕژێ.

(٩) ڕەنگزیندۆز: ڕەنگی مردوو لێتیشتوو. مشتە: ئامرازی سەرپان و دەسكباریك و قورسی پەڕۆ و چەرم کوتانی پینەچی و کڵاشکەر.

**هەم لێدە تەقەڵ، هەم خەط، هەم لێبەم و هەم تێکەم**
**نەخ نەخ لە کونی دەرزی، نەم نەم لە قەڵەمدانت (١٠)**
**تێت ناوە، لە لات خۆشە، ناخۆشە دەری بێنن**
**بەو خەرجە دەبێ دەربێ، ئەو پارە لە گیرفانت! (١١)**
**دەرپێ بکەنە، هەم ڕەخت، هەم بدبەم و هەم بدخەم**
**لەو حەوضی حەمامی گەرم، بێ جل، تەنی عوریانت! (١٢)**

واتە: ڕەنگت، نەك لە زیندروو، زیاتر لە دۆم دەچێ، بەڵام تۆ خەریکی زیندروونیشی؛ من کشتەکی زینکارییەکەم لە کونی لووتت گیر دەکەم و بە مشتەکەیشت لە دەفەی شانت دەدەم.

ڕەنگ‌دۆمی.. تاد (گم): ڕەنگ دۆمی فەڕەنگی زەند، هەم لێ دەم و هەم بەند کەم (کم): ڕەنگ دۆمی و ڕەنگ زەند هەم لێت دەم و هەم بەند کەم. (گم) لەوانەیە مەبەستی لە ڕەنگی زەند ئەوە بێ کە زەندی، واتە بازووت سپی و سوورە! «ڕەنگ»ی یەکەم (ف): ژەنگ. هەڵەیە. مشتەت (ف): مشتێ. شانت (گم): ڕانت.

(١٠) نەخ نەخ: تاڵ‌تاڵ. نەم‌نەم: دڵۆپ‌دڵۆپ.

واتە: تۆ، کە زیندروو و شاعیری، هەم تەقەڵ لێبدە و هەم خەت بکێشە و بنووسە! تاڵ‌تاڵ دەزوو لە کونی دەرزیت بەکار بێنە و دڵۆپ‌دڵۆپ لە قەڵەمدانت. ئەمە بۆ میرزا شتێکی ئاساییە. سالمیش کە دەڵێ: «هەم لێبەم و هەم تێکەم»، لەوانەیە بە تویکڵەوە بیڵێ. جا لەم ڕووەوە «نەخ نەخ لە کونی دەرزی»، واتە: تاڵ‌تاڵ لە کونی دەرزیم، دڵۆپ دڵۆپ بۆ چاوی قەڵەمدانت!! ئەگەر پاشان گلەیی لێ بکا کە بۆ وات وتووە، بە ئاسانی خۆی دەپەڕێنێتەوە، چونکە قسەکەی دوو واتا هەڵدەگرێ.

لێبەم و (کم، گم): لێدەم و.

(١١) واتە: پێت خۆشە پارەت خستووەتە گیرفانت، لات ناخۆشە دەری‌بێنن، بەڵام ناچارییە. دەبێ ئەو پارەیە بۆ خەرجی لە گیرفان دەربێ و هەتا هەتایە لەوێ نامێنێتەوە. واتا تویکڵدارەکەیشی ئاشکراترە.

بەو خەرجە (کم، گم): بۆ خەرجی، لەبارتر و سوارترە. دەری‌بێنن (کم، گم): دەری‌بێنی. بەو خەرجە (کم، گم): بۆ خەرجی.

(١٢) ڕەخت: بەرگ و پۆشاك.

واتا ئاشکراکەی: دەرپێ و جلی بەرت دابکەنە، بۆنی چەرمت لێ دێ، با بتبەم و لەشی ڕووتی بێ‌جلت لە حەمامی گەرمدا بخەم. واتاکەی تریشی دیارە.

**صەنعات و سەخایی تۆ، بەس تەنگ و گوشاد هاتن:**
**هەم حەلقەیی ئاوزوونەت، هەم سفرەیی میهمانت! (١٣)**

دەرپێ بکەنە .. تاد (ف): دەرپێ بکەنە، هەم ڕەخت، هەم بدەم و هەم بدخەم. (کم): دەرپێ بکەنە هەم ڕوخصەت بدە تا بتخەم، لەنگە! (گم): دەرپێ بکەنە زووکە، ڕوخصەت بدە تا بتخەم. زۆر سوارە! لەو حەوضی (کم): بۆ حەوضی. (گم): بۆ حەوزی. تەنی (کم، گم): لەشی.

(١٣) صەنعات: پیشە. سەخا: دەهەندەیی، بەدەستودڵی. بەس: زۆر. ئاوزوونە: ئاغزوونە، ئەڵقەی ددانەداری مەعدەنی کە زمانەی پێوەیە، بۆ داخستنی قایشی پشت و کەوش و بەرەزین بەکاردەهێنرێ.

واتە: پیشەی تۆ، یا دەستکردی تۆ، لەگەڵ دەهەندەییت؛ یەکەمیان کە ئەڵقەی ئاوزوونەیە، زۆر تەنگە، دووەمشیان کە خوانی میوانیتە، زۆر پانە. مەبەستی لە ئەڵقەی ئاوزوون، (کونی پاش)ی و لە سفرەی میهمانی (سمت)یەتی.

صەنعات (کم، گم): صیفات. ئاوزوونت (کم، گم): ئاوزەنگیت. میهمانت (کم، گم): میوانت.

(*) -٢٠-

**به نەزاکەت نییە گوڵ وەك بەدەنت**
**غونچە دڵتەنگە لە حەسرەت دەهەنت (١)**
**سینە پڕچاکە لە تیری غەمزەت**
**دڵ گرفتارە لە چاهی ذەقەنت (٢)**
**باغەبان! ئەمڕۆ لە باغا، قەدی یار**
**پەستی کرد قامەتی سەروی چەمەنت (٣)**
**کاشیفی کوفرە لە ڕوو کافری دین**
**تاری گێسوویی خەمی پڕشکەنت (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) دەهەن: دەم.

واتە: گوڵ، وەك لەش‌ولاری تۆ، نەرم و دڵگر و جوان نییە. خونچەی نەپشکووتوو لە خەفەتی ئەو دەمە بچووکە تەنگەی وا خودا بە تۆی داوە، دڵتەنگ و خەمبارە. جوانە (غونچە) لەگەڵ (تەنگ) کۆکراوەتەوە، هەم دەمی تەنگە و هەم دڵی تەنگ!

(٢) پڕچاك: زۆر لەت‌لەت. چاه: چاڵ. ذەقەن: چەناگە.

واتە: ئەوەندەت تیری غەمزە گرتووەتە سینەم، پارچەپارچە بووە و شوێنی ساغی نەماوە. دڵیش لە چاڵی چەناگەتدا بەند و گرفتارە، یا عاشقی چاڵی چەناگەتە.

نیوەی یەکەمی بەیتەکە لەنگە.

(٣) واتە: ئەی باخەوان! ئەمڕۆ کە یار هات بۆ گەشت و گەڕانی ناو باخ و قەد و باڵای بەرزی خۆی نواند، باڵای سەروی باخی پەست و خەمبار کرد، یا نزمی کردەوە و چەماندییەوە!

(٤) دین: ئایین، بینین. تار: تاڵ. گێسوو: ئەگریجە، زوڵف. خەم: چەماوە. پڕ شکەن: پڕ لە پێچ‌ولوول.

واتە: تاڵی ئەگریجەی پڕ لە پێچ‌ولوولت، هەم لابەری کوفرە و هەم داپۆشی دینە. کاتی لادان و دووبارە هاتنەوەی بەسەر ڕوخساردا، جارێك ڕوومەت دەردەخا و جارێك دایدەپۆشێ.

**ئەی گوڵاو! جێگەیی تۆ شیشە نییە**
**عاریضی دڵبەرە ئەصڵی وەطەنت (٥)**
**سوجدە بۆ تاقی برۆی یار، بەرە تۆ**
**وەثەنی بی، مەپەرستە وەثەنت (٦)**
**دادی شیرین مەدە "سالم" بە قەڵەم**
**نییە قەندی قەڵەمێ وەك سوخەنت (٧)**

(٥) عاریض: ڕوخسار، ڕوومەت.

واتە: ئەی گوڵاو، تۆ چی دەکەی لەناو شووشەدا؟ ئەوێ شوێنی تۆ نییە، نیشتمانی ڕاستەقینەی تۆ ڕوخساری یاری نازدارە.

(٦) وەثەنی: بتپەرست. وەثەن: بت.

واتە: ئەی بتپەرست! ئەگەر بە ڕاستییش بتپەرست بی، نابێ بتەکەت بپەرستی، وەرە کڕنووش لە بەردەمی تاقی برۆی کەوانەیی یاردا بەرە.

(٧) دادی مەدە: مافی جێبەجێ مەکە. قەند: شەکر. قەڵەم: خامە.

واتە: کەواتە، ئەی سالم، بە قەڵەم مافی شیرین مەدە و بە شێوەیەکی شایستە و گونجاو ڕەفتاری لەتەکدا مەکە. نووسینی جوان و شیرینی هیچ قەڵەمێك هێندەی گفتولفتی تۆ شیرین نییە.

مەدە (کم): کەدە. هەڵەیە.

-٢١- (*)

**ئەگەر باوەڕ دەکەی، سەوگەند بە ئەبرووت**
**هیلالئاسا خەمیدەم بۆ مەهی ڕووت (١)**
**دوصەد عوقدەم لە دڵدایە بەبێ تۆ**
**درۆ ناکەم بە عوقدەی چینی گێسووت (٢)**
**فسوونی عیشقی تۆ بۆ من طەلیسمە**
**بە ئەفسوونی نیگاهی چاوی جادووت (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ف، ج، غ، ق، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەقسوور.

(١) سەوگەند: سوێند. هیلالئاسا: کەوانەیی وەك مانگی یەكشەوە. خەمیدە: نوشتاوە، چەماوە. مەه: مانگ.

واتە: ئەگەر باوەڕم پێ دەکەی، سوێند بە برۆی وەك مانگی یەكشەوەت، باڵام وەك مانگی یەكشەوە لاواز و چەماوەیە بۆ بینینی تۆ و گەیشتن بە مانگی ڕوخسارت.

دەکەی (کم): ئەکەی.

(٢) عوقدە: گرێ.

واتە: سوێند بە گرێی چینی ئەگریجەی لوولت، بەبێ باڵات و کاتی دووری لە تۆ دووسەد گرێ لە دڵمدایە و هەرگیز فریای کردنەوەیان ناکەوم!

((بە عوقدە .. تاد)) وەك سوێند هەڵدەگرێ، هۆیش هەڵدەگرێ، یانێ دووسەد گرێ بە هۆی یەك گرێی چینی ئەگریجەتەوە لە دڵمدایە.

(٣) فسوون، ئەفسوون: فێڵ و تەڵەکە. جادوو: سیحرباز.

واتە: سوێند بە تەڵەکە و فێڵی نیگای چاوی سیحربازت، تەڵەکە و فێڵی ئەڤینی تۆ لە من بووەتە تەلیسم، بۆم ناکرێتەوە و هەرگیز لێی ڕزگار نابم.

((بە ئەفسوونی)) وەك سوێند هەڵدەگرێ، واتای هۆیش هەڵدەگرێ.

فسوونی (ف، ج، غ، ڕ، کم، گم): سەراسەر، جوانە و نابێتە دووبارەکردنەوە. بە ئەفسوونی نیگاهی (ڕ): بە ئەفوونی لگاهی. هەڵەیە.

**له کونجی بێکەسی جانم بە لەب هات**
**بە گۆشەی لەبنشینیی خاڵی هیندووت (٤)**
**لە ئەشکی خوێن بە یادی لێوی ئاڵت**
**کەنارم بوو بە کانی لەعل و یاقووت (٥)**
**تەنووری پرگڕە، میحنەتسەرای دڵ**
**بە گەرمیی تابی شوعلەی ئاتەشیخووت (٦)**

(٤) جانم بە لەب هات: گیانم گەیشتە سەر لێوم و خەریکە دەربچێ. لەبنشینی: لێونشینی، وەك خەڵوەتنشینی! لەسەر گۆشەی لێو گیرساونەوە.

واتە: سوێند بە خاکینەیی و کەنارگری و گۆشەنشینیی خاڵی ڕەشت، من لە لای لێوت لە کونجی بێکەسی و غەریبیدا گیان هاتووەتە سەر لێوم و دەیەوێ ماڵاوایی لە دنیای خەم و پەژارە بکا. چەند جوانە؟ سالم لە نامۆیی و بێکەسیدا گیانی هاتووەتە سەر لێوی بۆ دەرچوون، خاڵی یاریش وەك پادشا لای لێوی حەزرەتی یار گۆشەنشینە! چۆن گۆشەنشینییەکە؟!

«بە گۆشەی...» وەك سوێند هەڵدەگرێ، واتای هۆیش هەڵدەگرێ.

بە گۆشەی (کم): بۆ گوشەی!

(٥) ئەم بەیتە جوانە لە (مان، ق)دا نییە، لە (غ، ڕ)دا شەشەمە.

ئەشك: فرمێسك. کەنار: کۆش، داوێن، دەوروبەر.

واتە: هۆن هۆن فرمێسك لەگەڵ یادی لێوی ئاڵتدا دەڕێژم، چونکە یادەکە هی لێوی ئاڵە، فرمێسکیشم ئاڵ دەبێ و دەڕژێتە کۆشم. داوێنم دەبێتو ئەو کانەی کە لەعل و یاقووتی سووری لێ دەردەهێنرێ.

لە ئەشکی خوێن بە یادی لێوی ئاڵت (ف): لە ئەشك بە یادی لێوت ئاڵت. هەڵەی نووسینە. «بە»ی «بوو بە» لە (غ)دا کەوتووە. «بە یادی...» سوێندیش هەڵدەگرێ.

(٦) ئەم بەیتە لە (غ، ڕ)دا پێنجەمە، لە (ق)یشدا نییە.

میحنەتسەرا: سەرای میحنەت، خەفەتخانە، خانەی مەینەت و پەژارە. سەرای دڵ: ناوی دڵ. تاب: تاو. ئاتەشیخووت: خووی ئاگرینت، تووڕەیی و ڕق.

واتە: سوێند بە گەرمیی تاوی بڵێسەی خووی ئاگرینت، سەرای دەروونم تەنوورێکی پڕ لە گڕە و هاڵاوی خەفەتە؛ یا بەهۆی گەرمیی خووی ئاگرینتەوە، بە هۆی ڕق و تووڕەییتەوە سەرای .. تاد.

## کەناری چاوی "سالم" جۆیبارە
## بە سەروی قامەتی مەوزوونی دڵجووت (٧)

تەنووری (گم): تەنوورەی گڕە (کم): گڕە. دەبێ بۆ ئەمە بڵێین: میحنەتسەرای دڵ تەنووری پڕ گڕە... تاد. ئەمە بەهێزترە، ئەگەرچی لە (مان، گم)دا (گڕەی)ە. ئاتەشی خووت (ج): ئاگری خووت. (کم، گم): ئاگری ڕووت.

(٧) کەنار: دەوروبەر. جۆیبار: جۆگە. مەوزوون: سەنگین، ڕێکوپێك. دڵجوو: ئەوەی دڵ بەدوویدا دەگەڕێ و حەزی لێ دەکا.

واتە: سوێند بە باڵای وەك سەروی ڕێکی دڵبەرت، دەوروبەری چاوم بە هۆی گریان و فرمێسکی فراوانەوە بووەتە جۆگە و ڕووبار؛ یا دەوروبەری چاوم، بە هۆی باڵای هەمیشە ئامادەی وەك سەروتەوە، لە گلێنەی چاومدا جۆگە و ئاوەدانییە!

بە سەروی (کم، گم): بە سەرو و. ((وەکوو یەك)) زیادە و لە (ف)دا خراوەتە سەرەتای ئەم بەیتە.

## -٢٢- (*)

**جیهانئارایه مەه، ئەمما نەوەك ڕووت**
**هیلالی یەكشەبە ناگاتە ئەبرووت (١)**
**لە لەبتا مەنبەعی ئابی حەیاتە**
**دەڵێی ڕێی ظوڵمەتە هەر سوو لە گێسووت (٢)**
**هەوای سێبی ذەقەن، ئەی دڵ، نەكەی قەت**
**موهەییایە، لە ڕێتا، چاهی هارووت! (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، هـ، غ، ق، كم، گم)دا هەیە.
كێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەقسوور.

(١) جیهانئارا: ئارایشتدەر و جوانكەری جیهان. مەه: مانگ. ئەمما: بەڵام. یەكشەبە: یەكشەوە.
واتە: ڕاستە مانگ بە شەو جیهان دەڕازێنێتەوە و ڕووناكی دەكاتەوە، بەڵام نەك وەك ڕووی درەخشانی تۆ، ڕووی تۆ جوانتری دەڕازێنێتەوە. هەروەها مانگی یەكشەوە كە هەم چەماوە و هەم باریك و ڕێكە، ناگاتە برۆت، برۆت لەو جوانترە.
شەبە (هـ، كم، ق، گم): شەوە.

(٢) لەب: لێو. مەنبەع: سەرچاوە. ئابی حەیات: ئاوی زیندەگانی.
واتە: لێوت سەرچاوەی ئاوی ژیانە، هەر كەسێك بیگاتێ و لێی بخواتەوە، نامرێ و تا هەتایە دەمێنێتەوە، بەڵام كە لە هەموو لاوە بە هۆی ئەگریجەتەوە دەورە دراوە و بووەتە تاریكستان، كێ دەتوانێ پێی بگا! دیارە وا باوە كە ئاوی زیندەگانی لە تاریكستانیدایە، بۆیە كەس نایگاتێ!
ئابی (هـ، كم، گم): ئاوی. حەیاتە (عا): بەقایە. دەڵێی (هـ): وەڵێ. (حا) نیوەی دووەمی بەیتی پێشووی دووبارە كردووەتەوە.

(٣) هەوا: ئارەزوو و حەز. سێب: سێو. ذەقەن: چەناگە. قەت: هەرگیز. چاه: چاڵ. هارووت: جادووگەرەكەی بابل.
واتە: ئەی دڵ! هەرگیز هەڵەی وەهات لێ نەوەشێتەوە، حەز لە سێوی چەناگەی یار بكەی و بەدوایدا بگەڕێی. چاڵەكەی هارووت لەوێ لە ڕێتدایە، تێیدەكەوی و تێدا دەچی. مەبەستی چاڵی چەناگەیەتی!
سێبی ذەقەن (عا): سێبی زەقەن. (هـ): سیبی زەنەخ. (كم، گم): سێوی زەنەخ. ئەی دڵ (ڕ):

که تۆ غائیب دەبی، تاریکە چاوم
دەڵێی نوقطەی بەصەرمە، خاڵی هیندووت! (٤)
بە یادی لەعلی دڵبەر، ئەشکی خوێنین
مەڕێژە، لەعلی خۆی نادا بە یاقووت (٥)
لە نوطفەی طیفلی موشك، ئاهوو عەقیمە
نەبا فەحلی صەبا گەر بۆ خەتا، بووت (٦)
لەگەڵ بەرگەشتەبەختی من موژەی تۆ
قیاسم کرد، لە ڕووتا وەك یەکن، جووت (٧)

هەرگیز. قەت (عا، غ): قەد.

(٤) نوقطەی بەصەر: خاڵی چاو، مەبەستی گلێنەی چاوە.

واتە: کە تۆ لە بەرچاوم ون دەبی، چاوم کوێر دەبێ، چونکە خاڵی ڕەشی ڕوومەتی تۆ وەك گلێنەی چاوی منە؛ کە لام نەبی، چاوم نابینێ!

دەبێ (کم): ئەبێ. بەصەرمە (عا): بە سورمەی! (ڕ): لەصەرمە. هەڵەیە.

(٥) واتە: فرمێسکی خوێنین بە یادی لێوی ئاڵی وەك لەعلی یار مەڕێژە و بە تەما مەبە بەزەیی پێتدا بێتەوە و ماچی لێویت بداتێ! یار لێوی لەعلی خۆی بە فرمێسکی سووری وەك یاقووتی تۆ ناگۆڕێتەوە!

لەعلی (عا، غ): لێوی.

(٦) ئاهوو: ئاسك. عەقیم: نەزۆك. خەتا: وڵاتی خەتا. بووت: بۆنی تۆ.

واتە: ئەگەر بای نێرینەی سەبا بۆنی تۆ لەگەڵ خۆیدا نەبا بۆ وڵاتی خەتا و ئاسکی ئەوێی پێ چاك نەکا، ئاسك بە نەزۆکی دەمێنێتەوە و میسك لە تۆوەکەی پەیدا نابێ.

عەقیمە (کم): نەزۆکە. نەبا (مان، کم، گم): بەنا. هەڵەی نووسینە و (نەبا)یە. گەر بۆ (ھ، گم): بو بوو. هەڵەیە. (خەتا): جگە لە (گم)، هەموویان (خەطا)یان نووسیبوو، شارەکە، یا وڵاتەکە ناوی (خەتا)یە، نەك (خەطا). (موشك) بە (مشك) بخوێنرێتەوە، ڕەوانتر دەبێ.

(٧) بەرگەشتە: هەڵگەڕاوە، کینایەیە لە خراپی. بەرگەشتەبەخت: بەختی هەڵگەڕاوە و پێچەوانە، بەدبەخت. موژە: برژانگ.

واتە: بەختی وەرگەڕاوی خۆم و برژانگی هەڵگەڕاوەی تۆم لە ڕوومەتی تۆدا بەراورد کرد (لە کاتی چاو هەڵبڕیندا کە برژانگەکانی بەرەودوا هەڵدەگەڕێنێتەوە)، هەردووکیان -بێزیادوکەم- وەك یەکن، هیچم لە ڕووی تۆ دەست ناکەوێ و بەختیشم وەك برژانگی تۆ هەڵگەڕاوەیەوە.

**تەبی موحریقمە بۆ پوستان و لێوت**
**دەوای تەبریدی من، عونناب و لیمووت (٨)**
**لە باغا غونچە مەشقی لێوی تۆی کرد**
**نوخوستین گوڵ لە خەندەی تۆ دەپشکووت (٩)**
**مەپۆشە ڕووبەڕوو ڕووی ئافتابت،**
**بەبێ ڕووی تۆ، دەلەرزێ "سالم"ی ڕووت (١٠)**

سالم لەوەدا کە بەراوردەکەی لەگەڵ هەڵگەڕانەوەی برژانگ یەكخستووە، مەبەستی ئەوەیە کە هۆی بەختی هەڵگەڕاوەی برژانگی هەڵگەڕاوەی یارە، کاتێك چاو هەڵدێنێ ماڵی کاول دەکا. لە ڕاستیدا بەراوردەکەی سەیرە؛ هەڵگەڕانەوەی برژانگی یار نیشانەی دەسەڵاتە، هەڵگەڕانەوەی بەختی ئەمیش نیشانەی ماڵوێرانییە، ئیتر چۆن وەك یەکن؟!

قیاسم کرد (هـ): کەن. (غ، ڕ): قیاسی کەی.

(٨) ئەم بەیتە لە (حا)دا نییە.

تەب: تا. موحریق: سۆزندە، سووتێن، مایەی سووتاندن. پوستان: مەمك. تەبرید: ساردکردنەوە و نەهێشتنی تا. عونناب: کینایەیە لە لێو، لێویش وەك عونناب سوورە. لیمۆ: کینایەیە لە مەمکۆڵە.

واتە: تام لێ هاتووە بۆ ماچی لێوی ئاڵ و مەمکۆڵانت! دەرمانێك کە گڕەی ناو دڵم لابەرێ، لێو و مەمکۆڵانە، دەستم بە دامانت فریام بکەوە.

تەبی موحریقمە بۆ پوستان و لێوت (ڕ): تەبی موحریقمە بۆ بوستانی لێوت. (کم، گم): لەبت میحرابە بۆ بوستانی کوڵمت. تەبریدی من (عا): تبریدن. هەڵەی نووسینە. (کم، گم): دەردی منە. عونناب و لیمووت (هـ): عونابی لیمووت. (ڕ): عونناب و لێوت. هەڵەیە.

(٩) نوخوستین: یەکەمین. خەندە: پێکەنین.

واتە: خونچە خەریکی مەشقی لێوی تۆ بوو، خۆی لەسەر بچووکی و کرانەوەی دەمی جوانی تۆ ڕادەهێنا و یەکەم گوڵ کە لە باخدا پشکووت، لە پێکەنینی تۆ دەچوو. هەروەها هەڵدەگرێ (خەندە) پێکەنینی گاڵتەپێکردن بێ، یانێ: کە خونچە مەشقی لێوی تۆی دەکرد، تۆ گاڵتەت لێ دەهات و پێی پێدەکەنیت، خونچە بەرگەی ئەو پێکەنینەی تۆی نەگرت و لە حەسرەتدا کرایەوە و بوو بە گوڵ.

غونچە (گم): خونچە. مەشقی لێوی تۆی کرد (ق): شەوقی لێوی تۆی گرت. تۆ دەپشکووت (غ، کم، گم): تۆوە پشکووت. ئەمە جەختی واتای دووەم دەکاتەوە.

(١٠) ڕووبەڕوو: بەرامبەر یا ڕووبەڕووم: بەرامبەرم. ئافتاب: هەتاو. ڕووت: ڕووتوقووت.

واته: ڕووی وەك خۆرت ڕووبەڕووی من دامەپۆشە، پێویستیم پێـەتی، چونکە ڕووی ڕووت‌وقووتی سالم بەبێ تین و گەرمیی ڕوومەتی تۆ لـە سەرماندا دەلـەرزێ.

مەپۆشە ڕوو.. تاد (عا): بپۆشە ڕوو بە ڕوویی ئافتابت. واتە: ڕووی من بە ڕووی وەك خۆرت داپۆشە، هەتا گەرمم بێتەوە! ڕووبەڕوو (کم، گم): ڕووبەڕووم. ((ڕووبەڕوو))ی (مان) و ((ڕووبەڕووم))ی (کم، گم) هەردووکیان یەك واتا دەدەن.

## -٢٣- (*)

**شۆری شەهرم گەر وەها بێ، جێمە هاموون عاقیبەت!**
**یاری لەیلاخەصڵەتم دەمکاتە مەجنوون، عاقیبەت (١)**
**گەر شەپۆلی بەحری ئەشکم موڵکی ڕووم وا داگرێ**
**دەبنە یەك هەردوو لەگەڵ دەریایی جەیحوون عاقیبەت (٢)**
**ڕامی خۆی کردم لە ئەووەڵدا بە عیشوە، چاوی مەست**
**دەست و پای بەستم بە سیحر و کەید و ئەفسوون عاقیبەت (٣)**
**بۆ موطیعی، عیسەئاسا ڕاسـتڕەو بوو «پیش ازین»**
**وەك خەطی تەرسا بینای نا حەرفی واروون عاقیبەت (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لـە (مان، عا، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) شۆر: خرۆشان، کەڵکەڵە و عیشق، دێوانەیی. شەهر: شار. هاموون: چۆڵ و بیابان.

واتە: ئەگەر دێوانەیی و کەڵکەڵە و خرۆشانم لەناو شاردا وا بمێننەوە، سەرەنجام چۆڵ و بیابان دەبنە جێم و دواجار یاری خوو وەك لەیلایشم دەمکاتە مەجنوون و سەرگەردان دەبم.

(٢) ڕووم: وڵاتی ڕۆم، ڕوخسارم. جەیحوون: ئەمۆدەریا، کۆن (ئوکسووس)ی پێ وتراوە، سەرچاوەکەی چیاکانی پامیری هیندستانە و دەرژێتە دەریاچەی ئۆراڵ.

واتە: ئەگەر شەپۆلی فرمێسکم بەم جۆرە وڵاتی ڕوخسارم، یا وڵاتی ڕۆم دابگرێ و بیکا بە ژێر ئاوەوە، ئاخری دەریای فرمێسکی من و دەریای جەیحوون دەبنە یەك!

ئەگەرچی «ڕووم» ناوی وڵاتێکە، بەڵام بە شێوەنووسینی ئەوسا «روم» دیمەنەکەی لەگەڵ فرمێسکدا گونجاوە و جوانکاریی تێدایە.

(٣) ڕام: دەستەمۆ،ماڵی. سیحر: جادوو. کەید: مەکر و فێڵ. ئەفسوون: ساختەکاری و فریو.

واتە: یار لە سەرەتاوە بە نازی چاوی مەستی دەستەمۆی کردم، دوایی بە جادوو و فێڵ و فریویش شێتی کردم و دەست و پێی بەستم.

ڕامی.. تاد (کم): رامی خۆی کرد وەکو وەحشی بە سەبزەی خەط و خەدی. (گم): رامی خۆی کردووم وەکو وەحشی بە سەبزەی خەت و خاڵ. بە سیحر و (کم، گم): بە عیشوەی.

(٤) ئەم بەیتە لـە (کم، گم)دا نییە.

(سەرچنار)ی چەشمەیی چاوم، ئەگەر وا هەڵقوڵێ
مەوج و گەردابی دەگاتە کێوی (گودروون) عاقیبەت (٥)
سێبەسێ یەك‌یەك طەلاق دەن، بادەکەش، با دوختی ڕەز
تا ئەبەد مەستی دەبەخشێ چاوی مەیگوون عاقیبەت (٦)
ئەی ڕەقیب! با تۆ لەگەڵ من ظوڵمی فیرعەونی بکەی
سەرزەمین قووتت دەدا وەك گەنجی قاروون عاقیبەت (٧)

موطیع: ملکەچ، گوێڕایەڵ. عیسائاسا: وەك عیسا. ڕاسترەو: ڕاستڕۆیشتوو. پیش ازین: بەر لە ئێستا، ڕستەیەکی فارسییە. تەرسا: گاور. بینای نا: بنیاتی نا، دروستی کرد. حەرف: وشە. واروون: سەرەوخوار، هەڵگەڕاوە و پێچەوانە (لە چەپەوە بۆ ڕاست).

واتە: یار، لە پێشدا وەك عیسا ڕاست و ڕەوان و بێ‌وەی بوو، ئازاری کەسی نەدەدا، بەڵام پاشان هەڵگەڕایەوە و وەك گاور دەستی دایە قسەی بێ‌سەروبەر و پێچەوانە.

(عیسا)، بۆ ڕاگرتنی سەنگی نیوەبەیتەکە بە (عیسە) نووسراوە و وا دەخوێنرێتەوە.

(٥) سەرچنار: سەرچاوە و ئاوێکی خۆشی ڕۆژاوای شاری سلێمانییە. چەشمە: سەرچاوە، کانی. مەوج: شەپۆل. گەرداب: گەرداو، گێژاو. گودروون: چیای پیرەمەگروون.

واتە: ئەگەر سەرچاوەی (سەرچنار)ی چاوم بەم جۆرە هەر هەڵقوڵێ و فرمێسك دەربدا، ئەوەندە زۆر دەبێ، سەرەنجام شەپۆل و گێژاوی دەگاتە شاخی (پیرەمەگروون).

مەوج و گەردابی (کم): مەوجی گەردابی. کێوی گودروون (کم، گم): کۆهی گەردوون!

(٦) بادەکەش: مەیخۆرەوە. دوختی ڕەز: کچی دارمێو، مەی. مەیگوون: وەك مەی.

واتە: با مەیخۆرەوەکان هەموویان، یەك بە یەك، سێ بە سێ کچی مێو (مەی) تەلاق بدەن، چونکە چاوی یار مەستی دەبەخشێ، ئیتر شەرابیان بۆ چییە؟!

یەك یەك (کم): نە یەك. (گم): نەك یەك. دەبەخشێ (کم): ئەبەخشێ.

(٧) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا نییە.

ڕەقیب: بەدکار. فیرعەونی: خراپەکارانە، ملهوڕانە. گەنج: گەنجینە. قاروون: دەوڵەمەندێکی سەردەمی مووسای پێغەمبەر بوو، لێی هەڵگەڕایەوە و دوژمنایەتیی کرد، تا خودا خۆی و سامانەکەیی بە قوڕدا برد.

واتە: ئەی بەدکار! ئەگەر تۆ ئەمڕۆ کە دەستت دەڕوا، وەك فیرعەون ستەم لە من بکەی، ئاخری زەوی وەك گەنجینەکەی قاروون قووتت دەدا وهەڵتدەلووشێ.

**عافییەت بێ، وەك غەضەنفەر، دوشمن ئەر خوێنم بخوا**
**پشتی ئەو دەشکێنێ پەنجەی شێری گەردوون عاقیبەت (٨)**
**تەنگدەستی، دەوڵەتی لەدوایە "سالم"، موژدە بێ**
**شادمانی دێ لەگەڵ ئەحواڵی مەحزوون عاقیبەت (٩)**

(٨) عافیـەت: نۆش. غەضەنفەر: شێر. ئەر: ئەگەر.

واتە: دوژمن ئەگەر وەك شێر خوێنم بخواتەوە، نۆشی گیانی بێ، دواجار چەرخی گەردوون، کە شێری شێرخۆرە، پشتی ئەویش دەشکێنێ و بەیەکدای دەهاڕێ.

عافییەت بێ، وەك غەظەنفەر دوشمن ئەر خوێنم بخوا (کم، گم): عاقیبەت بێ وەك غەضەنفەر دوژمن ئەر خوێنم بخوا. (غەضەنفەر) لە (مان)دا (غظنفر)ە، دیارە کە هەڵەیە. ئەو دەشکێنێ پەنجەی (کم): ئەو ئەشکێنێ پەنجەی.

(٩) تەنگدەستی: هەژاری، بێدەسەڵاتی. دەوڵەت: دەوڵەمەندی، بەدەسەڵاتی. مەحزوون: خەمبار.

واتە: سالم: موژدە بێ لێت! هەژاری و بێدەسەڵاتی، دەوڵەمەندی و دەسەڵاتداریان بە دواوەیە، شادی -دواجار- لەگەڵ خەم و پەژارە پەیدا دەبێ!

لەگەڵ (کم، گم): لەپاش. (پ): لەدوو. (لەگەڵ)ی (مان)، هاومانای ئایەتی پیرۆزی ((ان مع العُسر یُسرا))یە.

## -٢٤- (*)

هەمیسان کەوتمە ناو دەریایی فیکرەت
سەری دا باز لە خاطر مەوجی میحنەت (١)
هیلاکی کردْوم زەهری تەحەممول
صەبووریم چوو لەدەست ئەندووهی فیرقەت (٢)
سەنەندوج، باوجوودی باغ و گوڵزار،
بەبێ تۆ تارە لێم، وەك شامی میحنەت (٣)
دەجۆشێ خوێن لە دڵما میثلی دەریا،
بە ڕووما دێ، سروشکم هەروەکوو شەط (٤)
وەها کەوتوومە سەر فرمێسکی چاوم
تەفاوت ناکرێ ئەصڵەن لەگەڵ بەط (٥)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (نم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) باز: دووبارە. خاطر: دڵ. مەوجی میحنەت: شەپۆلی مەینەت.

واتە: دیسان کەوتمە ناو دەریای بیرکردنەوە. دڵیشم دووبارە شەپۆلی مەینەتی تێدا کەوتەوە جووڵە.

(سەری دا) بە (سەربدا) نووسراوە، کە دەبێ هەڵەی نووسینەوە بێ.

(٢) ئەندووەه: خەفەت. فیرقەت: لێك‌جیایی.

واتە: ئەوەندە ژاراوی سەبر و دەربردنم خواردووەتەوە، ماندوو و شەکەت بووم. داخ و خەفەتی لێك‌جیاییش وای لێ کردووم، سەبووریم بە هیچ نەبێ.

(٣) باوجوود: ئەگەرچی، سەرباری ئەوەی. شام: شەو.

واتە: ئەگەرچی (سنە) باخ و گوڵزاری زۆرن و دڵگیرن، مادامێکی تۆم لەگەڵ نیت، وەك شەوی مەینەت تاریکە.

(٤) شەط: زێ و چەمی گەورە.

واتە: خوێن لە دڵمدا وەك شەپۆلە توندەکانی دەریا لە جۆش و خورۆشدایە. ئەوەندە گریاوم، فرمێسکم وەك چەمی گەورە زۆرە و بە ڕوومدا دێتە خوارێ.

(٥) تەفاوت: جیاوازی. بەط: مراوی.

**کەماندارن جەفای چەرخ و غەمی یار**
**لەدەست تیری قەضایان نیمە موهلەت (٦)**

واتە: من فرمێسکم وا زۆر بووە، خۆیشم کەوتوومەتە سەر ئەو ئاوی فرمێسکە. حاڵم هەرگیز لەگەڵ حاڵی مراوی بەراورد ناکرێ و جیاوازییان زۆرە. مەبەست ئەوەیە فرمێسکی من لەو ئاوە زۆرترە کە مراوی مەلەی تێدا دەکا.

(٦) کەماندار: تیر و کەوان بەدەست. قەضا: قەزا و قەدەر. موهلەت: مۆڵەت، مەودا.

واتە: ئێش و ئازاری ڕۆژگار و خەمی یار لەسەرڕێن بۆ من و تیر و کەوانی پەلاماریان ئامادەیە. هیچ دەرفەت و مۆڵەتێکم نییە تا لە تیری قەزا و قەدەریان ڕزگار ببم.

(کەماندارن) بە هەڵە بە (کەمانداران) نووسراوە.

(*) -٢٥-

**به نەقدی جان دەدا یەك بۆسە دڵدارم، وەلێ زەحمەت**
**دەگاتە حەددی وابوون عوقدەیی کارم، وەلێ زەحمەت (١)**
**بە پایین گەر نەیێ عومرم، بە پایین دێ شەوی هیجران**
**دەبینێ صوبحی وەصڵت دیدەیی تارم، وەلێ زەحمەت (٢)**
**حەکیم ئەووەڵ ضەعیفی کردوْم بۆ کەشفی دانایی**
**دەکا ئاخر دەوایی قەلبی بیمارم، وەلێ زەحمەت (٣)**
**بەسەرچێ گەر حەیاتم، بێ زمستانی غەم و هیجران**
**دەکەم ڕۆژێ تەماشای باغ و گوڵزارم، وەلێ زەحمەت (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) نەقد: دراو، پارە. وابوون: کرانەوە. وا: کراوە. عوقدە: گرێ. وەلێ: بەڵام.

واتە: دڵبەر ماچێکم بەرامبەر بە گیان پێدەدا، بەڵام زەحمەتە. ئەگەر گیان بدەم، ئەم گرێیە بگاتە ڕادەی کرانەوە، گرانە گیان تا ئەو کاتە دەرنەچێ. مەبەست لە زەحمەتەکە ئەوەیە کە گیان دەرچوو، تازە ماچی چی؟!

نەیێ (کم، گم): نەبێ!

(٢) پایین: کۆتایی. تار: تاریك.

واتە: ئەگەر تەمەن نەبڕێتەوە، ئاخری شەوی دووری هەر دوایی دێ و چاوی تاریکم بەرەبەیانی گەیشتن بە تۆ دەبینێ و ڕوون دەبێتەوە، بەڵام گرانە ئەم مەرجە بێتە دی، گرانیشە تەمەن ئەوەندە بڕبکا!

(٣) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا نییە.

ئەووەڵ: یەکەم جار. کەشف: دەرخستن. دانایی: لێزانین. ئاخر: پاشان. دەوا: تیمار، دەرمان.

واتە: پزیشك یەکەم جار پێش هەموو شتێك لاوازی کردم، تا نەخۆشییەکەم بدۆزێتەوە و دوایی تیماری دڵی بیمارم بکا. بەڵام گرانە فریام بکەوێ، من پێش تیمارکردنەکەی ئەو دەمرم! بێگومان پزیشکەکەی سالم یارە، ئیتر دەبێ چیی لێ چاوەڕوان بکرێ؟!

(٤) واتە: ئەگەر ژیان بەبێ زستانی پەژارە و دووری بچێتە سەر و بمێنێ، ڕۆژێك هەر دەبێ تەماشای باخ و گوڵزاری یار بکەم، بەڵام گرانە ئەم مەرجە بێتە دی. زستانی پەژارە و دووری دەمکوژێ!

**به شوهرەت "سالم"م، ئەمما لە هیجرت پیری کەنعانم**
**دەبێ ڕۆشن بە وەصڵت، دیدەیی تارم، وەلێ زەحمەت (٥)**

(٥) پیری کەنعان: حەزرەتی یەعقووبی باوکی حەزرەتی یووسف (د.خ). تار: تاریك و لێڵایی‌هاتوو.

واتە: بە ناووبانگ "سالم" و ساغ و سەلامەتم، (ناسناوی سالمە!)، بەڵام بە هۆی دەردی دووریتەوە یەعقووبم و یووسفم ون کردووە. بۆیە بە گەیشتنە تۆ چاوی بەگریان‌سپی‌بووم، وەك چاوی یەعقووب، ڕوون دەبێتەوە. بەڵام کوا ئەم بەیەك‌گەیشتنە و لە کوێ دەستم دەکەوێ؟!

هیجرت (گم): هیجرەت! ڕۆشن (کم): ڕەوشی، هەردوو جیاوازییەکە هەڵەن.

-٢٦- (*)

سروورم پەست و باڵادەستە میحنەت
ضەعیفی قووەتی ساندم لە قووەت (١)
عەجائیبب صەعبە عومری ئەهلی دونیا،
لە ئەووەڵ دەردیسەر، ئاخر مەشەققەت (٢)
بە تەحقیق جاهیل و شێت و نەفامە
کەسێ بیبێ لەگەڵ دونیا مەحەببەت (٣)
لە دونیا ڕاحەتی قەت نابێ بۆ کەس
خەیاڵم بێ لەناو قەبرا فەراغەت (٤)
ڕەفیق بێن بارْبەندی کەین لە دونیا،
مەحەللێکە مەکانی قەحطِ و عوسرەت (٥)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (نم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) سروور: شادی. پەست: نزم، کەم. باڵادەست: بەرز، زۆر. میحنەت: مەینەت. ضەعیفی: بێهێزی، بێداروباری. (قووەت)ی یەکەم: هێز. (قووەت)ی دووەم: توانایی، هێز و تین.

واتە: شادیم نەماوە و مەینەت ڕکێفی کردووم. بێتینی بەسەرمدا زاڵ بووە و هێزی لێ بریوم.

(٢) مەشەققەت: کوێرەوەری.

واتە: تەمەنی خەڵك لەم دنیایەدا بە شێوەیەکی سەیر قورس و سەختە، لە سەرەتاوە تا کۆتایی دەردەسەری و نارەحەتییە.

(٣) تەحقیق: بە ڕاستی.

واتە: ئەگەر یەکێك دڵی بە دنیا خۆش بێ، دەبێ بە ڕاستی نەزان و شێت و نەفام بێ.

(٤) فەراغەت: ئاسوودەیی و بێخەمی.

واتە: کەس لەم دنیایەدا ژیانی ئارام و بێسەرئێشەی بەنسیب نابێ، مەگەر لە گۆڕدا ئاسوودە بێ.

(٥) باربەندی کەین: بارگە و بنە بپێچینەوە. مەحەل: شوێن. قەحط: قاتوقڕی. عوسرەت: ناسازی.

واتە: یاران، وەرن با بارگە و بنە بپێچینەوە و واز لەم دنیایە بێنین، چونکە جێی ناخۆشی و تاڵاو چێشتنە.

**دەخیلتان بم، مەکەن لەم تەکیە، تەکیە**
**نییە -ئەصڵەن- ئومێدی ئیستیقامەت (٦)**
**وەرە "سالم" مەبە میهمانی دوونان،**
**بەقینە، دەتکوژێ ئاخر بە ضەیقەت (٧)**

(٦) (تەکیە)ی یەکەم: جێی دەروێشان. (تەکیە)ی دووەم: پشت‌پێ‌بەستن. ئیستیقامەت: ڕێکی و ڕاستی.

واتە: دەستم بە دامێنتان، پشت بەم تەکیەی دەروێشانە مەبەستن، چونکە لە بنەڕەتدا هیچ هیوایەکی ڕێکی و ڕاستی چاوەڕوان ناکرێ.

(٧) میهمان: میوان. دوونان: هیچ‌وپووچان، یا دوو نان، یانێ لە پێناوی دوو ناندا کە دەرخواردت بدرێ، مەبە بە میوانی کەس. ضەیقەت: تەنگانە.

واتە: سالم خۆت مەکە بە میوانی خەڵکانی ناچیزەی هیچ‌وپووچ، ئاخری ئەم دنیایە بە تەنگانە و نەبوونی دەتکوژێ.

## - ٢٧- (*)

ڕەشە، تیغی شکەمی کەر بە ڕەشت
ڕەشە، پاپاخی ڕەشت ڕاست بە ڕەشت (١)
خایەوو پاچـکەوو شاخی بەران
بە لەشت، هەم بە پشتت، هەم بە ڕەشت (٢)
ڕەشە هیندوویی خەبیثت میهمان کەم
بە ڕەشیی خۆی ڕەشە گیرکا لە ڕەشت (٣)
شافی سوور لەو ڕەشە لێیی دەردێ
ڕەشە، ... وەك خومی لیلەنگە ڕەشت (٤)
ڕەشە، دیدەی پەست ئەزبەسکی ڕەشە
شەوە کافوورە لەچاو چاڵی ڕەشت (٥)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (کم)دا هەیە و ناسناوی "سالم"یشی تێدا نییە. شیعرەکە بەگشتی ناتەواوە و لەبەرئەوەی نوسخەیتری نەبوو، هەر ئەوەندە ڕاست کرایەوە و لە ڕیزی شیعرەکانی ئەم پیتە هێنرایە دەرێ و خرایە کۆتایی پیتەکە. "ڕەشە" کورتکراوەی ناوی "ڕەشید"ە، چڵوچێوی (چەمەڕەش) و شاخی هەموو بزنی (سەردەشت)یشی بۆ حەواڵە کردووە. هەر ئەوەندە مانای وشەکانی لێكدرایەوە، پێویست نەزانرا لەبەر ناتەواویی دەقەکەی و -تا ڕادەیەك- ئاشکرایی و ڕوونیی مەبەست، مانایان بنووسرێتەوە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) شکەم: سك. تیغی شکەمی کەر: دەعباکەی. پاپاخ: جۆرە کڵاوێکی گەورە و قووچە. ڕەش: پاشەوە.

(٢) خایە: هێلکەگون. پاچکە: پێچکە، سەروپێ.

(٣) (ڕەشە)ی یەکەم: ڕەنگڕەش، ڕەشید. (ڕەشە)ی دووەم: دەعبای پیاو. هیندوو: نۆکەر. خەبیث: بەد، خراپەکار. میهمان کەم: بکەمە میوان.

(٤) شاف: دەرمانێك کە دەکرێتە کۆم. خوم: ڕەنگ، یا کوویەکەی. لیلەنگ: شین. وشەیەك لە نیوەبەیتی دووەمدا کەوتووە و لەنگی کردووە، ڕەنگە (هەر) بێ.

(٥) ئەزبەسکی: زۆر. شەوە: بەردی بەنرخی ڕەش. کافوور: شیرەی وشکەوەبووی دارێکی سپیی بۆنخۆشە. دیدەی پەس: کونی پاشەوە. ئەزبەس: ئەوەندە!

**مەسکەنی ڕەشبەچچەیە مابەعْدت**

**ڕەشە ئەوسا ڕەشەڕەشیان بە ڕەشت (٦)**

**تاوی دا ناری ڕەشت مەطرەقیتر**

**ڕەشە دوور بێ ڕەشیی مەردوم لە ڕەشت (٧)**

**ڕەشە، نازانی لەبەر چی ڕەشە مووت؟**

**دایکوتاوە ڕیشە، ڕەشە، لە ڕەشت (٨)**

**(بو برەی میم کوقالی؟) خۆشیەکەت**

**ڕەشە بتبینم و ڕەش کەم لە ڕەشت (٩)**

**بیسْت دوو صەد ئیسمی لەغْزی**

**ڕەشە ڕەش بێ، ڕەشە ڕەنگین لە ڕەشت (١٠)**

**گەر طەڵەبکاری، گەڵێ کافییە بۆت**

**ڕەشە سووری گەڵی گونڕەش بە ڕەشت (١١)**

(٦) ڕەشبەچچە: بەچکەی ڕەش، مەبەست پاشەڕۆیەتی، یا هەتیوی ڕەشە کە ڕەشە. مابەعد: پاشەوە. ڕەشەڕەش: دەعبای نێرینە. ڕەش: پاشەوە.
نیوەی یەکەم لەنگە.

(٧) ناری ڕەشت: دەبێ (تاری ڕەشت) بێ و مەبەست لە ڕەشی تاریکییە. مەطرەق: چەکوش. ڕەشیی مەردوم: گلێنەی چاو، کە بەو تووڕانە یا بەو باوبژە کوێر نەبێ، یان چاوی مەردومی لەسەر نەبێ. لەوانەیە (ڕیشی مەردوم) بێ، واتە ڕیشیان پیس نەبێ، یا پاشەوەی هیچ مەردومێك بە پاشەوەی تۆ نەبێ.

(٨) دایکوتاوە ڕیشە: ڕەگی داکوتاوە.
ئەگەر نیوەی دووەم ((دایکوتاوە، ڕەشە، ڕیشە لە ڕەشت)) بووایە، سوار دەبوو.

(٩) نیوەی یەکەم ساغ نەکرایەوە.

(١٠) لەغزی: بزووت. ڕەنگە (لوغزی)ش بێ بە مانای هەڵنەهێنراو و پێنەزانراو.
نیوەی یەکەم لەنگە و (و)ی نێوان (بیست) و (دوو) کەوتووە. (ڕەنگینی) لە نیوەی دووەمدا دەبێ (ڕەنگین) بێ، تا لەنگ نەبێ.

(١١) طەڵەبکار: دوور نییە بە مانای (بەطەڵەب) بێ، واتە حەزکردنی وڵاخی مێ لە نێر، وەك دەڵێن (بەفاڵە). گەڵ: نێوان دووڕان. ڕەنگە (کەڵ)یش بێ: کەڵەگا.

ڕەشە ضەربی گەڵ ئەگەر ضەربی کەسە
ڕەشە مەششاکی کەری ڕەش بە ڕەشت (١٢)
ڕەشە بەم شیعرە ڕەشت پارە دەکەم
چڵ‌وچێوی (چەمەڕەش) بێ بە ڕەشت (١٣)
ڕەشە هەر شام و سەحەرە شەش نەوبەت
شاخی جەمعی بزی (سەردەشت) بە ڕەشت (١٤)
چوارچێوەی کورسی بە پشتی کەفەڵت
ڕەشە وەك تاقی خەڵووزانە ڕەشت (١٥)
سوختەگەزیت هەیە بۆ توندیی و تاو
ڕەشە، چەند گەرمە لە تا پشتی ڕەشت (١٦)
میصرەعی ماوە شریطەیی وەصفت
تا ڕەشە ماوە، ڕەشە سوور بە ڕەشت (١٧)

(١٢) مەششاك: دەعباکەی.
مانای نیوەی یەکەم ڕوون نییە.
(١٣) پارە: لەت‌وپەت. چڵ‌وچێو: چیلکەوچاڵ.
(١٤) شام: شەو. سەحەر: بەرەبەیان. نەوبەت: نۆرە. شاخ: قۆچ. جەمع: هەموو، تێکڕا. بز: بزن. سەردەشت: شارێکی کوردستانی ئێرانە.
(١٥) کەفەڵ: سمتی یەکسم. خەڵووزان: خەڵووزدان، جێیەکە خەڵووزی لێ دروست دەکرێ.
(١٦) سوختە گەزیت: نەزانرا چییە.
(١٧) میصرەع: نیوەبەیت. شریطە: شریت، کشتەك.

# پیتی (ث)

## -١- (*)

**نایێڵێ بێمە حوضوورت منی ئاوارە، عەبەث**
**عاجزیی گوڵ لە جەفای بولبولی بێچارە عەبەث (١)**
**نەوجەوانی! بە ستەم دڵ مەدە، بێ، تووبی خودا**
**بێغەمانە بە جەفا ئەم سەری ئازارە عەبەث (٢)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، غ، ڕ، کم، گم)دا هەیە. بەڵام لە (کم، گم)دا خراوەتە ڕیزی شیعرەکانی (پیتی سین)، چونکە دوا وشەی بەیتەکان (عەبەس)ە، کە دیارە دەستکاری کراوە، بەڵام لە (مان، عا، غ، ڕ)دا ڕاست (عەبەث)ە و لە ڕیزی پیتی (ث)دایە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) دووەم نیوەی ئەم بەیتە و نیوەی دووەمی بەیتی چوارەم لە (کم، گم)دا جێگۆڕکێیان پێ کراوە.

نایێڵێ: ناهێڵێ. ئاوارە: بێڕێوشوێن و نامۆ، سەرگەردان. عەبەث: بێهوودە، بێسوود، بە خۆڕایی، ئەگەرچی تامی (بە داخەوە)یش دەدا.

واتە: شتێکی بێسوود و هیچوپووچە تۆ ناهێڵی منی بێچارە بێمە خزمەتت و بە دیدارت شاد ببم. شتێکی بێمانایشە کە گوڵ لە ئازاری بولبول زویر بێ، بولبول ناڵە و خوێندن نەبێ، ئازاری لەکوێیە. دیارە بولبولەکە ساڵم خۆیەتی و گوڵیش یارە.

نایێڵی (عا، کم، گم): نایەڵی. لەبەر کورتی، دەبێ بە (نایەڵێ) بخوێنرێتەوە. عاجزیی گوڵ لە جەفای بولبولی بێچارە عەبەث (گم): ئارەزووی چاکە لەگەڵ مەردومی بێگانە عەبەس.

(٢) ئەم بەیتە لە (عا)دا پێنجەمە.

سەری ئازار: سەروساخت و ئارەزووی ئازاردان.

واتە: تۆ تازە جوانی، تووبی و خودا دڵ مەدە بە ستەم، حەز مەکە لە ستەمی بەرامبەر و ئازاردانی عاشق، خودا دەتگرێ. بێترس و بێباك گەڕان بە دوای ئازاردانی دڵی دڵدارانداْ، کارێکی بێسوودە. ڕەنگە سەری ئازارە (سیرڕی ئازارە) بێ، یانێ نهێنیی ئەم بە ئێش و ژانەوە ئازاردانەی تۆ لەچیدایە، کە بێسوودە!

جەوری خۆت کوشتن و هەم فەخری عەدووی تۆ باعیث
بە صەدای خەندەیی ئەو کوشتنی دووبارە عەبەث (٣)
کەمی ڕیتە قەدەمت مەردومی چاوم، لوئلوء؟!
ئارەزووی چاکە لەدەست مەردومی بێکارە عەبەث (٤)
پایەیی نیك و بەدی لەم طەبەقە بەرعەکسە
هەوەسی ڕوتبە لە لای ئەم سەر و سەرکارە عەبەث (٥)

نەوجەوانی (کم، گم): تۆ جوانی، (مان)یش ئەم بارە هەڵدەگرێ، مەدە (گم): مەدەیێ. خودا (کم، گم): خوا. سەری (عا، ڕ، کم، گم): هەموو، زۆر بەجێیە.

(٣) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا نییە، لە (عا، غ، ڕ)دا پێنجەمە.

واتە: ستەمی خۆت بەسە بۆ کوشتنم، هەر خۆیشت هۆی ئەوە بووی کە دوژمن دڵخۆش بێ و شانازی بەو دۆخە خراپەوە بکا کە تێیکەوتووم. ئیتر دووبارە کوشتنم بە دەنگی بەرزی پێکەنینی ڕەقیبی بەدکار، شتێکی بێهوودەیە. یا: کوشتنی دووبارەم بە دەنگی پێکەنینێك، نەك پێکەنینی ڕەقیب، کارێکی بێسوودە.

خۆت (عا) تۆ. عەدوویی تۆ (عا): عەدوو تۆی، لەبارترە.

(٤) ئەم بەیتە لە (ڕ)دا سێیەم و لە (کم، گم)دا دووەمە.

ڕیتە: ڕژاندە. قەدەم: پێ، لێرە مەبەست بەرپێیە. (مەردوم)ی یەکەم: گلێنەی چاو. (مەردوم)ی دووەم: خەڵك، بنیادەم. ئارەزوو: مەبەستی هیوا و ئاواتە.

واتە: ئەی یار! گلێنەی چاوم کەم فرمێسکی گەشی وەك مرواریی ڕژاندە بەرپێت؟ کەم لێت پاڕایەوە و تکای لێ کردی سزای نەدەی؟ وا دیارە تەمای چاکە لە مرۆڤی بێکارە و پیاوەتیلێنەهاتوو شتێکی بێسوودە و هیچی لێ نایێتە بەرهەم.

چاوم (مان): چاوت، هەڵەیە. لوئلوء (غ): لوئلوو.

(٥) ئەم بەیتە لە (ڕ)دا چوارەمە.

بەرعەکس: پێچەوانە، هەڵگەڕاوە. هەوەسی ڕوتبە: بە تەمای پلە و پایە بوون. سەر و سەرکار: سەرگەورە و بەردەستی سەرگەورە.

واتە: پایەی چاکی و خراپی، پیاوەتی و ناپیاوی لەناو خەڵکی ئەم چەرخەدا پێچەوانەیە، چاکە خراپەیە و خراپە چاکەیە، بێسوودە بە تەما بی ئەم گەورە و بەردەستانە پایە و پلەت پێ بدەن.

**دیدەنی قوربی ڕەقیب، بوو بە کەدەر، کەوتە دڵم**
**دات بە ڕووی ئاینەدا ئەم خەطی زەنگارە عەبەث (٦)**
**دڵ لە ڕەقصایە وەکوو ذەڕڕە لەبەر پەرتەوی ڕووت**
**بە هەوای شۆڕشی من ڕەقصی حولی دیارە عەبەث (٧)**
**ناڵە سوودی نییە "سالم!" لە دڵی کافردا**
**لەب بدۆزە بە ئەلەم، ئەم هەموو هاوارە عەبەث (٨)**

پایەبی (کم): بایەبی، دەبێ هەڵەی چاپ بێ. (گم): مایەبی. بەرعەکسە (عا، غ، ڕ): واروونە. یا هەڵگەڕاوەتەوە، یان «وا ڕوونە»یش هەڵدەگرێ، یانێ وەها ئاشکرایە. بەر (کم): بدر، هەڵەی چاپە.

(٦) ئەم بەیتە هەر لە (مان)دا هەیە.

دیدەن: بینین. قوربی ڕەقیب: نزیکیی بەدکار لە یارەوە. کەدەر: خەم و پەژارە. ئاینە: ئاوێنە. خەطی زەنگار: خەطی ژەنگار، مەبەست ڕوومەتی ڕەقیبی بەدکارە کە سوورێکی ئەرژەنگیی ناشیرینە.

واتە: کە دەبینم بەدکار لێتەوە نزیکە و ڕووبەڕووت دانیشتووە، ئەو نزیکە و من بێبەشم، ئەو بینینە دەبێتە خەم و پەژارە و بار لەسەر دڵم. بۆچی وا دەکەی ڕووی ئەرژەنگ «ڕەنگی ڕەقیب» لە ڕوومەتی ئاوێنەتدا ڕەنگ بداتەوە؟ ئەمەی تۆ دەیکەی کارێکی بێسوودە.

(٧) ئەم بەیتە لە (ڕ، کم، گم)دا نییە.

واتە: دڵ لە بەر ڕووناکیی ڕوومەتی وەك خۆرتدا، وەك گەرد و تۆزی بەر هەتاو لە پەنجەرەوە، یا لە کلاوڕۆژنەوە هاتوو، دێتە سەما. بەڵام سەمای خشڵ و زێڕی یار، لە خۆشیی ئەو شەیدایی و سەرگەردانییەی من بێسوودە، چونکە خشڵ ئەوەندەی دڵی من بە ڕووناکیی ڕووت مەست نابێ.

ذەڕڕە (عا): زەڕڕە. ڕووت (غ): ڕوخت.

(٨) بدووزە: بدوورە، دادروو. ئەلەم: ئازار.

واتە: سالم! هاوار و پاڕانەوە کار لە دڵی کافری بێبەزەیی ناکا. کەواتە بە ئازار لێوت بدوورە و بیخۆرەوە، هاوار و داد و بێداد بێهوودەیە.

بدووزە (عا): مەدووزە. لەوانەیە هەڵە بێ. بە (کم، گم): لە.

## پیتی (ج)

-١- (*)

گەرچی نیی مەحشەر شەفیعم، لاعیلاج
شادمانم پێت وەکوو ڕاهیب بە خاج (١)
ئاهویی چین گەر ببینێ گەردەنت
دەر زەمان دێنێ لە گەردنیا، خەراج (٢)
خاك و سایەی کۆیی تۆم گەر دەستکەوێ
نامەوێ ئیتر ئومووری تەخت و تاج (٣)
دەوری پوستانت لە زوڵفت جەدوەلە
وا لە حەلقەی ئابنووسا گۆیی عاج! (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەقسوور.

(١) نیی: نیت. مەحشەرشەفیع: تکاکاری ڕۆژی مەحشەر.

واتە: هەرچەند تۆ کەسێك نیت بتوانی لە ڕۆژی مەحشەردا ببێتە تکاکارم، بەڵام ناچارم وەك چۆن ڕەبەن (ڕاهیب) دڵی بە خاچ خۆشە، ئاوا پێت شادمان بم.

گەرچی (گم): گەر چەنی.

(٢) دەر زەمان: گورج، لە هەمان کاتدا، دەمودەست. خەراج: باج وماڵیات.

واتە: ئەگەر ئاسکی جوانی چینی گەردنی بەرز و جوانت ببینێ، نەك هەر گورج جوانیی گەردنی خۆی لێ دەبیژرێ، بەڵکوو هەر بە گەردن باج و ماڵیاتت بۆ دێنێ و ملکەچی جوانیت دەبێ.

چین (کم، گم): دڵ.

(٣) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا نییە.

واتە: ئەگەر خاك و سێبەری دەوروبەری بەردەرگای تۆم دەستبکەوێ تێیدا بحەسێمەوە، ئیتر کاروباری تەخت و تاجم ناوێ.

(٤) پوستان: مەمك. ئابنووس: درەختێکە دارەکەی ڕەش و سەخت و بەنرخە. عاج: ددانی فیل،

**عومری عاشق وەك وەفا نابوود دەبێ،**
**گەر بدەی بۆ نەقدی جان، ئەمری ڕەواج (٥)**
**عەکسی ڕووت دایم لەناو دیدەی پڕئاو**
**ظاهیرە، وەك مەی لە توێی پەردەی زوجاج (٦)**
**بۆ لیباسی طالیعی واروونی من**
**بێ وەفایە عەهدی تۆ وەك ڕەنگی زاج (٧)**
**گەر بە ئەغیار ئاشنام، چارم نییە**
**شێر دەباتە طەبعی ڕووبەه، ئیحتیاج (٨)**

ئێسقانی جۆرە ماسیـەکە سپی و بەنرخە.

وا (کم): وە.

واتە: ئەگریجەت چینچـین دەوری مـەمکتی داوە، گـۆی مـەمکی وەك عـاج سـپی و لـووسـت کەوتووەتە نێو بازنەی ئابنووسی ئەگریجەی ڕەشت.

وا (کم): وەه، جوانە. (گم): وەك.

(٥) واتە: ئەگەر تۆ ڕەواج بدەی بە دراوی گیان و بتەوێ و لەباتی قوربانی قوبـوولّی بکـەی، تەمەنی عاشق وەك وەفا نابووت دەبێ. وەك چۆن وەفا لـە لایەن یارەوە نییە، تەمـەنی عاشـقیش زوو لـە پێناوتدا بەخت دەبێ و دەچێتە خانەی نەبووانەوە!

نابوود دەبێ (کم، گم): نابووت نەبێ. بدەی (کم): یدەی. دیارە هەڵەی چاپە.

(٦) پڕئاو: لەبەر کێشی نیوەبەیتەکە بە (پڕاو) دەخوێنرێتەوە.

واتە: وێنەی ڕوومەتت لەناو چاوی پڕ لـە فرمێسکمدا، هەمیشە وەك بادەی نێو شووشە دیارە.

توێی (کم): تۆی.

(٧) ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی لـە (کم، گم)دا نین.

طالیع: بەخت. واروون: پێـچەوانە، وەرگـەڕاو، بـەد. عەهـد: پـەیمان. زاج: زاخ، ماددەیـەکی بلوورییە و جۆری زۆرە، جۆرێکیان سپییە، ئاوی لێ بکەوێ ڕەش دەبێ، سالم ئەمەی مەبەسـتە. سـالم بەختی بەدی خۆی شوبهاندووە بە بەرگ و پۆشاکی پێویـسـت بـە ڕەنـگ، ئـەو ڕەنگـەیش وا ئـەو دەیەوێ، پەیمانی یارە کە بیرێتە سەر. جا بەداخەوە ئەم پەیمانە وەك ڕەنگی زاخی سپی نامێنێتەوە!

(٨) ڕووبەه: ڕێوی کە هیچلێنەهاتوو و فێڵبازە.

**موددەعی وا لافی هەمحوسنت دەدا!**
**پێشی ئەعما هەر یەکێکە، نوور و داج (٩)**
**تووشی ڕاداری ئەجەل "سالم" کە بووی،**
**ڕەسمی ئەو بۆ باری عومرت جانە، باج (١٠)**

واتە: سەرت سوور نەمێنێ کە لەگەڵ بێگانە بوومەتە ئاشنا، چونکە چارم نییە، ناچارییش شێری وەك من دەباتە سەر خووی ڕێویی بەدکاری فێڵباز، یا ناچاری سەری پیاو بەماڵی دوژمندا دەکا.

(٩) ئەعما: کوێر. داج= داجی: تاریك.

واتە: بەدکار گەزافی ئەوە لێ دەدا کە لە جوانیدا هاوشانی تۆیە! لات سەیر نەبێ، چونکە ڕووناکیی ڕۆژ و تاریکیی شەو لای کوێری وەك ئەو وەکوو یەکن.

(هەمحوسنت) ئەگەر (هەمحوسنیت) بووایە، تەواوتر دەبوو.

(١٠) ڕادار: ڕاهدار، پاسەوانی ڕێ، چاودێریکەری ڕێوبان کە باجی ڕێ لە ڕێبوار و باردار وەردەگرێ.

واتە: ئەی سالم! کە تووشی ڕاداری ئەجەل بووی، یەکودووی ناوێ، گیانت بەدەستەوە بدە. ئەو باجەی وا ئەو لە باری تەمەنی تۆی دەوێ، گیانە. دیارە مەبەستی لە (ڕاداری ئەجەل) یارە.

# پیتی (ح)

## -١- (*)

**نەمەکی ڕیتە برینم نەمەکینڕوویی مەلیح**
**لالّی کردم لە کەلاما بە عیباراتی فەصیح (١)**
**مایەیی فیتنە دڵە و تازە دەڵێ: لادە لە عیشق!**
**لە خەطا بەدترە تا صەد دەرەجە، عوذری قەبیح (٢)**
**مەوجْسان بێتە تەلاطوم، بە ئەبەد نازانێ**
**ڕەمزی پێشئامەدیی کاری منی بێچارە، سەطیح (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لـە (مان، حا، عا، غ، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەقسوور.

(١) نەمەك: خوێ. ڕیتە: ڕشتە. نەمەکینڕوو: ڕووی جوان، ڕووی سوێر کـە مـرۆڤ تینـوێتیی لێ ناشکێ. مەلیح: سوێر.

واتە: یاری ڕوومەت جوان و سوێرم خوێی کـردە بـرینم و لــە کـاتی گفـتوگۆدا بـە قـسەی ڕێکوپێك لالّی کردم و قسەی لە دەمدا نەهێشتم.

نەمەکینڕوویی (عا، ڕ): نەمەکیڕوویی.

(٢) ئەم بەیتە لـە (غ، ڕ)دا چوارەمە.

واتە: هۆی ئاژاوە و گیرۆدەبوون دڵە. ئەو لە سەرەتاوە تووشی کـردم، کەچـی پـێم دەڵــێ واز لــە عیشق بێنە! کە گیرۆدەی عیشقی کردم، تاوانی کرد. ئێستا بەهانە دەهێنێتەوە، دەیـەوێ واز لــە عیـشق بێنم، بەهانەکەی سەد ئەوەندەی دزێویی تاوانەکەی بەدترە!

دەڵێی (غ): دڵ. هەڵەیە. (کم): ئەڵێ. لادە لە عیشق (مان): لاوە لـە عیـشق، هەڵــەی نووسـینە، نوسخەکانیتر هەموو «لادە لە عیشق»ن، بۆیە وا ڕاست کرایەوە. خەطا (گم): خەتا.

(٣) ئەم بەیتە لـە (حا، کم، گم)دا نییە، لە (عا، ڕ)دا دووەمە.

مەوجسان: وەك شەپۆل. پێشئامەد: کە بە پێشامەد دەخوێنرێتەوە، ئەوەی دێتـە ڕێـی مـرۆڤ، یـا چارەنووس. سەطیح: پەککەوتوو.

**غەیری بۆسەی لەبی تۆ، چارە نییە بۆ دەردم**
**باوەڕت گەر هەیە، ((باللّٰه))، ئەمەتە قەولی صەحیح (٤)**
**چوست و چابوك وەرە ڕێی دوشمنی نەفست "سالم"**
**صیدقە خەفتان و وضوو مەرکەب و شوکرانە سەلیح (٥)**

واتە: ئــەگەر پــەککەوتوو وەك شــەپۆل بەیەکدا بێ و هــەوڵ بدا، هــەرگیز ناتوانــێ ڕاز و نهێنیی چارەنووسی منی بێچــارە بدۆزێتــەوە و بزانــێ چــیم لێ هــاتووە. ئــەو گێــژاوەی وا مــن تێــی کەوتووم، لـە وزەی کەسـدا نییە بچێتە بنی.

مەوجسان (عا، غ، ڕ): بەمصیفەت: وەك دەریا. (طەلاطوم) لـە (مـان)دا و (تـەلاتوم) (عـا)دا هەڵەن، (تەلاطوم) ڕاستە.

(٤) ئەم بەیتە لـە (ڕ)دا سێیەمە.

واتە: لە ماچکردنی لێوی تۆ بەولاوە، چارەیەك بۆ دەردی من نییە. ئەگەر باوەڕت بە خـودا هەیـە، قسەی ڕاست ئەمەیە. یا ئەگەر باوەڕ دەکەی، قەسەم بە خودا، قسەی ڕاست ئەمەیە.

(٥) ئەم بەیتە لـە (ڕ)دا نییە.

خەفتان یا خەفـدان: جـۆرە کراسـێکی ڕۆژی جەنگـە. سـەلیح: پرچـەك، ئامـادە بـۆ جـەنگ، پێشەنگی سوپا.

واتە: چالاکانە وەرە ڕێگا لـە نەفسی دوژمنت بگرە. جا بۆ ئەم شەڕە ڕاسـتی زرێــە، دەســتنوێژ کەشتییە و شوکری خودا شەڕکەرە.

ڕێی (حا): ڕووی. صیدقە (گم): صیدق. خەفتان (غ): خەوتان. (کم، گـم): خـەفقان. چـاپوك (عا، غ): پرچەك. دوشمنی نەفست (عا): دوشمن لـە فەنت. هەڵەیە. شوکرانە (غ): پێنج فەرضە.

# پیتی (خ)

-١- (*)

**نامەویٚ وەختی فیراقت، صەنەما، ویسعەتی کاخ**
**جیٚ بە من لەم دەمە زیندانە، چ تەنگ بیٚ، چ فەراخ (١)**
**جیٚم ئەگەر گوڵشەنی فیردەوسە، بەبیٚ صوحبەتی تۆ**
**دڵ لە جیٚی خەندە، دەکا هەر دەمە صەد ناڵەوو ئاخ (٢)**
**ڕەنگی شوومیمە سیاهی کە بەسەر بەختا دیٚ**
**ئەو ئەگەر میثلی ئەدیمە، ئەمە جوزئیٚکە لە زاخ (٣)**
**عالییە ڕوتبەیی کاخم لە مەدەد دەوڵەتی عیشق**
**مەصطەبە و غورفەیی "سالم" کەمەر و دامەنی شاخ (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەقسوور.

(١) صەنەما: ئەی بت، بتەکەم! کاخ: کۆشك. جیٚ بە من: جیٚ بۆ من. دەم: کات. فەراخ: فراوان.

واتە: ئەی دڵبەرەکەم! کاتی لە تۆ جیابوونەوە کۆشکی گەورە و بەرفراوانم ناویٚ، هەرچی جێیە لەم کاتە تەنگەی لێكجیاییدا بۆ من زیندانە، چ تەنگ بیٚ و چ فراوان.

(جیٚ بە من) واتە: جیٚ بۆ من، ڕێی تیٚدەچیٚ ((چی بە من؟))یش بیٚ، یانیٚ بە من چی.

(٢) واتە: ئەگەر گوڵزاری بەهەشت بەبیٚ هاوڕێیەتیی تۆ جێم بیٚ، دڵ لەباتیی پێکەنین، هەر هەناسەیەك سەد ناڵە و ئاخ هەڵدەکێشیٚ.

(٣) شوومی: نەگبەتی. سیاهی: ڕەشی. ئەدیم: چەرم.

واتە: ئەو ڕەنگە ڕەشەی وا بەسەر بەختمەوە، ڕەنگی نەگبەتیمە، تەنانەت ئەگەر بەختی من ببیٚ بە چەرم، ئەم ڕەنگی شوومییەی منی بۆ دەبێتە زاخ و ڕەنگەکەی جێگیر دەکا کە نەچێتەوە.

(ئەو ئەگەر) لەبەر کێش بە (ئەوەگەر) دەخوێنرێتەوە. (ئەدیمە) بە (ئەویمە) نووسراوە، دیارە هەڵەی ڕوونووسکەرەوەیە.

(٤) کاخ: کۆشك. مەدەد: یارمەتی. مەصطەبە: سەکۆ. کەمەر: ناوقەد، ناوەڕاست. دامەن:

داوێن. شاخ: کێو.

واتە: جێ و پایەی کۆشکم لە هیممەت و یارمەتیی دەوڵەتی عیشقەوە بەرزە. سەکۆ و هۆدەی سالم بووە بە کەمەر و دامێنێ شاخ، یانێ لە عیشق و خۆشەویستیدا بووم بە دێوانە و کەوتوومەتە کێو، ئەمە بەرزترین پایەیە بۆ مرۆڤی عاشق.

## پیتی (د)

-١- (*)

**هەر دیدەنی تۆیە دڵ بکا شاد**

((**رویت همەساله لالەگون باد**)) (١)

**گەر سوجدە نەبا موقابیلت، سەرو**

((**پیش الف قدّت چو نون باد**)) (٢)

**حوسنت وەکوو ماهی ئاسمانی**

((**هر روز که هست، در فزون باد**)) (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، ه، ف، غ، ڕ، کم، گم)دا هەیە. لە (مان، ن)دا یەکێکە لە تێهەڵکێشەکان (ملمعات). تێهەڵکێشی سالە لەگەڵ شیعرێکی "حافظ شیرازی" و دەستکاریی چەند نیوەبەیتێکیشیی کردووە. بەداخەوە هەم نیوەبەیتی ناوەکەی حافظ لە تێهەڵکێشەکەدا و هەم ناسناوی "سالم"یش نیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی ئەخرەبی مەقبووزی مەقسوور.

(١) رویت: ڕوومەتت. همە سالە: هەموو ساڵێ. لالەگون: گوڵڕەنگ. باد: بێ.

واتە: هەر بینینی تۆیە دڵی عاشق شاد دەکا، خودایە ساڵ دوازدە مانگ ڕووت وەك گوڵ سوور و گەش و بۆنخۆش بێ.

همە سالە (کم، گم): همە سال. دووەم نیوەی بەیتی دوایی لە (ڕ)دا لێرە دووپات کراوەتەوە.

(٢) پیش: بەردەم. الف قدت: باڵای وەك ئەلف ڕاستت. همچو: وەك. نوون: پیتی (ن) کە چەماوە و کەوانییە.

واتە: ئەگەر سەرو کوڕنووش بۆ باڵای وەك ئەلفت نەبا، خودایە باڵای وەك پیتی (ن) بچەمێتەوە. ئەگەر کوڕنووشیش با، هەروەك نوونی لێ دێ، بەڵام ڕاستبوونەوەی تێدایە.

نەبا موقابیلت (گم): کونەد بە غەیری تو. قدت (کم): قدت قدش! حافظ خۆی (قدت)ی وتووە!

(٣) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (کم، گم)دا پاش و پێشن.

ماهی ئاسمانی: مانگی ئاسمان. فزون باد: زیاتر بێ.

**شمشاد بە ڕەسمی خاکبۆسی**
**«پیوستە برابرت نگون باد» (٤)**
**گەر ڕەوشەنە دیدە بێ جەمالت**
**«از گوهر اشك، بحر خون باد» (٥)**
**غەمزەت لە بەرابەری دڵی زار**
**«از کردن سحر، ذوفنون باد» (٦)**

واتە: جوانی و درەخشانیت، وەك مانگی ئاسمان، هەموو ڕۆژێك زیاتر بن.
(هست) لای "حافظ" (باد)ە.

(٤) دووەم نیوەی ئەم بەیتە لە (ف، ق)دا دووبارەکراوی بەیتی دووەمە.

شمشاد: درەختێکە گەڵای هەمیشەییە و دارەکەی سەخت و ڕێکە، باڵای یاری پێ دەشوبهێنرێ.

خاکبۆسی: خاکی بەری پێ ماچکردن. پیوستە: هەمیشە. نگون: سەربەرەوخوار، قلّپەوەبوو.

واتە: داری شمشاد بۆ خاکی بەری پێ ماچکردنت، هەمیشە ڕووبەڕووت سەربەرەوخوار بێ.

پیوستە .. (کم، گم): در پای قد تو سرنگون باد. ئەم نیوەبەیتە لای "حافظ" «در خدمت قامتت نگون باد»ە.

(٥) ئەم بەیتە لە (ه)دا دوایینبەیتە.

از: لە.

واتە: ئەگەر چاوی من بەبێ بینینی جوانیت ڕۆشن بێ، خودایە ئەوەندە فرمێسك بڕژێنێ دەریای خوێنی لێ پێك بێ.

بحر (کم، گم): غرق. نیوەی دووەم لای "حافظ" «چون گوهر اشك، غرق خون باد»ە. (بێ) لە (ڕ)دا دوو جار نووسراوەتەوە. باد (ن): یاد. هەڵەی نووسینە.

(٦) دووەم نیوەی بەیتی حەوتەم لە (کم)دا خراوەتە سەر نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە و دوو نیوەکەیتر کەوتووە.

ذوفنون: خاوەنی هونەری جۆراوجۆر.

واتای ئەم بەیتە بەستراوە بە بەیتی پێشیەوە و نزایە. واتە: با غەمزەت بەرامبەر بە دڵی لاواز و نەخۆشم بە دەیان جۆر جادوو بنوێنێ و ئەوەندەیترماڵوێرانم بکا.

از کردن .. (کم): بی صبر و قرار و بی سکون باد. کردن (گم): گەردەنی. (از) لای "حافظ" (در)ە.

**تا کەی دڵی من لە شەوقی وەصڵت**
**«بی‌صبر و قرار و بی‌سکون باد» (٧)**
**گەر عاجزە دڵ لە حەلقەیی زوڵـف**
**«از حلقهٔ عشق تو برون باد» (٨)**
**جێی ئاوی حەیاتە، لەعلی لێوت**
**«دور از لب هر خسیس و دون باد» (٩)**

(٧) ئەم بەیتە لـە (کم، گم)دا دوا بەیتە.

واتە: تا کەی دڵی من لـە شەوق و ئارەزووی بینینی دیدارت و گەیشتن بـە تـۆ بـێ‌ئۆقرە بـێ و دانەسـەکنێ.

لـە (ه): ز. نیوەبەیتەکەی کردووە بە فارسی. بی صبر و قرار .. (کم): زبـون [و] نـاتوان و بـی سکون باد.

(٨) ئەم بەیتە لـە (کم، گم)دا حەوتەمە.

برون باد: بچێتە دەرێ، بکەوێتە دەرێ!

واتە: ئەگەر دڵی من، کە لـە پێچی ئەگریجەتدا بەندە، لێی زویر بێ، خودایە لـە ئەڵقەی کۆمەڵی عاشقانی تۆ بەدەر و لـە عیشقیش بێ‌بەش بێ.

عشق (ف، کم، گم): وەصـڵ. لای "حافظ"یش هەر (وصل)ە.

(٩) خسیس: خەسیس، بەدڕەوشت. دوون: پەست، مەبەستی بەدکارە.

واتە: لێوی سووری لـەعل ڕەنگت سەرچاوەی زیندەگانییە، لـە خودام دەوێ ئەم کانییـە لـە لێوی ناکەس و مرۆڤی نزم دوور بێ!

ئاوی (ه، ف، غ، ڕ): ئابی. هر خسیس (کم): هر خبیث. (گـم): هـر خـەبیثـی. لای "حـافظ" (مردمان)ە.

## -٢- (*)

گوشادیی عوقدەیی خاطر بە کاریٚ بوو، ئەویش ڕابورد
دڵی پڕشۆڕشم خوشنوودی یاریٚ بوو، ئەویش ڕابورد (١)
موقیمی خاکی کۆی جانانە بووم، حاجیب دەریکردم
لە بەرچاوی عەدوو بۆ من ویقاریٚ بوو، ئەویش ڕابورد (٢)
چراغی عومری شیرینم شەوی دووری بەپاین هات
زەمانی وەصڵی دڵبەر ڕۆژگاریٚ بوو، ئەویش ڕابورد (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ف، غ، ج، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی موسەببەغ.

(١) گوشادی: فراوانی. عوقدە: گریٚ. خۆشنوودی: شادمانی.

واتە: گرێی خەم و پەژارەی دەروونم بە کاریٚ دەکرایەوە کە هیوای گەیشتن بە یـار بـوو، ئـەو هیوایەیش نەما و تیٚپەڕی. دڵی شەیدام بە یارێك شاد دەبوو، ئەویش ڕۆیی.

بە کاریٚ (ف، ج، کم، گم): نیگاریٚ، یانیٚ دڵبەریٚ. زۆر جوانە، ئەوە نەبیٚ کە لە لایەنی ماناوە دووبارەکردنەوەیە، چونکە لە نیوەی دووەمدا یارە و لێرە نیگار، نیگاریش هەر یـارە. شێوەنووسـی (مان) (بکاری)یە، لەوانەیە (ن) کرابێتە (ب). پڕ شۆڕشم خوشنوودی یاریٚ (ف، غ، ج، کم، گـم): پڕمیحنەتم شادیی بە یاریٚ.

(٢) کۆ: دەوروبەر و بەردەرگای مەنزڵی یـار. جانانـە: دڵبـەر. حاجیـب: دەرگـاوان. ویقـار: سەنگینی و ڕێز.

واتە: نیشتەجێی دەوروبەر و بەردەرگای یار بووم و حەسابوومەوە، دەرگاوان دەریپەڕاندم و بیٚبەشی کردم. ئەوێم ڕێز و سەنگینییەك بوو لە داخی بەدکار، ئەویش ڕۆیی.

جانانە (گم): جانان.

(٣) ئەم بەیتە و بەیتی دوایی لە (غ، کم، گم)دا پێش و پاشن، لە (ف، ج)یشدا چوارەمە.

چراغ: چرا. بەپاین هات: دوایی هات و نەوت و ڕۆنی تێدا نەما!

واتە: چرای عومری شیرینم لە شـەوی تـاریکی دووریـدا کوژایـەوە. زەمـانی بەیـەكگەیـشتن سەردەمێك بوو، ئەویش ڕۆیی.

دووری بە پاین هات (ف): هیجرت بە پایان هات. (غ): دووری بە پایان هات. (کم): هیجرت بەیان هات، لەنگە. (گم): هیجرت بەیانی هات. بە پاین (غ): بە پایان.

**له عوریانی پەشیمانم، ئەگەرچی مەشقی مەجنوونە**
**بە کەف جێبی دڕیدەم ئیعتیباریٚ بوو، ئەویش ڕابورد (٤)**
**ئەوەند باری بە خوڕ، ئەشکی نەما ئەم چەشمە بیٚئاوە**
**بە یادی قەددی سەرْوت جوٚیْباریٚ بوو، ئەویش ڕابورد (٥)**
**بە بیٚداری لە یادی نیمْوەصلیٚ، غەم بەسە "سالم"**
**لە خەودا دەفعەییٚ بوٚس و کەناریٚ بوو، ئەویش ڕابورد (٦)**

(٤) ئەم بەیتە لە (ج)دا سیٚیەمە.

عوریانی: ڕووتی. کەف: بەری دەست. جیٚب: یەخە. دڕیدە: دڕاو. ئیعتیبار: ڕیٚز و حورمەت.

واتە: پەشیمانم لە ڕووت‌وقووتی، ئەگەرچی ئەم ڕووت‌وقووتییە کار و پیشەی مەجنوونی عامیرییە و شوورەیی نییە. حەزم لە یەخەی دادڕاو دەکرد، ئەم یەخە دادڕاوییە ڕیٚز و حورمەتیٚك بوو، ئەویش نەما.

دوور نییە (پەشیمانم) (پەشیمان نیم) بووبیٚ، ئەوکاتە واتە: لە ڕووت‌وقووتی پەشیمان نیم، ئەگەرچی ڕووت‌وقووتی کاری شیٚتانە، چونکە یەخەی بە دەست دڕاو و ڕووتی نیشانەی کوٚست‌کەوتنە و جوٚرە تامیٚکی تایبەت و ڕیٚزیٚکی هەبوو، ئەویش نەما؟

بە کەف جیٚبی دڕیدەم (کم): بە کفنی حب دریدم؟

(٥) واتە: ئەم چاوە ئاوهاتووە، یا ئەم سەرچاوە بیٚئاوە، کە ئەویش هەر چاوەکەیە، ئەوەندە بە خوڕ فرمیٚسکی لیٚ باری، وشکاوی هات و فرمیٚسکی نەما. یادی باڵای وەك سەروت جوٚگە و ئاویٚك بوو بوٚم، ئەویش ڕوٚیی.

ئەشکی (ف، ج، کم، گم): ئەشکم، ڕستەبەندیی نیوە بەیتەکە تەواو نابیٚ. نەما (ف): تەمام. چەشمە بیٚئاوە (گم): چەشمەیی ئاوە.

(٦) بوٚس و کەنار: ماچ و باوەش.

واتە: ئەی سالم! بەس خەمی ئەوە بخوٚ کە کاتی بیٚداری -تەنانەت- بیر لە بەیەکگەیشتنیٚکی نیوەوناچڵی یاریش بکەیتەوە، ئەوە هەر جاریٚك و لە خەودا بوو، ماچ‌وموورچ و باوەشیٚکیش بوو، ئەویش ڕوٚیی.

نیموەصلیٚ (غ): نیمعەیشیٚ. (ج): نیمعەیش. (کم): نیوە عەیشی. (گم): نیمە عەیشی.

-٣- (*)

دەدا هەردەم شەکەرخەندت، ثەمەرقەند
بە قوربانی شەکەرخەندت، سەمەرقەند (١)
لە قەدتا دەستی من موشکیل کەمەر بێ
قەدی موو قەت قوبووڵ ناکا کەمەربەند (٢)
بە ڕووی وەصلا چ غەم، گەر بەحرە هیجرت
کە نەمبا ناخودا، دەمبا خوداوەند (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، ه، ف، ج، ق، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەقسوور.

(١) شەکەرخەند: زەردەخەندەی شیرین. ثەمەرقەند: بەری وەك قەند، بەری شەکر. سەمەرقەند: شارێکە لە تورکمەنستان.

واتە: هەموو کاتێك زەردەخەنەی وەك شەکر شیرینت بەری شەکر دەدا، دەبا شاری سەمەرقەند بە قوربانی ئەو زەردەخەنە جوانە شیرینەت بێ.

دەدا (ڕ): دەوا. (کم): ئەدا. شەکەرخەندت (کم، گم): شەکەرخەندەت، کە بە واتای خاوەنی زەردەخەنەکە دێت. سەمەرقەند (عا، ڕ، کم): ثەمەرقەند.

(٢) واتە: زۆر گرانە دەستی من بێتە کەمەربەندی قەدت، چونکە قەدی وەك موو باریکت کەمەربەند و پشتێن هەڵناگرێ.

موشکیل (ه، گم): میثلی. قەت (عا، ه، کم، گم): قەد.

(٣) ئەم بەیتە لە (حا، ه)دا پێنجەم و لە (ف)دا چوارەم و لە (کم، گم)دا حەوتەمە، لە (ج)یشدا نییە.

ناخودا: کەشتییەوان، یار. خوداوەند: خودا.

واتە: ئەگەر دووریت بێتە دەریا، بەسەر بەیەكگەیشتندا بێ و داپۆشێ، چ خەمێکم هەیە. من ئەگەر کەشتییەوان لە کاتی بەیەكگەیشتندا لەگەڵ خۆی نەمبا، خوداوەند دەمبا و بە خەفەت دەمکوژێ. بەکورتی: پاش بەیەكگەیشتن دوورکەوتنەوە بێ، ئیتر ژیان هیچ ناهێنێ و مردن جێی خۆیەتی.

چ غەم، گەر بەحرە (ق): چ غەممە بەحری.

له هیجری ڕووی بەهاری دڵستانم،
له دڵمایە خەفەت وەك كێوی ئەڵوەند (٤)
دڵی تیشنەم مەحەللی ڕەحمە، سا دەی
بە ئاوی تیغی تۆیە، ئارەزوومەند (٥)
غوباری كۆیی عیشقە، كوحلی بینش
بە خاكی نەقشی پێی جانانە سەوگەند (٦)
بە ئەفسوونت جەلا دا دانەیی خاڵ
بە دامی طوڕڕەی تۆ بوو مورغی دڵ بەند (٧)

(٤) ئەم بەیتە لە (ھ)دا نییە.

دڵستان: دڵبەر. ئەڵوەند: كێوێكە لە ناوچەی (ھەمەدان).

واتە: خەم و خەفەت لە دووریی ڕوخساری وەك بەهار جوانی دڵبەرم، لە دڵمدا بەقەدەر كێوی ئەڵوەند كۆمەڵ بووە.

هیجری (عا، ف، ج، ڕ): دووری. دڵستانم (حا، كم، گم): نازەنینت. وەك كێوی ئەڵوەند (ف): هەر وەك دەماوەند. (ق): وەك كۆهی ئەڵوەند.

(٥) ئەم بەیتە لە (ھ)دا حەوتەم و لە (ج)دا سێیەمە.

واتە: دڵی تینووم شایانی بەزەیییە، تینووی ئاوی تیغی دەستی تۆیە. یانێ تینووی خوێنی دەستی تۆیە و چاوەڕوانە بیكوژی!

(٦) ئەم بەیتە لە (ھ)دا سێیەمە.

واتە: سوێند بە خاكی بەری پێی دڵبەر، كلی بینین و ڕووناكیی چاوی من تۆزی دەورروبەری ئارامگەی یارە.

كۆیی (ف، ج): كۆهی. عیشقە (ج): عیشق.

(٧) ئەم بەیتە هەر لە (ھ، كم، گم)دا هەیە.

ئەفسوون: سیحر و فێڵ. جەلا دا: مشتومالی دا و ژەنگەكەیی لابرد. دام: داو. مورغ: باڵندە.

واتە: دانەی خاڵی ناو داوی ئەگریجەی خۆتت بە جادوو و فریودان ڕازاندەوە. ئەوەتا باڵندەی دڵم بە تاڵی داوی ئەگریجەی تۆ بەستراوەتەوە و كەوتووەتە بەند.

جەلا دا (كم، گم): جەلای دا. تۆ بوو (ھ): تا بوو.

**دەزانن غوصصە تا کەی بارە بۆ دڵ؟**

**هەتا تەم بێ لەسەر کێوی دەماوەند! (٨)**

**مەکەن مەنعم لە غەم؛ بێ ئەو، زمستان**

**بە چی بێ بولبولی بێچارە خورسەند؟! (٩)**

**ئەبەد نادەم بە خەرقەی پادشاهی**

**پەڵاسی خەز، لیباسی کوهنەیی ڕەند (١٠)**

**خودایا! میحنەتی "سالم" هەتا کەی؟**

**لە کارا سستییی بەختی هەتا چەند؟ (١١)**

(٨) غوصصە: خەم و پەژارە.

واتە: تا تەم بەسەر کێوی دەماوەندەوە بێ، کە هەرگیز تەمی لێ نابڕێ، دڵی منیش بێ خەم و پەژارە نابێ.

دەزانن (کم): ئەزانم. (هـ، گم): دەزانی. بارە (ف): مارە. لەسەر (عا): بەسەر. کێوی (ج): گێسووی. هەڵەیە.

(٩) ئەم بەیتە لە (حا، هـ)دا نییە.

خورسەند: شاد و دڵخۆش.

واتە: سەرزەنشتم مەکەن کە بەبێ یار خەمبارم، بولبولی بێچارە دڵی لە زستانی ساردوسڕدا بەبێ گوڵ و گوڵزار بە چی خۆش بێ؟!

(١٠) ئەم بەیتە هەر لە (کم، گم)دا هەیە.

کوهنە: کۆن. ڕەند: دێوانە.

واتە: پەڵاسی وەك ئاوریشم و بەرگی کۆن و ڕزیوی دێوانەیە، لە لام بەنرخن، هەرگیز نایانـدەم بە خەرقە و جبەی پادشایی.

ئەبەد (هـ، کم): نەمەد. پەڵاسی خەز، لیباسی کوهنەیی (هـ): پەڵاس و خەز لیباسێکە لەلای.

(١١) واتە: خودایە گوناهی سالم چییە وا گیرۆدەی نەگبەتییە و بەختی نایهێنێ، کاری بە سستی بۆ مەیسەر دەبێ.

میحنەتی (ج): بەختی. لەنگە. سستییی بەختی (گم): سستی بێبەختی.

-٤- (*)

**لەگەڵ ئێمە فەلەك! بەم نەوعە تا چەند:**
**من و دڵبەر لە جەورت بین پەڕاگەند؟!** (١)
**بڕۆ ناصیح! لە حەرفت گوێم گرانە**
**لە لای من** ((**بعد ازین**)) **بێهوودەیە پەند** (٢)
**ڕەقیب بگرە زبانی لەهُوی پەلیت**
**موباهاتت قوبووڵ ناکا خوداوەند** (٣)
**نمەد نادەم بە خەرقەی پادشاهی**
**پەڵاس و خەز، لیباسێکن لە لای ڕەند** (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەقسوور.

(١) پەڕاگەند: پەرت و بڵاو و لێكدوور.

واتە: ئەی چەرخی گەردوون، تا کەی من و دڵبەر بەم جۆرە بە هۆی ستەمی تۆوە لەیەك جیا بین.

(٢) حەرف: قسە. بعد ازین: ڕستەیەکی فارسییە، واتە لەمەبەدوا. پەند: ئامۆژگاری.

واتە: ئامۆژگاریکەر، بڕۆ قسەم بۆ مەکە، گوێم لە ئاستی قسەی تۆ گرانە و نایبیستم، لەمەبەدوا پەند و ئامۆژگاری لە لای من بێ کەڵکە.

(بعد ازین) لەبەر کێشی شیعرەکە بە (بەعدەزین) دەخوێنرێتەوە.

(٣) لەهو: ڕابواردن، گەمەکردن. پەلیت: پەلید، ناپاك، پیس. موباهات: شانازی بەخۆوەکردن و خۆبەزلزانین.

واتە: ئەی بەدکار! زمانی پیس و بەدی بێڕابواردنت بگرە، بەس ئاژاوە بگێڕە. خودا ئاخری ئەم کەشوفش و خۆبەزلزانینەت لێ قوبووڵ ناکا و تۆڵەت لێ دەکاتەوە.

(٤) نمەد: لباد. پەڵاس: جلوبەرگی خوریی زبر. خەز: ئاوریشم. ڕەند: دێوانە و شەیدا.

واتە: لبادی هەژارانەی خۆم نادەم بە جبە و عەبای پادشایی، بەرگی پەڵاس و بەرگی ئاوریشم لە لای دێوانە وەك یەکن.

**مەجووسی! ناری عیشقت ناگوڕێزە**
**دەزانم مەتن و مەعنای (زەند و پازەند) (٥)**
**تەمامە وێڵی دونیا بم لەدەست غەم**
**وەلێ، ئاخ، حەلقەیی گێسووتە پابەند (٦)**
**بەدەست تۆ قەندە بۆم، زەهری هەلاهیل**
**لە لام زەهرە بەبێ تۆ لەذذەتی قەند (٧)**
**گوشادیی دا بە دڵ ئەمڕۆ، شوکر، یار**
**لە گریەی "سالم"ا کردی شەکەرخەند (٨)**

(٥) مەجووس: ئاگرپەرست. ناگوڕێزە: واز ناهێنێ. زەند: ئاڤێستای زەردەشت. پازەند: لێکدانەوەی ئاڤێستا. زەند و پازەند بەو دوو دارەیش دەڵێن کە لە یەکتر دەدرێن و دادەگیرسێن.

واتە: ئەی یاری ئاگرپەرست! ئاگری عیشقت ماوەم نادا و لێی ڕزگار نابم. من دەق و ڕاڤە، زەند و پازەند و هەموو نهێنییەکانی کاری عیشقی تۆ دەزانم و لە خۆڕایی قسە ناکەم.

(٦) گێسوو: ئەگریجە، زوڵف. پابەند: پێوەند.

واتە: دەمەوێ لەدەست خەم هەڵبێم و وێڵی دنیای بەرین بم، بەڵام -داخی بە جەرگم- ئەڵقەی ئەگریجەت پێی بەستوومەتەوە.

(٧) هەلاهیل: جۆرە ژەهرێکی کوشندەیە.

واتە: ژەهری کوشندەی هەلاهیل کە لە دەستی تۆ بیخۆمەوە، وەك شەکر شیرینە، بەڵام بەبێ تۆ شەکر لە لای من ژەهری مارە.

(٨) واتە: سوپاس بۆ خودا، یار ئەمڕۆ بە گریانی سالم پێکەنی و خۆشیی دا بە دڵم!

(*) -٥-

مەشقی مەردی بە کەرەم، کەسبی صەڵاحەت بە سوجوود
«هر که این هردو ندارد، عدمش بِهْ ز وجود» (١)
عەبەثە نازشی مونعیم بە زەڕ و موڵك و مەتاع
«که محال است دراین مرحله امکان خلود» (٢)
ئەمە هەر پەرتەوی ئەو ڕۆژەیە ئەییامی قەدیم
«که همه تافت بر آرامگـه ٔ عاد و ثمود» (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لـە (مان، ه، ف، غ، ن، کم، گـم)دا هەیـە. لـە (مـان، ن)دا یەکێکـە لـە پارچەشیعرە تێهەڵکێشەکان (ملمعات). فارسییەکەی هی "سەعدی شیرازی"یـە و پـاش و پـێش لـە تێهەڵکێشی بەیتەکاندا کراوە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەقسوور.

(١) هەشت بەیتی ئەووەڵ لە (غ)دا نین.

کەرەم: بەخشندەیی. کەسب: بەدەستهێنان. صەڵاحەت: شایستەگی، کارچاکی، سوودوەرگرتن.

واتە: پیاوەتی، بـە دەهەنـدەیی و بەخـشش دەسـت دەکـەوێ، شایـستەگی و کـاری چـاك یـا سوودبینین بە کوڕنووشبردن بۆ خودا. هەر کەس ئەم دوو کارەی نەبێ، نەبوونی لە بوونی باشترە.

کەسبی صەڵاحەت بە سـوجوود (ه): کەسـبی جەلالـەت بـە سـوجوود. (کـم، گـم): صـیدق و صەلاحەست و سجوود. تێهەڵکێشەکەی لە کوردییەکەیشی و فارسییەکەکەیشیدا تێكچووە.

(ز وجود) لای "سەعدی" (که وجود)ە.

(٢) عەبەث: بێسوود. نازش: نازین. مونعیم: خاوەنی بەخشندەیی. خلود: نەمری، هەتاهەتایی.

واتە: شتێکی بێسوودە خاوەنی سامان بە سامان و دەسەڵاتی خۆی بنـازێ و خـۆی لێ بگـۆڕێ، چونکە کەس لەم قۆناغی ژیانی دنیاییەدا تاسەر نامێنێ.

موڵك (ه): ماڵ. مەتاع (مان): مەطاع، هەڵەیە.

(٣) پەرتەو: تیشك. تافت: لێی دا، لێی هەڵات. آرامگە: یا مەبەستی گۆڕەکانیانە، یـا جـێوڕێ و کۆشکەکانیان پێش کاولبوون.

واتە: ئەم ڕووناکییەی وا ئێستا دەیبینی جیهان ڕۆشن دەکاتەوە، هەمان ڕووناکییـە کـە وەختـی خۆی ڕۆژانی ڕابوردووی کۆن لە جێ و کۆشك یا لە گۆڕی نەتەوەکانیتری دەدا؛ نە ئەوان مـان، نە ئەمان دەمێنن.

**ڕاسته پامالّی غه‌می، ئه‌ی دلّی ئاشوفته، وه‌لیّ**
**((صبر کن کین دو سه روزی بسَرْ آید معدود)) (٤)**
**سه‌روکاری منی بیّکه‌س به که‌سیّکه، هه‌مه جا**
**((که کریم است و رحیم است و غفور است و ودود)) (٥)**
**لازیمه‌ی دینه له‌سه‌ر ئه‌هلی خیره‌د، عیززه‌تی خاك**
**((که عیون است و جفون است و قدود است و خدود)) (٦)**
**ئینس و جین موعته‌ریفی قودره‌تی حه‌ققن، به یه‌قین**
**((همه در ذکر و مناجات و قیامند و قعود)) (٧)**

(٤) پامالّ: پایه‌مالّ، پیّخوست و له‌ناوچوو. کین= که این: که ئه‌م. بسرآید: ته‌واو ده‌بیّ.

واته: ئه‌ی دلّی سه‌رگه‌ردان! ڕاسته خه‌فه‌ت و په‌ژاره پایه‌مالّ و مالّویّران و سه‌رگه‌ردانی کردووی. به‌لاّم ددان به خوّتدا بگره. ئه‌م دووسیّ ڕوّژه‌ی ژیان ته‌واو ده‌بیّ و له جیهانی نه‌مانی ئه‌به‌دیدا ده‌حه‌سیّیته‌وه.

غه‌می، ئه‌ی (ه): غه‌مت بوو. مه‌عدوود. (کم، گم): مه‌وعوود. دوو سه روزی (کم، گم) به دوو سی روزی. (کین) لای "سه‌عدی" (کاین)ه.

(٥) هه‌رجا: له هه‌ر شویّنیّکدا.

واته: جیّبه‌جیّبوونی کاری من به ده‌ستی یه‌کیّکه له هه‌موو شویّنیّکدا به‌خشنده و میهره‌بان و گوناهپوّش و به‌به‌زه‌ییه.

میسکین (ه): بیّکه‌س. رحیم است و غفور است (کم): غفور است و رحیم است.

(٦) واته: به‌پیّی ڕیّوشویّنی ئایین، پیّویسته له‌سه‌ر ژیران نرخی ئه‌م خاکه بزانن و به بیّقه‌دری به‌سه‌ریدا نه‌ڕوّن، چونکه ئه‌م خاکه‌یش کاتی خوّی چاو و برژانگ و بالاّ و کولّم و ڕوخساری نازداریّ بووه. یا: لازیمه‌ی دینه... تاد، ده‌ین: قه‌رز. واته: قه‌رزیّکی پیّویسته .. تاد.

لازیمه‌ی.. تاد (ه): لازیمی ... عیززه‌تی یار. (ف): لازیمه‌ی دینه له‌سه‌ر ئه‌هلی خیره‌د حورمه‌تی یار. (کم، گم): لازمه (لازم) ئه‌و دینه له‌مه‌ڕ ئه‌هلی خوا عیززه‌تی یار! عیون (ف): جنون. قدوداست و خدود (مان): قدوراست و خدور. هه‌لّه‌یه. (ف): خدود است و قدود. به دوور نازانریّ له‌باتی (لازیمه‌ی دینه) لازمه و ده‌ینه بووبیّ، واته پیّویسته و قه‌رزه. (قدوداست و خدود) لای "سه‌عدی" (خدوداست و قدود)ه.

(٧) ئینس: بنیاده‌م. جین: جنوّکه. موعته‌ریف: ددانپیّدانه‌ر. حه‌ق: خودا. یه‌قین: بیّچه‌ندوچوّن.

**نائومێد نابێ ببن لەم ڕەهە، بێگانەوو خوێش**
**((هیچ خواهندە ازین در نرود بی مقصود)) (٨)**
**ذاکیری لەفظی شەهادەت بە، دڵا، حاڵەتی نەزع**
**((گرت ایمان درست است بە روز موعود)) (٩)**
**ئەو وجوودەی نییە دونیا غەرەضم بێ لە چ کەس**
**((ای برادر کە نە محسود بماند نە حسود)) (١٠)**
**سەعدە ئەم پەندە، وەلێ صەعبە لەدەست "سالم" بێ**
**((نتواند کە بەجا آورد إلاّ مسعود)) (١١)**

واتە: ئینس و جین هەموو ددان بە دەسەڵات و توانایی خودادا دەنێن، هەموویان خەریکی یادی خودا و پاڕانەوە و خوداپەرستین.

(٨) ئەم بەیتە لە (ه)دا نییە.

خواهندە: داواکار، ئەوی شتێکی بوێ.

واتە: نابێ بێگانە و دۆستان لەم ڕێیە نائومێد ببن. هیچ داواکارێك لەم دەشت و دەرەدا بەبێ ئامانج و مەرام ناڕوا.

(٩) نیوەی دووەمی بەیتی دوایی لە (ف)دا خراوەتە سەر نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە.

نەزع: گیانەڵا، کاتی گیانکێشان.

واتە: ئەی دڵ! ئەگەر باوەڕی تەواوت بە ڕۆژی دیاریکراو هەیە، کە ڕۆژی قیامەتە، ڕستەی شایەتومانت لە کاتی سەرەمەرگدا لە بیر بێ.

دڵا (کم): دڵ. (گم): دڵی. ایمان (ف، غ): امکان.

(١٠) دووەم نیوەی ئەم بەیتە لە (غ)دا خراوەتە سەر نیوەی یەکەمی دوایین بەیت و دوو نیوەکەیتریش کەوتووە.

وجوود: بوون، لێرەدا مەبەستی نرخ و ئیعتیبارە.

واتە: دنیا ئەو نرخەی نییە کە لە پێناویدا کارم بە کەسێ هەبێ و دەستەودامانی ببم. برا! دوایی نە بەخیلیپێبراو دەمێنێ و نە بەخیل!

وجوودی (گم): وجوودەی. غەرەضم بێ. (کم، گم): کە غەمی بێ. ئەی برادەر.. تاد. (کم، گم): نتواند کە بەجا آورد الاّ مسعود.

(١١) ئەم بەیتە لە (ه)دا نییە.

سەعد: بەختیاری. مەسعوود: بەختیار (وەك لەپێشدا وتمان، لەوانەیشە ناسناوی خاوەنی نیوە فارسییەکانی ئەم شیعرانە بێ).

واتە: ئەم پەند و ئامۆژگارییانە مایەی بەختەوەرین، بەڵام گرانە بە سالم جێبەجێ بکرێن! کەس ناتوانێ پێڕەویی ئەم ئامۆژگارییانە بکا، کەسێکی بەختیار نەبێ.

(بێ) لە (غ)دا کەوتووە.

شایانی باسە، ئەم دواینبەیتە لە (ف، کم، گم)دا ئەم بەیتەی خوارەوەی لە جێدایە، کە لە (مان)دا نییە:

قەطعی ئومێد مەکە "سالم"، نە لە بێگانەوو خۆیش

((هیچ خواهند ازین در نرود بی مقصود))

مەکە سالم، نە لە (ف): مەکەن ئەی سالم. نە لە بێگانەوو خویێش. (کم): نە لە بێگانە نە لە خوێش!

-٦- (*)

**نەما ڕەنگم، بەبێ دیداری ئەحمەد**
**چ دڵتەنگم، بەبێ ڕوخساری ئەحمەد (١)**
**سەری پڕشۆڕشم سەودایی هیجران**
**دوچاوم تا سەحەر بێداری ئەحمەد (٢)**
**دەبارێ ئەشکی خوێن گوڵ گوڵ لە چاوم**
**وەکوو لەعلی لەبی گوڵناری ئەحمەد (٣)**
**بینابیم تار و ئەشکم سوور و ڕەنگ زەرد**
**دەروون پڕنار و لەب پڕباری ئەحمەد (٤)**
**لە دەور قوطبی خەیاڵم وەك جەدیوار**
**لە مەغریب تا بەیان دەوواری ئەحمەد (٥)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (نم)دا هەیە. نازانرێ ئەو "ئەحمەد"ە کێیە؟ ڕەنگە سەردەمی غەریبی و ئاوارەیی بۆ "ئەحمەد پاشای بابان"ی دوایین میری بابانی وتبێ.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) دیدار: بینین.

واتە: لەبەر چاوپێنەکەوتنی ئەحمەد ڕەنگم نەماوە. کە ڕوخساریشی نابینم، دڵتەنگم.

(٢) پڕشۆڕش: پڕ لە هەرا و هوریا و چالاکی. سەودا: پەرێشان. هیجران: لێکجیایی. سەحەر: بەرەبەیان.

واتە: سەری پڕ لە هەرا و زەنام بە دەست لێکجیاییەوە پەرێشانە. تا بەرەبەیان چاو لە ڕێی ئەحمەدم.

(٣) گوڵ گوڵ: وەك گوڵ ئاڵ و بەردەوام. لەعلی لەب: سووریی لێو. بار: باری لێو. گوڵنار: گوڵەهەنار.

واتە: فرمێسکم وەك گوڵی ئاڵە و لە چاومەوە دێتە خوارێ. وەك لێوی بە وێنەی گوڵەهەنار سووری ئەحمەدیش وایە.

(٤) تار: تاریك. نار: ئاگر. لەب: لێو.

واتە: چاوم نابینێ و فرمێسکم لەبەر گریانی زۆر سوورە و ڕەنگیشم زەرد هەڵگەڕاوە. دەروونم پڕ لە ئاگر و لێوبەبارم بۆ ئەحمەد.

(٥) جەدیوار: وەك ئەستێرەی جەدی.

زەمانە مەرکەز و ئەو نوقطەکەی ناو
دڵم دەوری نوقطە پەرگاری ئەحمەد (٦)
درەختی ((کن فکان)) ئەووەڵ کە نێژرا
جیهان هات شاخ و بەرگ و باری ئەحمەد (٧)
لەژێر باری خەفەت "سالم" صەبوور بە،
دەنێرێ ئەحمەدت موختاری ئەحمەد (٨)

واتە: وەك ئەستێرەی (جەدی)، لە خۆرئاواوە تا بەیانی، بە دەوری قوتبی خەیاڵمەوە بۆ ئەحمەد دەسوورێتەوە.

(٦) مەرکەز: ناوەندی گەردوون. نوقطە: خاڵ. مەغریب: خۆرئاوابوون. دەووار: بەدواداسووڕاو، بە شوێندا خولاوە.

واتە: ئەحمەد، خاڵێکە لە ناوەندی گەردووندا، دڵم بە دەوریدا وەك پەرگار دەسووڕێتەوە.

نیوەی دووەم تەفعیلەکەی ڕاست نییە و (فاعلاتن)ە، لە کاتێکدا دەبێ (مفاعیلن) بێ. بۆیە دەشێ وا بووبێ: دڵم دەور نوقطەیی پەرگاری ئەحمەد، یا: لە دەوری نوقطە، دڵ پەرگاری ئەحمەد، بەتایبەتی کە بەیتی پێشوویش شتێکی لەو جۆرەی تێدا کراوە: لە دەور قوطبی خەیاڵم وەك جەدیوار.

(٧) کُن فکان: ئەوی دەسەڵاتی خوداوەند بڵێ ببە، دەبێ. شاخ: لقوپۆپ. بەرگ: گەڵا. بار: بەر، میوە.

واتە: کە خودا ئەووەڵ جار فەرمانی دا دار و درەخت بنێژرێ و ببێ، ئیتر درەختی تەمەنی ئەحمەدیش لقوپۆپ و گەڵاو بەری بۆ پەیدا بوو و هاتە جیهانەوە.

(٨) واتە: سالم! لەژێر باری خەمدا ئارام بگرە، ئەو ئەحمەدەی تۆ "ئەحمەدی موختار" -یانێ پێغەمبەری موسوڵمانان-ت بۆ دەنێرێ و فریات دەکەوێ.

# پیتی (ذ)

-١- (*)

**به تەقدیمی وەفا ناردی نیگاری سیمْبەر کاغەذ**
**بەریدی خۆشخەبەر هێنای وەکوو بادی سەحەر کاغەذ (١)**
**خیطابی غائیبانە عادەتی داوم بە تەنهایی**
**ڕەفیقە بۆ دڵی خوێنینی من، گاهی سەفەر کاغەذ (٢)**
**مەگەر موژگان ئیشارەی کرد بە کاتب، نوکتەسەنجی کا؟**
**لە زەخمی خوونچەکانی دڵ، وەکوو من باخەبەر کاغەذ (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ه، کم، نم، گم) هەیە. لە (کم، گم)دا خراوەتە ناو شیعرەکانی پیتی (ز) و (کاغەذ) بە (کاغەز) نووسراوە، بەڵام لە (مان، ه، نم)دا جێی دروستی خۆی دانراوە. لەوە دەچێ "سالم" نامەیەکی بۆ هاتبێ و ئەم پارچەشیعرەی لە خۆشیی هاتنی ئەو نامەیەدا نووسیبێ، پارچەشیعری دووەمیش وەڵامدانەوە بێ.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) بە تەقدیمی: بۆ تەقدیمی. نیگار: یار. سیمبەر: بەدەنسپی، جوان.

واتە: یار، بە شێوەی پێشکەشکردنی وەفا و پیشاندانی ئەمەکداری، نامەی نارد. پەیکی خۆشخەبەر نامەی هێنا و وەك سرووەی بەرەبەیان دڵی فێنك کردەوە.

ناردی (مان): ناروی. هەڵەی نووسینە.

(٢) خیطاب: مەبەستی نامەیە. غائیبانە: هیی پاشملە، ئەو کەسە لەوێ نەبێ.

واتە: نامەی دووربەدوور وای لێ کردووم خووم بە تەنهاییەوە گرتووە، کاتی سەفەر هاوڕێی دڵی خوێنینم نامەیە.

خیطابی غائیبانە (کم، نم، گم): خیطابی غائیبانەی. گاهی سەفەر (نم): گاهی سەقەر. دیارە هەڵەیە.

(٣) موژگان: برژانگەکان. کاتب: نامەنووس. نوکتەسەنجی: نوکتەهۆنینەوە. زەخم: زام، برین. خوونچەکان: خوێنتکان. باخەبەر: ئاگادار.

**شەکەرئەفشانیی شیرینزوبان مایەی حەلاوەت بوو**
**دەهان شیرین دەکا هەر حەرف و نوکتە وەك شەکەر کاغەذ (٤)**
**قودوومی قاصیدی، زینددانی هیجرانی بە گوڵشەن کرد**
**دەکاتە ڕەوضەیی جەننەت بە موشتاقان سەقەر کاغەذ (٥)**
**لە شادیی خەلعەتی ئەڵطافی دڵبەر دەست بەرە "سالم"!**
**هوەیدا کە بە شەوکەت وەك ڕەقەم موحکەم بەسەر کاغەذ (٦)**

واتە: لەوە دەچێ موژگانی یار فەرمانی دابێ بە نامەنووس بکەوێتە وشەئارایی و دڵم خۆش بکا. نامەکەی یار، وەك خۆم ئاگاداری ئەوەیە کە دڵم خوێنی لێ دەتکێ!

نوکتەسەنجی (گم): نیکتەسەنجی.

(٤) دەهان: دەم. شیرینزوبان: زمانشیرین، قسەخۆش. حەلاوەت: شیرینی. دەهان: دەم.

واتە: شەکروەشاندنی زمانی شیرینی یار و قسەی خۆشی مایەی شیرینی بوو بۆ من. بەڵێ، قسە و نوکتەی خۆشەویست وەك شەکر، بەڵکوو زیاتر، دەم شیرین دەکا و شادمانی بە دڵ دەبەخشێ.

دەکا (کم): ئەکا. زوبان (کم، نم، گم): زمان. نوکتە (کم، نم): نوکتەی. (گم): نیکتەی.

(٥) قودووم: هاتن. قاصید: نامەبەر. هیجران: دووری. ڕەوضە: باخچە. بە موشتاقان: بۆ موشتاقان.

واتە: کە پەیك لای تۆوە هات، زینددانی دووریی کردە گوڵستان. بەڵێ، نامەی دڵبەر دۆزەخی دووریی ئارەزوومەندان دەکاتە باغچەی بەهەشت.

قاصیدی (کم، نم، گم): قاصیدت. دەکاتە (کم، نم، گم): دەگاتە. سەقەر (کم): سەفەر. (گم): نەظەر.

(٦) خەلعەت: خەڵات و بەرات. ئەڵطاف: لوتفنواندن. هوەیدا کە: دەربخە. شەوکەت: شانوشکۆ. وەك ڕەقەم: بە نووسین، بە ژمارە. موحکەم: قسەی ڕوون و ئاشکرا کە پێویستی بە لێکدانەوە نەبێ.

واتە: سالم، لە خۆشیی خەڵاتی لوتفنواندنی دڵبەردا، بە شانوشکۆی خۆت بە نووسین یا بە ژمارە قسەی ڕوون و ڕاستی خۆت لەسەر کاغەز دەربخە.

دەست (ه، کم، نم، گم): دەس. (موحکەم بەسەر) لە (ه)دا کەوتووە.

-٢- (*)

بنووسم چۆن؟ لە هیجرانا بە یاری سیم‌بەر کاغەذ
دەکا گوم دووکەڵی ئاهم لەبەر مەددی نەظەر کاغەذ (١)
چ حاجەت مینەتی باڵی کەبووتەر هەڵگرێ نامەم؟
کە پەڕ بۆ طەیی ڕاهی کۆیی تۆ دێنێتە دەر کاغەذ! (٢)
لە تەندووری فیراقا ئافەتی مەکتووبە گریانم
وەکوو پشکۆیی ئاگر خوێن بە گەرمی دێتە سەر کاغەذ (٣)
لە بەندی دیقەتی وەصفی میانا نوکتەبازێکە!
لە پەردەی مەعنییا پڕشەهدە، میثلی نەیشەکەر، کاغەذ (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرەیش لە (مان، ه، کم، نم، گم)دا هەیە. لە (کم، گم)دا، لەناو شیعرەکانی پیتی (ز)دا دانراوە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) بە یاری: بۆ یاری. سیم‌بەر: لەش‌سپی، جوان.

واتە: چۆن نامە لە دووریدا بۆ یاری جوان بنووسم و وەڵامی بدەمەوە، کە دووکەڵی ئاه و هەناسەم تا چاو بڕ بکا کاغەزەکەم لێ ون دەکا.

یاری (کم، گم) یادی. دەکا (کم) ئەکا.

(٢) کەبووتەر: کۆتر. طەی: پێچانەوە. ڕێگەبڕین.

واتە: نامەم پێویستی بەوە نییە منەتی کۆتری نامەبەر هەڵگری؛ خۆی پەڕ دەردەکا و باڵ دەگرێتەوە و ڕێگا دەپێچێتەوە و دەگاتە بەردەرگات. پەڕدەرکردن واتای پێ‌خۆش‌بوون و شادمانیش دەدا. لە کوردەواریدا دەوترێ: لە خۆشیدا پەڕی دەرکرد، واتە: ئامادەی باڵ‌گرتنەوە بوو. تێکڕا بەیتێکی جوانە.

دێنێتە دەر کاغەذ (نم): دێنێتە سەر کاغەذ.

(٣) تەندوور: تەنوور.

سالم لە بارودۆخی نووسینی نامەکەی دەدوێ و دەڵێ: گریانم لە تەنووری دووریدا بووەتە بالا لە نامە و ناهێڵێ بینووسم. خوێن وەك پشکۆی ئاگر بە گەرمی دێتە سەر کاغەزەکە و دەیسووتێنێ. فرمێسکی "سالم" لە تەنووری دووریدا دەبێتە ئاگر، زۆر جوانە.

فیراقا (گم): فیراقت.

(٤) میان: ناوقەد.

**له جیلوەی شەعشەعەی وەصفی جەمالا غەرقی پەرتەو بوو**
**ئیحاطەی شەمعی مەعنیی دا، مودەووەر وەك فەنەر کاغەذ (٥)**
**چ حاجەت پورسشی ئەحوالّی ئاشوفتەم له قاصید کەن؟**
**ئەدا خەططی پەرێشانی له ئەحوالّم خەبەر کاغەذ (٦)**
**له فەحوای شەرحی ناری فیرقەتا سووتا دلّی دوشمن**
**که نووسیی "سالم"ی بێکەس به خوونابی جگەر کاغەذ (٧)**

واته: نامه، لـه بابەتی وەسف‌کردنی ناوقەدی باریکی تۆدا، نوکتەی باریکی هەیە و زۆر بـه وردی وەسفی دەکا. هەروەها لـه پەردەی مەعناکاریدا وەك قامیشی شەکر پڕ لـه شیرینییە. بەم جۆرە وشـەی (کاغەذ) دەبێتە موبتەدای دواکەوتوو، دوو خەبەری هەیە: یەکەم (نوکتە باریکـە..) دووەم (پڕشـەهدە میثلی نەی‌شەکر).

وەصفی (هـ): وەضعی. نوکتەبازێکـه (کـم، نم): نوکتـه باریکـه. (گـم): نیکتەبازێکـه. مـەعنییا: مەعنیـدا، مەعنادا، مەعنایا، واته مەعنایدا هەلّدەگرێ.

(٥) فەنەر: چرای دەورگیراوی نەکوژاوە.

واته: نامەم، لـه جوانی و ورشەی وەسفی جوانیی یاردا، نوقمی تیشك بـووە. هـەروەها نامەکـەم وەك فەنەر پێچ‌پێچ دەوری مۆمی مەعنای داوە، یانێ: نامەکەم به دەوری مەعنای جواندا وەك بازنەیە. لێرەیشدا وشەی (کاغەذ) موتبەدای دواکەوتووە و دوو خەبەری هەیە. وشـەی مـەعنی (مەعنـەی)یـش هەلّدەگرێ، که دەکاتە مەعنای.

(٦) واته: هیچ پێویـست نییە دەنگ‌وباسی باری ئالّۆزم لـه نامەهەلّگر بپرسن؛ هێلّـی پەرێـشان و ئالّۆزی نامەم خەبەری چۆنیەتیی ئەحوالّم دەگەیێنێ.

ئەگەر نیوەبەیتی دوایی بکەینەوە به پەخشان، بەم جۆرەی لێ دێ: ((خـەططـی پەرێـشانی کاغـەذ خەبەر دەدا لـه ئەحوالّم)).

لـه قاصیـد کەن (نم): به قاصید کەی. (هـ، کم، گم): لـه قاصیـد کەی.

(٧) فەحوا: ناوەڕۆك و مەعنا. نار: ئاگر.

واته: که سالمی بێکەس و غەریب نامەی به خوێنـاوی جگـەر بـۆ نووسـیت، دلّـی دوژمـن لـه گەرمیی مەعنای شـەرحی ئاگری دوریدا سووتا. (دەست خۆش!)

دوشمن (کم، نم، گم): دوژمن. خوونابی (هـ، نم): خوێناوی.

## پیتی (ر)

### -١- (*)

**به چین گرتوویه، زوڵفت گەردی ڕوخسار**
**چلۆن سازش دەکا مارت لەگەڵ نار؟! (١)**
**به خوێن بێ دڵ، به گەرمی بێتە سەر جەرگ**
**ئەگەر بێ تۆ دڵم شاد بێ به گوڵزار (٢)**
**دەڵێم: وەك قامەت و ڕووتە، مەه و سەرْو**
**گەر ئەم صاحێبقەبا بێ، ئەو کولەهدار (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، ف، غ، ج، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەقسوور.

(١) گەرد: دەور. سازش: گونجان.

واتە: چین و ئەڵقەی ئەگریجەت دەوری ڕوخسارتیان گرتووە، من نازانم چۆن مار لەگەڵ ئاگر دەگونجێ، ماری ئەگریجە و ئاگری ڕوخسار.

گەردی (کم، گم): دەوری.

(٢) واتە: خودایە دڵم ببێتە خوێن و بە گەرمی برژێتە سەر جەرگم، ئەگەر بەبێ تۆ دڵم بە گوڵ و گوڵزار خۆش بێ.

بە گوڵزار (ق): لە گوڵزار.

(٣) مەه: مانگ. قەبا: کەوا. کولەه: کڵاو.

واتە: دەڵێم سەرو وەك بەژن و باڵاتە و مانگ وەك ڕوومەتتە. ئەگەر سەرو کەوای لەبەردا و مانگیش کڵاوی لەسەردا بووایە، یانێ جیاوازییەکە هەر لە کەوا و کڵاوەکەدایە. یاخۆ تەعلیق بە مەحاڵە، واتە: نە سەرو کەوای لەبەردا و نە مانگیش کڵاوی لەسەردا دەبێ، کەواتە ئەم دووانە هەرگیز ناگەنە ڕێکی و جوانیی تۆ!

دەڵێم .. تاد (کم، گم): دڵم وەك قامەتی ڕووتە مەهی سەرو! گەر ئەم (کم): گەرم. (گەر ئەم) لەبەر ڕاگرتنی کێش بە (گەرەم) دەخوێنرێتەوە.

**ئەگەر شەبها بەبێ تۆ خوابگاهم**
**پەڕی قوو بێ، لە پەهلووما یە وەك خار (٤)**
**صەبا! سا بێ بەسەر گێسوویی یارا،**
**دەماغم خوشکە بێ بۆی موشکی تاتار (٥)**
**طولووعی کرد کە خورشید ئاینەی گرت**
**لە صوبحا عەکسی ماهی کرد نموودار (٦)**
**«تعالی الله»، چ سیحرێکی بینا نا**
**لە نەظمی خاڵ و زوڵف و چاو و ڕوخسار؟! (٧)**

تەفعیلەی (مەھ و سەرو) لەنگە، بە (سەرو و مەھ) (فعولن) ڕاست دەبێتەوە و (لەف و نەشر)ەکەیش لە (موشەووەش)ەوە دەبێتە (مورەتتەب).

(٤) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (حا)دا نین.

شەبها: شەوان. خوابگاه: شوێنی نوستن. قوو: باڵدارێکی جوانە و تاڕادەیەك گەورەیە، لەبەر پانیی باڵەکانی جوان باڵ دەگرێتەوە و لە ئاویشدا جوان مەلە دەکا. پەڕەکەی زۆر نەرمە، بۆ سەرین بەکاردەهێنرێ. پەهلوو: پاڵ. خار: دڕك.

واتە: ئەگەر بەبێ تۆ شەوان شوێنی نوستنم نەرمونیان بێ و سەرینم لە پەڕی قوو بێ، ئەو شوێنە نەرمە لێم دەبێ بە دڕك و دەچەقێتە سەر و ملم.

پەهلوو (کم، گم): پاڵووما.

(٥) خوشك: وشك.

واتە: ئەی بای سەبا، بەسەر ئەگریجەی یاردا تێپەڕە و بۆنیم پێ بگەیێنە، من دەماغم وشکە و موحتاجی بۆنی میسکی ئاهووی وڵاتی تەتارە، کە بۆنی ئەگریجەی یارە.

صەبا (گم): سەبا. سا بێ (غا): با بێ. خوشکە (کم): وشکە.

(٦) خورشید: خۆر. ئاینە: ئاوێنە. نموودار: دیار و دەرکەوتوو و گەشەکردوو.

واتە: کە خۆر لە بەرەبەیاندا هەڵهات، یار ئاوێنەی ڕوومەتی تێگرت و خۆر وێنەی مانگی لە ئاوێنەی ڕوومەتی یار دا و لە خۆری کەوت.

(٧) ئەم بەیتە لە (غ)دا نییە.

نەظم: هۆنینەوە، ڕێکخستن، کۆکردنەوە.

واتە: گەورەیی و بەرزیی دەسەڵات هەر بۆ خودایە، چ جوانییەکی سیحراویی دروست کردووە، کە

ڕەشی کرد و بڕیی، خەم بوو، موزەییەن
بە غازە و سورمەوو میقراض و پەڕگار (٨)
بە سونبولزاری زوڵفا کەوتە ناو باغ
لە شەودا دڵ وەکوو شەبگەردی هوشیار (٨)
چنیی، گرتی، گەزیی، بۆی کرد و لایدا:
بەنەفشە و سونبول و سێب و گوڵ و نار (١٠)

خاڵی هیندوو و ئەگریجەی عەنبەرین و چاوی ڕەش و ڕوومەتی گەشی یاری پێکەوە کۆکردووەتەوە.

سیحرێکی بینا نا (کم، گم): ظولمێکی بینا نا. لێرەدا مەبەست ظولمی یارە. (ق): صوبحێکە نما نا. نەظمی (حا): ظولمی. زوڵف و (کم): زوڵفی.

(٨) غازە: سووراو.

(لەفف و نەشر) لەنێوان نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە و نیوەی دووەمی بەیتی پێشوودا، هەروەها لەنێوان نیوەی یەکەم و نیوەی دووەمی ئەم بەیتەدا هەیە و بەیەکەوە بەستراون. لە بەیتی پێشوودا وتی: خودا خاڵ و زوڵف و چاو و ڕوخساری یاری پێکەوە بە جوانی کۆکردووەتەوە. لە نیوەی یەکەمی ئەم بەیتەیشدا دەڵێ: چاوی ڕەش کرد و زوڵفی بڕی و لوول بوو، ڕوخسار بە سووراو ڕازایەوە و سورمە بۆ چاو و میقراض (مەقەست) بۆ زوڵف و پەڕگار بۆ دانان و دیاریکردنی جێی خاڵ، یا مەبەست لە پەڕگارەکە حەڵقەی زوڵفە لەسەر کوڵمی کە خاڵەکە لە ناوەڕاستیدایە.

بڕیی (کم، گم): بەری. (ی)ی (بڕی) لە (غ)دا کەوتووە. (ق): بڕی و. بە غازە و (حا): بە غاز و. (کم): بە نازەی. میقراض (کم): میقراضی.

(٩) ئەم بەیتە هەر لە (مان، عا)دا هەیە.

سونبولزار: وەك گوڵزار، مەبەست زوڵفی یارە. شەبگەرد: دز (ئەگەرچی واتایتریش زۆرە کە نێوانی لەگەڵ ئەم شوێنە هەیە، بەڵام دزەکە لە هەموویان گونجاوترە).

واتای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی، چونکە (لەفف و نەشر)یان لەنێواندایە، پێکەوە دێ.

(١٠) گەزی: گەستی. سێب: سێو.

واتە: دڵ وەك دزی هۆشیار لە باغچەی زوڵفەوە کەوتە ناو باغ و گوڵی چنی، سێوی گەست و وەنەوشەی بۆن کرد و گوڵی گرت و ئاگری لادا. گوڵ و نار دووریش نییە (گوڵنار) بێ.

چنیی.. تاد (غ، کم، گم): چنیم، گرتم، گەزیم، بۆم کەرد و لام دا. (ف، ج، ق): چنیم، گرتم، گەزیم، بۆم کرد و لام دا. بەنەفشە (کم): بنەوشە. سێب و گوڵ و نار (کم، گم): سێو و گوڵی نار.

**لە وەختێکا لەگەڵ تۆ ئاشنا بووم**

**نە مانیع بوو، نە حاجیب بوو، نە ئەغیار (١١)**

**بە ڕووما وا لە ئەبرۆ تیغی کێشا**

**وەکوو سەیفی عەلی بۆ صەففی کوففار (١٢)**

**نە پێی ڕۆیین، نە ڕێ بۆ دەستی کۆشش**

**ئیلاهی! کەس نەبێ وەك من گرفتار (١٣)**

**دەکێشێ خوێنی "سالم" حەرفی ئیسمت**

**وەکوو مەنصوور، ئەگەر ببرێتە سەر دار (١٤)**

(١١) ئەم بەیتە هەر لە (عا)دا هەیە.

حاجیب: دەرگاوان.

واتە: کە لەگەڵ تۆ ئاشنا بووم، نە کەس هەبوو ڕێم لێ بگرێ، نە دەرگاوان هەبوو و نە بێگانە، تا نەهێڵن بەیەك بگەین.

(نە)ی (نە ئەغیار) لە (مان)دا کەوتووە.

(١٢) سەیف: شمشێر.

واتە: بە جۆرێ تیغی برۆی لە ڕوومدا هەڵکێشا، وەك حەزرەتی عەلی کە شمشێری لە ڕووی کافراندا هەڵدەکێشا و دەیکوشتن.

ئەبرۆ (حا، کم، گم): ئەبرۆی. سەیفی (حا، غ): صەیفی. هەڵەیە. (ق): یووسف. بۆ (کم): بە.

(١٣) واتە: نە پێی ڕۆیینم هەیە، نە ماوەی دەستی کۆششم هەیە، خودایا! کەس وەك من گیرۆدە و دەستوپێبەستراو نەبێ.

دەستی کۆشش (ق): دەست و کۆشش.

(١٤) مەنصوور: مەنصووری حەلاجی شەهید.

واتە: ئەگەر سالم وەك مەنصووری حەلاج ببرێتە بەر دار و بکوژرێ، خوێنەکەی ناوی تۆ دەنووسێ، وەك چۆن خوێنی حەلاج ((أنا الحق))ەکەی ئەوی نووسی.

حەرفی ئیسمت (عا، ف، ج، غ، کم، گم): صوورەتی تۆ، چونکە کێشان بۆ صوورەت لەبارترە، بەڵام لە لایەنی شوبهاندنەکەوە، هیی (مان) بەهێزترە، لەبەرئەوەی خوێنی حەلاج ناوی ئەوی نووسیوە، وێنەی نەکێشاوە.

-٢- (*)

دڵ لە میحنەت کەیلە، ڕێم کەن، با بە غەم دەرچم لە شار
ئەمڕۆ ڕۆژێکە لە جەمعی مەردومان بگرم کەنار
دەستەوئەژنۆ دانیشم، بۆ حاڵی خۆم بگریم بە زار
«موسم عیداست و ما نومید از دیدار یار
عالمی در عیش و نوش و ما دو چشم اشکبار» (١)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، ف، غ، ج، کم، نم، گم)دا هەیە. لە (مان، ن)دا یەکێکە لە سێ پارچەی پێنجخشتەکی و لە سەرەتاوە نووسراوە: مخمسات، واتە: پێنجخشتەکییەکان. هەروەها لە سەرووی ئەم پارچەیانەوە نووسراوە: «من کلام مولانا خالد»، دیارە مەبەستی ئەوەیە کە تەخمیس‌کراوە فارسییەکە هیی مەولانایە. (کم) هەر بەم مەعنایە لە پەراوێزدا ئاماژەی بۆ کردووە. (گم)یش لە سەرووی پارچەکەوە نووسیویە: «پێنجخشتەکی لەسەر هەڵبەستی مەولانا خالیدی شارەزووری»، لە پەراوێزیشدا نووسیویە: «بوێژی نەمر "پیرەمێرد" هەڵبەستەکەی مەولانای لە فارسییەوە کردووەتە کوردی- ژین، ژمارە ٢٩، ١/٧/١٩٧١».

شایانی باسە، (گم) لەباتیی ئەسڵە فارسییەکەی مەولانا خالید، تەرجەمە کوردییەکەی "پیرەمێرد"یشی نووسیوە. ئەسڵە فارسییەکە نووسرا، چونکە "سالم" ئەوی تەخمیس کردووە، ئەمەی پیرەمێرد، واتە دوابەیتەکان، نە هیی سالمە و نە هیی مەولانا، بەڵکوو پێنجخشتەکییەکی کوردییە، سێ نیوی هیی سالمە و دوو نیوی هیی پیرەمێرد؛ هەر لەبەرئەمە، هەر لە سێ نیوە کوردییەکانی "سالم"دا، لەگەڵ چاپەکەی (گم) بەراورد کراون. بەڵام ئەم پێنجخشتەکییە، لە (عا)دا ئاڵۆزە و لە سەرەتاوە نووسیویە: «از گفتهٔ مولانا خالد. بسم الله الرحمن الرحیم». بۆیە ناچار لە کۆتاییی لێکدانەوەی ئەم پارچەیەدا دەقەکەی ئەویێ هەمووی بە چەند وردەسەرنجێکەوە نووسرایەوە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەقسوور.

(١) کەیل: لێوان، پڕ. مەوسیم: وەرز. ما: ئێمە. نومید: نائومێد، هیوابڕاو. اشکبار: فرمێسکڕێژ.

واتە: دڵ لە خەم لێوانە، یاران! لێم گەڕێن با بە خەمەکانمەوە لە شار دەرچم. ڕۆژی ئەوەیە کەنارگر بم و دەستەوئەژنۆ بە گەرمی بۆ حاڵی خۆم بگریم، چونکە جەژنە و من لە دیداری یار بێبەشم، هەرچی خەڵکە لە ڕابواردندایە و چاوی من بە خوڕ فرمێسک دەبارێنێ.

**ئەی ڕەفیقان! بێن بە مەردی، چاری ئەم بێچارە کەن**
**غەرقی لوججەی ژەرفی دەردم لەم دەمە، سەر تا بەدەن**
**نەونیهالی شادمانیم، بۆ نەبێ سا ڕیشەکەن؟!**
**«هرکسی با یار در گشت گلستان است و من**
**زاشك سرخم شد کنار از داغ هجران لالەزار» (٢)**

**ئەم جیهانە خولدە بۆ مەردوم، وەلێ بۆ من سەقەر!**
**عومری شیرینم بە تەڵخی چوو، لەبەر طوولی سەفەر**
**قەد لە موددەی عومری خۆمدا، هەفتەیێ نەمدی حەضەر**
**«سینە سوزان، دل فروزان، کوچە کوچە، دربدر**
**کس مبادا همچو من آوارە از یار و دیار» (٣)**

با بە غەم (کم):خەڵکەبا.(پ،گم): بەڵکو زوو. کەنار (ج): قەرار. دەستەونەژنۆ (ف): دەستونەژنۆ. (غ): دەستەئەژنۆ. بۆ حاڵی خۆم بگریم بە زار (کم، نم، گم): بێچارەوو زار و نەزار. ما دو (عا): ماە.

ئەم بەندانە لە (عا)دا چوارخشتەکین و پێنجەمیان لەگەڵ نیوەی فارسیی پێنجخشتەکییەکی پاش خۆیدا یەکخراوە. (عا) ئەم پارچەشیعرەی -بە گشتی- نارێکوپێك ڕوونووس کردووەتەوە.

(٢) ئەم بەندە لە (عا)دا سێیەمە.

لوججە: نێرینەی ئاو، قووڵاییەکەی. ژەرف: قووڵ. نەونیهاڵ: نەونەمام. ڕیشەکەن: لەبنهەڵکەنراو. با یار: لەگەڵ دۆست. اشك: فرمێسك. سرخ: سوور. کنار: کۆش، بەردەم.

واتە: هاوڕێیان! وەرن چارێکی منی بێچارە بکەن، سەر تا خوار نوقمی قووڵاییی دەریای دەردی دووریم. دە سا نەونەمامی خۆشی و شادیم چۆن لە بن نەبێ کە دەبینم هەر کەس لەگەڵ دۆستی خۆی خەریکی گەشتوگوزارە و منیش داوێن و کۆشم بە هۆی فرمێسکی سووری زۆرمەوە، وەك لالەزار سوور و ڕەنگینە!

بێن بە مەردی (گم): بێنە فریام. لەم دەمە (کم): ئەو دەمە. غەرقی لوججەی ژەرفی دەردم لەو دەمە (گم): غەرقی لیتەی دەردی مەحروومی بووە. بۆ نەبێ سا (گم): با نەکا با. «ز اشك» لەبەر کێش بە «زەشکی» دەخوێنرێتەوە. هجران (ج): هجرم.

(٣) ئەم بەندە لە (کم، گم)دا چوارەم بەندە.

خولد: بەهەشت. سەقەر: دۆزەخ. حەضەر: نیشتەجێیی، دژی سەفەر. سینەسوزان: بە سنگسووتاوی.

**لەو دەمە تا حاڵ لە داوی دوورییا کەوتوومە بەند**

**نەبوە فاریغ بم بە ئانێ قەت لە ئافات و گەزەند**

**ڕۆژ و شەو مەشغووڵی ئەم ذیکرەم بە فەریادی بوڵەند**

**«بی نوا و دل پر از خار و غریب و دردمند،**

**دست بر دل، سر بزانو، چشم در ره، دل فگار» (٤)**

دڵفروزان: بە دڵداگیرساوی. مبادا: نەوەکا، نەبێ.

واتە: ئەم جیهانە بۆ خەڵك بەهەشتە و بۆ من دۆزەخە. تەمەنی شیرینم، لەبەر سەفەری دووروودرێژ و نابەدڵ، هەمووی بە تاڵی ڕۆیی. هەرگیز لە عومری خۆمدا یەك هەفتە دانەسەکنام و هەر لە سەفەردا بووم، سنگسووتاو، دڵداگیرساو، کۆڵان بە کۆڵان، دەربەدەر و ماڵوێران. خودایە کەس وەك من لە وڵات و کەس‌وکار دوور نەکەوێتەوە.

خولدە بۆ مەردوم وەلێ (گم): جەننەتە بۆ هەر کەسێ و. وەلێ (ج): ئەمما. تەڵخی (کم، پ، گم): تاڵی. طوولی سەفەر (ن): طویلی سەفەر. هەڵەی نووسینە. (گم): ئەرکی حەذەر! قەد (حا، ن، کم، نم، گم): قەت. خۆمدا.. تاد (غ): خۆما، هەفتەیێ نەمدی حەضەر. (ن): خۆمدا هەفتەیێ نەمدی حەذەر. (کم): خۆما نەمدیوە یەك لەحظە حەضەر.

ئەم بەندە لە (عا)دا شەش‌خشتەکییە، بەیت و نیوێکی مەولانا تێکەڵ کراوە.

(٤) ئەم بەندە لە (کم، گم)دا سێیەم بەندە.

تا حاڵ: تا ئێستا. گەزەند: زیان و ئازار. فەریاد: هاوار. بی‌نوا: بێ‌کەس. پر از خار: پڕ لە دڕك. دردمند: دەردەدار. دست بر دل: دەست لەسەر دڵ، نیگەران. سر بە زانو: سەر لەسەر ئەژنۆ، خەمبار. چشم در ره: چاو لەڕێ، چاوەڕێ. دل فگار: دڵ ناخۆش.

واتە: لەو کاتەوەی کەوتوومەتە بەندی داوی دووری، ئانێك بێ بەڵا و ئازار نەبووم. شەو و ڕۆژ خەریکی ئەم هاوارەم و بە دەنگی بەرز دەڵێم: بێ‌کەسم، دڵ پڕ لە دڕکم، نامۆم، دەردەدارم، دەست لەسەر دڵم، نەبادا خەبەرێکی ناخۆش بیەم، سەر لەسەر ئەژنۆ و چاوەڕێ و دڵخەمینم.

لەو دەمەی تا حاڵ (گم): لەو دەمەی دەوران. کەوتوومە (ج): کەوتمە. لەنگە. (گم) خستوومیە. ئافات (ف): ئافاتی. مەشغووڵی ئەم ذیکرەم (ج): مەشغووڵی گریانم. (حا، کم): مەشغووڵی ناڵینم. (پ، گم): کەوتوومە واوەیلا. نوختەی سەر (ذ) لە (ذیکرەم)ی نوسخەی (ن)دا کەوتووە.

ئەم بەندە لە (عا)دا شەش‌خشتەکییە، بەیت و نیوێکی مەولانا تێکەڵ کراوە.

**دێتە گوێم دایم بە زاری، ناڵەیی مەحزوونی دڵ**
**بێقەراری و ئیضطیرابە، ساڵ و مەه، قانوونی دڵ**
**وا تەپی کاخی موراد و تێکشکا ئەستوونی دڵ**
**«بکرەجویی شد ز هر چشمم روان از خون دل**
**عاقبت کردم دوا داغ فراق سرچنار» (٥)**

**کەس نەبێ "سالم!" لە دونیادا وەکوو من تووشی دەرد**
**بێنەوا کەوتوومە غوربەت، ناتەوان و ڕەنگزەرد**
**شیعری "مەولانا" دەڵێم و هەڵدەکێشم ئاهی سەرد:**
**«"خالدا" گر نیستی دیوانە و صحرانورد**
**تو کجا و کابل و غزنین و خاك قندهار» (٦)**

(٥) کاخی موراد: کۆشکی ئاوات و هیوا. ئەستوون: هەسوون، کۆڵەکە. بەکرەجۆ و سەرچنار: دوو شوێنی ئاودار و لالەزاری خۆشن کەوتوونەتە ڕۆژاوای شاری سلێمانی و ئێستا بەشێکن لە شار.

واتە: هەمیشە ناڵەی خەمباری دڵم دێتە گوێم، چونکە بە درێژایی ساڵ و مانگ حەسانەوەی نییە. وا کۆشکی هیوا و ئاواتم ڕووخا و کۆڵەکەی دڵم شکا و خوێنی دڵم لە چاوانمەوە دەڕژێتە خوار و (بەکرەجۆ)یەکی پێکهێناوە. جا بە هۆی ئەم بەکرەجۆیەوە چاری داخی دووریی (سەرچنار)م کرد، چونکە تامی یەك دەدەن و لە یەکەوە نزیکن.

دایم (کم): هەردەم. بێقەراری (کم، گم): بێ قەرار و. وا تەپی (ف): داتەپی. تێکشکا (عا): نیك‌شکا. هەڵەیە.

(٦) ئەم بەندە لە (عا)دا نییە.

صحرانورد: دەشتپێو، دەشتبڕ، ئەوی دەشت و بیابان بگرێتە بەر و گوێ بە هیچ نەدا. کابول، غەزنەین، قەندەهار: سێ شارن لە ئەفغانستان، کە مەولانا خالید لە سەفەرەکەی (هیندستان)یدا ڕێی تێیان کەوتووە.

واتە: خودایە لە دنیادا کەس وەك "سالم" تووشی دەرد نەبێ، بێکەس و نامۆ و بێهێز و ڕەنگزەرد. ئاهی سارد هەڵدەکێشم و شیعری مەولانا دەخوێنمەوە، کە ئەویش هەر لە غەریبیدا وتوویەتی: خالید! ئەگەر شێت نیت و دەر و دەشتت نەداوەتە بەر، تۆی شارەزووری لە کوێ و کابول و غەزنەین و قەندەهار لە کوێ؟ دیارە سالمیش هەر لە غەریبیدا ئەم پێنجخشتەکییەی داناوە، سالم و مەولانا هەردووکیان

غەریبییان هەستاوە، بەڵام مەولانا بەدوای صۆفیـیدا گەڕاوە و سالم لـەدەست جەوری تورکانی عوسمانی هەڵاتووە.

من (کم): تۆ. ڕەنگ‌زەرد (نم): ڕەنگی زەرد. هەڵەیە. دەڵێم (کم): دەخوێنم. (گم): ئەخوێنم. هەڵدەکێشم (نم، گم): هەڵئەکێشم. بێنەوا .. تاد (گم): دوو ڕەفیقی غوربەتن ڕۆژی سیاهی ڕەنگ‌زەرد. دەڵێم و هەڵدەکێشم (گم): ئەخوێنم، هەڵئەکێشم. دیوانە و (ف): دیوانە[٤].

***

شایانی ئاماژەبۆکردنە، ئەم دوو بەندەی لای خوارەوەیش، یەکەمیان هەر لـە (گم)دا هەیە و هەردوو بەندەکەیش لـە ((ژ ٨١١، ١٩٤٥/١١/٢٩، ل٣-٤))ی ڕۆژنامەی "ژین"دا هەن و "پیرەمێرد" خستوونیە پاش بەندەکانی‌تر.

((شیوەسوور))ە ئەشکی دیدەم، پەیڕەوی لافاو ئەکەم
شەو بڵێـەم بەرزە، وێنەی ((باوەگوڕگوڕ)) ناو ئەکەم
دەست‌شکستەم، بۆیە مەیلی مۆمیای بێخاو ئەکەم
باوەمردەی ((باوەمردە))م، ((ئاڵبولاخ))ە چاوەکەم
خوزگە ئەمبیست پێم بڵێن: وا ((باوەگێڵدی)) گەیە شار

چەند بەسۆزە، ئەی دڵەی سووتاو، کزە و هاواری تۆ
دیدە، ئەی تۆ ئەم هەموو ئاوە کە کردووتە بە جۆ
ئاوی ظەڵم و تانجەرۆ وشکن لـە چاوتا بێ درۆ
خوێنی دڵ وا هات بە چاوما، بوو بە جۆگەی ((بەکرەجۆ))
هەردوو سەرچاوەی چەمێکن، کردمە تاسەی ((سەرچنار))

یەکەم بەندیان کە لـە (گم)دا هەیە، لـەو ژمارەیەی ڕۆژنامەی "ژین"ی وەرگرتووە و لـە پەراوێزدا نووسیویە: ((ئەم پارچە پێنج‌خشتەکییەی کە بە ((شیوەسوور)) دەست پێ دەکات و پیرەمێرد بە هی "سالم"ی لـەقەڵەم داوە، هیچ سەرچاوەیەك قۆڵی بۆ ناکێشێ. کەچی هەر لـەو شوێنەی ناو سەرچاوەکانی لای ئێمەدا، ئەمەی خوارەوە لـەجیاتیی پارچە ناوبراوەکە هەیە و پیرەمێرد ئاوڕی لێ نەداتەوە: دێتە گوێم هەردەم .. تاد.)). بەندی ((دێتە گوێم .. تاد))یش لـە (کم، گم) نییە، لـە (مان، عا)دا هەیە.

ئێمە پاش هەڵسەنگاندن و بەراوردکردن، بە دڵنیاییەوە بۆمان دەرکەوت بەندی یەکەمیان هەمووی هەر هی "پیرەمێرد"ی شاعیر خۆیەتی و هیچ پێوەندییەکی بە شیعرەکەی "مەولانا"وە نییە. هەرچی دووەم بەندیشە، سێ نیوەدێڕی یەکەمی هی "پیرەمێرد" و دوو نیوەکەیتریش هی "مەولانا خالید"ە و "پیرەمێرد" کردوویە بە کوردی، دەقە فارسییەکەی ئەمەیە:

(بکرەجو)یی شد ز هر چشمم روان از خون دل
عاقبت کردم دوا داغ فراق (سرچنار)

جگە لەوە، تەنها بەیتێ لە پارچەشیعرە فارسییەکەی "مەولانا"دا ماوە، نە تەخمیس کراوە و نە بەر تەرجەمە کەوتووە، ئەویش ئەم بەیتەیە:

((جان نثار مقدم جانان نکرده دم به دم
چیست بهره از تفرّجهای تخت جان نثار))

(بۆ پارچەشیعرەکەی "مەولانا" بڕوانە: مەلا عبدالکریمی مدرس، یادی مەردان، بەرگی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٩، ل٥١٥).

-٣- (*)

**جیلوەیی عیشقت دەکا هەردەم لە دڵ نوور، ئاشْکار**
**پێشی دیدەی دڵ لە ڕووتا ئاگری طوور ئاشْکار(١)**
**وام دەوێ سیڕڕی نیهانم قەت لە پەردە دەرنەچێ**
**جەذبەیی عیشقت دەکا پێم ڕازی مەستوور، ئاشْکار (٢)**
**کردوویە لێم ضەعفی خۆم و شۆخیی و جەور و جەفات**
**چەنگڵی بازی شکار و حاڵی عوصفوور ئاشْکار (٣)**
**گەر بزانی نووکی پەیکانی موژەت چۆن دێتە دڵ**
**بۆت دەبێ صەعبییەتی سووراخی زەنبوور، ئاشْکار (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەقسوور.

(١) جیلوە: ڕووناکی و درەوشانەوە. هەردەم: هەموو کات. ئاشکار: ئاشکرا. پێش: بەردەم، بەرچاو.

واتە: ڕووناکیی عیشقت هەمیشە نوور پیشانی دڵ دەدا. لە بەرچاوی دڵدا، ئاگری کێوی (طوور) لە ڕوخساری تۆدا ئاشکرا دەبێ.

(٢) جەذبە: ڕاچڵەکان و هاوار و حاڵەتێکی نائاسایییە کە هەندێ کات لە سۆفییان ڕوو دەدا. ڕاز: نهێنی. مەستوور: داپۆشراو.

واتە: من ئەوەم دەوێ کە پەنهانی دەروونم لە پەردە دەرنەچێ و کەس پێی نەزانێ، بەڵام جەزبەی ئەڤینی تۆ ڕازی نیهانم ئاشکرا دەکا و ناوم دەزڕێنێ!

(٣) ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی هەر لە (پ)دا هەن.

ضەعف: بێهێزی، لاوازی. شۆخی: گاڵتەجاڕی.

واتە: بێهێزیی خۆم و گاڵتەجاڕی و ستەم و ئازاری تۆ، کارێکیان کردووە چنگی زۆرداریی بازی ڕاو و حاڵوباری بێدەسەڵاتیی چۆلەکەم تێدا دەربکەوێ.

(٤) صەعبییەتی: قورسی و ئەستەمی. سووراخ: کون. زەنبوور: زەردەواڵە.

واتە: ئەگەر بزانی چۆن نووکی تیری برژانگت لە دڵ گیر دەبێ و دێتە ناو دڵ، ئەوسا بۆت ڕوون دەبێتەوە چوونە ناو کونی زەردەواڵە چەند زەحمەتە.

**سەبکی شیعرم شاهیدە بۆ دڵڕوباییی دڵبەرم**
**صوورەتی چینی دەکا تەزیینی فەغفوور، ئاشکار (٥)**
**موددەعیی خاطر ئیشارەی ڕووت دەکا، حاشا مەکە**
**مەبنییە بۆ بادەنۆشیت، چاوی مەخموور ئاشکار (٦)**
**ڕۆژ کە ظاهیر بوو، نیشانەی دەفعی نوسخەی ظوڵمەتە**
**زوڵفی تۆ، بێ شەو، لە ڕووی ڕۆژ کردی دەیجوور، ئاشکار (٧)**
**مەنعی زاریی دڵ کە "سالم" با نەدا عیشقت بیرووز**
**بەزمی پەنهانی دەکا ئاوازی سەمتوور، ئاشکار (٨)**

(٥) سەبك: شێواز. دڵڕوبایی: دڵکێشی. فەغفوور: ناوی پادشایانی وڵاتی چین.

واتە: شێوازی شیعری من بەڵگەی دڵکێشیی دڵبەرەکەمە، وەك چۆن وێنە و نیگاری چینی ڕازاندنەوەی پادشاهانی چین ئاشکرا دەکا.

(٦) موددەعی: دوور نییە مەبەست دڵی عاشقی خاوەندەعوا بێ. مەبنییە: دامەزراوە. بادەنۆشی: خواردنەوە. مەخموور: مەست.

واتە: دڵی عاشقی کە خاوەندەعوایە، ئیشارەتی کرد بۆ لای ڕوخسارت، وتی: ئەوە کوشتوومی، دە تۆ نکوولی لەم ڕاستییە مەکە. چاوی مەستت بە ئاشکرا بۆ بادەنۆشی دانراوە.

دوور نییە (مەبنییە) ((مەی نییە)) بووبێ، واتە: مەی لە مەیداندا نییە، چاوی مەستت شتەکە ئاشکرا دەکا. تێکڕا واتای بەیتەکە پەسەند نییە.

دەکا (کم): نەکا. مەبنییە (کم): مەبنی بە بۆ. هەڵەیە.

(٧) ڕووی ڕۆژ: ڕوومەتی وەك خۆر، ڕوخساری یار. دەیجوور: شەوی زۆر تاریك.

واتە: خۆر کە دەرکەوت، نیشانەی لاچوونی تاریکییە، کەچی ئەگریجەی تۆ، بێئەوەی شەو دابێ، لەسەر ڕوخساری وەك خۆرت شەوی تاریك پێكدێنێ و ئاشکرای دەکا، واتە (جمع النقیضین)ە، هەم شەوە و هەم ڕۆژ. (دەفعی نوسخەی) دوور نییە (دەفع و نەسخی) بێ، نەسخ: هەڵوەشاندنەوە و لابردن.

(٨) زاری: گریان. برووز: دەرکەوتن. کە: بکە. سەمتوور: ئامێرێکی مۆسیقایە، سالم مەبەستی دڵەتی کە ناڵە و هاواری لێ بەرز دەبێتەوە و نهێنیی عیشق دەردەخا.

واتە: ئەی سالم! ڕێ لە دڵ بگرە مەهێڵە بگری، تا عیشقت هەر شارراوە بێ. بەڵام ئاواز و ناڵەی سەمتووری دڵت بەزمی پەنهان ئاشکرا دەکا.

نەدا، دەبوو (نەکا) بووایە! دەکا (کم): نەکا.

-٤- (*)

**ئەییامی عید و عەهدی گوڵە و مەوسیمی بەهار**
**«ساقی به روی یار ببین ماه و می بیان» (١)**
**جانە لە ماڵ و دەوڵەت و موڵکم عەزیزتر**
**«آن نیز به گرشمهٔ ساقی کنم نثار» (٢)**
**بێت و لەبم بگاتە لەبت، دڵ بەڵەد دەبێ**
**«از فیض جام و قصّهٔ جمشید کامگار» (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، عا، ف، غ، ر، کم، گم)دا هەیە. لە (مان، ن)دا، یەکێکە لە شیعرە مولەممەعەکان و ئەو بەیتانەیش کە تەلمیعی کردوون، لەناو پارچەشیعرێکی "حافظ شیرازی"دان. جێی باسە، سالم هەندێ لە نیوەبەیتە فارسییەکانیتری نیوچە تەرجەمەیەك کردووە، هەم تەرجەمە و هەم تەلمیع!

کێشی عەرووز: موزاریعی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور.

(١) واتە: ڕۆژی جەژنە و سەردەمی گوڵە و وەرزی بەهار، ئەی مەیگێڕ -ئەگەر باوەڕ ناکەی- بڕۆ مانگ لە ڕوومەتی یاردا ببینە و مەی بگێڕە و ڕۆژوو بشکێنە و جەژن بەرپا بکە! بەڵام لای "حافظ" «به روی شاه ببین»ە.

گوڵە و (ج، ر، کم، گم): گوڵ و. یار (ف، ج): شاه. (کم، گم): شه. وەك حافظ وتوویە. ماه و می (ف): جام می.

(٢) گریشمە: ئیشارە بە چاو، غەمزە.

واتە: هەر گیانمە لە گەورەیی و سامان لام بەنرخترە، ئەویش دەکەمە پایەندازی غەمزەیەکی مەیگێڕ. دیارە مەیگێڕەکەیش یارە و پیاڵەی مەیەکەیشی چاوەکانیەتی.

جانە (ج، ر، کم، گم): جانا! دەوڵەت و موڵکم (ف، کم، گم): دەوڵەتی دونیا. بە گرشمە (ج، غ): بر گرشمه. ساقی کنم (ر): کیم. هەڵەیە. (آن) لای "حافظ" (کان)ە.

(٣) فەیض: بەرەکەت. جام: جامی شەراب. کامگار: بەختیار.

واتە: ئەگەر بێت و لێوم بگاتە لێوت و بە ماچی لێوت مەست و سەرشار بم، دڵم لە بەرەکەتی جامی شەراب و لە داستانی جەمشیدی بەختیار شارەزا دەبێ.

دەبێ (کم): ئەبێ.

**چیهرەت بە ئاب و ڕەنگ و لەطافەت دەڵێی گوڵە**
**«یا رب ز چشم و زخم زمانش نگاەدار» (٤)**
**ڕەنگین دەبێ، لە حاڵەتی بەزما، بە شیعری من**
**«جام مرصّع تو ازین دُرّ شاهوار» (٥)**
**ڕێگا دەبا بە سیڕڕی دەهانت خەیاڵی من**
**«موسوم نقطەاست نە پنهان نە آشکار» (٦)**

(٤) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا دوابەیتە.

چیهرە: ڕوخسار. ئاب و ڕەنگ: جوانی. نگاه دار: بپارێزە.

واتە: ڕوخسارت لە جوانی و ناسکیدا دەڵێی گوڵە. خودایە لە چاوی پیس و زیانی ڕۆژگار بیپارێزی.

ڕەنگ و (کم، گم) ڕەنگی. دەڵێی (کم): ئەڵێی. زمانش (ن): زمانەاش. هەڵەیە. «چشم و زخم» لای "حافظ" «چشم زخم»ە.

(٥) مورەصصەع: ڕازاوە بە جەواهیر. دوڕ: مرواری. شاهوار: شایانی شا، بەنرخ.

واتە: جامی شەرابی ڕازاوە و بە شیعری من نەخشێنراوی تۆ لە حاڵەتی بەزمدا، کە وەك مرواریی شاهانەیە، جوانتر و ڕازاوەتر دەبێ.

دەبێ (کم): ئەبێ. ازین (کم، گم): بەدین. لای " حافظ" «بدین»ە.

(٦) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا پێنجەم بەیتە، لە «مان، ن، ف، غ، ج، ڕ»دا نییە. لە «مان»دا یەکێکە لە بەیتەکانی پارچەشیعری شەشەمی ئەم پێتە، لەوێدا لەباتی مەوسووم «مەوهووم»ە و واتاکەی تەواوە، بۆ واتاکەی تەماشای ئەوێ بکەن. جێی وتنە، نیوە فارسییەکە لە دیوانەکەی "حافظ"دا نییە. هەروەها ناسناوی سالم لەم پارچەشیعرەدا نییە.

ڕێگا دەبا: پەی پێدەبا. دەهان: دەم. موسوم: ناونراو. پنهان: شاراوە. آشکار: ئاشکرا.

واتە: خەیاڵم هێندە ورد و فراوانە، ڕێ دەباتە سەر نهێنی و ڕازی دەمت و پەیی پێدەبا. ئەو خاڵە ناونراوە، نە شاراوەیە و نە ئاشکرایشە.

**-٥- (*)**

**ڕووت نازك و لەطیفە وەکوو نەوگوڵی بەهار**

**«قدّت بە راستی چو سهی سرو جویْبار» (١)**

**ڕێ کەی دەبا بە سیڕڕی دەهانت خەیاڵی من**

**«موهومنقطەایست، نە پنهان نە آشکار» (٢)**

**زۆرئاوەرن فیراق و غەریبیی و بێکەسی**

**«از دست هر سە تا چە کَشَدْ این دل فگار؟» (٣)**

**بۆ من غەزایە قەتلی ڕەقیبم بە ئەمری تۆ**

**«دارم مصافِ راە و نترسم ز کارزار» (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، ه، ڕ، کم، نم، گم)دا هەیە. لە (مان، ن)دا، یەکێکە لە شیعرە مولەممەعەکان و فارسییەکەی هی "حافظ شیرازی"یە.

کێشی عەرووز: موزاریعی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور.

(١) سەهی سەرو: سەروی ڕاست و تازە. جویبار: جۆگە و سەوزی.

واتە: ڕوخسارت ناسکە وەك تازەگوڵی بەهار، باڵات ڕاستە وەك سەروی چەمەنزار.

(٢) سیڕڕ: نهێنی. دەهان: دەم. موهومنقطە: خاڵێکی خەیاڵی.

واتە: خەیاڵی کۆڵی من کەی پەی بە نهێنیی دەمی بچووکی نادیاری تۆ دەبا؟ دەمی تۆ خاڵێکی خەیاڵییە، نە ئاشکرایە و نە پەنهان، کەس سەری لێ دەرناکا!

ڕێ کەی (غ، نم): ڕێگەی.

وەك پێشتر باس کرا، ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا یەکێکە لە بەیتەکانی پارچەشیعری پێنجەم. لەوێ لەباتیی مەوهووم (مەوسووم) بوو، بە واتای تەواو نەبوو.

(٣) چە کشد: چەندێ دەکێشێ؟ چەندێ هەڵدەگرێ؟ فگار: نەخۆش، بیمار.

واتە: جیایی لە یار و نامۆیی و بێکەسی، سێ دەردی گرانن، زۆریان بۆ هێناوم و تەنگیان پێ هەڵچنیوم! ئاخۆ دڵی بیمار چەند لە دەست ئەم سێ دەردە دەچێژێ و چەند هەڵدەگرێ؟

(زۆرئاوەرن) لەبەر کێش بە (زۆراوەرن) دەخوێنرێتەوە.

چە کشد (کم، گم): چە کند، واتە: چی بکا؟

(٤) مەصاف (مصافّ): شوێن و مەیدانی جەنگ، کە جەنگاوەران لەوێ ڕیز دەبن بۆ بەرامبەریی دوژمن. کارزار: جەنگ.

**وێران بکەی بە طەرزی جەفا، گەر بینایی دڵ**
**((از وی بە در شَوَم اگر آیم باضطراب)) (٥)**
***مەشغووڵی مەشقە وا شەوی ئابان لە زوڵفی تۆ***
**((عقلِ طویل را نبود هیچ اعتبار)) (٦)**
**"سالم" نییە نەجاتی لە داوت بە نەقدی جان**
**((در ششدر غمت دلش افتاد مُهرەوار)) (٧)**

واتە: ئەگەر فەرمانم پێ بکەی ڕەقیب بکوژم، بۆ من غەزایە و خێرم دەگا. منیش شوێنی جەنگم هەیە و پشتئەستوورم و لە جەنگ ناترسم.

تۆ (ھ): یار. دارم مصاف راه و (کم): دانم منافری او و. (ج، ر، نم): دانم مصافرا. (گم): دارم منافری و. منافر: هێزی جووڵان و بزواندنی ئەسپ کە بە ئارەزووی سوارەکە بجووڵێتەوە و تینوتوانی لە دوژمن ڕزگاربوونی هەبێ. (غ): دانم مصاف را و. لای "حافظ"یش ((دانم مصاف را))یە. ئەوسا مەبەست ئەوەیە کە من مەیدانی جەنگ و ڕیزبەستن پێدەزانم.

(٥) واتە: ئەگەر بە شێوەئازارێك بینای دڵ وێران بکەی، من ناچارم لێی بێمە دەرێ و بەجێی بهێڵم.

بینایی (ر): بە ناری. باضطرار (غ): باحترار. ((از وی)) لای "حافظ" ((زین در اگر))ە.

(٦) ئابان: مانگی هەشتەمە بە حیسابی هەتاوی کە خۆر لە بورجی دووپشك ((عقرب))دایە، شەوی درێژە و ڕۆژی کورت.

واتە: شەوی ئابان دەیەوێ لە درێژیی زوڵفی تۆوە فێری درێژی بێ و مەشقی لەسەر بکا! نەفامە کە بیری وا دەکاتەوە. چۆن درێژیی ئەو دەگاتە درێژیی زوڵفی تۆ! قسەی پێشینان ڕاستە کە دەڵێ: مرۆی درێژ عەقڵی لە ئەژنۆیدایە و جێی بڕوا نییە.

مەشقە وا شەوی ئابان لە زوڵفی تۆ (ھ): مەشقی وا شێویانە لە زوڵفی یار. (کم، گم): مەشقە وا شەوی ئایان لە زوڵفی تۆ! هەڵەیە. (نم): مەشقە وا شەوی ئایایان بە زوڵفی تۆ.

(٧) موهرە: پوولی تاوڵە و شەترەنج. موهرەوار: وەك موهرە.

واتە: سالم گیانیش پێشکەش بکا، لە داوت ڕزگار نابێ؛ دڵی، وەك پوولی تاوڵە، لە شەشدەری خەمتدا گیری خواردووە.

بورهانی قاطع دەڵێ: ((مهره در ششدر بودن کنایه از محبوسی است))، یانێ تەعبیری نیوەبەیتە فارسییەکە دیلی و بەندی دەگەیێنێ. لە یاریی ((مەحبووس))دا، کە جۆرە یارییەکی تاوڵەیە، ئەگەر زاری یەکێ لە یاریکەران لە خانەی یەکەمی لای خۆی حەپس بێ، تا ئەوی بەرامبەر پوولەکانی خۆی

یەکە یەکە نەخوا، ئەم ڕزگاری نابێ و خاوەنەکەی دۆڕاوە، دیارە شەش‌خانەی لێ گیراوە و ڕزگاری نابێ. لەوانەیە ئەمە بناغەی شتەکە بێ.

دلـش (کم): دل.

## -٦- (*)

**وەکوو نەی تا لەبم نەگرێ لەبی یار**
**نەی‌ئاسا دێتە گوێم نالەی دڵی زار (١)**
**دڵی بیماری بێدارم لە زوڵفا**
**دەناڵێنێ لەبەر طوولی شەوی تار! (٢)**
**سەری زوڵفت لە خەودا دێتە سەر ڕوو**
**دەکا خەو خۆش لە بەرچاوم، سییەهمار! (٣)**
**وەها پایەی بینای هەستیم لەبن هات**
**قوبووڵ ناکا ئەبەد تەعمیری میعمار (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، هـ، ف، غ، ج، ق، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەقسوور.

(١) نەی: نەیچە. نەی‌ئاسا: وەك نەی (شمشاڵ).

واتە: تا لێوم لێوی یار نەگرێ و ماچی نەکا، وەك ناڵەی نەی دەنگی ناڵەی دڵم دەبیستم. لە لایەکی‌ترەوە، "سالم" دەیەوێ بڵێ: لێوی یار شەکرە و لێوی خۆی نەیە (نەی‌شەکەر)، تا قامیشی لێوی بەری شەکر نەگرێ و پڕ نەبێتەوە، دڵی هەر ناڵەی لێ دێ. دیارە شەکرگرتن بە ماچی لێوی یار دەبێ.

دڵی زار (ق): دڵ‌ئازار.

(٢) تار: تاریك.

واتە: دڵی نەخۆشی هەمیشە بێدارم لە بەندی ئەگریجەتدا دەناڵێنێ، لەدەست درێژیی ئەم شەوە تاریکە کە ئەگریجەی یارە!

بیماری بێدارم (ج): بیمارم بێدارە. طوولی (کم): طووطی. لەبەر (هـ): بەسەر. شەوی (ف): شەبی.

(٣) سیەهمار: ڕەشمار، مەبەست لە ئەگریجەی یارە.

واتە: لە خەودا، نەك لە بێداریدا، زوڵفت دێتە سەر ڕوومەتم. سەیرە، ئەم ڕەشمارە خەوەکەم خۆش و قووڵ دەکا و چاوم هەڵنایێ و خەبەرم نابێتەوە! مرۆڤ کە لە خەودا مار ببینێ، لەوانەیە لە ترساندا ڕاچڵەکێ، ئەم خەوی خۆش دەبێ.

لە خەودا (ف، غ، ڕ): لە خوابا. خۆش (کم): خۆ. دێتە (عا): دیدتە.

(٤) هەستی: بوون، کیان.

ئەگەر ئیفشا بێ، نەفحەی چینی زوڵفت
خەجاڵەت دەیگرێ ئاهوویی تاتار (٥)
وەکوو لەعلی لەبت دێ، ئەشکی ئاڵم
لە هیجرا، گەر ببینم ڕەنگی گوڵنار (٦)
لە گەردنمایە تا زەنجیری گێسوو
وەکوو من کەس نەبێ، "سالم"، گرفتار (٧)

واتە: بناغە و پایەی بوونم وەها لەبن هات و ڕووخا، هیچ تەلارسازێ قوبووڵ ناکا ئاوای بکاتەوە؛ یا بناغە و پایەکەی بە جۆرێك کاول بووە، هەرگیز ئاوەدانکردنەوە هەڵناگرێ.

وەها (کم): وەهای. دەبێ هەڵەی چاپ بێ. (پایەی) لە (ج)دا کەوتووە.

(٥) ئیفشا: بڵاوبوونەوە، مەبەست ئاشکرایی و بڵاوبوونەوەیە. تاتار: تاتارستان، کە هەرێمێکی خۆبەڕێوەبەری نێوان دەریاچەی بایکاڵ و چیای تائییە لە ڕووسیا، ناوەندەکەی (قازان)ە.

واتە: ئەگەر بۆنی خۆشی چینچینی ئەگریجەت بەهۆی باوە بڵاو ببێتەوە، ئاسکی تەتار شەرمەزار دەبێ کە بۆنی میسکی ئەو وەك بۆنی خۆشی ئەگریجەی یار خۆش نییە.

ئیفشا (ق، کم، گم): ئەفشان: بڵاوکردنەوە. (بێ)ی (ئەفشان بێ) لە (ق)دا کەوتووە. نەفحەی (مان، ه، ج، ق، ڕ): نەفخەی، هەڵەیە. چینی (ف، ج): بۆیی. خەجاڵەت (عا): عەجالەت.

(٦) واتە: کاتی دووری، ئەگەر ڕەنگی گوڵنارم بەرچاو بکەوێ کە لە ڕەنگی لێوت دەکا، وەك لەعلی لێوی سوورت فرمێسك لە چاوم دێ.

ئەشکی ئاڵم (ه): ئاڵە ئەشکم. (ق): ئەشکی زەردم. هیجرا (کم، گم): حیجزا. ڕەنگی (ق): ڕوویی.

(٧) واتە: تا من گەردنم لە داوی ئەگریجەت گیر و ئەمە حاڵم بێ، خودایە کەس حاڵی بە حاڵی من نەبێ.

(تا) لە (کم)دا پەڕیوە.

## -٧- (*)

یادی زوڵف و ئەبرۆوو موژگانی یار
زەخمی تیرە، ضەربی تیغە و زەهری مار (١)
((طرفة العین))یێ جودا نابم لە دۆست
گەر بە دەستم بێ زەمامی ئیختیار (٢)
وا لە قەیدی زوڵفتا ئاشوفتە بووم
شوبهەیە کارم بە وەضعی ڕۆزگار (٣)
ئیبتیدا دایەی ئەزەل تەنخواهی شیر
دای بە طیفلی طالیعی من کووکنار (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، ق، کم، گم)دا هەیە.
کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشیی مەقسوور.
(١) واتە: لە یادکردنەوەی زوڵفی وەك ڕەشمار و برۆی وەك شمشێر و موژگانی وەك تیری یاردا، ئەمانەم دەست دەکەوێ: لە برژانگەوە زامی تیر، لە برۆوە لێدانی شمشێر، لە زوڵفەوە ژەهری مار.
ئەبرۆوو (ق): ئەبرۆی. هەڵەیە. زەخمی (کم، گم): زەحمەتی. تیرە (کم): تیرە و. تیغە و (ق): شیرە.
(٢) طرفة العین: چاوبەیەکدادان. جودا: جیا. زەمام: جڵەو. ئیختیار: هەڵاوێردن.
واتە: ئەگەر جڵەوی هەڵاوێردن و کاری خۆم بە دەستی خۆم بێ، ئەوەندەی چاوبەیەکدادانێك لە یار جیا نابمەوە.
(٣) قەید: بەند، پێوەند. ئاشوفتە: ئاڵۆز. شوبهەیە: هاوشێوەیە.
واتە: لە داوی زوڵفتدا تێدا چووم و بارودۆخم بە خەمی زوڵفت ئاڵۆزا. کاروبارم هەمووی لە باری ئاڵۆزی ڕۆژگار دەچێ.
شوبهەیە (ق): شوبهەتەن.
(٤) ئیبتیدا: سەرەتا. دایە: دایك. تەنخوا: لەباتی. کووکنار: توێکڵ و گوڵی خەشخاش، کە تاڵە، یا کە ئینسان بێهۆش دەکا.
واتە: دایکی ئەزەل لە سەرەتای دروستبوونمەوە هەر زوو لەباتی شیر کووکناری دا بە کۆرپەی بەختم، بۆیە ئێستەیش بێهۆشی و بەدبەختی لە کۆڵم نابنەوە.
طالیعی (گم): طابعی. کووکنار (کم): کەوکەنار. (گم): کۆکەنار، هەردووکیان هەڵەن.

**دەست ئەدا بۆم ڕوو لە ڕوو ماڵینی دۆست**

**گەر موقارین بێ، خەزان و نەوبەهار (٥)**

**کەی بە سالم دەردەچێ "سالم" کە بوو**

**صەیدی سەحرایی شکاری شەهسەوار (٦)**

(٥) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (کم، گم)دا نین.

موقارین: شتێ لەگەڵ شتێکیتر بێ و پێکەوە بیانکرێ.

واتە: ئەگەر خەزان و بەهار و سەوزی و خەزان پێکەوە کرایان بەیەکەوە بن، ئەوا ڕوو لە ڕووماڵینی دۆستیش بۆ من ئاسان دەبێ، خۆ هەرگیز خەزان و بەهار و سەوزی و خەزان پێکەوە نابن. کەواتە ڕووی منیش هەرگیز لە ڕووی یار ناماڵێ، دیارە تەعلیق بە مەحاڵە.

ڕوو لە ڕوو (ق): ڕوو لە پێ. بن (مان، عا): بێ.

(٦) "سالم"ی یەکەم: سەلامەت.

واتە: "سالم"ی کلۆڵ کەی بە سەلامەتی دەردەچێ، ئەگەر ببێتە نێچیری دەشتی شکاری شاسوارێ کە یارە.

(سەحرای) شێوەنووسی (مان)ە.

(*) -٨-

**جەمعی ضیددەینە لە ڕووی موویی سفیدەم ڕوخی یار**
**گڕ دەبەستێ بە یەقین پەنبە لە نەزدیکییی نار (١)**
**عەزمی ئەو شۆخە، وەلێ، ناظیمی ضیددەینە مودام،**
**سازشی دا کە لە ڕوخسارەوو موو، ئاگر و مار! (٢)**
**صوورەتی عاشقیی و پیرییی من بێنە نەظەر:**
**وەکوو طیفلێ کە بدا پەنجە لەگەڵ شێری شکار (٣)**
**شادیی و غوصصەیە بۆ دڵ، ڕوخی دڵدار و ڕەقیب**
**طەرەب و ئەندووهە بۆ بولبولی شەیدا، گوڵ و خار (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە بەشی (غزلهای جدیدە)ی (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەقسوور.

(١) جەمعی ضیددەین: کۆکردنەوەی دوو شتی دژی یەك. لە ڕووی: مەبەستی بەرامبەرە. سفید: سپی. پەنبە: لۆکە. نار: ئاگر.

واتە: مووی سپیی (ڕیشی سپی)ی من بەرامبەر بە ڕوخساری یار، کۆکردنەوەی دوو شتی دژی یەکە، چونکە -بێگومان- لۆکە لە نزیکی ئاگردا گڕ دەگرێ و دەسووتێ و پێکەوە نایانکرێ.

(٢) مودام: هەمیشە. سازش: گونجان.

واتە: وەك وتم مووی سپیی (ڕیشی سپی)ی من بەرامبەر بە ڕوخساری یار، کۆکردنەوەی دوو شتی دژی یەکە، بەڵام ئەو شۆخە بۆ خۆیشی هەمیشە دوو دژی کۆکردووەتەوە؛ ڕوخساری وەك ئاگر و ئەگریجەی وەك ماری کۆکردووەتەوە و پێکەوەی گونجاندوون.

(٣) واتە: ورد بەرەوە لە وێنەی عاشقیی من؛ پیری و بێهێزییەکەم وەك ئەوە دێنە پێش چاو کە ساوایەك لەگەڵ شێرێکی شکاری پەنجەبازی بکا، یانێ پیریی من لە کوێ و هێزی بێسنووری عیشق لە کوێ؟!

(٤) غوصصە: خەفەت. ئەندووە: خەمباری.

واتە: ڕوخساری نازداری یار و ناوچاوی دێزی بەدکار، یەکەمیان هۆی خۆشیی دڵە و دووەمیان پەژارە و خەمە. دیارە گوڵی جوان و دڕکی دەورووبەری، یەکەم بولبول دێنێتە سەما و دووەم هۆی خەمبارییەتی. ئاشکرایە سالم بولبولەکەیە و ڕوخساری یار گوڵەکە و بەدکاریش گونکەی سەر دڵە!!

**دڵی "سالم" بە صەفا عەکسپەذێریی ڕووتە**
**ڕۆشنیی وا، بە ستەم، حەیفە ببێ تیرەوو تار (٥)**

(٥) عەکسپەذێر: وێنەوەرگر، وەك شتێ لە ئاوێنەدا ببینرێ. تیرەوو تار: تاریك. ڕۆشنیی وا: ڕووناکیی وەها.

واتە: دڵی سالم ئەوەندە ساف و بێگەردە، بە ئاسانی ڕوخساری ناسکی یار دەنوێنێ و وەك ئاوێنە تێیدا دەردەکەوێ. ڕووناکی و بێگەردیی وەها، حەیفە بە جەور و ستەم تاریك ببێ!

(*) -٩-

**خۆشا هەرجا کە فەصدی لەب دەکا، یار**
**دەبێتە مەعدەنی لەعل و نەمەکزار (١)**
**لە زەخمی، خوێن وەکوو فەوواره دەقوڵێ**
**شەهیدی ناوەکی موژگانی دڵدار (٢)**
**کە فەصصاد قەصدی فەصدی لێوی تۆی کرد**
**جیهان گرتی سەراسەر ڕەنگی گوڵنار (٣)**
**پەناهی بردە بەر چاوت، دڵی تەنگ**
**دەوای بیمار ئەگەر بکرێ بە بیمار! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لـە (مان، عا، غ، ق، ڕ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی مەقسوور.

(١) فەصد: کەڵەشاخگرتن، لێرەدا مەبەست ماچکردنە، چونکە ماچیش وەك کەڵەشاخگرتن خوێن لـە شوێنی دیاریدا کۆدەکاتەوە. نەمەکزار: خوێڵێن. شوێنی خوێ.

واتە: خۆشی بۆ ئەو شوێنەی کە یار بە لێو خوێنی دەمژێ و ماچی دەکا، ئەو شوێنە ئەوەندە ئاڵ دەبێتەوە، دەبێتە کانگای لەعلی سوور؛ ئەوەندە بەتام و خوێدار دەبێ، دەبێتە کانگای خوێ (خوێڵێن). یاخۆ: لە لایەك شوێنی ماچەکە وەك کانی خوێ سپی بێ و لـە لایەکیش لەعلی لێوی یارە و سوورە. دووریش نییە مەبەست ئەوە بێ کە یار خۆی لێوی خۆی بە دەسەنقەست دەگەزێ و سووری دەکاتەوە.

(٢) ناوەك: جۆرە تیرێکە.

واتە: شەهید و کوشتەی برژانگی ئازیز، خوێنی وەك فووارە لێ هەڵدەقوڵێ.

دەقوڵێ (ق): دەڕژێ. دڵدار (ق): نازدار.

(٣) ئەم بەیتە لـە (عا، غ، ڕ)دا نییە.

فەصصاد: کەڵەشاخگر، مەبەست عاشقە.

واتە: ئەگەر عاشق تەنها نیازی خوێنگرتن و ماچکردنی لێوی تۆی کرد، تەنها بە نیازە ڕووتەکە هەموو جیهان ڕەنگی گوڵنار دەگرێ و ئاڵ دەبێ!

(٤) (بیمار)ی یەکەم: نەخۆش. (بیمار)ی دووەم: مەست، ئەمیش هەر جۆرە نەخۆشیێکە.

واتە: دڵی تەنگی خەمباری من پەنای بردە بەر چاوی مەستت، بەشکوو نەختێ شادمان بێ، ئەگەر

له خاکی کوشتەیی زەنجیری زوڵفت
سەحەر دێنێ صەبا بۆی میشکی تاتار (٥)
سەری زوڵفت کە ئیفشا بوو بە ڕوودا
لە لام ئاشوفتە بوو تەرتیبی ئەشعار (٦)
هوما بگرێ، دەبارێنێ لە پەڕ لەعل
کە پیشەی کوشتەیی لێوت بە مینقار (٧)
دەترسم بێ لە ناکادا سەموومێ
نە گوڵ بێڵێ، نە دڵ بێڵێ، نە گوڵزار (٨)

نەخۆش لە دەستی بێ چاری نەخۆشی بکا!

(٥) ئەم بەیتەیش لە (عا)دا نییە.

خاك: مەبەستی گۆڕە.

واتە: کوشتەی بەندی زنجیری ئەگریجەی بۆنخۆشت کە نێژرا، بای سەبا بەیانیان لە گۆڕەکەیەوە بۆنی میسکی تەتار دەهێنێ، چونکە کوشتەکە لە بەندی ئەگریجەی بۆنخۆشتدا گیانی سپاردووە. دیارە سالم بەختیارە، ئەگەر پاش مردنیش بێ، بۆنی زوڵفی یار لە گۆڕەکەیەوە بێ.

کوشتەیی (ڕ): تیشنەیی.

(٦) ئەم بەیتە لە (ق)دا حەوتەمە.

ئیفشا: مەبەست پەخش و بڵاوە. ئاشوفتە: ئاڵۆز.

واتە: سەری زوڵفت کە بەسەر ڕوخسارتدا بڵاو بووەوە، منیش تەرتیبی شیعرەکانم وەك زوڵفی تۆ پەخش و بڵاو بوو و تێكچوو.

سەری (غ، ق): سیەه. ئیفشا بوو بە ڕوودا (ق): ئەفشان بوو بە ڕووتا.

(٧) هوما: پیرۆزە. مینقار: دەنووك.

واتە: ئەگەر هوما ئێسقانی عاشقی کوشتەی لێوت بە دەنووك بگرێ، لە پەڕەکانیەوە لەعلی ئاڵ دەبارێنێ، چونکە ئێسقانەکە هی یەکێکە لێوی ئاڵی یاری نازدار کوشتوویە و ئێسقانەکانی دەبنە هۆی بارینی لەعلی ئاڵ. مەبەستی ئەوەیە: هوما، ئەگەر تەنانەت بە دەنووك ئەو ئێسقانە بگرێ، ئەوەندە کاری تێدەکا لەعل لە پەڕەکانیەوە بباری.

هوما بگرێ، دەبارێنێ لە پەڕ لەعل (ق): هوما بگرێ و ببارێنێ پوڕی لەعل.

(٨) سەمووم: گڕەی گەرمی هاوین.

**له وه‌ختێکا له‌گه‌ڵ تۆ ئاشنا بووم**
**نه حاجیب بوو، نه مانیع بوو، نه ئه‌غیار (٩)**
**له حاڵاتی نه‌ظه‌ردا لێم ده‌تۆرێ،**
**موژه‌ت خوونڕێز، دڵی "سالم!" گونه‌هکار (١٠)**

واته: ده‌ترسم له ناکاودا گڕه‌یه‌کی گه‌رمی وه‌ها هه‌ڵکا، منیش و تۆیش له‌ناوبه‌رێ. ئه‌ڵبه‌ت گڕه‌که ئاه و هه‌ناسه‌ی گه‌رمی ساله.

له ناکادا (ق، ر): له ناکاوا.

(٩) ئه‌م به‌یته له پارچه‌شیعری شه‌شه‌می ئه‌م پیته‌یشدا هه‌بوو.

واته: کاتێك من و تۆ پێکه‌وه ئاشنا بووین، ئیتر نه ده‌رگاوان و نه هیچ به‌ربه‌ست و بێگانه‌یه‌کیش له ئارادا بوون.

له وه‌ختێکا (ق): له وه‌ختیدا.

(١٠) واته: که ته‌ماشات ده‌که‌م لێم ده‌تۆرێی و زیز ده‌بی، برژانگت خوێنڕێژ و جه‌للاده و منیش ئه‌ی سالم! دڵم گوناهباره و به تیری برژانگت ده‌کوژرێم.

ئه‌م به‌یته، به‌و شێوه‌یه که له به‌رچاوه و هی نوسخه‌ی (مان)ه، به‌پێی زانیاریی ڕه‌وانبێژی (به‌لاغه‌ت) هونه‌ری (ئیلتیفات)ی تێدایه، جارێ له‌گه‌ڵ قسه‌بۆکراو ده‌دوێ و جارێکیش له‌گه‌ڵ خۆی. له لایه‌ك ده‌ڵێ: له کاتی بۆ ڕوانیندا تۆ لێم زیز ده‌بی و موژه‌ت خوێنڕێژه، دوایش ده‌ڵێ: دڵی تۆیش، ئه‌ی سالم! گوناهباره‌که‌یه. واته به‌پێی ڕێبازی زانیاریی نه‌حو (دڵ) موبته‌دایه و (گونه‌هکار) خه‌به‌ریه‌تی، "سالم" له ناوه‌ڕاستدا قسه‌له‌گه‌ڵکراو و بانگ‌کراوه (مخاطب و مُنادی). به‌ڵام له (عا)دا، له‌باتیی دڵم (دڵی)یه، له‌م حاڵه‌دا (دڵ) موبته‌دا و موضافه و (سالم) (مضاف الیه) و (گوناهکار) خه‌به‌ره، ئه‌و ئیلتیفاته‌یش که باس کرا نامێنێ.

خوونڕێز، دڵی (ق): خوونڕێزه لێم.

-١٠- (*)

کەی موقارین بن لە وەصلا ڕووی من و ڕوخساری یار؟
قەد بەهەم ناگەن لە یەك جا؛ ئەم خەزانە و ئەو بەهار (١)
ڕاستیی شەمشاد و قەددی تۆ بە ئەندازەی یەکن
هەردو مەوزوونن، وەلێکین ئەو زەخیمە و ئەم نەزار (٢)
دای لە قافڵەی صەبر و بردی ڕەهزەنی عیشقت بە تاو
تا حەشر ناگەم بە گەردی؛ من پێیادە و ئەو سەوار (٣)

(*) ئەم پارچە سێبەیتییە لە (مان، غ، ق، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەقسوور.

(١) موقارین: شتێ لەگەڵ شتێکیتر بێ. بەهەم: بە یەك. یەك جا: لە یەك جێدا.

واتە: کەی و چۆن ڕۆژی بەیەکگەیشتنی ڕووی من و ڕوخساری یار بەیەکەوە بن؟ نەخێر، هەرگیز لە شوێنێکدا یەکناگرن. ئەم -واتە ڕوخساری من- خەزان و گەڵاڕێزانە و ئەو -واتە نازداریی یار- بەهار و لالەزارە.

کەی (گم): گەر. قەد (کم، ق): قەت. بەهەم (ق، کم، گم): بە یەك، دیارە (بەیەك) کوردییە و (بەهەم) فارسییە. جا (ق): جێ. خەزانە و (کم، گم): خەزان و.

(٢) مەوزوون: ڕێك. زەخیم: سەخت و بەهێز، ئەستوور و قەبە (لە -ضخم-ەوە هاتووە). نەزار: باریك. نەزار: بێهێز و لاواز، باریك.

واتە: داری شمشاد و باڵای تۆ -لە ڕاستیدا- وەك یەکن، بەڵام ئەو ئەستوور و قەبە و باڵای تۆ لاواز و باریکە. زیادەڕۆییـەکی جوانە.

وەلێکین (گم): وەلاکین. ئەو زەخیمە و ئەم نەزار (ڕ): ئەم زەخیمە و ئەو نەزار. (غ، ق، ج، کم، گم): ئەم ضەخیم و ئەو نەزار.

(٣) ڕەهزەن: ڕێگر، جەردە. گەرد: تۆز.

واتە: جەردەی عیشق دای لە کاروانی سەبرم و بردی، تا ڕۆژی حەشر بەدوایدا ڕابکەم بە تۆزی پێیدا ناگەم؛ من پیادەم و ئەو سوار!

دای (ڕ): وای. صەبر و. (کم، گم): عەقڵ و.

-١١- (*)

((آن چنانم از فراق روی یار))

لەحظەیێ نەمماوە ئارام و قەرار (١)

((گریەام ازبسکە آرد خون دل))

دێ بە ڕووما میثلی سەیلابی بەهار (٢)

((سوی من گر بگـذرد جانانەام))

نەقدی ڕۆحم وا لە کەفدا بۆ نیثار (٣)

((چون سگ کویش ندارم آشنا))

هەر ئەوە بۆ من ڕەفیق و یاری غار (٤)

((باد اگر آرد غبار کوی دوست))

وەك جەواهیرسورمەیە بۆ چاوی تار (٥)

((بسکە من گریم بە یاد گلرخی))

ظاهیرە هەر سوو لە ئەشکم لالەزار (٦)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (م)دا هەیە. دوور نییە فارسییەکەی هەر هی "سالم" بێ، بەتایبەتی کە ناسناوی خۆیی لە دواینبەیتدا داناوە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەقسوور.

(١) لەحظە: سات.

واتە: لە دووریی ڕووی یاردا گەیشتوومە ڕادەیەك، ساتێك ئارامم نییە.

(٢) میثل: وەك. سەیلاب: سێلاو، لافاو.

واتە: گریانم، لەبەرئەوەی خوێنی دڵ زۆر لەگەڵ خۆیدا دێنێ، وەك لافاوی بەهار بە ڕوومدا دێتە خوارەوە.

(٣) واتە: ئەگەر یارەکەم بە بەردەممدا بڕوا، نەختینەی ڕۆحم وەك پارە لە دەستمدایە، دابەشی بکەن و ببیەخشنەوە.

(٤) واتە: ئاشنایەکم نییە وەك سەگی بەردەرگاکەی ئەو، هەر ئەو دۆست و یارە.

(٥) جەواهیرسورمە: کلەی گرانبەها.

واتە: ئەگەر با تۆزی ناو کۆڵانی دۆست بە ڕوومدا بهێنێ، وەك جەواهیرسورمە وایە بۆ چاوی تار.

(٦) واتە: هـەر لەبەرئەوەی زۆر بـە یـادی گـوڵڕوویـەکەوە دەگـریم، فرمێســـك لە هـەر لایـەکی

«چون غمش آرد شبيخون بر سرم»
**دەوری دڵ دەگرێ لە هەر سوو وەك حەصار (٧)**
«متصل شد نالهٔ مجنون و من»
**ئەو لە صەحرا، من لە قوللەی کۆهسار (٨)**
«نيست چون من در جهان ديوانه‌ای»
**وێڵی کردم هەر طەرەف صەحراوو شار (٩)**
«جمله بند چشم بی‌خوابم به شب»
**ئاسمان و میحوەر و قوطبی مەدار (١٠)**
«گر ز محشر داد رندان بشنوند»
**دەچمە بەر دیوانی حەق، مەست و خومار (١١)**
«سجده خواهم کرد اندر پيش صف»
**عەرض دەکەم، ئەی پادشاهی کردگار! (١٢)**
«"سالم" رند از جهان بدنامی چيست»
**زاهیدت بۆچ کرد بە صاحیبئیعتیبار؟ (١٣)**

ڕوخسارمدا باخچەیەکی گوڵی دروست کردووە.

(٧) واتە: کە خەمی ئەو هەڵدەکوتێتە سەرم، لە هەر چوار لاوە دەوری دەدا.

(٨) واتە: ناڵەی مەجنوون و من بەیەکدا چوون، ئەو لە بیابان و من لە لوتکەی کێواندا.

(٩) واتە: دنیا دێوانەیەکی وەك منی تێدا نییە، لە هەر لایەك بە بیابان و بە شاردا وێڵ کراوم.

(١٠) واتە: بە شەو هەموو چاوی بێخەوم بەستراوە بە ئاسمان و تەوەر و جەمسەری ئەم گەردوونەوە.

(١١) واتە: ئەگەر لە مەحشەردا دادی عاشقان ببیسترێ، بە مەستی دەچمە بەر دیوانی حەق.

(١٢) واتە: خۆم کرد بە کڕنووشبەر لە پێشی ڕیزەوە. ئەی خودایە شکاتی خۆم نیشان دەدەم.

(١٣) واتە: سالم، بەدناوی لە جیهاندا چییە، ئەگەر تۆ زاهیدت کردە پیاوچاك.

## (*) -١٢-

### (رقعه ٔ احوال‌پرسی درویش آغا)

**ئەی فیدایی ڕەوتی توندت، گورگەلۆقی کەمتیار**
**وەی غولامی جوست و خێزت، لەقلەقی ناو جۆێبار (١)**
**ئەی لە وەزنی خیصیەتەینت، سەرسەبوك تۆپی قەپان**
**وەی لە ڕووی خەرطوومی بێ‌جانت، حەفیی وەك توولەمار (٢)**
**ئەی بە قەددی تۆپی شەش پۆن «است» قیتەی سەرپەتیت**
**وەی وەکوو صندووقی جوببەخانە خایەت ئوستۆار! (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە داشۆرین‌بابەتە هەر لە (مان، ن)دا هەیە، بەڵام ناسناوی سالمی تێدا نییە. وەك پێشتریش وترا: سالم کەمتر ناوی خۆی لە پارچەشیعرەکانی هەجوودا هێناوە. لە سەرناوی پارچەشیعرەکەدا نووسراوە: «رقعه ٔ أحوالپرسی درویش آغا»، واتە: پارچەشیعرێکە لە هەواڵپرسینی دەروێش ئاغادا گوتراوە. چۆن هەواڵپرسینێ؟!

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەقسوور.

(١) جوست‌وخێز: جموجووڵ و هەستانەوە.

واتە: گورگەلۆقەی کەمتیار، کە چەند نالەبارە، بە قوربانی ڕەوت و ڕۆیشتنی توند و تیژت بێ، یانێ شایان نیت، گورگەلۆقەی کەمتیار نەبێ، هیچی‌تر بە قوربانی ڕەوتت بێ. لەقلەقی گوێ جۆگە خزمەتکاری جموجووڵت بێ. ئاخۆ -بەپێی تێڕوانینی سالم- دەبێ ڕەوت و جموجووڵی دەروێش ئاغای داماو چۆن بووبێ؟!

(٢) خیصیە: هێلکەگون. خیصیەتەین: جووتە هێلکەگون. سەرسەبوك: سەرسووك. تۆپ: قورسایی و سەنگی قەپان، هەموو. خەرطووم: لمۆز. بێ‌جان: بێ‌گیان، مەبەستی دەعبای درێژی دەروێشە. حەفی: ماری گەورە.

واتە: ئەی ئەو خاوەن لەش‌ولارە ناقۆڵایە کە هەموو قەپانەکان سەریان سووکە لە کێشانەکردنی جووتە هێلکەت و پێیان ناکێشرێ! یا تۆپی قورسی قەپان لەچاو کێشی هەردوو هێلکەی گونتدا سووکە! ئەی ئەو دەعبا زل و درێژەی کە گەورەمار (ئەژدەها) لە چاو لووتەفیلی بێ‌گیانتدا وەك توولەمار دیارە!

(٣) بە قەددی: بە قەدەر، ئەوەندەی. پۆن: دەبێ پۆند بێ، کە کێشانەیەکی ئینگلیزیی ٤٥٣ گرامییە. سەرپەتی: سەرڕووت. جوببەخانە: جێی تایبەتی چەك. خایە: هێلکەگون. ئوستوار: پایەدار و مەحکەم.

ئەی بەرابەر توخمی باتووت بەیضەیی ڕوخ، هێلکەکەو!
وەی موقابیل طوولی میلت، نێرکی کاردوو و مەنار (٤)
خایەماڵی چۆن بکا؟ ناگاتە مەقصەد دەستی عووج!
کۆتەهە بۆ باوەشێنی کێری تۆ، دەستی چنار (٥)
وەك گونت شووتیم لە بوستانا نەدی ئاونگ و زل!
هیچ زەمێنێ نایێنێ نەوعی عەموودت، کالیار! (٦)

نیوەبەیتی یەکەم دەبێ هەڵە لە نووسینەوەیدا کرابێ و وا بووبێ: ((ئەی بە قەددی تۆپی شەش پۆنەست قیطەی سەرپەتیت)) (پۆن است) لە خوێندنەوەدا وای لێ دێ. دیارە (است)ەکەی لە فارسییەوە هێنراوە.

واتە: دەعبا قیتە سەرڕووتەکەت گەورەیە و ئەوەندەی تۆپێکی شەش پۆندی دەبێ. گونیشت وەك سندووقی جبەخانە مەحکەم و پایەدارە.

(قیتەی) بە هەڵە بە (قیطەی) نووسراوە.

(٤) توخم: تۆو، ناوك. باتوو: گون. بەیضە: هێلکە. ڕوخ: گیانلەبەرێکە وەك عەنقا ناوی هەیە و ناوکەی نییە، دەڵێن ئەوەندە زەبەلاحە فیل و کەرکەدەن دەرخواردی بێچووەکانی دەدا. طەویل: درێژ. میل: مەبەست دەعبای دەروێشە کە بە قەد میلێ درێژە! نێرکە کاردوو: ئەوەی کە لە ناوەڕاستی کاردوو دەردەچێ کە کورت و باریکە، کینایەیە لە بچووکی و کورتی. مەنار: بینای بەرزی سەر ڕێوبان کە بۆ وننەکردنی ڕێگە و مەسافەزانینی دروست دەکرێ، کینایەیە لە درێژی و بەرزی.

واتە: هێلکەی ڕوخ بەو گەورەییە کە هەیە، بەرامبەر بە تۆوی هێلکەگونت ئەوەندە بچووکە، وەك هێلکەکەو دەنوێنێ. مەناریش بەرامبەر بە درێژیی دەعباکەت بچووکە و وەك نێرکە کاردووە.

(مەنار) کورتکراوەی (منارە)یە، کە واتاکەی ئاشکرایە.

(٥) خایەماڵی: ماڵین و پاككردنەوەی هێلکەگون. عووج: عووجی کوڕی عەنەق، کابرایەکی ئەفسانەیی زۆر درێژ بووە! کۆتەه: کورت.

واتە: دەستی عووجی کوڕی عەنەق بەو هەموو درێژییەی ناگاتە گونت تا بیسڕێ و پاکی بکاتەوە! بۆ باوەشێنکردنی دەعباکەیشت، دەستی چنار کورتە و نایگاتێ.

(٦) ئاونگ: ئاودار. عەموود: کۆڵەکە، مەبەستی دەعباکەی دەروێشە. کالیار: جۆرە ترۆزییەکی گەورە و درێژە، تامی لەنێوان تامی کاڵەك و ترۆزیدایە و مەیلی ترشی دەکا.

واتە: من تا ئێستا شووتیی گەورەی بەقەد گونتم لە هیچ بێستانێکدا نەدیوە. هیچ زەوییەك ئەو

بۆ هەوای تێچێنی دانی ئەو مەدارە، دێ بە دەو
بستی پەڕڕەی شەشپەڕت بۆ پیرەزاڵی بێتە کار (٧)
وەك یەلی عەهدی قەدیم –بیستوومە– لۆنگت کردە پێ
چوویە ناو زۆرخانەوە بۆ کوشت و گیری کارزار (٨)
میلی ناولنگت یەکێ بوو، میلی سەرشانت دووان
دەستی جەللابی بە سێ میلی وەها نەیکردوە کار (٩)

فەڕ و پێتەی نییە کالیاری وەك دەعباکەت هەڵبخا!

(٧) تێچێن: بە تێچاندن، وردەوردە تێکردن. مەدار: تەوەرە کە بەرداشی لەسەر دەگەڕێ. دەو: غار. بست: ئاسنی نێوان تەوەرە و بەرداش کە لە تۆپێکی دارینی پەڕەدار هەڵکێشراوە. لای خوارووی لەسەر موورەسەنگ و ژێر دۆزەخەی ئاشدا و لای سەرووی خراوەتە کونی تەوەرە کە لەسەر بەرد توند کراوە. کە ئاو بە توندی لە نێ یا تەنوورەوە دەدا لە تۆپەکە، دەیسوورێنێتەوە. بەمە بەرداش دەسوورێتەوە. پەڕە: پەروانەی ئاش، چەند تەختەیەکی پان و بستێ زیاتر درێژە و سەرەکانی وەك کەوچك چاڵە، بە تۆپی ئاشدا دەکوترێن. ئاو کە بە توندی لە گوێجەوە هات، تۆپ دەخاتە جووڵە. پیرەزاڵ: پیری بەدەسەڵات، زاڵی کوڕی سام و باوکی ڕۆستەم کە پاڵەوانێکی ئێرانییە.

واتە: بە ئارەزووی تێچاندنی بەشی خۆی لەو ئاشە، بە غار دێ. بستی ئاشی دەعباکەت کە شەشپەڕە بۆ پێنیشاندانی دەسەڵاتی پیری بخەرە کار.

(٨) لەم بەیتە بەدواوە شاعیر وای حیساب کردووە کە دەروێش ئاغا بە خۆی و گورز و گۆپاڵیەوە چووەتە مەیدانی زۆرانبازی، لەوێ تێکەوتووە و دۆڕاندوویە.

یەل: پاڵەوان. عەهدی قەدیم: سەردەمی پێشوو. لۆنگ: پەشتەماڵی حەمام، کەوڵی ڕایەخ. کوشت و گیر: بکوژە و بگرە، یا (کوشتیگیری) بووە، واتە: زۆرانگرتن. کارزار: جەنگ و شەڕوشۆڕ.

واتە: بیستوومە وەك پاڵەوانەکانی پێشوو لۆنگت لە پێ کردووە و چوویتە ناو زۆرخانە بۆ زۆرانگرتن و شەڕکردن.

(٩) میلی ناولنگ: مەبەستی دەعباکەی دەروێشە. میلی سەرشان: دوو میلی یاری کە لە زۆرخانەکاندا بەکار دەهێنرێن. جەللاب: جەللاد.

واتە: کە چوویتە زۆرخانە، میلی ناولنگت یەکێك و میلی یاریی سەرشانت دووان. دەستی هیچ جەللادێ هەرگیز یاریی بە سێ میلی وەها نەکردووە!

دوو کەدووی زل، یەعنی خایەت، کیسوەتی پڕ کردبوو
عەقرەبێ بۆ ئەزیەتت، وەك دز، لەوێ گرتبوی قەرار (١٠)
گوێچکەفیلێ کەوتە سەر ئاو، یەعنی جێبی خیصیەتت
ئەو چەقە پڕ کیسوەتە بۆ شانی عەقرەب بوو بە بار (١١)
هەر کە باری کەوتە سەر لەولەوچە، عەقرەب قەهری کرد
تێی چەقاند چاپوك بە چەقدا نێشی تیژی زەهردار (١٢)
ئینتیشاری ژاری ئەو نێشانە زگتی خستە ڕێ
بۆ ژیانت، بۆ ڕیانت، صەد شوکر، ئەی یاری غار (١٣)

(١٠) کەدوو: کوولەکە. کیسوەت: لێرەدا مەبەست دەرپێیە. عەقرەب: لەوانەیە مەبەست دەعبای هاوزۆرانەکەی بێ، کە یەکەمجار کەوتووەتە ژێر.

واتە: دوو گونەکەت کە وەك دوو کوولەکەی ناقۆلان، پڕی دەرپێکەی بوون. دووپشکی دوژمن کە لەژێرەوە بوو، بۆ ئازاردانت لەوێ بوو.

(١١) گوێچکەفیل: مەبەستی گونیەتی. ئەو چەقە: دەعبای هاوزۆرانەکەی، کە لەژێرەوە بووە.

واتە: یەکەمجار گونت، کە وەك گوێچکەفیل گەورەیە، کەوتە سەر دووپشکی هاوزۆرانەکەت، کە دەعباکەیەتی، ئەو جووتە گونە بوون بە بار بەسەریەوە.

(١٢) لەولەوچە: ڕەنگە (لەبولەوچە) بێ، لێوولچ، دەموليو. قەهری کرد: تووڕە بوو.

واتە: بەڵام کە ئەو باری قورسی کەوتە سەر لچولێوی، دەعباکەی تووڕە بوو و ڕقی هەستا، دەستوبرد چزووی ژەهراویی چەقاندە ڕەگ و دەماری!

(١٣) ئینتیشار: بڵاوبوونەوە. نێش: چزوو. خستە ڕێ: ڕەوانەی کرد، تووشی سکچوونی کرد. ڕیان: دانیشتن لە پێشاودا، خۆپیس کردن.

واتە: ئەی یاری ڕۆژانی ئەشکەوت، بڵاوبوونەوەی ژەهری ئەو چزووانە تووشی سکچوونی کردی. بۆیە سەد شوکور بەو ژیانەت و بەو خۆپیس کردنەت.

## -١٣- (*)

**ڕەها ناکا دڵم طوڕڕەی خەمی یار**
**سەری نەبڕن هەتا وەك پەرچەمی یار (١)**
**عەزیزە دڵ، هەتا دەمرم، بەقەد جان**
**زەمانێ چونکە ئەو بوو مەحرەمی یار (٢)**
**ببۆسە ئەی صەبا! گەر چوویە مەقصەد**
**لەباتیی من، بە فرصەت، ناو دەمی یار (٣)**
**دڵی تەنگم نەبینێ ڕوویی شادی**
**ڕەفیقم بێ، ئەگەر غەیرەز غەمی یار (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، هـ، ف، ج، ڕ، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەقسوور.

(١) ڕەها: بەرەڵڵا. طوڕڕە: زوڵف. خەم: لوول.

واتە: دڵم زوڵفی لوولی یاری کردووەتە ئارامگای خۆی و هەرگیز چۆڵی ناکا، تا وەك پەرچەم سەری نەقرتێنن و گیانی نەکێشن!

سەری نەبڕن (ق): سەری نەبڕێ.

(٢) واتە: دڵ بەقەدەر گیان بەنرخ و خۆشەویستە، چونکە سەردەمێ ئەو مەحرەمی یار بوو و خۆی لە ئەگریجەیدا حەشار دابوو!

دەمرم (هـ): دەمرێ. بەقەد (ق): وەکو.

(٣) ببۆسە: ماچ بکە. چوویە: چوویتە.

واتە: ئەی بای سەبا! وا من خۆم هیچ، بێبەش و چارەڕەشم، بەڵام تۆ ئەگەر لە هەلێکدا گەیشتیتە مەنزڵی یار، لەباتیی من ناودەمی ماچ بکە. دیارە یاریش بێ هەوا ناژی، لەوانەیە سەبا ئەم هەلەی بۆ ڕێك کەوێ.

لەباتیی (ڕ): لەیای. هەڵەی نووسینە.

(٤) ئەم بەیتە لە (عا)دا نییە، لە (کم، گم)دا سێیەمە.

واتە: ئەگەر شتێکیتر، جگە لە خەمخواردن بۆ یار، ببێ بە هاوڕێم، خودایە دڵی تەنگ و خەفەتبارم هەرگیز شادی نەبینێ.

**له بەندا ضەربی هەر موو کەوتە سەر دڵ**
**وەکوو دیرهەم لە طوڕڕەی دەرهەمی یار (٥)**
**دەبێتە باغی جەننەت، دەفعەیێ بێ**
**بە کولبەی "سالم"ا، گەر مەقدەمی یار (٦)**

(بێ) لە (حا)دا کەوتووە. غەیرەز (مان، حا): غیراز، وا دەخوێنرێتەوە کە نووسراوەتەوە. (ھ): غەیری.

(٥) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا چوارەمە.

بەند: حەپس. دیرهەم: پارەی زیو، ئەسڵەکەی (دراخما)ی یۆنانییە. دەرهەم: ئاڵۆز.

واتە: کە دڵ لە پێچی ئەگریجەی ئاڵۆزی یاردا بەند بوو، هەر موویەك کە دەیدا لە دڵ وەك دیرهەم دەبووە نەخش.

(٦) کولبە: کەلاوە، وێرانە.

واتە: ئەگەر تاقە جارێ پێوقوومی یار رێی بکەوێتە کەلاوەی خەفەتخانەکەم، کاولەکەم لێ دەبێ بە بەهەشت.

-١٤- (*)

**غەبغەب و خاڵ و لەب و طوڕڕەیی یار**
**سونبول و سێب و بەنەفشە و گوڵنار (١)**
**تا لە لای یارە، فەرەحناکە دڵم**
**جێی لە گوڵزارە بەبێ فەصڵی بەهار (٢)**
**خۆفناکە دڵی ئازوردە لە زوڵف،**
**حاڵەتی تەڵخە، لە شەودا بیمار (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، ھ، ف، غ، ج، ق، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشیی مەخبوونی ئەصڵەمی موسەببەغ.

(١) غەبغەب: گۆشتی ژێرچەناگەی قەڵەو و خرپن. سێب: سێو. بەنەفشە: وەنەوشە. گوڵنار: گوڵی هەنار.

واتە: غەبغەبی یار سێوە، ئەگریجەی سونبولە، خاڵی وەنەوشەیە و لێوی وەك گوڵنار سوور و ئاودارە. لە ڕاستیدا شوبهاندنی غەبغەب بە سێو زۆر تەواو نییە، خۆ یار تووشی ملەخڕە نەبووە!

(و)ی نێوان (خاڵ) و (لەب) لە (مان)دا کەوتووە.

(٢) ئەم بەیتە لە (ج)دا سێیەمە و لە (کم، گم)دا لەگەڵ بەیتی پاشەوەی پاش و پێشن.

واتە: تا دڵ لای یار بێ و منی بەجێهێشتبێ، شادمانە، جێی نەوێی -بێ وەرزی بەهار- گوڵزارە، یانێ پێویستی بە بەهار نییە.

(٣) ئەم بەیتە لە (ج)دا دووەمە.

ئازوردە: خەمبار. تەڵخ: تاڵ. بیمار: نەخۆش.

واتە: دڵ کە لە پێچی ئەگریجەی یاردا بەندە، لە زوڵف دەترسێ. دیارە نەخۆش لە شەودا حاڵی تاڵە و شەوی بە گران لێ دەڕوا.

ئاشکرایە کە شەوەکە زوڵفی یارە، بەڵام دەربڕینەکەی زۆر بەهێز نییە. چۆن دڵی سالم، کە ئەگریجەی یار جێی هەمیشەییەتی، لە ئەگریجە وەڕز دەبێ. ئەو زۆر جار لە خودای دەوێ شانە وازی لێ بێنێ و پێچی ئەگریجەی یاری پێ ڕەوا ببینێ.

خۆفناکە (گم): خەوفناکە. دڵی (ف، کم، گم): دڵم. ئازوردە (ھ): ئاشوفتە. لە شەودا (ھ): بە شەودا.

**گەر قیاس کەم بە قەدت، قەددی بوڵەند**
**هەروەکوو سەروە موقابیل بە چنار (٤)**
**گەرچی ئایینە دەبێ تیرە لە ئاه،**
**ئاهم ئارایشە بۆ چیهرەیی یار (٥)**
**سازشی طورڕەوو ڕووی دا بە فونوون**
**ناری داخستووە بۆ دۆشەکی مار (٦)**
**وەك کەسێکم لە جونوونبازییی عیشق**
**بێتە دەر موفلیس و ڕیسوا لە قومار (٧)**

(٤) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا هەشتەمە، لە (ف، ج)یشدا نییە.

واتە: ئەگەر ئەندازەی باڵای بەرزیتر بە باڵای تۆ بگرم، وەك بەراوردکردنی باڵای سەرو دەبێ بە باڵای چنار، دیارە سەرو جوانترە، ئەگەرچی چنار بەرزترە.

قەددی بوڵەند (کم، گم): قەدی بەندوا (ق): سەروی بوڵەند.

(٥) تیرە: تاریك. ئارایش: ڕازاندنەوە. چیهرە: ڕوخسار.

واتە: ئەگەرچی هەناسە ئاوێنە لێڵ دەکا، بەڵام ئاهی من ئاوێنەی ڕوخساری تۆ دەڕازێنێتەوە. دیارە نە ئاهی سالم لە ئاهی خەڵکیتر دەچێ، نە ڕوخساری یاریشی لە ئاوێنەیەکیتر. بەیتەکە جوانە. ئەوەیشمان لە بیرنەچێ کە ئەوسا بە هەڵم و هەناسە ئاوێنە دەسڕرا و پاك دەکرایەوە.

دەبێ تیرە (عا): تیرە دەبێ. دەبێ (کم): ئەبێ.

(٦) ئەم بەیتە لە (عا)دا نییە.

سازش: گونجان. فونوون: کۆی فەن بە واتای فێڵ! نار: ئاگر.

واتە: زۆر سەیرە یار زوڵفی وەك مار و ڕوخساری وەك ئاگری پێکەوە گونجاندووە؟! کێ دیویە مار و ئاگر پێکەوە هەڵکەن؟! یار ئاگری ڕاخستووە و کردوویە بە دۆشەکی مار!

طورڕەوو ڕووی دا (ف): طورڕەیی ڕووی دا. (ج): طورڕە لە دوویدا. ناری (کم): یاری. مار (کم) یار. هەڵەن. داخستووە بۆ (ڕ): وا خستووە. هەڵە و لەنگە. (کم، گم): ڕاخستووە بۆ. (غ): تاخستووە. هەڵەیە.

(٧) واتە: لە یاریی شێتانەی عیشقمدا وەك ئەو قومارچییەم کە بە دۆڕاوی و باخەڵی خاڵی و ئابڕووی تکاوەوە دەرچێ و مەجلیس بەجێ بهێڵێ! منیش لە دۆڕان زیاتر بەشم نابێ!

**بەری دا شانە بە دڵ، دامەنی زوڵف**
**شانی مەششاطە جودا بێ بە مشار (٨)**
**"سالم"، ئەر تووتییە، بێ قەندی لەبت**
**مات و مەبهووتە وەکوو بووتیمار (٩)**

(٨) مەشـشـاطە: ئەوەی ئافرەت دەرازێنێتەوە، کە شانەیشی دەکا. جودا: جیا.

واتە: شانە داوێنی ئەگریجەی لە دڵی هەژار بەردا، بە زۆری زۆرداری وای لێ کرد بەری بدا! خودایە شانەی شانەکەر بە مشار دوولەت بێ، وەك دڵی منی لە ئەگریجەی یار جیا کردەوە! بەری دا.

بەری دا (عا، ە، کم، گم): بەر بدا، یانێ ئەگەر بەر بدا.. تاد. (بێ) لە (غ)دا کەوتووە.

(٩) ئەم بەیتە لە (ە)دا نییە.

بووتیمار: باڵندەیەکە هەمیشە لە قەراغی ئاودا دەنیشێتەوە، وێڕای ئەوە کە تینوویەتی، لە ئاوەکە ناخواتەوە، دەڵێن -گوایە- نەبادا کەم ببێتەوە، هەمیشە مات و مەلوولە.

واتە: سالم ئەگەرچی تووتییە و هەق وایە بەکەیف بێ، بەڵام ئەو بێچارەیە بەبێ شەکری لێوت مات و کزە وەك بووتیمار. تووتی شەکری نەبێ، چی بکا؟!

تووتییە، بێقەندی (ڕ): تووتی بێ قەندی. لەنگە. مەبهووتە (ق): شێواوە.

## -١٥- (*)

لەناو زوڵفا بە ڕوو دڵداری مەستوور
دەسووتێنێ لە شەودا شەمعی کافوور (١)
بتی شیریندەهانی زوهرەچەشمم
دەبەخشێ نۆشێ نەحل و نێشی زەنبوور (٢)
ئەگەر حۆری لە جەننەت بێنە دونیا
نەظەر ناکەم مەگەر بۆ ڕوویی مەنظوور (٣)
لەبەرکا، گەر دڵم دیرعی تەهەمتەن
بە تیری غەمزە هەر ئیماتە مەنصوور (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، هـ، غ، ق، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەحزووف.

(١) واتە: دڵداری داپۆشراوی لە پەردە دەرنەهاتووم بە ڕووی ڕووناك و گەش و زوڵفی ڕەشی جوانیەوە، دەڵێی لە شەودا مۆمی کافووریی سپی دەسووتێنێ.

دڵداری (هـ، غ، کم، گم): دڵدارە.

(٢) زوهرە: یەکێکە لە ئەستێرە گەڕۆکە دیارییەکان کە زۆر جوانە و بۆ ئەوە دەشێ چاوی یاری پێ بشوبهێنرێ!

واتە: بتی شیریندەمی زوهرەچاوم بە دەم دەرمانی هەنگوینی هەیە، کە شیفای دەردە و بە چاو نێشی چزووی زەردەواڵەی هەیە، یانێ بە دەم دەرمانی دەردی عاشق دەکا و بە چاو پێوەی دەدا.

زوهرەچەشمم (کم): زوهرەچاوم. دەبەخشێ (کم، گم): دەبەستێ. نەحل (هـ): نەخل. (ڕ): گوڵ.

(٣) واتە: ئەگەر پەری لە بەهەشت بێتە دنیا، من یارمی پێ ناگۆڕمەوە و سەیری ناکەم، مەگەر بۆ ئەوە کە ڕەتی بکەمەوە و بڵێم نامەوێ.

بێنە. (هـ، کم، گم): بێتە. ڕەددی (هـ، ق): ڕوویی.

«ڕەددی مەنظوور» لە هەموو نوسخەکاندا «ڕووی مەنظوور»ە، تەنها لە (مان)دا شەددە لەسەر واوەکە نووسراوە، بەم جۆرە: «ڕوّی». ئەوە خستینیە سەر ئەو بیرە کە «ڕەددی» بێ، چونکە لێرەدا «ڕووی» واتای نیە و بۆ شوێنەکە ناشێ و شەددەیشی ناچێتە سەر، بە پێچەوانەی «ڕەدد»ەوە کە زۆر بۆ ئەم شوێنە گونجاوە.

(٤) دیرع: کراسی جەنگی زرێ. تەهەمتەن: ناساوی ڕۆستەمی زاڵە. ئیما: ئیشارە. ئیماتە: ئیشارەتە،

**لەبی تۆ بۆ تەبی من چارەسازە**
**بەڵێ، عونناب‌ە داروی دەردی مەحروور (٥)**
**بە کەس ناگا خەراجی هیندویی خاڵ**
**لە قەلعەی چینی زوڵفا بوو بە فەغفوور (٦)**
**بە حەسرەت دڵ، وەکوو نەی، دێتە ناڵین**
**لە لەبتا لەب، نەی‌ئاسا، گەر بکەم دوور (٧)**

ئیشارەی تۆ. مەنصوور: سەرکەوتوو.

واتە: دڵم ئەگەر زرێکراسی ڕۆستەمی زاڵیش بپۆشێ، هێشتا بەرگەی ئیشارە و غەمزە و نازی چاوی تۆ ناگرێ و هەر ئیشارەکەی تۆ سەردەکەوێ.

دڵم (کم، گم): زرە! تەهەمتەن (ڕ): هەنەمتەن. هەڵەیە. ئیماتە (ه، کم، گم): ئیمانە! مەنصوور (ق): مەنظوور.

(٥) تەب: تا. عونناب: داریکی دڕکاوییە، بەرەکەی لە زەیتوون دەچێ. چاکترین جۆری ئەوەیە کە سوور و شیرین بێ. لەوە دەچێ ئەم عونناب‌ە بۆ تادار باش بێ و تاکەی سووك بکا. داروو: دەرمان. مەحروور: تادار.

واتە: ماچی لێوی ئاڵی تۆ چاری تای من دەکا. بەڵێ، دەرمانی بنیادەمی تادار عونناب‌ە.

(بۆ) لە (عا)دا کەوتووە. لەبی تۆ بۆ تەبی من چارەسازە (ه): لەبی تۆ چارەسازە بۆ تەبی من. عونناب (گم): عەنناب.

(٦) ئەم بەیتە لە (ه، کم، گم)دا نییە.

فەغفوور: ناسناوی پادشایانی چین لای ئێرانییەکان.

واتە: خەراجی خاڵی ڕەشی یار بە کەس ناگا و کەس ناتوانێ خەراجی لێ بسێنێ، چونکە لە قەڵای چینی زوڵفدا بووەتە پادشا، کێ دەستی بەسەر پادشادا دەڕوا.

شایانی باسە، ئەگەرچی مەبەست لە (چین) چینی زوڵفە، بەڵام کۆکردنەوەی لەگەڵ فەغفووردا کە پادشای چینە، بە دیمەن تەناسوبێکی جوانە.

فەغفوور (ڕ): فەخفوور.

(٧) نەی‌ئاسا: وەك شمشاڵ. لەب: لێو.

واتە: لەو کاتەدا کە لێوم لەناو لێوتدایە، ئەگەر وەك حاڵی شمشاڵلێدان، نەختێ لێوم لە لێوت دوور بخەمەوە، دڵ لە خەفەتدا وەك نەی دەست بە ناڵە و هاوار دەکا. لێرەدا لێوی سالم لێوی ئاسایی

**دەبینێ هەر نەظەر "سالم" لە ڕووتا**
**هیلال و ئافتاب و لەیلی دەیجوور (٨)**

شمشاڵلێدەرە، لێوی یار لەباتی لێوی نەیە!

(٨) نەظەر: چاوپێکەوتن. هیلال: مانگی یەکشەوە. ئافتاب: هەتاو. دەیجوور: تاریک و ئەنگوستەچاو.

واتە: سالم لە هەر چاوپێکەوتنێکدا، کەوانی برۆ و هەتاوی ڕوومەت و شەوی تاریکی زوڵفت لە ڕوخساری جوانی تۆدا دەبینێ. ئەم بینینە هەموو جارێك دووبارە دەبێتەوە.

## (*) -١٦-

**به ڕووی ڕۆژا نووواندی، لەیلی دەیجوور**
**لە طوڕڕە و ڕوو بە مەجنوون، لەیلی مەستوور (١)**
**کەمەر هەردەم بە دوشنامم دەبەستێ**
**هووەیدایە نیشانەی نەحل و زەنبوور (٢)**
**دەزانم چۆنە، تا دڵ صەیدی عیشقە،**
**لەژێر چنگاڵی بازا حاڵی عوصفوور (٣)**
**لە وەصلا هەر کە یارم دی، شەوی تار**
**بەڵەد بووم داسْتانی مووسەوو طوور (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، غ، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەقسوور.

(١) واتە: لەیلای بە حەیا و حورمەتی کەس‌نەدیو، شەوی تاریك و ڕۆژی ڕووناکی لە زوڵف و ڕوخساریەوە پیشانی مەجنوون دا. دیارە ڕوخساری ڕۆژەکەیە و زوڵفیشی شەوی دەیجوور.

ڕۆژا (کم، گم): لەیلا. (ق): ڕۆژدا. لە گوڕڕە و (کم، گم) لە تەڕ و.

(٢) دوشنامم: مەبەستی دوژمنییە، جنێوە. هووەیدا: ئاشکرا. نەحل: هەنگ. زەنبوور: زەردەواڵە.

واتە: یار هەمیشە بە نیازی دوژمنایەتیم یا جنێوپێدانم کەمەری بەستووە، نیشانەی چزووی هەنگ و زەردەواڵە ئاشکرایە.

کەمەر (ق): مەگەر. نەحل و (کم، گم): نەحلی.

(٣) واتە: تا دڵم نێچیری عیشق بێ، دەزانم حاڵی چۆلەکە لەژێر چنگی بازدا چۆنە، چونکە دەردەدار حاڵی دەردەدار دەزانێ.

صەیدی (عا): صەدی. هەڵەی نووسینە.

(٤) تار: تاریك. داستان: سەرگوزەشتە، بەسەرهات.

واتە: کاتێ گەیشتن بە یار، کە ئاگرم تێبەربوو و سووتام، لە داستانی مووسا و سووتانی کێوی (طوور)ەوە تێگەیشتم، چۆن کێو بە کێویی خۆی بەرگەی دەرکەوتنی نووری خودایی نەگرت و سووتا. دیارە کە عیشق و ئەڤینی مەجازی ئەم ئاگر و سۆزەی بێ، دەبێ دەرکەوتنی نووری خودایی چۆن بێ؟!

شایانی باسە (مووسا و طوور) لەبەر ڕاگرتنی کێش بە (مووسەوو طوور) دەخوێنرێنەوە.

**تەحەرروكبەخشە بۆ شیریانی عیننین**
**بلوورینساقی وەك ماهیی سەقەنقوور (٥)**
**لە چاو بەختی سیاە و ڕۆژگارم**
**ڕوخی زەنگی دەبێتە عەینی کافوور (٦)**
**بە دوشمن بۆ نیشان دەم صوورەتی یار؟**
**بە هەدیە کێ دەبا ئایینە بۆ کوور؟ (٧)**
**بە دەردی شانە چێ سینەی لە چاکا**
**لە زوڵفا گەر دڵم مەششاطە کا دوور (٨)**

(٥) ئەم بەیتە هەر لە (عا، غ)دا هەیە.

تەحەرڕوكبەخشە: جووڵەبەخشە. شریان: خوێنبەر. عینین: شلەپەتە، کاری جینسی پێنەکراو. ساق: قاچ، لاق. سەقەنقوور: گیانەوەرێکی وەك توولەمارە، لە جێی گەرم و فێنك دەژی.

واتە: لاقی بلووڕینی سپیی وەك ماسیی سەقەنقوور، مایەی جووڵە و بزووتنە بۆ دەماری خوێنبەری کەسی شلەپەتەی کاری جینسی پێنەکراو.

تەحەرروكبەخشە (غ): تەحەرروكبەختە. هەڵەیە.

(٦) ئەم بەیتە لە (غ)دا شەشەمە.

واتە: بەخت و ڕۆژگارم ئەوەندە ڕەشن، ڕوومەتی زەنگیی ڕەشپێست لە چاویدا وەك کافوور سپییە.

ڕۆزگارم (کم، گم): ڕۆژگارم.

(٧) کوور: کوێر.

واتە: بۆچی وێنەی درەخشانی یارم پیشانی ڕەقیب بدەم؟ ڕەقیب لە عاستی ڕاستیدا کوێرە! کێ ئاوێنە بە دیاری بۆ کوێر دەبا؟ ڕەقیب لەکوێ دەتوانێ وێنەی یار ببینێ؟

بە دوشمن.. تاد (عا): بە دوشمن کەی نیشان دەم صوورەتی تۆ. (کم، گم): بە دوژمن کەی نیشانەی دەم صوورەتی تۆ. (ق): بە دوشمن چۆن نیشان دەم صوورەتی تۆ. بە هەدیە (کم): هەدیە. لەنگە.

(٨) چاك: لەتلەتبوو. مەششاطە: شانەکەر و ئارایشدەری جوانان. کا: بکا.

واتە: ئەگەر شانەکەر، کاتی شانەکردنی زوڵفی یار، دڵم لە زوڵفی دوور بخاتەوە، خودایە سینەی بە دەردی ددانەکانی شانە چێ و پارچەپارچە بێ.

**به زۆر، ئەی چەرخ!، ئەگەر "بەهرامی گوورِ"م**
**دەکەی قەبری منیش بازیگەهی گوورِ (٩)**
**لە صیدقا وەصلە بۆ "سالم"، فیراقت**
**بە دڵ نەزدیکە دایم، گەر بە تەن دوور (١٠)**

(بە دەردی شانە جێ) لە (مان)دا هەڵەیە و (بە دەردی شانە چێ) ڕاستە. سینەی. (گم): سینە.

(٩) گوورِ: کەری کێوی، بارامی گوور بە ڕاوی کەری کێوی ناووبانگی دەرکردووە. بازیگەه: شوێنی یاری، یاریگە.

واتە: ئەی چەرخی بێبار! ئەگەر من ئێستا بە زۆر و توانایی وەك بارامی گوور ئازا و ڕاوچی و دەستڕاست بم، ڕۆژێ دێ گۆڕەکەی منیش وەك هیی خەڵکیتر دەکەیتە شوێنی یاری و ڕمبازیی گوورِ! کە ئەوسا بە زیندوویی ڕاوم دەکرد!

ئەگەر (کم، گم) وەکو. لە (عا)دا کەوتووە. بەهرامی گوورِم (ق): بەهرامی گوورِی. قەبری (کم، گم): کۆیی. (عا، غ): گۆڕی. بازیگەهی گوورِ (گم): بازیگەهی دوور.

(١٠) صیدق: ڕاستگۆیی. وەصڵ: بەیەك‌گەیشتن. تەن: جەستە.

واتە: سالم ئەوەندە لەگەڵ تۆ ڕاست و بەئەمەکە، جیاییشت لای ئەو بەیەك‌گەیشتنە. ئەگەرچی بە لەش لێت دوورە، بەڵام بە دڵ لێتەوە نزیکە و لێت جیا نابێتەوە، هەمیشە لە حاڵوباری گەیشتن بە تۆدایە.

## (*) -١٧-

**هەر شەو کە ماهْتابی ڕوخت دەرکەوێ لە دوور**
**کولبەی دڵم لە تیرەگییا پڕ دەبێ لە نوور (١)**
**تا مەحرەمم بە بەزمی ویصالت لە خەڵوەتا**
**ناکەم هەوایی قەصری بەهەشت و لیقایی حوور (٢)**
**بێئیعتیبارە مەردوم، ئەگەر ماڵ و یەد نەبێ**
**«وا حسرتا»، نە قووەتی زەڕ ما، نە دەستی زوور (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، ف، غ، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: موزاریعی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور.

(١) ماهتاب: ڕووناکی و تاوی مانگ. کولبە: کاولە، وێرانە. تیرەگی: تاریکی.

واتە: هەر شەوێك ڕووناکیی مانگی ڕوخسارت لە دوور دەرکەوێ، وێرانەی تاریك و نوتەکی دڵم پڕ دەبێ لە ڕۆشنایی.

لە تیرەگییا (ق): لە تیرەگیدا.

(٢) واتە: تا لە حاڵی تەنیایی خۆمدا لەگەڵ خەیاڵی گەیشتن بە یار بم، یا تا بە جووتە لەگەڵ یار بم و لە خەڵوەتدا بین، هەرگیز ئارەزووی کۆشکی بەهەشت و گەیشتن بە حۆری ناکەم. بەڵام باری یەکەم بەهێزترە.

قەصری (گم): باغی. لە (کم)دا کەوتووە.

(٣) ئەم بەیتە لە (ق)دا نییە.

بێئیعتیبار: بێنرخ. یەد: دەسەڵات و زۆر. «وا حسرتا»: دەستەواژەیەکی فارسییە، بە داخەوە.

واتە: بنیادەم لەم ڕۆژەدا کە پارەی نەبێ و دەستی نەڕوا، بێنرخە و بە هیچی دانانێن. داخەکەم منیش نە هێزی پارە و پووڵم ماوە و نە زۆر و دەسەڵات.

ماڵ و یەد نەبێ (کم، گم): ماڵی وێ نەبێ، واتە ماڵی لەگەڵ نەبێ. قەت «وێ» لە زمانی شیعریی "سالم"دا نەبینراوە. سەرەڕای ئەوە، دوو شتی لە نیوەی یەکەمدا باس کردووە کە لە نیوەی دووەمدا هەردووی نەفی کردوون. کەچی بە حیسابی (کم، گم) لە نیوەی یەکەمدا یەك شت و لە نیوەی دووەمدا دوو شت!

یەد (کم): وێ.

**دڵ، گەر بکا شیکایەتی تیری نیگاهی تۆ**
**ناکا کەسێ حیکایەتی بەهرام و صەیدی گووڕ (٤)**
**وەك (ظەڵم)ە ئەشکی دیدەیی تارم لە ظوڵمی چەرخ**
**هەردەم بکەم لە کونجی غەما یادی (شەهرەزوور) (٥)**
**شوێنی خەدەنگی غەمزەیی تۆ، بوو بە جێی طەواف**
**(نارین)قەڵایی دڵ بە شەرەف گەییە (میری سوور) (٦)**
**ئەمجار ئەگەر لە طەعنەیی ناصیح دەبم خەڵاص،**
**ناکەم ئەبەد ڕەفاقەتی ئینسانی بێشوعوور (٧)**

(٤) ئەم بەیتە لـە (حا)دا شەشەمە.

واتە: ئەگەر دڵ شکاتی تیری چاوی تۆ بکا، کە چۆنی دەپێکی و گورج لێی دێتە دەست، کەس حیکایەتی ڕاوی بەهرام و گووڕی نێچیری ناکا. ئەو لـە چاوی ئەمدا هیچ نانوێنێ و بۆ باس‌کردن ناشێ.

دڵ، گەر (ق): دڵ کە. صـەیدی (کم): سیدی = سـەیدی.

(٥) ئەم بەیتە لـە (حا)دا چوارەمە.

ظەڵم: زەڵم، سەرچاوە و تاڤگەیەکی جوانە لای ژووورووی دێی زەڵم، کە سەر بە ناحیەی خورماڵە لـە ناوچەی هەڵەبجە. ئەشك: فرمێسك. تار: تاریك. هەردەم: هەر کات.

واتە: هەر کات لـە خەڵوەتخانەی خەم و تەنیاییدا یادی (شارەزوور) بکەم، دوو دیدەی لێڵ و تاریکم لەدەست ستەم و سزای چەرخی ڕۆژگار وەك سەرچاوەی زەڵم فرمێسك دەڕێژن.

ظوڵمی (حا): زوڵمی. بکەم (کم، گم): دەکەم.

(٦) خەدەنگ: تیر. نارینقەڵا: قەڵایەکی بچووکی ناوەڕاست کە چەند قەڵایەکیتری بە دەورەوە بێ، یان ڕەنگە قەڵایەکی بە هەمان ناوەوەی شاخی (دمدم)ی سەردەمی "خانی لـەپ زێڕین" بێ. میری سوور: شەخس و زیارەتگایەکی دیارییە لـە شارەزوور، وەك هەموو زیارەتگاکانیتر شێت و نەخۆشیان دەبردە سەر بۆ چاکبوونەوە!!

واتە: شوێن و نیشانی تیری نازی چاوت، کە دڵمە، بەهۆی موبارەکیی تیری چاوی تۆوە، بووەتە زیارەتگای خەڵك. قەڵای (نارین)ی دڵم لـە شەرەف و ناو و شۆرەتدا گەیشتووەتە پایەی (میری سوور)، کە نەخۆش و دەردەداران بۆ چاکبوونەوە دەچنە سەری و زیارەتی دەکەن!

تۆ بوو بە جێی (ق): تۆیە لـە جێی. نارینقەڵایی (ق): تا بن قەڵایی.

(٧) ئەم بەیتە لـە (حا)دا نییە.

**"سالم!" نەکەی لە شەوکەتی مونعیم نەظەر بە غەم**
**نادەم پەلاسی کوهنەیی فەقرم بە صەد سەموور (٨)**

واتە: ئەگەر ئەمجارە لە تانە و تەشەری کەسانی بە ناو ئامۆژگاریکەر ڕزگار ببم، ئیتر هەرگیز هاوڕێیەتیی بنیادەمی هەستبەهیچنەکردوو ناکەم، تا بە ئامۆژگارییە هیچوپووچەکانیان دامگرنەوە.

ناصیح (گم): ئەغیار.

(٨) مونعیم: مەبەستی خاوەنڕۆزی و دارایە. سەموور: سووککراوی (سەموورە)یە، کە لە کوردیدا (سمۆرە)ی پێ دەڵێن، مەبەست پێستە جوانەکەیەتی کە لە جوانکردنی جلوبەرگدا بەکاردەهێنرێ.

واتە: سالم! بە خەم و خەفەتەوە سەیری ناز و نیعمەتی دەسەڵاتداران مەکە، من بەرگی پەلاسی زبری کۆنەی خۆم نادەم بە سەد بەرگی بە پێستی سمۆرە ڕازاوە.

شەوکەتی (ف): شەوکەت و. کوهنەیی (کم، گم): کۆنەیی.

## (*) -١٨-

**ڕافیضی شیعەن، لە هەردوولا، نەزان و بێخەبەر**
**موعجیزەی صیددیقە بوڕڕا، هەر وەکوو دوڕڕەی عومەر (١)**
**یا عەلی! خۆ تۆ دەزانی داسْتانی غار و مار**
**جوهد و صیدق و پاکیی صیددیقی ئەکبەر سەربەسەر (٢)**
**موجتەهید! تۆ ڕوخصەتی ئیفکی حومەیرا بۆ دەدەی؟**
**کێ دەکا توهمەت بە زەوجەی سەییدی «فخر البشر»؟ (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، هـ، غ، ق، گم)دا هەیە، ناسناوی سالمیش دیار نییە. لەوانەیە لە نێران دایناب‌ێ و نەیویستب‌ێ ناوی خۆی بهێنێ؛ یاخۆ لەبەرئەوەیە -وەك لەمەوپێش باس کراوە- لە شیعری داشۆریندا کەمتر ناوی خۆی هێناوە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) بوڕڕا: بڕندە. دوڕڕە: عەصاکەی حەزرەتی عومەر (د.خ).

واتە: ڕافیزی و شیعە -لە ڕاستیدا- لە دوو شت بێئاگان: یەکەم موعجیزەی ئەبووبەکری صیددیق (د.خ) کە بەبڕشت بووە، دووەم عەصاکەی عومەر کە دروشمی ڕاستی و دادپەروەری بووە. دیارە ئەبووبەکر موعجیزەی نەبووە، موعجیزە هەر هی پێغەمبەرانە (د.خ)، ئەڵبەت مەبەستی ئەو پایە بەرزەیەتی کە لای حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) بوویەتی. مەبەستیش لە دوڕڕەکەی عومەر حوکمی عادیلانەیەتی کە لەگەڵ زەبروزەنگی پێویست بووە. ڕافیضی شیعەن، بەدوور نازانرێ (ڕافیضی و شیعەن) بووبێ کە لە هی (مان)یش جوانترە.

ڕافیضی(هـ): ڕافیضی و. بوڕڕا، هەروەکوو دوڕڕەی عومەر (ق): ئاخر تا بەشی تیغی عومەر.

(٢) داستان: حیکایەت و بەسەرهات. غار: مەبەستی (ئەشکەوتی ثەور)ە، شاخێکی مەککەی پیرۆز کە حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) شەوی کۆچ لەگەڵ "ئەبووبەکری صیددیق" خۆیان تێدا شاردەوە و مارەکە بە قاچی ئەبووبەکرەوەی دا. جوهد: ڕەنج. صیدق: ڕاستگۆیی.

واتە: ئەی عەلی! خۆ تۆ خۆت بەسەرهاتی ئەشکەوتی ثەور و شەوی کۆچ و مارەکە باش دەزانی، خۆت لە جێنوێنی پێغەمبەردا خەوتبووی بۆ سەرشێواندن لە کافران. هەروەها ئاگاداری ڕاستگۆیی و ڕەنجی ئەبووبەکری لە پێناوی ئیسلامدا، ئاگاداری چ هاوڕێیەکی بەڕێز و بەقەدری پێغەمبەر بوو (د.خ).

صیدق و پاکیی (هـ): صیق و خدمەتی. (گم): صیدقی خدمەتی.

(٣) موجتەهید: ناسناوی زانایانی ئاینیی گەورەی شیعەیە. ئیفك: بوختان. حومەیراء: ناسناوی

**ڕەنجشی عوثمانە بۆ تۆ، ڕەنجشی شێری خودا**
**تۆ بە یادی باغی جەننەت! مەنزڵت ناری سەقەر (٤)**
**فەرقی "فارووق" و "شەمر" ناکا، نەزانی ڕافیضی**
**حەشری شەمر و ئەو لەگەڵ یەك کا، خودایی دادگەر (٥)**
**کەی "عەلی" ڕوخصەت دەدا کەس بەد بە یارانی بڵێ؟**
**عالمی ناعالمی شیعەن، حەقیقەت، میثلی کەر (٦)**

حەزرەتی عائیشەی حەرەمی حەزرەتە (د. خ).

واتە: ئەی موجتەهید، تۆ چۆن ڕێی ئەوە دەدەی بوختان بۆ عائیشەی حومەیرا هەڵبەستێ؟ کێ بوختان بۆ خێزانی پێغەمبەر (د. خ) هەڵدەبەستێ؟!

دەدەی (غا): ئەدەی. حومەیرا (گم): ... . کێ دەکا (گم): تا بکا.

(٤) ڕەنجش: دڵڕەنجان. بە یادی: لە بیری.

واتە: دڵڕەنجاندنی عوسمان و قسەپێوتنی، وەك دڵڕەنجاندنی عەلیی شێری خودایە. تۆ لە بیر و یادی بەهەشتدای و بە تەمای دەستت بکەوێ، بەڵام شوێنی تۆ ئاگری دۆزەخ دەبێ.

تۆ بە یادی (گم): تۆ کوجادو. دیارە (تۆ کوجاوو) بووە کە زۆر جوانە، واتە: تۆ لە کوێ و باغی بەهەشت لە کوێ! جێی تۆ ئاگری دۆزەخە. لە کوردیدا دەوترێ: ((تۆ و فلانەشت کوجا مەرحەبا؟)).

(٥) ئەم بەیتە لە (ق)دا شەشەمە.

شەمر: شەمری (ذي الجوشن) کە سەری حەزرەتی حوسەینی کوڕی حەزرەتی عەلیی بڕی. کا: بکا.

واتە: ڕافیزی فەرقی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب و شەمری دەستخوێناوی ناکا. خودای دادپەروەر حەشری ڕافیزی و شەمر لەگەڵ یەك دەکا.

هەردوو (شمر) (گم): شبر.

(٦) ئەم بەیتە لە (ق)دا پێنجەمە.

واتە: عەلیی کوڕی ئەبووتالیب ماوەی نەداوە کەس قسەی بەرز و نزم بە یارانیتری خەلیفەی موسوڵمانان بڵێ. کردەوەی نەزانانەی وا —لە ڕاستیدا— هیی زانایانی نازانای شیعەیە.

شیعەن (ق): شیعەی. (گم): ... . کەر (گم): ... .

## "موصطەفا" مەرکەزشناس و "مورتەضا" ڕاضی لە یار
## شیعە کوا بەهرەی لە ڕەفدا، غەیری عیصیان و ضەرەر؟ (٧)

(٧) ڕەف: جنێودان بە هاوڕێیانی پێغەمبەر (د.خ). دوور نییە نەسڵەکەی (ڕەفض) بووبێ، واتە ڕازی‌نەبوون لە خەلیفە و هاوڕێیانی پێغەمبەر (د.خ).

واتە: پێغەمبەر (د.خ) پایەناسە و پلە و پایەی یارانی خۆی دەزانێ، عەلیی مورتەزایش لە یاری غاری پێغەمبەر ڕازییە، ئیتر شیعە لەم جنێودانە، جگە لە زیان، چ سوودێکیان دەست دەکەوێ؟

شیعە کوا بەهرەی (گم): کوانێ بەهرەی دی. لە ڕەفدا (ق): لە ڕەفعا.

(*) -١٩-

**بەدڵ وەختی نیگەهـ موژگانی دڵبەر**
**دەکا کاری سینانی طووسی نەوزەر (١)**
**سەوادی چینی زوڵفت، وەك شەوی تار**
**بەیاضی عاریضت، وەك ماهی ئەنوەر (٢)**
**هەتا تۆ دەرنەخەی وەختی سەحەر، ڕوو**
**طولووع ناکا لە مەشریق، شەمسی خاوەر (٣)**
**بە ڕەنگی دڵبەرم تەحقیقە، ئیتر**
**عەقیمە مادەری دونیا لە دوختەر (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، هـ، غ، ق، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) نیگەهـ: تەماشا. سینان: سەری تیر. طووسی نەوزەر: پاڵەوانێکی کۆنی ئێران و لە ڕیزی پاڵەوانە نەمرەکان بووە. پلەی سپەهبودی لە دەرباری کاوس و کەیقوباد و کەیخوسرەودا هەبووە و داوای تاج و تەختی کردووە.

واتە: تیربارانی برژانگی تیژی دڵبەر لە کاتی ڕوانیندا، کاری سەرەتیری تووسی نەوزەر لە دڵی مندا دەکا.

وەختی (هـ): وەقتی. دەکا (کم): ئەکا.

(٢) ئەم بەیتە لە (حا، هـ، کم)دا نییە.

عاریض: ڕوخسـار.

واتە: ڕەشیی چینچینی زوڵفت وەك شەوی تاریکە، سپێتیی ڕوخسارت وەك ڕووناکیی مانگی ورشەدارە.

(٣) خاوەر: ڕۆژهەڵات.

واتە: تا تۆ سبەینێیان ڕوومەتت دەرنەخەی، هەتاو لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵنایێ، یانێ ڕوخساری تۆ خۆرە.

تۆ دەرنەخەی (کم، گم): ئەو دەرنەخا.

(٤) ڕەنگی: بە وێنەی، چەشنی. عەقیم: نەزۆك. مادەر: دایك. دوختەر: کچ.

واتە: لە ڕەنگوڕووی یارمەوە ساغ بووەتەوە کە ئیتر دنیا کچێکیتری وەك یار ناخاتەوە.

بە ڕەنگی (عا) بە میثلی.

**موژەت بۆ دڵ دەپرژێ، گاهی ئیما**
**وەکوو پەروازی شاهێن بۆ کەبووتەر (٥)**
**فەریبی قەرضی بۆسەم دەی لە دونیا**
**یەخەت دەگرم لە بەر دیوانی مەحشەر (٦)**
**لە موژگان و برۆ کێشاویە چاوت**
**بەرابەر بۆ دڵم، شەمشێر و خەنجەر (٧)**
**مەکە تەقریری عیلم و فەضلی "سالم"،**
**بە ئاوی عیشقی تۆ شوشتوویە دەفتەر (٨)**

(٥) دەپرژێ: بڵاودەبێتەوە و دەپژێ. گاه: کات. ئیما: مەبەست ئیشارە بە چاوە. پەرواز: فڕین، باڵگرتنەوە. شاهێن: باز. کەبوتەر: کۆتر.

واتە: برژانگت لە کاتی تەماشاکردندا پەرش‌وبڵاو دەبێتەوە، وەك باڵگرتنەوەی باز و داپەڕینی بۆ گرتنی کۆتری بێچارە، هەر یەکە لە لایەك کار دەکاتە دڵ.

دەپرژێ (کم، گم): دەڕێژێ. گاهی (ڕ، کم، گم): وەختی. شاهێن (ق): شەهێن.

(٦) فەریب: فریو، خەڵەتاندن. بۆسە: ماچ.

واتە: ئەگەر لە دنیادا بمخەڵەتێنی و دەستی‌دەستیم پێ بکەی و ئەو ماچە قەرزەی کە لاتە نەمدەیتەوە، لە دیوانی ڕۆژی حەشردا یەخەت دەگرم و حەقی خۆمت لێ دەسێنمەوە.

بۆسەم (ه): بۆسەی. دەگرم (ه): دەگرێ. (کم، گم): ئەگرم.

(٧) ئەم بەیتە لە (ق)دا نییە.

واتە: یار برژانگ و برۆی وەك خەنجەر و شمشێر بۆ دەرکێشاوم.

برۆ (ه): برۆت.

(٨) واتە: باسی زانایی و هونەری "سالم" مەکە، چونکە دەفتەری خوێندەواری و زانایی بە ئاوی عیشقی تۆ شۆردووەتەوە و هیچی تێدا نەهێشتووەتەوە.

مەکە (ق): مەگەر. عیشقی تۆ (عا): عیشقی، (تۆ) لەم نوسخەیەدا کەوتووە.

## -٢٠- (*)

## (در وصف میرزای سنندجی
## یعنی عبدالله بیگ حواشی)

**موو لە تەنما، باز لە قەهرا، بوو بە نووکی نێشتەر**
**دڵ لە سینەمدا دەسووتێ هەروەکوو شەمعی فەنەر (١)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، عا، غ، نم)دا هەیە.

سەرناوی پارچەکە لە (مان، ن)دا: ((در وصف میرزای سنندجی))یە، واتە: ئەم پارچەشیعرە لە وەسفی میرزای سنەیی دەدوێ. هەر لەژێر ئەم سەرناوەیشدا نووسراوە: ((یعنی عبدالله بیگ حواشی))، کە مەبەست لەم میرزای سنەییە "عەبدوڵڵا بەگ"ە. ئیتر نازانین ئاخۆ نووسەرەوەی دیوانەکە مەبەستی لەم وشەی (حواشی)یە ئەوەیە بڵێ: ئەم "یعنی عبدالله بیگ"ە لە پەراوێزی دەستنووسەکەی بەردەستمدا نووسراوە، یاخۆ حەواشی سیفەتی عەبدوڵڵا بەگە؟ هەروەها لە نوسخەکەی (عا)دا لە پێش پارچەکەدا نووسراوە: ((هجویات است در حالت جهل و نادانی انشا شدەاست استغفر الله))، واتە: ئەم پارچە داشۆرینبابەتە لە کاتی نەفامی و نەزانیدا دانراوە، داوای لێبوردن دەکەم لە خودا. بە دووری نازانین ئەوە قسەی "سالم" خۆی بێ. وا دیارە سالم ئەگەرچی شیعری داشۆرینی وتووە، بەڵام حەزی نەکردووە ناوی خۆیی پێوە بنێ. هەر بۆیە ناسناوی "سالم"، لە زۆربەی شیعرە داشۆرینبابەتەکانیدا -کە ئەم پارچەیەیش یەکێکیانە- نییە. "پیرەمێرد"یش کە ئەم پارچەشیعرەی لە (ژ٩٣١، ١٩٤٨/٨/١٩، ل٣)ی رۆژنامەی "ژین"دا بڵاوکردووەتەوە، نووسیویە: ((هەجووی میرزا عەبدوڵڵا کە مەشهوورە بە "شوتورمورغ")).

کێشی عەرووز: رەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) تەن: لەش. باز: دیسان. دیارە ئەم میرزایە ئەمە یەکەمجاری نییە سالمی توورە کردووە، ئەمجارەیش رقی هەڵساندووە، بۆیە وشەی (باز)ی، بە واتای (دیسان)، لە سەرەتای پارچەکەوە وتووە.

واتە: دیسان هەرچی مووی لەشم هەیە لە رقاندا وەك نەشتەر راست بووەتەوە و تیژ و بەکارە، هەروەها دڵم لە سینەمدا دەسووتێ وەك مۆمی ناو شووشە.

دەسووتێ (نم): ئەسووتێ.

**تۆ سەراسەر پەشم و ڕیشی خۆت لە ئاگر بۆ دەخەی؟**
**«الحذر»، خۆت دوورگرە، سووتای، بڕۆ هەی بێخەبەر! (٢)**
**شاوەتەن، لەقلەقخەرام، گەردەنسەقاقوش، سەرزەغەن**
**سابرێنڕیش، ناقەزانوو، پێشوتورمورغ، عەقڵکەر! (٣)**
**گوربەخوو، ژیشکبەدەن، سووچەڕمەکان، ڕەوتکەمتیار**
**لووتچەکوش، موو پڕ شیپیش، پاپاخچەپیش، ڕەنگجانەوەر (٤)**

(٢) الحذر: خۆت بپارێزە، وریا بە.

واتە: تۆ پیاوی ئەوە نیت بەرامبەری لەگەڵ من بکەی، کەواتە بۆ هەرچی ڕیشی وەك خـوریت هـەیە، دەخـەیتە ئاگری قینی منەوە؟ وەرە، پیاوی چـاك بە، خۆت دوور بـخەرەوە. هـەی بێئاگا، وا سووتای! شایانی باسە، دەبوو (پەشمی ڕیشی) یا (پەشم ڕیش)ی بوتایە، نەك پەشم و ڕیش، چونکە هەردووکیان هەر ڕیشـەکەن.

تۆ سـەراسەر (عا، غ): تۆ سـەراپا. (نم): ناسزا تۆ. سووتای (نم): سووتابی. هەڵەیە.

(٣) شاوەتەن: شاوە مەلێکی کەوەلەی قاچ و مل درێژی لەدەم ئاودا ژیاوە، شاهۆ، شینەشاهۆ. لەش وەك لەشی شـاوە. خەرام: لەنجە. سەقاقوش: باڵندەیەکی ئاوییە، دوور نییە (سەقاکێش) بێ، یانێ ئەوانەی ئاو دەکێشن بۆ خەڵك، کە بەپێی ئیشەکەیان ملیان درێژ دەبێ! زەغەن: کۆلارە، بازێکی چکۆلـەی کلك-دووفلیقانەی چابوکی ڕاوکەری مشك و جرج و باڵندەی بچووك. سابرێن: نێری بزن. ناقە: وشتر. زانوو: ئەژنۆ. شوتورمورغ: وشترمر، کە بە باڵ باڵندەیە و بە قاچ و ملی درێژ و ناقۆڵا وشترە.

واتە: لـەشی میرزا وەك لـەشی بەرازە، لەنجەی وەك لـەنجەی لەقلەقە، گەردنی وەك سەقاقوش درێژە، سەری وەك سـەری کۆلارەیە، ڕیش دووفلیقانە وەك ڕیشی سابرێن، ئەژنۆ دەرپەڕیو وەك ئەژنۆی وشتر، پێ وەك پێی وشترمر، نە هیی باڵندەیە و نە هیی وشتر، خۆ هیی ئینسانیش هەر نییە، وەك گوێدرێژ بێمێشکە.

سابرێن ڕیش (نم): سابرێن. هەڵە و لەنگە.

(٤) تەنها چوار بەیتی ئەم پارچەشیعرە لـە نوسـخەی (غ)دا هەیە.

گوربە: پشیلـە. سـووچەڕ: سیخوڕ، گیانەوەرێکی لـە تۆخمی ژیشك و لـەو گەورەترە. شـپیش: ئەسپێ. پاپاخ: سەر و کڵاو. چەپیش: سابرێنی یەكساڵە.

واتە: وەك پشیلـە سپڵەیە، زبرە وەك ژیشك، لانەی وەك هیی سووچەڕ کونەبەرد و تەنگەڵانە، ڕەوتی وەك ڕەوتی کەمتیارە، لووتی چەکوشی ناقۆڵایە، موو پڕ لـە ئەسپێ و چلکن و سـەر سابرێن و

**موورخەصڵەت، شێرهەیبەت، پەششەقووەت، پیل‌تەن**
**سەرخەڕەك، بەردووخ‌موو و ناخوون‌وەلادە، گوێ‌سیپەر (٥)**
**ئوشتورئاسا وەك چەنگچیی عووج كە دێ وەختی نەهار**
**ئاسمان بۆ مەجمەعەی مەجلیس دەنێتە تەوقی سەر (٦)**
**ئیمتیحانت چۆن بكەم؟ گەز نابێ ئەندازەی قەدت!**
**سەر لە خایەت ناسوێ، پۆپەی چناری (ماسیدەر) (٧)**
**فەرعی تۆ -ئەصڵەن - حەقیقەت صولب و ڕەحمی كەس نییە**
**ڕاستی واتە كە تۆ جینسی منارەی، نەك بەشەر (٨)**

بە ڕەنگ جانەوەرە.

پاپاخ (ن): پاپا. هەڵەی نووسینە.

(٥) ئەم بەیتە لە (نم)دا چوارەمە.

موور: مێروولە. پەششە: مێشوولە. پیل: فیل. تەن: لاشە. وەلالە: مانای بۆ نەبینرایەوە، دەبێ (وەلادە) بێ بە مانای سەرەتەشی كە بە عەرەبی پێی دەڵێن فولكە و بۆ ئێرە دەگونجێ. سیپەر: قەڵغان.

واتە: بێ‌هێزە وەك مێشوولە، لەش قەبەیە وەك فیل، سەری خەڕەكە، مووی سەری بەردووخە، نینۆكی سەرەتەشییە، گوێی وەك قەڵغان پانە.

(٦) ئەم بەیتە لە (نم)دا نییە.

وشترئاسا: وەك وشتر. چەنگچی: چەنگ‌لێدەر. نەهار: فراوین، نانی نیوەڕۆ. مەجمەعە: سینی.

پوختەی واتا: ئەم زەلامە كە بەقەد عووجی كوڕی عەنەق درێژە، وەك وشتر ناقۆڵایە، كاتی نانخواردنی نیوەڕۆ كە نان بۆ میوان دەبا، ئاسمان وەك سینی لەسەر تەوقەسەری هەڵدەگرێ و دەیباتە مەجلیس!

تەوقی (مان، ن): طەوق.

(٧) گەز نابێ: گەز ناكرێ، ناپێورێ. خایە: هێلكە. لێرە مەبەست هێلكەگونە. ماسیدەر: دێیەكی لای چەمی (شلێر)ی ناوچەی پێنجوێنە، لەوانەیە لەو سەردەمەدا بە دارچناری زۆر بەرز بەناووبانگ بووبێ. ناوچەی (مەریوان)یش دێیەكی بەو ناوەوە لێیە.

واتە: چۆن درێژیت تاقی بكەمەوە؟! بۆم ناپێورێ تا بزانم چەند گەزیت، تێكڕا پۆپەی چناری ماسیدەر ناگاتە هێلكەگونت و لێی ناسوێ!!

گەز نابێ (عا): گەز ناكرێ، یانێ ناپێورێ. (نم): گەر ناگری.

(٨) واتە: لــق‌وپۆپی وەچــەی تۆ وەك تۆ پشــتی هیچ پیاوێك و بەری هیچ ئــافرەتێك نابێتە ئەسڵی.

**خۆ لەبەر طوولی درێژی زۆر ضەرەرتە، گەر بنووی**
**دەست لە سمتت خەن لە بەغدا، لێرە نابی باخەبەر (٩)**
**ئەهلی ئەم ئەییامە نیی، تەحقیق، بە قووچیی قامەتت**
**گەر بە تەرکیبت حیساب کەم: بابە عووج و تۆ پوسەر (١٠)**
**بەسیەسی میرزا! بوەخشە، ناوێژم ئیتر هەجوو**
**نەقدی لەهوم دا بە جینسی سەهۆی ذیللەت، سەربەسەر (١١)**

ڕاستییەکەی ئەوەیە کە تۆ لە بابەتی منارەی، نەك بنیادەم.

واتە (نم): وایە.

(٩) واتە: ئەوەندە درێژی، زیان دەکەی بخەوی، ئەگەر لە بەغدا دەست لە سمتت بخەن، لێرە خەبەرت نابێتەوە.

ضەرەرتە (عا): صندنە. هەڵەیە.

(١٠) ئەم بەیتە لە (نم)دا نییە.

نیی: نیت.

واتە: تۆ بەڕاستی لە قووچیی باڵاتەوە دەردەکەوێ ئەهلی ئەم زەمانە نیت، بەڵکوو لە بنیادەمە کۆنەکانی کە زۆر کەتە و ناقۆڵا بوون. ئەگەر درێژی و ناقۆڵاییی لەشت لێك‌بدەمەوە، عووجی کوڕی عەنەق باوکە و تۆ کوڕیتی!

(١١) بەسیەسی: بەسیەتی. بوەخشە: ببەخشە، ببوورە. ناوێژم: ناڵێم. ئەو سێ زاراوەیە هیی ناوچەی سنە و دەورووبەرینی. هەجوو: داشۆرین.

واتە: من کارێکی نارەوام کرد، سەربەسەر -بێزیادوکەم- پارەی گاڵتەم دا بە قوماشی بێئاگایی، کە یەك لە یەك نابەجێترە!

بوەخشە (نم): بوخستە. هەڵەیە. ناوێژم (نم): ناوێژ. هەڵەیە.

## -٢١- (*)

**له ذیکری ئالەتی یاری قەلەندەر**
**لە ئەفکارم دەکەم، فیکرێکی بەرتەر (١)**
**دەکا گورزی گرانوەزنی لە ڕەوتا**
**زەمین، جێ جێ، لە بەردەمیا موجەددەر (٢)**
**لەناو دەریایی طوممانا، عەموودی**
**نەهەنگئاسا لە هەنگاوی شەناوەر (٣)**
**بەبێ دەرپێ، ئەگەر بێ سوویی صەحرا**
**لە شەش فەرسەخ دەبینن، میلی ئەحمەر! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە داشۆرینبابەتەیش هەر لە (مان، عا، ن)دا هەیە. ناوونیشانەکەی لە (مان، ن)دا ((ایضا بجهت درویش آغا))یە، یانێ دووبارە دەربارەی دەروێش ئاغا، بۆیە (ایضاً)ی نووسیوە، چونکە هەر لەم نوسخەیەدا ڕاستەوخۆ پێش ئەم پارچەیە پارچەیەکیتریش نووسراوە، باسی زەفافی دەروێش ئاغا دەکا، بەڵام لە پێتی (ی)یە. لە (عا)یشدا نووسراوە ((ایضا وصف ثانی)) واتە: دووبارە وەسفێکی دووەمی دەروێش ئاغا.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەحزووف.

(١) قەلەندەر: ڕەند، دەروێش، ئاغا ناوی دەروێشە، یانێ: دێوانە و وازلەدنیاهێناو. بەرتەر: پێشتر.

واتە: لە باسی دەعباکەی قەلەندەری برادەرماندا، بیرێکی پێشتر دەخەینە کار.

(٢) لە ڕەوتا: لە ڕۆیشتندا. موجەددەر: ئاوڵاوی، کە جێی ئاوڵەکە چاڵ دەبێ.

واتە: گورزی قورس و گرانوەزنی دەروێش لە کاتی ڕۆیشتندا جێجێ لە زەوی دەدا و چاڵی دەکا.

لە ڕەوتا (ن): لە ڕەوتە. هەڵەیە.

(٣) طوممان: تەومان، ژێردەرپێ. عەموود: مەبەستی دەعباکەی دەروێش ئاغایە. نەهەنگئاسا: وەك نەهەنگ. هەنگاو: هەنگام، کات.

واتە: کە دەعباکەی لەناو دەریای ژێردەرپێکەیدا مەلە بکا، ئەو دەمە وەك نەهەنگ مەلە دەکا و دەکەوێتە سەر ئاو و دەردەکەوێ.

طوممانا (ن): تەومانا.

(٤) سوویی صەحرا: بەرەو دەشت.

**لە پێی دار قابغی، نەوسی بە مەششاك**
**لە بن خایەی دەنووسێ: ((عَبْدُهُ)) کەر!! (٥)**
**لە ڕووی ئەودا منارەی شاری هەولێر**
**بە قەد بەردووخە جورمی، بەڵکە کەمتەر (٦)**
**دەبێتە نەردەبانی جەمعی یەئجووج**
**هەڵێنێ گەر بە دیواری سکەندەر (٧)**
**چ نەڕنایشژنێ بێ، میلی گوم کا**
**نوقم نابێ لەناو دەریایی شوشتەر! (٨)**

واتە: خۆ ئەگەر لە دەریا دەرچێ و بەبێ دەربێ ڕێی دەشت بگرێتە بەر، میلە سوورەکەی لە شەش فرسەخ دوورەوە بە ئاشکرا دەبینرێ!

صەحرا (عا): سەحرا.

(٥) قابغ: قابوق، تورکییە بە مانای قاوغ، کالان و ئاماژەیشە بۆ کونی پاش و پێش؛ یان دارێکی درێژی سەر بە ئەڵقەیە، سوار لە تیربازیدا بە یەڵغار تاو دەدا و تیر بۆ ئەڵقەکە دەهاوێژێ، ئەگەر بچێتە ناوی بە براوە و دەستڕاست دادەنرێ. نەوس: کینایەیە لە دەعبای نێرینە. مەششاك: پوازێکی نووكتیژە لە کلکەبێل و باڵتە دادەکوترێ تا لەق نەبێ، کینایەیشە لە هەمان دەعبا. خایە: گون، باتوو.

واتە: لە خوار کونی پاشەوەیدا بە سەری دەعباکەی لە بنگونیدا دەنووسێ: ((بەندەی خودا: کەر))، وەك چۆن جاران کۆتاییی نامە مۆری ((عبدُهُ فلان))ی لێ دەدرا.

قابغی (عا): قاپغی.

(٦) بەردووخ: کلکەتەشی. حەجم: بارستایی. بەڵکە: بەڵکوو.

واتە: منارەی شاری هەولێر، لە چاو دەعباکەی دەروێشدا بە قەد کلکەتەشییەك، بەڵکوو کەمتریش، دەنوێنێ.

(٧) نەردەبان: پەیژە.

واتە: ئەگەر دروێش ئاغا هەڵێنێ بەو دیوارەدا کە ئەسکەندەری (ذوالقرنین) بە دەوری شوێنی (یەئجووج و مەئجووج)دا دروستی کرد، دەعباکەی دەبێتە پەیژە و کۆمەڵەکە لەو دیوەوە پێیدا سەر دەکەون و دێنە ئەمدیو!

(٨) نەڕنایشژن: ژنی گەورە و کەتەی ناقۆڵا. میل: مەبەستی دەعبای دەروێشە. شووشتەر: شارێکە لە ئێران.

**که زوڕنا سەرقەفی ڕەق بوو لە کارا**
**دەدا ماکەر لە بەریا هەوڵی دوختەر! (٩)**
**دەبێتە قەیصەری پەس، بەر بە ئەشکەوت**
**ئەگەر ئاغا بکا کاری پەس و بەر! (١٠)**
**دەلەرزن پیرەژن وەك بی لە حەممام**
**بکێشێ، گەر لە نەقشی ئەو، موصەووەر! (١١)**
**وتم: ئاغا! دەدەی تەسکینی فاطان؟!**
**وتی: مێشوولە کەی دەگرێ بەری کەر؟! (١٢)**

واتە: دەبێ چ ژنێکی قەبەی خوداغەزەبلێگرتوو هەبێ، میلی دەروێش قووت بدا و ونی بکا؟ میلەکەی ئەو لە دەریای دەرپێکەیدا دیار بوو!! دەریای شووشتەریش نوقمی ناکا.

گوم کا (عا): ون کا.

(٩) زوڕناسەر: سەر وەك زوڕنا، دەعباکەی دەروێش. دوختەر: کچ.

واتە: کە قەفی دەعبای زوڕناسەری دەروێش ڕەق بوو و هاتە مەیدان، ماکەر لە بەریدا تەنگاو دەبێ و بەرگەی ناگرێ، وەك چۆن کچ لە شەوی گواستنەوەدا دەکەوێتە پەلەقاژە.

دەدا (عا): ئەدا.

(١٠) واتە: ئەگەر دەروێش زەوقی لێ بێ، چ لە پاش و چ لە پێش، گورز بوەشێنێ، پاشەوەی گورزلێوەشێنراوەکە دەبێتە قەیسەری و پێشی دەبێتە ئەشکەوت!!

(١١) موصەووەر: وێنەگر، ڕاستییەکەی (موصەووير)ە، دەبێ لەبەر کێشی شیعرەکە وا بنووسرێ.

واتە: ئەگەر وێنەکێش لە حەمامدا وێنەی دەعباکەی دەروێش بکێشێ، پیرەژنی دنیادیدە! لە حەمامدا لە ترساندا وەك بیی ناو ئاو دەلەرزێ.

(١٢) فاطان یا فاتان: دوور نییە ناوی ئافرەتێکی حەشەری بووبێ، ڕەنگیشە ناوی خێزانی دەروێش ئاغا بێ.

واتە: وتم: ئاغا! لە کاتی تێوەشاندندا تەسکینی فاتان دەدەی؟ دەیحەسێنیتەوە؟ تێری دەکەی؟! وتی: مردووت مرێ بۆ عەقڵت، مێشوولە لە کوێ بەرگەی کەر دەگرێ؟!

وتم ئاغا (ن): گوتم ئاغە. وتی (ن): گوتی.

(فاتان)، لە هەرسێ نوسخەکەدا بە (فاطان) نووسراوە.

## -٢٢- (*)

### (در جواب نالی)

جانم فیدایی سروەکەت ئەی بادەکەی سەحەر!
ئەی پەیکی موستەعید لە هەموو ڕاهی پڕ خەطەر! (١)
ئەی میروەحەی جەمالی مەهئاسایی دڵبەران
وەی شانەزەن بە کاکۆڵی تورکانی سیمبەر! (٢)
جاڕووکەشی مەنازیلی جانان لە خەڵوەتا!
فەڕڕاشی فەرشی سەبزە، بەهاران، لە دەشت و دەر! (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، عا، ق، ڕ، کم، نم، گم)دا هەیە، سەرناوەکەی (در جواب نالی)یە، یانێ سالم ئەم شیعرەی لە وەڵامی نامەشیعرییەکەی مەلا خدری "نالی"دا نووسیوە.

کێشی عەرووز: موزاریعی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

(١) پەیك: نامەبەر. دیارە وەك "نالی" نامەکەی بۆ سالم بە بای خۆشمروروری شارەزای شارەزووردا ناردووە بۆ سالم، ئەمیش بە هەمان بادا وەڵامەکەی بۆ ناردووەتەوە.

واتە: گیانم بە قوربانی سروەت بێ، ئەی شنەبای بەیانیان! ئەی نامەبەری ئامادە و شارەزای هەموو ڕێیەکی مەترسیلێکراو!

ئەی پەیکی (گم): وەی پەیکی. موستەعید (کم، گم): شارەزا.

(٢) میروەحە: باوەشێن. مەهئاسا: وەك مانگ. شانەزەن: شانەکەر. کاکۆڵ: زوڵف. تورکان: جوانان. سیمبەر: بەدەنسپی و جوان.

واتە: ئەی ئەو سروە بەختەوەرەی کە لە ڕوخساری وەك مانگی یاری نازدار دەدەی، ئەی ئەو سروەیەی کە کاکۆڵ و زوڵفی جوانان شانە دەکەی، وەك شانە زوڵفەکانیان تاتا دەکەی.

(٣) جاڕووکەش: گسکدەر. جانانە: دڵبەران.

واتە: لە کاتی تەنهایی یاردا، گسکی مەنزڵ دەدەی و بێپرسوڕا دەچیتە ژوور! ئەی ڕاخەری ڕایەخی سەوزەگیا لە وەرزی بەهاردا لە دەشتودەر. یانێ سروەکەیە هۆی سەوزبوونیەتی، سروەکەیە لێی دەدا و ئەویش بەو لێدانە دەشنێتەوە و وەك فەرش سەرانسەری دەشتودەر دەگرێتەوە و بەو سروەیە کەروێشکە دەکا!

فەرشی سەبزە (کم، نم، گم): فەرشی ئەبری. (ق): بادی فەرش. (سەبزە) لە (ڕ)دا کەوتووە. لە

**ماڵش دەدەی بە دەم لە دەمی خوابی صوبحْدەم**
**هەم زوڵفی قیرْگوونەوو هەم چیهرەیی قەمەر (٤)**
**باری لە سروەکەت بە شنەی، ئەنگەبینی گەز**
**کردوویە جونبوشت بە هەمئاغۆشی نەیشەکەر (٥)**
**وەختی طەوافی عاریضی دڵبەر، شنۆیی تۆ**
**لەغزش دەخا بە طوڕڕە، لە سەر تا بە پێی کەمەر (٦)**

دەشت ودەر (ڕ): لە دەشت و دوور. هەڵەیە.

(٤) دەم: هەناسە. لە دەمی: لە کاتی. صوبحدەم: کاتی بەیانی. ماڵش: ماڵین، خشاندنی شتێ بە شتێکیتردا.

واتە: کاتی خەوی بەرەبەیان کە خەو قووڵ و خۆشە، دوو شتی یەك لە یەك جوانتری دژی یەك بە هەناسەت دەماڵی و دەمی پێدا دەهێنی؛ یەکەم زوڵفی ڕەش و دووەم ڕوخساری وەك مانگ گەش، بە بێئەوەی یار ئاگادار بێ!

زوڵفی (ڕ): زوڵفت. قیرگوونەوو (کم): قیرە و گوونە و (گم): قیرە گۆنە و.

(٥) ئەنگەبین: هەنگوین. گەز: دارگەزۆ، دارۆکەیێکە گەڵای ورد لقەکانی داپۆشیوە و شیرەی شۆکە دەردەدا. جونبوش: جمەوجووڵ و لارولەنجە. هەمئاغۆش: هاوباوەش. نەی: نەیجە، قامیش. شەکەر: ئەو تۆزە شیرینەی کە لە نێو نەیجەکەدایە و گرتوویەتیە ئامێز.

واتە: هەنگوین بە شنەی سروەکەت لەسەر گەڵای دارگەز دەبارێ. ڕەنگە مەبەستی گەزۆ بێ کە شەوان لە هەندێ وەرزدا دەبارێتە سەر گەڵای داری وەك دارمازوو یا وێوڵ (زڕەمازوار)، ئەویش شیرینە. هەروەها جمەوجووڵ و لارولەنجەت شەکری کردووەتە هاوباوەشی نەیجە. مەبەست ئەوەیە هەر شنەبایە دەبێتە هۆی ئەوەی نەیجە شەکر لەناو بۆشاییەکەیدا بگرێتە ئامێز؟ بەڵێ، ژیان بێ سروەی نەسیم بەتاڵە.

لە (عا، کم، نم، گم): بە. کردوویە (ق، ڕ، کم، نم، گم): گرتوویە. گەز (کم): کەژ، یانێ کێو. بەم جۆرە لەوانەیە هەنگوینی کەژ گەزۆ بێ کە بە دارمازووەوە دەنیشێتەوە، یا گەڵای دارەکە دەریدەدا.

(٦) عاریض: ڕوو. شنۆ: شنە. لەغزش: لەرزە. طوڕڕە: زوڵف. پێی کەمەر: خواری پشتێنە.

واتە: ئەی بای سەحەر! کە شنەی تۆ زیارەتی ڕووی دڵبەر دەکا و بە دەوریدا دەسووڕێتەوە، هەر لە سەر تا ناوقەد زوڵفی دەلەرێنێتەوە.

دەخا (کم): ئەکا. پێی کەمەر (گم): پێ کەمەر.

کەی دێتە خەندە غونچە، دەمی، بێوەزیدەنت؟
گەر تۆ نەبی، درەختی چەمەن ناگـرێ ثەمەر (٧)
ئیحیاکونی جەمیعی نەباتاتی عالەمی
ڕەعنا کشا لە تەربیەتت قامەتی شەجەر (٨)
ئابی حەیاتی ئاتەشی ئەفسوردەیە دەمت
تەحریکی تۆیە گڕ لە تەنوورا کە دێتە سەر (٩)
میحنەت ئەوەندە زۆرە، دڵم هێندە تەنگ بووە
دوودی هەناسەیی سەحەرم هەوری گرتە بەر (١٠)

(٧) وەزیدەن: هەڵکردنی با. چەمەن: باخ و سەوزایی.

واتە: ئەی بای سەحەر! ئەی پەیك و تەتەر! ئەگەر تۆ هەڵنەکەی، دەمی بچکۆلەی خونچەی نازدار کەی دێتە پێکەنین و دەکرێتەوە؟ دار و درەختی باخ و بێستان کەی بەر دەگرن؟ ڕاستە هەر بایە دار ئاوس دەکا و دەیهێنێتە بەر.

کەی (کم): کە. هەڵەیە. بێ وەزیدەنت (عا): وەزیدەنت، (بێ)کەی کەوتووە. چەمەن (کم): چیمەن.

(٨) ئەم بەیتە لە (نم)دا نییە.

ڕەعنا کشا: وەك گوڵە ڕەعنا درێژ کشا.

واتە: تۆ ئەی بای سەحەر! زیندووکەرەوەی هەرچی گژوگیای جیهانی، باڵای دار لە پەروەردەکردنی تۆوە وەك ڕەعنا کشا و بەرز و ڕێك دەرچوو.

ئیحیاکونی (کم، گم): ئیحیاکەری. (جەمیعی) لە (عا)دا کەوتووە. کشا (کم، ق، گم) گوشا. تەربیەتت (عا): شەربەتت!

(٩) ئەفسوردە: سیس و هێز تێدا نەماو. دەمت: هەناسەت.

واتە: هەناسەی تۆ، ئەی بای سەحەر! بۆ ئاگری کوژاوەی بێتین وەك ئاوی زیندەگانییە و ژیانی پێ دەبەخشێ، ژیانی ئەبەدی. بزواندنی تۆیە کە گڕ لە تەنوورەوە دەردەکا و سەردەکەوێ. دژایەتی و سەبەبکاریـەکەی جوانە؛ ئاو ئاگر خۆش دەکا!

ئابی حەیاتی.. تاد (کم، نم): ئاوی حەیات و ئاتەشی ئەفسوردەیە دەمت. (ق): ئابی حەیاتی ئاتەشی ئەفسووردەیی دەمت. (گم): ئاوی حەیاتە ئاتەشی ئەفسوردەیی دەمت. گڕ (کم): گەر. تەنوورا (گم): تەنووریش. سەر (کم، گم): دەر.

(١٠) دوود: دووکەڵ.

**هیممەت کە چابوکانە بە ئیجرایی مەطڵەبم**
**لەمسەر بڕۆ وەکوو بەرید و لەوێ بێ وەکوو تەتەر (١١)**
**بۆ موڵکی شامە نامەیی من، سوویی "نالی"یە**
**هەر حەرفی ئەو لە وەضعی ویلایەت دەدا خەبەر (١٢)**
**پرسیویە -ظاهیرەن- لە ڕەفیقانی یەك جیهەت**
**ئەحواڵی ئەصڵی شەهر و موقیمانی سەربەسەر (١٣)**
**لەوساوە حاکمی بە ستەم دەربەدەر کرا**
**نەیدیوە کەس لە چیهرەیی کەس جەوهەری هونەر (١٤)**

واتە: نەگبەتی ئەوەندە زۆرە، دڵم ئەوەندە تەنگ و خەمبارە دووکەڵی هەناسەی سەرلەبەیانانم هەوری ڕاماڵی و خۆی جێی گرتەوە!

ئەوەندە (عا) ئەوەند، لەنگە.

(١١) چابوکانە: گورج‌وگۆڵانە. بەرید و تەتەر: نامەبەر، ئەوی ڕاسپاردە دەگەیێنێ.

واتە: پیاوی چاك بە، ئازایانە هەستە و داخوازییەکەم گورج جێبەجێ بکە، لەمسەرەوە نامە بەرەو لەوسەرەوەیش ڕاسپێری بێنە.

وەکوو بەرید و (ق): وەکو پەڕندە. (گم): وەك بەرید و.

کێشی نیوەی دووەم لەنگە. (لەمسەر بڕۆ وەکوو بەرید و) ئەگەر (لەمسەر بڕۆ وەك بەرید) بووایە، ڕاست دەبووەوە.

(١٢) سووی: بۆ لای. هەر حەرفی: هەر حەرفێکی.

واتە: نامەکەم بۆ وڵاتی شامە، بۆ لای شاعیری ناوداری نامۆ "مەلا خدری نالی"یە. هەر حەرفێکی ئەم نامەیە خەبەر لە بارودۆخی موڵکی بابان دەدا.

ئەو (نم): ئەوە. لەنگە. دەدا (کم، نم): ئەدا.

(١٣) یەك جیهەت: یەکلا و یەکدڵ.

واتە: بە ڕواڵەت حاڵوباری شار و یەك بە یەکی دانیشتووانی شاری لە هاوڕێیانی یەکدڵی خۆی پرسیوە.

ئەصڵی (ق، کم، گم): ئەهلی. موقیمانی (ڕ، کم، نم، گم): ڕەفیقانی، دووبارەیە.

(١٤) حاکم: فەرمانداری شار، بابان.

واتە: ئەوەتی بابانەکان بە زۆری ستەمکارە تورکەکان دەربەدەر کراون، کەس هێز و جەوهەری

**تا بوو بە جایی مەطلەعی خورشیدی موڵکی ڕۆم**
**سووتا گیاهی تیشنەوو خوشکیدە بوو شەمەر (١٥)**
**ناکەن هەوایی هیچ کەبابێ ذەلیلی شەهر**
**بوریانە بەس لە ناری غەما، پارەیی جگەر! (١٦)**
**جوز گاهی ئاه و گریە لە ئەییامی ڕۆمییا**
**نەمدیوە وا ببێ لە فەرەحدا لەبی بەشەر (١٧)**

هونەری بە ناوچاوانی کەسەوە نەدیوە؛ هەرچی زیرەکییە شارراوەیە، هەرچی ئازاییە کوژاوەیە.

لەوساوە (نم): لەو سـایەوە. بە ستەم دەربەدەر کرا (ڕ، کم، نم): بابان کە دەربەدەر کران. لەنگە! (گم): بەبە گشت دەربەدەر کران. چیهرەیی کەس (کم): چیهرەی کەسێ.

(١٥) جای: جێی. تیشنە: تینوو. خوشکیدە: وشك. شەمەر: حەوزی بچووك، هەر شوێنێ ئاوی تێدا وەستابێ، یا ئاوی بارانی تێدا کۆبووبێتەوە.

واتە: ئەوەتی شار بووەتە شوێنهەڵاتنی خۆری موڵکی تورك و جێی دەسەڵاتیان، هەرچی گیایەتی لە تینوواندا سووتاوە و هەرچی حەوز و گۆلاویەتی وشك بووەتەوە.

بە جایی (نم): جاهی. (ق): بیای؟ هەڵەیە. موڵکی (عا، ن، کم، نم، گم): بەختی. لە (مان)یشدا لە سەرووی وشەی (موڵکی)یەوە (بەختی) بە خەتێکی ورد نووسراوە. گیاهی. (عا): گیاه. (ق، ڕ، کم، نم، گم): گیاه و. خوشکیدە بوو (نم): خوشکدیدە بوو. شەمەر (کم، نم): ثمەر. (گم): شەجەر.

(١٦) شەهر: شار. بوریان: برژاو. پارە: پارچە.

واتە: ئەوەندە جگەری خەڵك لە ئاگری پەژارەدا سووتاوە، هەموو لایەك هەر بۆچەکە و بۆنی گۆشتی برژاوە، بۆیە داماوان و هەژارانی شار کاس و وڕی بۆنی جگەری بوریانی خەڵکن و حەز لە بۆنی کەباب ناکەن!

کەبابێ (ق، ڕ): گیاهێ.

(١٧) جوز: جگە. وا: کراوە.

واتە: لە سـەردەمی دەسەڵات و ستەمی تورکەکاندا، لێوی بنیادەمێ لە خۆشیدا ناکرێتەوە، زەردەخەنەی پێکەنینێ نییە، خۆشی و شادی چوونەتە بەست، لێو تەنها لە کاتی هاوار و گریاندا دەکرێتەوە.

نوختەی (جوز) لە (ن)دا کەتووە. گریە (کم، نم، گم): ناڵە. ڕۆمییا (ق، ڕ، کم، نم، گم): ڕۆمییان. لە فـەرەحدا لەبی بەشـەر (عا): لە فرصـدا لەبی بەشـەر. (ڕ، کم، گم): وا بێ لە فەڕی

(سەیوان) پڕە لە شەخصی ستەمدیدە، خوار و ژوور
هەر قەبری پڕغەمانە بە هەر لا دەکەم نەظەر! (١٨)
جێی تورکەکانی ڕۆمە دەر و ژووری (خانەقاه)
غافڵ هەموو لە جایی موریدانی باخەبەر! (١٩)
ئەو حەوضە پڕ دەبوو کە وەکوو چاوەکانی ئەو
تەغییرە ئاوی وەك دڵی مەردانی پڕکەدەر (٢٠)
ئەو دەشتە جایی یارییی یارانی حوجرە بوو،
یەکسەر مەقامی ڕۆمییە هەروەك تەهی سەقەر (٢١)

عەدالەت بەنی بەشەر. (بە)ی (بەشەر) لە (نم)دا کەوتووە.

(١٨) سەیوان: گردێکە کەوتووەتە ڕۆژهەڵاتی شاری سلێمانی، لە کۆنەوە گۆڕستانی سەرەکیی شارەکەیە. شەخص: گۆڕی پیاوچاکان، بەتایبەتی گۆڕی دیاری وەها کە داری لە سەر و بەردا ڕووێنرابێ و دەوری بە وشکەکەڵەك هەڵچنرابێ. سالم، لەبەر ڕێز، هەمووی بە شەخص حسێب کردووە.

واتە: گردی سەیوان، کە هەواڵت پرسیبوو، پڕە لە گڵکۆی ستەمدیدەکان، بە هەر لایەکدا دەڕوانم گۆڕی ئەوانەیە کە بە دڵی لێوان لە خەمەوە سەری نائومێدییان ناوەتەوە!

دەکەم (نم): ئەکەم.

(١٩) جای: جێی، یا جاهی: پایە. باخەبەر: دڵوریا.

واتە: خانەقای مەولانا، کە ئەوسا فەقێ و مەلا و خوێندەواری زیرەك جمەیان تێدا دەهات و خانەیەکی زانست بوو بۆ خۆی، ئێستا دەر و ناوی سیخناخە لە تورکە ڕۆمییەکان، کە غافڵن لە جێ‌وڕێ و پایەی خوداناسە دڵوریاکان. دیارە جەندرمەی ستەمکاری عوسمانی و سۆفیی خوداپەرست کوجا مەرحەبا؟!

خانەقاه (ق): خانەقا. جایی (گم): جاهی، واتە: پایەی.

(٢٠) پڕکەدەر: پڕ لە خەم. کەدەر: لێڵی.

واتە: ئەو حەوزی خانەقایە کە وەك چاوەکانی "نالی" کاتی گریان پڕ دەبوو و دەتوت چاوی قرژانگە، ئێستا ئاوەکەی گۆڕاوە و لیخنە، وەك دڵی خەمباری لێوبەبار.

حەوضە (گم): حەوزە. ئەو (کم، گم): تۆ.

(٢١) ئەم بەیتە لە (گم)دا نییە.

تەه: خوار، ناخ.

واتە: ئەو دەشتە پان و بەربڵاوە کە جێی یاریی سێ‌باز و کەوشەك و ڕابواردنی یاران و فەقێیانی

سووتا دڵم بە حاڵەتی جۆباری (سەرچنار)
لێڵاوە چەشمەساری وەکوو چاوی بێبەصەر (٢٢)
زستانی ئەووەڵین بوو دڕا بەرگی (شێخەباس)
ڕۆمی ئەوەندە شوومە لە شەخصیش دەخا ضەرەر (٢٣)
وەك پیری خوردساڵە خەمی داری (پیرمەصوور)
مەشغووڵی لەغزشە، هەمە جا، پایی تا بە سەر (٢٤)

حوجرە و پڕ لە خۆشی و بەستە بوو، کە دەتوت پارچەیەکە لە بەهەشت، ئێستا هەمووی شوێنی جەندرمەی تورکە، چادریان لەوێ هەڵداوە و دەڵێی قووڵایی دۆزەخە.

جایی (ق): جێگەی. یاریی یارانی (عا): یارانی یاری! (یاریی) لە (ق)دا کەوتووە.

(٢٢) جۆبار: جۆگە. چەشمەسار: سەرچاوە. بێبەصەر: بێبینایی، کوێر.

واتە: دڵم بۆ حاڵ و بارودۆخی سەرچاوەکەی (سەرچنار) کە وەك چاوی کوێری لێ هاتووە و دڵۆپە ئاوی تێدا نەماوە و وشکاوی هاتووە، سووتا و بوو بە زوخاڵ.

چەشمەساری (ڕ): چەشمەسارەی.

(٢٣) شێخەباس، یا شێخ هەباس، یا شێخ عەباس یەکێك بووە لە سەییدەکانی بەرزنجە و قەبرەکەی زیارەتگای خەڵك بووە، کەوتووەتە داوێنی سلێمانی.

واتە: هەر یەکەمین زستان بوو گەڵا و بەرگ و پەلوپۆی شێخەباس دڕا و داڕزا. ڕۆمی ئەوەندە شووم و نەگبەتن، زیان لە شەخس و قەبریش دەدەن.

شێخەباس (مان، ن): شێخ اباس، وەها دەخوێنرێتەوە کە لێرەدا نووسراوەتەوە. نوختەی (اباس) لە (ن)دا کەوتووە. (ق): شێخ هەباس. (نم): شێخ عەباس. شوومە (گم): شوومن. شەخصیش (عا): سەخصیش. هەڵەی نووسینە. دەخا (ڕ): دەدەن. (کم، نم): ئەدا. (گم): دەخەن. (شوومە) لە (ن)دا کەوتووە.

(٢٤) خوردساڵ: لە فارسیدا (سالخوردە) و (سالخورد) بە بنیادەمی زۆر پیر و بەتەمەن دەوترێ، (خوردساڵ) یا (خوردەساڵ)ەکەی سالمیش بۆ هەمان مەبەستە، دیارە چ فارسییەکەی و چ کوردییەکەی ئەوە دەگەیێنێ کە درێژیی تەمەن خواردوویەتی و شتێکی وەهای نەهێشتووەتەوە. پیرمەصوور= پیرمەسوور، پیرمەنسوور: پیاوچاکێك بووە، قەبرەکەی لە داوێنی گەڕەکی مەڵکەندییەوەیە. ئێستا بەو دەوروبەرە دەڵێن: گەڕەکی پیرمەسوور. لەغزش: لەرزە.

واتە: دارەکەی شەخسی پیرمەسوور چەماوەییەکەی وەك چەماوەیی پیری پەرپووتی کۆماوەیە،

ئەو بەردەکانی ناوی نرا قصنی شەخصەکەی،
دایان بە شاخی دارەکەیا، تورکی بێهونەر (٢٥)
وەك چاوی بێغەمانە، هەموو (شیوی ئاوْدار)
بەس موشکیلە لە چەشمەیی ئەو قەطرە بێتە دەر (٢٦)
ئەوسا مەکانی ئاسْکە بوو (کانیی ئاسْکان)
ئێستە لە دەنگ و ڕەنگی ئەڕۆمی پڕە لە کەر (٢٧)

سەرتاخواری دەلەرزێ و هێزی تێدا نەماوە. لەسەر ئەم بارە، (داری) موبتەدای یەکەمە، (خەمی) موبتەدای دووەم و (وەك پیری خوردساڵە) خەبەریەتی.

خوردساڵە خەمی (عا): خوردساڵ خەمی. (ن، کم، نم، گم): ساڵخوارده خەمە. ئەم ڕەساترە، بەم حیسابە (داری) موبتەدایە و (وەك پیری ساڵخوردە خەمە) خەبەریەتی. (ق، ڕ): خوردەساڵە خەمە. پیرمەصوور (عا): پیر موور. هەڵەیە.

(٢٥) قصن= حصن: وشکەکەڵەکی دەوری شەخس و گۆڕ. شاخ: لقوپۆپی دار.

واتە: ئەو بەردانەی کە کرابوونە شوورەی گۆڕەکە، تورکە بێفەڕەکان دایان بە سەر و گوێلاکی دارەکەیدا و تێکیانشکاند. ئیتر تۆ چییان لەوە زیاتر لێ چاوەڕوان دەکەی؟!

قصنی شەخصەکەی (ن): قص شخیصەکی. هەڵەی نووسینە. (کم، گم): قسنی شەخصەکە. شاخی (کم، گم): شاخ و. ئەمە لە (ڕ)دا کەوتووە.

(٢٦) شیوی ئاودار: شیوێکە لە باکووری ڕۆژاوای سلێمانییەوە بەلای (سەرچنار)دا.

واتە: شیوی ئاودار ئەوەندە گرانە دڵۆپی ئاو لە سەرچاوەکەیەوە بێتەدەر، دەڵێی چاوی بێخەمانە کە هەرگیز گریانی بە خۆیەوە نەدیوە.

چاوی بێغەمانە. (کم): بێغەمانە، وشەی (چاوی) کەوتووە و لەنگی کردووە.

(٢٧) کانیئاسکان: کانی و سەراوێك بووە لە ڕۆژاوای سلێمانییەوە و ئێستا ناوی گەڕەکێکە لە شار.

واتە: وەك خۆت دەزانی ئەوسا (کانیی ئاسکان) جێی ئاسکە بوو (ئاسکە یا ناوی کیژۆڵەیەکی جوانی خۆشەویست بووە، یان مەبەست ئاسکی عادەتییە کە کینایەیە لە دڵبەر)، هەرچۆن بێ ئێستا کانیی ئاسکان لە بەرەکەتی تورکانەوە پڕە لە مرۆڤی کەر و نۆکەری خۆیان!

ڕەنگی (گم): نەعرەیی. ڕۆمی (کم، نم، گم): ڕۆمییە. (مان، عا): ارومی. پڕە لە کەر (ق): پڕە لە گاوو کەر. (نم): پڕ لە کەر.

**ئەمڕۆ فەضایی بازیگەهـ جایی ڕەهزەنە**
**لەو دەشتە دێ لە غەیبەوە ئاوازی «الحَذَرْ» (٢٨)**
**تا دوزْدجۆیی نیمەشەبن تورکی بێنیظام**
**دوزدن هەموو لە خەرمەنی مونعیم وەکوو شەرەر (٢٩)**
**شەهرێکە پڕ لە ظوڵم و مەکانێکە پڕ لە شین**
**جایێکە پڕ لە شۆر و ولاتێکە پڕ لە شەڕ (٣٠)**

(٢٨) ئەم بەیتە لـە (کم، گم)دا بەیتی بیستونۆیەم و لـە (ڕ)دا سیویەکەمە.

فەضا: لێرە مەبەست دەشتە. بازیگەهـ: شوێنی یاری، یاریگە. ڕەهزەن: ڕێگر، جەردە. الحذر: خۆت بپارێزە.

واتە: ئەو دەشتەی کە ئەوسا شوێنی یاری و خۆشی و هێمنایەتی بوو، ئێستا شوێنی جەردە و ڕێگرە، هەر لە دەشتەوە لە غەیبەوە هاوار دێت و دەڵێ: ئاگاتان لە خۆتان بێ و خۆتان بپارێزن. وا دیارە غەیبیش نارازی بووە لـە کردەوەی تورکە عوسمانیـەکان!

ئەمڕۆ فەضایی بازیگەهـ (کم، گم): ئەمڕۆ فەضایی بازیگەهی. (ق): ئەمڕۆ کە فەضای بازگەهـ خۆ. هەڵەیە. دەشتە دێ (گم): دەشتەوە.

(٢٩) ئەم بەیتە لـە (کم، گم)دا بەیتی بیستوپێنجەم و لـە (ڕ)دا سییەمە.

دوزدجۆ: ئەوی بەدوای دزدا دەگەڕێ و ماڵی موسوڵمانان دەپارێزێ، حەسحەس. نیمەشەب: نیوەشەو. خەرمەن: خەرمان، مەبەست سامان و داراییە. مونعیم: خاوەننیعمەت، دەستڕۆیشتوو. شـەرەر: پریشکی ئاگر.

واتە: تا ئەم تورکە بێنیزامانە بە شەو بەدوای دزدا بگەڕێن! خۆیان دزن و وەك ئاگر بەردەبنە سامان و ماڵ و دارایی نیعمەتداران. پوختەی قسـە: خۆیان دزن، کەچی بە قسـەی خۆیان بەدوای دزدا دەگەڕێن.

تا دوزدجۆی (کم، نم، گم): تا وەقتێ دوزدی. (ق): تا دوزدی. وەکوو شـەرەر (گم): دەخەن زەرەر. «هەموو» لـە (ق)دا کەوتووە. لـە (کم)دا نیوەی یەکەم وەك چاپەکەی (گم)ە، نیوەی دووەم وەك دەستنووسـەکانە.

(٣٠) شەهر: شار. شین: گریان و شیوەن. شۆر: ئاژاوە.

واتە: سلێمانی ئێستا شارێکە پڕ لـە ستەم و شوێنێکە پڕ لـە شیوەن، جێیەکە پڕ لـە ئاژاوە و ولاتێکە پڕ لـە شەڕ و نەگبەتی.

شەهـرێکە (کم، نم، گم): شارێـکی. (ق): شارێکە. مەکانێکە (کم، گم): مەکانێکی. (ق): ولاتێکە.

**سەربانی پڕ لە گەژدوم و دیواری پڕ لە مار**
**گوودالی پڕ لە ڕەهزەن و صەحرایی پڕ خەطەر (٣١)**
**دڵ نایێڵێ بڵێم: چییە سامانی حوجرەکەی**
**هەر تۆڕی عەنکەبووتە، حیجابی بیروون و دەر!! (٣٢)**
**نایێ صەدا لە پەنجەرەکەی، جوز فیغانی جوغد**
**غەیرەز شەقامی مووری نییە شوێن و پێ گوزەر (٣٣)**

وڵاتێکە پڕ لە شەڕ (کم، گم): وڵاتێکی پڕ لە شەڕ. (ق): مەکانێکە پڕ لە شەڕ.

(٣١) ئەم بەیتە لە (ق)دا سیٚ‌وسێیەمە.

گەژدوم: دووپشك. گوودال: شوێنی نزم و چاڵ‌وچۆڵ و پێچاوپێچ. ڕەهزەن: جەردە و ڕێگر. دیارە مەبەستی لە دووپشك جەندرمەی تورکە، لە ماریش ئەوانەی کە بە نهێنی بە مرۆڤەوە دەدەن، وەك سیخوڕ و گوێ‌سووك. ئەو ڕۆژانە سەربان پڕ و چالآیی و پێچاوپێچ چڕ و دەشت‌ودەر پڕ مەترسی بووە، شیرازەی کار پچڕاوە و سەر و بنی ون و ئالۆزاو بووە.

سەربانی پڕ (نم): سەربانی پڕە. گوودالی (عا): کەودالی. (ق، کم، نم): کۆڵانی. پڕ لە ڕەهزەن (کم): پڕ لە ڕەزەن. هەڵەن. صەحرایی (عا، نم): سەحرایی.

(٣٢) تار: تاڵ. عەنکەبووت: جاڵجاڵۆکە. حیجاب: پەردە، دەرگاوان. بیروون: ناوەوە.

واتە: دڵم نایێ بڵێم حوجرەکەت چیی بەسەر هاتووە، ئەو حوجرە خۆشە پڕ لە فەقێ و شیعر و ئەدەبە، ئێستا کەسی تێدا نییە و چۆڵ‌وهۆڵە. لەبەرئەوەیش کە کەسی تێدا نییە، تاڵی یانەی جاڵجاڵۆکە بووەتە دەرگاوانی دەر و ناو، هەموو لایەکی گرتووەتەوە.

نایێڵێ (کم): نایەڵێ. لەبەر کێش، دەبێ بە (نایەڵێ) بخوێنرێتەوە. حوجرەکەی (ق، ر، کم، نم، گم): حوجرەکەت. تۆڕی (مان، عا، ن، ر): طوری. تۆڕی، واتە: داو،ماڵی جاڵجاڵۆکەیش جۆرە داوێکە! (کم، نم، گم): تاری.

(٣٣) ئەم بەیتە و بەیتی دوایی لە (ق)دا پاش و پێشن.

جوغد: کوندەبەبوو کە بە نەگبەتی مەشهوورە. موور: مێرووولە.

واتە: جگە لە ئاوازی ناسازی کوندەبەبوو، لە پەنجەرەی حوجرەکەی "نالی"یەوە، هیچی‌تر نابیستی. هەروەها جگە لە شار و ڕێچکەی مێرووولە شوێن‌پێیەکت لە ئەرزەکەیدا دەست ناکەوێ گوزەری پێدا بکەی.

نایێ صەدا لە پەنجەرەکەی (کم، نم): نایێ صەدا لە حوجرەکەت. (گم): نایەتە دەر لە پەنجەرەکەت.

**توو خوا بڵێ بە حەضرەتی "نالی": دەخیلی بم**
**بەم نەوعە قەد نەکا بە سولەیمانییا گوزەر!! (٣٤)**
**"سالم"صیفەت لە بێکەسییا با نەبێ هیلاك**
**من کردم، ئەو نەکا لە غەما خوێنی خۆی هەدەر (٣٥)**
**ئەم موڵکە نەظمی نابێ بەبێ ضەبطی واریثی**
**بێ ئەو، بە قەصدی ئەم طەرەفە، با نەکا سەفەر!! (٣٦)**

شەقامی (کم، نم): مەقامی. مووری (گم): موور. شوێن و (مان، ن): شون و. هەر مەبەست (شوێن)ە. (عا، کم، گم): شوێنی.

(٣٤) واتە: لە ڕێی خودادا بە حەزرەتی نالی بڵێ: سلێمانی کە ئەمە دۆخەکەی بێ، دەستەوداوێنی بم، با پێیدا تێنەپەڕێ.

توو خوا (ن): توو خود. هەڵەی نووسینە. (ق، ر): توو خودا. قەد (ق، کم، نم، گم): قەت. (نالی) لە (ق)دا کەوتووە.

(٣٥) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (کم، نم، گم)دا پاش و پێشن. ڕیزکردنەکەی ئەوان تەواوترە، کە ناسناو لە دوایینبەیتدا دەبێ.

هەدەر: بەخۆڕایی لەناوچوون.

واتە: با ئەویش وەك سالم بێکەس نەکەوێ و ماندوویی پرزەی لێ نەبڕێ. وا من تووش بووم، با ئەو خوێنی خۆی بۆ خەم و خەفەتی ئەم مەملەکەتە بە فیڕۆ نەدا.

(من کردم ئەو) بە (من کردمە و) دەخوێنرێتەوە، تا کێشی بەیتەکە سوار بێ.

(٣٦) واتە: ئەم وڵاتە بەبێ دەسەڵاتی میراتگرانی، کە بابانەکانن، کاری ڕێکوپێکی نابێ. بەبێ بوونی ئەو کاربەدەستە خۆماڵییانە، با "نالی" هەرگیز نیازی ئەوە نەکا سەر بکاتەوە بە سلێمانیدا و بێتەوە بۆ ئەم مەرز و بوومە!

ضەبطی (عا) ظەبیتی. (کم) ظەرفی. (گم): عەدلی.

***

جێی باسە، پارچەشیعرە درێژەکەی نالی ئەمەی لای خوارەوەیە:

**نامەکەی "نالی"**

قوربانی تۆزی ڕێگەتم، ئەی بادی خۆش‌مروور
ئەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری (شارەزوور)

ئەی لوطفەکەت خەفییی و هەواخواه و هەمدەمە
وەی سروەکەت بەشارەتی سەرگۆشەیی حوضوور
ئەی هەممیزاجی ئەشکی تەڕ و گەرمی عاشقان
طــۆفانی دیدەوو شەرەری قەلبی وەك تەنوور
گاهێ دەبی بە ڕەوح و دەکەی باوەشێنی دڵ
گاهێ دەبی بە دەم، دەدەمێنی دەمی غوروور
مەحوی قوبوولی خاطری عاطرشەمیمتە
گەردی شیمال و گێژی جەنووب و کزەی دەبوور
سووتا ڕەواقی خانەیی صەبرم، دڵ و دەروون
نەیماوە غەیری گۆشەیی ذیکرێکی ((یا صوبوور))
هەم هەمعەنانی ئاهم و هەم هەمڕیکابی ئەشك
ڕەحمێ بەم ئاه و ئەشکە بکە، هەستە بێقوصوور
وەك ئاهەکەم دەوان بە هەتا خاکی کۆیی یار
وەك ئەشکەکەم ڕەوان بە هەتا ئاوی (شیوەسوور)
بەو ئاوە خۆت بشۆ لە کودووراتی سەرزەمین
شاد بن بە وەصڵی یەکدی، کە تۆی طاهیر، ئەو طەهوور
ئەمجا مەوەستە تا دەگەییە عەینی (سەرچنار)
ئاوێکە پڕ لە نار و چنار و گوڵ و چنوور
چەشمێکە میثلی خۆر کە لە صەد جێ، بە ڕۆشنی
فەورانی، نووری صافە لەسەر بەردی وەك بلوور
یا عەکسی ئاسمانە لە ئاوێنەدا کەوا
ئەستێرەکانی ڕابکشێن وەك شەهابی نوور
یا چەشمەساری خاطری پڕ فەیضی عاریفە
یەنبوعی نوورە دابڕژێنێ لە کێوی طوور
دەموت دو چاوی خۆمە، ئەگەر (بەکرەجۆ)یی ئەشك
نەبوایە تیژ و بێئەمەر و گەرم و سوێر و سوور
داخڵ نەبی بە عەنبەری سارایی (خاكوخۆڵ)
هەتا نەکەی بە خاکی (سولەیمانی)یا عوبوور

یەعنی ڕیاضی ڕەوضە کە تێدا بە چەن دەمێ
موشکین دەبی بە کاکوڵی غیلمان و زوڵفی حوور
خاکی میزاجی عەنبەر و داری ڕەواجی عوود
بەردی خەراجی گەوهەر و جۆباری عەینی نوور
شامی هەموو نەهار و فوصوولی هەموو بەهار
تۆزی هەموو عەبیر و بوخاری هەموو بوخوور
شارێکە عەدل و گەرمە، لە جێگێکە خۆش و نەرم
بۆ دەفعی چاوەزارە دەڵێن شاری (شارەزوور)
ئەهلێکی وای هەیە کە هەموو ئەهلی دانشن
هەم ناظیمی عوقوودن و هەم ناظیری ئوموور
سەیرێ بکە لە بەرد و لە داری مەحەڵلەکان
دەورێ بدە بە پرسش و تەفتیش و خوار و ژوور
داخۆ دەروونی شەق نەبووە (پردی سەرشەقام)؟
پیر و فوتادەتەن نەبووە (داری پیرەسوور)؟
ئێستەش بە بەرگ و بارە عەلەمداری (شێخ هەباس)
یا بێنەواوو بەرگە گەڕاوە بە شەخسی عوور
ئایا بە جەمع و دائیرەیە دەوری (کانی با)،
یاخۆ بووە بە تەفریقەیی شۆڕش و نوشوور؟
(سەیوان) نەظیری گونبەدی کەیوانە، سەبز و صاف
یاخۆ بووە بە دائیرەیی ئەنجومی قوبوور؟
ئێستەش مەکانی ئاسکەیە (کانیی ئاسکان)،
یاخۆ بووە بە مەلعەبەیی گورگ و لوورەلوور؟
ئێستەش سروشکی عیشقی هەیە (شیوی ئاودار)،
یاخۆ بووە بە صۆفییی وشکی لەحەقبەدوور؟
داخۆ دەروونی صافە، گوڕەی ماوە (تانجەرۆ)،
یاخۆ ئەسیری خاکە، بە لێڵی دەکا عوبوور؟
سەیرێکی خۆش لە چیمەنی ناو (خانەقا) بکە
ئایا ڕەبیعی ئاهووە، یا چایری ستوور؟

سەبزە لە دەوری گوڵ تەڕە وەك خەططی ڕوویی یار
یا پووشی وشك و زوورە وەکوو ڕیشی "کاکەسوور"؟
قەلبی مونەووەرە لە حەبیبانی نازەنین،
یا وەك سەقەر پڕە لە ڕەقیبانی لەندەهوور؟
دەسبەندییانە دێن و دەچن سەرو و نارەوەن،
یا حەلقەیانە صۆفییی ملخوار و مەندەبوور؟
مەیلێ بکە لە سەبزەدرەختانی مەدرەسە:
ئەوراقیان موقەددیمەیی شینە یانە سوور؟
حەوضی پڕی کە نائیبی دیدەیی منە لەوێ،
لێلاوی دانەهاتووە وەك سەیلی (شیوەسوور)؟
ئێستەش کەناری حەوشەکە جێی باز و کەوشەکە،
یاریی تیایە، یا بووەتە مەعرەضی نوفوور؟
چاوێ بخە لە سەبزەوو سێرابی دائیرە
جێ‌جیلوەگاهی چاوەکەمە، نەرمە یانە زوور؟
توخوا فەضایی دەشتی فەقێکان ئەمێستەکەش
مەحشەرمیثالە، یا بووەتە (چۆڵی سەلم و توور)؟
واصیل بکە عەبیری سەلامم بە حوجرەکەم
چیی ماوە، چیی نەماوە، لە هەیوان و طاق و ژوور؟
ئەو غاری یارە پڕ ئەغیارە، یانە خۆ
هەر غاری یارە، یا بووەتە غاری مار و موور؟
زارم وەکوو هیلال و نەحیفم وەکوو خەیاڵ!
ئایا دەکەومە زار و بە دڵدا دەکەم خوطوور؟
لەم شەرحی دەردی غوربەتە، لەم سۆزی هیجرەتە
دڵ ڕەنگە بێ بە ئاو و بە چاوا بکا عوبوور!
ئایا مەقامی ڕەخصەتە لەم بەینە بێمەوە،
یا مەصڵەحەت تەوەققوفە تا یەومی نەفخی صوور؟
حاڵی بکە بە خوفیە: کە ئەوی یاری سەنگ‌دڵ
"نالی" لە شەوقی تۆیە دەنێرێ سەلامی دوور

## (*) -٢٣-

**ویردی زوبان و فیکری دڵ، شەرحی فیراقە سەربەسەر**
**هەڵدەقوڵێ لە عەینی چاو، خوێنی جگەر شەمەر شەمەر (١)**
**زوڵفی سیاهی پڕخەمی، حەلقە بە حەلقە، چین بە چین**
**دەستە بە دەستە تا میان، سیلسیلەجۆ کەمەر کەمەر (٢)**
**گەرچی بە بۆسەیی لەبی حاصڵە بۆم فەرەح فەرەح**
**لێك فەلەك بە ئینتیقام پێشم ئەدا سەقەر سەقەر (٣)**
**ئەی دڵی هەرزە قەت نەکەی سەیری جەماڵی ڕووبەڕوو**
**تیری موژەی بەقەصدە لێت، وەختی گوزەر حەضەر حەضەر (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (م)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەجەزی هەشتیی مەتویی مەخبوون.

(١) شەمەر: کاسە.

**واتە:** قسەی سەر زمان و بیرکردنەوەی دڵ وەك یەك هەر لەسەر لێکدانەوەی دووری و جیابوونەوەی یارە. کاسە کاسە خوێنی جگەر لە کانیاوی چاوەوە هەڵدەقوڵێ.

(٢) میان: ناوقەد. سیلسیلەجۆ: بەدوای زنجیردا گەڕاو.

واتە: زوڵفی ڕەشی پڕ پێچی، ئەڵقە ئەڵقە و چین بە چین، ئەوەندە درێژە تا پشتێنەی هاتووە، وەك زنجیر بەدوای ئەوەدا دەگەڕێ بێتە سەر کەمەری.

(٣) لێك: بەڵام. ئینتیقام: تۆڵە. سەقەر: دۆزەخ.

واتە: ئەگەرچی خۆشیم بە ماچی لێوی دەستدەکەوێ، بەڵام گەردوون بە تۆڵەسەندنەوە ناخۆشی و نارەحەتیم دەداتێ.

(ئەدا)، دەبێ (دەدا) بووبێ و گۆڕرابێ.

(٤) بەقەصدە: لە بۆسەدایە، بەبەهانەیە. گوزەر: تێپەڕین. حەذەر: وریایی، خۆپاریزی.

واتە: ئەی دڵی هەرزە و نەفام، نەکەی بڕوانیتە جوانیی ڕوو. کە بەلایدا تێدەپەڕی، ئاگات لە خۆت بێ، تیرت تێنەگرێ.

(حەذەر حەذەر) بە هەڵە بە (حەضەر حەضەر) نووسراوە.

بۆ سەری زوڵفی پڕخەمی کەوتە دڵم گرێ‌گرێ
حاصڵی دا بە خاطرم صەفوەتی ڕووی کەدەرکەدەر! (٥)
نامەیی یاری سیمتەن باعیثی زەوقە دەم بە دەم
شامیلی حاڵی "سالم"ە پەیکی صەبا خەبەر خەبەر (٦)

(٥) حاصڵ: بەرهەم، ئەنجام. خاطر: دڵ. صەفوەت: پاکی، بێ‌غەڵوغەشی. کەدەر: دڵگیری، بێ‌ئارامی، پەرێشانی.

واتە: گرێ‌وگۆڵ کەوتە دڵم بۆ سەری زوڵفی پڕ لە پێچ‌ولوولی، کەچی ڕووی بە تاڵ و ترشی نیشان دام.

(٦) سیمتەن: لەش‌سپی. باعیث: مایە. شامیل: ڕەچاوکردوو. خەبەر: هەواڵ.

واتە: نامەی یاری قەدباریك ناوبەناو نەشئە و خۆشی دەبەخشێ، تەتەری سەبایش هەواڵی حاڵی "سالم"ی پێیە.

## -٢٤- (*)

بۆ فیراق شەو زۆر بەطوولە، یادی زوڵفیشی لەسەر!
زوڵف و شەو پایانی چۆن بێ؟ ئۆف خودا! کەی دێ سەحەر؟ (١)
من شکستمە گەر نیگا کەم، تۆ بە ئیما فەتْحتە
هەردو ڕوو کونکون بووە جەرگم لەبەر تیری نەظەر (٢)
خۆ لە غەمزەی تۆ، چ جای دڵ، ئیستیخوانیش لەتلەتە
تیری تۆ ناکا، بە تیزی، فەرقی قیرطاس و حەجەر! (٣)
دوور لە باڵای تۆ، وەها سووتام لە تەندووری فیراق
هەردو یەکسانن لە لام ئێستا: فەضای خولد و سەقەر (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (نم، پ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) فیراق: دووری. بەطوولە: درێژە. پایان: کۆتایی. سەحەر: بەرەبەیان.

واتە: شەو بۆ کەسێ دەردی دووریی یار بچێژێ، زۆر درێژە، نەخوازەڵا ئەگەر یادی ئەگریجە درێژە ڕەشەکانیشی بخەیتە سەر. زوڵف و شەو چۆن ببڕێنەوە؟ ئۆف خودایە کەی ڕۆژ دەبێتەوە.

فیراق شەو زۆر بەطوولە، یادی زوڵفیشی (پ): فیراقی شەو بە طوولە یادی زوڵفەینت.

(٢) شکست: تێشکان. فەتح: سەرکەوتن. نەظەر: تەماشا.

واتە: من ئەگەر بڕوانمە تۆیش شکستمە، چونکە دەنگم دەرنایێ. ئەگەر ئیشارەتیشت بۆ بکەم، تۆ هەر سەرکەوتووی. جەرگ لە تیری تەماشای کوناودەر بووە. یان: من ئەگەر نیگایشت بکەم، هەر شکستمە، بەڵام تۆ بە ئیشارەت سەرکەوتنتە.

شکستمە (پ): شکستم.

(٣) ئیستیخوان: ئێسقان. تیزی: تیژی. قیرطاس: کاغەز. حەجەر: بەرد.

واتە: نەك دڵ، ئێسقانیش بە غەمزەی تۆ لەتلەتە. تیری تۆ لە تیژیدا فەرقی پەڕەکاغەز و بەرد ناکا، هەردووکیان کون دەکا.

تیزی (پ): تیژی.

(٤) فەضا: پانتایی. خولد: بەهەشت. سەقەر: دۆزەخ.

واتە: وا بە ئاگری دووریی تۆ سووتام، پانتایی و گۆڕەپانی بەهەشت و دۆزەخیشم لا وەك یەکن.

**ڕاستە گەر باغی تەحەممول میوەیی مەقصەد ئەدا،**
**حەسرەتا بۆ بەختی من، غەیرەز جەفا نەیبوو ثەمەر (٥)**
**ظولْمەتی زولْفی کە ئەفشان بوو، ئەوە لای دا لە ڕوو**
**«أَبْشِروا» یاران! نەظەر کەن، مانگ لە هەورا هاتە دەر (٦)**
**جیلوەگەر دلْبەر لە هەر سوو بۆ نەظەر بازی دەکا**
**لەم دەرە هەر تیر دەبارێ، بێخەبەر "سالم"! حەذەر (٧)**

(٥) تەحەممول: دەربردن. مەقصەد: مەبەست و مەرام. حەسرەتا: داخ و خەفەت. غەیرەز: جگە لە. ثەمەر: بەرهەم.

واتە: دەربردنەکەی من هیچ بەرهەمێکی نەبوو. داخ و خەفەت بۆ بەختی من کە جگە لە ستەم هیچ بەرهەمێکی‌تری لێ بەدەست نەهات.

(٦) ظولْمەت: تاریکی. ئەفشان بوو: ڕەوییەوە. أَبشِروا: مژدە بێ. نەظەر کەن: بڕوانن.

واتە: کە تاریکیی ڕووی ڕەوییەوە، ئەوە زولْفی لەسەر لاداوە. مژدە بێ یاران، بڕوانن مانگ لەناو هەورەوە دەرکەوت.

أَبشِروا (پ): موژدە بێ.

(٧) جیلوەگەر: ئاشکرا و دیار. هەر سوو: هەر لا. نەظەر: ڕوانین، نیگا. بازی: یاری. حەذەر: وریایی، خۆپارێزی.

واتە: دلْبەر، لە هەر لایەکەوە بە ئاشکرا چاوبازی دەکا. "سالم"ی بێخەبەر! وریا بە لەم ناوەدا تیربارانە.

## -٢٥- (*)

**قەوسی ئەبرۆوو موژەت تیر و کەمانە، بە عومەر**
**نیگەهت قەیدی دڵ و ئافەتی جانە، بە عومەر (١)**
**پەرتەوی عاریضی یار و دڵی صەدپارەیی من**
**قیصصەیی شەوقی مەه و چاکی کەتانە، بە عومەر (٢)**
**تیرْبارانی نیگاهت لە دڵی عاشْقی زار**
**تیژ و سووهانزەدە، وەك نووکی سینانە، بە عومەر (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ف، ق، کم، گم)دا هەیە. لە (ف)دا بە ناوی "حەسرەتی"یەوە نووسراوە و لە (دیوانی کوردی، بەرگی یەکەم، ل١٤٦)یشدا دراوەتەپاڵ "کوردی"، لە کاتێکدا بەپێی نوسخەکەی (مان) ڕاست هیی سالمە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) قەوس: کەوان. نیگەه: تەماشاکردن. جان: گیان. عومەر: حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب (خ.ڕ)، دووەم جێنشینی حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ).

واتە: برۆی کەوانیت و برژانگی تیژت کە لە یەکەوە نزیکن، سوێند بێ بە عومەر، دەڵێی تیر و کەوانن و دڵ دەپێکن. تەماشاکردنیشت داوە و دڵی عاشق دەبەستێتەوە و مایەی نەگبەتیی گیانە.

ئەبرۆوو موژەت (ف): ئەبرۆت و موژەت. دڵ و (ف): دڵە.

(٢) ئەم بەیتە و بەیتی دوایی لە (کم، گم)دا پاش و پێشن، لە (ف)یشدا شەشەم بەیتە.

پەرتەو: ڕووناکی، ورشە. عاریض: ڕوخسار. پارە: پارچە. مەه: مانگ.

واتە: ڕووناکیی ڕوخساری یار و دڵی سەدپارچەی من حیکایەتی شەوق و ڕووناکیی مانگە لەگەڵ کەتان؛ وەك کەتان لە بەر شەوقی مانگدا خۆی ناگرێ و لەتلەت دەبێ و دادەڕزێ، دڵی منیش لەبەر ڕووناکیی ڕوخساری یاردا خۆی ناگرێ و پارچەپارچە دەبێ.

(٣) زار: نەخۆش و لاواز. سووهان: بڕبەند. سووهانزەدە: بە بڕبەند تیژکراو. سینان: سەری تیر.

واتە: بە عومەر قەسەم، نیگات کە دڵی بیمارم تیرباران دەکا، بڕندەیە و وەك سەری تیر بە بڕبەند تیژ کراوە.

تیربارانی (ف، ق): تیرەبارانی.

**تیغی ئەبرۆیی خەمت صوورەتی سەیفی عەلییە**
**باعیثی زەمزەمەوو شۆری جیهانە، بە عومەر (٤)**
**بە شەرارەی غەمی تۆ نەخلی مورادم سووتا**
**باغی شادیم هەموو دەم فەصڵی خەزانە، بە عومەر (٥)**
**بە عەلی سوێندت دەدەم، شیعەی ئەگەر، ڕەحمت بێ**
**خۆ ئەگەر سوننییی، ئەی شۆخی زەمانە! بە عومەر (٦)**
**زۆر نییە "سالم"ی بێچارە ئەگەر کۆهکەنە**
**دڵبەری هەر وەکوو "شیرین"زوبانە، بە عومەر (٧)**

(٤) سەیف: شمشێر. عەلی: حەزرەتی عەلیی کوڕی ئەبووتالیب (خ.ڕ)، زاوا و ئامۆزای حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) و جێنشینی چوارەمی. لەوانەیە مەبەست لە سەیفەکەیش (ذوالفقار) بێ.

واتە: تیغی برۆت کەوانییە، وەك شمشێرە بەناووبانگەکەی حەزرەتی عەلی. دیارە شمشێرەکەی عەلی هەمیشە لە ڕووی ناحەقدا لەکێلان‌دەرهاتوو و دوژمنکوژ بووە.

تیغی ئەبرۆیی خەمت (ف): تیری ئەبرۆی بەخەمت. سەیفی (ف): صەیفی. هەڵەیە.

(٥) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (کم، گم)دا پاش و پێشن، لە (ف)یشدا سێیەم بەیتە.

شەرارە: پریشکی ئاگر. نەخلی موراد: دارخورمای هیوا و ئاوات. فەصڵ: وەرز.

واتە: داری ئاواتم بە پریشك و گڕی ئاگری خەفەت‌خواردن سووتا و لەبن هات. باخی خۆشی و شادیشم هەموو کات خەزانیەتی و ڕەنگ‌زەردە.

هەموو (کم، گم): هەمە.

(٦) واتە: ئەگەر شیعەیت بە عەلی سوێندت دەدەم، ئەگەر سوونیشیت بە عومەر، کە بەزەییت پێمدا بێتەوە!

سوێندت (ف): سوێنت. دەدەم (کم): ئەدەم. خۆ ئەگەر (ف): وە ئەگەر.

دەبوو (سوێندت دەدەم)، لەبەر درێژیی بڕگەکە، یا (سوێنت دەدەم) یان (سوێندت ئەدەم) بووایە، تا لەنگ نەبێ.

(٧) ئەم بەیتە لە (مان، ق)دا نییە.

واتە: زۆر سەیر نییە و شتێکی ئاساییە ئەگەر سالمی بێچارە وەك فەرهاد کێوهەڵکەن بێ، چونکە دڵبەرەکەی "شیرین"ە و زمانی شیرینە و دەهێنێ ئەوەی بۆ بکا.

شایانی باسه، وەك وترا، ئەم بەیتە لە (مان)دا نییە، یانێ لەوێ ناسناوی "سالم" نییە. بەڵام وەك لە (ف) و پەراوێزی چاپەكەی (كم)دا نووسراوە: ئەم پارچەشیعرە بە ناوی "حەسرەتی"یەوە لە یەكدوو جێگەدا وا دێ: «حەسرەتی ناوە ئەگەر كۆهكەنی بیمارم». بەپێی بۆچوونی ئەوانە "حەسرەتی" ناوی خاوەنی پارچەشیعرەكەیە! نوسخەی (ف)یش، یەكەم نیوەی بەیتەكەی بە هەمان شێوەیە. ئێمە پێمان وایە ڕستەكە «حەسرەتی ناوە» نییە، بەڵكوو «حەسرەتی ناوێ»یە، كە زۆر لەگەڵ شوێنەكە دەگونجێ.

هەرچۆن بێ، وا بەم جۆرە پێنج نوسخەیمان دەستكەوت: یەكەم هیی نوسخەكانی (كم، گم)ە، كە لە دەقەكەدا دانراوە و ناسناوی سالمی تێدایە، دووەم لە بەر ڕۆشنایی پەراوێزی چاپەكەی (كم)دا كە دەبێتە «حەسرەتی ناوێ ئەگەر كۆهكەنی بیمارم»، بەڵام نیوەی دووەم لەسەر ئەم بارە دەبێ بەم جۆرە بێ: «دڵبەرم هەر وەكوو "شیرین"زوبانە بە عومەر»، ئیتر ناوی سالمیش نامێنێ.

## -٢٦- (*)

**به حەقیقەت، صەنەما، دیدەتە ئوستادی هونەر**
**بۆ نگینی جگەر ئەڵماسە موژەت، وەختی نەظەر (١)**
**دڵ قەفای خوارد و شکا، کردیە نیشانەی قیرقاج**
**گەردشی تیری نیگاهت بە قەفا میثلی قەجەر (٢)**
**مەنزڵی عەقرەبی زوڵفە، قەمەری چیهرەیی تۆ**
**لەم دەرە بۆ منی غەمدیدە ئەبەد نەحسە سەفەر (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، غ، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) صەنەما! بتەکەم! خۆشەویستەکەم! نگین: نقێم. نەظەر: تەماشاکردن.

واتە: ئەی بتەکەم! لە ڕاستیدا چاوە جوانە جادووەکانت مامۆستای هونەرن، موژەت کە وەك ئەڵماسە لە کاتی تەماشاکردندا نگینی جگەرمە، واتە جگەرم ئەنگوستیلەیە و موژەت دەبێتە نقێمی، بەڵام نقێمێکی بڕندە. دیارە ئەم بوون بە نقێمە لە کاتێکدایە کە یار چاو دەبڕێتە عاشق و دڵی دەپێکێ.

صەنەما دیدەتە (مان): دیدیتە، هەڵەی نووسینە. (غ): صەفا. هەڵەیە. وەختی (کم، گم): گاهی.

(٢) قەفای خوارد: لە پشتەوە لێی درا. قیرقاج: خواروخێچ.

واتە: جموجووڵ و چەرخاندنی تیری تەماشاکردنت و چاوگێڕانت بە تیری پەڕی لە پشتەوە دای لە دڵم و شکاندی و وەك قاجارێك کردیە نیشانەیەکی خواروخێچ.

بە (کم، گم): لە. قیرقاج (مان): قرقاج. بە قەفا (ق): بە قەضا.

(٣) عەقرەب: دووپشك. قەمەر: مانگ. چیهرە: ڕوخسار. غەمدیدە: خەفەتدیو. ئەبەد: هەمیشە. نەحس: شووم، مایەی نەگبەتی.

واتە: مانگی ڕوخساری تۆ جێی دووپشکی زوڵفتە، دیارە زوڵفی پێچولوولە و چزووداره وەك دووپشك. سەفەرکردن لەم دەرگایەدا، واتە دەوروبەری یار، بۆ منی خەمبار نەگبەتییە، چونکە دڵی سالم لە پێچی زوڵفی یاردا خۆی حەشار داوە، هەر بجووڵێتەوە بە چزووەکەی پێیەوە دەدا.

تەناسوبێکی زۆر جوان لە کۆکردنەوەی (قەمەر) لەگەڵ (عەقرەب) -کە ناوی بورجێکی ئاسمانە- هەیە، قەمەر دەبێتە شوێنی عەقرەب! تۆ بڵێی لایان وابووبێ ئەگەر مانگ لە بورجی عەقرەبدا بێ، سەفەرکردن مایەی نەگبەتییە.

**کوورەیی شیشەپەزە بۆ دڵی سەختم، عیشقت**
**لە تەفی جۆششی ئەم ئاگرەدا مۆمە، حەجەر! (٤)**
**وا موقیمی سەری کۆتە وەکوو خاکی قەدەمت**
**"سالم"ی غەمزەدە مەحرومە لە ئیخوان و پودەر (٥)**

(دەرە) لە (غ)دا کەوتووە.

(٤) شیشەپەز: شووشەکوڵێن، شووشەدروستکەر. تەف: گەرمی. جۆشش: تینوتاو. حەجەر: بەرد.

واتە: عیشقی تۆ بۆ دڵی سەرسەخت و بوردەبارم کوورەی بەتینی شیشەپەزە، عیشقی تۆ دەیتوێنێتەوە و دەیشیکاتە شووشەی ناسکی بەرگەنەگرتوو. بەڵێ، گەرمی و جۆشی ئەم ئاگری بەتینی عیشقە، بەرد وەك مۆم دەتوێنێتەوە! کێ بەرگەی گەرمیی ئاگری عیشق دەگرێ؟!

شیشەپەزە (غ): شیشەیی پزە. (کم، گم): شیشە پزە. (ق): شیشی پزە.

(٥) موقیم: نیشتەجێ. کۆ: دەوروبەری ماڵ و مەنزڵی یار. غەمزەدە: خەمبار. ئیخوان: براگەل. پودەر: باوك.

واتە: سالمی خەمبار ئەوەتە لە خاکی بەردەرگاتدا وەك خاکی بەری پێت نیشتەجێیە و بەجێیناهێڵێ، چونکە لە کەس‌وکار و باوك و برا دابڕاوە.

## -٢٧- (*)

**چاكیری خاصصەتە دڵ، خوسرەوی شیریندەهەنان**
**لە صیفەت وەصف و ڕوخت، لەم ڕەهە شاپوورە مەگەر (١)**
**جورمی كونجوشكی نییە جان لە ڕەهی شاهی عیشق**
**دڵ لە چنگ بازی غەمت، قاڵبی عوصفوورە مەگەر (٢)**
**یەكەتازە لە فەلەك ماهیی دووهەفتە بە من**
**دولبەری شەمس‌لیقا، لەم شەوە مەستوورە مەگەر (٣)**
**ئەوجی حوسنت لە ڕوخ و زوڵف و جەبین و ئەبرۆ**
**لە هەموو میهر و هیلال، شەوی دەیجوورە مەگەر (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە بەم شێوەیە هەر لە (م)دا هەیە. نازانرێ چەند بەیتی لە سەرەتاوە کەوتووە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتی مەخبوونی مەحزووف.

(١) چاکیر: نۆکەر. خاصصە: تایبەت. خوسرەو: خوسرەوی پەروێزی یەکێك لە ناودارترین پادشایانی ساسانییە. شیریندەهەن: دەمشیرین. شاپوور: دلاوەرێکی ئێرانیی ڕۆژگاری خوسرەوی پەروێز بووە.

واتە: ئەی خوسرەوی دەمشیرینەکان، دڵ نۆکەری تایبەتی تۆیە. مەگەر وەسفی ڕووی تۆ لەم ڕێیەدا وەك شاپوور وایە.

(وەصف و)، ڕاستترە (وەصفی) بێ.

(٢) جورم: قەوارە. کونجوشك: چۆلەکە. جان: گیان. ڕەه: ڕێ.

واتە: جەستە لە ڕێی پادشای عیشقدا هێندەی چۆلەکەیەکی بچووك نابێ. مەگەر دڵ لە چنگی بازی خەمی تۆدا ئەوەندەی چۆلەکەیە؟!

(٣) یەکەتاز: پێشەنگ. ماهی دووهەفتە: مانگی چواردە. شەمس‌لیقا: ڕوو وەك خۆر. مەستوور: شاراوە.

واتە: مانگی چواردە لە گەردووندا بەرەو من لە غاردایە، بە ئاسمانەوە نامێنێتەوە و بۆ من نابێ. دڵبەری ڕوو وەك خۆر، مەگەر بۆچی لەم شەوەدا دیار نییە و شاردراوەتەوە؟!

(٤) ئەوج: بەرزترین ئاست. حوسن: جوانی. ڕوخ: ڕوخسار. جەبین: ناوچاوان، تەوێڵ. هیلال: مانگی یەكشەوە. دەیجوور: ئەنگوستەچاو.

واتە: مەگەر ڕوخسار و زوڵف و ناوچاوان و برۆت بەرامبەر بە خۆر و مانگی یەكشەوە و شەوی

**بەرقە بۆ خەرمەنی عاشق، بە یەقین جەور و جەفات**
**سەرْوی میهرت لە دڵا داروویی کافوورە مەگەر (٥)**
**کە بە حاڵ جیلوە ئەکات، شێوەیی حەق، ئەیمەن نیم**
**پەرتەوی نوورە وەیا شەعشەعەیی طوورە مەگەر (٦)**
**سینە وا بوو بە هەدەف بۆ نیگەهی تیری موژەت**
**دڵی "سالم" لە نیگەهـ خانەیی زەمبوورە مەگەر (٧)**

دەیجوور ناوەستنەوە؟!

نیوەی دووەم لەنگە، بۆیە (هیلال) ڕەنگە (هیلالی) بووبێ.

(٥) بەرق: هەورەبرووسکە. بە یەقین: بێچەندوچۆن، بە بنەبڕی. جەور: ستەم. جەفا: ئازار. میهر: خۆشەویستی. داروو: دەرمان. کافوور: ماددەیەکی گیایی بێڕەنگ یا ڕەنگسپی بۆنخۆشە.

واتە: ڕاستییەکەی، ستەم و ئازارت بۆ خەرمانی عاشق هەورەبرووسکەیە. سەروی خۆشەویستیت لە دڵدا وەك دەرمانی کافوور وایە، دڵ بەهێز دەکا.

(٦) بەحاڵ: بە ئاستەم. جیلوە ئەکات: دەردەکەوێ. ئەیمەن: دڵنیا. پەرتەو: پرشنگ. نوور: ڕووناکی. شەعشەعە: درەوشانەوە.

واتە: کە شێوەی ڕاستی یار بەحاڵ دەردەکەوێ، دڵنیا نیم درەوشانەوەی (توور)ە دەیسووتێنێ، یا تیشکی ڕووناکیەتی.

(ئەکات)، لە بنەڕەتدا (دەکا یان دەکات) بووە و گۆڕراوە.

(٧) هەدەف: نیشان. نیگەهـ: نیگا. زەمبوور: زەردەواڵە.

واتە: سنگم بووە بە نیشانی نیگای تیری برژانگت. مەگەر دڵی سالم لە بەرچاوتدا شارەزەردەواڵەیە، وا ئاوای لێ دەکەی.

-٢٨- (*)

((رَبّنا)) ساكینی كۆتن، چ غولام و چ ئەمیر
وەكوویەك ئەهلی نیازن، چ غەنیی و چ فەقیر (١)
بە ئومێدی كەرەمت، شام و سەحەر، سوجدەكونان
دەكەن ئیظهاری ڕەزالەت، چ گەداوو چ وەزیر (٢)
بە نەظەر ڕەحمەتی تۆوە لە نەظەر ئەهلی بەصەر
جوملە نەزدیكی نەجاتن، چ زەلیل و چ ئەسیر (٣)
شەرەفی خەلعەتی خاصصت بە قەدەر كوللی جیهان
چەسپە بۆ قامەتی هەر كەس، چ طەویل و چ قەصیر (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە موناجاتبابەتە لە (مان، ف، ج، ق، ڕ، كم، گم)دا هەیە.

كێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەقسوور.

(١) ربّنا: پەروەردگاری ئێمە! كۆ: بەردەرگا و دەورووبەر. نیاز: موحتاجی، پێویستی.

واتە: خودایە! چ خزمەتكار و چ ئەمیر و فەرماندار لە بەردەرگاتدا دانیشتوون. چ دەوڵەمەند و چ هەژار، وەك یەك چاولەقاپیی تۆن.

ساكینی كۆتن (كم، گم): دڵ كون كونن سا.

(٢) شام: ئێوارە. سوجدەكونان: بە كوڕنووشبردن.

واتە: چ گەدا و چ وەزیر، بە هیوای بەخششی تۆ كوڕنووش دەبەن و كەمینەیی خۆیان لە بەردەرگاتدا دەردەخەن.

سوجدەكونان (ف، ج، ڕ، كم): گریەكونان. (گم): گریەكەنان. ڕەزالەت (ف، ج، كم، گم): حەقارەت.

(٣) ئەهلی بەصەر: خاوەنچاو، مەبەستی دڵڕوونایانە.

واتە: ئەوانەی كە دڵڕوونان، چ پەككەوتوو و چ دیل، لە بەرچاوی بەزەیی و میهرەبانیی تۆدا نزیكن لە ڕزگاربوون و هیچیش مەحاڵ نییە.

نەزدیكی (ج): نەزدیكە. نەجاتن (ڕ): نەجتن. هەڵەی نووسینە. ((زەلیل لە (مان)دا دەبوو ((ذەلیل بووایە.

(٤) واتە: شەرەفی خەڵاتی تایبەت بەقەدەر هەموو دنیایە و چەسپە و پڕ بە باڵای هەموو كەسێكە، چ كورت و چ درێژ. یانێ خەڵاتت بۆ هەموو كەس هەیە.

**زۆر به کەم گاهی کەرەم قابیله بۆ قودرەتی تۆ**
**جورمی صفری ئەحەدێکه، چ قەلیل و چ کەثیر (٥)**
**سەطحی دونیا وەکو گەهوارەیە بۆ طیفلی بەشەر**
**شیرْخواری کەرەمی تۆن، چ صەغیر و چ کەبیر (٦)**
**فیکری خاصی نودەما و قودەرەتی تۆ ضیددی یەکن**
**لەم ڕەهە مەحوی کەماڵن، چ مودیر و چ موشیر (٧)**
**طالیبت گەینه مەقامێ بە صەفای هیممەت و حاڵ**
**چ تەفاوت نییه بۆیان، چ پەلاس و چ حەریر (٨)**

شەرەفی (کم، گم): شەرەف و. چەسپە (ف، کم): چییە. هەڵەی چاپە.

(٥) ئەم بەیتە لە (ف)دا پێنجەم و لە (ج)دا شەشەمە و لە (ق)یشدا نییە.

گاه: کات. کەرەم: بەخشندەیی. جورم: قەبارە. ئەحەد: یەك.

واتە: دەسەلاتی ئەوەت هەیە زۆر بدەی بە یەکێك بەرامبەر بە چاکەیەکی کەمی ئەو. وەك ئەوەی چۆن سفرەکانی بەردەم ژمارەیەك زۆر بن یا کەم، لە ئاستی بەخشندەیی تۆدا هیچ نین و قەبارەیەك نانوێنن.

بە کەم (کم): بکەم. گاهی (ج، ڕ): وەختی. قودرەتی (ف، ج، ڕ): ڕەحمەتی. جورمی صفری ئەحەدێکه (کم): جرمی صغرا بە ضدیکه.

(٦) ئەم بەیتە لە (ف)دا چوارەمە.

گەهوارە: بێشکە.

واتە: تەختی ڕووی زەوی بێشکەیە و بنیادەم هەموو ساوان، چ گەورە و چ بچووك هەموو شیرەخۆری بەخشندەیی تۆن.

شیر (کم، گم): شیرە.

(٧) ڕەهە: ڕێگا.

واتە: بیری تایبەتیی هاونشینانی گەورەپیاو و دەسەلاتی تۆ دژی یەکن، ئەوان بێهێز و تینوتوانی تۆ بێسنوور. لەم ڕێیەدا، چ فەرماندار و چ ڕاوێژکار لە تەواوی و گەورەیی تۆدا نانوێنن.

خاصی نودەما (کم) قاضی و نودەما. (ق): خاص و بەد یا. (گم): خاص و نودەما. ضیددی یەکن (ف، ج، ڕ، کم، گم): لێك دوورن. چ مودیر و چ موشیر (کم، گم): چ موشیر و چ مودیر.

(٨) ئەم بەیتە لە (ف، ج، ڕ، کم، گم)دا نییە.

واتە: ئەوانەی وا بە دوای ڕەزامەندیی تۆدا دەگەڕێن، لە دڵڕووناکی و هیممەتبەرزیدا گەیشتوونەتە

**شاهیدی خالیقە تەصویریی خەلایق، ئارێ**
**ظاهیرە قودرەتی صونعت، چ لە بوڕنا چ لە پیر (٩)**
**حورمەتێکن لە کەفی بەخششی تۆ، گەوهەر و خاك**
**زێوەرێکن لە وجوودا، چ قوماش و چ حەسیر (١٠)**

پایەیەکی وەها کە چ بەرگی پەلاسی زبر و چ پۆشاکی ئاوریشمینی نەرم و جوان، هیچ فەرقیان نییە لایان.

طالیبت (ق): طالیبی. هیممەت و حاڵ (ق): میحنەتی دڵ.

(٩) ئەم بەیتە لە (ڕ)دا هەشتەمە.

ئارێ: بەڵێ. بوڕنا: گەنج.

واتە: وێنەکێشانی ئەم هەمووە دروستکراوانە، ئەم هەموو ئەرز و ئاسمان و مانگ و ئەستێرانە، شایەتی بوونی خودا و توانایی ئەون. بەڵێ، توانایی خودا، چ لە گەنجی و هێز و پاراویدا و چ لە پیری و پەککەوتوویی و داماویدا، بە ڕوونی دەردەکەوێ.

شاهیدی خالیقە (کم): شاە خالتە. ئارێ (ڕ): ئارای. هەڵەیە. صونعت (کم): حەقت.

(١٠) واتە: چ گەوهەر و چ خاك شتێکی بەحورمەت و بەقەدرن لە دەستی بەخشندەیی تۆدا، چ قوماش و چ حەسیر جوانن لە جیهاندا.

شایانی باسە، بەپێی ئەم نوسخانە ناسناوی سالم نییە.

حورمەتێکن (ف، ڕ): حەرەمێکن. گەوهەر و خاك (ف، ج، ڕ): هەر وەکو خاك. (حەسیر) لە (مان)دا بە (حەصیر) نووسراوە. وجوودا (ف، ج، ڕ): جەوادت. چ قوماش (ف، ڕ): چ حەریر.

(کم، گم) لەباتیی ئەم بەیتە، ئەم بەیتەی خوارەوەیان تێدایە:

«دڵی "سالم" لە کەفی بەخششی تۆ هەروەکوو خاك
زێوەریکن لە جەوادت، چ حەریر و چ حەسیر»

(*) -٢٩-

**هەڵپڕژا خوێن بە جگەرما دەمی غەمزەت لە ضەمیر**

**هاتە جونبوش کە بە ئاهم لە دەروونا، پەڕی تیر (١)**

**بۆ ڕەفووکردنی چاکی دەمی شەمشێری برۆ**

**موژە تەڕدەستە لە دڵما، وەکوو سووزن لە حەریر (٢)**

**هەمە جا خوارْکشان تا بە لەبی چاهی زەنەخ**

**کافری دڵسییەهی دیدە دەبا دڵ بە ئەسیر (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، غ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەقسوور.

(١) ضەمیر: دڵ.

ئەگەر بەیتەکە بکەینە پەخشان، بەم جۆرەی لێ دێت: دەمی غەمزەت کە بە ئاهم پەڕی تیر لە دەروونا هاتە جونبوش، هەڵپڕژا خوێن لە ضەمیر بە جگەرما.

پوختەی واتای بەیتەکە: کە غەمزە و نازی چاوت کەوتە کار و پەڕی تیری برژانگت دڵمی سمی و ئاهم بەرز بووەوە، پەڕی تیر بەهۆی ئاهەکەمەوە هاتە جونبوش و لە دڵەوە خوێن بە جگەرمدا هەڵپڕژا.

لە ضەمیر (عا، غ): بە ظەمیر. هەڵەیە. لە دەروونا (کم، گم): لە دەروونیدا. جێی باسە، سالم – بەپێی هەموو نوسخەکان– بە دەگمەن (دا)ی بەکارهێناوە.

(٢) ڕەفووکردن: چنینەوەی پارچەی دڕاو، (ڕەووافی)ی ئەمڕۆ. چاك: پارچەپارچە. موژە: برژانگ. تەڕدەست: گورج دەست دەوەشێنێ و دەکەوێتە کار، دەستهەڵێن.

واتە: برژانگ ئامادەیە وەك کارکردنی سووژنی زل لە ئاوریشمی ناسکدا، بۆ چنینەوە و چاككردنەوەی ئەو دڵەی کە دەمی شمشێری برۆت لەتلەتی کردووە. چۆن چنینەوە و چاككردنەوەیەکە؟!

دڵما (عا): ما. هەڵەیە.

(٣) هەمە جا: هەموو جێیەك. خوارکشان: بەرەوخوار کێشان. لەب: لێوار. چاه: چاڵ. زەنەخ: چەناگە. دڵسییەه: دڵڕەش. ئەسیر: دیل.

ئەڵبەت مەبەستی ئەوەیە: لە هەموو لایەکەوە ڕاکێشانی دڵ بوو بەرەوخوار، تا گەیشتە لێواری چاڵی چەناگە. چاوی یار کە کافرە و دڵڕەشە، دڵم بە دیلی دەبا، تا لەو چاڵەدا دەستبەسەری بکا و بیهێڵێتەوە. جوانە دیدە گلێنەکەی ڕەشە کە دڵەیتی.

تا تەڕەددودمە لەسەر صەفحەیی دونیا لە غەمت
بەس کەشاکەش لە گوزەرمایە وەکوو کلکی دەبیر (٤)
بۆ سروشتی بەدەنت، ڕۆژی ئەزەل صانیعی گوڵ
صافییی مرواری و ماهی بە یەکا کردە خەمیر (٥)
بە نیگاری عەجەمیشێوەیی تۆ نایێتە ضەبط،
تازەئاموو‌خْتە کەی مەشقی دەگاتە خەطی میر؟ (٦)
زێڕە، سەرمایەیە بۆ "سالم" و (کرمان)ی دەبا
شیعری کوردی کە بدا جیلوە لە لای شێخی کەبیر (٧)

هەمەجا خوارکشان. (عا): بە هەمەجا خوارکشا. سییەهی (عا): سهیل.

(٤) تەڕەددود: هاتوچۆ. کەشمەکەش: کێشمەکێش، دەردەسەری. گوزەر: ڕێگەی پێدا تێپەڕین، مەبەستی تێکڕای ڕێگەیە. دەبیر: قەڵەم.

واتە: لە ڕووی دنیادا، دوودڵ و ڕاڕام لە خەم و پەژارەی یار. وەك کلکی قەڵەم کە بە چەندین باردا هەڵدەسووڕێنرێ و هەمیشە لە جموجووڵدایە، دەردەسەریی زۆر لە ڕێگامدایە.

بەس (مان): بەسا، لەنگە! لە گوزەرمایە وەکوو (کم، گم): لە کەدەر مایەوە وەك.

(٥) سروشت: مەبەستی خوڵقاندن و دروستکردنە. صانیعی گوڵ: مەبەستی خودای کردگارە. ماه: مانگ. خەمیر: هەویر.

واتە: خودای کردگار، لە کاتێکی زووی ڕۆژگارەوە مرواریی ورشەدار و مانگی تریفەداری بۆ دروستکردنی تۆی وەك گوڵ جوان کردە هەویر، تۆ لەو دووانە دروست کرای!

ڕۆژی (عا): ڕۆزی. صانیعی (کم): صاحێبی. گوڵ (غ، کم): کولل. مرواریی و (عا): مرواریی. خەمیر (غ): عەجین.

(٦) تازەئامووختە: تازە فێربوو. میر: ئەڵبەت مەبەستی میرزایە، کە دەبێ خەتی خۆش بێ، یا هەر ئەمیرە کە ئەوسا خوێندن و نووسین هەر بۆ ئەوان ئاسان بووە!

واتە: نیگارکێشی عەجەمی ناتوانێ شێوەی تۆ بەتەواوی بکێشێ. بەڵێ، خەت و مەشقی کەسێکی تازە فێری نووسین بوو، ناگاتە خەتی میرزا، یا خەتی ئەمیر.

ضەبط (عا): ظەبط. هەڵەیە. میر (کم، گم): ئەمیر.

(نایێتە) لەبەر کورتیی بڕگەکە بە (نایەتە) دەخوێنرێتەوە.

(٧) کرمان: شارێکی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئێرانە و ئێستا ناوەندی ئوستانێکە بە هەمان ناوەوە.

واته: شیعری "کوردی" که لای شێخی گەورە جوان بێ و جوان بنوێنێ، ئاڵتوونە و سەرمایەیە بۆ سالم و بۆ ناوچەی (کرمان)ی دەبا، یا بۆ سالم و "کرمانی" ناوێکی دەبا. بەو پێیە، ئەگەر وابێ: سالم سالمە، ئەی کرمانی کێیە؟ "کوردی" و شێخی کەبیر کێن؟ تۆ بڵێی شیعرەکە هیی مستەفا بەگی "کوردی" بێ، ئێمە بە شیعری "کوردی"ی نازانین. شایانی باسە، (گم) وشەی (کرمان)ی لەناو کەوانەدا داناوە، یانێ شاری (کرمان)!

"سالم" و (عا): سالم.

## -٣٠- (*)

**زەهرە خەشمی تۆ، نەزانێ نۆشە، گەر ذەوقی ضەمیر**

**نەسرەوێ شەو تا سەحەر، یا ڕەب، لە ئێشی نێشی تیر (١)**

**سالیکی جادەی حەقیقی، گەر جەوانمەردی دەکا،**

**با بخوێنێ دەرسی عیشقت ئیبتیدا تا بێ بە پیر (٢)**

(١) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەقسوور.

(٢) نۆش: هەنگوین، ئاوی زیندەگانی. نەسرەوێ: نەحەسێتەوە.

ئەم بەیتە نەختێ ئالۆزە: ((زەهرە خەشمی تۆ .. تاد))، کە لە دەقەکەدا دەیبینن، لە (مان)دا نووسراوە ((زەهرە چەشمی تۆ .. تاد)). نووسەرەوەی دیوانەکە بە زوهرەی ئەستێرەی تێگەیشتووە کە پێی دەشوبهێنرێ. (گم) نیوەبەیتەکەی بەم جۆرە نووسیوەتەوە: ((زوهرە گەر خەشمت نەزانێ نۆشە گەر شەوقی ضەمیر)) کە (شەوقی)یەکەی بە یەکجاری تێکیداوە. (گەر)ەکانیش یەکێکیان بێمەعنا دەمێنێتەوە. بەڵام (کم) نووسیویە ((زهرە گەر خەشمی تۆ نەزانێ نوشە گەر شەوقی ضەمیر)) کە جگە لە سرنجەکانی سەر نوسخەی (گم)، نیوەبەیتێکی درێژ و لەنگی لێ دەردەچێ! (ق) نووسیویە ((زەهری خەشمی تۆ)).

لەبەر ڕووناکیی وشەی (خەشم)ی نوسخەکانی (کم، گم)دا وای بۆ چووین کە "چەشمی"ی نوسخەکانی (مان، حا، ق) بە تەواوی هەڵەیە، سا یا زەهرە خەشمی..، وەك نووسراوە، یا زەهری خەشمی.. تاد. کە دەربڕینی وەها لە کوردەواریدا هەیە: وەك شەکرەسێو، نوقڵەدەم .. تاد. واتە ژەهری ڕق وەك واتای زەهری خەشمی. بەم جۆرە واتای بەیتەکە وەها دەبێ: ڕقی تۆ کە ژەهری کوشندەیە، ئەگەر زەوقی دڵی عاشق بە هەنگوینی نەزانێ، یا بە ئاوی زیندەگانیی نەزانێ، خودایە شەو تا بەیان لە ئازاری چزووی تیر نەسرەوێ و خەوی لێ نەکەوێ. یاخۆ: ڕاستە ڕقی یار ژەهرە و تاڵە، سەرباری ئەوە ئەگەر زەوقی دڵی عاشق .. تاد.

زەهرە خەشمی (ق): زەهری چەشمی. ضەمیر (ق): خەمیر. ئێشی نێشی (ق): ئێش و نێشی.

(٣) ئەم بەیتە لە (ق)دا سێیەمە، چونکە بەیتی یازدەیەمی پارچەشیعری (٢٩)ی بە هەڵە کردووە بە دووەم بەیتی ئەم پارچەیە.

سالیك: ڕێڕەوی ڕێگرتوو، زاراوەی صۆفییانە. پیر: مەبەستی شێخی تەریقەتە.

واتە: ئەوی موریدە و ڕێگرتووی جادەی ڕاستییە، ئەگەر جوامێری دەکا، با لە پێشدا دەرسی عیشقی تۆ بخوێنێ، تا بگاتە پایەی پیری تەریقەت!

**شیرەیی پوستانی حوسنت قووتی طیفلی مەردومە**
**شیری پوستانی نەبێ ناژی، یەقین، طیفلی صەغیر (٤)**
**ناڕەسیدە کوودەکێکە موستەعیددی کوشتنم**
**بۆیی خوێنم دێ لە غەمزەی، دێ لە لێوی بۆیی شیر (٥)**
**وەك لە تاریکیی شەوا، ناگەه، چراغێ بێتە دەر**
**پەردەیی زوڵفی کە لادا، کەوتە دەر بەدری مونیر (٦)**
**تا لە کوفری زوڵفی یارا دڵ گرفتاریی نەدی**
**نەمدەزانی، «پیش ازاین»، بەم شەرحە ئەحواڵی ئەسیر (٧)**

جادەی (ق): ڕاهی. با بخوێنێ (کم، گم): تا نەخوێنێ. تا بێ (کم، گم) نابێ.

(٤) پوستان: مەمك. قووت: بژیو، ئەوەی گیانلەبەری پێ بژی. مەردوم: خەڵك، یا گلێنەی چاو.

واتە: شیرەی مەمکۆڵەی جوانیت هۆی ژیانی منداڵی خەڵکە، یا هۆی مانی گلێنەی چاوە. دیارە ساوای بچووك شیری مەمکی نەبێ، ناژی.

شیرەیی پوستانی (ق): شیرەیی بوستانی.

(٥) ئەم بەیتە لە (حا)دا پێنجەمە و لە (کم، گم)یشدا نییە.

ناڕەسیدە: پێنەگەیشتوو، کاڵ، ساوا. کوودەك: منداڵ. موستەعید: ئامادە و ساز.

واتە: منداڵێکی ساوای پێنەگەیشتوو ئامادەیە بۆ کوشتنم و قۆڵی لێ هەڵماڵیوە، بۆنی خوێنی من لە نازی چاوی دێ، کەچی بۆنی شیر لە لێوانی دێ، یانێ ئەوەندە منداڵە.

کوودەکێکە (ق): کوودەکێکم.

(٦) ئەم بەیتە لە (حا)دا چوارەمە.

ناگەه: لەپڕ. چراغێ: چرایێ. بەدری مونیر: مانگی چواردەی تریفەدار.

واتە: وەك چۆن لە تاریکیی شەودا لەپڕ چرایەك بێتە دەر و دنیا ڕووناك بکاتەوە، کە پێچی زوڵفی لادا، مانگی چواردەی ڕوومەتی تریفەداری دەرکەوت و دنیای ڕوون کردەوە.

تاریکیی شەوا (ق): تارکەشەوانا. ناگەه چراغێ (ق): گا چرا گەر. بێتە دەر (کم): دەرکەوێ.

(٧) تار: تاریك. پیش ازاین: فارسییە، پێش ئەمە. بەم شەرحە: بەم درێژییە.

واتە: تا دڵ دیلیی لە کوفرستانی زوڵفی تاریکی یاردا نەدی، وەزعی دیلم بەم درێژییە نەدەزانی چۆنە؟

**کەی بە دامانت دەگا سا، دەستی ئەو، گاهی نیاز**
**تۆ شەهی حوسن و جەلال و "سالم"ی میسکین فەقیر** (٨)

گرفتاریی (کم): گرفتاریم. ((پیش ازاین)) لەبەر کێشی بەیتەکە بە (پیشەزین) دەخوێنرێتەوە. یارا دڵ گرفتاری (کم): یار ئەووەڵ گرفتاریم، هەڵەی نووسینە.

(٨) ئەو: واتە سالم. گاهی نیاز: کاتی پاڕانەوە.

واتە: کەی دەستی سالم لە کاتی سکاڵا و پاڕانەوەدا بە دامێنت دەگا؟ تۆ پادشای جوانی و گەورەیی و شکۆداریی و سالمیش گەدا و هەژارە.

گاهی (کم، گم): وەختی. جەلال و (حا، ق، کم، گم): جەلالی.

## -٣١- (١)

دەکا یادت بە پەنهان بۆ دڵم هەردەم، جەفا ظاهیر
لە هەر گامێ بە سەیلی میحنەتت بۆ من قەضا ظاهیر (٢)
لە بەر یادی فیراقت هەڵگڕا ئەمشەو چرای عومرم
نییە پابەندەگی تا صوبحْدەم وەصفی فەنا ظاهیر (٣)
مەپۆشە پەنجەیی نازك، نیگارت با نومایان بێ
لە ئەشکی ئاڵی گریەی چاوی من، ڕەنگی حەنا ظاهیر (٤)
نییە بۆ شاهیدیی مەی کەس، قەراری پەردەیی عیصمەت
لە چاوی مەستی نازت چۆنە وا شێوەی حەیا ظاهیر؟! (٥)

(١) ئەم پارچەشیعرە لە (کم، نم، پ، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(٢) گام: هەنگاو. سەیل: لافاو. قەضا: مەبەست بەڵایە.

واتە: یادی تۆ بە نهێنی هەموو جارێك ئازاری دڵم دەردەخا. یادەکە نهێنییە و جەفاکە ئاشکرا! لە هەر هەنگاوێکەوەیە بەهۆی لافاوی مەینەتەوە، بەڵام بۆچی پەیدا دەبێ؟

دەکا (کم): ئەکا. بە پەنهان (نم): لە پەنهان.

(٣) ئەم بەیتە هەر لە (نم، پ)دا هەیە.

واتە: ئەمشەو یادی دووریی یارم کردەوە و ئاگری چرای تەمەنم بە شێوەیەك هەڵگڕا و بەرز بووەوە تا بەرەبەیان وا مایەوە، ئیتر لەناوچوونم دەرکەوتووە و مسۆگەرە.

عومرم (پ): غەمماز. وەصفی (پ): وەضعی.

(٤) نازكنیگار: جوانەنەخشێنراو. نومایان: دەرکەوتوو و ئاشکرا. حەنا: خەنە.

واتە: پەنجەی جوان ڕەنگکراوت دامەپۆشە، با دەرکەوێ، چونکە لە فرمێسکی خوێنی ئاڵی منەوە ڕەنگی خەنە بە دەست و پەنجەتەوە دەردەکەوێ. ڕەنگی پەنجەت خوێنی چاومە، مەیشارەوە، با خەڵك بە ستەمت بزانن.

نازك نیگارت (نم): نازت نیگارا.

(٥) «قەراری پەردەیی عیصمەت»، ڕەنگە «قەراری پەردەیە عیصمەت» بێ، جا واتای بەیتەکە بەم جۆرە دەبێ: هیچ کەس نییە شایەتی بدا کە تۆ مەیت خواردووەتەوە و سەرخۆشی. لەبەرئەوە بڕیاری پشتپەردەی دادگا ئەوەیە کە تۆ بێگوناهی، ئیتر بۆچی شەرم لە چاوی مەستی غەمزە و نازتدا

**سەروکارێکی پەیدا کرد دەماغم لەخلەخەی ناوی**
**لە نەفحەی چینی نافەی زوڵفی تۆ، موشکی خەتا ظاهیر (٦)**
**لە فیکری صەنعەتی ڕووت کارْخانەی حەق هووەیدایە**
**لە سیڕڕی نوقطەیی خاڵی لەبت فەردیی خودا ظاهیر! (٧)**
**نەماوە قودرەتی چاوم بە خواهیش سەیری چاوت کا،**
**لە ئیمای تورکی دیدەت بۆ دڵم تیری قەضا ظاهیر (٨)**
**خەیاڵی دڵ چلۆن قەصدی لەبی لەعلت دەکا، ئیتر**
**کەناری گەنجی ڕوخسارت لە هەر سەودا دەکا ظاهیر (٩)**

ئاشکرایە، پێویستت بە شەرم نییە.

مەی کەس (پ): مەیکەش. دروستترە. بەو پێیە یانێ: بڕیاری پشتپەردەی بێگوناهی نییە بۆ شایەتیی مەیخۆرەوە. مەستی نازت چۆنە وا (پ): بادەنۆشت هەر نەظەر. حەیا (کم): حەنا.

(٦) ئەم بەیتە هەر لە (نم، پ)دا هەیە.

لەخلەخە: تێکەڵەیەك لە شتی بۆنخۆشی وەك میسك و عەنبەر و کافوور.

واتە: دەماخم سەروساختێکی لەگەڵ تێکەڵەی بۆنخۆشی ناوی یار، یان ناو خۆی، پەیدا کرد. بۆنی میسکی ئەگریجەی یار، بۆنی میسکی وڵاتی خەتای هێنایە ئارا.

(نەفحە) لە هەموو نوسخەکاندا بە هەڵە بە (نەفخە) نووسراوە.

(٧) واتە: ڕوخسارت ئەوەندە جوانە دەسەڵاتی زۆری خودا لە بیری چۆنیەتیی دروستکردنیدا ئاشکرایە. یانێ: نیشانەیەکە لە نیشانەکانی توانایی خودای کردگار. هەروەها لە نهێنیی نوختەی خاڵی لێوتدا کە وەك خونچە دەینووقێنی و دیار نییە، تاقانەیی خودا دەردەکەوێ. ئیتر کە ئەم ئاوا و نادیار و تەنها و بێوێنە بێ، دەبێتە بەڵگەی ئەوە کە خودا یەکە و کەسنەدیوە.

خودا (نم): خوا.

(٨) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی هەر لە (نم)دا هەن.

واتە: چاوم هێزی بینینی نەماوە تا بیەوێ بڕوانێتە چاوت. هەموو نیگایەکی چاوی دڵفڕێنت کارێکی کردووە تیری بەڵا پەیدا بێ و بەر دڵم بکەوێ.

(٩) واتە: دڵ چۆن دەکەوێتە خەیاڵی توخنکەوتنی لێوی سوورت، وا دەرکەوتووە مامەڵە و ساتوسەودایەکی زۆر لە دەوروبەری گەنجینەی ڕوخسارتدا دەکرێ.

هەر سەودا دەکا (پ): هەر سوو ئەژدەها. دروستترە.

**تەماشا کەن بەهارستانی ڕووی دڵبەر خەزان دێنێ**
**لە چیهرەی "سالم"ی بێچارە، ڕەنگی کەهرڕوبا ظاهیر (١٠)**

(١٠) واتە: وەرن سەیری ئەم ناکۆکییە بکەن، کە چۆن بەهارستانی ڕووی دڵبەر دەبێتە هۆی خەزانی ڕەنگزەردیی من. کاتی دڵخۆشـی یار، ڕەنگی زەردی کارەبا لە ڕوخساری سالمی بێچارەدا دیار و ئاشکرایە.

کەهرڕوبا (کم، گم): کارەبا.

(*) -٣٢-

**ئەگەر شەو ڕۆشنایی بێ، لەبەر نووری قەمەر ظاهیر**
**دەکا پێشانییی یارم لە دەیجوورا سەحەر ظاهیر (١)**
**بە سەهلی تێمەگەن یاران! غوباری مەقدەمی دڵبەر**
**بە مادەرزادی ئەعما، گەر بکا نووری بەصەر ظاهیر (٢)**
**نیشانەی کەوثەر و خولدە، زەمانی وەصڵی دڵدارم**
**لە ئەوضاعی فیراقا، هەر مەکان، شێوەی سەقەر ظاهیر (٣)**
**بڵێن ڕەحمێ بە دڵ کا، مونقەطیع بێ عیشوەیی چاوی**
**لە پەیکانی نیگاهی، هەر طەرەف، ڕێگەی گوزەر ظاهیر (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ق، نم، پ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) قەمەر: مانگ. پێشانی: ناوچاوان، تەوێڵ. دەیجوور: شەوی تاریك.

واتە: ئەگەر شەو ڕۆشنایی لە بەر تریفەی مانگدا دەربکەوێ، شتێکی سەیر نییە. ڕوخساری درەوشاوەی یاری نازدارم لە شەوەزەنگدا شەبەق دەردەخا!

(٢) دوو وشەی (مەگەن) و (بگا) لەم بەیتەدا دوو بار هەڵدەگرن، هەر بارێکیان واتایەکی تایبەتیی هەیە: ئەگەر (مەگەن) و (بگا) بن، واتە: تۆزی بەری پێی یار کە تەشریف دێنێ، بە شتێکی ئاسان و هەرزانی مەزانن، ئەگەر بگاتە کوێری زگماك، ڕووناکی بە چاوی دەبەخشێ و دەیکاتەوە. بەڵام ئەگەر (بگەن) و (بکا) بن، واتە: ئەگەر تۆزی تەشریفهێنانی یار ڕووناکیی چاو لە کوێری زگماکدا دەربخا، بە شتێکی ئاسانی تێبگەن. ئەمە ئیشی ئەوە!

یاران (ق): یارا. بکا (نم): بگا.

(٣) واتە: نیشانەی سەردەمی بەیارگەیشتن و نزیکی لێیەوە، ئاوی کەوثەر و بەهەشتی بەرینە. لە بارودۆخی جیابوونەوەیشدا، شێوەی دۆزەخ لە هەموو لاوە دیارە و جیهان تەڵخ و تارە.

(ضا)ی (ئەوضاعی) لە (پ)دا کەوتووە.

(٤) واتە: بە یار بڵێن با بەزەیی بە دڵمدا بێتەوە و کۆتایی بە عیشوەی چاوی سیحربازی بهێنێ. دڵ لە پەیکانی نیگای ئەوەوە لە هەموو لایەکەوە کون و دیوادەر بووە، بووەتە ڕێی هاتوچۆ.

**موهەییایە مەکانی نەونیهالی قامەتی سەرْوی**

**لە دیدەی ئینتیظاری، ڕۆژ و شەو عەینی ثەمەر ظاهیر (٥)**

**دەڵێن: حاشا لە سۆزی دڵ دەکەی، ئەی زاهیدی کەودەن!!**

**شیکاف کەم پەردەیی سینەم، ببێ شەمعی فەنەر ظاهیر (٦)**

**نیگاهی ئیسمی خۆی هەڵکەند بە چالاکی لەناو دڵما**

**لە ئەڵماسی موژەی بۆ نیکتە کاووشی هونەر ظاهیر (٧)**

**ئیحاطەی سەروی داوە ئەژدەها، یاران تەماشا کەن**

**بە حەلقەی خۆی دروستی کرد، لە قامەتیا کەمەر ظاهیر (٨)**

(٥) ئەم بەیتە هەر لە (نم)دا هەیە.

واتە: سەرەنجام جێوڕێی نەمامی تازەی باڵای وەك سەروی یار، بە ڕۆژ و شەو لە بەرچاوی چاوەڕوانیدا بەرهەمی دەرکەوت.

ئینتیظاری (پ): ئینتیظامی. دروستە.

(٦) ئەم بەیتە لە (نم)دا حەوتەم بەیتە، لە (ق)یشدا نییە.

کەودەن: دەبەنگ و نازیرەك. شیکاف کەم: بکەمەوە، دایدڕم. شەمعی فەنەر: مۆمێك کە دەوری گیرابێ و با نەیکوژێنێتەوە.

واتە: ئەی بە دیمەن تەرکیدنیاکردووی زەینکوێر! دەڵێن لە سۆزی دڵ بێزاری و بە شتێکی گرانی دەزانی! پەردەی سینەمت بۆ بکەمەوە کە شەمعی فەنەر، دڵی هەمیشە داگیرساوی هەمیشە سووتاوم، دەربکەوێ؟

دەکەی (نم): دەگەی. هەڵەیە. شیکاف کەم پەردەیی سینەم، ببێ شەمعی (پ): وەرە تا سنگی خۆم شەق کەم لەوا نووری.

(٧) ئەم بەیتە لە (ق)دا نییە.

کاووش: هەڵکۆڵین.

واتە: یار، وەك مۆرهەڵکەن، بە ئەڵماسی برژانگی زۆر بە دەستوبردی ناوی خۆی لەناو دڵمدا هەڵکەند. ئەم هەڵکۆڵینەی یار وەك کارێکە دانسقە، هونەر نیشان دەدا.

بۆ نیکتە کاووشی (نم): بۆ نیکتەیی کاووش.

(٨) ئەم بەیتە هەر لە (نم)دا هەیە.

واتە: یاران، بڕوانن پێچولوولی پرچی یار وەك چۆن مار دەوری داری سەروی داوە، ئاوا هاتووەتە

**لەبەر تیری نیگەهـ "سالم!" چلۆن ماوە دڵی زارت؟!**
**دەکا ئیمایی دڵبەر خوێن لەناو قەلبی حەجەر ظاهیر (٩)**

خوار و وەك پشتێن لە کەمەری ئالآوە.

(٩) ئیما: ئیماء، ئیشارەت بە چاو.

واتە: سالم! چۆن ئەم هەموو ماوەیە خۆت لە بەر تیری نیگای یاردا گرتووە؟ چۆن دڵی کز و نەخۆشت ماوە؟ خۆ غەمزەی دڵبەر خوێن لە دڵی بەرد دەردەهێنێ!

نیگەهـ (ق): موژەی. ئیمایی (م): ئیمانی. هەڵەیە.

## -٣٣- (*)

## (فرد در وصف أمين افندى)

**به دو چاو دیومه، یەکێ دێته نەظەر عەیبی چەهار:**
**گونبەدیلووت و موجەددەرڕوخ و ڕیش‌بۆز و حیمار (١)**

(*) ئەم تاکە بەیتە هەر لە (مان)دا هەیە. ئەمیش هەر لە بابەتی داشۆرینە، ناسناوی سالمی تێدا نییە. تاکە بەیتێکە لە وەسف و پێداهەڵدانی ئەمین ئەفەندیدا.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەقسوور.

(١) چەهار: چوار. گونبەدی لووت: لووت وەك گومەزی ناوەڕاست بەرز و ناقۆڵا. موجەددەر: ئاولەوی. ڕوخ: ڕوومەت. حیمار: کەر.

واتە: بە دوو چاو سەیری دەکەم، بە وردی تێی دەڕوانم، ئەوەی لە بەرچاومە یەك زەلامە، چوار عەیبی هەیە: لووت وەك گومەزی، دەموچاو ئاولەوی و ڕووش وەك دیوی ناوەوەی ورگ گرنج‌گرنجە، ڕیش‌بۆز: ڕەش و چەرموو، دێز! وەك گوێدرێژ نەفام!

(لووت) بە هەڵە بە (لوط) نووسراوە.

## پیتی (ز)

### -١- (*)

به دەورمدا وەفا کێشاویە مەرکەز
هەتا دەمرم لە خەط ناکەم تەجاوەز (١)
کوهەن ناکەم قوماشی عیشقی جانان
هەتا قابیض نەیێ، ڕۆحم نەکا گەز (٢)
بە نەوعێ چەرخی داوم، چەرخەیی چەرخ
ڕەگی دڵ با درا وەك ڕشتەیی قەز (٣)
برادەرمادەرە هیندوویی باغت
غولامی چاوی مەستت دوختەری ڕەز (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، غ، ڕ)دا هەیە.
کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەحزووف.

(١) واتە: وەفا خەتی بە دەورمدا کێشاوە و مەرکەزی بۆ دیاری کردووم، من تا دەمرم لەو بازنەیە دەرناچم.

دەمرم (عا، غ): نەمرم.

(٢) کوهەن: کۆن. جانان: جانانە، دڵبەر. قابیض: گیانکێش، عیزرائیل.
واتە: پۆشاکی ئەڤینی دڵبەر کۆن ناکەم و دایناکەنم، تا ئیزرائیل گیانم نەکێشێ و لەشم گەز نەکا و کفنی پربەپرم بۆ نەبڕێ.

(٣) چەرخی داوم: بایداوم. چەرخە: سەری تەشی و هەر شتێك دەزوو و شتیوای پێ بڕێسرێ. چەرخ: گەردوون. ڕشتە: تاڵەدەزوو و هەورێشم. قەز: هەورێشم.
واتە: سەرەتەشیی چەرخی گەردوونی بێبار بە جۆرێك بایداوم و هەڵیسووڕاندووم، ڕەگی دڵم بادراوە و توند کراوەتەوە و وەك تاڵی هەوریشم باریك بووە.

(٤) برادەرمادەر: دایكبرا، واتە خاڵ، خاڵەکەیش خاڵۆ نییە، بەڵکوو خاڵی ڕەشی ڕوومەتی یارە. دوختەری ڕەز: کچی دارمێو، یا کچی ترێ، چونکە ڕەز بە ترێکەیش دەوترێ، تێکڕا یانێ مەی.

**به شەرعی شافیعی، گەر نەهیە کوشتن**
**لە شەرحی شەرعی دڵبەردا بە جایەز (٥)**
**شەوی فیرقەت، لەبەر غەم، تا سەحەرگاه**
**لە پەهلووم خارە "سالم!" نەرمییی قەز (٦)**

واتە: خاڵت، هیندووی ڕەشی باخی ڕوومەتە و دەیپارێزێ. مەیش خزمەتکاری چاوی مەستە، حەددی چییە لە عاستی تۆدا خۆی هەڵکێشێ و بڵێ: منیش بنیادەم مەست دەکەم؟!

(٥) ئەم بەیتە لە (مان، عا)دا نییە.

جایەز: جایز، شیاو و ڕێپێدراو و دروست.

واتە: ئەگەر کوشتن لە مەزهەبی شافیعیدا قەدەغە کرابێ، ئەوا لە درێژەی شەرِی یاردا ڕێپێدراوە.

(٦) پەهلوو: تەنیشت. قەز: هەموو نوسخەکان وایان نووسیوە، لە کاتێکدا دەبوو لەبەرئەوەی لە چوارەم بەیتدا هەیە، دووبارە نەکرایەتەوە و (خەز) بووایە بە مانای کراسی هەوریشم، یا کراسی لە پارچەی ئاوریشم و لۆکە.

واتە: شەوی جیاییت لەبەر خەم و پەژارە تا بەرەبەیان بەرگی هەوریشمینی نەرم لە بەرمدا وەك دڕکە و دەچەقێتە تەنیشتم و ناهێڵێ بخەوم.

-٢- (*)

**نیگەھ کەی، گەر بە چاوی فیتنەئەنگێز**

**دەکەن تائیب لە وەرعا تەرکی پەرهێز (١)**

**ئەگەر شەھ بم، دەبەخشم گاهی خەندەت**

**بە هیندوو و خاڵی تۆ، (شیران و (تەبرێن (٢)**

**شەوی ماوە کە بێدارم لە شۆرت**

**لە عەهدی گوڵ وەکوو مورغی سەحەرخێز (٣)**

**درێغی بوو لە "شیرین"، "کۆهکەن"ی جان**

**دەبوو بیکاتە پایەندازی شەبدێز! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، ھ، غ، ج، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەقسوور.

(١) واتە: ئەگەر بە چاوی فیتنەهەڵگیرسێنت بڕوانی، ئەوەی وا تۆبەی لە گوناھ کردووە و لە حاڵی وەرع و خۆ لە گوناھ پاراستندایە، واز لە خۆپاراستن دەهێنێ و لەگەڵ عیشقتدا تێهەڵدەچێتەوە.

نیگەھ (کم، گم): نیگا. چاوی (ھ): جادووی. تائیب (کم، گم): زاهید. (ق): عابید. وەرعا (کم) لە دوعا.

(٢) شەھ: پادشا. گاھ: کات.

واتە: ئەگەر پادشا و خاوەنی شار و وڵات بم، لە کاتی پێکەنینتدا شاری شیراز و تەبریز دەبەخشم بە خاڵی هیندووت.

ئەگەر شەھ بم (ج): بە وەڵڵا من. شەھ (کم، گم): شا. گاهی (کم، گم): وەختی. خەندەت (عا): وەصڵت. تەبریز (کم، گم): تەورێز.

(٣) شۆر: عیشق. سەحەرخێز: ئەوی بەیانیان زوو لە خەو هەڵدەستێ.

واتە: هێشتا شەوی ماوە کە من لە تاوی عیشقی تۆ بەخەبەرم، وەك ئەو بولبولەی کە لە سەردەمی گوڵدا بەیانییان زۆر زوو خەبەری دەبێتەوە و دەست بە ناڵین دەکا.

(٤) شیرین: ژنی خوسرەو پەروێز و خۆشەویستی فەرهاد.

کۆهکەن: فەرهاد. جان: گیان. پایەنداز. پێشکەش. شەبدێز: ئەسپە ڕەشەکەی خوسرەو پەروێز.

واتە: فەرهاد گیانی بە شیرین نەدا و درێغیی لێ کرد، دەبوو خۆی لە بەرپێی شەبدێزی پەروێزدا

**فەلەك نەیخستە مەحشەر خوونی "فەرهاد"،**
**بە "شێرۆ" حەقی "شیرین" سەند لە (پەروێز) (٥)**
**فەرەح دێنێتە خاطر گەر (سەنەندوج)**
**لە دڵمایە خەفەت وەك كێوی (ئارێز) (٦)**
**بە زاری موددەتێكە وا لە بەندا**
**دڵی "سالم" لەناو زوڵفی دڵئاوێز (٧)**

بەخت بكردایە و بیكردایەتە پێشكەشی، چونكە شەبدێز هیی پەروێزە و پەروێزیش لەگەڵ شیرینە. فەرهادی داماو گیانی پێشكەشی شەبدێز كرد، ئیتر چی دەمێنێ پێشكەشی شیرینی بكا؟!

شەبدێز (كم، گم): شەودێز.

(٥) شیرۆ: شیرۆیەی كوڕی خوسرەو پەروێزی ساسانییە كە باوكی خۆی كوشت.

واتە: فەلەك هەقی فەرهادی كوشتەی عیشقی شیرینی نەخستە قیامەت و هەر لە دنیادا لێی سەندەوە، ئەو هەقەی كە دەبوو ڕاستەوخۆ لە شیرینی بستێنێ، بە دەستی شیرۆیە لە خوسرەو پەروێز وەرگیرا و كوشتی. واتە كوشتنی خوسرەو تۆڵەیە لە شیرین، چونكە زۆری خۆشویستووە و كوشتنی لە دڵی "شیرین"دا دەبێتە داخێكی گران. ئا بەم جۆرە فەلەك هەقی فەرهادی لە شیرین كردەوە و داخی بە دڵیدا نا، وەك ئەو داخی بە دڵی فەرهاددا نا و كوشتی.

نەیخستە (غ، ج، ڕ): نەیبردە. شێرۆ (ڕ): شیری. خوونی (ه، كم، گم): خوێنی. حەقی "شیرین" سەند (كم، گم): حەقی شیرین بوو.

(٦) واتە: ئەگەر شاری (سنە) خۆشی بخاتە دڵمەوە، ئەو خۆشییە جێی نابێتەوە، چونكە بەقەدەر كێوی (ئارێز)ی نزیكی (سنە) خەفەت لەسەر دڵم بارە.

خاطر گەر (ق): یادم كۆی. كێوی (ه): كوهی.

(٧) ئەم بەیتە لە (ه)دا نییە.

دڵئاوێز: دڵاوێز، دڵخواز.

واتە: ماوەیەكی درێژە دڵی سالم بە نەخۆشی و لاوازی لەناو داوی ئەگریجەی یاری نازداری دڵخوازدا بەندییە. دیارە (دڵئاویز) لەبەر كێش بە (دڵاوێز) دەخوێنرێتەوە. فارسییەكەیشی (دلاویز)ە، (كم، گم)یش هەر (دڵاوێز)یان نووسیوە.

لەناو (ڕ): لاو. هەڵەیە.

## پیتی (س)

### -١- (*)

**خامۆش ببه له بانگ و صەدا ئەمشەو، ئەی خەرووس!**
**با دەس بکەم له گەردنی دڵبەر بە عەیش و بووس (١)**
**ناکەم تەهی کەناری دڵئارا بە بانگی مورغ**
**تا دێ سەحەر لە دەرگەهی والی، غریوی کووس (٢)**
**تیری نیگاهی عیشوەیی نازم بە جەرگ و دڵ**
**خوێنینە، وەك خەدەنگی تەهەمتەن بۆ ئەشکەبووس (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: موزاریعی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور.

(١) خامۆش: بێدەنگ. خەرووس: کەڵەشێر. عەیش: ڕابواردن. بووس: ماچکردن.

واتە: ئەی کەڵەشێر، ئەمشەو بێدەنگ ببە و مەکەوە بانگ و سەدا، با من بە ئاسوودەیی لەگەڵ یارمدا ڕابوێرم و ماچومۆچ بکەم.

(٢) تەهی: چۆڵ، خاڵی. کەنار: باوەش. دڵئارا: دڵفڕێن، بە (دڵارا) دەخوێنرێتەوە. مورغ: باڵندە، مەبەست کەڵەشێرە. دەرگەه: دەرگا. والی: فەرماندار. غریو: هاوار و فەریاد. کووس: نەقارە.

واتە: باوەشی یار تەنها بە خوێندنی کەڵەشێر چۆڵ ناکەم و جێی ناهێڵم، تا بەیانیان ئاواز و ناڵەی مۆسیقا لە دەرگای والییەوە بەرز دەبێتەوە.

تا دێ (کم): تاوێ. والی (کم): وەلی!

(٣) خەدەنگ: سەری تیر. تەهەمتەن: ناسناوێکی ڕۆستەمی زاڵە، یانێ ئازا. ئەشکەبووس: پاڵەوانێك بووە چووەتە یارمەتیی ئەفراسیاب دژی ڕۆستەمی زاڵ، ڕۆستەمیش دەمودەست کوشتوویەتی.

واتە: تیری عیشوەی یار، کە لە جەرگ و دڵی داوم، خوێنینە وەك ئەو سەرەتیرە کە ڕۆستەم ئەشکەبووسی پێ کوشت.

((عیشوەیی نازم)) یا (عیشوەوو نازی) بووە، یا (عیشوەیی یارم).

بۆ قەصدی دڵ، ئیشارەی غەمزەیی بە ئەمری چاو
تابووری لەب بە تیپی موژە وەك سوپاهی ڕووس (٤)
پوستانی دڵبەرم بە نەزاکەت لە چینی زوڵف
وەك گۆیی عاجە بۆ خەمی چەوگانی ئابنووس (٥)
مەششاطەیی خەیاڵە مەگەر وەصفی ڕوویی یار
زینەت دەدا بە دوختەری فیکرم وەکوو عەرووس (٦)
زاهید بڕۆ، نەصیحەتی من شوغڵی تۆ نییە،
جەوهەر دەبا ڕەفاقەتی هەر واعیظی عەبووس (٧)
ئەی چەرخی واژگوون! ستەمی تۆ بە کێ بڵێم؟
ظاڵمدڵی بە جەور و جەفا میثلی فەیلەقووس (٨)

(٤) واتە: بە فەرمانی چاوی یار ئیشارە و غەمزە و ناز دەگیرێنە دڵ، تابووری لێو و تیپی برژانگی بۆ منی بێچارە وەك سوپای ڕووسە و لای لێ بریومەتەوە. تابوور و تیپ زاراوەی کاروباری سوپایین.

(٥) پوستان: مەمك. چەوگان: گۆچان.

واتە: مەمکی سپیی یار کە بە زوڵفی ڕەشی دەورە دراوە، دەڵێی گۆی سپیی عاجە و لەناو دەسکی گۆچانی ڕەشی ئابەنووسدایە.

(٦) واتە: وەسف و باسکردنی جوانیی ڕوخساری یار، دەڵێی ئارایشتی خەیاڵە و جوانی دەکا. ئەوەتە کچی بیر و زەینمی وەك بووك ڕازاندووەتەوە. بە کورتی، وەسفی جوانییەکە خەیاڵ و بیری سالمی جوان کردووە و شتی جوان و وردی پێ دەنووسێ.

(٧) واتە: ئەی بە دیمەن تەرکیدنیاکردوو، بڕۆ بەرۆکم بەردە، ئامۆژگاریکردنی من کاری تۆ نییە و لێت نایێ، دوور بە لێم، چونکە بێگومان هاوڕێیەتیی مرۆی ناوچاوگرژ جەوهەر و ڕەونەق و جوانی ناهێڵێ.

(٨) واژگوون: هەڵگەڕاوە. فەیلەقووس: پادشایەکی ڕۆم بووە.

واتە: ئەی چەرخی ستەمکاری کارپێچەوانە، سکاڵای ستەمی تۆ بۆ لای کێ بەرم؟ کێ هەیە لە تۆ بەزەبرتر؟ وەك فەیلەقووس خاوەنی دڵێکی بێبەزەیی و ستەمکاری.

**ئەهلی زەمانە جەنبی هونەر ناگرن، بە هیچ**
**"سالم!" مەکە هەوایی ئەمەل ئێستە بێ فلووس (٩)**

(٩) جەنب: لایەن.

واتە: خەڵك لەم ڕۆژگارەدا لایەنگری هونەر نین. سالم، ئیتر ئێستا بە خۆڕایی ئارەزووی هیچ مەکە و بە تەمای هیچ مەبە.

-٢- (*)

غەیری فیکری وەصڵی دڵبەر، نیمە ئەصڵەن یادی کەس
((هردو عالم را بە دشمن دە، کە مارا دوست بَسْ)) (١)
نیم جۆ گەر بێ وەفا کا، گەندومینڕوو دڵبەرم
((جملە دنیا پیش چشم من نماید یك عَدَس)) (٢)
قەڕن و ساڵ و مەهـ ئەبەد نایێمە یادت لەمحەیێ
((ای کە بی یاد تو هرگز بَرْنَیارَمْ یك نَفَسْ)) (٣)
عیجزی حاصڵ بوو بە غەفڵەت، دڵ لە جەوری دڵبەرم
((قند را لذّت مگر نیکو نمی‌داند مگَسْ؟!)) (٤)

(*) ئـەم پارچەشـیعرە لـە (مـان، حـا، ج، ڕ، کـم، گـم)دا هەیـە. لـە (مـان)دا یەکێکـە لـە مولەممەعەکان. فارسـیەکەی هی "حافظ شیرازی"یە و تەنها بەیتێکی تێهەڵکێش نەکراوە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) دە: بدە. مارا: بە ئێمە.

واتە: یادی کەس لە دڵمدا نییە، هیی یار نەبێ. هەردوو جیهان بدە بە خەڵك، من تەنها یارم بەسە.

(٢) نیم جۆ: نیوەی دەنکەجۆیەك. کا: بکا. گەندومینڕوو: گەنمڕەنگ، ئەسمەر. جملە: هـەمووی. پیش چشم من: لە بەرچاوی من. نماید: دەنوێنێ. عدس: نیسك.

واتە: یاری گەنمڕەنگ ئەگەر بێ و بە ئەندازەی نیو دەنکەجۆ وەفام لەگەڵ بکا، هەرچی دنیایە لە بەرچاوم بە ئەندازەی دەنکێك نیسك دەنوێنێ.

نیم جۆ.. تاد (ج، کم): گەر ببینم دەفعەیێ ڕووی دڵبەرم. (گـم): گـەر ببیـنم دەفعەیـەکی تـێر ڕوویی دڵبەرم. زۆر لەنگە. یك (کم، گم): چون. (جملـە دنیـا) لای "حـافظ" (هـردو عـالم)ە و (مـن نماید)یش (ما نمودی)یە.

(٣) قەڕن: سەد ساڵ. مەهـ: مانگ. برنیارم: هەڵناکێشم، دەرناهێنم.

واتە: ئەی ئەو کەسەی کە بێ یادی تۆ هەرگیز یەك هەناسە دەرنابەم و ناژیم، کەچی تۆ بـە قـەڕن و ساڵ و مانگ بەقەد چاوبەیەکدادانێك یادم ناکەی!

نایێمە (کم): نایەمە. (برنیارم یك) لای "حافظ" (برنیاوردم)ە.

(٤) قند: شەکر. نیکو: چاك. نمیداند: نازانێ. مگس: مێش.

واتە: دڵم، بە هۆی سزای یاری دڵفڕێنمەوە، تووشی بێهێزی و بێهۆشی بووە. هەرگیز دەچێتە

**دیده هەڵنایێ لە سەیری گوڵعوزارانی جیهان**
**((تا ترا دیدم نکردم جُز به دیدارت هَوَس)) (٥)**
**بیمی ئافاتم نییە شەوها لەبەر ئوفتادەگی**
**((آنچنانم کز خیالم باز نشناسد عَسَسْ)) (٦)**
**بوو بە یەم ئەشکم لە کۆتا، وەه چ خۆشە ناگەهان**
**((بر سر آیند این رقیبان سبکبارت، چو خس)) (٧)**
**صەعبە "سالم!" قاصیدی دڵبەر دوئەسپە بێتە لات**
**((بعدازین بنشین کە گردی برنخیزد زان فَرَس!)) (٨)**

عەقڵەوە مێش شەکری لا بێلەزەت بێ؟ بەڵام من هێزم تێدا نییە و زەوقیشم نەماوە.

حاصڵ (حا): غافڵ.

(٥) گوڵعوزار: ئەوی کوڵمی وەك گوڵی سوور ئاڵ بێ. جز: جگە لە.

واتە: چاو هەڵنایێ سەیری جوانانی جیهان بکا. کە تۆم دی، جگە لە تۆ، ئارەزووی بینینی کەسیترم نەکرد.

(٦) بیم: ترس. ئوفتادەگی: لەپێکەوتن. شەوها: شەوان. خەیاڵ: تارمایی.

واتە: شەوان، لەبەر کەنەفتی و بێهێزی و لەڕی، ترسی گەزەنی کەسم نییە، ئەوەندە لاوازم وام لێ هاتووە پاسەوانی شەو تارماییەکەم ناناسێ و هەستی پێ ناکا.

خیاڵم (کم، گم): خیالت. هەڵەیە. (آنچنانم) لای "حافظ" (من چنانم)ە.

(٧) ئەم بەیتە هەر لە (ج، ڕ)دا هەیە.

یەم: دەریا.

واتە: فرمێسکی ڕەوانم هێندە زۆرە، لە بەر ئاستانەی تۆدا بوو بە دەریا. ئای چەند خۆشە لە ناکاودا ناحەزانی بارسووکی ئاسوودەی تۆ وەك پووشوپوڵاش و خاشاك دەکەونە سەر ئاو و بێنرخ دەبن.

بوو بە (ج): بویە. هەڵەیە. (سبکبارت) لای "حافظ" (سبکسارت)ە، بە مانای هیچوپووچت.

(٨) قاصید: نامەبەر. پەیك: ڕاسپێردراو. دووئەسپە: عەرەبانە، کینایەیە لە خێرا. بعدازین: دوای ئەمە، ئیتر. بنشین: دانیشە. گرد: تۆز. برنخیزد: هەڵناسێ.

واتە: سالم! گرانە نامەبەری یار بە عەرەبانە یا خێرا بگاتە لات، هەرگیز نایێ، ئیتر بە دڵنیاییەوە دانیشە، هەرگیز تۆز لەو ئەسپی عارەبانەیە هەڵناسێ، یانێ نایێ.

دوئەسپە بێتە لات (ج، کم، گم): ئیتر نایێتە لات. زان (ج، کم، گم): زین. لای "حافظ"یش (زین)ە.

## -٣- (*)

به فەن ئەی موددەعی! گەر بی بە ئیبلیس
فەریبی دڵبەرم نادەی بە تەلبیس (١)
لە جەوری ماهی بێمیهرم، هەموو شەو
دەگا ئاهی شەرەربارم بە بیرجیس (٢)
دڵم تا جەننەتی وەصڵت قوبووڵ کا
دەبەم ناوت بەقەد تەهلیلی "ئیدریس" (٣)
پەرێشانە لە ڕووتا کافری موو!
مەگەر شێواوە صوڵحی ڕۆم و ئینگلیس؟ (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، غ، ق، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەقسوور.

(١) فەن: مەبەست فێڵە. بی: ببی. فەریب: فریو، خەڵەتاندن. تەلبیس: فێڵ و ڕووکەش‌کردن.

واتە: ئەی ڕەقیب! ئەگەر لە فڕوفێڵدا بیشگەیتە ڕادەی شەیتان، ناتوانی دڵبەرم فریو بدەی.

بی بە (کم، ق، ج، ڕ، گم): ببیە.

(٢) ئەم بەیتە لە (ق)دا نییە.

بێمیهر: بێخۆشەویستی، بێلوتف. بیرجیس: ئەستێرەی موشتەری.

واتە: لە ستەمی مانگی بێبەزەییمدا، یانێ یار، هەموو شەوێك ئاهی گەرمی ئاگراویم دەگاتە ئەستێرەی موشتەری.

شەرەربارم (عا، غ): شەرەروارم.

(٣) واتە: تا دڵم بەهەشتی بە تۆ گەیشتنی بوێ، بەقەدەر زیکر و تەهلیلەی ئیدریس پێغەمبەر (د.خ) ناوت دەبەم و بیرت دەکەم.

قوبووڵ (غ، ج، ڕ، کم، گم): طەڵەب.

(٤) واتە: زوڵفت بەسەر ڕوخسارتدا پەخش و بڵاوە، لەوە دەچێ ئاشتیی نێوان ڕۆم و ئینگلیس تێك‌چووبێ. سالم هەندێ لە زوڵفی یاری بە ڕۆم و هەندێکی بە ئینگلیز داوەتە قەڵەم، کە هەردووکیان ستەمکارن، ئاژاوەکە لەنێوان زوڵف خۆیدایە.

**موورادم ڕووته، هەرچا وەصفی مەه کەم**
**دەبێ دوو بێ نیشانەی تیری تەجنیس (٥)**
**خەبەر کەن شێخی واعیظ، با بزانێ**
**بەجوز دەرسی مەحەببەت، سەهوە تەدریس (٦)**
**"سولەیمان"م بە تەمکین، تا مەکانت**
**لەناو مەهدی دڵا بێ، میثلی "بەلقیس" (٧)**
**ئەوەندە چەرخی داوم، چەرخەیی چەرخ**
**ڕەگی دڵ بادرا وەك ڕشتەیی ڕیس (٨)**
**ڕەقیب! بۆ کاری "سالم" تۆی خەلەلخواە**
**نەگا، یاڕەب! بە مەطڵەب دوزدی دڵپیس (٩)**

(٥) تەجنیس: جیناس هێنانەوە. ئەمە بۆ ئێرە دەست نادا و دەبێ مەبەستی سالم لە تەجنیس (تەورییە) بێ! کە ئەوەتە وشەیەك دوو واتای هەبێ، یەکێکی دوور و یەکێکی نزیك.

واتە: لە هەر شوێنێ باسی مانگ بکەم و ناوی بهێنم، مەبەستم ڕوخساری تۆیە. بەڵێ، دەبێ نیشانەی تەجنیس دوو شت، یا دوو واتا بێ، یەکێکی نزیك و یەکێ دوور.

(٦) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (ق)دا نین.

واتە: بە پیری پەنددادەر و ئامۆژگار بڵێن: پێویستە بزانێ، جگە لە وتنەوەی دەرسی خۆشویستن، هەموو دەرسەکانیتر هیچوپووچن.

(٧) واتە: تا شوێنت وەك بەلقیس ولاتی (سەبەء)ی بێشکەی دڵم بێ، لە داموودەزگا و جێگەوڕێگەدا خۆم وەك سولەیمان پێغەمبەر (د.خ) بە خاوەنشکۆ دەزانم.

دڵا بێ (کم): دڵایی.

(٨) واتە: چەرخەی چەرخی گەردوون ئەوەندەی باداوم، ڕەگی دڵم وەك تاڵی دەزوو و ئاوریشم بادرا.

ڕەگی دڵ بادرا (غ، ج، کم، گم): سەراپا لاغیرم.

(٩) خەلەلخواە: حەزلەخراپەکردوو.

واتە: ئەی ڕەقیب! تۆ حەز لە تێکچوونی کاری من دەکەی. خودایە دزی دڵپیس هەرگیز بە مەرامی خۆی نەگا.

مەطڵەب دوزدی (کم، گم): مەقصەد دوزدە.

# پیتی (ش)

## -١- (*)

**به پابۆست بگا گەر سەر وەکوو فەرش**
**سەری فەخرم دەگاتە پایەیی عەرش (١)**
**نیگاهی چاوی مەستت گاهی ئیما**
**دەبەخشێ نەشئەیێ بۆ من وەکوو بەرش (٢)**
**ئەگەر مانیع نەبن، دەستم دەگا پێت**
**درازیی ئاستێن و کۆتەهیی ئەرش (٣)**

•

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، غ، ق، ڕ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەقسوور.

(١) واتە: ئەگەر سەر وەك ڕایەخ بگاتە پایەی پێماچکردنت. یانێ پێی پێدا بنێی، سەری شانازیم ئەوەندە بەرز دەبێتەوە، دەگاتە عەرش!!

دەگاتە (ڕ): دەچێ بۆ.

(٢) ئەم بەیتە لە (ق)دا نییە.

بەرش: جۆرە شۆربایەکە بە گۆشت و کەلەرم و شتی وا ساز دەکرێ.

واتە: نیگای چاوی مەستت لە کاتی ئیشارەتکردندا وەك بەرش نەشئەبەخشە بۆ گیانی پڕئازارم!

من وەکوو (ڕ): دڵ هەر وەکو.

(٣) درازی: درێژی. ئاستین: فەقیانە، قۆڵی کراس. کۆتەهی: کورتی. ئەرش: دەست لە سەرپەنجەی باڵابەرزە (ناوڕاست)وە تا ئەنیشك.

واتە: ئەگەر درێژیی قۆڵی کراسی یار و کورتیی دەستی من ڕێم نەگرن، دەستم پێت دەگا. لەوانەیە درێژیی ئاستێن کینایە بێ لە باڵابەرزی، دەستی ئەم کورت و باڵای ئەو بەرز، لە کوێ دەستی دەگاتە دەستی؟ یا درێژیی قۆڵی کراسەکەم و کورتیی دەستم، یانێ: قۆڵی کراسەکەم و کورتیی دەستم ناهێڵن دەستم بگاتە دەستت.

(نەبن) لە (ق)دا کەوتووە.

**موژەت طابوور و میرئالاّیە چاوت**
**پێرش بۆ دڵ دەبا، گەر بێ بڵێ: عەرش (٤)**

(٤) تابوور: سوپا. میرئالاّ: میرلیوا، پلەیەکی بەرزی ناو سوپای عوسمانی بووە.
واتە: برژانگەکانت تابووری سوپا و چاوت میرئالاّ و سەرکردەی سوپایە، ئەم تابوورە هێـرش دەباتـە سەر دڵ، ئەگەر فەرمانی سوڵتانی لەسەر بێ. یا: ڕەنگە دووەم نیوەبەیت وا بووبێ: ((ئێـرش بـۆ دڵ دەبـا گەر پێی بڵێ: عەرش)). یانێ ئەگەر عەرشی شاهانە پێی بڵێ و فەرمانی پێ بکا، پەلاماری دڵ دەدا.
موژەت طابوور و (عا): موژەت خاڵ و برۆ. هەڵەیە. (ق): طابوورە . پێـرش بـۆ دڵ دەبـا (عـا، غ): پێرش بۆ دڵ دەبا. (ڕ): هێرش بۆ دڵ دەبەن. گەر بێ بڵێ (عا): بێ بیستنی. (ق): گەر تۆ بڵێی.

-٢- (*)

**گوارەت کەوتە سەر ڕەوشەنبناگووش**

**«سهیل و ماەرا کردی همآغوش» (١)**

**لەبی شیرینی دڵبەر، کانی لەعلە**

**«ازان لعلی که از جان میبَرَد هوش» (٢)**

**وەکوو لەعلی گوارەت ئاڵە ئەشکم**

**«مَنَش در دیده جا کَرْدَم، تو در گوش» (٣)**

**ئەگەر دەیدی لەبی تۆ، پووری "هورمز"**

**«نمودی لعلِ شیرین را فراموش» (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ف، غ، ج، کم، گم)دا هەیە. لە (مان)دا، یەکێکە لە مولەممەعەکان. فارسییەکەی، بەپێی دواینبەیت، هی" مەولانا عەبدوڕڕەحمانی جامی"یە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەقسوور.

(١) دووەم نیوەی بەیتی پاشەوەی خراوەتە سەر نیوەی دووەمی ئەم بەیتە و دوو نیوەکەیتریش کەوتووە.

ڕەوشەنبناگووش: بناگوێی ڕۆشن. همآغوش: هاوباوەش، باوەش بەیەکداکردوو.

واتە: گوارەت کەوتە سەر بناگوێی ڕۆشنت، ئەم گوارەیە ئەستێرەی سیوەیل و مانگی کۆکردەوە، ئەڵبەت مانگەکە ئەسڵی گوارەکەیە کە هیلالییە، سیوەیلیش نقێمەکەیەتی، دیارە ئەم دووانە لە باوەشی یەکدان.

ڕەوشەنبناگووش (ه): ڕەوش و بناگووش. هەڵەیە. همآغوش (کم، گم): فەرامۆش.

(٢) واتە: لێوی شیرینی دڵبەر کانی لەعلی ئاڵە، لەو لەعلەی کە لە جوانیدا هۆش و بیر لە دڵ دەستێنێ.

ازان (ف، غ، کم، گم): چ سان.

(٣) ئەم بەیتە لە (ف)دا نییە.

جا کردم: جێم کردەوە.

واتە: فرمێسکم وەك لەعلی نقیمی گوارەت ئاڵە. من ئەو لەعلە ئاڵەم لە چاومدا و تۆ لە گوێدا جێ کردووەتەوە.

منش (کم): کە من.

(٤) پووری هورمز: کوڕی هورمز، یانێ خوسرەو پەروێز. نمودی: دەیکرد.

**به ئیما گەر طەڵەب کەم، ماچی لێوی**
**((بە لؤلؤ لعل را گیرد: که خاموش)) (٥)**
**پەیاپەی دێتە ڕوو، ئەشکم وەکوو سەیل**
**((ازان خونی که در دل میزَنَدْ جوش)) (٦)**
**وەکوو "جامی" ئەگەر "سالم!" حەریفی**
**((ز خون دل شراب لعل مَی نوش)) (٧)**

واتە: ئەگەر خوسرەو پەروێزی عاشقی شیرینی ئەرمەن لێوی تۆی بدیایە، لەعلی لێوی ئاڵی شیرینی لەبیر دەچووەوە!

(٥) ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی لە (غ)دا نین.

ئیما: ئیشارە بە چاو. لوئلوء: مرواری، ددانی یار. لەعل: مەبەست لێویەتی. گیرد: دەگرێ. خاموش: بێدەنگ بە.

واتە: ئەگەر بە ئیشارە داوای ماچی لێوی لێ بکەم، بە ددانە مرواریەکانی لەعلی لێوی دەگەزێ و دەڵێ: بێدەنگ بە، داوای شتی وا گران مەکە.

بە ئیما.. تاد (هـ): یە ئیما گەر کەرەم کەی ماچی لێوت. (ف، ج): بە ئیما گەر طەڵەب کەی، ماچی لێوت. (کم، گم): بە ئێمە گەر خەڵات کەی ماچی لێوت. هەڵەیە. گیرد (ف): گیری. (کم، گم): گویی. هەڵەیە. کە خاموش (ج): در آغوش.

(٦) میزند جوش: قوڵپ دەدا، دەکوڵێ.

واتە: پەیتا پەیتا فرمێسك لەو خوێنەی کە لە دڵمدا دەکوڵێ و قوڵپ دەدا، دێتە سەر ڕوومەتم.

جوش (ف): خوش. هەڵەیە.

(٧) واتە: سالم! ئەگەر وەك "جامی" ئەربابی و لە عاشقانی، شەرابی ئاڵ، نەك شەرابی ترێ، لە خوێنی دڵ بنۆشە.

وەکوو جامی ئەگەر سالم حەریفی (ف): وەکو سالم ئەگەر جامی حەریفی. لعل می نوش (گم): عیشق مینووش.

-٣- (*)

**عەجەب دیگی دڵی هێناوْمە جووش**

**«بت سنگین‌دل سیمین‌بناگوش» (١)**

**برۆ قەوس و موژە تیر و وەلەد چاو**

**«ظریف مەوش ترك قباپوش» (٢)**

**لە تابوشتی شەرارەی ناری عیشقت**

**«بە سان دیگ، دایم می‌زنم جوش» (٣)**

**بە مەرگی تۆ، لە قەبریشا کە بڕزێم**

**«نگردد مهرت از جانم فراموش» (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (نم)دا هەیە. پارچەکە مولەممەعە و فارسییەکەی هیی "حافظ شیرازی"یە. ناسناوی "سالم"یش نییە، لە دوا بەیتدا "بیمار" هەیە. دوور نییە، وەك (کم) لە پێشەکی چاپەکەیدا وتوویە، سالم لە پێشدا ناسناوی "بیمار" بووبێ و دوایی کردبێتیە "سالم". جێی وتنە، (نم) دوو لاپەڕەی بۆ "بیمار" تەرخان کردووە، بێئەوەی -کەموزۆر- باسی تەرجەمەی حاڵی بنووسێ، ئەم شیعرەیشی نەداوەتە پاڵ و لەنێو پارچە شیعرەکانی "سالم"دا نووسیویە!

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەقسوور.

(١) دیگ: مەنجەڵ. سنگین‌دل: دڵڕەق. سیمین: زیوین. بناگوش: بناگوێ.

واتە: دڵڕەقی بناگوێ سپی، بە شێوەیەکی سەیر مەنجەڵی دڵی هێناومەتە جۆش.

(٢) مەوش: وەك مانگ. ترك: دڵبەر. قباپوش: کەواپۆش، کەوالەبەرکردوو.

واتە: یاری وەك مانگ جوانی کەوالەبەر، برۆ کەوانە، موژەی تیرە و چاوی کوڕی تیرئەندازە!

(ظریف مەوش ترك) لای "حافظ" (ظریفی مهوشی ترکی)یە.

(٣) تابوشت: تاو و گەرما. بە سان: وەك. میزنم جوش: دەکوڵێم.

واتە: لەتاو تین و گەرمای پرژی ئاگری عیشق، هەمیشە وەك مەنجەڵی سەر ئاگر دەکوڵێم.

(٤) واتە: بە مەرگی تۆ قەسەم، لەناو گۆڕیشدا کە بڕزێم، خۆشەویستیت لەبیرناکەم و لە دڵ دەرناچی.

**ڕەقیب چاك‌چاك دەكا جێبی كراسی**
**((گرت همچون قبا گیرم در آغوش)) (٥)**
**دڵ و ئیمان و دینی برد بە تاراج**
**((برو دوشش، برو دوشش، برو دوش)) (٦)**
**حەكیمانە وتی "حافظ" بە بیمار:**
**((لب نوشش، لب نوشش، لب نوش)) (٧)**

(٥) چاك‌چاك: لەت‌لەت. آغوش: باوەش.

واتە: بەدكار، ئەگەر ببینێ وەك كەوا بتگرمە باوەش، لە داخاندا یەخەی كراس دادەدڕێ و لەت لەتی دەكا. لە قەبریشا (نم): لە قەبریشدا.

(گرت) لای "حافظ" (گرش)ە.

(٦) واتە: یار دڵ و دینی بە تاڵان بردم، بڕۆرە كۆڵی و دوای كەوە، دەست لە شانی مەكەرەوە تا حەقی خۆت دەستێنی. یان دووشەش كینایەیە لە بەخت و بۆهاتن، یانێ ئەی بەخت و ناوچاوان! بڕۆ لای من جێت نییە. یا: بڕۆ بیدۆشە، بەشكم شتێكت دەست كەوێ.

(٧) نوش: هەنگوین، ئاوی زیندەگانی بخۆرەوە.

واتە: حافظ وەك پزیشك بە "بیمار"ی وت: لێوی هەنگوینی یار بنۆشە، یا لێوی سەرچاوەی ئاوی زیندەگانی بنۆشە.

-٤- (*)

ئەبدالٚ ئەبەد هەر منم، ئەی چەرخی جەفاکێش!
تا دەربەدەر و شەهر بە شەهرم وەکو دەروێش (١)
یەك بێشە لە صەحرایی دەروون سەبزە لە سینەم
ئەزبەسکی ڕووا تیری نیگاهت لە دڵی ڕێش (٢)
تا یاری منی، یاری دڵم هەر غەمی تۆیە
بێگانە بووْم یەکسەرە بۆ تۆ لە کەس و خوێش (٣)
جوز بۆسەیی ئەییامی ڕەضامەندییی دڵدار
نەمدی لە جیهانا بە ئەبەد نۆشێ بەبێ نێش (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، ف، غ، ق، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور.

(١) ئەبدالٚ: عەودالٚ، ڕەند و دەروێش‌حالٚ. کێش: کیش، ئایین. جەفاکێش: ئایین‌ستەم، جەورپیشە. شەهر بە شەهر: شار بە شار، دەربەدەر.

واتە: ئەی ڕۆژگاری ستەمکار، تا وەك دەروێش دەربەدەر بم و شارەوشار بگەڕێم، منم عەودالٚی هەمیشەیی.

ئەبدالٚ (عا، ف، غ، ق، ج، ڕ): عەبدالٚ. (کم، گم): عەودالٚی. شەهر بە شەهرم (ق): شوهرەیی شەهرم.

(٢) ازبسکی: لەبەرئەوە، ئەوەندە زۆر، چونکە.

واتە: ئەوەندە تیری نیگای یەك لەدوای یەکت لە دڵی بریندارمدا ڕووا، بێشەیەك لە دەشتی سینەمدا سەوز بووە.

ڕووا (غ): ڕوو. هەڵەی نووسینە. صەحرایی (عا): سەحرایی. سەبزە (کم، گم): سەوزە.

(٣) واتە: تا تۆ دۆستی منی، یاری دڵم خەم و پەژارەی تۆیە و لێم جوێ نابێتەوە، بەتەواوی بەهۆی تۆ و خەمی تۆوە لە خزم و کەس‌وکار تەریك بووم و بە هەموویان بێگانەم.

تا یاری منی (عا): تۆ یاری منی. (کم، گم): تۆ یاری من و. بووم (ف): بووە. یەکسەرە (کم): یەکسەری.

(٤) جوز: جگە لە. نۆش: هەنگوین.

**وا دێتەوە سۆ زەخمی دەروون گاهی خەیاڵت**
**شەو خاوی نییە "سالم"ی بێچارە لەبەر ئێش (٥)**

واتە: جگە لە ماچی سەردەمی ڕەزامەندیی یار، کە هیچ ناخۆشیی لەگەڵ نەبوو، هەرگیز هەنگوین و شیرینی بێ چز و ئێشم لە دنیادا نەدی.

دلدار (ق): یارم. لە جیهانا (ج): لە جیهانی.

(٥) واتە: کاتی خەیاڵت برینی دڵ بە جۆرێ دێتەوە سوێ، "سالم"ی بێچارە لەبەر ئازار خەو لە چاوی ناکەوێ.

سۆ (عا): بۆ. (بۆ)کەی بێجێیە! هەر (سۆ) بووە و بە هەڵە نووسراوەتەوە. (کم، گم): سوێ. دەروون (ق): خەدەنگ. خەیاڵت (ج): خەیاڵم.

-٥- (*)

خودا! چ بکەم لەدەست بەختی جەفاکێش؟!
نەمەکڕێزە لەسەر داغی دڵی ڕێش (١)
لە غەمزەت، موددەتێ بوو، خۆم دەپارازت
ئەجەل هێنامیە بەر تیرت، جڵەوکێش! (٢)
تەعەششوق بۆ کەماڵی عاشقی زار
بە میثلی حەملەیی گورگە ئەسەر مێش (٣)
لە تای میزانی عیشقا سەر چ سووکە؟!
لە کیشی دڵبەرا بێوەزنە بۆ کێش (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەقسوور.

(١) جەفاکێش: ئەوی دەرد و ئازار دەچێژێ. ڕێش: بریندار.

واتە: خودایە چ بکەم لەدەست بەخت و ناوچاوی پڕ دەرد و ئازار، خوێ بەسەر داغی دڵی بریندارمدا دەڕژێنێ و ئەوەندەیتر کوڵەوارم دەکا.

(٢) واتە: ماوەیەك بوو خۆم لە تیری نازی چاوت دەپاراست، وا ئاکام جڵەوکێشت کردم و هێنامتە بەر تیرت.

دەپارازت (کم): دەپاراست.

(٣) کەماڵ: مەبەست هۆش و فامە. زار: نەخۆش. حەملە: هێرش. ئەسەر: بۆ سەر. مێش: مەڕ.

واتە: هێرشی عیشق بۆ لەناوبردنی فام و هۆشی عاشق، وەك هێرشی گورگە بۆ سەر مەڕی بەستەزمان، مەگەر خودا بە خودایەتیی خۆی بیپارێزێ!

(٤) میزان: ترازوو. کیش: ئایین. کێش: کێشانە.

واتە: سەری عاشق لە تای ترازووی عیشقدا چەند سووکە؟ سەر لە ئاستی دڵبەردا قورسایی و کێشی نیە و هیچ نییە!

کیشی (گم): کێشی!

**فیراق حەڵوایی وەصڵی کرد بە صەفرا**
**فەرامۆشم بووە نۆشت لەتاو نێش (٥)**
**لە ڕووگەرمیی و دڵسەردیت مەلوول نیم،**
**دەکەم شوکرت بە ئینعامی کەم و بێش (٦)**
**تەماشا کەم لە وەضعی بەزمی دڵبەر**
**ڕەقیب بێغائیلە و "سالم" بەئەندێش! (٧)**

(٥) نۆش: هەنگوین. نێش: چزوو، ئازار.

واتە: ئەگەرچی نەختێ شیرینیی بەیەکگەیشتنم چێشت، داوای جیابوونەوە لێی کردم بە سەفرای تاڵ و ژەهری مار، لە تاو ئازار هەنگوینم لەبیرچوو.

(٦) واتە: زویر نیم لەوەی کە ڕووت پڕ قین و دڵت سارد و بێبەزەییە، من شوکرانەبژێرم بەرامبەر بە نیعمەتت، کەموزۆر، سزایشت خۆشییە بۆ من.

دەکەم (کەم): ئەگەم. هەڵەیە.

(٧) واتە: تەماشای بەزم و ئاهەنگی دڵبەر بکەن چۆن سزای عاشق دەدا. ڕەقیب بێ خەم و خوتوورەیە، سالمیش نوقمی دەریای خەیاڵ و ئەندێشەیە! (تەماشا کەم) دەبوو (تەماشا کەن) بووایە، هەر بەو جۆرەش واتای لێکدرایەوە.

## پیتی (ص)

-١- (*)

**به وەفایە قەراری من، مەخصووص**
**بە جەفا شوغڵی یاری من، مەخصووص (١)**
**لە وەفات دوورە بێی، ئەگەر بمرم**
**ڕووبەڕوو بۆ مەزاری من، مەخصووص! (٢)**
**زیندە هەر کەس بە ڕووت، وەلاکین خووت**
**بەرقە بۆ کشتزاری من، مەخصووص! (٣)**
**ئەو کەسە ئیبتیدا گوڵی بەش کرد،**
**خاری خستە کەناری من مەخصووص! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: خەفیفی شەشی مەخبوونی ئەصڵەمی موسەبەغ.

(١) واتە: بڕیاری من بە تایبەتی وەفایە و کاری یاری من بە تایبەتی جەفایە.

(٢) واتە: کە مردم، لە وەفاتەوە دوورە ڕووبەڕوو بێی و سەر لە گۆڕەکەم بدەی، تۆ ئەوەندە بەوەفا نیت.

(٣) کشتزار: کێڵگەی کشتوکاڵ، مەزرا و دێمەر.

واتە: بە بینینی ڕووی تۆ هەموو کەس زیندووە، هەر کەس بتبینێ -مردوویش بێ- زیندوو دەبێتەوە. خوو و ڕەوشتت بۆ کشتوکاڵی هیوا و هەواڵی بەتۆگەیشتن و عومری من، وەك برووسکەیە و دەیسووتێنێ.

(٤) کەنار: باوەش.

واتە: ئەو کەسە کە لە سەرەتاوە گوڵی بەسەر خەڵکدا دابەش کرد، بەتایبەتی لەباتیی گوڵ دڕکی خستە باوەشی منەوە.

لێکی دا ئاسْمان بەرابەر زوڵف
نوسخەیی ڕۆژْگاری من، مەخصووص (٥)
سورمە بۆ چاوی موددەعی دێنی
گەر بە باد دەی غوباری من، مەخصووص (٦)
داویە سالم! زەمانە ڕیسوایی
حاصڵی سەعْیی کاری من، مەخصووص (٧)

(٥) واتە: ئاسمان بەتایبەتی نوسخەی ڕۆژگاری عومری منی بەرامبەر بە زوڵفی پەرێشانی تۆ دانا، وەك ئەو ڕەش و پەرێشانی کرد.

(٦) سالم قسەی لەگەڵ یار کردووە و وتوویە: ئەگەر تۆ من لەناو ببەی و تۆزم بەبا بدەی، ئەو تۆزە دەبێتە سورمەی چاوی بەدکار و پێی دەگەشێتەوە!!

(بە باد دەی) بە (بە بادەی) دەخوێنرێتەوە.

(٧) واتە: بەرهەمی ڕەنجم بەتایبەتی ڕیسوایی و بەدناوییە، خەتای من نییە، زەمانە وای کردووە.

## پیتی (ض)

-١- (*)

له ظوڵمت بەرمە بەر کەس، گەر عەرایض
ئەجەل کۆتا بکا کارم بە قابیضْ (١)
دەبا دڵ سوجدەیی طاقی برۆی تۆ
هەموو وەختێ لەگەڵ جەمعی فەرایض (٢)
نەبوغضـێنێ کەسێ مەنناعی عاشق
ئەوە نوطـفەی زەنی ناپاکی حایض! (٣)
شەهیدی نیمنیگاهی تۆ شەریفە
دڵی "سالم" لە فەیضی زەخمە فایض (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، ق)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) قابیض: ئیزرائیل، گیانکێش.

واتە: ئەگەر سکاڵا لە دەستی ستەمت بەرمە لای کەس، ئیزرائیل تەمەنم کورت بکا و گیانم دەربێنێ.

بەرمە بەر (ق): بەرمە لای.

(٢) واتە: دڵم هەموو کاتێ لەگەڵ نوێژە فەرزەکان، کڕنووش بۆ تاقی برۆی کەوانیی تۆ دەبـا. دوور نییە مەبەستی شاعیر ئەوە بێ: کاتی نوێژەکان، میحرابی ئەو برۆی یارە.

تۆ (عا): یار.

(٣) مەنناع: ڕێگر، قەدەغەکەر. زەن: ژن.

واتە: ئەوی ڕقی لەوانە نەبێ کە لۆمەی عاشقان دەکەن، تۆوی ژنی ناپاکە و زۆڵە.

عاشق (عا): عوششاق. زەنی (عا، ق): ژنی.

(٤) فایض: خاوەنبەرەکەت.

واتە: ئەوی شەهیدی چاوی تۆ بێ، پایەی بەرزە. دڵـی سـالم لـە بەرەکـەتی زامـی تـیری یـارەوە بووەتە خاوەنبەرەکەت!

فەیضی (عا): عەیضی!!

# پیتی (ط)

## -١- (*)

**طاقە لە مەرکەزی جەمال خاڵی سیەهـ وەکوو نوقەط**
**جەدوەلی زوڵـف چەنبەری دەوری کراوە میثلی خەط (١)**
**پایی خەیاڵی جوزئیی من، لەنگە لە وەصفی کوللیی تۆ**
**وادییی سەنگلاخی عیشق، پایی خیرەد دەکا سەقەط! (٢)**
**دەیکەمە بەندەری (فورات)، گەر بە (ڕەی)ا گوزەر بکەم**
**ئەشکی ڕەوان بە ڕووم٘دا دێت و دەچێ بە ڕەنگی شەط (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەجەزی هەشتیی مەتویی مەخبوون.

(١) چەنبەر: بازنە.

واتە: خاڵی ڕەشت لە ناوەڕاستی بازنەی جوانیدا تاقانەیە و هەر ئەو بۆ مەرکەز و ناوەڕاست دەشێ، وەك خاڵی مەرکەزی هەر بازنەیەك، پێچاوپێچی زوڵفت بە دەوری ئەو خاڵەدا کراوەتە هەڵقە و بازنە.

(٢) وادی: شیو. سەنگلاخ: بەردەلان.

واتە: پێی خەیاڵ و وردبوونەوەی من بەشێکە (جوزئییە)، وەسفی جوانیی تۆ هەموویەتی (کوللییە)، بە جوزئی وەسفی کوللی ناکرێ. ڕێگە و شیوی بەردەلانی عیشق پێی هۆش دادەڕزێنێ و سەقەتی دەکا و لە کاری دەخا. (جوزئی و کوللی) لە زاراوەکانی زانستی مەنتیقن.

شایانی باسە، (ی)ی جوزئی و کوللی، لەبەر کێشی بەیتەکە، هەرچەند ئێمە لە شیعرەکەدا نووسیومانە، بە کورتی دەخوێنرێنەوە.

(٣) بەندەر: ئەو شوێنەی کە کەشتی لەنگەری لێ دەگرێ.

واتە: فرمێسکی چاوم وەك ڕووبار دێت و دەچێ، بە ڕادەیەك زۆرە، ئەگەر بە خاکی (ڕەی)دا تێپەڕم، بە ئاوی فرمێسکم دەیکەمە لەنگەرگای فورات، کە کەشتی تێدا دەوەستێ. زیادەڕەوییەکی سەیری تێدایە!

**دڵ لە سەوادی زوڵـفْتا، ئابی بەقای لەبی دەوێ**
**چونکە بە ظوڵمەتا دەچێ، زەحمەتە ڕێ نەکا غەڵەط (٤)**
**ڕەمزی میانی چاو و دڵ کەشفە لە فیکری "سالم"ا**
**مەنعە لە کوردییا بکا عەرضی مەعانییی لەغەط (٥)**

(٤) واتە: دڵ، لە تاریکستانی زوڵفتـدا، بـەدوای ئـاوی زینـدەگانیی لێوتـدا سـەرگەردانە. جـا لەبەرئەوەی ڕێگەکەی تاریکە، گرانە ڕێ هەڵە نەکا و بگاتە سەری.

(٥) میان: بەین. لـەغەط: دەنگ و قرەقر، یا دەنگێ کەس تێی‌نەگا.

واتە: نهێنیی نێوان چاوی یار و دڵی سالم، لە بیری "سالم"دا ئاشکرایە و لە یەك دەگەن. ڕەوا نییە ئەم نهێنییە لە زمانی کوردیدا بە قرەقرِ دەربخرێ.

ئەگەر (بە لـەغەط) بووایە، چاکتر دەبوو.

## پیتی (ظ)

-١- (*)

گورێزانی جەفام، ئەی تورکی سیمینبەر، خودا حافیظ
لەتاو جەورت دەڕۆم، ئەی شۆخی مەهپەیکەر، خودا حافیظ (١)
بە یەغما چوو، لە یەك ئیما، مەتاعی صەبر و ئارامم
بە دەروێشی دەڕۆم، ئەی تورکی غارەتگەر، خودا حافیظ (٢)

(*) ئەم چوارینە هەر لە (مان، عا)دا هەیە، لە (عا)دا هەر بەیتی ئەووەڵی دیارە.
کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) واتە: ئەی شۆخی تاڵانکەری لەشسپی، هەڵهاتووی دەستی ئازارم، خودات لەگەڵ بێ.
لەتاو ستەمی تۆ دەڕۆم، ئەی شۆخی پەیکەر وەك مانگ، خودات لەگەڵ بێ.

(٢) یەغما: تاڵان. ئیما: ئیشارەت، نیگا. مەتاع: کەلوپەل و کاڵا.
واتە: ئەی شۆخی تاڵانکەر، هەموو کاڵایەکی ئارامی و ددانبەخۆداگرتنم بە تاڵان برا. بۆیە وا بە دەروێشی و سەڵتوقوڵت دەڕۆم، خودات لەگەڵ بێ.

# پیتی (ع)

## -١- (*)

**((الوداع)) ئەی موڵکی (بابان)، ((الوداع))**
**((الوداع)) ئەی جایی جانان، ((الوداع)) (١)**
**موستەعیددم بۆ بیلادی ڕافیضی**
**((الوداع)) ئەی ئەهلی ئیمان، ((الوداع)) (٢)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، هـ، غ، ج، ڕ، کم، نم، گم)دا هەیە.

ئەگەرچی لە (مان)دا باسی بۆنەی وتنی ئەم پارچەیە نییە، دەبێ سالم ئەم پارچەیەی لە کاتێکدا وتبێ کە سلێمانیی بە ناچاری لە ترسی ستەمی تورکان بەجێهێشتووە و نابەدڵ بەرەو ئێران و خاکی ((ڕەی)) کەوتووەتە ڕێ، هەرچەند بە دڵ لێی بێزار بووە، وەك هەموو چەوساوەیەکی سیاسی کە دنیای نیشتمانی خۆی لێ تەنگ دەبێ و ملی ڕێی ڕزگاری دەگرێتە بەر. هەروەها لەم ماڵاواییە گەرمەوە دەردەکەوێ کە ئەمە لە دواجاری ڕووخانی حوکمی باباندا بووە، کاتێك هیچ هیوایەکی خێر نەماوە!

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەقسوور.

(١) الوداع: خودا حافیز، ماڵئاوا. جایی جانان: جێی دڵبەران.

واتە: ماڵ ئاوا، ئەی وڵاتی بابان و جێی دڵداران، وا دەڕۆم.

ئەی جایی جانان (کم): ئەی ئەهلی ئیمان. (عا، ج): ئەی جانی جانان. (گم): ڕەیحانی جانان. تێکرا هیی (مان) بەجێترە، ئەگەرچی جانی جانان مەشهوورە، چونکە سالم دەیەوێ بە موڵکی بابان بڵێ: شوێنی جانان، یانێ شوێنی یاران و دۆستان.

(الوداع ئەی ئەهلی ئیمان الوداع) و (الوداع ئەی جایی جانان الوداع) لە (کم، نم)دا جێگۆڕکێیان پێ کراوە. ئەی جایی جانان (هـ): ئەی جانی جانان. (گم): ڕەیحانی جانان.

(٢) موستەعید: ئامادە. بیلادی ڕافیضی: وڵاتی شیعە، مەبەست ئێرانە. شاهی خووبان: شای جوانان.

واتە: ئەی باوەڕداران، وا خۆم ئامادە کردووە بچمە وڵاتی شیعەمەزهەبانی ڕافیزی، ماڵئاوا.

ڕافیضی (عا): ڕافیزی. ئەهلی ئیمان (کم، گم): جانی جانان.

**وەك ئەسیری تورکمان دەمبەن بە زۆر**
**«الوداع» ئەی شاهی خووبان، «الوداع» (٣)**
**دەشتی هیجرت تارە وەك دەریایی قیر**
**«الوداع» ئەی میهری ڕەخشان، «الوداع» (٤)**
**ڕووبەڕووی مەشریق دەچم بۆ موڵکی «ڕەی»**
**«الوداع» ئەی قیبلەیی جان، «الوداع» (٥)**
**ئەشکی دیدەم ڕەنگی گوڵناری هەیە**
**«الوداع» ئەی ناری پوستان، «الوداع» (٦)**
**صیحەتی دا وەصڵی تۆ، هیجرت مەرەض**
**«الوداع» ئەی دەرد و دەرمان! «الوداع» (٧)**

(٣) ئەسیری تورکمان: دیلی دەستی تورکان.

واتە: ئێستا کە تۆ بەجێدێڵم، ناچاری بە زۆر بەرەو ئێرانم دەبا، وەك چۆن تورکان بە زۆر دیلەکانیان لە وڵاتی خۆیان دەردەکەن و دەیانبەن.

(٤) تارە: تاریکە. میهر: خۆر. ڕەخشان: تابان و ڕووناك.

واتە: دەشتی دووری و جیابوونەوە لە تۆ تاریك و نوتەکە وەك دەریای قیر. خودات لەگەڵ بێ، ئەی خۆری درەخشان و ڕووناك. لە ڕووناکییەوە بۆ تاریکی، لە نیشتمانەوە بۆ غوربەت!

(٥) مەشریق: ڕۆژهەڵات. ڕەی: تاران. قیبلەیی جان: قیبلەی گیان.

واتە: ئەی قیبلەی گیان، ماڵ ئاوا، وا بەرەو ڕۆژهەڵات بۆ وڵاتی «ڕەی» دەچم.

دەچم (کم، نم، گم): ئەچم.

(٦) واتە: فرمێسکی چاوم ئاڵە و ڕەنگی گوڵناری هەیە. خودا حافیز، ئەی مەمك وەك هەنار، یا ئەی هەناری بێستان، چونکە «پستان» لە (مان)دا «بستان»یش هەڵدەگرێ. لە هەردوو حاڵدا هەر مەمك مەبەستە!

(٧) واتە: گەیشتن بە تۆ تەندروستی دەدا بە لەش، دووریشت نەخۆشی. خودات لەگەڵ بێ، ئەی زێدی جوان، ئەی هەم دەرد و هەم دەرمان.

صیحەتی (کم، نم): هیممەتی. هیجرت (گم): هیجری. دەرد و دەرمان (نم): دەردی دەرمان.

**دڵ بەرابەر زوڵفی تۆ واضیح دەڵێ:**

**«الوداع» ئەی سونبولستان! «الوداع» (٨)**

**زەخمی دڵ بۆ ئابی پەیکان تیشنە ما،**

**«الوداع» ئەی تیری موژگان! «الوداع» (٩)**

**گەرچی بۆ ئەحواڵی "سالم" بێغەمی،**

**«الوداع» ئەی ناموسوڵمان! «الوداع» (١٠)**

(٨) سونبولستان: جێی سونبول، وەك (گولستان).

واتە: دڵ بەرامبەر بە زوڵفی تاتا و بۆنداری تۆ، بە ئاشکرا دەڵێ: خودات لەگەڵ بێ، ئەی دێر و کێڵگەی سونبول و زوڵفی جوان.

واضیح (عا): وازیح. (گم): واعیظ!. دەڵێ (کم): ئەڵێ. سونبولستان (ھ): تیری موژگان.

(٩) ئەم بەیتە لە (ھ، گم)دا نییە. هەر ئەم بەیتە و بەیتی دوایی لە (غ)دا هەیە، چونکە پەڕەی پێشووی دەستنووسەکە کەوتووە.

تیشنە ما: بە تینوێتی مایەوە.

واتە: زامی دڵ پەترۆی بەستووە و تینووی ئاوی پەیکانە. خودات لەگەڵ بێ، ئەی تیری موژگان! ئای کە ماڵاواییەکی دڵتەزێنە.

زەخمی دڵ (غ): زەخمی من.

(١٠) ئەم بەیتەیش لە (ھ)دا نییە.

ناموسوڵمان: بێئایین و ستەمکار. دیارە لە خۆشەویستیدا وای پێ دەڵێ، بە دڵی نییە!

واتە: ئەی بێدینی ستەمکار، ئەگەرچی تۆ هیچ خەمی حاڵوباری منت نییە، ماڵ ئاوا!

-٢- (*)

**دەڵێم با تەرکی عیشقت کەم بە دڵ، شەرطی وەفا مانیع**
**لە جەورت ڕەنگە کافر بم، وەلێ خۆفی خودا مانیع (١)**
**دڵم دێنێ لە جێی ساغەر لە گەردشدا لەبت بێنی**
**ئەتۆیش خۆ کەمحەریفێ نیی، وەلێ پەردەی حەیا مانیع (٢)**
**ویصالت بۆ هوزاری دڵ، حەدیقەی بیم و ئومێدە؛**
**لە ڕووت غونچەی وەفا ظاهیر، لە خووت خاری جەفا مانیع (٣)**
**سەرای تاریکی دڵ ڕۆشن بووە "سالم" لە شەوقی ئەو**
**بەڵێ، بۆ ظوڵمەتی کافر چراغی "موصطەفا" مانیع (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، نم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) واتە: بە دڵ دەڵێم با واز لە خۆشەویستیت بێنم، بەڵام ئەمەك و وەفا ڕێم لێ دەگرێ. ستەمت ئەوەندە بەتینە، لەوانەیە لە دینم وەرگەڕێنێ، بەڵام ترسی خودا ڕێم لێ دەگرێ.

بە دڵ (نم): وەلێ. خودا (نم): خوا.

(٢) دێنێ: دەهێنێ، شایانیەتی، یا دەیەوێ. ساغەر: پیاڵەی مەی. حەریف: ئەرباب. نیی: نیت.

واتە: دڵم حەز دەکا، لەباتیی پیاڵەی شەراب، لێوت بگرێ و بیمژێ، تۆیش ئەربابێکی کەم نیت و چاکی پێدەزانی و بەدڵتە، بەڵام پەردەی شەرم ڕێی لێ گرتووی.

(٣) ئەم بەیتە لە (نم)دا نییە.

هوزار: بولبول. بیم: ترس. ئومێد: هیوا. خار: دڕك.

واتە: گەیشتن بە تۆ بۆ بولبولی دڵم باخچەی ترس و هیوایە، ڕووی جوان و دەمی بچووکت وەك خونچەی وەفایە و جێی هیوایە، خوو و ڕەوشتی توندوتیژت دڕکی ستەمە و ناهێڵێ بەو هیوایە بگەم.

(٤) سەرا: یانە.

واتە: خانەی تاریکی دڵ بە شەوقی ڕوومەتی ئەو ڕووە ڕۆشن بووە. بەڵێ، ڕاستە چرای پێغەمبەر ڕێ لە تاریکیی کوفر دەگرێ.

بە دوور نازانرێ سالم ئەم پارچە شیعرەی بۆ "کوردی" نووسیبێ و مەبەستی لە مستەفا ئەو بێ.

## پیتی (غ)

-١- (*)

دادەنیشێ دڵبەرم، شەو بێچراغ
شەوق ئەدا ڕووی گەوهەری وەك شەوچراغ (١)
دیم لەناو گوڵزاری ڕووی خاڵ و وتم:
ئەی عەجەب، زاغ ئاشیانەی وا لە باغ! (٢)
وەه چ دەردێکە فیراقی لالەڕوو!
حاصڵە بۆ قەلبی دڵ هەر کۆنەداغ (٣)
مەوجی وا خستە دڵم، طۆفانی غەم
کەوتە سەر دەریایی ئەشکم وەك قەیاغ (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەقسوور.

(١) چراغ: چرا، شەوچراغ جۆرە گەوهەرێکە لە شەودا وەك چرا دەگرێ و دەوروبەری ڕۆشن دەکاتەوە.

واتە: یار شەوان بێ چرا دادەنیشێ، چرای بۆ چییە؟ ئەو ڕووی وەك گەوهەری شەوچرایە و دنیای ڕووناك کردووەتەوە.

(٢) واتە: خاڵم لە ناو گوڵزاری ڕوخساری یاردا دی و وتم: سەیرە! قەلەڕەش هێلانەی لە باخدایە. سالم زوڵفی یاری لە ڕەشیدا شوبهاندووە بە قەلەڕەش، شوبهاندنێکی -بەڕاستی- نابەجێیە. ئەمە لە لایەك، لە لایەکیترەوە، ئەمە سەرسووڕمانی بۆچییە؟ ئەی قەلی چارەڕەش هێلانەی، گەر لە باخدا نەبێ، دەبێ لە کوێدا بێ؟

(٣) وەه: وەی. لالەڕوو: ڕوومەتگوڵ.

واتە: ئای لەیاربڕان چ دەردێکی بێدەرمانە! بەرهەمی ئەم لێبڕانە بۆ ناوجەرگەی دڵم هەر کۆنەداخە.

(٤) قەیاغ: ئامرازێکی سەرەتایی بووە بۆ پەڕینەوە لە چەم و ڕووبار.

ڕائیحەی عەطری جیهان دەردیسەرە،
بۆیی زوڵفت دەست بدا گەر بۆ دەماغ (٥)
قانیعم "سالم!" بە صەحرایی جونوون
نامەوێ ئارایشی کاخ و وەتاغ (٦)

واتە: لافاوی خەم شـــەپۆلێکی وەهای خستە ناو دڵــم، دڵــم وەك قـەیاغ کەوتـە ســـەر ئـاوی ڕووباری فرمێسکم.

(٥) واتە: ئەگەر بۆنی خۆشی زوڵفی دەست بدا بۆ دەماخ، ئـیتر بـۆنی عـەتری نـاوێ، چـونکە بۆنی عەتری دنیا سەرئێشە دێنێ.

(٦) دڵی سالم قسەی لـەگەڵ ئەو کردووە و وتوویە: ئەی سالم! من بە دەشتی شـێتی دەساچـێم و پێی ڕازیم، جوانی و ئارایشتی کۆشك و تەلارم ناوێ.

# پیتی (ف)

## -١- (*)

**عومری شیرینم بە تەڵخی بوو لە ڕێگەی تۆ، تەلەف**
**سا جەفا تا کەی، وەفا کە، بێ لە ڕێی شاهی (نەجەف) (١)**
**گۆزەگەر حەتتا طەماعی پێ نییە، وا کەوتووە**
**ڕووی طەلاڕەنگم بەبێ حورمەت لە خاکا وەك خەزەف! (٢)**
**بارشی نیسانی لوطفت چونکە هاتە بەحری غەم،**
**کەوتە دڵ عیشقت وەکوو لوئلوء لەناو قەلبی صەدەف (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ق)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) تەڵخی: تاڵی. وەفا کە: وەفاداری بنوێنە.

واتە: تەمەنی شیرینم لە پێناوی تۆدا بە تاڵی بەسەرچوو. ئیتر ئێش و ئازار تا کەی، وەفات هەبێ، بە ڕێی شای نەجەفدا، یانێ حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبووتالیب، وەرە. یان لەبەر خاتری ئەو وەفا بنوێنە. بەوەدا کە ئەو داوایەی لێ دەکا، ڕەنگە کچەکە سنەیی و شیعەمەزهەب بووبێ.

ڕێی شاهی (مان): ڕێگەی شاهی. نیوەبەیتەکەی پێ لەنگ دەبوو، بۆیە ئەوی (ق) دانرا.

(٢) گۆزەگەر: ئەوی کووپە و گۆزەی گڵێن دروست دەکا. طەلاڕەنگ: ڕەنگ وەك زێڕی زەرد. خەزەف: سواڵەت، پارچەگۆزەی سوورەوەکراو کە جارێکیتر ناکرێتەوە بە قوڕ.

واتە: ڕووی وەك زێڕ زەردم وەها بە بێقەدری لە خاکدا وەك سواڵەت کەوتووە، تەنانەت وەستای گۆزەگەریش ئیشی پێی نییە و لای لێ ناکاتەوە.

وا کەوتووە (ق): وای کردووە. (تەلا) لە هەردوو نوسخەکەدا بە (طەلا) نووسراوە.

(٣) بارش: باران.

سالم دڵی خۆی بە صەدەفی ناو دەریای خەم و پەژارە، لوتفی دڵبەریشی بە بارانی بەهار شوبهاندووە، وەك چۆن دڵۆپی بارانی بەهار دەکەوێتە ناو سکی صەدەف و دەبێتە گەوهەری تاقانە، بەو جۆرەیش عیشق لە لوتفی یار باری و چووە صەدەفی دڵیەوە و دیارە دەیەوێ عیشقەکەی وەك

**قەد گوڕێز نادەم لە بەیعی لەعلی ڕوممانیی لەبت**
**تا لە بازاڕی حەیاتا نەقدی جانم بێ بە کەف (٤)**
**زاهیدی خەڵوەت بە ظاهیر مەنعی عیشقم لێ دەکا!**
**زاڵی دەورانیش، لەبەر پیری، بووە عەقڵی خەرەف! (٥)**
**ڕۆژی عوقبا گەر بەبێ تۆ جێم بەهەشت بێ، نامەوێ**
**بۆ فەریبم ڕاگرن غیلمان و حۆری، گەر بە صەف (٦)**
**شادمانیی دڵبەرە "سالم!" صەدایی شیوەنم**
**بۆ زیادیی ذەوقی سالیك هاتووە ئاوازی دەف (٧)**

گەوهەری بێهاوتا بە تاقانە پیشان بدا.

(٤) واتە: تا نەقدی گیانم لە بازاڕی ژیاندا بەدەستەوە بێ و بە سەر زیندوو بم، کاتی فرۆشتنی لەعلی هەناریی لێوت هەرگیز ڕاناکەم و نابەزم. یانێ تا گیانەکەم هەبێ پێشکەشی دەکەم و لەعلی لێوت دەکڕم. پوختەی قسە: تا ساتی گیانکێشان واز لە ئەوینت ناهێنم.

(٥) ئەم بەیتە لە (ق)دا نییە.

واتە: زاهیدی ‑بە دیمەن‑ گۆشەنشین ڕێی عیشقم لێ دەگرێ و سەرزەنشتم دەکا. پیری زەمانەیش، کە زاهیدەکەیە، لەبەر پیری عەقڵی نەماوە. من چۆن واز لە عیشق دەهێنم؟!

(٦) واتە: ئەگەر لە ڕۆژی دواییدا بێ تۆ بەهەشتم بدەنێ و پەریم بۆ ڕیز بکەن و بیانەوێ بمخەڵەتێنن، نامەوێن.

بۆ فەریبم ڕاگرن غیلمان و حۆری، گەر بە صەف (ق): بۆ فەریبم بێ ئەگەر غیلمان و حۆری صەف بە صەف.

(٧) سالیك: سۆفی و دەروێش، ڕێگرتووی ڕێی تەریقەت.

واتە: ئاوازی شین و گریانی من، شادی و خۆشییە بۆ دڵی دڵبەر. ئاوازی دەف بۆ زیادکردنی زەوقی سۆفی و دەروێشە و من نامەوێ، تەنها شیوەنەکەی خۆم بەسە، بەتایبەتی کە یار پێی خۆشە.

یا: شین و گریانی سالم مایەی شادیی دڵی دڵبەرە، وەك چۆن ئاوازی دەف زەوقی سالم زیاد دەکا!

دڵبەرە (ق): دڵبەرم.

# پیتی (ق)

## -١- (*)

لازمی عەرضوحاڵمە کاغەزی زەڕ طەبەق
شەرحی میحەن، بە خوێنی دڵ، ثەبتی دەکەم وەرەق وەرەق (١)
تیری نیگاهی دڵبەرم یەك یەکی نیشتە ناو جگەر
سینە لە نێشی پیلْکەی موتتەصیلە شەبەق شەبەق (٢)
گەرچی شەکەر لە هەر مەذاق صاحێبی لەذذەتە، وەلێ
شەهدی حەلاوەتی لەبت، بردوویە لێی سەبەق سەبەق (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (کم، نم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەجەزی هەشتیی متویی مەخبوون.

(١) کاغەزی زەڕ: کاغەزی بە ئاوی زێڕ زەردکراو، کاغەزی زەرکەفت! لەوانەیە ئەو ڕۆژانە شتی بەنرخ لەو جۆرە کاغەزانەدا نووسرابێ. میحەن: کۆی میحنەتە، مەینەت.

واتە: کاغەزی زێڕین بۆ نووسین و نیشاندانی حاڵم تەبەقتەبەق پێویستە، تا پەڕە پەڕە شەرحی نەگبەتیی خۆمی بە خوێن تێدا بنووسم. دوور نییە مەبەستی لە کاغەزی زەڕ ڕوومەتی زەردی خۆی بێ، دیارە شەرحی حاڵی عاشق لە ڕوخساری زەردی زێڕینیدا دیارە.

دەکەم (نم): ئەگەم. (کاغەزی)، دەبێ (کاغەذی) بووبێ و گۆڕرابێ.

(٢) پیلکە: قامك، پەنجە.

واتە: تیری نیگای دڵبەرم یەك لە دوای یەك جگەری داگیر کردم. سنگم بە پیلکەتێگرتنی تیرەکانی برژانگی، بووەتە شەبەق و کونی یەك لەپاڵ یەك و سنگم وەك بێژنگ کونکونە.

نێشی (گم): ترسی. پیلکەی (کم): پیلکی.

(٣) واتە: ئەگەرچی بە چەشی هەموو کەس شەکر بەلەزەتە، هەنگوینی شیرینی لێوی یار گرەوی لێ بردووەتەوە و لێی پێشکەوتووە.

**زوڵفی سیاهی چین بە چین، مائیلی دۆشە خەم بە خەم**
**حەلقەیی ئەو لە گەردنم پێچشی دا وەهەق وەهەق (٤)**
**وەصڵ و صەفاوو کەیف و ذەوق، هەفتەیێ بوو، چ زوو گوزەشت؟!**
**باز من و بێکەسیی و غەم، کەوتینە لاوە دەق بە دەق (٥)**
**گەرچی زەمانی وەصڵی یار، شەهد و شەکەر لە بۆسە بوو**
**ئێستە بە طەبعی ڕۆژگار، ژەهرە، فیراقە، دەق بە دەق (٦)**
**عیبرەتی نازەنین کْوا شامیلی حاڵی "سالم"ە؟**
**ناڵەیی ئەو بە سامیعین گریە دەدا، فیرەق فیرەق (٧)**

(٤) دۆش: سەرشان. وەهەق: پەتێکی گرێدراوە دەکرێتە ملی وڵاخ و پێی دەگیرێ. لێرەدا مەبەست تەنها هەڵقەیە.

واتە: زوڵفی ڕەشی چین‌چینی یار پێچ بە پێچ حەز لە سەرشان دەکا. ئەو زوڵفە ڕەشە چووەتە گەردنم و هەڵقە بە هەڵقە پێچی بە دەوردا دەدا.

وەهەق وەهەق (گم): حەق بە حەق.

(٥) باز: دیسان.

واتە: بەیەکگەیشتن و خۆشی حەفتەیێ بوو و زۆر زوو چوو، دیسان دەق بە دەق من و خەم و بێ کەسی کەوتینەوە یەك.

ژەهرە فیراقە (کم): ژهر فراقە.

(٦) وەصڵ: بەیەکگەیشتن. دەق بە دەق: بەتەواوی، دەقاودەق.

واتە: هەرچەندە ماچی سەردەمی گەیشتن بە یار شیرین بوو، چونکە هەنگوین و شەکری تێدا بوون، بەڵام ئێستا بەپێی ڕۆژگار تاڵ بووە وەك ژەهر، چونکە بەتەواوی لێك دابراوین.

ژەهرە، فیراقە دەق بە دەق (نم): هەر فیراقە دەق بە دەق.

(٧) واتە: ناڵەی سالم کۆمەڵ کۆمەڵ گوێگرانی هێناوەتە گریان، بەڵام کوا یار عیبرەت دەگرێ و عیبرەتەکەی حاڵی سالم دەگرێتەوە و نەختێ بەزەیی پێدا دێتەوە؟! بەم شێوەیە مەبەست لە عیبرەت دەس‌هەڵگرتنی یارە لە ئازاردانی عاشق.

کوا شامیلی (کم، نم): شامیلی. لەنگە. (گم): کەوا شامیلی.

-٢- (*)

**وەکوو یەك دێتە بەر گوێی پیاوی ئەحمەق**
**نەفیری بولبول و ئاوازی لەقلەق!!** (١)
**لە بازاڕی جیهان وەك یەك دەناسن**
**لە زەردیدا طەلاوو ڕەنگی مەفرەق!!** (٢)
**لە حەرفی ناکەسان با چەندْ ڕۆژێ**
**گران کەم گوێم بە پەنبە و سورب و زەیبەق!** (٣)
**لەبی تەنگی دلارامم دەبەخشێ**
**بە غونچەی نەوشکوفتە، ڕەنگ و ڕەونەق** (٤)
**لەبەر نەقشی خەیالت، کولبەیی من**
**سەراسەر نەقشە وەك قەصری (خەوەرنەق)** (٥)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، غ، ج، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) واتە: پیاوی بێعەقڵێ لە عیشق نەگەیشتوو، چریکەی بولبولی شەیدا و قرەقرِی لەقلەقی وەك یەك دێتە بەر گوێ، فەرقیان ناکا.

ئاوازی (عا، غ): فەریادی. جوانترە.

(٢) طەلا: ئاڵتوون، زێڕ. مەفرەق: برنجە، زەرد.

واتە: لە بازاڕی ئەم دنیا بێنرخەدا زەردیی زێڕ و ڕەنگی زەردی برنجە وەك یەك دەناسن.

جیهان (کم): جیهاندا. تەلاوو (ج): تەلا وەك. (کم، گم): گولاوو.

(٣) پەنبە: لۆکە. سورب: قورقوشم. زەیبەق: جیوە.

واتە: با چەند ڕۆژێ گوێم کەڕ بکەم لە قسەی ناکەسان، بە لۆکە و قورقوشم و جیوە بیئاخنم.

بە پەنبە و (غ): بە پەنبە. سورب و (عا): شیرب و!

(٤) نەوشکوفتە: تازەپشکووتوو.

واتە: لێوی تەسکی دلبەرم ڕەنگ و ڕەونەق بە خونچەی تازەپشکووتوو دەبەخشێ، چونکە لە لێوی یار دەچێ.

لەبی تەنگی (ج): لەبت تەنگ.

(٥) کولبە: کەلاوە، وێرانە. خەوەرنەق: ناوی کۆشکێکی جوان بووە، نوعمانی کوڕی مونذیر

**به گەردش دێ، لە جۆشی گریە، ئەندام**
**بەسەر دەریایی ئەشکا میثلی زەورەق (٦)**
**مەقامم کەن بە زەجر، ئەر داری "مەنصوور"**
**دەکێشێ خوێنی من نەقشی ((أنا الحق))! (٧)**
**لەبەر تیغی برۆت دڵ وا دەلەرزێ:**
**لە ڕووی سەیفی "عەلی"، کوففاری (خەندەق) (٨)**
**لە سەرخۆشیی غەما، بۆ فەوتی شادی،**
**وەرە "سالم" بکەین با جامە ئەزرەق (٩)**

بۆ بەهرامی گووڕی دروست کردبوو.

واتە: کە خەیاڵت دەکەم، لەبەر جوانیی تۆ خەیاڵم جوان و پڕ لە نەخش و نیگار دەبێ. وێرانەکەم بەو خەیاڵە، وەك کۆشکی خەوەرنەق، سەرانسەر دەبێتە نەخش و نیگار.

سەراسەر نەقشە (کم، گم): فەرەحئەنگێزە.

(٦) گەردش: سووڕان. زەورەق: گەمی، بەلەم.

واتە: لەشم لە جۆش و تاوی گریانم، لەسەر دەریای فرمێسك وەك بەلەم دەسووڕێتەوە.

گەردش (عا، غ، ج، کم، گم): جونبوش. گریە (ق): دیدە.

(٧) ئەم بەیتە هەر لە (کم، گم)دا هەیە و زۆر جوانە.

واتە: ئەگەر زەجرم بکەن و داری خنکاندنەکەی مەنسووری حەللاج بکەنە شوێنم و بمکوژن، خوێنم نەخشی ((أنا الحق)) دەکێشێ. مەنسوور گیرۆدەی عیشقی خودایی بوو، ئەمیش هیی مەجازی!

(٨) ئەم بەیتە هەر لە (مان)دا هەیە.

واتە: دڵ لە ترسی تیغی بڕۆت، وەها دەلەرزێ، وەك کافرەکانی غەزای خەندەق کە لە شمشێری حەزرەتی عەلی دەترسان و دەلەرزین.

(٩) ئەم بەیتە لە (ج)دا نییە.

واتە: سالم! کە شادی مرد، وەرە با کراس شین بکەین و بچینە سەرخۆشیی خەم و پێی بڵێین خۆت خۆش! چۆن سەرخۆشییەکە؟ زۆر جوانە. ئەوەندە داماون، سەرخۆشی لە دوژمن دەکەن کە دوژمنی مردووە، دوژمنە مردووەکەیشی دۆستی ئەمانە.

لە سەرخۆشیی (ق): بە سەرخۆشیی.

## -٣- (*)

**له چەرخی حوسنتا هاتن موطابیق**
**شەو و ڕۆژ و هیلال و صوبحی صادیق (١)**
**له خاکا لاله کەی دەڕوێ بەهاران**
**نەڕێژێ خوێنی دڵ، گەر چاوی عاشیق؟! (٢)**
**له من تا دووره چیهرەی ئەرغەوانت**
**سروشکم دێته دامەن وەك شەقایق (٣)**
**له ڕووی ئایینەتا تا طووطییی دڵ**
**حەریفی خۆی نەبینێ، نابێ ناطیق! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعره له (مان، عا، ه، ف، غ، ج، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) واته: چوار شت له سەردەمی جوانیتدا زۆر به ڕێکی کۆبوونەوە؛ شەوی زوڵف، ڕۆژی ڕوخسار، کەوانی برۆ، شەفەقی ڕوو.

شەو و ڕۆژ و (مان): شەو و ڕۆژە.

(٢) لاله: گوڵی سوور و زەرد و سپیی ڕوو، لێرەدا مەبەستی سوورە.

واته: ئەگەر چاوی عاشقی گریاو فرمێسکی خوێنین نەڕێژێ و زەوی ئاو نەدا، کەی لالەی هەمەجۆر -بەتایبەتی سوور- سەر له خاك دەردێنێ؟

دەڕوێ (کم): دەوڕێ. هەڵەی چاپە.

(٣) ئەرغەوان= ئەرخەوان: درەختێکی بەهاریی ڕەنگینی ڕەنگ‌سووره کە سروشتی سارد و وشکە. سروشك: فرمێسك. شەقایق: گوڵاڵەسووره.

واته: تا ڕوخساری جوانی ئەرخەوانیت، کە هەم جوان و هەم وشك و ساردە، له من دوور بێ، فرمێسکم به ڕەنگی گوڵی سووری گوڵاڵەسووره دەڕژێته داوێن.

چیهرەی (کم): چارەی. (گم): چاوی! (ئەرغەوانت) ئەگەر (ئەرغەوانیت) بووایە، جوانتر دەبوو.

(٤) واته: تا تووتیی دڵ وێنەی خۆی له ئاوێنەی ڕووی ساف و بێگەرد و درەخشانی تۆدا نەبینێ، نایێته قسە. یانێ- کە دوور بم زمانم گۆ ناکا، کە لێت نزیك دەبمەوە، دێمە قسە.

نەبینێ نابێ (ه، غ، ج، ڕ، کم، گم): نەدیبێ نەبووە.

**دڵم وەختێ لە عوهدەی چاوی تۆ دێ**
**بەسەر بازا ببێ عوصفوورْ، فایق!! (٥)**
**دەترسم دڵبەری دڵسەختْ "سالم!"**
**لە خاطریا نەمابێ عەهدی سابیق (٦)**

(٥) ئەم بەیتە هەر لە (مان)دا هەیە.

عوهدە: دەرەقەت، پێویران. عوصفوور: چۆلەکە. فایق: سەرکەوتوو، باڵادەست.

واتە: دڵم وەختێ دەرەقەتی چاوی تۆ دێ، کە چۆلەکە بەسەر بازدا زاڵ ببێ و ئەوەیش هەرگیز نابێ!

(٦) ئەم بەیتە لە (هـ)دا نییە.

واتە: سالم! دەترسم یاری دڵڕەق پەیمانی پێشووی لەبیرچووبێ، بۆیە وا بێبەزەییيە.

دڵسەخت (ف، ق): دڵسەختی. سابیق (عا): پابیق. هەڵەیە.

نوسخەی (هـ) ئەمە دواینبەیتیەتی:

لەبەر گریانی شادی، هەردوو چاوم
ڕژایە ئەرض، "سالم" بوو بە ناهیق

# پیتی (ك)

## -١- (*)

**تیری ئاهی صوبحگاهم، ڕەنگە کونکون کا فەلەك**
**ئەشکی ئاتەشناکی من، تەحقیق، دەگاتە سەر سەمەك (١)**
**دوور لە تۆ دوورم لە خەو، نەزدیکە مەرگم ڕۆژ و شەو**
**میحنەتی دووری هەمیسان ڕیتیە ناو چاوم، نەمەك (٢)**
**بۆ پیادەی وەصڵی یار ئەسبابی نەگبەت زۆر ئەبێ:**
**فیکرە ڕێم و غەم سوارم، دەرد و هیجرانیش یەدەك (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) واتە: تیری ئاهی سەرلەبەیانم ئەوەنـدە تیـژ و بڕندەیـە، لەوانەیـە ئاسمـان کـون بکـا. فرمێـسکی ئاگرینیشم -بێگومان- دەگاتە سەر ئـەو ماسـییە کـە گـا بەسـەر پـشتـیەوەیە و گـۆی زەویـش بەسـەر شاخەکانی گاکەوەیە؛ یا هەر مەبەست ماسیی ئاساییە کە لەناو ئاودایە، چونکە فرمێسکی ئاگرینی سالم بە ئاو ناکوژێتەوە و ماسیی ناو دەریا دەسووتێنێ.

دەگاتە (کم، گم): ئەگاتە.

(٢) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی هەر لە (کم، گم)دا هەن.

ڕیتیە: ڕشتیە.

واتە: کە دوور بم لە تۆ، دوورم لـە خـەو و شـەو و ڕۆژ مـەرگم لێ نزیکـە. نەگبـەتیی دووری هەمیسان خوێی کردە چاوم و خەوی لێ حەرام کردم.

خەو (کم): خو.

(٣) واتە: بۆ ئەو عاشقی پیادەیە کە دەیەوێ بگاتە مەنزڵگەی بەیەکگەیشتنی لەگەڵ یاردا، هـۆی نەگبەتی زۆرە؛ ڕێگە بیرە، سواری خەمم و دەردی دووریش سەربارە.

(ئەبێ)، لە بنەڕەتدا (دەبێ) بووە و گۆڕراوە.

**مردنم پێ خۆشه، نەك دڵبەر کەدەر حاصڵ بکا**
**من سەراپا ناری غەم بم، ئەو دەڵێ: سووتا، دەرەك! (٤)**
**پێم بڵێ، ئەی عیشوەجۆ! تۆ جادْوی، یا ساحیری؟**
**بەم قەرارە قەد لە لای من دڵبەری ناکا، مەلەك! (٥)**
**ظوڵم و فێڵی لێ مەکە "سالم"، دڵی مۆرە بە زۆر**
**ئاسْمان! ڕەحمت ببێ، تووبی خودا تا کەی کەچەك (٦)**

(٤) کەدەر: خەم، زویری. دەرەك: دۆزەخ.

واتە: من مردنم پێخۆشە، نەك زویریی دڵی یار. کەچی ئەگەر ئاگری خەم سەراپا داگیرم بکا، یار دەڵێ: لێی گەڕێن با بسووتێ، بە جەهەننەم!

دڵبەر (کم): یارم. ناری غەم (ق): غەری نار.

(٥) عیشوەجۆ: بەناز. مەلەك: فریشتە.

واتە: ئەی یاری غەمزەدار و بەناز! تۆ فریودەری یا سیحربازی! من لام وایە فریشتەیش وەك تۆ دڵبەری ناکا و ناز نافرۆشێ.

قەد (کم، گم): قەت.

(٦) کەچەك: تێلای ئاسنی سەرنوشتاوە، قولاپ.

واتە: ئەی ئاسمان ڕەحمت هەبێ، ستەم و فێڵ لە سالم مەکە، کە دڵی بە زۆر و ستەم مۆر کراوە! توو بی و خودا تا کەی تێلای ئاسن و قولاپم تێ دەگری؟!

خودا تا کەی (کم، گم): خوا بەسی بێ.

-٢- (*)

## (در وصف خاله عزیز)

خاڵە! وا بەخشیم بە هاولاقیی تۆ، دێڵی بەڵەك
ماینی کوێتیی ئەفەندیش بۆ ئەنیسی بۆزی سەك (١)
مەوجی بەحری ئارەزوو، گەر سەددی صەبری ڕاڕفاند
تۆ هەڵێرە پشتی دێڵ و بۆز لەسەر کوێت وەك کەڵەك (٢)
مرقەمرق و قووڕەقووڕ و کووڕەکووڕ و حیلەحیل،
کوێت و دێڵ و بۆز و تۆ بەزمێ بینا نێن یەك بە یەك (٣)
داپەڕین و هەڵپەڕین و هەر پەڕین و هەر تڕین
هەر لە بۆزە و تۆوە بێ ئەم صەوتە وەك دێزەخەڕەك (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان)دا هەیە، ناسناوی سالم نیە، بەڵام لە هەموو ڕوویەکەوە لە هی ئەو دەچێ. وا دیارە سالم لە غەزەل و داشۆرینبابەتەکانیدا نەیویستووە ناوی خۆی بنووسێ. وەك دەبینن لە ناوونیشانی پارچە شیعرەکەدا نووسراوە: «در وصف خالە عەزیز» واتە: باسی خاڵۆ عەزیز دەکا!

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) هاولاقی: هاوجووتی. دێڵ: مێنەی سەگ. بۆز: شینی ئامالسپی. کوێت: ئەسپی سووری ئامالڕەش. ئەنیس: هاودەم، هاونشین.

دیارە خاڵە خۆی ئەسپێکی سكبۆزی هەبووە، سالمیش ماینێکی کوێت و دێڵەسەگێکی پێ بەخشیوە، ماینە کوێت بۆ هاوجووتیی ئەسپەبۆز و دێڵەسەگیش بۆ هاوجووتیی خاڵە!!

(٢) مەوج: شەپۆل. سەد: بەنداو، بەربەست. هەڵێرە: هەڵبێ، ڕابکەرە، هەڵقونە سەر پشتی. کەڵەك: کۆمەڵەبەردی بەسەریەکدادراو.

واتە: ئەگەر شەپۆلی (ئارەزوو) بەربەستی سەبری ڕامالی و نەتانتوانی خۆتان بگرن، تۆ سواری دێڵە بە، ئەسپەبۆزیش سواری ماینەکوێت، وەك کەڵەك یەك لەسەر یەك!!

(٣) قووڕەقووڕ: دەنگی تایبەتی دێڵەسەگ. کووڕەکووڕ: پشتدانەوانەن کە کاری خاڵەیە. حیلەحیل: هیی ئەسپەبۆزە و مرقەمرقیش: دەنگی گەروو بە دەمقووچانەوەی ماینەکوێت.

واتە: تۆ و ماینەکوێت و دێڵە و ئەسپەبۆز، هەر یەکە بە دەنگی خۆی بەزمێك بگێڕن.

(٤) هەڵپەڕین و داپەڕین: بەرزبوونەوە و نزمبوونەوە. پەڕین: نێر سواربوونی مێ. تڕین: بالێبوونەوە.

دێڵ و کوێت، گەر حامیلەی تۆ و ئەسپی بۆز بن، وەختی ژان
بۆز لە کوێت ئوشتور دەبینێت و لە تۆ و دێڵیش دەڵەك (٥)
گەر لەڕی گاهی پەڕین بن بۆز و تۆ، تەدبیرمە:
ئەو بە کرشەجۆ قەڵەو کەم، تۆ بە ئاشی مەرجومەك (٦)
گەر تەواو ئوفتادە بن، هەم غەم مەخۆن، فەربیه دەبن
تۆ بە ئێسقانی فڕووج و بۆز بە خەپلەی جۆ و کەپەك (٧)
کوێت بگێی فرصەتتە، بۆز و دێڵ بگێی دووشەشتە خاڵ!
با بزانین چۆن دەنیشێ طاسی نەڕرادی فەلەك؟! (٨)

صەوت: دەنگ. دێرەخەڕەك: دێر- شووم و بێفەڕ، خەڕەك- دەزگای لۆکەڕێسی.

واتە: تۆ و بۆزە هەر خەریکی هەڵپەرین و داپەڕین و کاری جینسی و بـاڵێبوونـەوە بـن. بـا ئـەم دەنگەدەنگەی وەك خەڕەکی بێفەڕ هەر لـە تۆ و ئەوەوە بێ.

(٥) حامیلـە: زگپڕ. دەڵەك: جانەوەرێکی لـە ڕێوی بچووکتری کەوڵ بەنرخە.

واتە: ماینەکوێت و دێڵەسەگ ئەگەر «گرتیان»، ئەوا بەرهەمی ئەسپەبۆز لە ماینەکوێت وشـتر و هی تۆیش لـە دێڵ دەڵەك دەبێ، کە پێستەکەی بەنرخە!

(٦) لـەڕ: لاواز، ڕەتووتە. گاه: کات. تەدبیرمە: ڕێوشوێنم داناوە. کرشـە: کلـۆش، درەوکـراوی دەغڵ. ئاش: چێشت. مەرجومەك: نیسك. ئاشی مەرجومەك: نیسکێنە.

واتە: ئەگەر تۆ و ئەسپەبۆز لـە ئەنجامی پەڕیندا لـەڕ و لاواز بوون، ئەو بە پووشی جۆ قەڵەو دەکـەم و تۆیش بە نیسکێنە.

(٧) ئوفتادە: پەککەوتوو، لـەپێکەوتوو. فەربیە: قەڵەو. فڕووج: جووجەڵەی مریـشك. خەپلـە: کولێرەی ئەستوور لـە گەنم نەبێ. کەپەك: درشتەی ئاردی دابێژراو.

واتە: ئەگەر هەر بە تەواویش لـەپێکەوتن، ئەوا مەترسـن دیسان قەڵەوتان دەکەم، تۆ بـە ئێـسقانی فڕووج و ئەویش بە کولێرەی جۆ و سۆسی ئارد.

(٨) تاس: کاسە، فەلـەك وەك کاسەیە. نەڕراد: زارهەڵدەر، نەردێنکەر.

واتە: خاڵۆ، بۆ تۆ قازانجە و دووشەشتە هەر کامیان بگێی: ماینەکوێت، یا ئەسپەبۆز، یا دێڵەسەگ!! بزانین فەلـەك چۆن زار هەڵدەدا و چی دێنێ؟

-٣- (*)

**لەیلاوەشانی موڵکی عەرەب، جوملە یەك بە یەك**

**«دیدم سیاه چرده، ندیدم بدین نمك» (١)**

**تەنها زەمین لە عاریضی تۆ پەرتەوی نەدی**

**«مانند آفتاب همی تابد از فلك» (٢)**

**چینی، لە ڕوویی مەعنییی ئەوصافی حوسنی تۆ**

**«نقش و نگارخانهٔ چین را کنند حك» (٣)**

**ڕۆژی ئەزەل لە جایی پودەر، گەر پوسەر دەبوو**

**«از دیدنش به سجده نپرداختی مَلَك» (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، هـ، ف، غ، ن، ج، کم، گم)دا هەیە، لە (مان، ن)دا یەکێکە لە مولەممەعەکان. فارسییەکەی هیی "حافظ شیرازی"یە و بەیتەکانی پاش و پێشیان بێ کراوە.

کێشی عەرووز: موزاریعی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

(١) وەش: چەشن. لەیلاوەشان: هاوچەشنانی لەیلا. چردە: ڕەنگ. نمك: خوێ.

واتە: جوانی هاوچەشنی لەیلام لە وڵاتی عەرەبدا زۆر دیوە، ڕەشتاڵە بوون، بەڵام نەك بەم جوانی و ئاووتاو و خوێدارییە کە دلبەرم هەیتی. گوایە دەڵێن لەیلا ڕەشتاڵە بووە:

«یقولون لیلی سودة حبشیةٌ فلولا سواد المسك ماکان غالیا»!

دیدم (غ): هرگز. (دیدم سیاه چرده، ندیدم) لای "حافظ" (هرگز سیاه چرده ندیدم)ە.

(٢) عاریض: ڕوخسار. مانند: وەك. تابد: دەدرەوشێتەوە.

واتە: تەنها زەوی لە ڕووناکیی ڕوومەتی تۆ ڕۆشن نەبووەتەوە، بەڵکوو لە ئاسمانیشدا وەك هەتاو دەدرەوشێتەوە و ڕووناکی دەکاتەوە.

نەدی (کم، گم): نەدا.

(٣) لەم بەیتەوە تا دوایی ئەم پارچە شیعرە لە (کم)دا نییە، ئەم بەیتە لە (گم)دا پێنجەمە.

واتە: خەڵکی چین، بەرامبەر بە جوانیی تۆ، هەرچی نەخش و نیگاری یانەکانی چین هەیە، هەمووی دەکوژێننەوە و لەبەر ڕووی تۆدا نەخشی لێ دەکێشن.

(نقش و) لای "حافظ" (نقش)ە.

(٤) پودەر: باوك. پوسەر: کوڕ. نپرداختی: فریا نەدەکەوت.

هەم شەمعی شەرعی تۆیە، دەکا مەنعی گومڕەهی
«هم روشن از جمال تو در دیده مردمك» (٥)
جانهای پاك، سوجدەكونان، دێنە دەرگەهت
«وان گاه خاك پای تو بوسند یك به یك» (٦)
کافر لە مەنعی "سالم" ئەگەر دەم بدا، چ غەم؟
«زر خالص است، باك نمیدارد از محكّ» (٧)

واتە: ڕۆژێ کە ئادەمی باوك دروست کرا، گەر لەباتیی ئادەم نەوەی ئادەم بووایە، کە تۆی شۆخی، فریشتە لەبەر جوانیت فریا نەدەکەوت کڕنووش بەرێ، سەری لێ تێكدەچوو.

ڕۆژی ئەزەل .. تاد (حا): ڕۆژی ئەزەل لە جایی پسەر، ئەو پودەر دەبوو. (غ): روزی .. . (ه، گم): روز ازل ز جای پدر گر پسر بدی. بەیتەکە، بەم حیسابە، مولەممەع نابێ و هەمووی دەبێتە فارسی. دەبوو (غ): بووی.

(٥) ئەم بەیتە لە (گم)دا نییە.

واتە: هەم ڕووناکیی ئاینی تۆیە ناهێڵێ عاشقان سەرلێشێواو بن و ڕێ ون بکەن، هەم گلێنە لە ڕووناکیی جوانیی تۆوە لە چاودا ماوەتەوە و کوێر نەبووە.

(جمال) لای "حافظ" (دو لعل)ە.

(٦) جانها: گیانەکان. سجدەکنان: سوجدەکونان، کڕنووشبەرانە. وآن گاه: ئەو وەختە. بوسند: ماچ دەکەن.

واتە: گیانە پاکەکان بە کوڕنووشەوە دێنە دەرگات، ئەو کاتە یەك بە یەك خاکی بەرپێی تۆ ماچ دەکەن.

شێوەی فارسی ئەوەندە کاری لە "سالم" کردووە، نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە، کە لای خۆی کوردییە، تەنها (دێن)ەکەی کوردییە!

(٧) واتە: ئەگەر ڕەقیبی بێدین چەنەبازی بکا و بکەوێتە سەرزەنشتم، هیچ باکم لە خۆشەویستی نییە. من زێڕی پاکم، لە مەحەك ناترسم، هەر بە پاکی و بە عاشقی دەمێنمەوە.

غەم (ه): باك. از (گم): ئەر. هەڵەی چاپە. (دەم) لە (ج)دا کەوتووە.

## پیتی (گ)

-١- (*)

**هاته پرووی دڵ له غه‌مزه به‌سكی خه‌ده‌نگ**
**خانه‌یی خارپۆشته، سینه‌یی ته‌نگ (١)**
**جێی دڵم زوڵفی تۆیه تا ده‌مرم**
**كه‌ی نه‌جاتی ده‌بێ ئه‌سیری فه‌ڕه‌نگ؟! (٢)**
**ڕه‌غبه‌تت واجیب و حه‌ذه‌ر لازم**
**له له‌بت شه‌ككه‌ر و له دیده شڕه‌نگ (٣)**
**تۆ حه‌یاتی منت به دیده بڕی،**
**تۆ به ئاهوو ده‌كه‌ی شكاری پوڵه‌نگ (٤)**

(*) ئه‌م پارچه‌شیعره له (مان، عا، ف، غ، ج، ق، ڕ، كم، گم)دا هه‌یه و ناسناوی سالمی تێدا نییه. به‌ڵام به‌وه‌دا كه له نوسخه‌ی (مان)دا هه‌یه، هی "سالم"ه.

كێشی عه‌رووز: خه‌فیفی شه‌شی مه‌خبوونی مه‌قسوور.

(١) خارپوشت: ژیشك، كه ده‌ره‌وه‌ی له‌شی هه‌موو دڕكه.

واته: ئه‌وه‌نده تیر له غه‌مزه‌ی یاره‌وه گیراوه‌ته دڵ، سینه‌ی ته‌نگم وا پڕ دڕكه، ده‌ڵێی خانه‌ی ژیشكه.

به‌سكی (ڕ): له‌كه‌ی. خارپوشته (كم): خارپوشت.

(٢) واته: تا ده‌مرم شوێنی دڵم زوڵفی پێچپێچته و ڕه‌هاییم نابێ. دیاره دیلی ده‌ستی فه‌ڕه‌نگ كه‌ی ڕزگار ده‌بێ!

(٣) شڕه‌نگ: ژه‌هر.

واته: خۆشویستنت پێویسته و خۆلێپاراستنیشت پێویست، چونكه ماچی لێوت شه‌كری شیرین و به‌تامه و نیگای چاویشت ژه‌هره بۆ عاشق.

واجیب (ف، ق): واجیبه. له دیده شڕه‌نگ (ج): له ده‌یده سڕه‌نگ. هه‌ڵه‌ی نووسینه. (كم، گم): له دیده‌ت ڕه‌نگ. هه‌ڵه‌یه.

(٤) واته: تۆ ژیانی منت به چاو له‌ناوبرد. به‌ڵێ، تۆ به ئاسك – یانێ چاو– ڕاوی پڵنگ– یانێ

**به مه‌ثه‌ل به‌حره عیشق و دڵ زه‌وره‌ق**
**ئامه‌دوشودیه غه‌م به میثلی نه‌هه‌نگ (٥)**
**بێسه‌ره کارْوان و شه‌و تاریك**
**ڕێ خه‌طه‌رناك و دوور و مه‌رکه‌ب له‌نگ (٦)**

عاشق– ده‌که‌ی.

حه‌یاتی (عا): جانی.

(٥) ئه‌م به‌یته له‌ (عا)دا نییه‌.

ئامه‌دوشود: هاتوچۆ.

واته‌: عیشق ده‌ریایه و دڵ که‌شتیی بچکۆله‌یه‌، خه‌م وه‌ك نه‌هه‌نگ له‌م ده‌ریایه‌دا هاتوچۆیه‌تی، ئیتر چۆن ڕزگار ده‌بم؟!

به مه‌ثه‌ل (کم): به میثلی. ئامه‌دوشودیه غه‌م به (ف، ج): ئامه‌دوشودیه دڵ به‌. (کم، گم): ئامه‌دوشود به دڵ. هه‌ڵه‌ی چاپ یا هه‌ڵه‌ی خوێندنه‌وه‌ی ده‌ستنووسه‌.

(٦) ئه‌م به‌یته هه‌ر له‌ (کم، گم)دا هه‌یه‌.

واته‌: بارودۆخێکی زۆر ناله‌باره و ڕزگاربوون زۆر گرانه‌، چونکه کاروان بێپێشه‌نگ و بێسه‌روبه‌ره‌، شه‌و تاریك و نوته‌ك و ڕێ دوور و پڕمه‌ترسی، که‌شتییش له‌نگ و بێله‌نگه‌ر.

بێسه‌ره (کم): پێشره‌. (ف، ج، ڕ): پێشڕه‌وی. (غ، گم) پێشڕه‌و. هیچ‌کامیان ته‌واو نین، ئه‌وه‌ی له ده‌قه‌که‌دا دانراوه ته‌واوتره‌. شه‌و (ف، غ، ج): ڕه‌ه‌. (ڕ): دره (ده‌ره‌). ڕێ (ف، ج): ڕه‌ه‌.

## پیتی (ل)

-١- (*)

خستیە چەه تا ڕۆستەمی بەختم، نەدامەت وەك شوغاڵ
بەهمەنی غەم عەیشمی تێك دا وەکوو ئەیوانی زاڵ (١)
ڕۆژی ڕۆشن کەی دەبینم، تا موقابیل تۆ نەبم؟
مەردومەك کوانێ لە چاوما، لابدەی گەر عەکسی خاڵ؟ (٢)
بێتە سەر دامانی نازت، تا سەری ڕەشماری زوڵف
بۆ نیازم کەی بە دامانت دەگا، دەستی خەیاڵ؟! (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەقسوور.

(١) چەه: چاڵ. نەدامەت: نەگبەتی، نەهاتی. شوغاڵ: چەقەڵ. بەهمەن: ئەردەشێری کوڕی ئەسفەندیار، کە بەهۆی کوژرانی باوکیەوە، ڕقی لە بنەماڵەی ڕۆستەم هەڵگرت و فەرامورزی کوڕیی شکاند و بە داریدا کرد. ئەیوان: هەیوان. زاڵ: باوکی ڕۆستەمی پاڵەوان.

واتە: کە چەقەڵی نەهاتی و نەگبەتی ڕۆستەمی بەختمی خستە چاڵ، بەهمەنی خەم و پەژارە ژیانی شێواندم، وەك چۆن بەهمەنی کوڕی ئەسفەندیار هەیوانی زاڵی تێکوپێك دا.

عەیشمی تێك دا وەکوو (کم): عەیشی تێك دا هەروەکو. (ق): عەیشمی تێك داوە وەکو. (گم): عەرشی تێك دا هەروەکو.

(٢) مەردومەك: گلێنەی چاو.

واتە: تا بەرامبەر بە تۆ نەبم و تەماشای ڕوومەتت نەکەم، کەی ڕۆژی ڕووناك دەبینم؟ یانێ ڕوومەتی تۆ ڕۆژی ڕووناکە. هەروەها چاوم بێگلێنەیە، ئەگەر ڕەنگدانەوەی خاڵی ڕوومەتی تۆ نەبێ. چ ڕۆژی ڕووناك و چ گلێنەی چاوی سالم، هەردووکیان بە بینین و بەرامبەربوون لەگەڵ ڕوخساری یار دەس دەکەون.

تۆ (حا): ڕووت. لابدەی گەر (ق): گەر بەدەرکەی.

(٣) واتە: کە سەری ڕەشماری زوڵفت ئەوەندە شۆڕ بێ بگاتە سەر داوێنی نازت، ئیتر چۆن دەستی

**بانی سەر فەرشی ڕەهت بوو، چونکە پاشێلت نەکرد،**

**ئەشکی حەسرەت دێ بە ڕووما وەك تکەی وێرانەماڵ (٤)**

**لافی چی لێدەم لە هەمڕەنگیی لەب و پوستانی تۆ؟**

**وا نە نارم دی لە بوستانا، نەوا گوڵناری ئاڵ! (٥)**

**ماه ئەگەر وەك تۆ جەمالی بێ، لە کوێ بێنێ قەدت؟**

**سەرو ئەگەر وەك تۆ سەهیقەد بێ، لە کوێ بێنێ جەمال؟ (٦)**

**تا لە دڵما بێ خەیاڵی وەحشی تۆ، دەگرم نەفەس**

**نەك بە سروەی بای هەناسەم ڕەم بکا میثلی غەزال (٧)**

خەیاڵ بۆ پاڕانەوە و داوای نیاز دەگاتە داوێنت لە ترسی مار؟!

ڕەشماری. (کم): ڕەژماری.

(٤) واتە: بانی سەرم فەرشی ڕێگەت بوو، بەڵام تۆ نەتکوتایەوە و بە پێ نەتشێلا، لەبەرئەوە فرمێسکی خەم و پەژارە وەك دڵۆپەی وێرانەخانووی قوڕین بە ڕوومدا دێ. سالم سەری خۆی شوبهاندووە بە بانی خانووی قوڕین لە کوێستانەکاندا، کە ئەگەر زستان بە بانگردێن نەکوترێتەوە، دڵۆپە دەکا. ئەم دەبێ یار بە پێ بیشێلێ تا فرمێسك نەڕێژێ. ئەوا یار نەیکرد، بۆیە فرمێسکی چاوی وەك دڵۆپە دێتە خوار.

پاشێلت (کم، گم): پاشکێت. هەڵەیە. دێ بە ڕووما (کم، گم): دێتە سەر ڕووم.

(٥) وا: وەها. پوستان: مەمك. نار: هەنار. نە وا: نە وەها.

واتە: گەزافی هاوچەشنیی لێوی تۆ و مەمکی خڕت چۆن بدەم و بڵێم: وێنەیان هەیە؟! نە هەنارم وەك مەمکی تۆ لە باخدا دیوە، نە وەك لێوی ئاڵت گوڵنار.

لێدەم (کم، گم): لێدەن. زۆر جوانە، یانێ: هەنار و گوڵنار چۆن گەزافی هاوچەشنیی تۆ لێ دەدەن؟ تۆ (ق): یار. وا نە نارم دی (گم): دانە نارم دی. ئاڵ (ق): نار.

(٦) ماه: مانگ. سەهیقەد: باڵای ڕێك.

واتە: ئەگەر مانگ وەك ڕوخسارت جوان بێ، باڵای وەك باڵای تۆ لە کوێ بێنێ؟ ئەگەر قەد و باڵای وەك باڵای تۆ بەرز و ڕێك بێ، جوانی لە کوێ بێنێ؟

سەهیقەد بێ (ق): سەهیقەدە.

(٧) سالم یاری بە ئاسکی کێوی شوبهاندووە، کە سڵ لە هەموو شتێك دەکاتەوە، وتوویە: ئەگەر تەنانەت خەیاڵیشی بێتە دڵمەوە، ناتوانم هەناسە بدەم، نەبادا خەیاڵەکەی بە سروەی هەناسەم بسڵەمێتەوە و هەڵبێ!

**ظوڵمی بێپایانی تۆ، تا بێ بە دڵ لەذذەت دەدا**
**یا ئیلاهی! قەت نەبێ بۆ ظاڵمی "سالم" زەواڵ (٨)**

بە سروەی (ق): لە سروەی. بکا (حا، کم، گم): بکەی.

(٨) ئەم بەیتە لە (ق)دا نییە.

واتە: ستەمی لەڕادەبەدەری تۆ، تا بێ خۆشی بە دڵم دەگەیێنێ و لەزەتی زۆرتر دەبێ. خودایە! هەرگیز ئەم ستەمی سالمە زەواڵی نەبێ و هەر بمێنێ!

لەذذەت (حا): لەززەت.

### ٢- (*)

**لە قیبلەی ڕوو، بڕۆت میحرابە بۆ دڵ**
**بە لەب، قوبلەت وەکوو جوللابە بۆ دڵ (١)**
**شەوی دەی، بێ چرا، پڕ نوورە کولبەم**
**خەیاڵی عاریضت مەهتابە بۆ دڵ (٢)**
**ئەلەم ئاسایشی ئەربابی عیشقە**
**هەموو خاری جەفا سەنجابە بۆ دڵ (٣)**
**قەنارە حاضرە هەر سوو لە موژگان**
**لە چاوتا مەردومەك قەصصابە بۆ دڵ (٤)**
**لە جەورت، وەك سەمەك، گەر بچمە دەریا**
**موژەت بەرگەشتە، وەك قوللابە بۆ دڵ (٥)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، غ، ق)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەحزووف.

(١) قوبلە: ماچ. جوللاب: شەکر یا هەنگوین کە بە گوڵاو بگیرێتەوە، گوڵاوی شیرین.

واتە: ڕووت تێکڕا قیبلەیە و بڕۆت میحرابی دڵە، ماچی لێوت گوڵاوی شیرینە بۆ دڵ.

ڕوو، بڕۆت (عا، غ): ڕووبەڕووت، واتە: بەرامبەر. (ق): ڕوو بڕۆ.

(٢) دەی: یەکەم مانگی زستانە، کە ساردە و دەر و پەنجەرە دەگیرێ و تاریك دەبێ.

هەر چۆن بێ، واتە: کە مادەم خەیاڵی ڕوخسارت مانگەشەوی دڵە، شەوی یەکەم مانگی زستان کەلاوەکەم بەبێ چرایش پڕ لە ڕووناکییە.

شەوی دەی بێچرا پڕ نوورە (ق): شەوی بێچارەیی پڕ نوور.

(٣) سنجاب: سمۆرە، لێرەدا مەبەست کەوڵەکەیەتی کە نەرم و نیانە.

واتە: ئازار، ئاسایش و خۆشیە بۆ عاشقان و دڕکی ستەمیان لا وەك پێستی سمۆرەیە کە ئازار ناگەیێنێ.

(٤) واتە: برژانگەکانت لە هەموو لایەکەوە قەنارەی جەستەهەڵواسینن، گلێنەی چاویشت قەسابی دڵە.

قەنارە (غ): قەنارەی.

(٥) واتە: ئەگەر لە ترسی ستەمت وەك ماسی بچمە نێو دەریایش، برژانگی هەڵگەڕاوەت قولاپە بۆ دڵ و لە دەریا دەرمدەهێنێ.

**له حەسرەت، هاتە لەغزش قەلبی "سالم"**
**خەیاڵت مەعدەنی سیمابە بۆ دڵ (٦)**

له جەورت ... تاد (عا، غ): سەمەك بم گەر لە جەورت بچمە دەریا.

(٦) لەغزش: لەرزە. سیماب: جیوە.

واتە: دڵم لە خەفەت و پەژارەی دووریت هاتە لەرزین. بەڵێ، خەیاڵی تۆ و بیرلێکردنەوەت جیوەیە بۆ دڵ و دەیهێنێتە جمەوجووڵ و بێئارامی دەکا.

له حەسرەت (عا، غ): بە میحنەت.

-٣- (*)

طوولی هەیە، بەیانی قصەی فیکری خامی دڵ
هەر وەصفی زوڵفی یارە، سەراسەر کەلامی دڵ! (١)
سامانی کاری طالیبی وەك زوڵفی خۆی دەوێ
بێنەظمییە لە مەذهەبی یارا، نیظامی دڵ! (٢)
خوێنی حەریرڕەنگی دڵم هاتە ڕوو لە چاو
نەمگرتە بەر حەریرقەبایێ بە کامی دڵ!! (٣)
"جەم" لەذذەتی خوماری وەکوو من نەدی، ئەبەد
نۆشیومە تا شەرابی مەحەببەت بە جامی دڵ (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ق)دا هەیە.

کێشی عەرووز: موزاریعی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

(١) واتە: قسەی بیری خاو و کاڵی دڵ درێژە، چونکە قسەی دڵ بەردەوام وەسفی زوڵفە، درێژیی زوڵفیش دوایی نایێ.

قصەی فیکری (ق): قصە و فیکری. وەصفی (ق): بەحثی.

(٢) واتە: یار دەیەوێ کاری عیشق وەك زوڵفی خۆی پەرێشان بێ. ئاڵۆزی و بێسەروبەری و ناڕێکوپێکیی دڵ لە بیروباوەڕی یاردا، هەر نیزام و ڕێکوپێکیی خۆیەتی.

(٣) نەمگرتە بەر: نەمکردە بەر.

واتە: هەرچی خوێنی ئاوریشمڕەنگی دڵم هەیە، لە چاومەوە هاتە سەر ڕوخسار. کەچی جارێ کەوایەکی ئاوریشمی بە ئارەزووی دڵی لەبەر نەکردا!

نەمگرتە (ق): نەمکردە.

(٤) ئەم بەیتە لە (ق)دا شەشەمە.

واتە: من شەرابی خۆشەویستیم بە جامی دڵ خواردووەتەوە و بە ڕاستی خواردوومەتەوە. جەمشید هەرگیز لەزەتی لە مەستی نەدی، وەك من دیم.

جەم لەذذەتی خوماری وەکوو من نەدی ئەبەد (ق): هیچ ئەحەدێ لەذەتی خوماری وەکو من نەدی.

دڵ غەرقی نووری ڕووتە لە دەیجووری زوڵـفْتا
نابێ طـولووعی صوبحی سەعادەت لە شامی دڵ (٥)
دڵ بێخودە لە دیدەت و دیدەت خەرابی مەی
مەی چاکی سەند لە دیدەیی تۆ، ئینتیقامی دڵ (٦)
دڵ باعیثە کە ڕامە بە "سالم" دڵی حەبیب
یا ڕەب! بدەی لە دەوری جیهانا دەوامی دڵ (٧)

(٥) واتە: دڵ نوقمی ڕووناکی ڕوخسارتە، بەڵام لـە تاریکـستانی زولفتـدا گـیری خـواردووە. زۆر گرانە شەوی دڵ ڕۆژی بەختیاریی لێ بێتەوە.

طولووعی صوبحی سەعادەت لە شامی (ق): بەبێ طولووعی سەعادەت بە شامی.

(٦) واتە: دڵ لەدەست مەستیی چاوت بێهۆشە، چاوی تۆیش مەست و شـێواوی مەیـە و چـاك تۆڵەی دڵی منی لە دیدەت کردەوە.

دیدەت و (ق): دیدەیی تۆ. خەرابی (ق): خوماری.

(٧) واتە: دڵ مایەی ئەوەیە کە دڵی دۆست لەگەڵ دڵی "سالم" و ڕام بێ و بـسازێ. بـەڵێ، دڵ دەردی دڵ دەزانێ. خودایە! درێژە بە ژیانی دڵ بدەی و لە ڕووی جیهاندا بیهێڵی.

# پیتی (م)

## -١- (*)

دەمەوێ مەستی بادە بم، تا بم
پایی خوم ئووفتادە بم، تا بم (١)
هەر سەحەرگەهە بە دەنگی نەی هەڵسم
بادەوەرگر لە سادە بم، تا بم (٢)
تۆ کە شاهی بە ڕوخ لەبەر ئەسپت
فەرضە بۆ من پـێیادە بم، تا بم (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، ھ، ف، ق، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: خەفیفی شەشی مەخبوونی ئەصڵەم.

(١) بادە: مەی. پای: پێی، لە بەردەم. خوم: کووپەی شەراب. ئووفتادە: کەوتوو.

واتە: دەمەوێ تا ماوم مەستی مەی بم و لە بەردەم کووپەی شەرابدا کەوتوو بم.

دەمەوێ (کم): ئەمەوێ. خوم (ق، ڕ): خەم. ئووفتادە (گم): ئیفتادە. نیوەی دووەمی ئەم بەیتە و نیوەی دووەمی بەیتی دوایی لە (ھ)دا پاش و پێشن.

(٢) ئەم بەیتە لە (ق)دا نییە.

واتە: دەمەوێ تا ماوم هەموو بەرەبەیانێك بە دەنگی شمشاڵ خەبەرم ببێتەوە و شەراب لـە دەسـتی سادەڕوو وەربگرم!

سەحەرگەهە (کم): سـەحەرگاهـ. دەنگی (کم، گم): بانگی. هەڵسم (کم): هەڵسـەم. هەڵەی چاپە. وەرگر (کم): گرِدەر!

(٣) ئەم بەیتە لە (ھ)دا نییە.

شاھ: پادشاھ. ڕوخ: قەڵا. پیادە: جوندی. ئەمانە ناوی هەندێ لە داشـەکانی شەترەنجن.

واتە: کە تۆ شای خاوەنقەڵا بی و لە بەردەم ئەسپەکەتدا ڕاوەستابی، ئیتر من پێویستە لەسەرم پیادە بم؛ یان قەڵا هیی تۆیە و ئەسپ هیی تۆیە و خۆت شای، منیش تەنها پیادەیـم بۆ دەمێنێتەوە.

سوویی (ھ، کم): دەمی.

**حاجیب ئەر ڕێ بدا، دڵم دێنێ**
**سوویی دەر ئێستادە بم، تا بم (٤)**
**حەق لە دڵ دەرنەکا خەیاڵی مەحاڵ**
**هەر لەسەر ئەم ئیرادە بم، تا بم (٥)**
**بۆ شکارت منم سەگی عاریف**
**بێڵە با بێ قەلادە بم، تا بم (٦)**
**حەق بدا فرصەتم بە ئیذنی عومەر**
**دوشمنی شیعەزادە بم، تا بم (٧)**
**دەمەوێ بۆ نیشانەیی تیرت**
**دڵی "سالم" نیهادە بم، تا بم (٨)**

(٤) ئەم بەیتە لە (ف)دا پێنجەم و لە (ڕ)یشدا شەشەمە.
واتە: ئەگەر دەرگاوان ڕێ بدا، دڵم پێوەیە لە بەردەرگادا ڕابوەستم.
حاجیب (عا): حاجیبە. لەنگە. ڕێ بدا (ق): ڕێم بدا. دەر (عا): دڵ.
(٥) ئەم بەیتە لە (ف)دا شەشەم و لە (ڕ)یشدا حەوتەمە.
واتە: ئەگەر خودا خەیاڵی مەحاڵی گەیشتن بە یار لە دڵم دەرنەکا، دەمەوێ تا ماوم لەسەر ئەم خواستە بم و هەمیشە بەتەما بم بە یار بگەم.
دەرنەکا (عا): درکن. مەحاڵ (کم): محل.
(٦) ئەم بەیتە لە (ف)دا چوارەم و لە (ڕ)یشدا پێنجەمە.
قەلادە: گەردنبەند، لێرەدا مەبەست (ڕست)ە کە لە ملی سەگ و تانجی دەکرێ.
واتە: منم سەگی شارەزا بۆ کاری شکاری تۆ کە بەدوای نێچیردا بگەڕێم و بیدۆزمەوە. یانێ بێڵە با بێ ڕست و گەردنئازاد بم و بە سەربەستی بجووڵێم. من هیی ئەوە نیم لە دەستت ڕابکەم.
(٧) ئەم بەیتە لە (هـ، ف، ق، کم، گم)دا نیە و لە (ڕ)یشدا چوارەمە.
واتە: ئەگەر خودا ماوەم بدا، دەمەوێ تا ماوم بە ئیزنی حەزرەتی عومەر دوژمنی شیعەزادە بم.
فرصەتم (عا): فرسەتم. شیعەزادە (عا): شاهزادە. هیچ پێوەندییەکی لەگەڵ عومەر نابێ.
(٨) واتە: دەمەوێ تا ماوم دڵی ساغ و سەلامەتم بنێمەوە بە نیشانە بۆ تیری چاوت.
شایانی باسە، هەموو (تا بم)ەکان لە (هـ، کم، گم)دا (دایم)ن.

-٢- (*)

**لە مەحشەردا، ئەگەر بێ ڕوویی تۆ، مایل بە جەننەت بم**

**لە لای یارانی صاحیبدڵ سەرئەفگەندە و خەجاڵەت بم (١)**

**قیامەتقامەتم ڕۆژی قیامەت دەرکەوێ هەر سوو،**

**نەکەم گەر سوجدەیی میحرابی ئەبرۆی ئەو، بە لەعنەت بم (٢)**

**شنۆی ئوردیبیهیشتی وەصڵی یار، ئەر بێ بەسەر مندا**

**لە لام (قەندیل) و (لاجان)ە، بە هاوین گەر لە (مەسقەت) بم (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، ف، غ، ج، ق، کم، نم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) سەرئەفگەندە: لەبەر کێش بە (سەرەفگەندە) دەخوێنرێتەوە، یانێ سەرشۆڕ.

واتە: ئەگەر بێ ئەوەی تۆم لەگەڵ بی، حەز بکەم لە ڕۆژی قیامەتدا بچمە بەهەشت، لای هەموو دۆست و برادەرێکی قەدریدڵزانیو شەرمەزار و سەرشۆڕ بم.

(بێ) لە (ج)دا کەوتووە. صاحیبدڵ (عا، ف، ج): ئەهلی دڵ. سەرئەفگەندە و (کم، نم، گم): سەر ئەفگەندەی. (صاحێب)، لەبەر کورتیی کێش بە (صاحیب) دەخوێنرێتەوە.

(٢) ئەم بەیتە و سێ بەیتی پاشەوەی لە (غ)دا نین.

قیامەتقامەت: ئەو یارەی کە باڵای قیامەتی منە. هەر سوو: لە هەر لایێ.

واتە: یاری باڵابەرزم کە دەرکەوتنی باڵای بۆ من وەك بەرپابوونی ڕۆژی قیامەت وایە، ئەگەر ڕۆژی قیامەت لە هەر لایەکەوە دەرکەوێ بۆم، بە نەفرەت بم ئەگەر کوڕنووش بۆ برۆی شێوەمیحرابی نەبەم! یانێ لەو ڕۆژە تەنگانەیەیشدا، هەر بە مەرجێ دەرکەوێ، کوڕنووشی بۆ دەبەم!!

قیامەتقامەتم ڕۆژی قیامەت دەرکەوێ هەر سوو (ق): قیامەت گومناوی قامەتی من بێ ئەووەڵ دەفعە. سوجدەیی (کم، نم، گم): سوجدە بۆ.

(٣) ئوردیبیهیشت: مانگی دووەمی بەهار، بانەمەڕ. مسقەت= مسقط: پایتەختی ئەمڕۆی عومان. قەندیل: شاخێکی بەرزی سەر سنووری نێوان کوردستانی عیراق و ئێرانە لە ناوچەی پشدەر. لاجان: ناوچەیەکی کوێستانییە لە کوردستانی ئێران. هەردوو شوێنەکە ساردن.

سالم دەڵێ: من کە شنەی گەیشتن بە یار -کە وەك هەوای دووەم مانگی بەهار خۆشە- بەسەرمدا بێ، ئەگەر لە شاری (مەسقەت)یش بم -کە زۆر گەرمە- وەك ئەوەیە لە کوێستانی قەندیل و لاجان بم.

**غەمم دەریا، دڵم زەورەق، منم تاجیر، وەصڵ بەندەر**
**دەبێ یا تەرکی بەندەر کەم، وەیا نەزدیکی ئافەت بم! (٤)**
**لە وەختی پاسەبانیتا، من و نامەحرەمی دوورین**
**لە خەودا بۆسە نەزدیکە، ئەگەر جۆیایی فورصەت بم (٥)**
**لە کوشتنما ئەگەر ڕەحمت نەبێ، مایەی تەڕەححومتە**
**لە سایەی زەخمی تیغت، بێڵە با ئەهلی شەهادەت بم (٦)**
**کە تیری غەمزە دڵ کون کا، دوصەف تێکەڵ دەبن موژگان**
**لە من قاتیل دەبێ ون بێ، ئەگەر صاحیبکەرامەت بم (٧)**

بەسەر مندا (عا): لە بەسەر مندا. هەڵەیە. مەسقەت (عا): مەتقەت. هەڵەیە.

(٤) ئەم بەیتە لە (کم، نم، گم)دا شەشەم و لە (ق)دا پێنجەمە و لە (حا)یشدا نییە.

واتە: من بازرگانم، کەلوپەلم پێیە؛ خەمم دەریایە، دڵ کەشتییە، گەیشتن بە یار جێلەنگەری کەشتیی دڵە. وام لەنێوان دوو ئاگردا، یا بچمە بەندەری گەیشتن بە یار و سەر و ماڵم بە فەتارەت بچێ و نزیکی بەڵا بم، یان دەبێ هەمیشە لە یار دوور بم. دیارە بەندەری ئەو سەردەمانە بۆ بازرگانی پڕ مەترسی بووە، بۆیە سالم گەیشتن بە یاری پێ شوبهاندووە.

منم (ج): من. نەزدیکی ئافەت (ف، ج): نەزدیك بە ئافەت.

(٥) ئەم بەیتە لە (ق)دا چوارەمە.

واتە: کە بەخەبەر بم و پاسەوانی جوانیت بم، من و کاری نامەحرەمانە لە یەکەوە دوور دەبین و ناتوانم ماچت بکەم. بەڵام کە لە خەودا بم، ئەگەر بە خەوبینینیش بەدوای هەلدا بگەڕێم، ماچت نزیکە.

من و نامەحرەمی دوورین (عا): من نامەحرەمی دوورین. لەنگە. (ف): مەنوو تا مەحرەمی دووریم (ج): منم نامەحرەمی دووریم. (کم، نم، گم): من و نامەحرەمی دوورن.

(٦) واتە: تۆ ئەگەر بەزەییت پێمدا نەیێتەوە و بێڕەحمانە بمکوژی، ئەوە عەینی بەزەییە، دەستت خۆش. بێڵە با لە سێبەری زامی تیغی عیشقی تۆدا بە شەهیدی بمرم!

لە کوشتنما (گم): لە کوژتنما. ڕەحمت (ف): زەحمەت. زەخمی (کم، گم): زامی. تیغت (حا، ف): تیرت. با (ق): تا.

(٧) ئەم بەیتە لە (ف، ج)دا نییە.

واتە: کە تیری برژانگت دڵ کون دەکا و دەمکوژێ، دوو ڕیزی تیری برژانگ تێکەڵ بە یەك دەبن، ئەگەر خاوەن کەشف و کەرامەتیش بم، بکوژم لێ ون دەبێ و نازانم کام تیرەی برژانگت کوشتمی؟!

**تەمەننای مەرحەمەت "سالم!" لە دڵبەر قەد نەکەی، ئامان!**
**لەگەڵ من ئیلتیفاتی با نەبێ، نەك فێری عادەت بم (٨)**

دوصەف (کم، نم، گم): صەفی. (ئەگەر) لەوانەیە ڕاستەکەی (مەگەر) بێ.

(٨) واتە: ئامان، سەد ئامان سالم! هەرگیز داوای بەزەیی لە یار نەکەی، با مەیل و مەرحەمەتی لەگەڵ من نەبێ. نەوەك چاوەڕوانی‌کردنی بەزەیی ببێ بە خووم، پاشان بۆم تەرك نەکرێ و تووشی دەردەسەری ببم.

قەد (حا، کم، نم، گم): قەت. لەگەڵ من (کم، گم): لەگەڵما. وشەی (من) لە (عا)دا کەوتووە.

-٣- (*)

**طەریقی عیشقت ئەر ون کەم، تەریقی دەشتی مەحشەر بم**

**قیامەت، نامەویٚ جەننەت، بەبێ تۆ، گەر موخەییەر بم (١)**

**هەناسەی سەردی پڕسۆزم، بە یادت، گەر لە دەم ببڕێ**

**لە سۆزی فیرقەتا، یا ڕەب! سەراپا میثلی ئەخگەر بم (٢)**

**کە شەیطانیش ستێزەم دا، خەیاڵی دانە قەت ناکەم**

**لەتاو دەردی جەفا، ئەم دەفعەیە لەم داوە گەر بەر بم (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، غ، ج، ق، کم، گم)دا هەیە. بەپێی (دیوانی کوردی، بەرگی یەکەم، ل٢٩٤، ٣٠١)، سالم ئەم شیعرەی لە تارانەوە بۆ "مستەفا بەگی کوردی" نووسیوە، لە وەڵامی نامەیەکی شیعریی ئەودا کە بەمە دەستی پێ کردووە:

ئەگەر مەیلت لە دڵ دەرکەم، غەریبی کۆیی دولبەر بم

وەگەر ساتێ لە یادم چی، هیلاکی ژەهری ئەژدەر بم

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) طەریق: ڕێگە. تەریق: سەرشۆڕ و خەجاڵەت، شەرمەزار.

واتە: ئەگەر ڕێگەی ئەڤینت ون بکەم و واز لە خۆشویستنت بێنم، ڕووزەردی ڕۆژی مەحشەر بم. هەروەها ئەگەر خۆم سەرپشك بم، لە ڕۆژی قیامەتدا بەبێ تۆ بەهەشتم ناوێ.

تەریقی (مان): طەریقی. دیارە هەڵەیە. (ق): ذەلیلی. نامەوێ (گم): ناوێ. هەڵەی چاپە.

(٢) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (مان، ق)دا نین.

ئەخگەر: پشکۆ.

واتە: ئەگەر کاتی یادکرنەوەت هەناسەی ساردی پڕ شۆڕم لە دەم ببڕێ، خودایە بەهۆی گڕی جیاییەوە سەرتاپام وەك گڕی ئاگر و پشکۆ بێ.

پڕ سۆزم (غ): دڵسۆزم.

(٣) ستێزە: هەڵخڕاندن و هاندان. دانە: خاڵی ڕوومەتی یار. لەتاو: لە ترس.

واتە: ئەگەر ئەمجارە لە داوی زوڵفی یار بەربووم، پەیمان بێ لە ترسی دەردی ستەم جارێکیتر، ئەگەر شەیتانیش لەخشتەم ببا، هەرگیز بیر لە دانەی خاڵی ڕوخساری یار نەکەمەوە و تووشی ئەم داوە نەبمەوە.

قەت (عا، غ، ج): قەد. لەتاو دەردی جەفا (عا): لەناو دەردی جەفا. (کم): لەناو دەرد و جەفا. (ئم، گم): لەناو دەرد وجەفا. لەم داوە گەر بەر بم (غ): لەم دامە گەر بەر بم. (ج): دامە کەر ببرم. هەڵەیە.

به پایین هات شەوی هیجر و نەسیمی صوبحی وەصڵ ئەنگووت
بەرمدە، ئەی تەبی غەم، وا بەیانە، با سەبوکتەر بم (٤)
بە یادی بۆسەیی لەعلی لەبت ئەزبەسکی لەبخوشکم
ئەبەد تیشنەم، ئەگەر -فەرضەن- لە گۆشەی حەوضی کەوثەر بم (٥)
تەمامە خۆم وەها گوم کەم بە ناکامی لەدەست جەورت
هەتا دەمرم بە نایابی وەکوو گۆگردی ئەحمەر بم (٦)
ڕەهی کۆی دڵبەرم دوورە، بە "سالم" ناگەمە مەقصەد
لە پەروازی طەڵەبدا، گەر بە توندی وەك کەبووتەر بم (٧)

(٤) ئەم بەیتە لە (عا)دا نییە و لە (ق)دا دووەمە.

تەب: تا. سەبوکتەر: سووکتر.

واتە: شەوی دووری دوایی هات و سروەی بەیانی هەڵیکرد. ئەی تای خەم! وا بەیانییە، بەرم دە، با نەختێ گیانم سووکتر بێ.

بە پایین (ق): بە پایان. (م): بە پاییز. هەڵەیە. سەبووکتەر (غ، ج): سەبووکسەر. یانێ سەرسووك و بێسەرئێشە، دروستترە.

(٥) واتە: لە یادکرنەوەی ماچی لێوی وەك لەعل ئاڵتدا، لێوم ئەوەندە وشکە، ئەگەر -وای دابنێین- لە قەراغی حەوزی کەوسەریشدا بم، هەر تینوومە.

(٦) گۆگردی ئەحمەر: لە بابەتی جەواهیراتە، وەك ئاگر دەدرەوشێتەوە و پێی دەڵێن (أبو الاجساد) و زۆر نایابە.

واتە: نیازمە بە نامورادی خۆم ون بکەم و لە ستەمت ڕزگار ببم، تا مردنیش وەك گۆگردی سوور دابگیرسێم و بسووتێم.

وەها گوم کەم بە ناکامی (کم، م، گم): وەها ون کەم بە ناکامی. (ق): بە ناکامی وەها دەکەم. لەدەست (ج، کم، م، گم): لە تاو. بە نایابی (کم، م): بە دڵما بی. (گم): لە دڵما بێ.

(٧) کۆ: مەنزڵ، دەوروبەری. پەرواز: فڕین. کەبوتەر: کۆتر.

واتە: ڕێگەی مەنزڵگەی یار دوورە و بە سەلامەتی ناگەمە ئاوات، تەنانەت ئەگەر لە باڵگرتنەوە و توندی و تیژڕۆییدا وەك کۆتریش بم.

توندی (کم): تیژی.

## -٤- (*)

**خەراب بێ خانەیی دڵ، هەر وەکوو خانەی خەراب کردم**
**خوداوەند ئابڕووی دیدەم بەرێ، وەك ئابڕووی بردم (١)**
**هەتا زیندووم دەچێنم توخمی هەر خارێ لە دڵ، بەڵکم**
**کە بێی بۆ سەر مەزارم، دامەنت بگرن ئەگەر مردم (٢)**
**دەبینم مووی موژەی مووریچە، میثلی ذەڕڕەبینمیرئات**
**لە فیکری مووشکافی مووی میانت، وا بە دڵ وردم (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، ف، غ، ج، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) واتە: ماڵی دڵ وێران بێ کە ماڵی وێران کردم، خودا ئابڕووی چاوم بەرێ کە ناوی بە فرمێسك و گریانی زۆر زڕاند و ئابڕووی بردم.

شایانی باسە، ڕستەی ((ئابڕووی بردم)) خاڵی نییە لە جوانی: ئاوی دەموچاویی بردووە. یانێ فرمێسکی نەهێشتووە و چاوی بە گریان وشکاوی هاتووە.

خەراب بێ (گم): خەراپ بێ. خەراب کردم (گم): خەراپ کردم.

(٢) خار: دڕك.

واتە: تا بە سەر زیندووم، تۆوی دڕك لە دڵمدا دەچێنم، بەڵکوو کە مردم دڕك لە خاکی گۆڕەکەم بڕوێ، کە هاتیت بۆ سەردانم داوێنت بگرێ.

توخمی (گم): تۆەی. بەلکم (ق، غ، ج، کم، گم): شایەد، یانێ لەوانەیە. بێی (ف): بێ. دامەنت (ف): دامەنی. بگرن (غ): بگردن. هەڵەی نووسینە.

(٣) مووریچە: مێروولە. ذەڕڕەبینمیرئات: ئاوێنەی زەڕڕەبین کە شتی ورد لە بەرچاو گەورە دەکا. مووشکاف: مووقڵیش. مووی میانت: ناوقەدی باریکی وەك مووت.

واتە: دڵم ئەوەندە وردبینە، بە بیر مووی میانت دەبینم و دەیقڵیشێنم. بەڵێ، وەك ئاوێنەی زەڕڕەبین مووی برژانگی مێروولە دەبینم!

دەبینم (ج): دەبینی. میثلی (عا): هەروەك. میانت (غ): بەیانت. وردم (غ): دوورم. هەڵەیە.

لە ڕاستیدا ئەگەرچی هەردوو نیوەکە وردبینی دەگەیێنن، بەڵام بەراوردکردن لەنێوان مووی ناوقەدی یار و مووی برژانگی مێروولەدا چێژی شیعریی تێدا نییە.

**لە سەرمای قەوسی سەردی میهری تۆدا، وا بەیەك هاتم**
**لە ڕێی چەوگانی میحنەتدا، وەکوو گۆ، دایما گردم (٤)**
**بەبێ سەددی تەنم بۆ دڵ، ڕەهی غەم کوا لەبەر ئەشکم؟**
**هەمیشە بۆ عوبووری قافڵەی جەورت وەکوو پردم (٥)**
**«مە پارس زبانم گفت: سالم، شرح حالت گو»**
**وتم: جانا! بەڵەد نیم ئیصطیلاحی ئێوە، من کوردم (٦)**

دەبینم (کم): دەبینی. بە دڵ (کم، گم): بە دەم!

(٤) قەوس: نۆیەم مانگی ساڵی هەتاوییە (سەرماوەز)، کە وشکەسەرمای پایز -بەتایبەتی- لە کوێستاناندا دەستپێدەکا. میهر: خۆشەویستی. بەیەك هاتم: هاتمە یەك، کرژ بوومەوە. چەوگان: گۆچان.

واتە: وا لە سەرمای بورجی قەوسی بێمەحەببەتیتدا کرژ بوومەتەوە و چوومەتە یەك. لە بەردەمی گۆچانی نەهامەتیدا وەك گۆی یاری گردم و گۆچان یەك لەدوای یەك لێم دەدا.

(٥) فرمێسکی سالم ئەوەندە زۆرە، وەك ڕووبارێکە ڕێی لێپەڕینەوەی نەبێ، وتوویە: بە بێ ئەوەی لەشم بکەمە بەربەست، کوا لەبەر فرمێسکی زۆرم ڕێی هاتوچۆی خەم و پەژارە هەیە؟! من بۆ تێپەڕینی کاروانی ستەمت وەك پردم. سالم، تەنانەت خەم و پەژارەکەیشی خۆش دەوێ و یارمەتیی دەدا، چونکە لە یارەوەیە.

سەددی (عا): تونديی. وەکوو (ف، غ): دەڵێی.

(٦) مە: مانگ. پارس زبان: فارسیزمان. گفت: وتی. گو: بڵێ. جانا: گیانەکەم!

واتە: یاری فارسیزمانم بە فارسی وتی: سالم! شەرحی حاڵی خۆت بکە، چۆنی؟! وتم: گیانە! شارەزای زاراوەی ئێوە نیم، من کوردم و فارسی نازانم!

ئیصطیلاحی (عا): ئیستیلاحی.

## -٥- (*)

سیاهیی کاغەذم چی بێ؟ سەوادی دیدەیی تارم
لە قاصید زوودْتەر، بەڵکە ببینم ڕوویی دڵدارم (١)
لە تەحریراتی عاشقدا، وەرەق ڕەسمێکی مەترووکە
دەکا ئەفشانْ مەکتووبت، سەراپا ئەشکی گوڵنارم (٢)
بە میثلی زوڵفی شەبڕەنگت سیاه و دەرهەمە ڕۆژم
وەکوو شەرحی فیراقت، هەر طەرەف ئاشوفتەیە کارم (٣)
چ حاجەت پورسشی ئەحواڵی ئاشوفتەم لە قاصید کەن؟!
سەراسەر وەصفی گێسووتە هەموو مەضموونی تۆمارم (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ق)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) سیاهیی کاغەزم: ڕەشیی نامەم. تار: تاریك. قاصید: نامەبەر، تەتەر.

واتە: ڕەشیی ئەو نامەیە کە بۆ یاری دەنێرم، ڕەشیی چاوی تاریکمە، بەڵکوو لە نامەبەر زووتر ڕوخساری دڵبەر ببینم. یانێ: سالم نایەوێ نامە بنێرێ، بەڵکوو گلێنەی چاوی دەنێرێ بۆ لای یار، دیارە ئەم دوانەیش لە ڕەشیدا وەك یەکن.

سیاهیی (ق): سەودای. سەودای دیدەیی (ق): سیاهیی دیدەیی.

(٢) ئەم بەیتە لە (ق)دا سێیەمە.

واتە: نامەنووسینی عاشق یا نامە بۆ عاشق نووسین و بەکارهێنانی کاغەز و مەرەکەب، شتێکی بێ‌کەڵکە، چونکە فرمێسکی سووری گوڵنارم سەراپای نامە بڵاودەکاتەوە و دەیسڕێتەوە؛ یا نامە و نامەکاری بۆ عاشق شتێکی بێ‌کەڵکە، فرمێسکی سووری هەموو ڕاز و نهێنییەك بڵاودەکاتەوە.

ئەفشان مەکتووبت (ق): ئەفشانی مەطـلۆوبم.

(٣) ئەم بەیتە لە (ق)دا دووەمە.

واتە: ڕۆژم وەك زوڵفی ڕەشی شەوڕەنگت ڕەش و ئالۆزە، کارم لە هەموو لایەکەوە وەك شەرحی جاییت پچڕپچڕ و شێواوە.

(٤) واتە: پێویست نییە باری ئالۆز و تێکچووم لە نامەبەر بپرسن، ناوەڕۆکی نامەکەم (تۆمارەکەم) وەسفی زوڵفتە و حاڵم وەك زوڵفت ئالۆزە.

**به ڕەنگی کاغەذی بێخەط سفیدە چاوی تاریکم**
**وەکوو زوڵفی پەرێشانت سیاهە بەختی ئەدبارم (٥)**
**وە چاکە نامەیی (صادیق) بە خاکی پێت موشەڕڕەف بێ**
**بە میثلی (صاد)ی (صادیق) وایە دایم، چاوی بێدارم (٦)**
**لەگەڵ نوقطەی مەحەببەت کەی جودا بوو خاطری "سالم"؟**
**لە دەوری نامەوو قاصید، بە دڵ وەك نووکی پەرگارم (٧)**

(تۆمارم)، لە هەردوو نوسخەکەدا بە (طـۆمارم) نووسراوە.

(٥) واتە: چاوم وەك کاغەزی سپیی هیچ‌لێ‌نەنووسراو و بێ‌خەت سپی بووە و لێڵاییی داهاتووە، بەختی نەگبەتیشم هەر وەك زوڵفی پەرێشانت پەرێشانە.

پەرێشانت (ق): سیاهت.

(٦) وە چاکە: وەها چاکە.

واتە: وا چاکە نامەی ڕاستگۆی من بە خاکی بەری پێت شەرەفمەند بێ، چاوم وەك (ص)ی (صادق) ڕۆشنە و هەمیشە کراوەیە، من چاوەڕوانتم، یا بیرت لێ دەکەمەوە. دیارە چاوی (ص) لە نووسیندا ڕەش ناکرێتەوە.

بە دوور نازانرێ سالم ئەم نامەیەی بۆ "صادق" ناوێکی برادەریی نووسیبێ.

(٧) جودا: جیا.

واتە: دڵی سالم هەرگیز لە خاڵی خۆشویستنت جیا نابێتەوە. نەك تەنها ئەوە، بەڵکوو وەك نووکی پەرگارم لێ هاتووە، بە دەوری نامە و نامەبەردا دەسووڕێمەوە!

## (*) -٦-

**صەبووریم دێ ببینم، گەر بە خەو، دیداری دڵدارم**
**لەگەڵما دوشمنە، چ بکەم ڕەفیقان، چاوی بێدارم (١)**
**لەپاش دەردی فیراق، ئیتر لە لام دونیا هەموو پەشمە**
**لە عومر و زیندەگی و عەیش و جەوانی، جوملە بێزارم! (٢)**
**ئەجەل! داروی شیفای من مردنە، سا دەی خەلاصیم کە**
**لەدەست دەردی حەیات و جەوری دونیا زۆر بەئازارم (٣)**
**بە میثلی زوڵفی دڵبەر تیرەوو ئاشوفتەیە، ڕۆژم**
**بە ڕەنگی لەعلی لێوی ئاڵە دایم، ئەشکی گوڵنارم (٤)**
**بەهەم نایێ لەبەر کورتی لە هەر سوو ڕشتەیی ئومێد**
**یەهوودانە فەلەك عوقدەی ئەوەندە خستە ناو کارم (٥)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (م)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) واتە: ئەگەر بە خەویش دیداری یار ببینم، سەبووریم بۆ دێت و دەحەسێمەوە، بەڵام چ بکەم ئەی برادەران! چاوی بێدارم دوژمنمە، ناهێڵێ خەوم لێ بکەوێ و بە خەویش یار ببینم.

(٢) واتە: هەموو دنیام پاش دەردی جیایی، لا هیچوپووچە و لە تەمەن و جوانی و ژیان و ڕابواردن، هەمووی بێزارم.

(٣) ئەجەل: ئاکام. داروو: دەرمان.

واتە: ئەی ئاکام! دەرمانی چاکبوونەوەی من مردنە، دە گورج بە ڕزگارم بکە. لەدەست دەردی ژیان و ستەمی دنیا بەتەنگ هاتووم و گیرم خواردووە.

(خەلاصم کە) بە (خەلاصیم کە) نووسراوە، کە بۆ ئێرە نەگونجاوە و ڕەنگە هەڵەی نووسین بێ.

(٤) واتە: ڕۆژم وەك زوڵفی یار ڕەش و ئاڵۆزە، هەمیشە فرمێسکی گوڵنارم وەك لێوی لەعلی ئاڵیەتی.

(٥) بەهەم نایێ: کۆناکرێتەوە و ناگاتەوە یەك. یەهوودانە: جوولەکانە، فێڵبازانە. عوقدە: گرێ.

واتە: فەلەك وەك جوولەکە ئەوەندە گرێی خستووەتە کارم، ڕشتەی هیوام لە هەموو لایەکەوە ئەوەندە کورتە، ناگاتە یەك و کۆنابێتەوە!

**نومایان که صەبا! ئیعجازی یووسف، وەختی ئیمدادە**
**غوبار بێنە لە کۆی جانانەوە بۆ دیدەیی تارم (٦)**
**بە یەكدڵ بۆ دلآرامێ بە دڵ مەجنوون و خووصەنعان**
**خەیاڵی زوڵفی لەیلایە، بە دایم بەند و زوننارم (٧)**
**لە حیرصی غەم، بە لەب گەر ئاشنا بێ شەکوەیی دووری**
**دڵی عیسا بە جۆش دێنێ، صەدای ئەفغان و هاوارم (٨)**
**لەگەڵ دونیا بەشەڕ هاتووم و کۆ نادەین، دەسا یاران!**
**فەلەك چەرخێترە، یا من ئەزەلجانسەخت و بێعارم؟ (٩)**
**کەسێ تەفتیشی ئەحواڵ کا، بڵێ: ناسالمە "سالم"**
**صەبا تەشریفی خاصت، گەر دەچیتە مەنزڵی یارم! (١٠)**

(٦) نومایان: ئاشکرا. ئیعجازی یووسف: بۆنوبەرامەی کراسەکەی کە ناردی بۆ یەعقووبی باوکی (د.خ).

واتە: ئەی بای سەبا، موعجیزەکەی حەزرەتی یووسف (د.خ) دەربخە، وەختی یارمەتییە. تۆز و گەرد لە دەوروبەری مەنزڵی یارەوە بێنە بۆ چاوی تاریکم، تا ڕووناك بێتەوە!

(٧) دلآرام: دڵئارامکەرەوە. زوننار: چەلیپای خاچ.

واتە: بە یەكدڵ بێڕاڕایی بۆ یاری دڵئارامکەرەوە، بە دڵ مەجنوونی عامیریم، بە خوو شێخی صەنعانی لەدینوەرگەڕاوی سەرگەردانم. خەیاڵ و تارمایی زوڵفی لەیلا بەند و چەلیپامە، بەندەکە بۆ مەجنوونییەکەی و چەلیپاکە بۆ صەنعانییەکەی!

(٨) لە حیرس: (لە حیرصی) ڕاستە، لە داخی. شەکوە (شەکوا): سکاڵا. عیسا: مەبەست خۆگر و ددانبەخۆداگرە.

واتە: ئەگەر لە داخی خەم و پەژارە سکاڵای دەردی دووری بە دەممدا بێ و بە لێوم ئاشنا ببێ و لێوم بەو سکاڵایە بیزوێنم، ئاوازیناڵە و هاوارم دڵی قایمی حەزرەتی عیسا دێنێتە جۆش.

(٩) کۆ نادەین: واز ناهێنین و بەردەوامین.

واتە: من لەگەڵ دنیا کەوتوومەتە شەڕ و دەست لە یەخەی یەکتر ناکەینەوە. یا فەلەك چەرخێکیترە و لە وزەی مندایە بەگژیدا بچم، یان من هەر لە ئەزەلەوە سەرسەخت و بێعارم!

(١٠) واتە: ئەی بای صەبا، ئەگەر تەشریفت بردەماڵی یارم و کەسێ هەواڵی منی لێ پرسیت، بڵێ: سالم ناساغە و نەخۆش و دەردەدارە!

-٧- (*)

لەدەس ئەم ئەسپە بۆزە بێقەرارم
هەمیشە دڵغەمین و داغْدارم (١)
لەبەر بێنی برینی لاشەویلەی،
وەها گێژم، نەماوە ئیختیارم (٢)
وەرن کاروانی توججاریم ببینن
مەتاعم مشکییە، هەممانە بارم (٣)
کە دێ لافاوی خوێنین، دری؟ شەوقی
وەرن پێم هەڵپژێن، کۆتایە کارم (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (ف، کم، گم)دا هەیە و ناسناوی "سالم"ی تێدا نییە. سالم سکاڵای لەدەست ئەسپ و ماین هەیە، دەبێ کەمجار ولاغێکی چاکی بە تووشەوە بووبێ.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) دیارە بێزاری لەدەست ئەسپە کەتە لەڕەکەی دەربڕیوە و وتوویە: دەمێکە بەدەست ئەم ئەسپەبۆزە ئارامنەگرتووەمەوە دڵ و دەروونم پڕە لە خەم و خەفەت.

دەی (ف): دەست.

(٢) بۆنی برینی دەمی ئەم ئەسپە بێزاری کردووە، بۆیە وتوویە: بە هۆی بۆنی برینی دەمی ئەم ئەسپەوە، گێڕم و دەسەڵاتم بەدەست خۆمەوە نەماوە.

(٣) "مشکی" شێوەنووسی (کم، گم)ە، بە نزیکایەتیی وشەی (هەممانە)، وا دەزانین (مەشکە)یە و (مشکی) نییە. لەوانەیە مەبەستی ئەوە بێ، ئەسپەکە خۆی مەشکە و هەمانەی خاڵییە. هەروەها سالم – ئەوەندەی ئێمە ئاگادار بین– هەرگیز وشەی (مشکی)ی بەکارنەهێناوە.

هەممانە (کم، گم): هەمیانە. هەڵەی چاپە و دەبێ (هەمبانە) بووبێ.

(٤) بەم جۆرە کە دەیبینن، نازانرێ واتای بەیتەکە چییە؟ ڕەنگە بەم شێوەیە بووبێ:

((کە دێ لافاوی خوێنین، دەبڕێ شەوقی    وەرن پێم هەڵبڕن، کۆتایە کارم!))

ئەگەر وابێ، ئەسپەبۆزە کە لافاوی خوێنی دێ، شەوقی ڕەنگورووی نامێنێ. سالم داوای یارمەتی دەکا، پێی لە لافاوی خوێن ڕزگار بێ و بەرزی بکەنەوە! بۆچی ناتوانێ پێی هەڵبڕێ؟ لەوانەیە نوقمی لافاوی خوێن بێ، بە پێهەڵبڕین فریای چی دەکەوێ؟ یا لەوانەیە (دەبڕێ شەوقم) بێ، یانێ من لەو دۆخەدا شەوقم نامێنێ. جێی باسە، (گم)یش بێزاریی لە لەنگی و نارێکیی بەیتەکە دەربڕیوە.

لەتاو کێم، هێندە دەست و پەل دەشۆرم
دەڵێی نەوصۆفیەکانی تەوبەکارم (٥)
ئەمەندە ڕاست و چەپ فکریم لە زامی
بەبێ عیللەت ئەمێستاش خێڵوخوارم (٦)
دەنووم جارجار لەژێر سایەی چنارا،
لە شڵپەی دەنگی گوێچکەی گەشکەدارم (٧)
بۆ خۆم سەرگەشتەوو ئەسپیش وەهاتە
هەمیشە بۆیە من زیر و زگارم (٨)

دری شوقی (ف): رشوقی. هەڵەیە. هەڵێژین (ف): هەڵێژن.

(٥) واتە: لەتاو کێم و زووخی برینی ئەسپەبۆز، ئەوەندە دەستوپلم دەشۆم، دەڵێی تازە سۆفیی تۆبەکارم، کە زۆر دەستی دەشوا و دەستنوێژ دەگرێ. جێی وتنە، «نەوسۆفیەکانی» ئەگەر «نەوسۆفییانی» بووایە، نیوەبەیتەکە سوارتر دەبوو، بەڵام ئێستا خوارە!! بۆیە وای بۆ دەچین دەستکاری کرابێ.

نەوصۆفیەکانی (کم): نەوصۆفیەکانم.

(٦) ئەم بەیتە لە (ف)دا حەوتەمە.

فکریم: تێفکریم، بیرم لێ کردەوە.

واتە: ئەوەندە بیرم ڕاست و چەپ و ئەملاوئەولای کرد و پەرێشانە، بە دوای زام و شوێنی زامیدا دەگەڕێم، بەبێ هۆ خواروخێچ بووم.

فکریم (کم، گم): فکرم. هەڵەیە.

(٧) گەشکە: فێ، پەرکەم، صرع.

واتە: جاروبار ماندوو دەبم و لە سێبەری چناردا دەنووم، لەپڕ لە دەنگی شڵپەی گوێی گەورەی ئەسپەبۆز ڕادەچڵەکێم و فێم لێ دێ!!

چنارا (کم): چناردا.

(٨) زیر و زگارم: خەمبارم.

واتە: خۆم سەرگەردانم و ئەسپیش وەهایە، بۆیە هەمیشە زیز و خەمبارم.

وەهاتە: هەڵەیە و دەبێ «وەهایە» بووبێ.

## -٨- (*)

**قەت تەواو نابێ ئارەزووی یارم**
**ئاخری عومرە، ئەووەڵی کارم (١)**
**وا حەکیمم دەڵێ: دڵی بیمار**
**صیحجەتی دێ بە چاوی بیمارم (٢)**
**دەك زیاد بن جەمالی تۆ و عیشقم**
**جانم ئازادە تا گرفتارم (٣)**
**قەت گورێزم نەدا لە تیری موژەت**
**ئەی بەسا سەختْجان و بێعارم؟! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، ه، ف، غ، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: خەفیفی شەشیی مەخبوونی ئەصڵەم.

(١) واتە: ئارەزووی دیداری یارم هەرگیز تەواو نابێ، ئەم خولیایەم قەت لەکۆڵ نابێتەوە. وا دوادوایی تەمەنمە و کەچی تازە لە سەرەتای کاری عیشقدام.

قەت (عا، غ، ڕ): قەد.

(٢) واتە: حەکیمم، کە یارە، وا دەڵێ: دڵی نەخۆشی عاشق بە هۆی چاوی مەست و بیماری منەوە خۆشیی بۆ دێ و چاك دەبێتەوە، یا تەندروستیی بە چاوی بیمارم دەبینێ.

بیمار (عا): بیمارە. وا حەکیمم .. تاد (ه): وا حەکیمی دڵ ... هەڵەیە. (کم): وا حەکیم ئەڵێ ئەی دڵی بیمار* صیحەتی دەبێ بە چاوی بیمارم. (گم): وا حەکیم دەڵێ: ئەی دڵی بیمار* صیحجەتی دەبێ بە چاو بیمارم. (گم) لە پەراوێزدا وتوویە: بەیتەکە لەنگ و نارێکە.

(دێ) هەڵدەگرێ (دی) بێ وەك لە شەرحەکەدا بینیتان.

(٣) ئەم بەیتە لە (ه)دا پێنجەمە.

واتە: دەك خودایە جوانیی تۆ و ئەڤینی من هەمیشە لە زیادیدا بن. من تا گیرۆدەی عیشق بم، گیانم ئازادە.

دەك (کم، گم): وەك. هەڵەیە.

(٤) واتە: هەرگیز لەدەست تیری برژانگت ڕام نەکردووە. ئای چەند دڵقایم و تەمێنەخواردووم، هەر تیرم تێدەگری و هەر بەپیرتەوە دێم.

**پەرتەوی ئافتابە شەمعی شەوی**

**عومرەها دڵ لە زوڵفی دڵدارم (٥)**

**تا نەبینێ مەهی جەمالی حەبیب**

**عارە خەو بێتە چاوی بێدارم! (٦)**

**"سالم" ئەمشەو بە ناڵە قادر نیم**

**بەسکی زار و نەزار و ئەفگارم (٧)**

قەت (ڕ): قەد. گوریزم نەدا (گم): گوریز نەدا. و بێعارم (ف): چارم. هەڵەیە و لەنگە.

(٥) عومرەها: چەند عومرێك، ماوەیەکی درێژ.

واتە: دڵی من کە عومری لەناو زوڵفی دڵبەردا بردە سەر، مۆمی شەوی بریتییە لە ڕووناکی هەتاوی ڕوخساری. دیارە شەوەکە زوڵفی یارە.

شەمعی شەوی (عا) شەمعی تۆ. (ف): بە شەمعی شەوێ. (کم): شەمعی جەمالم. (گم): شەمعی شەو. عومرەها (گم): عوعرەها. هەڵەی چاپە.

(٦) ئەم بەیتە لە (ف)دا نییە.

واتە: چاوی بێدارم مانگی جوانیی خۆشەویست نەبینێ، شوورەیییە بۆی خەوی لێ بکەوێ!

خەو (ڕ): حەو. هەڵەی نووسینە.

(٧) ئەفگار: ماندوو، بێزار.

واتە: سالم، ئەمشەو ئەوەندە بێهێز و لاوازم، تەنانەت نایشتوانم بناڵم.

نەزار و ئەفگارم (کم، گم): نزارە ئەفکارم.

-٩- (*)

**دریغا، صەعوەئاسا صەیدی دیدەی شاهبازێکم**
**زەدەی تیری نیگاهی جادووانەی عیشوەسازێکم (١)**
**ئەگەرچی -ظاهیرەن- دەروێش و میسکین و گەداڕەنگم**
**خەمیدەقامەتی شیرینخەرامێ، سەرونازێکم (٢)**
**لە چەتری نادری، ڕوتبەم گەلێ بالاترە ئێستە**
**کە من ئیکسیری خاکی ڕەهگوزاری سەرفرازێکم (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ق، کم، پ، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتی تەواو.

(١) دریغا: داخەکەم. صەعوە: چۆلەکەی بچووك، فیسقە. شاهباز: بازی زۆر چاك و تیژپەڕ.

واتە: ئاخ و داخ، وەك چۆلەکەیەکی بچووکی بێهێز بوومەتە نێچیری چاوی بازێکی ئازا. زەدە و برینداری نیگای سیحربازانەی خاوەننازێکم.

دیدەی (کم، گم): چنگی.

(٢) خەمیدە: چەماوە. شیرینخەرام: خۆشلەنجە. سەروناز: جۆرە سەروێکی جوانە، یا لەرەی نازکردنی وەك لەرینەوەی دارسەروە.

واتە: ئەگەرچی بە دیمەن دەروێش و هەژار و بە ڕەنگ گەدام، بەلام -لە ڕاستیدا- نە دەروێشم و نە گەدا، بەلکوو بالا کووڕ و چەماوەی دەستی دلبەرێکی شیرینلەنجەی بالا سەرونازم.

ئەگەرچی .. تاد (گم): ئەگەرچی ظاهیرەن میسکین و دەروێش. خەمیدە .. تاد (کم، گم): لە غەزنەی خاطرا مەحموودی گێسوویی ئەیازێکم. زۆرجوانە. غەزنە: شارەکەی سولتان مەحموودی غەزنەوی. مەحموود: سولتان مەحموود. گێسوو: زولف. ئەیاز: غولامی سولتانی ناوبراو، کە دەبێ جوان بووبێ.

واتە: ئەگەرچی بە دیمەن دەروێش و گەدام، بەلام لە شاری (غەزنە)ی دەروونـدا دەولەمەنـدم و سولتان مەحموودێکم بۆ خۆم و خاوەنی زولفی ئەیازێکم!

(٣) ئەم بەیتە و سێ بەیتی پاشەوەی لە (ق)دا نین.

چەتر: سەیوان. چەتری نادری: دوور نییە چەترێك بووبێ بۆ نادرشـای ئەفـشار بـەکارهێنرابێ و لەوەوە ناوی بە (نادری) دەرکردبێ. ئیکسیر: مایەیەکە مەعدەنیتر دەکاتە ئالتوون و زیو.

واتە: کە من ئێستا خاکی وەك ئیکسیری ڕێگای دلبەرێکی سـەربەرزم و ئەو پێم پێدا دەنێ، پایەم گەلێ لە چەتری نادری کە بەسەر سەرەوە دەگیرێ، بەرزترە!

**وەکوو ئەنجوم بە ڕەجمی موددەعی ئەخگەرنومام ئەمشەو**
**سەراپا نار و شوعلەی ئاتەشی ڕووی جانگودازێکم (٤)**
**درێغا کشتی ئوممێدم کە دێتە حاڵەتی سەبزی**
**ڕەقیبی سەگصیفەت حاضر دەبێ، یەعنی: بەرازێکم (٥)**
**ئەگەر دۆستە، ئەگەر دوژمن، لە قاپیت نائومێد نابن**
**منیش لەم دەرگەدا، یا ڕەب! طەڵەبکاری نیازێکم (٦)**
**ئەگەرچی میهرەبانی حوکمی وەك عەنقایە لەم عەهدە،**
**غولامی طالیعی خۆمم کە دیلی دڵنەوازێکم (٧)**

ئێستە (کم، گم): ئێستا. ئیکسیر (مان): ئیکثیر. هەڵەیە. سەرفرازێکم (گم): سەرفراز. هەڵەی چاپە.

(٤) ئەنجوم: کۆی نەجمە، واتە ئەستێرە. موددەعی: بەدکار، ڕەقیب. ئەخگەر: پشکۆ. ئەخگەرنوما: شتێك وەك پشکۆ بنوێنێ. جانگوداز: هەر شتێ ئازاری دڵ بدا، دیارە دڵبەریش لەوانەیە.

سالم خۆی بە ئەستێرە داناوە، بەدکاریشی بە شەیتان کە بە شەو ئەستێرەبارانی دەکا. جا لەم ڕووەوە وتوویە: ئەمشەو وەك پشکۆی سوور دەنوێنم، ئەستێرەئاسا بەدکار ئاگرباران دەکەم و ڕاوی دەنێم. ئەمەیش شتێکی سەیر نییە، چونکە من سەراپا ئاگر و گڕی عیشقی ڕوخساری یارێکم کە دڵی عاشقان ئازار دەدا.

وەکوو ئەنجوم بە ڕەجمی (کم، گم): وەکو بە ڕەجمی. (گم) خۆی نووسیویە: لەنگە. ئەخگەرنومام (گم): ئەخگەر نمام.

(٥) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (مان)دا نین.

واتە: داخەکەم کە کشتوکاڵی هیوام سەوز دەبێ و خەریکە بێبگا، بەدکاری سەگخوو لێی تاین دەبێ و دەڵێ من بەرازم و دوژمنی کشتوکاڵم، هەڵیدەگێڕمەوە.

کشتی (کم، گم): کەشتی. ئەمەی ئێمە ڕاستە، چونکە وشەکە کشتە، نەك کەشتی.

(٦) واتە: دۆست و دوژمن لە قاپیی میهرەبانیت بێبەش نابن، خودایە منیش نیازێکم لەم دەرگایەدا هەیە، بۆم جێبەجێ بفەرموو. ئەڵبەت نیازەکەی گەیشتن بە یارە. ئەگەر وا نەبێ، بەیتەکە لە پارچەشیعرەکەدا غەریب دەبێ و پێوەندیی بە تێکڕای بەیتەکانەوە نامێنێ.

(ئەگەر)ی دووەم (گم): وەگەر.

(٧) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا نییە.

## طەڵەبکاری حەقیقەت خاطری "سالم" لە باطیندا
## ئەگەرچی -ظاهیرەن- دڵدادەیی عیشقی مەجازێکم (٨)

عەنقا: سیمورغ، باڵندەیەکە هەر ناوی هەیە. شێخ ڕەزای تاڵەبانی دەفەرموێ:

((سێ ئیسم هەن بێ موسەمما، هەر وەکوو ناوی بەقا:

طەیری عەنقا، شاری جابولقا، پلاوی خانەقا))

طالیع: بەخت و ناوچاوان. دڵنەواز: یەکێك دڵی یەکێکیتر بداتەوە و بەزەیی پێدا بێتەوە.

واتە: ئەگەرچی دڵنەوایی و بەزەیی لەم چەرخەدا وەك عەنقایە و هەر بە ناو هەیە، من خزمەتکاری بەخت و ناوچاوانی خۆمم کە دیل و وێڵی یارێکی میهرەبانم.

(٨) خاطر: دڵ و دەروون. دڵدادە: کەسێ دڵی بە یەکێ دابێ و گیرۆدەی عیشقی ئەو بێ!

واتە: دڵ و دەروونی سالم ئەگەرچی بە ڕواڵەت گیرۆدەی عیشقی مەجازیی دنیاییە، بەڵام لە ڕاستیدا و لە ناخەوە بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێ.

طەڵەبکاری (ق): طەڵەبکارە.

**-١٠- (*)**

**شەو هاتەوە، من بێدڵ و مەجنوونی کەسێکم**
**ماتەمزەدەوو بێخود و مەحزوونی کەسێکم (١)**
**قەد خاری جەفا نێشی نەماوە، بە سیاقێ**
**مەحوی نەظەری عاریضی گوڵگوونی کەسێکم (٢)**
**ساقی لە صەفا، نەوبەتی من، مەی مەدە ئەصڵەن**
**مەستی نیگەهی دیدەیی مەیگوونی کەسێکم (٣)**
**نەوحەم لە سروشك لوججەوو طۆفانی بەهەم دا**
**سەرگەشتە شەناجۆ لە یەما، نوونی کەسێکم (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ق، نم، پ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

(١) واتە: ئۆف وا شەو هاتەوە و باری دڵم گرانتر بوو، من بێدڵ و شێت و شەیدای دلبەرێکم، ماتەمین و بێهۆش و خەمباری یارێکم.

(٢) ئەم بەیتە لە (نم)دا سێیەمە. نیوەی دووەمی ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (ق)دا پاش و پێشن.

بە سیاقێ: بە چەشنێك.

واتە: درکی ئازاردان لە لایەن یارەوە بە چەشنێك کارم لێ ناکا و ئێشی نەماوە، ئاگام لە خۆم نییە و فەوتاوی دەستی سەیرکردنی ڕوخسارێکی گوڵڕەنگم.

مەحوی نەظەری عاریضی گوڵگوونی کەسێکم (مان، ق): مەستی نیگەهی دیدەیی مەیگوونی کەسێکم. هەڵەی ڕوونووسکەرەوەیە.

(٣) لە صەفا= لە صەفدا: لە ڕیزدا.

واتە: ئەی مەیگێڕ، لە ڕیزی مەیخۆراندا لە نۆرەی خۆمدا شەرابم ناوێ و پێویستم پێی نییە، خەڵك مەی بۆ مەستبوون دەخۆنەوە، من مەستی سەیرکردنی یارێکم کە ڕوخساری مەیڕەنگە!

ئەصڵەن (مان، ق): ئیتر. مەستی نیگەهی دیدەیی مەیگوونی کەسێکم (مان، ق): مەستی نەظەری عاریضی مەیگوونی کەسێکم. هەڵەی ڕوونووسکەرەوەیە.

(٤) ئەم بەیتە هەر لە (نم)دا هەیە.

نەوحەم: گریانم. سروشك: فرمێسك. لوججە: قووڵایی دەریا، سەرگەشتە: سەرگەردان. شەنا: مەلە. شەناجۆ: مەلەوان، حەزلەمەلەکردوو. یەم: دەریا. توون: لەم جێیەدا مانای نییە و دەبێ (نوون)

**بۆ گەنجی طەرەب، طالیبی تەصویری پەشیزم**
**بۆ نەقدی جەفا، مونعیم و قاروونی کەسێکم (٥)**
**پڕموشکیلە طەبعم لەگەڵ ئەم ئەهلە بگونجێ**
**بۆ قاڵبی طینەت ئەزەلئەفیوونی کەسێکم (٦)**
**لەم ڕاهە خەطەرناکە، گوزەر زەحمەتە "سالم!"**
**جاندادەوو ئوفتادەیی ئەفسوونی کەسێکم (٧)**

بێ بە مانای ماسی، کە لەگەڵ تێکڕای دەریا و تۆفان و قووڵایی دەگونجێ.

واتە: گریانم بە فرمێسك قووڵایی دەریا و تۆفانی بەیەکدا دا. من ئێستا لەم دەریایەدا خەریکی مەلەم و وەك ماسی سەرگەردانی یارێکی بێبەزەییم.

(لوجەجەوو) بە (لوجەجەیە و) نووسراوە، کە لەگەڵ ماناکەی ڕێك نایێتەوە.

(٥) پەشیز: پارەی ڕیزەڕیزەی زۆر ورد. موفلیس: نابووت.

واتە: بۆ پێکەوەنانی گەنجینەی ئاهەنگ و خۆشی، تەنانەت پێویستم بە وێنەی وردەپارەیش هەیە، یانێ هیچم نییە ببێتە مایەی خۆشی! بەڵام لە ئازار و خەمدا، بەهۆی یارێکی سزاکارەوە، دەوڵەمەند و قاروونم و زۆرم هەیە.

ئەم واتایە بە جوان دەزانین، بەڵام لەمە باشتر دەستنەکەوت. دووریش نییە لەباتیی (تەصویر) تەصغیر بووبێ. (موفلیس) لە (مان)دا هەڵەیە، (مونعیم)ی نوسخەی (ئم) دروست و گونجاوە.

گەنجی (ق): کونجی.

(٦) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (ق)دا نین.

پڕموشکیلە: زۆر زەحمەت و گرانە. ئەزەلئەفیوون: هەمیشە وڕ و کاس، لەوانەیە مەبەستی کەسێك بێ کە هەر لە ئەزەلەوە ئەفیوون کاری تێکردبێ و هەمیشە گێژ بێ!

واتە: زۆر گرانە سروشتم لەگەڵ سروشتی ئەم خەڵکە بسازێ و لەگەڵیان هەڵکا. سەبارەت بە قاڵبی ئەو قوڕەی وا لێی دروست کراوم، من هەر لە ئەزەلەوە کاس و بەدمەستی یارێکی ستەمکارم!

طەبعم لەگەڵ ئەم ئەهلە بگونجێ (ئم، پ): خاکم لەگەڵ ئەم خاکە بچەسپێ.

(٧) جاندادە: یەکێکە لە گیانەڵادا بێ. ئوفتادە: لەپێکەوتوو. ئەفسوون: فێڵ و تەڵەکە.

واتە: تێپەڕین لەم ڕێگا پڕمەترسییە زۆر گرانە، من خەریکی گیاندەرچوون و لەپێکەوتووی دەستی یارێکم!

ڕاهە (ق): ڕاهی. خەطەرناکە (ئم): خەچرناکە. هەڵەیە. زەحمەتە (ئم، پ): موشکیلە.

## -١١- (*)

**لەسەر ڕووو دانەیی خاڵت بە فەن داناوە، دەیزانم**
**بە قەصدی مورغی دڵ زوڵفت بە دەورا داوە، دەیزانم (١)**
**خەریکی دڵنەوازیمی بە چاوی مەرحەمەت، ظاهیر**
**نیهانی بۆ سەرم تیغی برۆت ساو داوە، دەیزانم (٢)**
**گرانخێزی لە ڕەفتارا، بەهانەت عوجب و تەمکینە**
**بە باڵاتا لە گێسوو ئەژدەها ئاڵاوە، دەیزانم (٣)**
**سیەهدڵمەردومان، چ بکەم، لە شەرعا شاهیدی نادەن**
**دزینی دڵ لە سینەمدا فوتووری چاوە، دەیزانم (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) نیوەی دووەمی ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (ق)دا پاش و پێشن.

واتە: دەزانم خاڵی جوانی ڕوومەتت دانەیە و بە فێڵ داتناوە. ئەگریجەیشت داوە و بە نیازی گرتنی پەلەوەری دڵم بە دەوری ئەو دانەیەدا داتناوە! دەیشێ (داوە) کار بێ.

بە دەورا (ق): بە ڕوودا.

(٢) واتە: دەزانم بە ڕواڵەت بە چاوی میهرەبانی دڵنەواییم دەکەی، بەڵام بە پەنهانی برۆی وەك تیغت بۆ سەربڕینم ساو داوە و تیژ کردووە.

داناوە (گم): دانان. هەڵەی چاپە.

(٣) گرانخێز: لەشقورس کە نەتوانێ زوو هەستێ، لەشبەبار.

واتە: لە کار و کردەوەدا گران دەجووڵێیتەوە، گوایە بە فیز و دەعیەی! بەڵام من دەزانم هۆی ڕاستەقینەی ئەو قورسییەت، ئەوەیە کە ئەگریجەت وەك ئەژدەها بە باڵاتدا ئاڵاوە و درەنگ ڕاست دەبیتەوە.

(٤) سیەهدڵمەردومن: دەبێ (سیەهدڵمەردومان) بێ، بە مانای هەردوو گلێنەی دڵڕەش و بێبەزەییی چاوەکان. فوتووری چاو: مەستیی چاو.

واتە: هۆی دزینی دڵ لە سینەم مەستیی چاوتە. دوو گلێنە ڕەشە دڵڕەقەکانیشت بەم دزییە دەزانن، بەڵام چ بکەم شایەتیت لێ نادەن؛ یا بە شەرع چونکە ڕەشن، یان چونکە ستەمکارن و بێدادن، شایەتییان قوبووڵ نییە.

**وەکوو سینەم دەبێ تێکچێ، لە هەر جێ دڵ قەراری بێ**
**لە زوڵفا ئاشیانی بەستبێ، شێواوە، دەیزانم (٥)**
**لە ڕووی بەرقی تەجەللیی حوسنتا، موشکیل دڵم مابێ!**
**موجەسسەم گەر لە سەنگی خارە بێ، سووتاوە، دەیزانم (٦)**
**فەریبی دڵ دەدەم دایم بە موژدەی ڕوئیەتی حوسنت!**
**ئەگەرچی وەصڵی تۆ عەنقاصیفەت هەر ناوە، دەیزانم (٧)**
**قیامەت حەشرە بۆ عالەم، وەلێکین هەر لە ئێستاوە**
**خوداوەند بۆ ڕەقیبم دۆزەخی تاو داوە، دەیزانم (٨)**

(مەردومان) لە (مان، حا)دا (مردمن)ە. لە شەرعا (ق): بە شەرعەن.

نیوەی دووەمی ئەم بەیتە لە (ق)دا، نیوەی یەکەمی بەیتی پاشەوەیە و دوو نیوەکەی‌تریش کەوتووە.

(٥) ئاشیان: هێلانە.

واتە: هەر شوێنێ دڵم بیکاتە مەنزڵگەی خۆی، دەبێ وەك سینەم تێكچێ و ئاڵۆز بێ. دیارە کە هێلانەی لە زوڵفتدا کردبێ، دەبێ زوڵفیشت وەك سینەمی لێ بێ و بشێوێ.

(هەرچی) لە (مان، حا)دا هەڵەیە و (هەر جێ)ی (ق، کم، گم) ڕاستە. ئاشیان (کم، گم): ئاشیانە.

(٦) سەنگی خارا یا خارە: جۆرە بەردێکی ڕەقی سواوەی وەهایە لەشکان نایێ.

واتە: زۆر باش دەزانم ئەگەر دڵم ببێتە پەیکەرێکی لە بەردی خارا دروستکراویش، گرانە بەرگەی برووسکەی جوانیی تۆ بگرێ و دەبێ بسووتێ.

تەجەللی (کم، ق، گم): تەجەللای. گەر لە سەنگی خارا بێ (ق): سەنگی خارا بێ بەڵێ.

(٧) فەریب: خەڵەتاندن، فریو. ڕوئیەت: بینین.

واتە: هەموو جارێك دڵ بە موژدەی گەیشتن بە تۆ دەخەڵەتێنم و دڵخۆشیی دەدەمەوە، ئەگەرچی دەزانم گەیشتن بە تۆ عەنقایە، ئیسمی بێ موسەممایە، هەر ناوی هەیە و ناوکەی نییە!

وەصڵی تۆ (ق): وەصفی تۆ.

(٨) وەلێکین: بەڵام.

واتە: حەشری خەڵك ڕۆژی قیامەتە، بەڵام من دەزانم خودا دۆزەخی هەر لە ئێستاوە و پێش ئەوەی بگەینە قیامەت، بۆ بەدکاران تاوداوە.

وەلێکین (کم، گم): وەلاکین.

**موبالاتی نەبوو دڵبەر بە حاڵی "سالم"ی مەظڵووم**
**بە حەرفی موددەعیی ظاڵم، بەدڵ تۆراوە، دەیزانم (٩)**

(٩) واتە: چاك دەزانم دڵبەر گوێی نەدایە پەرێشانیی سالمی ستەمدیدە، بە قسەی بەدکاری ناحەزی ستەمکار و بەدڵ لێی تۆراوە و ئاشتبوونەوەی گرانە.

مەظـــڵووم (ق): مسکین.

شایانی باسە، (دەیزانم)ەکان، هەموویان لە (کم)دا ((ئەیزانم))ن.

## -١٢- (*)

ڕەفیقی گۆشەیی غوربەت هەراسانن لەناڵینم
لە ئەشکی دیدە ئەمشەو -باز- لە خوێنا مەوجە بالینم (١)
عورووجی سەند لە صەنعان وەصفی ئەحواڵم لە ڕێی عیشقا
مەگەر ئوستادی تەرسایە بە خەصڵەت یاری بێدینم؟! (٢)
چ جایی دڵ؟ لە شەوقا خوێن بە چاو دێنێ، ئەگەر جارێ
خیضابی پێی سەگی کۆت بێ حەنایی ئەشکی ڕەنگینم (٣)
لە غەم ئێستەم دەبینن، وای دەزانن ئەووەڵی دەردمە
دەمێکە بێخودم یاران، بە یادی یاری دێرینم (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (م)دا هەیە. بەپێی (دیوانی کوردی، بەرگی یەکەم، ل٣٣٨-٣٤٢)، سالم لە وەڵامی نامەیەکی شیعریی مستەفا بەگی "کوردی"دا نووسیوە، کە ئەمە سەرەتاکەیەتی:

((ڕەفیقی کونجی میحنەت عاجزن هەر شەو لە ناڵینم
گوڕێزانن لەبەر لێشاوی مەوجی بەحری ئەسرینم))

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) باز: دووبارە.

واتە: تەنانەت هاوڕێکانی غەریبیم لە ناڵینم بێزار بوون، ئەمشەو بەهۆی فرمێسکی چاومەوە دووبارە ناڵینم لە شەپۆلی خوێندایە.

(بالینم) بە هەڵە بە (ناڵینم) نووسراوە، لەسەر (دیوانی کوردی) ڕاست کرایەوە.

(٢) تەرسا: گاور.

واتە: وەسفی حاڵەتم لە پێناوی عیشقدا پایەی بەرزی لە شێخی صەنعان سەند و لێی سەرکەوت. لەوە دەچێ یاری بێئایینم بە ڕەوشت مامۆستای گاور بێ، بۆیە دڵدارەکەیشی وەها پایەبەرزە!

(٣) واتە: ئەگەر جارێ فرمێسکی ڕەنگینی وەك خەنەم ببێتە ڕەنگی پێی سەگی بەردەرگات، لە شەوق و خۆشیدا، نەك دڵ کە خۆی خوێنە، بە چاویش خوێن دێنم بۆ ڕەنگکردنی پێی سەگەکەت.

(٤) واتە: ئێستا بە شێوەی خەمبارییەوە دەمبینن، وا دەزانن سەرەتای دەردمە. نەخێر، من دەمێکە بە یادی کۆنەوە بێهۆشم.

**شەهیدم من، وەرن مەمشۆن و دەفنم کەن، دەخیل یاران!**
**لە قەبرا حوججەتی حەشرە سەراپا بەرگی خوێنینم! (٥)**
**بلێن: با یار لە وەختی مردنا زوو بێتە سەر شیوەن**
**قوبوڵمە گەر صەدای ئەو بێ لەباتیی دەنگی یاسینم (٦)**
**خەیاڵی دەست لە هیجرانا کە دێتە گەردنت هەر شەو**
**بە ڕەنگی گووشوارەی تۆ دەبارێ ئەشکی پەروینم (٧)**
**لە کۆی عیشقا دوصەد کێوی جەفا بارە لەسەر شانم**
**یەقین "سالم" لە میحنەتدا منیش فەرهادی شیرینم (٨)**

(٥) واتە: شەهید —بە پێی ئایینی ئیسلام— ناشۆردرێ. تەنها دفن دەکرێ. سالم وتوویە: من شەهیدم، بێ شۆردن بمخەنە گۆڕ، بەرگی خوێنینم لە گۆڕدا سەرتاپا شایەتی شەهیدیمە.

(٦) واتە: بە یار بڵێن کە خەریك دەبم بمرم، زوو بێتە کۆڕی شیوەنبۆکردنم. من ڕازیم لەجیاتیی ئەوەی گوێم لە دەنگی خوێندنی سوورەتی یاسین بێ، لە کاتی مردنمدا سەدای شیوەنبۆکردنی ئەو بکەوێتە بەرگوێم.

(٧) ئەشکی پەروین: فرمێسکی دانەدانەی وەك ئەستێرەی کۆ. پەروین: چەند ئەستێرەیەکی بچووکن لە یەك جێدا کۆبوونەتەوە، پێروو، بە عەرەبی پێی دەڵێن (ثریّا). گۆشوارە: گوارە.

واتە: کاتی دووری هەر شەوێك کە دەستی خەیاڵ دەگاتە گەردنت، ئەشکی پەروینم وەك گوارەی بریقەداری گوێت دەنکە دەنکە دەڕژێتە داوێن.

(٨) واتە: دووسەد کێوی مەینەت لە دەوروبەری مەنزڵی عیشقدا بەسەر شانمەوەیە. بێگومان منیش لەبابەت مەینەتەوە فەرهادی گیرۆدەی شیرینم، تەنها فەرهادی کێوهەڵکەن فەرهاد نییە، منیش وەك ئەو هەر فەرهادم.

## -١٣- (*)

**سەهیقەددانی موشکین زوڵف و پەرچەم**
**«همه کس دوست میدارند و من هَم» (١)**
**نەظەر، زاهید، قەرارێکی قەدیمە**
**«نه این بدعت من آوردم به عالَم» (٢)**
**مەڵێن: گەردوونە ڕەنگرێژی موصیبەت**
**«گنه اوّل ز حوّا بود و آدم» (٣)**
**بە تەرکی دڵبەرم ناصیح! مەڵێ هیچ**
**«من این دعوی نمیدارم مسلّم» (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، هـ، ف، ڕ، کم، گم)دا هەیە. لە (مان)دا، یەکێکە لە مولەممەعەکان و فارسییەکەی هیی "سەعدی شیرازی"یە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) سەهی: ڕێك. موشکین: بۆنی میسکدەر، هەر شتێك کە لەگەڵ میسك تێکەڵ بێ و بۆنی ئەوی گرتبێ.

واتە: دڵبەرانی نەوجوان و باڵاڕێك و زوڵف و پەرچەم بۆنخۆش، هەموو کەس خۆشیان دەوێن و منیش خۆشم دەوێن.

(٢) نەظەر: تەماشاکردن، تەماشاکردنی جوانان.

واتە: تەماشاکردنی جوانی و شۆخی، بڕیارێکی کۆنە و لە زووەوە باوە. من ئەم بەندوباوەم دانەهێناوە و نەهێناوەتە دنیاوە، پێش منیش بووە!

قەرارێکی (ف): قەرارێکە.

(٣) واتە: هەرگیز مەڵێن گەردوون ڕەنگرێژی بەڵا و نەهامەتی و سەرچاوەی نەگبەتییە. گوناه یەکەمجار لە حەوا و ئادەمەوە داکەوت. ئەگەر ئادەم و حەوا نەبوونایە، نە ئێمە دەبووین و نە تووشی ئازاری دنیایش دەبووین!!

(گنه) لای "سەعدی" (گناه)ە.

(٤) واتە: ئەی ئامۆژگاریکەر، هیچ شتێك سەبارەت بە وازهێنان لە یار مەڵێ، من هەرگیز قسەی وا ناسەلمێنم و ناچێتە دڵمەوە.

تەرکی (کم، گم): تورکی.

**به ئیما گەر طەڵەب کەی گیانی شیرین**

**«مسلَّم دارَمت، والله اعلم» (٥)**

**بەجوز عونابی لێوت بۆ تەبی دڵ**

**«به گیتی در ندارم هیچ مرهم» (٦)**

**وەها مەحوم لە سەودای عیشقی تۆدا**

**«نه از مدحم خَبَر باشد، نه از ذم» (٧)**

**غورووبی ڕۆژی غەم زۆر چاکە، گەرچی**

**«ز عمر مانده روزی میشود کَم» (٨)**

**وەفای دونیا لەگەڵ هەر کەس دەمێکە**

**«به روی دوستان خوش باش و خرّم» (٩)**

(٥) ئەم بەیتە لە (مان)دا نییە.

ئیما: ئاماژە (اشارة).

واتە: نەك بە قسە، بەڵکوو ئەگەر هەر بە ئیشارەتیش داوای گیانی شیرینم بکەی، خودا دەیزانێ بە هیی تۆی دەزانم و دەتدەمێ.

گیانی (هـ): جانی. (مسلَّم) لای "سەعدی" (مصدّق)ە.

(٦) عوناب: بەری دارێکی دڕکاوییە لە زەیتوون دەکا، چاکترین جۆری سووری شیرینە و بۆ پاڵفتەکردنی خوێن بەسوودە، تایش سووك دەکا!

واتە: جگە لە عونابی لێوی ئاڵت بۆ شیفای تای دڵ، مەرهەمێکیتر لە دنیادا شك نابەم.

عوناب (گم): عەنناب. دڵ (هـ): من. (ڕ): یا دڵ. هەڵەیە.

(٧) واتە: وەها لە نەخۆشیی عیشقی تۆدا پووکاومەتەوە و نەماوم، نە لە ستایش ئاگادارم، نە لە داشۆرین؛ هەموو شتێکم لە بیر چووەتەوە!

(مدحم) لای "سەعدی" (مدحش)ە.

(٨) واتە: ئاوابوونی ڕۆژی خەم زۆر چاك و بەسوودە، ئەگەرچی -ڕاستییەکەی- لەو تەمەنەیدا کە ماوە، ڕۆژێ کەم دەبێتەوە.

(٩) واتە: وەفای دنیا لەگەڵ هەموو کەسێك، من بم یا تۆ، یان غەیر، ماوەیەکی زۆر کورتە. بۆیە ئەی یار! لە خۆت بایی مەبە و لە ڕووی دۆستاندا ڕووخۆش و دەمبەپێکەنین بە.

**حەریفی تۆم منیش، ساقی! نیگاهێ**
**«بیاموز از فلك دور دمادم» (١٠)**
**دەزانم لوطفی تۆ وەك میهری گەردوون**
**«كە بنیادش نە بنیادیست مُحكَمْ» (١١)**
**جیهان "سالم!"، وەكوو مارانی ضەحاك**
**«كە مغزت میخورد، چندین مخور غم» (١٢)**

روزی (ر): كە روزی. هەڵەیە.

(١٠) دمادم: بەردەوام، هەناسە بە هەناسە، سات لەدوای سات.

واتە: ئەی یاری مەیگێڕ، منیش هاوڕێ و ئەربابی تۆم، نۆرەم مەفەوتێنە. لە چەرخی ڕۆژگارەوە فێری سووڕانەوەی بەردەوام بە و مەی بگێڕە!

ساقی! نیگاهێ (كم، گم): شاها كە ماهی.

(١١) واتە: دەزانم میهرەبانیی تۆ وەك میهرەبانیی چەرخی گەردوونی بێوەفایە، بناغەكەی بناغەیەكی بەهێز و پتەو نییە.

(١٢) مارانی ضەحاك: دوو برینەكەی سەرشانی ئەژدەهاك.

واتە: سالم! ئەوەندە خەم مەخۆ، ئەوەندەت نەماوە، چونكە گەردوون وەك مارەكانی سەرشانی ئەژدەهاك وردە وردە مێشكت دەخوا و دواییت پێدەهێنێ!

(مغزت) لای "سەعدی" (خاكت)ە.

-١٤- (*)

**کەوتە سەر ڕوو ئەگریجەی تارت بە خەم**

**ڕۆژ و شەو، ڕۆژ و شەوی لێك دا بەهەم (١)**

**سەرفگەندەی دیدەتە ئاهووی خەتا**

**پایەماڵی لەنجەتە سەروی ئیرەم (٢)**

**جەلبی دڵ بەم ڕەنگە کا، گەر صوورەتت**

**ناپەرستێ «بعد ازین» ڕاهیب، صەنەم (٣)**

**خاکی دەرگات سورمەیە بۆ چاوی تار**

**ماچی لێوت داروەە بۆ دەرد و غەم (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) واتە: ئەگریجەی ڕەش و تاریکت بە پێچولوول کەوتە سەر ڕوخساری وەك خۆرت، هەر ڕۆژ و شەو خۆیان ڕۆژ و شەویان بەیەکدا دا و کۆیان کردنەوە.

ڕوو ئەگریجەی (کم): ڕووت پەرچەمی.

(٢) سەرفگەندە: شەرمەزار و سەرشۆڕ. پایەماڵ: فەوتاو.

واتە: ئاسکی وڵاتی خەتا شەرمەزاری چاوی جوانتە، سەروی باخی ئیرەمیش ماڵوێرانی لەنجەولارتە.

خەتا (مان): خەطا. هەڵەیە.

(٣) صوورەت: وێنە، ڕەسم.

واتە: ئەگەر وێنەی جوانی تۆ بەم ڕەنگە دڵ ڕابکێشێ، ئیتر بتپەرستەکان بت ناپەرستن و تۆ دەپەرستن!

بەم ڕەنگە کا، گەر صوورەتت (کم، گم): بەم نەوعە کا گەر صوورەتت. (ق): گەر صوورەتت بەم ڕەنگە کا.

(٤) داروو: دەرمان.

واتە: خاکی بەردەرگات کلەیە بۆ چاوی لێڵ و چاکی دەکاتەوە، هەروەها ماچی لێوی شیرینت دەرمانی دەرد و خەمە.

**"قەیس"ی تۆن کوللەن لە غەم زومرەی عەرەب**
**"شەمس"ی تۆن جەمعەن بەهەم ئەهلی عەجەم (٥)**
**حەسرەتا! ڕۆژی ئەزەل نەیدا قەسیم**
**قیسمەتی "سالم" بە غەیرەز دەرد و غەم (٦)**

(٥) ئەم بەیتە لـە (مان، ق)دا نیـە.

واتای نیوەی یەکەمی ئاشکرایە، واتە: هەموو کۆمەڵی عەرەب قەیسی عامیرین و شەیدای باڵای تـۆی وەك لەیلان. هەموو خەڵکی عەجەمیش پێکەوە "شەمس"ی تەبریزیی تۆن بۆ پێداهەڵدان و تاریف‌کردنت.

(٦) حەسرەتا: داخەکەم. قەسیم: بەشکەر، خودا.

واتە: داخەکەم ڕۆژی ئەزەل خودا، جگە لـە دەرد و خەم، هیـچی‌تری نەکردە بەشی من.

بە غەیرەز (مان): "بغیراز". دەبێ وەها بخوێنرێتەوە وەك نووسراوەتەوە.

(غەم)، باشتر دەبوو (هەم) بووایە، تا دووبارە نەبووایەتەوە.

## -١٥- (*)

### (من كلام حافظ)

پووچە ناصیح، بە هەوای تەركت، ئەگەر لیٚدا دەم
دانەنیٚم ئەم سەرە تا لەم ڕەهە، زەحمەت لادەم
بە خودا تا دەمْرم گویٚ بە نەصیحەت نادەم
((فاش میگویم و از گفتهٔ خود دلشادم
بندهٔ عشقم و از هردو جهان آزادم)) (١)

لە حیجابی عەدەم، ئەو ڕۆژە كە من هاتمە وجوود
ویسعەتی خاكی دەرت خاطری كردم خۆشنوود
دووری خستم بە ستەم حاجیبی بەدبەختی حەسوود
((من ملك بودم و فردوس برین جایم بود
آدم آورد به دین دیرِ خراب آبادم)) (٢)

(*) ئەم پیٚنج‌خشتەكیە لە (مان، حا، نم)دا هەیە. سەرناوەكەی لە (مان)دا (من كلام حافظ)، لە (نم)یشدا (تەخمیس لەسەر شیعری حافظ)ە. سالم هەر ئەم سێ پیٚنج‌خشتەكیەی لەسەر سێ بەیتی پارچەشیعریٚكی "حافظ شیرازی" داناوە.

كیٚشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی ئەصلەم.

(١) واتە: ئەی یار! ئەگەر ئامۆژگاریكەر ئامۆژگاریم بكا و دەم لەوە بدا واز لە تۆ بهیٚنم، قسەیەكی پووچ و بیٚ‌مەعنا دەكا. من تا سەرم دانەنیٚم، زەحمەتە لە ڕیٚگای عیشقت لادەم. بە خودا قسەم، تا دەمرم گویٚ بەم جۆرە ئامۆژگاریە نادەم و بە ئاشكرا دەلیٚم و لە قسەی خۆم دلشادم. بەندەی عیشقم، ئیتر لە دنیا و قیامەتدا ئازادم و حەقم بەسەر هیچەوە نیە.

بە خودا تا دەمرم (نم): بە خوا تا ئەمرم.

(٢) ئەم بەندە و بەندی پاشەوەی لە (حا، نم)دا پاش و پیٚشن.

واتە: ئەو ڕۆژەی كە لە پەردەی نەبوونەوە هاتمە دنیای بوون، فراوانیی دەوروبەری دەرگانەت دلی خۆش كردم، بەلاٚم قاپیەوانی ڕژدی بەدبەخت بە ستەم دووری خستمەوە. من فریشتە بووم و بەهەشتی بەرین جیٚگەم بوو، ئادەم هیٚنامیە ئەم كاولە ویٚرانەیە!

**دێتە خول دڵ لە پەڕەی سینە بە ئەفسانەیی عیشق**
**ئابەدانیی خەفەتە خانەی وێرانەیی عیشق**
**ڕەنگە هەر بێم و بەرم سوجدەیی شوکرانەیی عیشق**
**«تا شدم حلقەبەگوش در میخانۀ عشق**
**هردم آید غمی از نو بە مبارکبادَم» (٣)**

«بە دین» لە لای حافظ «در این»ە.

(٣) واتە: دڵ بە ئەفسانەی عیشق لە سینەمدا دەسووڕێتەوە، کەلاوە و وێرانەی عیشق بە خەم و خەفەت ئاوەدانە. لەوانەیە بێم و کوڕنووش بۆ عیشق بەرم، چونکە ئەوەتی بوومەتە بەندە و ئەڵقەلەگوێی مەیخانەی عیشق، هەر تاوە نا تاوێ خەمێك دێت و پیرۆزبایی ئەو بەندەییەم لێ دەکا و دەڵێ ئەم مەیخانەیەت لێ پیرۆز بێ!

خەفەتە خانەیی (نم): خەفەتخانەیی. هەڵەیە.

## -١٦- (*)

بۆ وجوودی منی بێخود، نییەتی حوکمی عەدەم
نەقدی سەرمایەیی عومرم کە هەموو صەرفە لە غەم (١)
خوێن لە زەخمی موژە، هەنگامی تەڕەححوم، دەڕژێ
دامەنی دڵ پڕی یاقووتە لە ئیمایی کەرەم (٢)
ڕەغبەتی من لە جەفای یارە لە هەنگامی صەفا
نۆشی ئولفەت نییەتی لەذذەتی ئێشانی ستەم (٣)
بولبولی دڵ کە جودا ماوە لە گوڵزاری ڕوخت
هەر پەرێشانە، ئەگەر بیبەمە ناو باغی ئیرەم (٤)
تا بە لەیلایی عەرەب مایلە، مەجنوونی دڵم
صەعبە خوڕڕەم بێ لە هیجرا بە ظەریفانی عەجەم (٥)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ق)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) واتە: کە من نەقدی هەموو سەرمایەی تەمەنم سەرفی خەم بێ و لە پێناوی خەمدا بڕوا، ئیتر بۆچی بوونی من وەك نەبوون نەبێ؟ بە کورتی: کە تەمەنم هەمووی سەرفی خەم بوو، بوون و نەبوونم وەك یەکە.

نییەتی (ق): هەیەتی.

(٢) ئیما: ئاماژە بە چاو.

واتە: لە کاتێکدا بەزەییت پێمدا دێتەوە و نیگایەکم تێ دەگری، خوێن لە زامی برژانگت دەڕژێ و داوێنی دڵ، کە کەوتووەتە بەر تیری نیگات، پڕ دەبێ لە فرمێسکی سووری وەك یاقووت.

یاقووتە (ق): ئەڵماسە.

(٣) واتە: من کاتی خۆشی زیاتر حەز لە ستەمی یار دەکەم، نۆش و هەنگوینی دۆستایەتی تامی خۆشیی ئازاری ستەمی نییە!

(٤) واتە: مادام بولبولی دڵ لە گوڵزاری ڕوخسارت جیابووەتەوە، بیبەمە باخی ئیرەمیش هەر ناحەسێتەوە و خەیاڵی پەرێشانە.

ناو (ق): نێو.

(٥) خوڕڕەم: دڵخۆش.

**موورغی باغی حەرەمی تۆیە دڵم، لێی مەدە تیر**
**بێغەمانە بە ستەم مەکوژە وەها، صەیدی حەرەم (٦)**
**سوویی من مایلە دڵدار و ڕەقیبم لە حەسەد**
**بەسکی ڕەشکی هەیە، نەزدیکە کە بدڕێ بە وەرەم (٧)**
**جۆگەیی خوێنی سروشکت، چ بوو "سالم!"، نەبڕا**
**ڕەگی چاوت لە نەظەردا بووە شیریانی بەقەم (٨)**

واتە: تا دڵی وەك مەجنوونی عامیریم حەزی لە لەیلای عەرەب بێ، گرانە کاتی دووریی لە یارەوە بە قسەی خۆشی نوکتەزانەکانی عەجەم دڵخۆش بێ!

لە هیجرا (ق): ئیتر ئەو.

(٦) واتە: دڵم باڵندەی باخی حەرەمی ڕوخساری تۆیە، تیری لێ مەدە، دڵڕەقانە و بە ستەم نێچیری حەرەم مەکوژە. ڕاو –بەپێی ئایینی ئیسلام– لە خاکی حەرەمی پیرۆزی کەعبەدا ناکرێ و باڵندەکان ئازادن.

(٧) واتە: دڵی دڵدار مەیلی لای منە. بەدکاری ڕژدیش ئەوەندە پێی ناخۆشە، خەریکە وەرەم پەیدا بکا و شەق بەرێ.

وەرەم (ق): درەم.

(٨) شیریان: دەماری خوێنبەر. بەقەم: ڕەنگی سوور.

واتە: ئەوە چییە خوێنی فرمێسکت هەر وشکاوی نەهات؟ ڕەگی چاوت لە بەرچاودا وەك ڕەگی پڕخوێنی سووری لێ هاتووە.

شیریانی (ق): کووتاڵی.

(*) -١٧-

بۆ خاڵی لەبت زوڵفی سیەه دامە هەموو دەم
کونجوشکی هەوەس لەم ڕەهە ناکامە هەموو دەم (١)
دڵ صوبحی نەجاتی نییە بۆ جەبهە لە ڕێی زوڵف
ئەم طوڕڕەیە، تاسەر بە ئەبەد، شامە هەموو دەم (٢)
حەبسی منی ئەیمەنشودە بەس دوورە لە ئینصاف
ئەم مورغە، بەبێ قەید و قەفەس، ڕامە هەموو دەم (٣)
عاشق لە دڵ و دیدەیی ئەغیاری جەفاکار
ڕیسواوو ئەلەمدیدەوو بەدنامە هەموو دەم (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، ف، غ، ج، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

(١) سیەه: ڕەش. کونجوشك: چۆلەکە. ڕەه: ڕێگە.

واتە: زوڵفی ڕەشت بە دەوری دانەی خاڵی لێوتدا داوە، چۆلەکەی ئارەزوو لەم ڕێگەیەدا هەرگیز ناگاتە مراز؛ یا دەبێ نزیك نەبێتەوە، یان دەبێ گیرۆدەی داو بێ، بەڵام داوەکە خۆشە. دڵی سالم هەمیشە هێلانەی لەنێو زوڵفی یاردا کردووە!

کونجوشکی هەوەس (کم، گم): کونجشك‌صیفەت. بەم حیسابە کێ ناکامەکەیە. بەپێی (مان) هەوەس ناکام بوو.

(٢) واتە: دڵ لە ڕێی زوڵفدا هەرگیز ڕۆژی لێ نابێتەوە و شەفەقی ڕزگاریی لێ هەڵنایێ، یانێ ڕوومەتی یار نابینێ. زوڵفی یار هەمووی هەمیشە شەوی تارە.

لە ڕێی زوڵف (ف، غ، ج): لە زوڵفا.

(٣) ئەیمەنشودە: مەبەست ڕام و دەستەمۆ وماڵییە کە خاوەنەکەی لە ڕاکردنی ئەمینە.

واتە: بەندکردنی منی ڕام و ماڵی لە ئینسافەوە دوورە، چونکە ئەم باڵندەیە -واتە من- هەمیشە بێ داو و زنجیر ماڵی و دەستەمۆیە و هەرگیز ڕاناکا.

حەبسی (کم): حەپسی. ئەیمەنشودە بەس (ف، ج، کم، گم): ئەیمەن بە خودا.

(٤) ئەم بەیتە لە (حا)دا نییە.

واتە: عاشق بە هۆی دڵ و چاو و ڕەقیبی نامەردەوە ئابرووی چووە و ناوی زڕاوە، ئازاردیوە و بەدناوە. ناوی لەبەر گریانی نەبڕاوەی چاوی زڕاوە و دڵی ئازاردیوە، بەهۆی ڕەقیبیشەوە بەدناوە.

**بێهوودە دەبەی دەستی طەمەع بۆ سەری گێسوو**
**"سالم!" بە سەرت، ئەم هەوەسە خامە هەموو دەم (٥)**

دیدەیی (عا، غ): دیدەوو. ئەلەمدیدەوو (گم): ئەلەم دیدەیی. بەدنامە (کم): بەرنامە. هەڵەی چاپە.

(٥) بێهوودە: بێسوود. گێسوو: ئەگریجە، زوڵف. بە سەرت: بە سەرت قەسەم. خام: کاڵ.

واتە: سالم! تۆ بێسوود دەستی تەماع بۆ زوڵفی یار درێژ دەکەی، چونکە دەستت نایگاتێ. بە سەرت قەسەم، ئەمە هەمیشە ئارەزوویەکی کاڵ و خەیاڵێکی خاوە.

## (*) -١٨-

له دڵدا چونکه هەر خوێنم دەخوا غەم
بە تەدریج ئەشکی خوێنینم دەکا کەم (١)
سەمەك دێنێتە جونبوش ئەشکی شۆرم
مەلەك دەگری لەبەر تەئثیری ناڵەم (٢)
خەیاڵیشی وەکوو خۆی وەحشە، دڵبەر
نەفەس دەگرم له دڵما، نەك بکا ڕەم (٣)
بەنەفشە کەوتە ژێر سونبول لەسەر گوڵ
کە تێکەڵ بوو، له صوبحا، زوڵف و پەرچەم (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، غ، ڕ، کم، گم)دا هەیە.
کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) واتە: لەبەرئەوەی خەم هەمیشە خوێنی دڵم دەخوا، وردە وردە فرمێسکی خوێنینم کەم دەکا. بەوپێیە، بەشی چاو لە خوێنی دڵ نامێنێ کە بە شێوەی فرمێسك بیرێژێ، خەم هەمووی دەخوا.
چونکه (کم): چونکی.

(٢) سەمەك: مەبەستی ماسیی (گاو و ماهیـە)، کە بلەرێتەوە -دەڵێن- دنیا کاول دەبێ! دیارە ماسیی عادەتی بۆ شوێنەکە ناشێ. سالم دەیەوێ بارودۆخی خۆی بە هەموو جیهانەوە ببەستێ.
واتە: فرمێسکی سوێرم ئەوەندە زۆرە، لەوانەیە ماسی بهێنێتە لەرزە و دنیا کاول ببێ. فریشتەیش کە هەرگیز گریان و پێکەنینی نییە، ڕەنگە لەبەر ناڵەی بەسۆزم بگری!
شۆرم (کم، گم): سوورم. تەئثیری (عا): تەئسیری.

(٣) ئەم بەیتە لە (حا، عا)دا نییە.
ڕەم: سڵ‌کردنەوە، ڕاکردن.
واتە: یار هەر وەك خۆی سڵە و هەرگیز دەستەمۆ نابێ، خەیاڵەکەیشی وەها سڵە. لەبەرئەوە کە یار دەهێنمە خەیاڵم، هەناسە نادەم، نەبادا پێم بزانێ و ڕابکا.
خەیاڵیشی (غ): خەیاڵیش. وەحشە (غ): وەختە. هەڵەی نووسینە.

(٤) بەنەفشە: وەنەوشە. گوڵ: مەبەست ڕوخساری یارە.
واتە: وەنەوشە لە بەیانیاندا پێش شانەکردن کەوتە ژێر سونبول، هەردووکیان لەسەر گوڵی ڕوو لەت بوون. دیارە مەبەستی لە وەنەوشەکە پەرچەمی یارە (مووی پێشانی) و لە سونبول زوڵفە.

**نیهان نەکرا کەبابی دڵ لە ئەغیار**
**چ زوو تەشخیصی دا بۆنی هەناسەم! (٥)**
**لە دڵمایە حەجی کەعبەی خەیاڵت**
**سەقای چاوم دەگێڕێ ئاوی زەمزەم (٦)**
**ڕوخت بۆ مووسەیی دڵ ئاتەشی طوور**
**دەمت بۆ دەردی من عیسایی مەریەم (٧)**
**دەزانم دێتە سەر چی کاری "سالم"**
**فەریبی چاوەکەت دەیکاتە بەلعەم (٨)**

بەنەفشە.. تاد (کم، گم): بنەوشە کەوتە بابی دڵ لە ئەغیار! (ق): بەنەفشە کەوتە ژێر سونبول لەبەر گوڵ.

(٥) واتە: کە دڵ برژا و بوو بە کەباب، لە خەڵك نەشاردرایەوە و زانییان کەبابی عادەتی نییە. بۆنی کزەی هەناسەم چ زوو ناسرایەوە؟ دیارە بۆنی هەناسەی سالم بۆکڕووزی کەبابی دڵیەتی.

(٦) واتە: بە دڵ، بە خەیاڵ حەجی کەعبەی ڕوخسارت دەکەم. چاوم بووەتە ئاوگێڕ، ئاوی فرمێسکی کە وەك ئاوی زەمزەم سوێر و بەبەرەکەتە، بەسەر حاجییاندا دەگێڕێ. دیارە فرمێسکی عاشق لای عاشقان پیرۆزە!

خەیاڵت (ق): ویصالت. سەقای (کم): سەقایی. هەڵەیە. دەگێڕێ (کم): دەگری. (گم) دەگرێی. هەردووکیان هەڵەن.

(٧) مووسەیی: مووسایی. دەم: هەناسە.

واتە: ڕوخسارت وەك ئاگرەکەی کێوی (طوور)ە، کە مووسای بێهۆش خست، بۆ بێهۆشکردنی دڵم. هەناسەیشت وەك فووەکەی عیسای کوڕی مەریەمە، بۆ زیندووکردنەوە و بووژاندنەوە و لابردنی دەردم.

مووسەیی= مووسای (مان، گم): موسی، وا مەبەست بووە کە ئێمە لێرەدا نووسیومانەتەوە، تا نیوەبەیتەکە لەنگ نەبێ. دەردی من .. تاد (غ، ڕ): حاڵی من عیسایی مەریەم. (کم، گم): حاڵی من عیسا و مریەم.

(٨) ئەم بەیتە لە (حا، عا)دا نییە.

بەلعەم: بەلعەمی کوڕی باعوور، خوداپەرستێکی گاور بووە لە زەمانی حەزرەتی عیسادا، شەیتان لە خشتەی بردووە و لە دینی وەرگێڕاوە.

واته: دەزانم دواییی سالم بە چی دەگا، فێڵی چاوە جادووەکانت ئاخری دەمکاتە بەلعەمی کـوڕی باعوور و لە دینم وەردەگێڕێ.

چاوەکەت دەیکاتە (کم، گم): چاوی تۆ دەیکا بە. خۆزگە (دەمکاتە) بووایە.

-١٩- (*)

بۆ ڕەواجی قەلبی بێقیمەت، منم صەڕڕافی غەم
ڕەنگی زەردم سیمی صافە، قەطرەیی ئەشکم درەم (١)
شۆڕشی دەریایی ئەشکم بۆ هیلاکم هاتەوە
تەن لە گەردشدایە وەك کەشتی لەسەر گەردابی یەم (٢)
بۆ نیگاهی مەرحەمەت ئیستادەوو گەردەنکەچم
وەك گەدای موفلیس لە ڕێی مونیعم بە ئوممێدی کەرەم (٣)
نەقدی جان و دڵ دەدەم، بەیعەن، بە بۆسەی ئەوجیهان
لەم جیهانە گەر بقەبڵێنێ بە دڵ طوڕڕەی سەلەم (٤)
حەیفە "سالم" لەم دەرە بکوژی بە پەیکانی نیگاه،
خاریجی ئەرکانی دینە کوشتنی صەیدی حەرەم (٥)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ق)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) واتە: منم خەم دەگۆڕمەوە بۆئەوەی دڵی بێنرخم ڕەواج پێ بدەم، ڕەنگی زەردم زیوی سافە و دڵۆپی فرمێسکم درهەمە.

(٢) گەرداب: گێژاو، گێژی ئاو.

واتە: شۆڕشی دەریای فرمێسکم دووبارە هاتەوە بۆ لەناوبردنم، لەش وەك کەشتیی سەر گێژاوی دەریا لە سووڕانەوەدایە.

(٣) واتە: بۆ چاوتێگرتنێکی پڕ لوتف ڕاوەستاو و ملکەچم، وەك گەدای بێ پارە و پوول کە بە تەمای بەخششی خاوەننیعمەتان، لە چەقی ڕێگەدا ڕاوەستاو و ملکەچە.

(٤) ئەم بەیتە لە (ق)دا نییە.

سەلەم: پێشفرۆش‌کردن بە نرخێکی کەمتر. بقەبڵێنێ: بخەملێنێ، مەزەندە بکا.

واتە: ئەگەر یار لەم دنیایەدا ڕازی بێ دڵ بە قەواڵەی سەلەم بقەبڵێنێ و قوبووڵی بکا، دراوی دڵ و گیانمی پێ دەفرۆشم بەرامبەر بە ماچی ئەودنیا!

(٥) واتە: ستەمە و بێڕەحمییە سالم لە بەردەرگای خۆت بە تیری چاوت بکوژی، نێچیر بەپێی ئایینی ئیسلام نابێ لە خاکی حەرەمدا بکوژرێ. دیارە دەوروبەری ماڵی یار لای سالم، حەرەمی کەعبەی بابەتی عیشقە.

-٢٠- (*)

**حیسابی نەفحەیی زوڵفت لەگەڵ موشکی خەتا ناکەم**

**خەطا ناکەم، صەبا شاهیدمە، من تەشبیهی وا ناکەم! (١)**

**بزانم گەر لە قەبرا بۆی دەمی تیغت لە خاکم دێ،**

**هەتا دەمرم لە دونیا زەخمی خوێنینم دەوا ناکەم (٢)**

**لە دورجی سینەما تا گەوهەری یادی ڕوخی تۆ بێ،**

**لەبەر شوعلەی ئەوا شەو تا سەحەر مەیلی چرا ناکەم (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، ه، غ، ج، ق، ڕ، کم، نم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتی تەواو.

(١) خەتا: شارێکە لە چین بە میسکی بۆنخۆش ناودارە. وا: وەها.

واتە: هەرگیز بۆن و بەرامەی زوڵفت لەگەڵ بۆن و بەرامەی میسکی خەتا بەراورد ناکەم. هەڵەی وەها ناکەم. بای سەبا شایەتمە کە من شوبهاندنی وەها ناکەم، ئەو لە بۆنی هەردوو لایان شارەزایە و دەزانێ هی تۆ خۆشترە.

نەفحەیی (مان، حا، ه، ف، ق، نم): نەفخەیی. هەڵەیە. (کم): نەغمەیی. خەتا (مان): خەطا. هەڵەیە. من تەشبیهی وا (نم): تەشبیهی وەها.

(٢) ئەم بەیتە لە (ه)دا چوارەم و لە (ق)یشدا سێیەمە.

واتە: ئەگەر بزانم لە گۆڕدا بۆنی دەمی تیغت لە خاکی گۆڕم دێ، تا دەمرم تیماری زامی خوێنینم ناکەم. با زام و خوێن هەمووی بچێ بۆ ناو گۆڕ و بۆنەکەت بەسەرمدا بێ. با خەڵك بزانن من شەهیدی تیغی تۆم، یا با زوو بمرم.

بزانم گەر لە قەبرا بۆی دەمی تیغت لە خاکم دێ (عا): بزانم لە قەبرا بۆ دەمی تیغت لە خاکم دێ. هەڵەیە. (ه): بزانم گەر لە حەشرا بۆی دەمی تیغت لە جەرگم دێ. (ق): بزانم گەر لە قەبرا بۆی تیغت لە خاکم بێ. زەخمی (ه): زامی.

(٣) ئەم بەیتە لە (ه)دا دووەم و لە (ق)یشدا پێنجەمە.

دورج: قوتووی متومووروروی بەنرخ.

سالم، یادی ڕوخساری یاری بە گەوهەری شەوچراغ شوبهاندووە، ئەم یادەیش هەمیشە لە دڵ و سینەیدایە.

**هەناسەی حەسرەتی وەصڵی نیهانیت ڕێی بە نەی نادەم**
**((مَعَاذ الله)) بە لەب ئەم سیڕڕە هەرگیز ئاشنا ناکەم (٤)**
**لە صەحرای شۆڕەزاری عیشقی جانانا گـْیاهێکم**
**بەبێ بارانی تیری غەمزە، قەت نەشئوونوما ناکەم (٥)**
**بە خڵخاڵ ئەر بشێ پیشەی هەرەسکووبیدەیی هیجرت**
**لە لەبما تا نەفەس مابێ سوراغی مۆمیا ناکەم (٦)**

واتە: تا گەوهەری یادی ڕوومەتت لەناو قوتووی سینەمدا بێ، من لەبەر ڕووناکیی ئـەودا تـا بـەیانی حەز لە چرا ناکەم.

شەو (ق): تاکو. نوختەکانی (تا) لە (عا)دا کەوتووە.

(٤) ئەم بەیتە لە (ق)دا هەشتەمە و لە (هـ)یشدا نییە.

نەی: شمشاڵ.

واتە: هەناسەی خەم و خەفەتی نائومێدیم لە گەیشتن بە تۆ کە خەمێکی نهێنییە، هـەرگیز نـاهێڵم بگاتە شمشاڵ. من ناهێڵم لێو بەم نهێنییەم بزانێ، چ جای شمشاڵ!

نیهانیت (حا، عا، ف، ج، ڕ، کم، نم، گم): نیهانت. بە نەی نادەم (گم): بەنی ئادەم!

(٥) ئەم بەیتە لە (ق)دا چوارەمە.

شۆڕەزار: خاکی خوێدار کە بە کەڵکی کشتوکاڵ نایێ، شۆڕەکات. جانان: دڵبەر. گیاه: گیا.

سالم تیربارانی برژانگی یاری بە باران شوبهاندووە، دەڵێ: من گیایـەکم لـە دەشـتی شـۆڕەکاتی عیشقدا، بەبێ بارانی تیری برژانگ نابووژێمەوە.

صەحرای (حا، عا): سەحرای. (هـ): وادیی. جانانا (حا): جانانە. قەت (عا) قەد.

(٦) ئەم بەیتە لە (ف، ق)دا نییە.

خڵخاڵ: ئەڵقەی ئاڵتوون و زیو کە ئافرەت لە پێی دەکا.

سالم دەڵێ: ئەگەر ئێسقانی شکستەی ئەندامم کە هەرەسی دووریت بەسەریدا هاتووە و وردوخاشـی کردووە، بە کەڵکی ئەوە بێ بکرێتە خرخاڵی پێت، تا هەناسە بـە لێومـدا بێـت و بـە سـەر زینـدوو بم، بەدوای مۆمیادا ناگەڕێم تا ئێسقانم چاك بکەمەوە؛ با هەر شکاو بێ و یار بۆ خرخاڵ بەکاری بهێنێ.

بشێ پیشەی (هـ): بێتە یاد. (کم): شبی پیشە. (گم): شەبی پێت (گم) خۆی نووسیویە ((بـۆی ساغ نەبووەتەوە)). هەرەسکووبیدەیی (هـ): گویندەیی. هەڵەیە. (کـم، گـم): فـەرەس کوبیـدەیی. (عا): هەر. ئەمیش هەر (هەرەس) بووە و سینەکەی کەوتووە. لە لەبما (کم، نم، گم): بە لەبما.

**دەبێ ئەشکت ترازووی ئارەزوو، ئەی دیدە!، بڕژێنێ**
**لە بەرما تا نەبێ دەریا، بە کامی دڵ شەنا ناکەم (٧)**
**لە هیجرانا سەحەر وەختێ «فنا في النور»ی چیهرەت بم**
**لەبەر طاقی برۆی تۆ، ڕوو لە میحرابی دوعا ناکەم (٨)**
**دەمی قوربت لە پشتی سەر ئەجەل گەر دامەنم بگرێ،**
**وەها مەحْوم دەکا دیداری تۆ، ڕوو بۆ قەفا ناکەم (٩)**
**لە طوولی ظوڵمەتی هیجرا سەراسەر چونکە تۆی مەطڵەب**
**لە ذەوقی بۆسەیی لێوت هەوای ئابی بەقا ناکەم (١٠)**

(٧) ئەم بەیتە لە (ق)دا شەشەمە، لە (مان، حا، ھ)دا نییە.

بەیتەکە لە بەر ڕووناکیی (عا)دا نووسرایەوە. نیوەی دووەمی واتاکەی ئاشکرایە، بەڵام گونجانی نیوەی یەکەم لەگەڵ هی دووەم ڕوون نییە، واتاکەی نازانین. تێکڕا واتە سالم دەیەوێ لە دەریای فرمێسکدا مەلە بکا، بۆیە داوا لە چاوی دەکا ئەوەندە فرمێسك بڕێژێ کە بە ترازوو بە ئەندازەی ئارەزووی ئەو بێ. ئەگەر وا نەبێ، بە ئارەزووی دڵ مەلەی بۆ ناکرێ.

ئەشکت ترازووی (غ): ئەشك ترازووی. (کم، ق): ئەشکی تراروزی. (نم): ئەشکی ترازووی (گم): ئەشکی تەرا ئەر روزی. (گم) لە پەراوێزیشدا باسی ڕاستنەبوونەوەی نیوەبەیتەکەی کردووە.

ئەی دیدە (نم): ئەیدە. هەڵەی نووسینە.

(٨) ئەم بەیتە لە (ق)دا حەوتەمە.

واتە: لە کاتی دووریی تۆدا کە بەرەبەیان «فنا في النور»ی ڕوخسارت و نوقمی دەریای بیرکردنەوە لە جوانیی ڕوومەتت دەبم، مادام لە حاڵی فەناکەدا بەرامبەری تاقی برۆی تۆم، ئیتر ڕوو لە میحرابی دوعا و نزا ناکەم و تاقی برۆی تۆ میحرابمە. سالم وەك سۆفییان لە حاڵی فەنادایە، بەڵام فەناکەی ئەم لە جوانیی ڕوخساری یاردایە.

وەختێ (کم، نم، گم): وەختە! برۆی تۆ (عا): برۆت. لەنگە.

(٩) ئەم بەیتە لە (ق)دا نۆیەمە.

واتە: لە کاتێکدا لێت نزیك بم، ئەگەر مەرگ لە پشتی سەرەوە داوێنم بگرێ و قەستی سەرم بێ، دیداری تۆ وەها بێهێز و ناتوانام دەکا کە نەتوانم بەرەو پشت وەرچەرخێم و خۆم لە مەرگ ڕزگار بکەم.

لە پشتی (ڕ): لە بشتی. هەڵەیە. دەکا (کم، نم، گم): ئەکا.

(١٠) ئەم بەیتە لە (ق)دا دووەمە و لە (ھ)یشدا نییە.

**ڕەها بێ گەر لە بەندی زوڵفی یارا گەردنم، سالم**
**بە سەهلی «بعد ازین» بازی بە حەلقەی ئەژدەها ناکەم (١١)**

واتە: لە درێژایی تاریکیی دووریتدا، چونکە هەر تۆی مەبەست، لەبەر تامی ماچی -بە خەیاڵی- لێوت حەز لە ئاوی زیندەگانی ناکەم، ئەگەرچی ئاوی زیندەگانیش لە تاریکستاندایە.

ئابی بەقا (کم، نم، گم): ئاوی بەقا.

(١١) ڕەها: ڕزگار و بەڕەڵا. بعد ازاین: دوای ئەمە. بازی: یاری.

واتە: ئەگەر ئەمجارە بە سەلامەتی لە داوی زوڵفی یار ڕزگار بم، تۆبە بێ ئیتر جارێکیتر پاش ئەم گیرۆدەییە یاری بە پێچ و چین چینی ئەژدەها ناکەم، جارێکیتر خۆم تووشی داو ناکەمەوە. دیارە مەبەست لە (حەلقەی ئەژدەها) چین‌چینی زوڵفی یارە. ئەم ئاواتەی سالم هەرگیز نایێتە دی، ئەو هەتا دەمرێ و لە گۆڕیشدا عاشقە، ئیتر ڕزگار بوونی چی؟!

بێ (عا): نابێ. هەڵەیە و لەنگ دەبێ. بەندی (ه): طوڕڕەی. گەردنم سالم (ه، ق): گەردنی سالم. (کم، نم): گەردنی من. (گم): گەردەنم ئەمجار. بازی (ڕ): باری. هەڵەیە.

دواین‌بەیت لە نوسخەکانی (ف، ج، کم، گم)دا، ئەم بەیتەی لای خوارەوەیە و لە ڕاستیشدا بەیتێکی جوانە:

ڕەها بێ، گەر دڵی "سالم" لە چنگی چاوی شاهێنت
بەجوز کونجی قەفەس، هەرگیز وجوودم ئاشنا ناکەم

واتە: ئەگەر ئەمجارە دڵی "سالم" لە چنگی چاوی بازت بەرەڵا بێ، جگە لە کونجی قەفەس هەرگیز خۆم فێری هیچ شوێنێکیتر ناکەم.

## (*) -٢١-

**به من بێ سینەیی سەختم بە قەڵغانی نەظەر ناکەم**
**نیشانەی تیری خوونڕێزت بەجوز لوختی جگەر ناکەم (١)**
**دەمی نازت، بە ڕووسەختی، کە تابی تیری غەمزەم بوو**
**لە ڕێی تیغی جەفاتا ((بعد ازین)) جەوشەن لەبەر ناکەم (٢)**
**لە تاو شانەت لە چینی زوڵفتا دڵ حەلقەهای لێ دا!**
**خودا گەر وا بدا قودرەت بە من، کەس دەربەدەر ناکەم (٣)**
**ئەگەر پایانی بێ هیجرت، لە دەرگاتا هەتا دەمرم**
**بە مەحضی جەوری حاجیب، یەك وەجەب مەیلی سەفەر ناکەم (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، غ، ق، کم، نم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) خوونڕێز: خوێنڕێژ. جوز: جگە لە. لوخت: ڕووت.

واتە: بە دەست من بێ سینەی سەختم، کە هیچ نایبڕێ، ناکەمە قەڵغانی تیری ڕوانینت، نەبادا تیرەکە وردوخاش بێ! هەر جگەری ڕووتم دەکەمە نیشانەی تیری خوێنڕێژت، تا باش کونکونی بکا.

خوونڕێزت (ق): خوێنڕێژت.

(٢) جەوشەن: کراسی زرێ کە لە جەنگدا بەکاردەهێنرا.

واتە: من مادام لە کاتی نازی تۆدا بەرگەی تیری غەمزەتم گرت، ئیتر لەمەوپاش بەرامبەر بە تیغی جەفا و ستەمت هەرگیز کراسی زرێ لەبەر ناکەم و بەرگەت دەگرم. بە کورتی، من کە بەرگەی تیری نازت بگرم، بەرگەی تیری ستەمیشت دەگرم. زۆر جوانە.

((بعد ازین)) لەبەر کێش بە ((بەعدەزین)) دەخوێنرێتەوە.

(٣) لە تاو: لە ترس. حەلقەهای لێ دا: خۆی پێچ و لوول دا، پاپۆکەی خوارد.

واتە: دڵم کە لەناو چینی ئەگریجەتدا خۆی حەشار داوە، لە ترسی ئەوەی بەدەم شانەتەوە دەربەدەر بێ، خۆی پێچ دەدا. تۆ بۆ ئەوەندە ستەمکاری؟ خودا ئەگەر دەسەڵاتی وەها بە من بدا، کەس دەربەدەر و سەرگەردان ناکەم، کەچی تۆ بەم هەمووە دەسەڵاتەوە دەربەدەرم دەکەی.

لەتاو شانەت (کم، نم، گم): لە ناوشانت. (ق): لەناو شانەت.

(٤) حاجیب: دەرگاوان. وەجەب: بست.

**لە ڕەشکا گەر سەراسەر نوطقی تووتی بێتە سەر هەجْوم**
**لەسەر مەدحی لەبی شیرینی تۆ، وەصفی شەکەر ناکەم (٥)**
**لە فەردی وەصفی یارا، عارە ناوی موددەعی بردن**
**لە ڕشتەی فیکرما خەرموهرە هەمسیلکی گوهەر ناکەم (٦)**
**لە یاقووتی لەب ئەر یەك بۆسە مایەم دی، دەمی ئاخر**
**تەلەف کەم گەر سەر و ماڵم، لە سەوداتا، ضەرەر ناکەم (٧)**

واتە: ئەگەر دڵنیا بم، تا لە بەردەرگاتدا دەمرم دووریت دوایی دێت، بە تەنها ستەم و پاڵپێوەنانی دەرگاوانەکەت، هەرگیز بەقەدەر بستێ ئارەزووی سەفەر ناکەم و ئاستانەت بەجێناهێڵم. مادام دووریت دوایی دێت، با لە بەردەرگاتدا بمرم.

(بێ)ی (پایانی بێ) لە (غ)دا کەوتووە. جەوری حەبیب (غ): حەربە صاحێب.

(٥) ڕەشك: حەسوودی. هەجوو: داشۆرین.

واتە: ئەگەر سەراسەری قسەی تووتی لە داخ و حەسوودیی پێداهەڵدانی لێوی شیرینی تۆ ببێتە مایەی داشۆرینم، هەرگیز ستایشی شەکر ناکەم، کە ئەو حەزی لێ دەکا و خۆشی دەوێ! پوختەی قسە، شیرینیی شەکری لەمەڕ تووتیی کەودەن، کەی دەگاتە شیرینیی لێوی یاری منی عاشق؟!

تووتی (مان): طوطی. بێتە سەر (غا): بێتە بەر. لەسەر مەدحی لەبی شیرینی تۆ (کم): لە مەدحی لێوی شیرینی تۆ. (نم): لە مەدحی لەبی شیرینیت، ئیتر. (گم): لە مەدحی لێوی شیرینی تۆ من.

(٦) فەرد: مەبەست تاکە بەیتە. ڕشتە: هۆنراوە. خەرموهرە: مووروەکەرانە، مووررووی شین و گەورە کە دەکرێتە ملی کەر! هەمسیلك: هاوڕشتە، دوو شت کە بەیەکەوە بهۆنرێنەوە.

واتە: لە بەیتێکدا کە بۆ پێداهەڵدانی یاری بنووسم، باسی ناحەزیی بەدکار ناکەم، شوورەییە ناوی لە شیعری وەهادا بهێنم. من هەرگیز ناوی مووررووەکەرانە (بەدکار) لەگەڵ گەوهەری ناوی یار لە هۆنراوەی بیرمدا ناهۆنمەوە.

فیکرما (گم): فکری ما. هەڵەیە.

(٧) واتە: ئەگەر مایەم لە یاقووتی لێوت لە دوا هەناسەی ژیانیشمدا یەك ماچ بێ، سەر و ماڵیشمی بۆ دانێم، هێشتا زەرەر ناکەم.

(لەب ئەر) لەبەرکێش بە (لەبەر) دەخوێنرێتەوە.

لەب ئەر یەك بۆسە مایەم دی، دەمی ئاخر (کم، نم، گم): لەب ئەر یەك بۆسە مایەم بێ. زۆر جوانترە. (ق): لەبت وەڵڵا ئەگەر یەك بۆسە مایەم دی.

**لەگەڵ دڵ شەرطە "سالم" گەر نەجاتم بێ لە (تاران)ا**
**بەهەشت ئەر بێتە دەشتی (ڕەی)، بە ئێرانا گوزەر ناکەم (٨)**

(٨) ڕەی: تاران.

واتە: لەگەڵ دڵی خۆم مەرجم کردووە، ئەگەر لە شاری تاران ڕزگار ببم و لێـی بـچمە دەرێ، بەهەشت بەو خۆشییە کە هەیە، بێتە -(ڕەی)ی لای تارانیش، جارێکیتر بە ئێراندا تێناپەڕم.

دیارە سالم لەم بەیتەدا ئەوپەڕی بێزاریی خۆی لە غەریبی و لە تاران دەردەبڕێ، ناحەقیـشی نییـە، نامۆیی هەر نامۆییە!

تارانا (مان): طارانا.

## -٢٢- (*)

**له کونجی میحنەتا هەر شەو خەیاڵی وەصڵی دڵبەر کەم**
**وجوودم وا بە جاریێ دێتە جونبوش، وەختە پەڕ دەرکەم (١)**
**لە ئەووەڵ حەرفییا وەك دڵ لە کاغەذ بەر دەبێ ئاگر**
**ئەگەر شەرحی شەرارەی ناری هیجرت ثەبتی دەفتەر کەم (٢)**
**تەلاشی طەییی ڕاهی کەعبەیی کۆی یارە مەقصوودم**
**منی بێدەستوپیا، لازم کە پا بۆ ئەم ڕەهە سەر کەم (٣)**
**بە گێسوو چاکە زنجیرم بکا دڵبەر لە ڕووی موژگان**
**لە ڕوویا با منی دێوانە بەس ڕووی دڵ لە خەنجەر کەم (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لـە (مان، حا، عا، ق، کم، نم، گم)دا هەیە. بەپێی (دیوانی کوردی، بـەرگی یەکەم، ل٣٠٣-٣٠٤)، سالم کە لـە سلێمانییەوە چووەتە لای "کوردی" لــە دێـی (شـیوەکەڵ)، ئـەم شیعرەی بۆ نووسیوە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) واتە: هەر شەوێ لـە ناوجەرگەی مەینەت و پەژارەدا خەیاڵی گەیشتن بە یار بکەم، جەستەم وا دێتە جووڵانەوە، خەریکم لـە خۆشییاندا پەڕ دەربکەم، تا باڵ بگرمەوە و بچمە لای.

ڕستەی (پەڕ دەرکەم) زۆر کوردییە و جوانە، کینایەیە لـە ئەوپەڕی شادمانی.

وا بە جاریێ (گم): وایە جاریێ.

(٢) واتە: ئەگەر شەرحی بڵێسـەی ئـاگری دووری لــە دەفتـەردا بنووسـم، هـەر لــە سـەرەتای نووسینی یەکەم حەرفیدا ئاگر، وەك بەربووەتە دڵ، بەردەبێتە کاغەزەکەیش.

هیجرت (گم): هیجرەت.

(٣) ئەم بەیتە لـە (ق)دا چوارەمە.

تەلاش: هەوڵ و کۆشش. طەی: برین و پێچانەوەی ڕێگای دوور.

واتە: مەبەستی من برینی ڕێگای کەعبەی مەنزڵی یارە. جا من کە دەست و پـێم نییـە جموجـووڵی پێبکەم، دەبێ سەرم بکەمە پێ بۆ برینی ئەم ڕێیە. زۆر جوانە، بێدەستوپێیە و سەر دەکاتە پێ.

تەلاشی (مان): طەلاشی.

(٤) ئەم بەیتە لـە (کم، نم، گم)دا نییە، لـە (عا)دا پێنجەمە.

**له ئەفلاکی خەیاڵ کەوکەبی ڕووی یارە تا قوطبم**
**له ظوڵماتی شەوی هیجرا ڕەهی کۆی ئەو دەبێ دەرکەم (٥)**
**سەرئەفگەندەی حوضووری سەربوڵەندانی قیامەت بم**
**سەرم تا دانەنێم شۆری ویصالت گەر لە سەر دەرکەم (٦)**
**بە نەڕرادی فیراقت نەقدی جان ئاخر دەدۆڕێنم**
**بە خاڵی موهرەیی وەصڵت، ئەگەر صەد دەفعە شەشدەر کەم (٧)**

واتە: وا چاکە یار بە زوڵفی خۆی زنجیرم بکا و دوورم بخاتەوە لە ڕووی موژگان، تا ئیتر منی شێت بەس ڕووی دڵ بکەمە خەنجەری برژانگی یار! یانێ من شێتم و خۆم بەکوشت دەدەم، وا چاکە یار بە زوڵفی خۆی بمبەستێتەوە و لە کوشتن ڕزگارم بکا.

لە ڕووی (ق): بە ڕووی. لە خەنجەر (ق): بە خەنجەر.

(٥) ئەم بەیتە لە (ق)دا سێیەمە.

ڕەه: ڕێگا.

واتە: تا ئەستێرەی گەشی ڕوخساری یار لە ئاسمانی خەیاڵمدا ئەستێرەی ڕێنیشاندەرم بێ، لە تاریکیی شەوی دووریدا ڕێگای مەنزڵی یار دەردەکەم و دەیدۆزمەوە. ئەستێرەی (قوطب) بە شەو بۆ ڕێڕەو و دیاریکردنی مەبەست بەکەڵکە، چونکە سەر و خوار و ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوای پێ دەدۆزرێتەوە.

لە ظوڵماتی (کم، نم، گم): بە ظوڵماتی.

(٦) ئەم بەیتە لە (ق)دا حەوتەمە.

سەرئەفگەندە، کە لەبەر کێش بە (سەرەفگەندە) دەخوێنرێتەوە: سەرشۆڕ و خەجاڵەت. سەربوڵەندان: سەربەرزان.

واتە: ئەگەر شۆر و هەوای حەزکردن لە گەیشتن بە تۆ تا سەردانان و مردن لە مێشکم دەربکەم، شەرمەزار و سەرشۆڕی لای سەربەرزانی ڕۆژی قیامەت بم.

گەر (ق): ئەر.

(٧) ئەم بەیتە لە (ق)دا شەشەمە.

نەڕراد: نەردێنکەر، ئەوی نەردێن دەکا. موهرە: زار. شەش: شەش خاڵ کە لە زۆر جاردا بەکەڵکە، دووشەش زۆر بەکەڵکە، چ جای سەدجار دووشەش.

واتە: ئەگەر بە زاری گەیشتن بە یار سەد شەشدەر، یانێ سەد دووشەش دەربکەم و پێی دڵخۆش بم،

**قوبووڵی نرخی بۆسەی لەعلی ڕوممانیی لەبت ناکەی**
**لە ئەشکم پڕ بە دامانت، ئەگەر یاقووتی ئەحمەر کەم (٨)**
**لەسەر ئەم مەزهەبەم "سالم"! بە مەحظی ڕووبەڕووی مەطڵەب**
**وەکوو هیندوویی گێسوو هەر سەحەر تەعظیمی ئاذەر کەم (٩)**

ئاخری گیانم بەرامبەر بە نەردێنکەری جیابوونەوەت دەدۆڕێنم و بەرگەی ناگرم.

دەدۆڕێنم. (کم): ئەدۆڕێنم.

(٨) واتە: ئەگەر یاقووتی سوور لە فرمێسکم پڕی داوێنت بکەم، تۆ بۆ نرخی ماچێکی لێوی ئاڵڕەنگت وەری ناگری.

نا کەی (کم، نم، گم): ناکەم. هەڵەیە.

(٩) ئاذەر: ئاگر.

سالم قسەی لەگەڵ خۆی کردووە و وتوویە: لەسەر ئەو ڕێباز و ئایینەم کە هەموو بەیانییەك بە پەنامەکی ڕووبەڕووی مەبەست، کە ڕوخساری یارە، وەك زوڵفی ڕەش، ڕێز لە ئاگری ڕوخسار بگرم و کوڕنووشی بۆ بەرم. جێگەی دڵی سالم پێچی زوڵفی سیای دڵدارە، زوڵف هەمیشە سەری ڕێزی بۆ ڕوخسار دانەواندووە. دڵی سالمیش کە لەناو زوڵفدایە و نادیارە، بە پەنهانی و کەس نەدیدە، ئەو کوفرە دەکا و کوڕنووش بۆ ئاگری ڕوخسار دەبا!

مەزهەبەم (مان، ق): مەطڵەبەم. بێمەعنایە و دووبارەکردنەوەیەکی بێجێیە. (بە مەحظی) لە (مان)دا هەڵەیە و (بە مەحضی) ڕاستە. (حا، عا، کم، نم، گم): بە مەخفی. هەڵەیە. هیندوویی گێسوو (کم، نم، گم): هیندووی گیسووی. (ق): گیسوویی هیندووی.

## -٢٣- (*)

**موورادم حاڵی خۆمە گەر حەدیثی شۆری بولبول کەم**
**ئیشارەی ڕوویی تۆیە گەر بەیانی نازکیی گوڵ کەم (١)**
**بە میقراضی ئەجەل کۆتا بێ میثلی پەرچەمت عومرم،**
**لەسەر تەعریفی مووی زوڵفت، ئەگەر بێم وەصفی کاکوڵ کەم (٢)**
**ئەبەد ئاشوفتەخاطر بم لە هیجرانا هەتا دەمرم،**
**ئەگەر بێ زوڵفی موشکینت، لە باغا مەیلی سونبول کەم (٣)**
**بنێرێ یاری شیرینم، ئەگەر بۆ جانی شیرینم**
**دەرەك بێ جێم لە دۆزەخدا، ئەگەر ئانێ تەئەممول کەم (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، ف، غ، ج، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) حەدیث: قسە.

واتە: کە قسە لە شۆر و شەیدایی بولبول دەکەم، مەبەستم حاڵی خۆمە. کە باسی ناسکی پەڕەی گوڵیش دەکەم، هێمایە بۆ ڕوخساری تۆ و ئەوم مەبەستە. بە کورتی، تۆ گوڵ و من بولبولم.

(٢) دووەم نیوەی ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (عا)دا پاش و پێشن.

میقراض: مەقەست. ئەجەل: ئاکام. پەرچەم: مووی پێشی سەر. کاکوڵ: مووی شانەکراوی پەروەردەکراوی سەری کوڕانی تازەنەمام.

واتە: عومرم بە مەقەستی ئاکام کورت بکرێتەوە و بمرم، وەك کورتکردنەوەی پەرچەمت، ئەگەر بێت و پاش ستایش و پێداهەڵدانی مووی ئەگریجەت، ستایشی کاکۆڵی کوڕان بکەم!

تەعریفی مووی زوڵفت (کم، گم): تەعریفی زوڵفت. لەنگە.

(٣) ئەم بەیتە لە (ف)دا نییە.

واتە: خودایە هەمیشە و تا دەمرم دڵناخۆش و تێکچووی دووریت بم، ئەگەر بەبێ ئەگریجەی بۆنخۆشت لە باخ و بێستاندا حەز لە سونبول بکەم.

لە باغا (کم): لە باغە. هەڵەی چاپە.

(٤) دەرەك: ناخی دۆزەخ. تەئەمول: تێفکرین، تێڕامان، مەبەستی خۆگری و سستییە.

واتە: ئەگەر یاری شیرینڕووم بنێرێ بۆ گیانی شیرینم و داوای بکا، کە بۆ ساتێکیش خۆگری

مەلالی ئارەزوو "سالم!" بەقەد دووری لە دڵمایە
لە وەصلا بۆ تەماشای ڕوویی دڵبەر، گەر تەغافول کەم (٥)

بکەم و نەبینێرم، خودایە ناخی دۆزەخ جێگەم بێ.

یاری (کم): یادی. هەڵەی چاپە. جانی (ج): ڕۆحی. ئانێ (ق): نەختێ.

(٥) مەلال: خەم و پەژارە. ئارەزوو: مەبەستی ئارەزوومەندییە.

واتە: ئەگەر کاتی گەیشتن بە یار کەمێك سستی لە تەماشاکردنی ڕوخساری یارمدا بنوێنم، لێم مەگرن، چونکە خەم و پەژارەی ئارەزوومەندی بەقەدەر دووریی یار بارە لەسەر دڵم. جا بنیادەم کە وەها سەرودڵ گیراو و سەرگەردان بێ، لەوانەیە جاروبار کەمێك سستی و کەمتەرخەمی لە پێویستییەکانی سەر شانیدا بکا، تەنانەت لە کاتی بەیارگەیشتندا سەری لێ تێكبچێ.

ئارەزوو (ف): ئارەزووی.

## -٢٤- (*)

**(رقعه‌ایست به احمد آغای سنگ‌هلکیش نوشته‌ام)**

**دەك موبارەك بێ موكەڕڕەر، هەجْوی سەنگ‌هەڵكەن دەكەم**
**بای شەماڵی هەجوی دێ، خەرمانی عومری شەن دەكەم (١)**
**دیرعی هەجْوم با بپۆشم، تیژ بكەم نێزەی قەڵەم**
**جەنگی مەیدانی لەگەڵ ئاغایی ئەهریمەن دەكەم (٢)**
**تیغی هەجْوم خوونچەكانە و ئەسپی فیكرم خارەسوم**
**با موهەییا بێ ئەساسم، شەڕ لەگەڵ دوشمەن دەكەم (٣)**
**با لە مەیدانا بە پا بێ قیسپی هەجْوم، قابغی**
**هەر ئەمێستە قازوغی سەركار مێخ‌ئەفگەن دەكەم (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ف)دا هەیە. بەپێی سەرناوەكەی، سالم بۆ ئەحمەد ئاغای بەردهەڵكەنی نووسیوە. لێرەیش، وەك زۆربەی شیعرە داشۆرینبابەتەكان، ناسناوی سالم نییە.

كێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) موكەڕڕەر: دووبارەكراوە.

واتە: خودایە موبارەكی بێ، وا جارێكیتریش ئەحمەد ئاغای بەردهەڵكەن دادەشۆم. هەجوەكەی وەك بای شەماڵە و خەرمانی عومری ئاغا شەن دەكەم و تۆزی بە با دەدەم!

(٢) ئەهریمەن: شەیتان و ناقۆڵا.

واتە: با كراسی زریداری داشۆرین بپۆشم و نێزەی قەڵەمم تیژ بكەم، چونكە لە مەیدانی داشۆریندا لەگەڵ ئاغای شەیتان و ناقۆڵادا دەجەنگم.

(٣) خوونچەكان: خوێنتكێن، خوێنی لێ دەتكێ. خارە= خارا: بەردی سەختە. خارەسوم: ئەسپی سمسەختی بەرگەگر. ئەساس: كەرەستەی پێویست.

واتە: تیغی داشۆرینم ئەوەندە تیژە خوێنی لێ دەتكێ و ئەسپی بیرم بەهێز و سمسەخت و مەسافەبڕە، بۆیە وا دەكەم ئامرازی كارم ئامادە بێ، چونكە لەگەڵ دوژمن لە جەنگدام.

(٤) بە پا بێ: بە پێوە بێ، قیت و قنج بێ. قابغ: بەرگ، كالان، كیف، ئاماژەیە بۆ كونی باش یا پیش. قیسپ: داری دەستیی سەرتیژكراو بۆ تەیمان دروستكردن؛ سنجووق یا تیر، جاران سنجووقێن لە شوێنێكی نەرماندا دەكرا و یەكێكیش سنجووقهەڵكێش بوو. قازوغ: توركییە بە مانای قیسپ، تیر، سنگ، كینایەیشە بۆ دەعبای نێرینە. سەركار: كاربەدەستی پیاوی گەورە. مێخ‌ئەفگەن: بزمارڕێژ.

کلکی دووشەق، تیری دووسەر کەم بە سیمورغی خیرەد
ڕۆستەمی دەوری زەمانم، ڕەزمی ڕووبین‌تەن دەکەم (٥)
دا بمێنێ مەزرەعەی فیکرم سەراسەر بێ زیان
بۆ شکاری خووگی وا، ڕاوی وەکوو بیژەن دەکەم (٦)
«فی المثل» گەر کێوی سەنگین بێ لە وەزن و قورسییا
قیسپی هەجْوی تێدەگیرێنم، لە جێی بنکەن دەکەم (٧)
هەر دەرێنم و داکوتم قیسپێ بە بن قیسپی ئەوا
ماڵی تاریکی پەسی بەم قیسپە پڕڕەوزەن دەکەم (٨)

واتە: با کالانی قیسپی داشۆرینم لە مەیدانی ململانێدا دیار و دەرکەوتوو بێ. هەر ئیستا دەعبای سەرکار دادەگرمەوە و بزمارکوتی دەکەم.

قازوغی (ف): قازخی.

(٥) کلك: قەڵەمی قامیش، کە ئەوسا پاش دادان نووکەکەیان دەقڵەشاند. ڕەزم: جەنگ. ڕووبین‌تەن: تەنپۆلا، تەنمەحکەم، ناوی ئەسفەندیارە.

واتە: قەڵەمی سەر دوولەت بە سیمورغی بیر و هۆش دەکەمە تیری دووسەر. من ڕۆستەمی ڕووی زەمانم و جەنگ لەگەڵ ڕووبین‌تەن دەکەم.

دەوری (ف): دەورم.

(٦) دا: تا. خووگ: بەراز. بیژەن: کوڕی گیو و خوشکەزای ڕۆستەمی زاڵ بووە.

واتە: بۆ ئەوەی کشتوکاڵی بیر و هۆشم بە سەلامەتی بمێنێتەوە و زیانی لێ نەکەوێ، بۆ ڕاوکردنی بەرازی وەها، ئەحمەد ئاغای زیانبەخش وەك بیژەنی ئازا ڕاو دەکەم.

(٧) "في المثل": بۆ نموونە.

واتە: بۆ نموونە، ئەگەر ئەحمەد ئاغا لە کێش و قورسیدا کێوێکی گران بێ، کە قیسپی داشۆرینی لێ گیر بکەم، لە جێی خۆی هەڵیدەکەنم. وشەی قیسپەکە لە (تەوریە)وە دوور نییە، یانێ مەبەستی دەعباکەیەتی!

کێوی (ف): کوهی.

(٨) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (ف)دا نین.

ڕەوزەن: کلاوڕۆژنە.

واتە: هەر کە قیسپێ دەربێنم و بە بن قیسپی ئاغایدا داکوتم، ماڵی تاریك و نوتەکی پاشەوەی بەم

**سنگی هەجْوی گۆیژینم، هیی لە ((مابعد))ی کوتم**
**دێی (سەماوات) و (گوڵئەحمەد) تا بەوی بۆگەن دەکەم (٩)**
**ئاغە دەیزانێ لەبەر چی گۆیژم پێ لازمە؟**
**بۆ جەواڵی دەرکی دوبرت، دڕکی ئەو سووزەن دەکەم (١٠)**
**باقە باقە قیسپی گۆیژ بێنمە ناو چاڵی سیات**
**بۆ حەمامی گەرمی پشتت ئاگری گوڵخەن دەکەم (١١)**

قیسپە پڕ لە کون و کەلەبەر دەکەم و کلاورۆژنەی تێدەکەم!! بەیتەکە تویکلێدارە!!

(ماڵی) بە دوور نازانرێ (چاڵی) بووبێ، ئەگەرچی ڕەوزەن -یانێ کلاورۆژنە- لەگەڵ ماڵ و خانوو گونجاوە، نەك چاڵ.

(٩) سنگ: پواز، پارچەداری کورتی سەرتیژکراو. گۆیژین: لە دارگۆیژ دروستکراو کە سەخت و ڕەقە. مابعد: دەبێ مەبەستی پاشەوەی بێ. کوتم: تێیبچەقێنێ، لێرەدا پاشەوەکوتە. سەماوات و گوڵئەحمەد: دوو دێی ناوچەی شارەزوورن.

واتە: سنگی لە دارگۆیژ دروستکراوی داشۆرینم، کە مەبەست دەعباکەیەتی و ڕەق و قایمە و کوتاویەتە پاشەوەی کابرا، کارێکی پێکردووە پزووی پاشەوەیی پساندووە و پیسایی بۆ ڕانەگیراوە، ئەو دوو دێیەی پێ بۆگەن و پیس کردووە.

(١٠) ئەم بەیتە لە (ف)دا نۆیەمە.

گۆیژ: دارێکی کێویی سەخت و بەردارە، لقەکانی دڕکاوی و بەگرێوگۆڵن. جەواڵ: وەك گونیەیە، بەڵام لە موو چنراوە. دوبر: قنگ، کۆم. سووزەن: سووزن، سووژن.

واتە: ئاغا! دەزانێ دارگۆیژم بۆ چییە؟ دڕکەکەی دەکەمە سووژن و دەمی جەواڵی کۆمی هەڵپچڕاوتی پێ دەدروومەوە!

(١١) ئەم بەیتە لە (ف)دا هەشتەمە.

باقەباقە: چەپك چەپك. چاڵی سیا: چاڵی ڕەش، مەبەستی کۆمی ئەحمەد ئاغایە! گوڵخەن: توونی حەمام و جێگەی ئاگرەکەی.

واتە: دەستەدەستە و چەپك‌چەپك قیسپی گۆیژی دڕکاوی دەخەمە چاڵی ڕەشت، تا وەك ئاگری توون بۆ گەرماوی پشتتی دابگیرسێنم.

سیات (ف): سیای. پشتت (ف): پشتی.

## -٢٥- (*)

سەوادی دا بە مەغریب طوڕڕەیی گێسوویی جانانەم
خەمی بەخشی بە ماهی یەکشەبە، ئەبروویی جانانەم (١)
بە ناز ئیتر نەزاکەتهایی گوڵ بولبول قوبووڵ ناکا
بەسەر باغا صەبا بێنێ سەحەر، گەر بوویی جانانەم (٢)
نەبوونی شەمعی کافووری لە وەصلا، سەهلە بۆ عاشق
هەموو شەو ڕۆشنە کولبەم بە یادی ڕوویی جانانەم (٣)
بەیان ناکا کیتابی طیب دەوایی دەردی موشتاقان
شیفایە بۆ تەبی ئوفتادەگان، لیموویی جانانەم (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، غ، ج، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) جانانە: دڵبەر. ماهی یەکشەبە: مانگی یەکشەوە.

واتە: زوڵفی دڵبەر ڕەشیی بە شەو بەخشیوە، چەماوەیی برۆی دڵبەریش چەماوەیی بە مانگی یەکشەوە بەخشیوە.

دا بە (گم): دایە. بەخشی (ق): داوە. یەکشەبە (ق، کم، گم): یەکشەوە. ئەبروویی (ج): گێسوویی. هەڵەیە.

(٢) واتە: ئەگەر بای سەبا بەیانیان بۆنی دڵبەر بەسەر باخدا بێنێ، ئیتر بولبول موحتاجی گوڵ نابێ و نەزاکەتی قوبووڵ ناکا و بۆی ناخوێنێ، چونکە بۆنی خۆشی یاری بەسە.

(٣) ئەم بەیتە لە (ق)دا نییە.

واتە: کاتی گەیشتن بە یار شتێکی ئاسایییە پێویستم بە مۆمی کافووری نەبێ، چونکە یار خۆی مۆمی مەجلیسە. من وێرانەکەم لە کاتی دووریدا بە یادی ڕوومەتی دڵبەرەوە ڕووناکە!

بە یادی (غ، کم، گم): لە شەوقی. بوویی (ق): بێنی.

(٤) ئوفتادەگان: پەککەوتووەکان، کەنەفت و نەخۆشەکان. تەب: تا.

واتە: کتێبی پزیشکی باسی دەرمانی دەردی ئارەزوومەندان ناکا. لیمۆی دڵبەر بۆ تای لەپێکەوتووانی عیشق دەرمانە.

طیب (غ): طوب. موشتاقان (گم): عوششاقان.

**ڕەهاییم قەد نییە "سالم!" لە بەندی سیلسیلەی عیشقا،**
**لە گەردنمایە تا زەنجیری حەلقەی موویی جانانەم (٥)**

(٥) واتە: تا زنجیری ئەڵقەی زوڵفی دڵبەرم لە گەردندا بێ، هەرگیز لە زنجیر و داوی عیشق ڕزگار نابم.

قەد (ق، کم، گم): قەت. لە گەردنمایە تا (غ، کم، گم): لە گەردنما وەکو. زەنجیری (کم، گم): زنجیرە.

## (*) -٢٦-

بۆ گەڕانی ئاشی دڵ فرمێسکی چاوم بوو بە یەم
بۆ منی بێکەس مزەی نابێ، بە غەیرەز دەرد و غەم (١)
کافرم گەر بەحسێ بتخانە و جگەر لات بێنمە ناو
بۆ منی شەیدا، هەمیشە، ئەی سەمەن‌بۆ! تۆی صەنەم (٢)
لافی دانایی چلۆن لێدەم لە خزمەت مەهوەشا
عیشقی دڵبەر بۆ خەبەردان گورگە بۆ قەلبی غەنەم (٣)
چا بوو تەسکینم ئەهات جاران بە ئەشك و ئاهی خوێن
لەم دەمە بۆ من، درێغ، ئەمشەو نە دەم ماوە، نە دەم (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (م)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) مزە: ئەو ئەندازە ئاردەیە کە ئاشەوان لەباتیی کرێی هاڕینی باراش وەریدەگرێ.

واتە: ئاوی فرمێسکی چاوم بۆ گەڕان و ئیشکردنی ئاشی دڵ بوو بە دەریا، فرمێسك ئاشەکە دەگێڕێ. منی بێکەس جگە لە دەرد و خەم هیچ مزەیەکم دەست ناکەوێ، فرمێسکی خۆمە و ئاشی خەمی خۆم دەگێڕێ.

(٢) جگەر: خەم و پەژارە. سەمەن: گوڵێکی بۆنخۆشە. سەمەن‌بۆ: بۆن وەك سەمەن، بۆنخۆش.

واتە: ئەگەر باسی بتخانە و خەم و پەژارە لای تۆ بکەم، کافر دەبم. منی شەیدا تەنها تۆی بۆنخۆش بتمی و دەتپەرستم، بتی‌ترم نییە.

(٣) مەهوەش: وەك مانگ.

واتای نیوەی یەکەم: لافی ژیری و زانایی چۆن لای یاری وەك مانگ جوانم لێ بدەم؟ دەبێ واتای نیوەی دووەمیش بەم جۆرە بووبێ: ((عیشقی دڵبەر بۆ خیرەد وەك گورگە بۆ قەلبی غەنەم))، یانێ: گورگ چی بە مەڕومالآت دەکا، خۆشویستنی دڵبەریش بەو شێوەیە عەقڵ پایەماڵ دەکا. بەم جۆرە نیوەی دووەم دەبێتە بەڵگە بۆ نیوەی یەکەم، واتە: بۆیە گەزافی دانایی لێ نادەم، چونکە عیشقی دڵبەر بۆ لەناوبردنی عەقڵ، وەك گورگە بۆ لەناوبردنی مەڕ.

(٤) چا بوو: چاك بوو. (دەم)ی یەکەم: کات. (دەم)ی دووەم: خوێن. (دەم)ی سێیەم: هەناسە.

واتە: چاك بوو جاران بە فرمێسك و هەناسەی خوێنینم تەسکینیم دەهات و نەختێ دەحەسامەوە.

بۆ صەفی مەجنوون لان، ئاهوو لە ڕەمدا ڕام دەبێ
بەڕڕەئاهووی من لەپاش ڕامبوون دەبێ بنیاد ڕەم (٥)
بێ تەبەسسومکردنت عوقدەی دڵم نابێ گوشاد
سا دەهەن واز کە بە خەندە دەفعەیێ، ئەی غونچەدەم! (٦)
نوسخەیی ئەو خاڵە نەدراوە لە تەختەی ڕۆزگار
ڕۆح دەکا بەستە لە نەردی عیشقی ئەودا خاڵەکەم (٧)
خوسرەوی خووبان گوزەر کا گەر، بە پایەندازیی ئەو
چاو لە ئەشکی نوقرەگوون دەڕژێنێ دینار و درەم (٨)

داخەکەم، لەم سەردەمەدا، نە خوێن ماوە و نە هەناسە و نە سوکنایی‌هاتن.

(ئەهات) دەبێ (دەهات) بووبێ و گۆڕرابێ.

(٥) صەف: ڕیز. لان: هێلانە، بێشە (جێی قووڵ). ڕەم: ڕەو. ڕام: دەستەمۆ. بەڕڕەئاهوو: بێچووەئاسك. بونیاد: بناغە. ڕەم: هەڵاتن و سڵ‌کردن.

واتە: ئاسك لەناو ڕەوەکەی خۆیدا دەستەمۆ دەبێ و دێتە ڕیزی شێتانی ناو لان و بێشە. کەچی بێچووەئاسکی من، دوای دەستەمۆبوون، خووی سڵۆکی و هەڵاتن دەگرێ.

(٦) واتە: بێ زەردەخەنەی لێوانت گرێی دڵم ناکرێتەوە. ئەی خونچەدەم! دە وەرە جارێك دەمت بە پێکەنین بکەرەوە، با گرێی دڵی منیش بکرێتەوە!

(٧) تەختە: تاوڵە، ئامرازی نەردێن لەسەر کردن. خاڵەکەم: خاڵی ڕوخساری یارەکەم.

واتە: وێنە و نموونەی خاڵی ڕوومەتی یار هەرگیز لە ڕووی ڕۆژگار نەدراوە و وێنەی لە دنیادا نییە. خاڵی ڕوخساری یارەکەم، لە یاریی نەردێنی عیشقی خۆیدا، گیان دەبەستێتەوە و بەندی دەکا، وەك مەحبووسی یاریی تاوڵە. بەستنەوە هێمایە بۆ ئەم جۆرە یارییەی تاوڵە.

(٨) خوسرەوی خووبان: شای جوانان. گوزەر کا: ڕەت بێ. نوقرەگوون: وەك زیو. پایەنداز: پێشوازی، خراوە بەرپێ.

بەیتەکە بکەینە پەخشان وای لێ دێت: ئەگەر خوسرەوی خووبان گوزەر کا، چاو دینار و درەم لە ئەشکی نوقرەگوون بە پایەندازی ئەو دەڕژێنێ. یانێ ئەگەر جوانی جوانان تێپەڕێ، چاو بۆ پێشکەشی و پێشوازیی دینار و درەم لە فرمێسکی زەرد و سپی لە بەرپێیدا دەڕژێنێ و دەیکاتە شاباشی ڕێگەی!

**کێ وتی: "سالم" لە عیشقت عاجزە! با پێت بڵێم:**
**ڕاستی «واللهِ» درۆی مەحضە، بە مەرگی تۆ قەسەم (٩)**

(٩) واتە: کێ وتی سالم دەرەقەتی عیشقی تۆ نایێ و پێی دەرنابرێ. با من ڕاستییەکەت پێ بڵێم، قەسەم بە خودا درۆی ڕووتە و بە مەرگی خۆت سوێندت لەسەر درۆیی ئەم قسەیە بۆ دەخۆم.

## -٢٧- (*)

**عەبدی تۆن، باری خودایا! چ غولام و چ نەدیم**
**ئیحتیاجن بە وەظیفەت، چ گەداوو چ نەعیم (١)**
**بە کەرەم داوتە حەیات و بە ڕەحم قووەت و قووت**
**لازمە سوجدەیی شوکرت، چ کەریمی، چ ڕەحیم؟ (٢)**
**پەڕەکاهێکە لە لات کوللی جیهان، هەرچی هەیە**
**حادیثـێکە لە نەظەرتا، چ جەدید و چ قەدیم (٣)**
**ڕووبەڕووی جونبوشی قەهرت کەمەریی کۆ مووره**
**لە کەفی قودرەتی تۆدا، چ ضەعیف و چ ضەخیم (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە موناجاتبابەتە هەر لە (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەقسوور.

(١) نەدیم: هاودەمی هەر کەس، بەتایبەتی لێرەدا مەبەستی هاودەم و هاومەجلیسی گەورەپیاوانە، کە لەگەڵیان دادەنیشن و بە دیمەن بەڕێزن.

واتە: خودایە، چ خزمەتکار و چ بەندە و چ هاوڕێی هەر کەسێك، هەموو بەندەی تۆن، چ هـەژار و چ دارا هەموو پێویستیان بە تۆیە، تۆ کارێکیان پێ بسپێری. مەبەستی ئەوەیە، کەس بەبێ خودا هیچی بـۆ ناکرێ و هیچی بۆ ناچێتە سەر. سالم لەم پارچەشـیعرەدا ڕووی لــە بارەگـای خـودا کـردووە و کـۆی دۆستانی خستووەتە لاوە!

وەظیفەت (مان): وەضیفەت. هەڵەیە.

(٢) واتە: بە بەخشندەیی خۆت ژیانت بە جیهان داوە و بە بـەزەیی خـۆت هێـز و ژیـوارت بـە گیانداران بەخشیـوە، بۆیە پێویستە کوڕنووشت بۆ ببرێ. ئای چ بەخشندەیت؟ ئای چ بەبەزەییت؟

(٣) کاه: کا.

واتە: جیهان هەمووی لە ئاستی دەسەڵاتی تۆدا پووشـەکایەکی سووکی بێمایەیە. هەرچی کـۆن و تازەی ئەم گەردوونە هەیە، هەمووی شـتێکی (حـادث) تـازە پەیـدابووە، کـە ئەوسـا نـەبووە و پـاش ماوەیەکیش لەناودەچێ.

(٤) ضەخیم: گەورە.

واتە: کەمەری ئەستووری کێو ڕووبـەڕووی جووڵانـەوەی ڕقـی تـۆ وەك مێروولـە باریـك و بـێهێز و بەرگەنەگرە. چ بێهێز و چ هێزدار و گەورە لە دەستی توانایی تۆدا، هەموو وەك یەکن.

**لە یەمی موعجیزەتا قەطرەیە ئەنفاس و کەلام**
**هەردو لا شاهیدی ئەم قەولە، چ عیسا، چ کەلیم (٥)**
**تاجیر و ساعیی و مەللاح و بەرید و دەروێش**
**کەس بەدەرناچێ لە موڵکت، چ موسافیر، چ موقیم (٦)**
**ئەی حەکیمی ئەزەلی! چارەکەرم تۆی بە کەرەم**
**نەبضی هەر کەس لە کەفتدایە، چ "سالم"، چ سەقیم (٧)**

(ضەخیم) بە (زەخیم!) نووسراوە.

(٥) یەم: دەریا. ئەنفاس: مەبەستی نەفەسی عیسایە (د.خ) کە بە فەرمانی خودا مردووی زیندوو دەکردەوە. کەلام: مەبەستی قسەی خودای گەورەیە لەگەڵ مووسا (د.خ)؛ ئەم دووانە هەردوو موعجیزە بوون.

سالم ڕووی لە دەرگای خودای گەورە کردووە و وتوویە: هەناسە و فووی عیسا لە دەریای فراوانی موعجیزەی تۆدایە و قسەی لەمەڕ مووسا لە کێوی طوور قەترە بە دەریایە. لە هەمان کاتدا، چ عیسا و چ مووسا هەردووکیان شایەتی ئەم ڕاستییەن.

(٦) واتە: هەرچی ئادەمیزاد هەیە، هەر کارێکیان هەبێ و هەرچی بکەن، هەموو لە ژێر دەسەڵاتی خودادان و لە خواست و توانی ئەو دەرناچن.

(٧) واتە: ئەی پزیشکی ئەزەلی! ئەوەی بە بەخشندەیی چارەی دەردم بکا، تۆیت. لێدانی دڵی هەر کەس، چ ساغ و چ نەخۆش، لە دەستی تۆدایە.

## (*) -٢٨-

دوور لە خاکی سەری کۆی تۆ، صەنەما! تا سەفەریم
لە بەهەشتێکی وەك ئەم شارە بە حاڵی سەقەریم (١)
گەرچی باویسعەتە ئەم موڵکە، وەلێکین بێ تۆ
دڵی من تەنگە بەقەد دیدەیی نامەردی لەئیم (٢)
زەمزەمەی عیشقە لەناو میصری وجوودم، هەمە جا
ئاتەش‌ئەفشانە هەناسەم وەکوو ثوعبانی کەلیم (٣)
ئاگرێ بوو وەرەقی کەوتە دڵی مورغی چەمەن
دوگمەیی تیکمەیی هەر غونچە ترازا بە نەسیم (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، غ، ج، ق، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەقسوور.

(١) واتە: ئەی بتەکەم! تا لە سەفەردا بم و لە خاکی دەورروبەر و بەردەرگای تۆ دوور بم، بەهەشتێکی خۆشی وەك ئەم شارەم بە دڵدا ناچێ و لە حاڵەتی دۆزەخیدام.

خاکی (کم، گم): خاڵی! (تۆ) لە (مان)دا کەوتووە. بەهەشتێکی (ج): بەهەشتێکە. وەك (کم): وەکو. لەنگە. (وەك ئەم) لەبەر کێش بە (وەکەم) دەخوێنرێتەوە. شایانی باسە، (سەری) ئەگەر (بەری) یا (دەری) بووایە، جوانتر دەبوو.

(٢) واتە: ئەگەرچی ئەم وڵاتە پان و فراوانە، بەڵام بەبێ تۆ، وەك چاو یا بەرچاوی مرۆی ناپیاوی ڕژد، من دڵم تەنگە.

وەلێکین (گم): وەلاکین. بەقەد (ف): بەقەدەر.

(٣) زەمزەمە: هەرا و هوریا. میصر: شار، یا وڵاتی میصر.

واتە: ناو شاری یا وڵاتی بوونم لە هەموو لایەکیەوە هەرا و هوریا و شۆری عیشقە. هەناسەم گڕکانە و ئاگری لێ دەبێتەوە، وەك مار (عاسا)ەکەی حەزرەتی مووسا (د.خ) کە جادووی جادووگەرەکانی فیرعەونی بەتاڵ کردەوە.

زەمزەمەی عیشقە (غ): زەمزەمەی عیشقی. (ق): زەمزەمە و شۆرە. ئاتەش‌ئەفشانە (ڕ): ئاتەش‌ئەفسانە. هەڵەی نووسینە.

(٤) وەرەق: کاغەز. ئاگری وەرقی ئاگرێکە زوو گڕ بگرێ. دیارە ئاگری بەربووە کاغەز وایە. مورغی چەمەن: باڵندەی باخ، یانێ بولبول. دوگمە: قۆپچەی یەخە. تیکمە: ئاوریشمی کەنارچنراو بە زێڕ.

**وا ڕژا ئاوی فەرەح جوملە، کە طاسی دڵی زار**
**بە دەمی ئەبرویی شەمشێری کەچت، بوو بە دونیم (٥)**
**گەر لە نەفحەت بە خەتا فەحلی صەبا نوطفە نەدا**
**لە ئەمەل حەملی دەبێ ئاهوو و بۆی نافە عەقیم (٦)**
**طالیبم دیدەیی تۆ بێ بە شیفاجۆی دڵی ڕێش**
**گەرچی نایێ، بە ئەبەد، کاری حەکیمی لە سەقیم (٧)**

واتە: هەر کە دوگمەی ئاوریشمی بە زێڕ نەخشێنراوی یەخەی خونچە بە سروەی با ترازا، بە کورتی هەر کە غونچە دەمی کردەوە، ئەو کرانەوەیە ئاگرێکی زوو هەڵگیرساو بوو، کەوتە دڵی بولبول و کردی بە هەرا و زەمزەمە (زۆر جوانە، غونچە بە سروە دەکرێتەوە و دڵی بولبولیش گڕ دەگرێ!).

ئاگرێ بوو وەرەقی کەوتە (ق): ئاگری دووریی گوڵی ڕووتە. دڵی (ف): ئەنێو. دوگمەیی (عا): دوگمەوو. تیکمەیی (ق): تیکەیی. (گم): تەکمەیی.

(٥) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (ج)دا نین.

جوملە: هەموو. تاس: کاسە. کەچ: لار، هیلالی. دوونیم: دوونیوە، دوولەت.

واتە: کاسەی دڵی بیمار، کە بە دەمی برۆی وەك شمشێرت دوولەت بوو، هەرچی ئاوی خۆشی و بەختەوەریی تێدا بوو، هەمووی ڕژا. دیارە عیشق هەمووی ماتەمە.

وا ڕژا.. تاد (کم، گم): دارژاوی فەرەحی وەصڵە دڵی زار و نەزار. (ا)ی (ڕژا) لە (ڕ)دا کەوتووە. بە دەمی ئەبرۆیی (کم، گم): ئەبرۆیی. لەنگە.

(ئەبرۆیی)، لەبەر ڕاگرتنی کێش، کراوە بە (ئەبرویی).

(٦) خەتا: وڵاتێکە لە چین. ناف: ناوك. عەقیم: نەزۆك. سالم بای سەبای بە نێر و بۆنی خۆشی یاری بە نوتفە داناوە.

واتە: ئەگەر نێرەی بای سەبا نوتفە لە بۆنی خۆشی تۆ نەدا بە (خەتا)ی مەڵبەندی ئاسکی ناوكبۆندار، ئاهووی خەتا بە ئومێدی ئەوەی بە نوتفەی ئەو بۆنەی یار دووگیان بێ، ئیتر ناوکی نەزۆك دەبێ و میسك نادا تا بۆن ببەخشێ، یا خۆی کارێك دەکا ئەوە ڕووبدا، چونکە بۆنوبەرامەی ناوازە و خۆشی یار لە کوێ و هی میسکی ئاسك لە کوێ!

نەفحەت (کم، گم): نەغمەت (ق): نەفخەت. هەڵەیە. نەدا (ف، غ، ڕ، کم، گم): نەبا. و بۆی نافە عەقیم (عا): دەبوو نافەی عەقیم.

(٧) شیفاجۆ: شیفاخواز. سەقیم: نەخۆش، مەبەست چاوی مەستی یارە.

**خاڵی تۆی دی کە لەناو حەلقەیی زوڵفا، بە هەوەس**
**نایە ناو دائیرە مەششاقی ئەزەل نوقطەیی جیم (٨)**
**لافی لێ داوە بە بۆی نافە، لە نەفحەی گوڵی ڕووت**
**ڕووڕەشی کرْدووە تەئثیری گوناهانی عەظیم (٩)**
**تورکی تیرئەفگەنی شیریندەهەنی سیمْذەقەن،**
**سەری صوڵحی هەیە، گەر دەرحەقی یارانی قەدیم (١٠)**
**گەر بە قیمەت نیگەهێ کا لە ڕوخی زەرد و سروشك**
**دەیدەمێ ڕیشوەتی یەك غەمزە بە دامەن زەڕ و سیم (١١)**

واتە: بە تەمای ئەوەم چاوی تۆ ببێتە شیفاخوازی دڵی بریندارم، بەڵام من دوای کڵاوی بابردوو کەوتووم، چونکە هەرگیز ئیش‌وکاری پزیشکی لە نەخۆش نایێ! نەخۆش چۆن نەخۆش چاك دەکاتەوە. دیارە چاوی مەستی یار نەخۆشە.

طالیبم (کم، گم): طالبی. تۆ بێ (ق): تۆیە. (گم): تۆ بی. نایێ بە ئەبەد (کم، گم): نایبا بەد.

(٨) واتە: مەشقکاری ئەزەل کە خودایە، کاتێك خاڵی لەناو بازنەی زوڵفی تۆدا دی، ئەوەندە لە لای جوان بوو، نوختەی لەسەر وێنەی ئەو خاڵە لەناو بازنەی جیم (ج)دا دانا.

تۆی دی (ف، غ، ج، کم، گم): تۆیە. ناو (ق): نێو. دائیرە (غ، ق): دایرە. مەششاقی (عا، گم): موشتاقی! جیم (گم): میم!

(٩) واتە: ناوکی ئاسکی (خەتا)، بەرامبەر بە بۆنی خۆشی گوڵی ڕوخسارت، لافی بۆنخۆشی لێ دا. لە ئەنجامی ئەم گوناهە گەورەیەوە بوو کە ڕووی ڕەش بوو. دیارە میسك، کە نافەی ئاهووە، ڕەنگی ڕەشە.

بە بۆی نافە لە نەفحەی گوڵی ڕووت (ف، ج): بە بۆی نافەی گوڵی ڕوومەتی تۆ. (کم، گم): بە بۆ نافی گوڵی ڕوومەتی تۆ.. هەڵەیە. نەفحە (غ): بێنی. (ق): نەفخە. هەڵەیە. تەئثیری (عا، ڕ): تەئسیری.

(١٠) واتای ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی پێکەوەیە.

تیرئەفگەن: تیرهاوێژ. دەهەن: دەم. سیمذەقەن: چەناگەزیو.

هەیە گەر (ق): ئەمەیە.

(١١) ڕیشوەت: بەرتیل.

واتە: دڵداری تیروەشێن بە نیگای چاو، کە دەمی شیرینە و چەناگەی زیوینە، ئەگەر سەری ئاشتیی دەرهەق بە یارانی دێرینی هەیە، بە نرخ نیگایێ بگرێتە ڕوومەتی زەرد و فرمێسکی سپیم،

**کافییە یەك نیگەهت بۆ دڵی تیشنەیی "سالم"**
**دەستی کەم ناگرێ هەنگامی کەرەم، مەردی کەریم (١٢)**

پڕ بە داوێن ئاڵتوون و زیوی بەرامبەر بە یەك غەمزە دەدەمێ. دیارە ئاڵتوون و زیوەکە ڕەنگی زەرد و فرمێسکی سپیی سالمە، یا هەر فرمێسکەکەی زەرد و سپیی هەیە.

بە قیمەت (ڕ): لـە قیمەت. زەرد و (ف): زەردی. دەیدەمێ (گم): دەیدەیێ. هەڵەیـە. ڕیـشوەتی (غ): ڕیشوەت.

(١٢) هەنگامی: کاتی.

واتە: تاقە نیگایەکت بۆ شکاندنی تینوێتیی دڵی سالم بەسـە. بێگومـان مـرۆی بەخـشندە لـە کاتی بەخششدا دەستی زۆر دەگرێ، مەبەستی ئەوەیە کە: یار بەخشندەیە و نیگای زۆر زۆرە.

(*) -٢٩-

**ژەهرە موڵ بێ ڕووت بە «واللە العظیم»**
**خارە گوڵ بێ بووت بە «باللە الکریم» (١)**
**تاقە خاڵی ڕووت بە تەجریدی مەسیح**
**ساحیرە چاوت، بە ئیعجازی کەلیم (٢)**
**نەقشە ڕووت بۆ دڵ بە شاهی نەقشبەند**
**یاری دێرینە بە قورئانی کەریم (٣)**
**قامەتت سەروە بە گوڵزاری ئیرەم**
**سێبە ڕوخسارت بە فیردەوسی نەعیم (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە تەنها لە (کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتی مەقسوور.

(١) موڵ، لە (مول)ی فارسییەوە وەرگیراوە و لەبەر هاوتاییی (گوڵ)ی نیوەی دووەم کراوە بە (موڵ): شەراب. خار: دڕك. بووت: بۆت، بۆنت.

واتە: بە خودای گەورە قەسەم، شەراب بەبێ ڕوخسارت ژەهری مارە. بە خودای دەهەندە قەسەم، گوڵ بەبێ بۆنی خۆشی تۆ دڕکە.

(٢) تاقە: تاك و بێوێنە و بێهاوتایە. تەجریدی مەسیح: ئەڵبەت مەبەستی ڕووتیی عیسایە (د.خ) لە ماڵ و سامانی دنیا. ئیعجازی کەلیم: موعجیزەی مووسا (د.خ).

واتە: قەسەم بە زاهیدیی عیسا، خاڵی ڕوومەتت لەم دنیایەدا تاق و بێهاوتایە. قەسەم بە موعجیزەی مووسای کەلیم، چاوت جادووگەرە.

جێی باسە، تاقیی خاڵ و ڕووتیی لەگەڵ ڕووتیی عیسا، جادووگەر لەگەڵ ئیعجازی "کەلیم"، خاڵی نییە لە (تەناسوب). مووسایش بە موعجیزە جادووی بەتاڵ کردەوە.

(٣) شاهی نەقشبەند: محەمەد بەهائوددین، بنیادنەری ڕێبازی نەقشی کە یەکێکە لە ڕێبازەکانی سۆفێتی.

واتە: بە شاهی نەقشبەند قەسەم، نەقشی ڕوخسارت لە دڵدا هەڵکەنراوە. بە قورئانی پیرۆز قەسەم، ڕوومەتت یاری دێرینی دڵمە.

(٤) ئیرەم: ناوی بەهەشتەکەی شەدداد. سێب: سێو.

واتە: قەسەم بە گوڵزاری بەناووبانگی ئیرەم، قامەتت سەروە و بگرە جوانتریشە. قەسەم بە بەهەشتی پڕ ناز و نیعمەت، ڕوخسارت سێوەلاسوورەیە.

پەرچەمت تارە بە ((واللیل))ی کەلام
بێ وەفا و ڕەحمی بە ڕەحمان و ڕەحیم (٥)
خەم بووە قەددم بە شەمشێری عەلی
قیسمەتم عیجزە بە تەقسیمی قەسیم (٦)
بێ لەبت شاد نیم بە سەرچەشمەی حەیات
دەردی تۆ نادەم بە دەرمانی حەکیم (٧)
ڕەونەقە بۆ حوسنی تۆ ئاشوفتەگی
سەرحیسابم خۆم بە ئەسراری عەلیم (٨)
"سالم"یم ڕابورد بە مەرگی دڵبەرم
دڵبریندارم لەبەر دیدەی سەقیم (٩)

(٥) تار: تاریك، تای ئاوریشم، بەڵام تاریکەکە باشتر لەگەڵ (واللیل) دەگونجێ.

واتە: قەسەم بە سوورەتی (واللیل)ی قورئانی پیرۆز، پەرچەمت ڕەشە. قەسەم بە خودای بەخشندە و میهرەبان، تۆ بێوەفا و بێبەزەییت.

واوی عەتف لە (بێ وەفا)دا زیاد کرا، (کم، گم) (بێوەفا)یان بەبێ واو نووسیوە. ڕەحمی (گم): ڕوحمێ.

(٦) قەسیم: خودای گەورە کە بەش‌کردنی هەموو شت بە دەستی ئەوە.

واتە: بە شمشێری (ذوالفقار)ی عەلی قەسەم، بالآم کەوانئاسا چەماوەتەوە. بەو خودایە قەسەم کە هەموو شت بەش دەکا، بەشم هەر پەژارە و خەم و خەفەتە.

(٧) واتە: بەبێ ماچی لێوت بە سەرچاوەی ئاوی زیندەگانی دڵخۆش نابم و هەرگیز دەردی تۆ بە دەرمانی پزیشك ناگۆڕمەوە.

(٨) واتە: تێکچوونی من و ئاڵۆزیی حاڵم، ڕەونەقن بۆ جوانیی تۆ، ((مَصائبُ قوم عند قومٍ فوائدُ)). بە پەنامەکییەکانی خودای زانا قەسەم، خۆم سەرحیسابم و دەزانم چی دەکەم و چۆن جوانی بە یار و خەم و پەژارە بە خۆم دەدەم.

(٩) دیدەی سەقیم: چاوی نەخۆش، مەبەست چاوی مەستە.

واتە: بە مەرگی دڵبەر قەسەم، خودایە نەیبینم، ئیتر تەندروستیی دڵم ڕابورد، جارێکیتر من و تەندروستی؟! هەروەها لەبەر چاوی مەستی یار دڵبریندارم.

# پیتی (ن)

## -١- (*)

**ئەگەر دەستم دەگاتە گۆیی پوستان**
**دەکەم گۆی مەطڵەبم بیروون لە مەیدان (١)**
**لە غەمزەی تۆوە دڵ ڕووبێن‌تەنێکە**
**بەجێ‌ماوە لە تیرت بەسکی پەیکان (٢)**
**بەرابەر لەشکری کەیخوسرەوی عیشق**
**گورێزی دا خیرەد وەك شاهی توووران (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، غ، ج، ق، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) واتە: ئەگەر دەستم بگاتە گـۆی مـەمکی یـار، ئـەوە گـۆی ئـاواتم لـە مەیـدان دەرکـردووە و سەرکەوتووم، یا ئیتر باسی ئاوتەکانم ناکەم.

مەطـڵەبم (غ): مەطـڵەب.

(٢) ڕووبێن‌تەن: بەدەن‌پۆڵا کە تیغ کاری تێ‌ناکا، ناسناوی ئەسفەندیاریشە. بەسکی: ئەوەندە، زۆر.

واتە: دڵم بەهۆی نازی چاوی تۆوە بووەتە پـۆڵا، چـونکە سـەرەتیری غـەمزەت -کـە گیراوەتـە دڵم- ئەوەندە زۆرە، هەموو دڵم بووەتە پۆڵا؛ یا لـەبەرئەوەی ئەوەندە ئازاری تۆم لـەسـەر بـار بـووە، هەموو دەردێ دەردەبەم.

دڵ ڕووبێن‌تەنێکە (کم، گم): دڵ ڕووبینی تەنگە. (ق): دڵی ڕۆیین تەنگە. تیرت (عا): ڕێت.

(٣) گوریزی دا: ڕای‌کرد، یا ڕای پێ‌کرد.

واتە: عەقڵ بەرامبەر بە سوپای عیشق خۆی پێ نەگیرا و ڕای‌کـرد، وەك چـۆن پادشـای تـووران بەرامبەر بە خوسرەو هەڵات.

گوریزی دا خیرەد (حا): کە یزیدا. هەڵەیە. (ج): گوریزد ئاغر ئەو کـە. هەڵەیـە. (کـم، گـم): گوریزەد ئاخیرەت. (خیرەد) لـە (عا)دا و (دا) لـە (ق)دا کەوتووە. تووران (حا): طوران.

**بزانم گەر هیلاکی موددەعی دێ**
**لە فرمێسکم دەرێژم، ڕەنگی طۆفان (٤)**
**سمی گووڕ و سەری بەهرامە جێی تیر**
**نیگاهئاهوویی من، گەر بێتە مەیدان (٥)**
**لە ڕووی دەریایی غەم خوێن زایە چاوم**
**لە جێی لوولوو، صەدەف پڕ بوو لە مەرجان (٦)**
**کەفی عەقڵی بڕی، دڵ وەك زولەیخا**
**بە تیغی غەم، لە عیشقی ماهی کەنعان (٧)**
**ئەگەر دڵبەر قوبووڵ کا دینی تەرسا**
**دڵا! تۆ "وەیسە" بی، گەر نەبیە "صەنعان" (٨)**

(٤) موددەعی: ڕەقیب، بەدکاری نێوان دلدار و دڵخواز.
واتە: ئەگەر بزانم ڕەقیب بە گریانی من لەناودەچێ، ئەوەندە دەگریم لافاو هەستێ.
(٥) گووڕ: کەری کێوی کە بارامی گووڕ ڕاوی کردووە. نیگاهئاهوو: نیگای وەك نیگای ئاسك.
واتە: ئەگەر یاری ئاسكنیگام بێتە مەیدانی غەمزە و ناز، سمی گووڕ و سەری بارام دەبنە جێی تیری یار و لە دەستی دەرناچن.
نیگاهئاهوو (کم، گم): نیگای ئاهوو. من (ق): تۆ.
(٦) واتە: بەسەر دەریای خەم و پەژارەدا خوێن زایە چاوم، چاوم لەم دەریایەدا بوو بە سەدەف و پڕ بوو لە مەرجانی فرمێسکی سوورم. کەچی سەدەف بە شێوەی عادەتی شوێنی مروارییە، نەك مەرجان.
خوێن زایە (ق): خوێنڕێژە. چاوم (عا، غ، کم، گم): دیدەم. لوولوو (حا): لوئلوو. (کم، ق): لوئلوء.
(٧) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (حا)دا نین.
ماهی کەنعان: مانگی کەنعان، یووسفی کوڕی یەعقووب (د.خ). کەنعان: سەرزەمینی کۆنی فەلەستین.
واتە: دڵ و زولەیخا، هەردوو دەستی عەقڵیان بڕی؛ دڵ بە تیغی خەم و زولەیخا بە عیشقی یووسف. سالم ئەمەی لە بەسەرهاتەکەی حەزرەتی یووسفەوە وەرگرتووە.
(٨) ئەم بەیتە لە (مان)دا نییە.

**له گریەی "سالم"ی دڵدادە دڵبەر**
**دەبێ خوڕڕەم، وەکوو گوڵشەن بە باران (٩)**

تەرسا: گاور، ئاگرپەرست. وەیسە: کچە دڵبەری ڕامین بووە، داستانێکی دڵداریی کۆنی ئێران و هی سەردەمی ئەشکانییە، بە ئاکامێکی ناخۆش کۆتاییی پێ هـاتووە. صـەنعان: خوداپەرسـتێکی موسـوڵمان بووە کە دوایی شەیتان فریوی پێ خواردووە و لە دینی وەرگێڕاوە.

واتە: ئەگەر دڵبەر بچێتە سەر دینی گـاوران یـا ئاگرپەرسـتان، ئـەی دڵ، ئەگـەر نەبیتـە شـێخی صەنعان و نەچیتە سەر ئایینی ئەو، خودایە بە دەردی "وەیسە" بچی.

دڵا! توو وەیسـە بێ، گەر نەبیە صەنعان (ق): دەبێ عاشق لەبۆ وی بێتە صەنعان.

(٩) دڵدادە: عاشق. خوڕڕەم: شاد و دڵخۆش.

واتە: دڵبەر بە گریانی سالمی عاشق شـاد و کـەیفخـۆش دەبـێ، وەك چـۆن گـوڵزار بـە بـاران دەگەشێتەوە.

دڵدادە (عا): دڵ داوە. (کم، گم): دڵدارە. ئەگەر (دڵدار) بووایە ڕێی تێدەچوو. دەبێ خوڕڕەم وەکوو گوڵشەن بە باران (ق): دڵی وەك گوڵشەنە خوڕڕەم بەهاران.

## -٢- (*)

مەسئەلەم پرسی لە دڵدارم بە مەحضی ئیمتیحان
بۆی عەیان کردم لە لەفظا، هەرچی مەعنا بوو نیهان (١)
پێی دەڵێم: ئەشکم ڕرواندی موو لەناو چاوما، دەڵێ:
دێتە بەرچاوت، لە عەکسی قامەتم، نەقشی میان (٢)
شکڵی صفرێکم بینا نا، لێوی لێ گەزتم، یەقین
یەعنی: ئەفزوون دێ لە وەزنا، هیچە ئەندازەی دەهان! (٣)
ئەو دەڵێ: چی خۆشە هەر بێ؟ من دەڵێم: سەیری ڕوخت
پێم دەڵێ: چی دێتە بەرچاوت؟ دەڵێم: باغی جینان (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، ق، نم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەقسوور.

(١) واتە: تەنها بۆ تاقی‌کردنەوە هەندێ پرسیارم لە یار کرد، لە وشەکاندا چ واتایەکی نیهانی هەبوو، هەمووی بۆ ئاشکرا کردم.

مەسئەلەم (نم): مسلی. هەڵەی نووسینە. لەفظا (حا، نم): وەزنا.

(٢) واتە: بە یار دەڵێم ئەوەندە فرمێسکم زۆرە، مووی لە ناو چاومدا سەوز کردووە! ئەو دەڵێ: تۆ بەهەڵەدا چووی، ئەوە موو نییە، وێنەی ناوقەدی باریکی منە، تۆ بە مووی دەزانی!

دەڵێ (نم): ئەڵێ. لەناو چاوما (ق): لە چاومدا. بەرچاوت (نم): بەرچاوم. نەقشی (ق): موویی.

(٣) ئەفزوون: زیاد. دەهان: دەم.

واتە: وێنەی سفرێکم دروست کرد، دەستم دایە سفرەکە بنووسم، یار لێوی لێ گەزتم و وتی: سفرەکەی تۆ لە کێشانەدا لە دەمی من زیاترە، بەڵکوو دەمی من هەر وەزنی نییە!!

صفرێکم (حا): سفرێکم. یەقین (حا، ق، نم): بەقین. ئەفزوون (ق): زۆرکەم. دەهان (نم): میان.

(٤) هەر بێ: هەر ببێ، یان هەر بێ.

واتە: ئەو دەڵێ چ خۆشییەك هەیە هەموو کاتێ ببێ؟ من دەڵێم تەماشای ڕوخسارت. ئەو دەڵێ کە سەیری ڕوخسارم دەکەی، چی دێتە بەرچاوت؟ من دەڵێم: باخی بەهەشت. یان ئەو دەڵێ چ خۆشییەك هەیە هەموو جارێ بێ و سەربدەی؟ .. تاد.

**من دەڵێم: جێی موشکە نافەی، ئەو دەڵێ: گێسوویی من**
**من دەڵێم: شمشادە قەددت، ئەو دەڵێ: سەروی ڕەوان (٥)**
**من دەڵێم: گوڵ عەطرْبێژە، ئەو دەڵێ: ئاغۆشی من**
**من دەڵێم: نەی شەهدْخێزە، ئەو دەڵێ: خەندەی دەهان (٦)**
**هەر جەدەلمانە لەسەر ئیسمی موژە و ئەبرۆیی ئەو**
**من دەڵێم: شەمشێر و خەنجەر، ئەو دەڵێ: تیر و کەمان (٧)**
**ئەو وتی: حاڵت چلۆنە؟ من وتم: تابم نەما**
**ئەو وتی: چارەت بە چی دێ؟ من وتم: وەصڵت نیهان (٨)**
**ئیسمی وەصڵم هات بە دەمدا، بەستی ڕێگەی گفتوگۆ**
**پێی وتم: "سالم!" لە گوستاخی دەبێ ببڕی زوبان (٩)**

(٥) واتە: من دەڵێم: ناوکی ئاسك جێی میسکە، ئەو دەڵێ: زولفی من جێیەتی. من دەڵێم: بالآت وەك شمشادە، ئەو دەڵێ: بالآم سەروی ڕاستی بەلارولەنجەیە.

نافەی (ن، حا، نم): نافە.

(٦) ئەم بەیتە لە (حا، نم)دا نییە.

واتە: من دەڵێم گوڵ عەتری هەیە و بۆنی خۆشە، ئەو دەڵێ باوەشی من عەتری هەیە. من دەڵێم قامیشی شەکر (نەیشەکەر) شیرینی دەدا، ئەو دەڵێ: پێکەنینی دەمی من دەیدا.

(٧) ئەم بەیتە لە (ق)دا نییە.

واتە: هەمیشە دەمەقاڵەمانە لەسەر ناوی برژانگ و برۆی کە ناویان چییە؟ من دەڵێم برۆت شمشێرە و برژانگت خەنجەرە، ئەو دەڵێ برۆم کەوانە و برژانگم تیرە.

ئەو (نم): تۆ.

(٨) تاب: توانایی، تین‌وتوان.

واتە: ئەو لێی پرسیم و وتی چۆنی؟ وتم: تواناییم نەما و پەکم کەوت. ئەو پرسی: چارت چییە؟ بە چی چاك دەبی؟ وتم بە گەیشتن بە تۆ بە پەنهانی و دوور لە بەدکار.

وەصڵت (نم): وەصفت.

(٩) واتە: کە ناوی (وەصڵ)م بە دەمدا هات، ڕێگەی قسەی پێ‌بڕیم و پێی وتم: سالم! لە حاڵەتی گوستاخی و بێ‌ئەدەبیدا دەبێ زمانت ببڕی، چۆن باسی گەیشتن بە من دەکەی؟!

لە گوستاخی (نم): کە گوستاخی. (نم): ببڕی زمان.

## -٣- (*)

**ئەی قیبلەیی مورادم، داخۆ بە ڕۆژگاران**
**پرسیوتە قەد لە هیچ کەس، حاڵی غەریبی تاران (١)**
**بەو سوێندەکەی کە خواردت، من هەر ئەوەم کە دیومت**
**حاشا بکەم فەرامۆش میثاق و عەهدی جاران! (٢)**
**تا نەقشی خاطرم بێ، خوڕڕەمبەهاری حوسنت**
**دەتکێ لە هەوری چاوم، پەیوەستە تاوی باران (٣)**
**شەو تا سەحەر لە هیجرت بۆ من حەرامە خۆ خەو**
**هەر دێ صەدایی گریەم وەك ڕەعدی نەوبەهاران (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، ق، کم، نم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: موزاریعی هەشتیی ئەخرەبی موسەببەغ.

(١) سالم ئەم پارچەشیعرەی لە ڕۆژانێکدا وتووە کە ئاوارەی تاران بووە، گلەیی لەو کەسە دەکا کە ئەم پارچەشیعرەی بۆ ناردووە و دەڵێ: ئەی قیبلەی مەبەستم، ئاخۆ بە درێژایی ئەم ڕۆژگارە جارێ لە جاران لە کەسێکت پرسیوە: ئەم برادەرەمان، کە بە غەریبی و ئاوارەیی کەوتووەتە تاران، حاڵی چۆنە؟!

موورادم (کم): مرادان. ڕۆزگاران (کم، نم): ڕۆژگاران. قەد (حا): قەت. لە (ق، کم، نم، گم)دا کەوتووە. (تاران) لە (مان، ن)دا (طاران)ە.

(٢) واتە: ئەگەر بڵێی خەتای بێوەفایی منە کەوا تۆ هەواڵم ناپرسی، بەو سوێندەی کە تۆ خواردووتە، من هەر ئەو برادەرەی جارانم و بەڵێن و پەیمانی کۆنم لە بیر نەچووەتەوە.

سوێندەکەی (گم): سۆندەکەی. خواردت (کم، نم، گم): خواردم. (خواردمت) لە (مان)دا هەڵەیە.

(٣) خوڕڕەمبەهار: بەهاری خۆش و شاد. پەیوەستە: هەمیشە، سەرومڕ.

واتە: تا بەهاری پڕ لە شادیی جوانیت نەقشی دەروونم بێ، هەمیشە بارانی فرمێسك لە هەوری چاوم دەبارێ. چەند جوانە: لایەك بەهارە و هەور و بارانە، لایێ خۆشییە، لایێ گریانە. تابلۆیەکی قەشەنگە، هەر لە دەست و خامەی ڕەنگینی سالم دێت.

پەیوەستە تاوی (حا، کم، نم، گم): ئەشکم بە میثلی.

(٤) نەوبەهاران: سەرەتای بەهار، بەهاری تازە.

واتە: لە ئێوارەوە تا سبەینێ ڕۆژ دەبێتەوە، بە هۆی دووری لە تۆوە وەك هەورەبرووسکەی بەهار دەنگی گریانم لێ بەرز دەبێتەوە.

**لاكین لە ئەصڵی كارا، ناسیومە حاڵەتی تۆ:**
**سەنگینە گوێی سەماعت بۆ دادی دەردەداران! (٥)**
**تۆ هەر ئەوەی كە چاوت جەرگی بڕیم بە ئیما**
**من هەر ئەوەم كە عیشقت كردوومی وێڵی شاران (٦)**
**"سالم!" لە جەوری دڵبەر، كۆتا كە شەرحی دەفتەر**
**تۆ بێخودی لەتاو ئەو، ئەو بێخەبەر لە یاران! (٧)**

(٥) كارا: كاردا. سەنگین: گران، نەبیست. داد: فریاد.

واتە: بەڵام من لە ئەسڵی مەسەلەكە گەیشتووم، دەزانم تۆ بۆچی گلەییم لێ دەكەی، تۆ گوێت لە دادی دەردەدارانی وەك من نییە و ناتوانی ببیستی.

كارا (ق): كارە. سەنگینە گوێی سەماعت (كم): سەنینە گوێی سەماعت.

(٦) ئیما: ئاماژە، ئیشارەت بە چاو.

واتە: تۆ ئەو كەسەی كە چاوت بە ئیشارەتبۆكردن جەرگی منی بڕیوە و منیش ئەو كەسەم كە عیشقت وێڵ و ڕەهەندەی شارانی كردووم.

جەرگی بڕیم بە ئیما (ق): كردوومیە وێڵی شاران.

(٧) كۆتا كە: كۆتا بكە، ببڕەوە. بێخود: بێهۆش.

واتە: سالم! وەڵامدانەوەی ئەم گلەیی و بناشتەی ئەم برادەرەت ببڕەوە. پوختەی مەسەلەكە ئەوەیە: تۆ لەتاو دووریی ئەو بێهۆشی و ئاگات لە خۆت نییە و ناتوانی نامەی بۆ بنووسی، ئەویش ئاگای لە دۆستانی نییە، بۆیە گلەییت لێ دەكا. سالم بەم دوابەیتە جوان بیانووی بۆ نامەنووسینی خۆی و گلەییكردنی برادەرەكەی هێناوەتەوە.

تۆ بێخودی .. تاد (ن): تۆ بێخودی لەناوا، ئەو بێخەبەر لە یاران. (گم): تۆ بێخەبەر لە تاران ئەو بێخەبەر لە یاران.

-٤- (*)

بێ تۆ مەهیبە گریەم وەك ڕەعدی نەوبەهاران
پەیوەستە دێ بە ڕووما، ئەشکم بە میثلی باران (١)
نابێ بکەم، بەبێ تۆ، صوحبەت لەگەڵ چ دڵبەر
ئارێ، مەقامی وەرعە پەرهێزی تەوبەکاران (٢)
ناکاتە دەر لە خاطر، صەد کۆششی ئەرەستوو
غەیرەز ویصالی یاران، ئەندووهی بێقەراران (٣)
ئیستادەوو خەجاڵەت، گەردەنکەچ و تەریقم
جانا! بە چاوی توندی مەڕوانە شەرمەساران (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (عا، ف، غ، ج، کم، نم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: موزاریعی هەشتیی ئەخرەبی موسەببەغ.

(١) مەهیب: بەهەیبەت و سامناك و مرۆترسێن. پەیوستە: هەمیشە. ئەشك: فرمێسك.

واتە: بەبێ تۆ دەنگی گریانم سامناکە وەك هەورەبرووسکەی نەوبەهار، فرمێسکم بەردەوامە و وەك تاوی باران بە خوڕ دێتە خوار.

مەهیبە گریەم (کم، نم، گم): مەهیب و گریەم.

(٢) ئارێ: بەڵێ. وەرع: خۆ لە گوناه پاراستن. پەرهیز: خۆپاراستن، پارێز.

واتە: ڕەوا نییە بێ تۆ هاوڕێیەتی لەگەڵ کەسدا بکەم و کەسیتر بگرم بە یار. بەڵێ، دەبێ مرۆی تۆبەکار خۆی لە گوناه بپارێزێ. منیش، جگە لە تۆ، تۆبەم لە هەموو جیهان کردووە و دەبێ خۆم بپارێزم.

بەبێ تۆ (عا، ف، ج، کم، نم، گم): بە جوز تۆ. وەرعە (غ): درعە. هەڵەیە.

(٣) خاطر: دڵ. غەیرەز: جگە لە. ئەندووە: خەم و پەژارە.

واتە: تەنها گەیشتن بە یار خەم و پەژارە لە دڵی بێئارامی عاشق دەردەکا. هەوڵ و تەقەلای سەد زانای وەك ئەرەستوو، خەم لە دڵی بێئارامی عیشق دەرناکا.

ناکاتە (ج): ناگاتە. غەیرەز ویصالی یاران، ئەندووهی بێقەراران (غ): ئەندووهی بێقەراران، غەیرەز ویصالی یاران.

(٤) ئیستادە: ڕاوەستاو. تەریق: شەرمەزار. جانا: گیانە!

واتە: خەجاڵەت و گەردنکەچ و شەرمەزار لە بەردەرگاتدا ڕاوەستاوم. خۆشەویستەکەم! گوناهە، بە چاوێکی توندوتیژ سەیری خەجاڵەتباران مەکە.

**شام و سەحەر، وەکوو خاک، پامالّی پایی خەلّقم**
**ئەزبەس بە یادی لوطفت کەوتم لە ڕەهگوزاران (٥)**
**صەدبار ئەگەر لە گولّشەن گولّ چەتری زەڕ لەسەرنێ**
**دلّ تەنگە، غونچەئاسا، بێ ڕوویی گولّعوزاران (٦)**
**شێواوە دلّ لە هیجرا، ناگاتە شامی زولّفت**
**پەیوەستە ئینتیظارە وەک چاوی ڕووزەداران (٧)**
**بێهوودەیە لە گولّزار، ئەفغانی بولبولی زار**
**ناگاتە گۆشی یاران، ئەندووهی بێقەراران! (٨)**

(و)ی نێوان (گەردەنکەچ) و (تەریقم) لە (ف)دا هەیە.

(٥) ئەم بەیتە لە (ف)دا شەشەمە.

شام: ئێوارە، شەو. پامالّ: ژێرپێ کەوتوو و بەپێوەڕۆیشتوو. ئەزبەس: ئەوەندە، لەبەرئەوە.

واتە: ئەوەندە بە یاد و بە ئاواتی نەوازشتەوە لە ڕێگوزاری خەلّکدا کەوتم، بەیانیان و ئێواران بووم بە ژێرپێی خەلّکەوە و پایەمالّ و مالّوێران بووم.

خەلّقم (کم، نم، گم): خەلّکم. (بەس)ی (ئەزبەس) لە (غ)دا کەوتووە. لوطفت (عا): زولّفت.

(٦) بار: جار. گولّشەن: گولّستان. زەڕ: ئالّتوون، زەرد. لەسەرنێ: بکاتە سەر. غونچەئاسا: وەک خونچە. گولّعوزار: ڕوومەت جوان وەک گولّ.

واتە: ئەگەر گولّی گولّزار سەد جار چەتری زەردی ئالّتوونین بە سەریەوە بگرێ، دیارە سەری گولّ تاجەکەیەتی، دلّ بەبێ بوونی یاری ڕوومەت گولّ، وەک خونچەی نەکراوە هەر تەنگ دەبێ و ناکرێتەوە.

زەڕ (کم، گم): زی. (نم): زێڕ.

(٧) ڕووزەدار: بەڕۆژوو، ڕۆژووەوان.

واتە: دلّ بەهۆی دەردی دوورییەوە شێواو و تێکچووە و هەرگیز ناگاتە زولّفی ڕەشی وەک شەوت، وەک مرۆی بەڕۆژوو چاوەڕوانی هاتنی شەوە تا ڕۆژووەکەی بشکێنێ.

لە هیجرا (ج): لە هیجرت. (کم، نم، گم): لە گولّزار. ناگاتە شامی زولّفت (کم، نم، گم): ئەفغانی بولبولی زار.

(٨) بێهوودە: بێسوود. ئەفغان: هاوار. زار: گریاو. گۆش: گوێ. ئەندووه: پەژارە.

واتە: بولبول هەزار داد و فوغان لە گولّزاردا بکا، بێسوودە. هەرگیز هاواری دەردەداران ناگاتە گوێی دلّبەران.

"سالم" لەبی بە سالم ناگاتە ڕوویی دڵبەر
جەمعن بە دەوری گەنجا هەر سوو سیاهْـماران (٩)

ناگاتە (کم): ناگەنە. ئەندووهی (غا): نالێنی.

(٩) واتە: لێوی سالم بە ساغ‌وسەلامەتی ناگاتە ڕوومەتی یار. لەبەرئـەوەی ڕەشمـاران بـە دەوری گەنجینەی ڕوومەتی یاردا گەمارۆیان داوە، ئەگریجە ناهێڵێ لێوی عاشق بە ڕوومەتی یار بگا.

لەبی (کم): کەس. (نم): کەسی. (ف، ج، گم): کەسێ.

## -٥- (*)

**لێم گەڕێن با گریە کەم دیدەم بە دیدەی خوونفشان**

**نایێڵێ یەکدەم بە ڕاحەت ڕابوێرم، ئاسمان (١)**

**چونکە سیوەیلی قەدیمن، حەق لەپاش عەهدی "سەلیم"**

**دایە دەس "مەحموود"ی حاتەمدڵ، چراغی دوودمان (٢)**

**شەمعی دەسگاهی ملووکانەی گەیانە مەرکەزێ**

**بەرقی قیندیلی فرووزانی دەچوو بۆ کەهکەشان! (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (کم، گم)دا هەیە. بابەتی شیعرەکە شینگێڕانە بۆ مەحموود ئاغای سەلیم ئاغای شیوەکەڵ و بە ئاشکرا ناوی مەحموود و سەلیم براوە، سەرباری ناوی کوڕی مەحموود ئاغا و چەند کەسێکی تری بنەماڵەکە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەقسوور.

(١) خوونفشان: خوێن فڕێدەر، خوێنپژێن.

واتە: لێم گەڕێن با بگریم و چاوەکانم خوێن بڕێژن، چونکە ئاسمان ناهێڵێ یەك هەناسە بە ئاسوودەیی ڕابوێرم.

نایێڵێ (کم، گم): نایەڵێ. "سالم" وای نەنووسیوە.

(٢) حاتەمدڵ: دەهەندە، بەدەستودڵ. چراغ: چرا. دوودمان: خانەدان. سیوەیلی: (کم، گم) بە (سێوی) نووسیویانە کە هەڵەیە و (سیوەیلی)یە، یانێ خەڵکی بەری (سیوەیل)ی ناوچەی شارباژێڕ. "پیرەمێرد" لە وتاری (ئاثاری پایەدار، ڕۆژنامەی "ژین"، ژ ٥١٠، ١٩٣٧/١/١٨، ل٢)دا کە ئاماژەی بەو شیعرەی سالم داوە، بە (سیوەیلی) نووسیویە، دەیشبێ هەر وابێ.

واتە: چونکە سەلیمی باوك و مەحموودی کوڕی لە سیوەیلییە کۆنەکانن، پاش مردنی سەلیم بەگ، چرای خانەدانی دا بە مەحموودی دەهەندە.

چونکە سیوەیلی (کم): چنکە سێوی. (گم): چونکە سێوی. حاتەمدڵ چراغی (گم): حاتەم دڵچراغی.

(٣) گەیانە: گەیاندە. قیندیل: چرا. فرووزان: داگیرساو. کەهکەشان: ئەستێرەکانی کاکێشان.

واتە: خودا مۆمی دامودەزگای پادشاهانەی مەحموود بەگی گەیاندە مەرکەزێ، کە بریسکەی چرای داگیرساوی گەیشتە ئەستێرەی کاکێشان.

(گەیانە)، دەبێ (گەیاندە) بووبێ و گۆڕرابێ.

**وەھ چ خورڕەمدەوڵەتێکە، با بە شەرطێ طوولی بێ**
**دەستی حەق بەم نەوعە ڕۆشن کا چراغی خانەدان (٤)**
**(شیوەکەڵ) بووبوو بە بەندەن، خۆ بەسەر نەقشی بەدیع**
**لالەوو نەسرین گەییبوو، جامبلوورین شەمعدان (٥)**
**(شیوەکەڵ) بووبوو بە خانەی پادشا، وەختی نەھار**
**دیم لە ھەر سوو سفرەیی ئەیوانی حاتەم گردخوان (٦)**
**واقیعەن لەو خوانەدا [بوو] خام و پوختە ڕۆژ و شەو**
**ھەر طەعامێکی کە نەفسی ئارەزوو کا، میھْمان (٧)**
**(شیوەکەڵ) بووبوو بە عوربانی عەنێزە و مونتەفیك**
**صەد کەمەند پڕبوو لە سەرجی تازیئەسپ و مادییان (٨)**

(٤) وەھ: ئای! خوورڕەمدەوڵەت: دەوڵەتێکی خۆش و شاد. با: لەباتی (بەڵام) بەکاری ھێناوە.

واتە: ئای چ دەوڵەتێکی شاد و خۆشە! بەڵام بە مەرجێ بەردەوام بێ، دەستی خودای گەورە چرای خانەدان بەم جۆرە ڕۆشن بکا.

(٥) شیوەکەڵ: دێیەکی گەورەی سەر سنوور بووە لە ناوچەی سیوەیلی سەر بە لیوای سلێمانی. بەندەن: شاخ و کێو. جا ھەرچۆن بێ مەبەست ئەوەیە دێی شیوەکەڵ بە ھۆی پایە و دەھەندەیی مەحموودەوە، بووبوو بە شوێنێکی بەرزی پڕ لە گوڵ و گوڵزار و نیگاری نایاب.

شیوەکەڵ بوو.. تاد (کم): (شیوەکەڵ بوبوندن خۆ لە نەقشی بەدیع!)

(٦) نەھار: نانخواردنی نیوەڕۆ. گردخوان: خوان کۆمەڵ بوو. ھەر سوو: لە ھەر لایەکەوە.

واتە: شیوەکەڵ لە کاتی نانخواردنی نیوەڕۆدا دەبوو بە ماڵە پادشا، لە ھەر لایەکەوە سفرەی ھەیوانی حاتەمی تەی بوو، خوانی نان کۆمەڵ بوو.

پادشا (گم): پاشا. خوان (کم): خدان.

(٧) خام و پوختە: کاڵ و کوڵاو. کا: بکا.

واتە: لە ڕاستیدا شەو و ڕۆژ ھەر خواردنێ کە نەفسی میوان حەزی لێ بکا، لە کاڵ و لە کوڵاو، لەسەر ئەو سفرەیە ھەبوو.

وشەیەکی وەك (بوو) لە نیوەی یەکەمدا نییە، لەنگی کردووە.

(٨) کەمەند: یەکەی پێوانی درێژی کە ھاوتای درێژیی گوریسی کەمەند دروستکردنە. سەرج: زین. تازیئەسپ: ئەسپی عەرەبی. مادییان: ماین.

**چووم نیگاهم کرد، لە هەر لادا، لە حوجرەی خاصی ئەو**
**دیم بەقەد بازاڕی قوسطەنـطین، تفەنگی زەڕنیشان (٩)**
**زێوەری تاقی عەمارەت بوو، سەراسەر ڕەنگ ڕەنگ**
**ڕەختی قرتاسەی حەمایەڵ، خەنجەر و شیری دەبان (١٠)**
**دیم، وەکوو دوککانی بەززازی، لەسەر یەك بوخچەها**
**شاڵی تورمە و کەوڵی خەز، دێبایی هیند و پەڕنیان (١١)**
**ئاسمان زانیی: سەری سەوزە نیهاڵی بەختی ئەو**
**نازڵی کرد چاوی بەد، وەك ئافەتی بادی خەزان (١٢)**

واتە: شیوەکەڵ بووبوو بە شوێنی حەسانەوەی عەرەبی عەنزە و مونتەفیك. پانتاییەك بە درێژایی سەد کەمەند پڕ بوو لە زینی ئەسپ و ماینی عەرەبی.

(٩) نیگاه: تەماشاکردن. زەڕنیشان: تاڵ یا وردە زێڕی پێوەنراو.

واتە: کە چووم و ڕوانیم، هەموو لایەکی حوجرە تایبەتییەکەی "مەحموود بەگ": وەك بازاڕی قوستەنتینییەیە، پڕ بوو لە شمشێری زەڕنیشان.

لە هەر لادا (کم): بە هەر لادا. قوسطەنطین (گم): قوسطەنطینی. لەنگە.

(١٠) زێوەر: جوانی. ڕەخت: فیشەکدان. قرتاسە: مانایەکی بۆ نەبینرایەوە، ڕەنگە قەڕاسە بێ، بە مانای گوریسی سەربەنەڵقە بۆ بارپێچان. حەمایەڵ: ئەو قایشەیە کە شمشێرەکەی پێ بەستراوە و دەکرێتە مل، یا فیشەکلغی مل. دەبان: جۆرە پۆڵایەك بووە بۆ خەنجەر و شمشێر دروستکردن.

واتە: سەراسەری تاقەکانی کۆشکەکەی بە جۆرەها فیشەکدان و ئامرازی حەمایەڵی خەنجەر و شمشێری دەبان ڕازابووەوە.

(ڕەختی قرتاسەی حەمایەڵ) دەبێ (ڕەخت و قرتاسە و حەمایەڵ) بێ، چونکە ئاماژە بۆ چەند کەرەستەیەکی تاقەکانی کۆشکەکە کراوە.

(١١) واتە: کۆشکەکەی مەحموود بەگ وەك دووکانی کووتاڵفرۆش بوو، دەیان بوخچەی تێدا یەك لەسەر یەك دانرابوون؛ شاڵی تورمە و کەوڵی هەوریشمین و پارچەی جوانی هیند و پەڕنیان (یانێ پارچەی ئاوریشمی گوڵدار).

(١٢) نیهاڵ: نەونەمام.

واتە: ئاسمان زانیی نەونەمامی بەختی مەحموود بەگ سەری سەوزە و لە نەشونومادایە، چاوی بەدی بۆ نارد، وەك بای خەزان لێی دا و زەردی هەڵگەڕاند و هەڵیوەراند.

**خانەوێرانە، بە یەك تەب عالەمێکی کرد تەباه**
**ڕەنگی بێڕەنگی لەسەر ڕەنگی پەڕیدەی بوو عەیان (١٣)**
**دای بەسەریا، هەر کە گرتی نەبضی مەوجئاسایی ئەو،**
**یەك نەظەر شێوا بە جارێکی حەواسی بابەجان (١٤)**
**تەنفسوردەی بێزمانی تەن بە تەن عالەم مەلوول**
**طائیری ڕۆحی ڕەوانی پەڕزەنان چوو بۆ جینان (١٥)**
**گوڵ بە وەیشوومەی حەوادیث گەر قەضا پەژموردە کا**
**فائیدەی کوانێ بە حەسرەت قوڕ بپێوێ باغەبان؟! (١٦)**

نازڵی کرد (کم): نازی لیکرد.

(١٣) خانەوێران: ماڵوێران، کینایەیە لە ستەمکار. تەب: تا. تەباه: لەناوبراو. ڕەنگی پەڕیدە: ڕەنگی پەڕیو و نەماو.

واتە: ئەو چاوە بەدە بەدبەختە، بە تەنها تایەك خەڵکانێکی لەناوبرد. مەحموود بەگ، لە ئەنجامی ئەو چاوە بەدەدا، ڕەنگی بێڕەنگی لەسەر ڕوومەتی نیشت. دیارە ئەنجامی مەرگ ڕەنگی نەخش و نیگار نابێ، بێڕەنگی دەبێ. سالم ئەم بێڕەنگییەی کردووە بە ڕەنگی ڕوومەتی مەحموود بەگی کۆچکردوو.

پەڕیدەی (گم): پەڕیدی.

(١٤) بابەجان: حەکیمباشی پزیشکی تایبەتی میرانی بابان، کە دەبێ پاش ڕووخانی میرایەتییەکەیش مابێ و چارەسەری نەخۆشییەکەی پێ سپێردراوە.

واتە: بابەجان هەر کە نەبزی مووچی مەحموودی گرت، کە وەك چەپۆڵە دەهات و دەچوو، یەکجار شێواو و بێحەواس بوو و دای بە تەپڵی سەری خۆیدا، زانیی دەمرێ و چاری نییە.

بە جارێکی. (کم): لە دەردا.

(١٥) تەن: لەش. فسوردە: ژاکاو. تەن بە تەن: یەك بە یەك. پەڕزەنان: لە شەقەی باڵدان (فڕین).
جینان: کۆی جەنەتە، واتە بەهەشت.

واتە: لاشەی ژاکاوی مەحموود ئاغا یەك بە یەکی خەڵکی زویر کرد، باڵندەی گیانی دای لە شەقەی باڵ و چوو بۆ بەهەشت.

پەڕزەنان (کم): بەرزەنان. پەڕزەنان .. تاد (گم): بەرزەچوو بۆ ناو جینان. بەرزەچوو: بەرز ئەچوو. "سالم" هەرگیز (زمان)ی لەباتیی (زوبان) بەکارنەهێناوە، بۆیە (بێزمان) دەبێ (بێزوبان) بێ.

(١٦) پەژموردە: سیس و ژاکاو.

**کەی خەیاڵی بوو کوتوپڕ خاصصە بۆ سەر خەرمەنی**
**ئاسمان نازڵ بکا بەرقی غەضەب وا ناگەهان؟! (۱۷)**
**گریە دەڕژێنێ بەسەر ڕووما دەمادەم ئەشکی خوێن**
**بێن تەماشا کەن لە یەك صەفحەی عەقیق و زەعفەران (۱۸)**
**نائیرەی صەبرم بە حەسرەت وا لە گریانا بڕا**
**دێ بە خوڕ فرمێسکی خوێنینم لە چاو وەك ناوْدان (۱۹)**
**سا قەڵەم! بێ، دادی ئەم ئەندووهی کوبرایە بدە**
**من لەتاو ئەم تەعزییەی عوظمایە ماوم بێزمان (۲۰)**

واتە: کە قەزا و قەدەر گوڵی باخ بە وەیشوومەی کارەسات سیس بکا و بیوەرێنێ، قوڕپێوان و خەفەتخواردنی باخەوان چ سوودێکیان دەبێ و فریای چی دەکەوێ؟

گوڵ بە وەیشوومەی .. تاد (کم): گوڵ لەم شئومەی حوادث گەر قضا پر دەربکا! هەڵەیە.

(۱۷) ناگەهان: لەپڕ، ناوەخت.

واتە: مەحموود، کەی بە خەیاڵیدا دەهات ئاسمان وا کوتوپڕ بە تایبەتی برووسکەی ڕق و غەزەب بۆ سەر خەرمانی عومری ئەو بنێرێ و لەپڕ بیسووتێنێ؟!

سەر (کم، گم): هەر. بەو جۆرەی کە لای ئەوان نووسراوە، واتا بەدەستەوە نادا. خەرمەنی (گم): خەرمەنێ.

(۱۸) دەمادەم: بەردەوام، یەك لەسەر یەك.

واتە: گریان هەمیشە فرمێسکی خوێنین بەسەر ڕوومەتمدا دەڕژێنێ. وەرن بڕواننە یەك ڕووپەڕی ڕوومەتم، بزانن چۆن عەقیقی سوور و زەعفەرانی زەرد پێکەوە کۆبوونەتەوە، زەعفەرانی ڕوومەتم و عەقیقی فرمێسکی سوورم.

(۱۹) نائیرە: مەبەستی هێز و توانایییە. ناودان: پلووسکی ئاو.

واتە: هێزی خۆگریم بە خەفەت و لەبەر گریان نەما، وا فرمێسکی خوێنین بە خوڕ وەك پلووسکی ئاو لە چاوم دێ.

وشەی (خوڕ) لە (کم)دا کەوتووە. ناودان (گم): ئاودان.

(۲۰) ئەندووە: خەم و دڵگیران.

واتە: سا قەڵەم وەرە فریای ئەم خەم و پەژارە گەورەیە بکەوە و ڕوونی بکەرەوە، چونکە من لەتاو سام و ناخۆشیی ئەم پرسە و شینە گەورەیە، بێزمان ماوم و قسەم پێ ناکرێ!

تا خەدەنگی قامەتی تۆی گرتە باوەش، ماڵی قەبر
پشتی تاقانەت لە خەم خەم بوو، وەکوو ماڵی کەوان (٢١)
پشتی ئەحمەد بەگ شکا لەم ڕیحلەتی ناوەختەدا
کاشکی مەوقووف دەبوو کۆچت لە ڕەغمی دوژمنان (٢٢)
پشتی ناو تابووتی ڕەختت، پشتی (سیوەیل)ی شکاند
پشتیوانی (بانە)وو (تاژان) و قەومی (تاژەبان) (٢٣)
بوو بە زێبی کۆتەڵت ساتیرەکەی پادشایی ڕۆم
بۆ نەبەم، لەم حەسرەتە، ئەنگوشتی حیرەت بۆ دەهان (٢٤)

(ئەندووهی)، ئەگەر (ئەندووهە) بووایە چاکتر دەبوو. (بێزمان)، (بێزوبان) بووە و گۆڕراوە.

(٢١) ماڵی کەوان: پانتایی ناو کەوان، ئەڵبەت مەبەستی چەماوەکەیەتی.

واتە: کە خانووی گۆڕ بەژنی وەك تیری تۆی گرتە باوەش، پشتی کوڕە تاقانەکەت وەك کەوان چەمییەوە.

(خەم)ی یەکەم، دەبێ (غەم) بێ و گۆڕرابێ. (ماڵی کەوان) بە دوور نازانرێ (حاڵی کەوان)یش بێ، کە واتاکەی زۆر ئاشکرایە.

(٢٢) ئەحمەد بەگ: پشت بەو شەجەرەیە کە مامۆستا عەبدوڕڕەقیب یووسف بۆ ئەم بنەماڵەیەی سازکردووە، ئەحمەد ئاغای ناسراو بە (ئەحەحەیتە)ی برای مەحموود ئاغایە و هەردووکیان کوڕی سەلیم ئاغان. کاشکی: خۆزگە.

واتە: ئەم کۆچە ناوەختەی تۆ پشتی ئەحمەد بەگی شکاند، خۆزگە ئەم کۆچەت لە داخی دوژمنان دوا بخرایە.

ڕیحلەتی (گم): ڕیحلەتەی. (دوژمنان) دەبێ (دوشمنان) بووبێ و دەستکاری کرابێ.

(٢٣) ڕەخت: باروبنە. بانە: شاری بانە لە کوردستانی ئێران. تاژان و تاژەبان: دوو دێی ناوچەی بانەن، دەبێ دۆست و لایەنگری مەحموود بەگ بووبن و بە مردنی ئەو زیانیان لێ کەوتبێ.

واتە: پشتی تۆ کە لەناو تابووتی باروبنەتدا کەوتووە و گیانی تێدا نەماوە، پشتی خەڵکی ناوچەی سیوەیلی شکاند. ئەو، پشتیوانی خەڵکی ناوچەی بانە و تاژان و تاژەبانیش بوو.

تاژەبان (گم): تازەمان.

(٢٤) زێب: جوانی و زینەت و ئارایش. کۆتەڵ: جلوبەرگ و چەکی مردووە کە بە شێوەیەکی تایبەتی لەسەر ئەسپەکەی ڕێکی‌دەخەن و چەند کەسی شینگێڕ لەگەڵ ئەسپەکە دێن و دەچن و مردووەکە

تۆ میثلی سەر بووی، ئەقاریب تەن؛ کە سەر چوو، تەن چییە؟
تەن بە تەن بێسەر هەموو کەوتن لە خاکا بێڕەوان (٢٥)
چاو بچەرخێنە لە تابووتا بە لای کاکئەحمەدا،
هەر لە سەر تا دامەنی بۆ تۆ لە قوڕدایە، نیهان (٢٦)
خۆ بە سەیلابێ خەفەتخانەی ڕەسووڵت کرد خەراب
تۆ بە ئیمان خانەیی قەبرت کە بووبوو ئاوەدان (٢٧)
ئەمڕۆ بۆ تۆ حاڵی ئەم خەڵکە نموونەی مەحشەرە
کاشکی دەتدی لە تابووتا جەمیعی مەردومان! (٢٨)

دەلاوێننەوە، تێکڕای کارەکە پێی دەڵێن: (کۆتەڵ و ئـاڵایی). سـاتیر: داپـۆش. لەوانەیـە جـۆرە بـەرگ و خەڵاتێکی تایبەتی بووبێ، شای ڕۆم بە دیاری بۆ گەورەپیاوانی ناردبێ. هەڵدەگرێ (شاتیر) بێ، بـە مانـای تیری گەورە یا هیی پادشا، یا (تیر) وشەیەکی سەربەخۆیش بێ و بە (سا تیر) بخوێنرێتەوە، واتە: سا ئەو تـیرە پادشای ڕۆم بە خەڵات بۆی ناردووە، چونکە بە فێڵ ژەهرخواردوو کراوە.

واتە: ئەو ساتیرەی کە پادشای ڕۆم لەم ڕۆژی ماتەمەدا بە خەڵات بۆی ناردی، بوو بـە جـوانی و ئارایش بۆ کۆتەڵەکەت، ئیتر بۆچی لـە خەفەتدا ئەنگوستی سـەرسامی نەبەم بۆ دەمم و نەیگەزم؟!

((لەم حەسرەتە)) لە (کم)دا کەوتووە. ئەنگوشتی (کم): ئەنگوستی.

(٢٥) بێڕەوان: بێگیان.

واتە: تۆ سەر بووی و خزمەکانت لەش بوون، کـە سـەر نـەما، لـەش چـی پـێدەکرێ؟ ئـەوەتا خزمەکانت یەکە یەکە بێسەر، واتە بێ تۆ، بێگیان لاڵوپاڵ لێی کەوتوون!

میثلی (گم): وەکوو. ئەوەی (کم) لەنگە و (تۆ میثلی سەر بووی و) ڕاستە.

(٢٦) نیهان: داپۆشراو.

واتە: چاو بگێڕە بۆ کاکئەحمەد، کە برای مەحموود ئاغا بـووە، هـەموو گیـانی لـە قـوڕ نـاوە و داپۆشراوە.

(٢٧) سەیلاب: لافاو.

واتە: تۆ کە یانەی گۆڕت بە ئیمان ئاوەدان بوو، بە لافاوی خەفەت ماڵی ڕەسووڵت وێران کرد. ڕەسووڵ ئاغا، بەپێی هەمان شەجەرە، برای مەحموود ئاغا بووە.

سەیلابێ (گم): سێلابی.

(٢٨) مەردومان: خەڵك.

**کاشکی دەتدی لە تابووتا پەرێشانیی کەریم!**
**ڕەنگپەڕیدەی خوشکلەب، بێدەنگ و مات و بێزمان! (٢٩)**
**ڕۆژەکەی قەتڵی "حوسەین"ە، حەیفە ماوی بێخەبەر**
**کاشکی دەتبیست لە تابووتا صەدای گریە و فیغان (٣٠)**
**خۆت لەجیاتیی من دەگریای، گەر بە چاو دەتدی "ڕەشید"**
**قوڕبەسەر، دڵ پڕکەدەر، شینی پودەر، ئەفغانکونان! (٣١)**
**خۆ نەفیری مەرد و زەن لەم شیوەنە چوو بۆ فەلەك**
**سەر بوڵەند ناکەی، وەها دایگرتۆی خوابی گران! (٣٢)**

واتە: هەر دەڵێی ڕۆژی حەشرە وا خەڵك کۆبووەتەوە. خۆزگە لە تابووتەوە ئەم هەموو خەڵکەت دەبینی.

(٢٩) ڕەنگپەڕیدە: ڕەنگپەڕیو، ڕەنگنەماو. خوشکلەب: لێووشك.

واتە: خۆزگە لە تابووتەکەتەوە بێحاڵیی کەریمت دەدی، کە ڕەنگ بە ڕوویەوە نەمابوو و لێوی وشکی خەفەت مات و بێقسە بوو. کەریم، کەریم ئاغای کوڕە گەورەی مەحموود ئاغایە.

(بێزمان)، (بێزوبان) بووە و گۆڕراوە.

(٣٠) واتە: ڕۆژی کوشتنی حوسەینە لە (کەربەلا)، بووە بە هەرا و فیغان. حەیفە کە تۆ بێئاگای! خۆزگە دەنگی شین و گریانت لە تەرمەکەتەوە دەبیست.

ماوی (کم، گم): ماوە، ماناکەی ئاشکرایە، سالم ڕووی قسەی لە مەحموود خۆیەتی.

(٣١) شینی پودەر: شینی باوك. ئەفغانکونان: هاوارکەرانە.

واتە: ئەگەر بە چاو دەتدی ڕەشیدی کوڕت قوڕبەسەر و دڵپڕخەم شینی باوکی دەکرد و هاواری لێ بەرز دەبووەوە، لەباتیی من دەگریای. ڕەشید، بەپێی هەمان شەجەرە، بە ڕەشید ئاغای مووبرە ناسراو بووە.

(٣٢) نەفیر: ئاوازی بەرز. مەرد و زەن: پیاو و ژن. خواب: خەو.

واتە: ئەوا ناڵە و گریانی پیاو و ژن گەیشتە ئاسمان، بۆ سەر بەرز ناکەیتەوە و خەوی گران داگیری کردووی.

خوابی (کم): غەبرای. واتە: خاك! ئەو هێشتا لە تابووتدایە. غەبرا زۆر لەبار نییە.

**گەھ لەبەر تابووتی ئەودا گریەوو شینێ دەکا**
**پێی بڵێن: توخوا بڵا مەحشەر چییە داد و فیغان (٣٣)**
**حاڵی واپەسماندەگان، با ئیبتیدا بێنێتە یاد**
**ثانییەن، بۆ باسی ئەو بەم بەیتە کا شیوەن بەیان (٣٤)**
**بەختی بەد، مەیدانی کۆتەھ، خانە تێکچوو، تیرەڕۆژ**
**مەطڵەبی زۆر، عومری کەم، ناکام ڕەفت و نەوجەوان (٣٥)**
**سەنگ دەتاوێنێ صەدای پۆشیدەڕوویانی حەرەم**
**«اَلأمان»، ئەی چەرخی سەنگیندڵ لە جەورت، «الأمان» (٣٦)**

(٣٣) بەیتەکە بەم جۆرە مەعنای ڕۆشن نییە. ڕەنگە بەم جۆرە بووبێ:

کێ لەبەر تابووتی ئەودا گریەوو شینێ دەکا؟

پێی بڵێن: تو خودا: «إلى محشر» بکا داد و فیغان

ئەوکاتە واتاکە ڕوون دەبێ: واتە: هەر کەس کە لەبەر تابووتی ئەودا شیوەن دەکا و دەگری، پێی بڵێن: با وازنەهێنێ و تا مەحشەر هەر هاوار بکا.

چییە داد و (کم): چە دادی و.

(٣٤) واپەسماندەگان: ئەوانەی پاش مردووەکە ماون. کا: بکا.

واتە: ئەو کەسە کە شین بۆ مەحموود بەگ دەکا، با دوو شت ڕەچاو بکا: یەکەم حاڵی ئەوانە بێنێتە یاد کە دوای ئەو بەجێ ماون، خزم و کەسوکاری؛ دووەم ئەم بەیتە بۆ باسی مەحموود بەگ بڵێ، یانێ بەیتی دوای ئەم بەیتە.

بەیتە کا (کم): بەیت ئەکا.

(٣٥) واتە: پوختەی باسی مەحموود بەگ ئەمەیە کە بەختی خراپ، مەیدانی کورت، ماڵی تێکچوو، ڕۆژی تاریك، ئامانج و هیوای زۆر و تەمەنی کورت، ناکام و بەئاواتنەگەیو و جوانەمەرگ بوو. بەم جۆرە ئەم سێ بەیتەی پێشوو بەیەکەوە بەستران.

کۆتەھ (کم، گم): کەوتە. ناکام ڕەفت (کم): ناکام و ڕەفت.

(٣٦) پۆشیدەڕوو: ئەو ئافرەتانەی کە لە ماڵی مەحموود بەگ ڕوومەتیان لە نامەحرەم دادەپۆشن.

واتە: ئاوازی شین و گریانی ژنانی حەرەمسەرای مەحموود بەگ ئەوەندە گەرم و بەکوڵە، بەرد دەتوێنێتەوە. هاوار ئەی چەرخی دڵڕەق لەدەست ستەمت، هاوار!

**دێ بەسەر ڕوویا، بەسەر ڕوخساری زەردا، ئەشکی سوور**
**هەر بەسەر پێدا لە پا دامانی دەڕژێ ناودان (٣٧)**
**هیممەتی پاکان دەبوو لەم ڕێگە وا یاری بکا**
**یاوەری ڕێگەی خەطەر بوو، عەدلی بوو بۆ ڕەهرەوان (٣٨)**
**مەعبەری تابووتی تۆ وەختێ کە کەوتە «گردەشین»**
**کەی دەبێ ئیتر بە «ئالان»ا عوبووری کاروان؟ (٣٩)**
**سەددی سەرحەددی عەجەم، هەم پاسەبانی مەملەکەت**
**شێری بێشەی موڵکی «بابان»، ژێردەستی ڕوومییان (٤٠)**

(٣٧) ڕوویا: ڕوویدا. پادامان: خوار داوێن. دەبێ تەواوکەری بەیتی پێشوو بێ و مەبەست (پۆشیدەڕوویان)ی حەرەم بێ کە فرمێسکی خوێنین بەسەر ڕوخساری زەردیاندا دێتە خوار تا بەرپێ. کۆتایی بەیتەکە لە (کم)دا «نارەوان» و لە (گم)دا «نارەوادان»ە. ئەوە هەڵەی ڕوونووسکەرەوەیە، دوو شت هەڵدەگرێ: سا یا «نارەوان»ـە، کە ڕێی تێناچێ، چونکە فرمێسك بەردەوامە و ڕەوانە نەك نارەوان؛ یان «ناودان»ـە، بە مانای پلووسك، کە بۆ ئەم شوێنە گونجاوە و یانێ ئەو فرمێسکە لە خوار داوێنی ئەو ئافرەتانەدا زۆر دەبێ و دەبێتە پلووسك.

هەر بەسەر پێدا .. تاد (کم): هەر بەسەر پێدا لە پادامانی دری ژنانی نارەوان!!

(٣٨) واتە: هیممەتی پاکان و چاکان دەبوو لەم ڕێوڕەسمی بەخاكسپاردنەدا هاوڕێ بێ، چونکە کاتێك ئەو بە سەر زیندوو بوو، هاوڕێی پڕمەترسی بوو و دادی هەبوو بۆ ڕێبواران و ڕێگوزاران، کەس لەبەر دادی ئەو زیانی پێ نەدەگەیی.

لەم ڕێگە (کم): لەم ڕێگەم. یاوەری (کم): ئەو ڕێیە.

(٣٩) مەعبەر: گوزەرگا، شوێنی پەڕینەوە. گردەشین: گردێکی نزیکی دێی شیوەکەڵە. ئالان: دێهاتی بەری باکووری ڕۆژاوای ناوچەی شارباژێر.

واتە: گوزەری تەرمەکەت کە کەوتە «گردەشین»، ئیتر کەی کاروان بە «ئالان»دا گوزەر دەکا؟ یانێ: یا نابێ گوزەر بکا، یا ڕێگەی نییە گوزەر بکا. لەوانەیە گردەشین ناوی گۆڕستانەکەیان بووبێ.

مەعبەری (کم): مەعبەرەی.

(٤٠) واتە: تۆ ئەی مەحموود، لە ڕووی دەسەڵاتی عەجەمدا بەربەستێ بووی، پاسەوانی وڵات بووی، شێری بێشەی موڵکی بابان بووی، کە ئەوانیش ژێردەستەی ڕۆمییان بوون.

ڕۆمییان. (کم): ڕوویان.

**حوکمی تۆ حیصنی ویلایەت، عەزمی تۆ پەرژینی باغ**
**عیظمی تۆ پابەندی ساریق، عەدلی تۆ ئەمنی مەکان (٤١)**
**تەرزەکووبی ئافەتی دەستی دزانن باغ و تاك**
**واقیعەن ئەم قەضیە ناوەختە خەزان بوو بۆ ڕەزان (٤٢)**
**پیشەوەر، دوزدانی سابیق، تەوبەکاری سەهمی تۆن،**
**هەر لە ئێستاوە لە دڵدا موستەعیدن بۆ زیان (٤٣)**
**نۆکەر و سوارەی تفەنگدارت سەراسیمەن هەموو**
**نەظمی تێكچوو، مانەوە وەك گووسفەندی بێشوان (٤٤)**
**ذائیقەی "سالم" هەوای شەکراوی شاییی بوو بە خێرا!**
**ئاسمان ڕیتی بە شەڕ ژەهری بە دەمدا ناگەهان (٤٥)**

(٤١) واتە: دەسەڵاتی تۆ قەڵای وڵات، ورەی بەتینت پەرژینی باخی وڵات بوو، هەروەها گەورەیی تۆ پێی دزی بەستبووەوە، دادی تۆ ئاسایشی جێگە و ڕێگە بوو.

حوکمی تۆ (کم): حاکمی. عیظمی (گم): عەزمی. لەبەرئەوەی لە نیوەی یەکەمدا هەیە، گونجاو نیە.

(٤٢) تەرزەکووب: تەرزەکوت کە دوژمنی داری بەردارە کاتی گوڵکردن. تاك: داری مێو.

واتە: باخ و ڕەز زیانلێکەوتووی دەستی دزانن. مردنی ناوەختی مەحموود بەگ -بە ڕاستی- بوو بە خەزان بۆ باخ و ڕەز، چونکە پاش ئەو دزی دەست پێ دەکاتەوە.

ازان (گم): ڕەزانن. پێمان وایە (دزانن) ڕاستە کە بۆ ئەم شوێنە دەست دەدا.

(٤٣) پیشەوەر: خاوەنپیشە. سەهم: سام، مەبەست ترسە.

واتە: ئەو دزانەی پێشوو کە دزی پیشەیانە، لە ترسی تۆ تۆبەیان کردبوو و دزیيان نەدەکرد، ئەوانە هەر لە ئێستاوە لە دڵدا ئامادەن بگەڕێنەوە بۆ سەر پیشەی جارانیان.

سەهمی (کم): سامی.

(٤٤) گووسفەند: مەڕ.

واتە: نۆکەر و سوارەکانی تفەنگدارت، هەموو سەرگەردان وماڵوێرانن، وەك مەڕومااڵتی بێشوانیان لێ هاتووە، چونکە دۆخەکە شێوا و شیرازەی کاروبار تێكچوو.

(٤٥) ڕیتی: ڕشتی.

واتە: زەوقی سالم بە خێرێ حەزی لە شەکراوی شایی دەکرد، حەزی لە شیرینی بوو، بەڵام لە ناکاودا ئاسمان بە شەڕ ژەهری ڕژاندە ناو دەمی، شایی بوو بە شیوەن. "سالم" هەم ناسناوە و هەم ئاماژەیە بۆ

ئەوە کە مەحموود ساغ بووە و لەپڕ مردووە.

ئەم بەیتە هێمایە بۆئەوەی کە دەڵێن: ئەم مەحموود ئاغایە لە لایەن حاکمی تورکی حوکمداری لیوای سلێمانییەوە دەرمانخوارد کراوە و ژەهریان بۆ کردووەتە ناو خواردن. دیارە ئەم مەحموودە لایەنگری بابانەکان بووە و ڕۆمی لێی بەقین بوون، چونکە بۆیان دەستەمۆ نەکراوە. "پیرەمێرد" هەر لەو بابەتە ئاماژەبۆکراوەیدا لە زمانی "ئەحمەد حەسەن" ناوێکی پیاوی مەحموود ئاغاوە وەك شایەتحاڵ گێڕاویەتیەوە کە: عەزیز پاشای موتەسەڕیفی سلێمانی [لیستی موتەسەڕیفەکانی لیوای سلێمانی لە دەورانی حوکمی عوسمانیدا ناوێکی وەهای تێدا نییە، دەبێ سەرلەشکری ناوچەی سلێمانی بووبێ] بە فێڵ مەحموود ئاغای بانگ کردووەتە شار. ئەویش بە پێنجسەد تفەنگەوە هاتووە و لەسەر (کاریزی دایکی پاشا) خێوەتی هەڵداوە. عەزیز پاشا میوانداریی کردووە و ژەهری بۆ خستووەتە ناو خواردن و بەوە مردووە.

شایی (گم): سایی. لەوانەیە هەڵەی چاپ بێ.

-٦- (*)

بۆ منی سەرگەشتە، ئەلحەق، بێوەفا بوو ئاسمان
دەرحەقم ئەمجارە یەکسەر پڕجەفا بوو ئاسمان (١)
تێکیدا بونیادی وەصڵ و شیشەیی بەزمی شکاند
بۆ خەرابی موڵکی دڵ، پڕموودەدعا بوو ئاسمان (٢)
«الغرض» هات ڕۆشناییی دڵ لەبەر شەمعی موراد
دەرحەقی بەختم نەسیمی صوبحگا بوو ئاسمان (٣)
چاکچاک و لەتلەتە سینەم لە ئەندووهی فیراق
بۆ دڵی خوێنینی من، تیری قەضا بوو ئاسمان (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ق، نم)دا هەیە. بەوەدا کە باسی غەوغای موڵکی بابان و وێرانیی کوردستان لەم پارچەشیعرەدا کراوە، دیارە سالم لە ڕۆژانی سەرگەردانیی خۆی و ڕووخانی میرایەتیی باباندا وتوویەتی.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەقسوور.

(١) سەرگەشتە: سەرلێشێواو.

واتە: ئاسمان -بە ڕاستی- بۆ منی سەرلێشێواو زۆر بێوەفا بوو. ئەمجارە دەرحەق بە من پڕ بوو لە دەرد و ئازار.

بێوەفا (نم): پرفەنا. پڕ جەفا (نم): بێوەفا.

(٢) پڕموددەعا: پڕ ئیددیعا، ڕقلەدڵ.

واتە: ئاسمان بناغەی نزیکیی لە یارەوە ڕووخاند و شووشەی شەرابی شکاند، زۆر ڕقلەدڵ بوو بۆ کاولکردنی موڵکی دڵ.

شکاند (نم): شکان.

(٣) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی هەر لە (نم)دا هەن.

الغرض: مەبەست پوختەی مەبەستە، کورت و پەتی.

واتە: پوختەی قسە ئەوەیە کە دڵ ڕووناکیی لەبەر مۆمی ئاواتی بەدیهاتوودا بۆ هات، بەلام -دەرحەق بە بەختی من- ئاسمان بوو بە سروەی بەرەبەیان و چرای موورادی کوژاندەوە.

(٤) چاکچاک: لەتلەت. ئەندووە: پەژارە و خەم.

**وەك هەماوەردانی مەیدان، چاو و ڕووی هەر وا لە من**
**بۆ کەمینم گەردشی ڕووبەرقەفا بوو ئاسْمان! (٥)**
**چونکە زانیی دڵ موحەصصەن بوو لەتاو جەیشی فیراق**
**وەك عەلەم بۆ لەشکری میحنەت بەپا بوو ئاسْمان (٦)**
**تێکیدا غورفەی مورادم، بوومەلەرزەی ئینقیلاب**
**بۆ بناغەی موڵکی عیشقم بەدبەنا بوو ئاسْمان (٧)**
**موڵکی بابان پڕ لە غەوغا، خاکی کوردستان خەراب**
**مایەیی فیتنە و فەساد و ماجەرا بوو ئاسْمان (٨)**

واتە: سینەم بەدەست خەمی جیاییەوە لەتلەتە. ئاسمان تیری قەزا و قەدەر بوو بۆ دڵی خوێناویی من.

لەتلەتە (نم) لەت لەتی. هەڵەیە.

(٥) ئەم بەیتە لە (نم)دا حەوتەمە، لە (ق)دا نییە.

هەماوەرد: دوو کەس زۆران پێکەوە بگرن، یا دژی یەك بجەنگن، هەر یەکێکیان هەماوەردی ئەویتریانە. کەمین: پارێز، بۆسە. ڕووبەرقەفا: ڕوو لە پشت، ڕوو وەرگەڕاو.

واتە: ئاسمان وەك زۆرانگر و جەنگاوەر هەمیشە ڕووی لە منە و لە هەل دەگەڕێ بۆ لێدانم. سووڕی ئاسمان بەرەو دوایە و لە پارێزدایە بۆم، بەختم هەڵگەڕاوەتەوە.

(٦) موحەصصەن: خۆقایمکردوو، خۆپاراستوو.

واتە: ئاسمان، کە زانیی دڵ لەتاو سوپای جیابوونەوە خۆی قایم کردووە، بوو بە ئاڵای لەشکری نەگبەتی و هاتە سەرم.

دڵ موحەصصەن بوو لەتاو جەیشی فیراق (ق): دڵ لەناو عەیشا موحەصصەن بوو بۆ فیراق.

(٧) ئەم بەیتە هەر لە (نم)دا هەیە.

ئینقیلاب: هەڵگەڕانەوە و تێکچوون. بەدبەنا: بەننا و وەستای خراپ.

واتە: بوومەلەرزەی دۆختێکچوون و پاشاگەردانی یانەی ئاواتی تێکدام. ئاسمان بەڕاستی، سەبارەت بە بناغەی موڵکی عیشق، وەستا و بەننایەکی خراپ بوو.

(٨) ماجەرا: نەگبەتی و ماڵوێرانی، لە (ماجری)ی عەرەبییەوە هاتووە.

واتە: موڵکی بابان پڕ لە ئاشووبە و خاکی کوردستان وێرانە، دیارە ئاسمان هۆی فیتنە و تێکچوون و ماڵوێرانی بوو.

خەراب (نم): لە غەم.

**حەققی صوحبەت، بۆ بە چاو نادْرێ سالم! بەسیەتی**
**پار لە وەصلا چەندْ ڕۆژێ ئاشْنا بوو ئاسْمان! (٩)**

(٩) چاو: پارچە کاغەزێکی چوارگۆشە بووە، یەکێ لە پادشا جەنگیزیەکان وێنەی خۆی لێ داوە و وەك پارە برەوی پێ داوە. کە ئەو پادشایە مردووە، پارچە کاغەزەکەیش قاچاغ کراوە و کەس نەیتوانیوە مامەڵەی پێ بکا.

واتە: پار، ئاسمان لە کاتی گەیشتن بە یاردا چەند ڕۆژێ ئاشنا بوو و ماوەی دا بەیەك بگەین. ئەمڕۆ مافی برادەری و دۆستایەتی وەك چاو قاچاغ بووە و سالم ناتوانێ مامەڵەی پێ بکا!

یا: ئەی سالم! بۆ مافی برادەری ڕەچاو ناکەی؟ بەسیەتی بێوەفایی، خۆ ئاسمان پار چەند ڕۆژێ ئاشنات بوو و هەلومەرجی گەیشتن بە یاری بۆ ئامادە کردی و ڕەخساندی!

هەرچۆن بێ ئەمە دوو بار و دوو واتای بوون، ئێمە هی یەکەم بە باش دەزانین.

حەققی صوحبەت بۆ بە چاو ناوێرێ، سالم (ق): حەققی حوججەت بۆچی سالم چاونەزێر بێ، بەسیەتی. (نم): حەققی صوحبەت بۆچ بە چاو نادیرێ، سالم. «ناوێرێ» و «نادیرێ» هەردووکیان هەڵەن و دەبێ «نادری» بووبێ. پار (نم): یا. هەڵەی نووسینە.

## (*) -٧-

## «رزم عزیز بیگ بابان با اسماعیل پاشای رومی»

(*) ئەم پارچەشیعرە درێژە لە (مان، ن، حا، گم)دا هەیە. هەروەك لە (مان، ن)دا نووسراوە، باسی شەڕەكەی عەزیز بەگی بابانە لەگەڵ "ئیسماعیل پاشای ڕۆمی". ئەوەی لە چاپەكەی (گم)دا هەیە، بریتییە لە (٤٣) بەیت، بەڵام لە (مان)دا (١٠١) بەیت و لە (ن)دا (٩٨) بەیت و لە (حا)دا (٩٥) بەیتە. (حا) لە سەرناوی شیعرەكەدا نووسیویە: «ذكر محاربەی میر جلیل الشان عزیز بك بابان با طایفۀ رومی سنه ١٢٦٦ وتسخیر ولایت بابان بدست رومی و الملك پاشا»، واتە: باسی شەڕی میری پایەبەرز عەزیز بەگی بابان لەگەڵ تیرەی ڕۆمی ساڵی ١٢٦٦ [١٨٤٩-١٨٥٠] و داگیركردنی ویلایەتی بابان بە دەستی ڕۆمی و مەلیك پاشا. خوالێخۆشبوو گیوی موكریانی (گم) لە پێشەكی ئەم پارچەشیعرەدا نووسیویە: (جەنگی عەزیز بەگی بابان لەگەڵ ڕۆمیان لە ساڵی ١٨٥١ی بوونیدا).

كۆتایی دەستنووسێكی دینیی كۆن كە لە بەڕێز "ئیبراهیم قادر محەمەد"ەوە دەستكەوتووە، بە كورتی باسی ساڵی ڕوودانی ئەم شەڕەی تێدا نووسراوە. ئەمە دەقی كۆتاییەكەیە: «تمّت الربع الاول من المنهاج من ید الحقیر الفقیر الراجي عفو ملك الانس والجان عبدالرحمن الساكن في قریة شاناخصه الحاصل في ناحیة آلان في مدرسة عالیجناب معلاّ القاب فضائل مآب مولوی مولانان ملا احمد پسری مقدس القاب ملا عثمان في شهر سلیمانیه بابان. در وقت حكومة اسماعیل پاشاه رومیان و منازعت او و عزیز بیگ پسری پاشاه عبدالرحمن. اللهم وفقه بحرمة القرآن».

هەروەها نووسیویە: «تمت هذا الكتاب في روز شمه در وقت عصر في شهر جمادی الاول علی ید أحقر الناس عبدالرحمن شاناخصی پسر رسول الامام اللهم اغفر لي ولآبائي وآباء آبائي في سنة ١٢١٧». لە دواییدا یەكەكەی پاڵ حەوتەكەی گۆڕیوە و كردوویە بە (٦)، واتە (١٢٦٧)، دیارە مێژووەكە كۆچییە و دەبێ شەممەیەكی ڕێكەوتی ٨ یا ١٥ یا ٢٢ یان ١٨٥١/٣/٢٩ی زایینی لە نووسینی كتێبەكە بووبێتەوە.

مەبەست لە نووسینەوەی ئەم كۆتاییە پڕ هەڵە نیوە عەرەبی و نیوە فارسییە، تەنها سێ شتە: یەكەم ساڵی ئەم هەرایە (١٢٦٧ك) بووە، واتە (١١) ساڵ پێش نووسینەوەی دیوانەكە - نوسخەكەی (مان)- بۆ سالم. دووەم ئەوەیە نووسەرەوەی كتێبەكە دوعای بۆ سەركەوتنی عەزیز بەگی كوڕی عەبدوڕڕەحمان پاشای بابان كردووە كە بەڵگەی ئەوەیە ئەو ڕۆژە هەستی نەتەوەیی لەناو كوردانا هەبووە. بەو پێیە:

١. پارچەشیعرەکە باسی جەنگی عەزیز بەگە لەگەڵ ئیسماعیل پاشای ڕۆمی. بەڵام زۆر شتی وەهای تێدایە، بۆمان ڕوون نابێتەوە و زۆر ناویش هاتوون نەناسراون. دیارە شتی وەها پێویستی بە ڕوونکردنەوەی مێژوویی هەیە.

٢. لە (١٢٦٠ك)یەوە میرنشینی بابان زۆر لاواز بوو، چ لەبەر ناکۆکیی ناوخۆ و چ لەبەر شەڕ و هەرای عوسمانی لە ناوچەکەدا. هەر لە (١٢٦٠)ەوە نەجیب پاشای والیی بەغدا کەوتە بیری بە یەکجاری لەناوبردنی دەسەڵاتی بابان، بۆ ئەم مەبەستە ناکۆکیی نێوان ئەحمەد پاشای بابان و عەبدوڵڵا پاشای برایی بەهەل زانی، بەتایبەتی کە عەبدوڵڵا پاشا پەنای بۆ نەجیب پاشا بردبوو. ئەوە بوو ساڵی (١٢٦١ك) لەشکرێکی گەورەی هێنایە سەر ئەحمەد پاشا، لە (نارش)ی کۆیە -کە ساغ نەبووەتەوە کوێی کۆیەیە- جەنگێکی گەورە لەنێوان نەجیب پاشا و ئەحمەد پاشادا ڕووی دا. ئەنجام بە شکانی ئەحمەد پاشا تەواو بوو، کە ڕای‌کرد بۆ ئێران. ئیتر بە ڕاکردنی ئەحمەد پاشا ئاواتی نەجیب پاشا هاتە دی، عەبدوڵڵا پاشای کرد بە قایمقامی سلێمانی.

٣. کە نەجیب پاشا لێ‌خرا و نامیق پاشا بوو بە والیی بەغدا، ئەم نامیقە ئیسماعیل پاشای توركی نارد بۆ کەرکوك و سلێمانی. بە هاتنی ئەو، دەسەڵات و ئیدارەی عەبدوڵڵا پاشا هەر بە ناو بوو، لە ڕاستیدا هەموو شت بەدەست تورکەوە بوو. ئەوە بوو بە پەنهانی فەرمانی دا عەبدوڵڵا پاشا گیرا و نێررا بۆ بەغدا و لەوێوە بە دیلی بۆ ئەستەموول. ئیتر ئیسماعیل پاشا و (کەهیا)ی پیاوی تورك بە ئارەزووی خۆیان کاروباری وڵاتیان بەڕێوە دەبرد.

٤. عەزیز بەگی بابان کە لە لایەن عەبدوڵڵا پاشاوە فەرمانداری ناوچەی بازیان بوو، لەم بارودۆخە زۆر پەرێشان بوو، بە ڕاوێژ لەگەڵ دەستەوبەستەیدا دایان بەسەر سلێمانی‌دا و ئەم شەڕە گەورەیە ڕووی دا. بەڵام هاوڕێکانی عەزیز بەگ خیانەتیان لێ کرد و ئەنجام عەزیز بەگ شەڕەکەی دۆڕاند، لەگەڵ قادر بەگ بە دیلی گیرا، حاکمی سووررداشیش کوژرا و دەسەڵاتی بابان بە تەواوی لەناوبرا.

٥. ئەحمەد پاشایش بە تکا و تکاکاری عەفوو کرا و چوو بۆ ئەستەموول و چەند پلەوپایەی درایێ، وەك والیێتیی (یەمەن) و (وان) و (ئەرزڕۆم) و (ئەطەنە) تا ساڵی (١٢٩٢ك) کە لە ئەطەنە کۆچی دوایی کرد.

شایانی باسە، لە تێکڕای شیعرەکەوە دەردەکەوێ کە ماوەی فەرمانبەدەستیی عەبدوڵڵا پاشا و دەسەڵاتی تورك و (کەهیا)ی دەمڕاستیان زۆر کاری نارەوا کراون و زۆر کەسی سەر بە بابان دەستیان لە کار کێشراوەتەوە و زۆر پایەیش دراوە بە کەسی ناشیاو. هەروەك دەردەکەوێ هەندێ لە ئەصناف و بازرگان و پیشەوەرانی شار حەزیان لە بابانەکان نەکردووە. هێزی تورك و هێزی کورد هاوتا نەبوون؛ سوپای تورك سوپای دەوڵەتێکی کۆنی گەورەی دژ بە هەموو گەلانی ژێردەستی و سوپای عەزیز بەگیش

لێم گەڕێن با گۆشەگیر بم، دەستەوئەژنۆ، کەفزەنان
گێژەڵووکەی بای نەدامەت تاری کرد صەفحەی جیهان (١)
(شارەزوور) بەحر و (سولەیمانی) لەسەر ئاو، گەمیەڕەنگ
بۆ شکستی وەك نەهەنگ بوو، فیتنەیی ئاخرزەمان (٢)
کێ دوعای کردبێ بە سۆز ئەمساڵ لە کشتی (شەهرەزوور)
دا ببارێنێ لە تەنخوای تەرزە ڕۆمی، ئاسمان؟! (٣)

ژمارەیەکی تایبەتی و کەم بوون و لە کاتی شەڕەکەدا پاڵپشتیان لەناو شاردا کەم بووە، بەڵام تێکڕا شەڕێکی مەردانەیان کردووە و پیاوانە گیانی خۆیان لە پێناوی دەرکردنی تورکەکاندا بەخت کردووە. دیارە کە بارودۆخ نالەبار بوو، شێری بێشەیش هیچی پێناکرێ. جگە لەمانە، وەك دەردەکەوێ "سالم"، ئەگەرچی لە تێکڕای شیعرەکەیدا باسی بابان دەکا، بەڵام لەگەڵ بەرەی عەبدوڵڵا پاشا بووە، ئەگینا بۆچی دەربارەی هەرای کۆیە هیچی نەوتووە. کەچی پارچەشیعرێکی دووروودرێژی هەیە دەربارەی بەرەڵابوونی عەبدوڵڵا پاشا و هاتنەوەی بۆ سلێمانی، کە لە پیتی (ه)دا بەرچاوتان دەکەوێ.

با بگەڕێینەوە سەر شیعرەکە کە: یەکەم ناسناوی "سالم"ی تێدا نییە، ئەگەرچی بێگومان هی ئەوە. دووەم پاش و پێش و ڕیزی بەیتەکان لەسەر هێی نوسخەکەی (مان) دانرا، چونکە زۆربەی زۆری بەیتەکان لەوێدا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەقسوور.

(١) کەفزەنان: دەستبەدەستدادان لە خەمباریدا. نەدامەت: نەگبەتی. تار: تاریك.

واتە: وازم لێ بێنن، با دەستەوئەژنۆ دەست لەسەر دەست دابنێم و گۆشەیەك بگرم، چونکە گێژەڵووکەی نەگبەتی لاپەڕەی جیهانی ڕەش کردەوە و تاریك بوو.

گێژەڵووکە (گم): گەردەلوول.

(٢) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (گم)دا نین، لە (حا)یشدا دەیەم بەیتە.

گەمیە: کەشتی.

واتە: شارەزوور وەك دەریایە و سلێمانی وەك کەشتی کەوتووەتە سەر ئاو، فیتنەی ئاخرزەمانیش بووەتە نەهەنگ لەم کەشتییە و هەڵیدەگەڕێنێتەوە.

(٣) ئەم بەیتە لە (حا)دا شەشەمە.

دا: تا. تەنخوا: لەباتی.

واتە: ئەمساڵ کێ دوعای بەسۆزی لە کشتوکاڵی شارەزوور کرد، هەتا ئاسمان لەباتیی تەرزە تورکی

**ڕاسته گەردوون چابوکه بۆ ڕەنگی بەد ڕیتن، وەلیٚ**
**نارژێنیٚ ڕەنگی بەم ڕەنگه به موددەی صەد قیران (٤)**
**بەزمی صەیدی ئێمه صەییادی فەلەك كارێكی كرد**
**ڕەنگه باڵای تیرْقەددان بێته تەركیبی كەمان (٥)**
**ضیعفی طالیع جازیبه، وەك كەهڕوبا، بۆ خوێن و دەم**
**سەیری چیهرەی بەختی من كەن، بوو به ڕەنگی زەعفەران (٦)**
**نەوبەهاری من خەزان و فێنكیی صوبحم تەمووز**
**پەرتەوی ماهه غەم و چاكی دەروونم وەك كەتان (٧)**

عوسمانیی بەسەردا بباریٚنیٚ؟ (شارەزوور)ی بەیتی دووەم لێرە (شەهرەزوور)ە، ئەویان كوردی و ئـەمیان فارسییه.

دا (ن): تا. تەرزە (مان، ن): طەرزە. هەڵەیە.

(٤) ئەم بەیتە لـه (حا، گم)دا حەوتەمە.

چابوك: گورجوگۆڵ. ڕیتن: ڕشتن. قیران: كۆی قەرنە، سەدساڵ.

واتە: ڕاستە گەردوون لـه ڕشتنی ڕەنگی بەددا گورجوگۆڵە، بەڵام ڕەنگی وا تاڵ لـه ماوەی سـەد قەرنیتردا نارژێنیٚ.

(٥) ئەم بەیتە لـه (حا)دا دووەمە.

تیرقەددان: باڵا وەك تیر ڕێك و ڕاستەكان.

واتە: لەوانەیە گەردوونی ڕاوچی بۆ بەزمی ڕاوكردنی ئێمە، باڵای ڕاستی تیرباڵاكـان بـچەمێنێتەوە و بیكاتە كەوان.

بێتە (حا): بیٚ بە.

(٦) كەهڕوبا: كارەبا. چیهرە: ڕوخسـار. كەن: بكەن.

واتە: بیٚبەختیی خوێن وەك كارەبا ڕادەكێشیٚ، سەیری ڕوخسـاری بەختی من بكەن، چۆن بووەتـه زەعفەرانی زەرد.

جازیبە (گم): جاذیبە. ئەمیان ڕاستە. وەك كەهڕوبا (گم): بۆ كارەبا. هەڵەیە.

(٧) واتە: تازە بەهاری من خەزانە، فێنكیی بەیانیانم تـەمووزە، خـەم و پـەژارە تیـشكی مانگـه و دەروونم وەك كەتان لـه بەر ئەو تیشكەدا لەتلەت بووە.

نەوبەهاری (ن): بەوبەهاری. هەڵەیە. خەزان و فێنكی. (گـم): خەزانە و وەقتەكەی. هەڵەیە.

**توركی قورصی خۆر كه طالیع بوو، طولووعی كرد به ڕەقص**
**كەوكەبەی ماهی موڕادی ئەهلی (بابان) بوو نیهان (٨)**
**ئاگری نەگبەت لە خەرمەنهایی طالیع كەوتەوە**
**شەمعی دەوڵەت هەر طەرەف دەگڕا، هەموو خامۆش كران (٩)**
**حەلقە دەین یاران! بلاّ، ئاشوفتەبەخت و تیرەڕۆژ**
**ڕۆژگار دونیای لە ئێمە كردە گێسووی دڵبەران! (١٠)**
**هەوری بەدبەختی كە هاتە ڕووی فەلەك، وەك ڕەنگی قیر**
**كەوكەبەی ماهی موڕادی ئەهلی بابان بوو نیهان (١١)**
**صاعیقە و بەرقی نەدامەت ظوڵمەتی دا شەرق و غەرب**
**بەردەبارانە بە مەخصووصی لەسەر موڵكی بەبان (١٢)**

(٨) ئەم بەیتە لە (مان، ن، حا)دا نییە.

نیوە بەیتی یەكەم دەبوو وا دەستی پێ بكردایە: قورصی خۆری تورك .. تاد.

واتە: كە خۆری تورك بە سەما و شادییەوە هەڵات، دەبدەبەی مانگی هیوای بابان ون بوو. بە كورتی، خۆری تورك هەڵات و مانگی بابان ئاوا بوو.

(٩) ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی لە (گم)دا نین.

خەرمەنها: كۆمەڵە خەرمان. طالیع: بەخت و ناوچاوان.

واتە: ئاگری نەگبەتی بەربووە خەرمانەكانی بەخت و سووتاندنی. شەمعی دەوڵەتی بابان كە لە هەموو لایەكەوە دەگڕا، هەمووی كوژانەوە. "سالم" كە وشەی (دەوڵەت)ی بەكارهێناوە، هەستی نەتەوەیی خۆی لە قووڵاییی دڵیەوە دەربڕیوە.

(١٠) بلاّ: لێگەڕێن. ئاشوفتەبەخت: بەختئاڵۆز. تیرەڕۆژ: ڕۆژتاریك. گێسوو: زوڵف.

واتە: یاران، با گرد ببینەوە و بازنەیێ ببەستین بۆ بەختی تێكچوو و ڕۆژی ڕەش و تاریكمان. چەرخی ڕۆژگار دنیای وەك ئەگریجەی دڵبەر، لە ئێمەیش شێواند.

حەلقە دەین (حا): حەلقە دەن. كردە (حا): كرد بە.

(١١) واتە: هەر كە هەوری بەدبەختی وەك قیر ئاسمانی گرت، درەوشانەوەی مانگی ئاواتی ئەهلی بابان ئاوا بوو.

(١٢) نەدامەت: نەگبەتی.

**چاوی عیبرەت هەڵبڕە، ئەی دڵ! لە وەضعی دەهری دوون**
**سەیر کە سا تورکی فەلەك چیی کرد بە زومرەی کوردزوبان (١٣)**
**چارەسەر کەن ئەهلی دەروێش! نانی مفتیمان بڕا**
**لوولە بوو سفرە و نەواڵە، ون کراوە ظەرف و خوان (١٤)**
**ئەهلی سادات و مەلا و حاجی، بلا شین کەن بە سۆز**
**دەفتەری ئەهلی وەظایف، دیم -عوموومەن- حەك کران! (١٥)**
**عەرصەیی مەیدانی چەرخە، ئێستە جەولانگاهیioووم**
**بوو بە لانەی زاغی بەدخوو، ئاشیانەی باڵەبان (١٦)**

واتە: تریشقە و برووسکەی نەگبەتی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای تاریك کرد، بەتایبـەتی بـەردەبارانی مولکی بابانە.

"سالم" لەم بەیتەدا ئاماژە بـۆ ئـەوە دەکـا کـە ڕۆژهـەڵات و ڕۆژاوا، عەجـەم و ڕۆم، دەسـتیان لـەم کارەساتەدا هەیە. بێگومان ئەمە زیرەکیی سیاسیـیە.

نەدامەت (گم): نحووسـەت.

(١٣) ئەم بەیتە لە (گم)دا نۆیەمە.

دەهر: ڕۆژگار. دوون: هیچوپووچ، سووك و بێبەها.

واتە: ئەی دڵ، چاو هەڵبڕە و پەند لە بارودۆخی دنیای بێنرخ وەربگرە، سەیر بکە تورکی بـەدکاری وەك فەلـەك چیی بە خەڵکی کوردزمان کرد. وشەی (کوردزوبان) هەستی قووڵی نەتەوەیی سالم دەردەخا.

سەیرکە سا تورکی فەلەك (گم): سەیری کە ڕۆمیی دەڵەك.

(١٤) ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی لە (گم)دا نین.

نانی مفتی: نانی خۆڕایی.

واتە: ئەی دەروێشان و بێکەسان مشووری خۆتان بخۆن، بە نەمانی بابـان نـانی خۆڕاییمـان بـڕا، سفرەی نان و بابۆڵە پێچرایەوە و زەرف و خوان نەما.

نانی مفتیمان (حا): نان و نیعمەتتان. ظەرف (حا): ضەرف. هەڵەیە.

(١٥) واتـە: لـێگـەڕێ بـا سـەییدەکان و مـەلا و حاجییـەکان بـە گـەرمی بگـرین، دەفتـەری مووچەخۆرەکان هەموو کوژێندرایەوە.

وەظایف (مان، ن، حا): وەضایف. هەڵەیە.

(١٦) مـەیدانی چـەرخە: دەبێ مـەیدانێکی دیاری بووبێ، وەختی خۆی دەسـەڵاتی بابانەکانی تێدا

**دڵ لە میحنەت کەیلە، تابی سەیری ناوشارم نییە**
**عەینی چاوم خوێنی تێزاوە لە داغی مەردومان (١٧)**
**بێزوبان، کووکووزەنان، هەر خانەدان تێدەفکرم**
**عەنکەبووت خواجانشینە و جفت جوغدن دیدەبان (١٨)**
**حاکمە ڕۆمی لەسەر تەختی «سولەیمانی»، دریغ!**
**کەوتە دەستی دێوی دوون، موهری سولەیمان، «الأمان» (١٩)**

دەرکەوتبێ. یاخود سەردەمی بابانەکانی شووبهاندووە بە مەیدانێکی هێز تێدا نواندن. جەولانگاه: جێگەی جمەوجووڵ. بووم: کوندەپەپوو. زاغ: قەلەڕەش. ئاشیانە: هێلانە. باڵەبان: مەلێکی گۆشتخۆری خێرای ڕاوکەری لە باز گەورەترە.

واتە: ئێستا کونەپەپوو لە مەیدانی چەرخەدا هاتوچۆ دەکا، هێلانەی باڵەبانیش کە مەلێکی ڕاوکەرە، بووەتە هێلانەی قەلەڕەش.

(١٧) ئەم بەیتە لە (حا)دا نییە و لە (گم)دا شەشەمە.

کەیل: پڕ و لێوان. تاب: تاو، توانایی. عەین: سەرچاوە.

واتە: دڵم لە خەم لێوانە و توانایی تەماشای ناوشاری نییە و دڵم نایێ سەیری بکەم. سەرچاوەی چاوم لە داخی ئەو ستەمەی وا لە مەردوم دەکرێ، خوێنی تێزاوە.

تابی (گم): مەیلی.

(١٨) ئەم بەیتە و (٤٣) بەیتی پاشەوەی لە (گم)دا نین.

کووکووزەنان: کووکووکەران، کووکوو دەنگی کۆترەباریکەیە، کینایەیە لە چۆڵەوانی. خواجانشین: ڕاڕەوی دەروازەی خانووی کۆن کە بانی کەوانەیی و خوارەوەی چەند پلەیەکی پێپلکەیە بە نێوان دوو سەکۆی ئەملاوئەولادا بۆ سەرەوە. جوغد: بایەقوش، باڵندەیەکە بە نەگبەتی مەشهوورە. جفت: جووت. دیدەبان: ئەو کەسەیە کە لەسەر بەرزییەك دادەنیشێ و هەر کەسێکی بێگانە بێتە ئەو شوێنە، خەبەر دەدا.

واتە: هەر خانەدانێ کە بیری لێ دەکەمەوە، بێزمانانە هەر کووکوو دەڵێ. ماڵی جاڵجاڵۆکە خواجەنشینە و جووتە بایەقوش چاودێر و پاسەوانن.

خواجانشینە (حا): خواجەنشینە. جوغدن (حا): جوغدان.

(١٩) موهری سولەیمان: ئەنگوستیلەکەی حەزرەتی سولەیمان. ئاماژەیشە بۆ سلێمان پاشای بابان، کە پێشتر سەردەمێ حاکمی بابان بووە.

واتە: داخی گرانم ڕۆمی (تورك) ئەنگوستیلەی حەزرەتی سولەیمانی دەستکەوتووە و لە شاری

**مەجلیسێ وا بێ، موشەخخەص، دوودی گۆگرد عوودە بۆی**
**"دەروێش ئاغا" بوو لە جێی "مستۆ" هەموو شەو نەغمەخوان! (٢٠)**
**عەزل و نەصبی کرد بە تەدبیری (کیا)، مەنصووبی ڕۆم**
**قاوەچی "ئەوضایی قاپی" بێت و "سووران" پاڵەوان؟! (٢١)**
**کێ دەکا تەقسیمی مەنصەب، وا موقابیل شانی شەخص؟**
**بۆ عەزیز سەرواز یەکوم و حاجی قادر ئاشەوان (٢٢)**

سلێمانی حوکم دەکا.

(٢٠) موشەخخەص: وەك بڵێی (بالتأکید)، بە دڵنیاییەوە. مستۆ: سووککراوی ناوی مستەفایە، "کوردی"ی شاعیریش لە پارچەشیعرێکیدا وەك مەقامبێژ ناویی هێناوە: (("مستۆ" ئیبراهیمی، "ئەورەحمان" نەوا و "فەتحی" حەزین .. تاد)).

واتە: مەجلیسێ بەم جۆرە بێ، بێ‌گومان دووکەڵی گۆگردی بۆن‌ناخۆشی تێدا دەبێتە عوودی بۆنخۆش! دەروێش ئاغای دەنگ‌ناخۆش، لەباتیی مستۆی دەنگخۆش گۆرانی دەڵێ. لەوانەیە ئەم دووانە بەناووبانگ بووبن: یەکیان بە دەنگ‌ناخۆشی و ئەوی‌تریان بە دەنگخۆشی. دەشێ دەنگ‌ناخۆشەکە نەیار و دەنگخۆشەکە دۆستی بابان بووبێ. زۆر بەداخەوە ئەم ناوانەی ناو ئەم قەسیدە گرنگە، هەموویان ناناسین و هیچ زانیاریەکمان لەسەریان نییە، هەروەك دەورووبەری کارەساتەکەیش بە تەواوی ڕوون نییە.

مستۆ (حا): مسطـۆ.

(٢١) کیا یا کەهیا: لە (کەتخودا)وە هاتووە، بەگشتی بە کاربەدەستی گەورە وتراوە. پاشان بۆ وەزیری یەکەم لە حکوومەتی ویلایەتدا کە پاشایەك حوکمی کردووە، بەکارهێنراوە. ئەوضا: عەولا "عەبدوڵڵا"، ئەم ناوە لە کاتی عوسمانیدا وا وتراوە و نووسراوە. مەنصووب: دانراو و دیاریکراو.

واتە: فەرمانی دەستلەکارکێشانەوە و دیاریکردنی مووچەخۆر بە ڕاوێژی (کەهیا)ی کاربەدەستی تورك دەردەچوو؛ لە لایەك ئەولای قاپیەوان کرا بە قاوەچی و لە لایێ سوورانی ناتوانا کرا بە پاڵەوان. ئەڵبەت هیچ کامیان شیاوی ئەو کارەیان نەبوون، بۆیە وا دەردەکەوێ ئەوانە لەو وەزیفانەدا دانراون.

مەنصووبی (ن): مەنسووبی، واتە لایەنگر و پیاوی لەسەر وەزیفە دانراوی ڕۆم. دەشێ بەو شێوەیە بووبێ.

(٢٢) واتە: کێ بەپێی شان و شەوکەت پلە و پایە دابەش دەکا، ئەوەتا "عەزیز" پلەی سەربازی

**ئاڵوگۆڕی مەنصەبی دوو شەخصی عالیجاه کرا:**
**"مەحموود ئاغا"ی زل حەکیمباشی، حەمامچی "بابەجان" (٢٣)**
**کۆڵبەدۆش با خەرقەپۆش بن، تاج و کەشکۆڵ هەڵگرن**
**ڕوو کەنە ئەملاکی (پیتر) و بچنە شاری خامۆشان! (٢٤)**
**ئەسکەمل بێنن، قەراریان دەن لە جێی ئاغالەران**
**مەجلیسی شوورا ئەمێستە خاصصە بۆ ئەصنافەکان (٢٥)**

یەکەمی دراوەتێ و حاجی قادریش کراوەتە ئاشەوان.

سەرواز یەکوم (مان، ن): سەروازیی کوم. دەبێ بەو شێوەیە بێ کە نووسراوە. (حا): سەربازە کوم. (و)ی پێوەندی نێوان (یەکوم) و (حاجی) لەوێدا زیادە.

(٢٣) واتە: ئالوگۆڕی جێگەی دوو پیاوی گەورە کرا: "بابەجان"ی سەرحەکیم کرا بە حەمامچی و مەحموود ئاغای زل یا زەل کرا بە حەکیمباشی!

زل (حا): ذل. هەڵەیە.

(٢٤) ئەم بەیتە لە (حا)دا نییە.

کۆڵبەدۆش: کۆڵبەکۆڵ. خەرقەپۆش: دەروێش و عەوداڵ. تاج: کڵاوی کووزکووزی دەروێشی. کەشکۆڵ: توورەکەی تایبەتی دەروێش کە لە ملی دەکا و دەسکەوتی سواڵی تێدەکا، لە کۆندا قەپیلکی گوێزی هیندی بووە کە هێلکەیی و قووڵە، دەروێش زنجیری تێخستووە و سواڵی پێوە کردووە. ئەملاکی پیتر: ناوچەکانی قەڵەمڕەوی سەردەمی ئیمپراتۆر "پیتری گەورە"ی تزار کە دامەزرێنی ڕووسیای نوێیە و چاکسازییەکی زۆری کارگێڕی و ڕۆشنبیریی کرد. پاش داگیرکردنی کەنارەکانی دەریای باڵتیك شاری (پیترسبۆرگ)ی ساڵی ١٧٠٣ بنیات نا و پایتەختی لە مۆسکۆوە بۆ گواستەوە، کە دووسەد ساڵ زیاتر بە پایتەخت مایەوە.

واتە: با خەڵك کۆڵبەکۆڵ و دەروێشڕەنگ بن و تەرکی دنیا بکەن، عاسا و تاج و کەشکۆڵی نامۆیی هەڵگرن و ڕوو بکەنە وڵاتی ڕووس و بچنە شاری بێدەنگان کە کەس ورتەی تێدا لێوە نایێ.

(٢٥) ئاغالەر: ئاغاکان، بنەماڵەیەکی دیاری سلێمانی بووە. شوورا: ڕاوێژ. ئەمێستە: ئێستا.

واتە: خەڵکتان بۆچییە؟ ئەندامتان بۆچییە؟ هەر ئەسکەملە ڕەقوتەقەکە بێنن لەباتیی گەورەپیاوان یا بنەماڵەی ئاغالەرانی شار، چونکە ئەنجومەنی ڕاوێژ ئەمڕۆ هیی ئەسنافەکانە. مەبەستی ئەو کۆمەڵە پیشەوەر و سنعاتکارانەیە کە دژی بابانەکان بوون. دیارە سالم داکۆکیی لە بابان کردووە.

ئاغالەران (ن): ئاغەلەران.

**وا "کەریم ئاغای نەنێ" تەدبیری: هەستە جاف دەکا**
**"خاڵە هۆمەر" دارۆغەی شارە و مودیر "حاجی ئەحان" (٢٦)**
**کەس نەچێتە پێشەوە، "حاجی غەنی" تەدبیرییە!**
**مەئموری ثەبتی نوفووسە و شاغیلی باجی دوکان! (٢٧)**
**"حاجی میرزا" کەوتە ناو کار و ترازووی شاردەوە**
**"مەصرەف"ئاسا حاسیبە بۆ خاصەجاتی (ماڵوان) (٢٨)**
**میری (خوڵمار) و (دەڵێن) ئەمساڵ، مەظەننە، "صالح"ە**
**باز بە "جەببار"یان سپەرد، باقڵ، ئوموری (دۆمەکان) (٢٩)**

(٢٦) لەوە دەچێ ئەم سێ کەسە دژی بابانەکان بووبن، بە هاتنی تورکەکان نانیان کەوتبێتە ڕۆنەوە.
واتە: کەریم ئاغای نەنێ خەریکی ڕاوێژی ئەوەیە جاف هەستێنێ! چۆن؟ نازانرێ. هەروەها خاڵە هۆمەر دارۆغەی سەرۆکی پاسەوانانە و چاودێریی ناوشار دەکا، حاجی ئەحانیش بەڕێوەبەرە.
هەستە (حا): هەستەی. شارە (حا): شار. (و)ی نێوان (شارە) و (مودیر) لە (ن)دا نییە.
(٢٧) واتە: کەس نەچێتە پێشەوە: حاجی غەنی کاری هەیە و خەریکی ڕاوێژ و تەگبیرە، سەری لێ تێك مەدەن، سەرقاڵی جێگیرکردنی نوفووسە و باجی دووکانەکان ڕێكدەخا!
تەدبیرییە (ن): تەدبیرە. هەڵەی نووسینە.
(٢٨) واتە: حاجی میرزای پیاوی تورکەکان کەوتە ناو ئیش و بازاڕ و ترازووی شاردەوە (ڕۆژی دزییە!) و وەك "هەمزاغای مەصرەف"ی بەرپرسی دارایی بابانەکان، حیسابی دەرامەتی جۆگای ماڵوان دەکا. ماڵوان کەوتووەتە نێوان عەربەت و سەییدصادق لە پارێزگای سلێمانیی ئێستا.
حاسیە (ن): حاشیە. هەڵەی نووسینە.
(٢٩) خوڵمار: خورماڵ: ناحیەیەکی سەر بە قەزای هەڵەبجەیە لە پارێزگای سلێمانی. باز: دووبارە.
باقڵ: بە عەقڵم، پێم وایە. دۆم: تیرەیەکی کوردی خەریکی کڵاش دروستکردنە.
واتە: میراو و کاربەدەستی (خورماڵ) و جۆگەی (دەڵێن) "صالح"ە، کاروباری دۆمەکانیش بە "جەببار" سپێردراوە.
(سیری) لە (مان، ن)دا بێمەعنایە! خورماڵ و بەر (دەڵێن) بە دەغڵۆدان و مەرەزە بەناووبانگ بوون، نەك سیر. مادەم "صالح" ناویشی بەدوادا هاتووە، دەبێ وشەکە (میری) بووبێ، واتە صالح میری خوڵمار و دەڵێنە. نوسخەی (حا) بە (میری) نووسیوە.
سپەرد (حا): سپارد.

"ئاغە طاھا" مەشوەرەتچۆیە لەگەڵ سەرکاتبی
وا دەزانم وەرگریٚ حوکمی (چیاسەوز و (شوان)! (٣٠)
بۆ گەڕانی دەوری شار، ئەمشەو "مەلا یوونس" دەچیٚ
مشتەکەی گورز و کەمەندی کشتەك و دەرزیی سینان!! (٣١)
"حامید" و "وەستا حسیٚنی کۆڵ" لە شارا گەزمەچین
هەردو بۆ خویٚنڕیتنی دز کۆ بە کۆ تیشنەن بە جان (٣٢)
شیری قەیچی، تیری دەرزی، زەرگی نیوگەز، دیرعی ڕم!
نەخ کەمەند، ئیسپەر (دتو؟)، جەوشەن بەتیٚ، بەنبڕ ددان؟ (٣٣)

(٣٠) ئاغا طاھا: گەورەی بنەماڵەیەکی ناسراوی سلیٚمانی کە سەر بە تورکان بووە. سەرکاتب: رئیس الکتاب، سەرۆکی میرزاکان. فەرمانیٚکی دیاری کاربەدەستانی تورك بووە. مەشوەرەتچۆ: خەریکی پرس و راویٚژ. چیاسەوز: دیٚیەکی سەر بە ناحیەی ئاغجەلەرە. شوان: ناوچەیەکی باکووری ڕۆژهەڵاتی کرکووکە.

واتە: ئاغا تاھا لەگەڵ سەرکاتب خەریکی ڕاویٚژە و دەیەویٚ نەرمی بکا کە کاروباری (چیاسەوز) و (شوان) بگریٚتە دەست.

(٣١) لەوە دەچیٚ ئەم مەلا یوونسە تورکخوایە دژم بووبیٚ، چونکە ئامرازەکانی نیوەی دووەمی بەیتەکە تایبەت بە دژمن.

واتە: ئەمشەو مەلا یوونس نۆبەچییە بۆ پاسەوانیی دەوروبەری شار، گورز و گۆپاڵی مشتەی پەڕۆکوتین و کەمەندی لە کشتەکی کلاشدوورینە و نووکەتیریشی دەرزییە.

(٣٢) گەزمەچی: شەوگەرد، حەسحەس.

واتە: حامید و وەستا حسیٚنی کۆڵ، کە لەوە دەچیٚ تەنها وەستا حسیٚن یا هەردووکیان بەرگدروو بووبن، لە شاردا حەسحەسن. ئەم دوانە، بە گیان تینوون بە خویٚنی دزان و شاخ بە شاخ بە دوایاندا دەگەڕیٚن. دیارە سالم پلاریان تیٚدەگریٚ، ناحەقی نییە، کۆڵ چۆن کاری حەسحەسی و شەڕەشەوی پیٚ دەکریٚ؟!

(٣٣) سالم لەم بەیتەدا بە تەوسەوە ناوی چەکی ئەو دوو حەسحەسەی هیٚناوە.

قەیچی: مەقەست. زەرگ: نیٚزەی سیٚسووچی باریکی کورت. نیوگەز: پیٚوانیەکی قوماش و شاڵ. دیرع: زریٚ. نەخ: تاڵی دەزوو. کەمەند: پەتی سەرقوڵفەدار بۆ بەستنەوە. ئیسپەر: قەڵغان. دتو؟: ڕەنگە (وتد- وەتەد) بیٚ بە مانای پەواز، یان (وتر- وەتەر) بە مانای ژیٚ. جەوشەن: کراسی زریٚ. بەتیٚ: بطی، بەتیە، عابای هاوینە. بەنبڕ: تیغ.

غەڵبەغەڵبی ((هەی بکوژ)) هەڵسا لە دەشتی (چوارْباغ)
"قادری دەللاکە"، هەر شەو تا سەحەرگەهە، پاسەبان! (٣٤)
سەتڵی سەرخووسێنی تەپڵ و ئەسپی قاپقاپی حەمام!
لۆنگی جەوشەن، شیری کزلك، تۆپزی کاری ددان! (٣٥)
وا موسەللەح بوون بە ئەسبابی یەلی نەججاری شار
بۆ کەمینگاهی گوزەر وەك شێری بەندی بەردران (٣٦)

واتە: مەقەست شمشێری دەستی، دەرزی تیریەتی، نیوگەزەکە زەرگە، گەزی ڕمە، دەزووی کەمەنـدە، قەڵغانی پواز یان ژێـە، عابا کراسی زرێـەتی، ددانی خۆی تیغیەتی.

زەرگی (حا): خرکی. دیرعی (حا): زەرعی. (ینبن) لـە (مـان، ن)دا دەبـێ (یـەنبن) بووبـێ، وەك لـە (حا)دا نووسراوە. ددان (مان، ن): دوان. هەڵەیە. مادام ناوی چەند ئامرازێکی وەك مەقەست و دەرزی و قەڵغان و شتیوا هێنراوە، دەبێ (بەنبن) بێ کە ئامـرازێکی لـەو بابەتەیـە بـە مانـای تیـغ و لەگـەڵ (ددان) دەگونجێ، نەك (دەوان) کە بۆ ئێرە نابێ.

(٣٤) واتە: غەڵبەغەڵبی بگرە و بەریمەدە و بیکوژە لـە دەشتی چوارباغ بەرز دەبووەوە. قادری ناتری حەمام شـەو تا بەیانی پاسەوانە!

(٣٥) لۆنگ: فۆتەی حەمام، پەشتەماڵ. کزلك: قەڵەمبڕی بچووك.

واتە: ئەم قادری دەلـلاکە کە کراوەتە پاسـەوان، تەپلەکـەی بریتییـە لـەو سـەتڵەی کـە سـەری کڕیارەکانی خۆی تێدا دەخووسێنێ بۆ تاشین. قاپقاپی حەمام ئەسـپەتی. پەشـتەماڵی حـەمام کراسـی زرێینیەتی. چەقۆی بچووکی قەڵەمبڕ شمشێریەتی. کاری تۆپزی بە ددانی جێبەجێ دەکا.

سەتڵی (مان، ن، حا): سەطلی. تەپڵی (مان، ن، حا): طەبڵی. تۆپزی (مان، ن، حا): طـۆپزی.

(٣٦) یەل: پاڵەوان. کەمینگاه: حەشار، شوێنی خۆشاردنەوە بۆ ڕاو یا بۆسە بۆ کوشتنی خـەڵك. شێری بەند: شێری بەندکراو.

واتە: وا کۆمەڵی دارتاشانی شار پڕچەك بوون بە ئامێری پاڵەوانی بۆ ڕێگەگرتن، وەك شێری نـاو قەفەزی بەردراو هاتنە مەیدان.

خوێندەوار کە ئەم بەیتانەی بەرچاو دەکەوێ، عەقڵی بۆ ئەوە دەچێ کـە کاسـبکاران و بازرگـان و ئەم کەسانە لـەتەك حوکمی بابان ناتەبا بوون و بەرژەوەندیان لـەگەڵیان جووت نەهاتووەتەوە.

ناچەخ و تیر و کەمان و زەرگ و دەشنە و دەهرە بوو
ئەسکەنە و تێشە و مشار و لێسك و مەنگەنە و کەوان (٣٧)
چاکی کرد "میرزا سلێمان" پاسی دەککەی زیندروو
سەنگەری دەستگایە بۆ شەڕ، شەو هەتا وەختی بەیان! (٣٨)
مشتەیی نایە هەمانە و دەیوەشێنێ میثلی گورز!
گازنی تیژی نەجەخ، زووپین درەفش، ئیسپەر هەسان! (٣٩)
موونیسی خاصص و ئەدەبئامووزی پاشایە "بزە"
بۆ نەدیمی چوون "وزە"ش بێنن لە (تیمار) و (کچان) (٤٠)

(٣٧) ناجەخ: ناچەخ ڕاستە، تەوورزین، تیرێکە سواری جەنگی بە پاڵی زینی ئەسپەکەیەوە دەیبەستێ. دەشنە: کێرد یا خەنجەرێکی چکۆلەی نووکتیژی دەمی تیغ بەرزی دەسك‌کورتە. دەهرە: قەمەیەکی سەر وەك داسی مشتووئاسنە. ئەسکەنە: ئامرازی دارکۆڵینی دارتاش. تێشە: تەشوێ. لێسك: تیغی دەمخواری کەوچك‌تاشین.

واتە: تیر و کەوان و زەرگ و خەنجەر و قەمەی ئەم دارتاشانە، بریتی بوون لە ئامێرەکانی دارتاشی وەك ئەسکەنە و تەشوێ و مشار و لێسك و مەنگەنە و کەوانی مەتێ کە داری پێ کون دەکرێ. سالم گاڵتەیان پێدەکا.

(٣٨) دەککە: دووکانی بچووك.

واتە: میرزا سلێمانی زیندروو چاك پاسی دووکانەکەیی دەکرد، چونکە دەستگای زیندروونەکەیی شەو تا بەیانی بۆ شەڕ کردبووە قەڵغان!

(٣٩) مشتە: ئامرازی چەرمکوتانی دۆم و کەوشدروو و زیندروو. گازن: پارچە پۆلایەکی تیژی سەر وەك دەمە تەورە و بۆ بڕین و ڕێکخستنی چەرم بەکار دێ. نەجەخ: ناچەخ، تەوورزین. زووپین: نێزەیەکی بچووکی سەر دووفلیقانەیە. ئیسپەر: قەڵغان.

واتە: ئەم میرزا سلێمانە زیندرووە، کە یەکێکە لەوانەی هێنراونەتە مەیدانی پاڵەوانی، مشتەکەی خستووەتە ناو هەمانە و وەك گورز دەیوەشێنێ، لەباتیی تەوورزین گازن، لەباتیی نێزەی سەر دووفلیقان درەوش و لەباتیی قەڵغان هەسان بەکاردەهێنێ. دوور نیە سالم (مشتە و هەمانە)ی بە ڕەمز بەکارهێنابێ و مەبەستی پێ سیخوڕی بێ.

مشتەیی نایە (حا): مشتەی نایە ناو.

(٤٠) پاشا: مەبەست موتەسەڕیفی سلێمانییە، دیارە کە تورك بووە! موونیس: هاودەم و خەمڕەوێن.

**باشخەیاطی خەرقەیی (کەهیا) "ئەله کۆپاندروو"!!**
**"ئەحمەد ئاغای دەرزیباشی" بوو بە قاترچیی خەران!! (٤١)**
**هەی پەنا بە خوا لەدەست ئێڵی غەوارەی دەوری شار:**
**کافرۆشی و چنگنی و چووچانیی و جافی تەلان! (٤٢)**
**عەزمی هەر کارێ بکا، -فەرضەن- ئەگەر "کاکئەحمەد"ە**
**وای دەماڵن سێ کەڕەت تا دێتە (کانیی ئاسکان)! (٤٣)**

نەدیم: هاومەجلیس و قسەخۆش. تیمار: دێیەکی بەری ناوچەی (قەرەداخ)ە لە پارێزگای سلێمانی. کچان: دێیەکی ناوچەی (سەنگاو)ە. "بزە" و "وزە"یش، لەوە دەچێ دوو زەلامی لۆتیمەشرەب بووبن.

واتە: ئەدەبفێرکەر و خەمڕەوێنی تایبەتیی پاشا "بزە" بوو، چوون "وزە"یش بۆ هاودەمیی بزە، یا بۆ هاودەمیی پاشا، بێنن. ئەم دوو نموونەیە لە دێی تیمار و کچان بوون.

(٤١) دەرزیباشی یا تەرزیباشی: باشخەیات، سەروەستای بەرگدرووەکان.

واتە: هەموو شتێك لەم وڵاتەدا هەڵگەڕاوە و پێچەوانەیە؛ ئەوەتە بەرگدروو و خەرقەدرووی (کەهیا) "ئەلەی کۆپاندروو" بوو، دیارە کورتاندروو و بەرگدروو کوجا مەرحەبا؟ ئەگەرچی دەستی خۆش و کەهیا لەوە زیاتر هەڵناگرێ! کەچی ئەحمەد ئاغای سەربەرگدرووی دیاری کرا بە قەتارچیی کەران، ئەڵبەتە ئەمەیان سەر بە بابان بووە و تۆڵەیان لێ کردووەتەوە.

(٤٢) غەوارە، کافرۆشی، چووچانی و چنگنی: لە تیرەکانی هۆزی جافن، غەوارە لە نێوان پێنجوێن و سەیدصادق و کافرۆشی لە ناوچەی بازیان دادەنیشن و هەموویان لە ناوچەی سلێمانی جێگیرن. تەلان: دێیەکی ناوچەی (سووورداش)ی پارێزگای سلێمانییە.

ساڵم داد و هاواریەتی لەدەست کردەوەی ناپەسەندی ئەمانە، کە تێکچوونی دەسەڵاتی بابانیان بە هەل زانیوە و هەڵیانکوتاوەتە سەر شار! دیارە هەڵوێستیان دژی بابان بووە.

خوا (ن): خودا.

(٤٣) فەرضەن: تەنانەت، یا وای دابنێین.

واتە: ستەم و دەستدرێژی ئەوەندە زۆر بوون، لەوانەیە تەنانەت ئەگەر "کاکئەحمەدی شێخ"یش تەنها بیەوێ بە جووڵانەوەیەکی عادەتی بجووڵێتەوە، سەرباری ڕێز و پیرۆزییەکەی، سێ جار گەڕەکەکەیان دەماڵنەوە و گسکی لێ دەدەن و تاڵانی دەکەن، تا دەیگەیێننە (کانیی ئاسکان) کە گەڕەکێکی ڕۆژئاوای سلێمانییە.

**بۆ نەجیبانی ویلایەت بوونە ئافەت، نانەجیب**
**جامەیی شەهری لەدەست صەحرانشین بەس دادڕان (٤٤)**
**"بانەیی" و "ئەوضا سوتەڵ"، هەردوو شەریکی قیسمەتن**
**ئەبتی طوغرا بوون بە حوکمی (ماوەت) و سەمتی (قەشان) (٤٥)**
**لوطفی ڕۆمی پەرتەوی ڕۆژە، لە نیك و بەد دەدا!!**
**لەقلەق و نێریش دەچن بۆ ضابطیی نەهری (مووان)! (٤٦)**
**کەس نەڵێ ڕۆمی لە تەسخیری مەمالیك چابوکن**
**سستییی بەختی عەشیرەت بوو بە چالاکیی ئەوان! (٤٧)**

(٤٤) جامە: کراس. شەهری: شاری، خەڵکی شار.

واتە: خەڵکی نانەجیب بوونەتە ئافەتی گیانی نەجیبانی شار، کراسی شارییەکان بە دەست دێنشینەکانەوە دادڕان.

سالم لێرەیش هەموو خەڵکی دەشت بە نانەجیب دادەنێ و خەڵکی شار ئەوانەی وا سەر بە بابانن، بە نەجیب. بێ‌گومان نابێ مەبەستی هەموو دەشتنشینەکان بێ، بەڵکوو تەنها ئەوانەی کە دژی حوکمی بابان بوون. ئیتر سالم لەو ڕۆژەدا بیری لەوە نەکردووەتەوە کە بۆچی ئەم جۆرە خەڵکانە دوژمنی بابانن؟ تەنها ئەوەی ڕەچاو کردووە کە بابانەکە حوکم و دەسەڵاتێکی خۆماڵییە.

صەحرانشین (حا): سەحرانشین.

(٤٥) بالنی: بەپێی نوسخەی (ن) (بانەیی)یە، کە ناسناوی کەسێکی بە ئەسڵ خەڵکی (بانە)ی دیوی کوردستانی ئێران بووە. ئەوضا سوتەڵ: عەولا سووتەڵ. دەبێ ئەم جووتەیش سەر بە تورکەکان بووبن، وا بە فەرمانی پاشاکەیان کاری بەڕێوەبردنی (ماوەت) و (قەشان)ی دوو دێی ناوچەی شارباژێڕیان وەرگرتووە.

(بالنی) لە (مان)دا هەڵەی نووسینە. (و)ی نێوان (بالنی) و (ئەوضا) لە (مان)دا نییە.

(٤٦) نێری: حەیوانەکێوییی شاخداری نێر.

سالم پلاری گرتووەتە دەسەڵاتی تورکەکان و بە شێوەیەکی ڕەمزی وتوویە: نەوازشی تورك وەك ڕووناکیی خۆر (!) وەهایە، چاك و خراپ دەگرێتەوە: لەقلەق و نێری، لێهاتوو و لێنەهاتوو دەچن بۆ ڕێکخستن و میراویی جۆگەی (مووان) لە ناوچەی شارەزوور!

ضابیطی (مان، ن، حا): ظابیطی. هەڵەیە.

(٤٧) چابوك: چالاك.

واتە: کەس نەڵێ تورکەکان ئازان و وڵاتان دەهێننە ژێر دەستیان، چونکە سستی و بەدیی بەختی

**وەر نە ڕۆستەم وەك ئەمان کەی دێتە دەست بۆ چابوکی؟**
**وا بە جورئەت، وا بە غیرەت، وا یەل و صاحێبسینان! (٤٨)**
**وەختی حەملەی ڕۆژی مەیدان موددەعی وا پێدەکەن؛**
**دێتە لەغزش پێ و ڕیکاب و سست دەبێ دەستی عینان (٤٩)**
**شێری بیشەی موڵکی «بابان»، مەردی مەیدان ظاهیرە**
**گەر کەسێ بێنێتە خاطر دەستوبردیی گەرمیان (٥٠)**
**مەرگی تورکانی جەفاجۆ صەد قەدەم پێش گوللە کەوت**
**تا پلە ئەنگوشتێ بۆسێ، ئەو گەیشتە سەر نیشان (٥١)**
**ئیختیراعی تورك لە دڵدا مەشقجۆی شێوەی شوغال**
**یەککەتازی کورد لە دونبالی وەکوو شێری ژیان (٥٢)**

عەشیرەتی ئێمە بووە بە مایەی چالاکیی ئەوان.

(٤٨) یەل: پاڵەوان. سینان: سەری ڕم.

واتە: ئەگەر بەدبەختی نەبێ چۆن ڕۆستەم وەك بابانەکان ئاوها چاونەترساو و بەغیرەت و پاڵەوان و تیربەدەست دێتە دەست؟

ئەمان (حا): عەزیز. ڕاستترە، چونکە باسی کەسێکی وەك ڕۆستەم کراوە.

(٤٩) لەغزش: لەرزە. ڕیکاب: ئاوزەنگی. عینان: جڵەو.

واتە: کاتێ هێرشی وەها سەر لە دوژمن دەشێوێنن و وای پێ دەکەن، پێی لە ئاوزەنگیدا دێتە لەرزین و دەستی جڵەویشی سست دەبێ.

دەکەن (حا): دەکا.

(٥٠) شێری بێشە: شێری جەنگەڵ، ئازا.

واتە: ئەگەر یەکێ لە بیری بێ و شەڕی بەدەستوبردی گەرموگوڕیان بێنێتەوە بیر، بۆی دەردەکەوێ شێری بێشەی موڵکی بابان "ظاهیر بەگ"ە. لەوە دەچێ ئەم ظاهیر بەگەیش یەکێك بووبێ بۆ خۆی، یا ظاهیر ناو نییە و مەبەست ئاشکرایە.

ظاهیرە (حا): میر عەزیز.

(٥١) واتە: تورکانی ستەمکار کاتی جەنگ سەد پێ پێش ئەوەی گوللەیان بگاتێ، لێی دەکەوتن و دەمردن، تا ئەنگوست پیلکەی تفەنگی ماچ دەکرد، گوللە دەیدا لە نیشان.

(٥٢) تورك داهێنانەکەی ئەوە بوو بە شێوەیەکی بێدەسەڵاتانە و سستی وەك چەقەڵ مەشقی کردبوو،

**خۆ لە بیمی تیغی جانفەرسایی میر، ئەو ڕۆژە تورك**
**میثلی کەوباڕی هەڵۆبین شەشجیهەت لێكهەڵوەشان (٥٣)**
**هەر کە شوعلەی ماهیچەی تیغی بوڕەهنە، بوو ظوهوور**
**وەك قوڵنگی شەوچرابین تێکەڵاو بوون، ڕۆمییان (٥٤)**
**گوللەتۆپ وەك تۆپی قایش بوو لە ئاقار غیرەتی**
**طەبعی جۆیای بەزمی شێلگ بوو لە جێی سینەی کەمان (٥٥)**
**بۆ قوماری مەعرەکە تیغی بە ڕووتی نابەزێ**
**بۆ جەلای جەوهەر لە خوێنی موددەعی وەردەگرێ، قان (٥٦)**

لە کاتێکدا تانجیی کورد وەك شێری ڕاستەقینە بەدوایدا ڕایدەکرد.

(٥٣) بیم: ترس. جانفەرسا: گیانئازاردەر. میر: مەبەستی عەزیز بەگە. کەوباڕ: بێچووەکەو. هەڵۆبین: چاوی بە هەڵۆ کەوتبێ.

واتە: سوپای تورك لە ترسی تیغی گیانئازاردەری عەزیز بەگ، وەك بێچووە کەوێك کە هەڵۆ ببینێ، سەری لێ شێوا، ڕاست و چەپ و سەر و خواری لێ تێكچووبوو.

لێكهەڵوەشان (حا): لێكدابڕان.

(٥٤) ماهیچە: مانگە بچکۆلە، وێنەی مانگی یەكشەوە کە لە ئاڵتوون و زیو و جەواهێرات دروست دەکرا و لەسەر ئاڵای پادشاهان دادەنرا، بەڵام سالم لێرەدا بۆ ئەو تیغە بریقەدارەی بەکارهێناوە کە نیمچە کەوانەییە. بوڕەهنە: ڕووت.

واتە: هەر کە تیشکی تیغی ڕووتی بابانیان دەرکەوت، ڕۆمییان وەك قاز و قوڵنگ کە بە شەو چرا ببینن و بە شەوارە بکەون، بەیەکدا دێن.

(٥٥) جۆیا: بەدواداگەڕاو. بەزم: کەیف و شادی. شێلگ: دەستڕێژی تفەنگ و ڕیزی گوللە. سینەی کەمان: بەزەویداکەوتن و هەستانەوەی تیری کەوان، یا (سینەکەمان)ە کە ئامرازێکی کۆنی مۆسیقایە.

واتە: گوللەتۆپی تورك بەرامبەر بە مەردایەتی و غیرەتی جەنگاوەرانی بابان، وەك تۆپی لە چەرم دروستکراو وابوو، هیچ کاریگەری و زەبری نەبوو. لەباتیی بەزەویداکەوتن و هەستانەوەی تیر و نیشاننەپێکانی، حەز لە دەستڕێژ و ڕیزی گوللەی تفەنگ دەکرا؛ یان لە جێی ئاوازی ئامێری مۆسیقای وەك سینەکەمان، خولقی گەڕان بەدوای کەیف و شادیی دەستڕێژکردن لە ئارادا بوو.

(٥٦) قوماری مەعرەکە: شەڕی بردنەوە یا دۆڕاندن. جەلا: دەرکەوتن. موددەعی: دوژمن کە تورکە. قان: خوێن.

**شۆری مەخفیی ڕۆمییان، زانیوتە بۆ ظاهیر دەبوو؟**
**نووکی نەی دەیخۆند لە دڵیانا هەموو ڕازی نیهان! (٥٧)**
**ئیسمی قابیض بوو، لە جێی جەوهەر، لە حەربەی ڕممی ئەو**
**وەك چەپەر پۆستەی ئەجەل هات و بە تورکی دا نیشان (٥٨)**
**وەختەبوو تای پیرەهەن کفنی حەیات کەن بۆ مەمات**
**هەر لەناکادا نیظام دایان لە ڕیزی باڵەبان (٥٩)**
**ئاهی ئەم حاکمانە تەحقیقە، ئەگەر نەگرێ نیظام**
**قەومی نووحیش دەچنە جەننەت، بێ شك و شوبهە و گومان (٦٠)**
**صەرفی نەقدی ڕۆحی شیرین بوو، هەتا پەروەردە بوون**
**بەچچەگورگئاسا لە ئاخر کەوتنە کۆزی دوودمان (٦١)**

واتە: خەنجەر و شمشێری بە ڕووتی هەڵکێشراو لە شەڕی بردنەوە یا دۆڕاندا کاری خۆی دەکا و نابەزێ، چونکە خوێنی دوژمن وەردەگرێ بۆ مشتومالدانی خۆی تا گەوهەری خۆی دەربخا.

(٥٧) نووکی نەی: مەبەستی نووکی تیرە.

واتە: زانیوتە بۆچی شۆر و هەرای شاراوەی تورکان دەردەکەوێ؟ نووکی تیر لە دڵیاندا بوو بە نەی و هەموو پەنامەکییەکانی دەخوێندەوە.

(٥٨) قابیض: ئیزرائیل، گیانکێش، فریشتەی گیانکێشان. حەربە: نێزە، قەمە. چەپەر: تەتەر. نامەبەر. پۆستەچی. ئەجەل: وادەی مەرگ.

واتە: ناوی گیانکێش لە شوێنی جەوهەری نێزە و قەمەی ئەو دەهێنرا، فریشتەی گیانکێشان وەك تەتەر هات و مردنی نیشانی تورکان دا.

(٥٩) واتە: ئەوەندەی نەمابوو کراسی ڕۆمیەکان ببێتە کفن و بکوژرێن، کەچی لە ناکاودا کەوتنە لێدانی ڕیزی چەند دەهۆڵێکی گەورە (باڵەبان) کە نیشانەی سەرکەوتنی ڕۆمییان بوو.

پیرەهەن کفنی حەیات کەن بۆ مەمات (حا): پیرەهەنیان بێتە جامەی ئاخیرەت.

(٦٠) نیظام: مەبەستی سوپای تورکە.

واتە: ئەگەر ئاهی ئەم حاکمانەی بابان کە تێدا چوون، سوپای تورك نەگرێ و نەیسووتێنێ، بێگومان قەومی نووحیش دەچنە بەهەشت. یانێ سوپای ڕۆمی لە قەومی نووح ستەمکارتر بوون.

(٦١) واتە: نەختینەی گیانی شیرین لە پێناوی پەروەردەکردنی سوارەی باباندا بەخەرج درا و بە خوێنی دڵ پەروەردە کران، کەچی ئەوان وەك بەچکەگورگ کەوتنە ناو کۆزی خانەدانەکان و لەناویان بردن!

**فەرقی فەخری میرْئالاّ گەییبیە بەهرام و ئەسەد**
**کەوتە قەعری چاهی غەم لەو حاڵە، میری بازیان (٦٢)**
**باز وەکوو بازی تەوار دەورێکی کرد و هاتەوە**
**دەوری کەهیا و شاری دا، دیسان بڕا ڕای نۆکەران (٦٣)**
**ئاغەلەر، وەك گورچکی گا، هەر یەکێ فیکرێ لە دڵ**
**خۆ نیظامیش میثلی سەوسەن، جوملە خودڕوو، دووزوبان (٦٤)**
**هاتە ژێر پاساری تەنگ لەشکر، ڕیکاب ئەندەر ڕیکاب**
**کەوتنە سەر کۆڵان و بێڕێگە، عینان ئەندەر عینان (٦٥)**

بەچچە گورگ‌ئاسا لە ئاخر (حا): عاقیبەت وەك گەللەگورگ ڕەو. (گم): بەچکە گورگ‌ئاسا لە ئاخر.

(٦٢) فەرق: تەپڵی سەر. بەهرام: ئەستێرەی مەریخ. ئەسەد: بورجی پێنجەمی پاش قـرژاڵ و وێنـەی پێنجەمی ناوچەی بورجەکان لە نیوەگۆی باکووری ئاسماندا کە بە شێوەی شـێری نێـر دەردەکـەوێ، بەرامبەر بە مانگی گەلاوێژە. قەعر: قووڵایی، بن. چاه: چاڵ.

واتە: لەوکاتەدا کە "عەزیز بەگ"ی میری بازیان کەوتە قووڵاییی چاڵی خەم و شکا، سەری میرئالاّی تورك گەییبە ئاسمان، گەییبە مەریخ و ئەسەد، دیارە سەرکەوتوو بووە.

میرئالاّ (گم) میملاّیی.

(٦٣) باز: دووبارە. تەوار: چابوك و تیژپەر، بازی مێیینە.

واتە: عەزیز کە هێشتا بە تەواوی بەیدەست نەکرابوو، وەك بازی ئـازا دەورێکـی‌تـری دایـەوە و هاتەوە مەیدان. وەك چۆن باز بەچـکەکانی لـە تەنگانـەدا بـەجێ‌ناهێڵـێ، دەوری "کـەهیا" و شـاری سلێمانیی دا و ڕێی نۆکەرانی تورك بڕا.

تەوار (مان، ن): طەوار. شاری دا (حا): شاری گرت. بڕا ڕای. (گم): بە ڕاڕای.

(٦٤) ئاغەلەر: ئاغاکان، بنەماڵەیەکی دەسـڕۆی شـار بـووە. گورچـك: گورچـیلە. سەوسـەن: گوڵێکە بە چەند ڕەنگ دەبێ. جوملە: هەموو. خودڕوو: کەسێ فێر و پەروەردە نەکرابێ.

واتە: ئاغاکان وەك گورچیلەی گا بچووك بوونـەوە و هەریەکـە بیریـان لـە شـتێك دەکـردەوە. سوپای تورکیش وەك گوڵە سەوسەن بە چەند ڕەنگ و زمانێ خۆی نوواند.

ئاغالەر وەك گورچکی گا هەر یەکە (گم): وەگ گورچکی هەر یەکە. ناتەواوە. خودڕوو (گم): دووڕوو.

(٦٥) واتە: لەشکر ئاوزەنگی لەپاڵ ئاوزەنگی هاتە ژێر پاساری تەنگی دیواری خانووی گەڕەکەکان.

**بوو بە جێی بەبر و غەضەنفەر، کووچە کووچە و ناو سوقاق**
**سەرمەحەللە ڕەنگی بێشەی گرت لە نێزەی جانسْتان (٦٦)**
**ڕەنگی صەحرای مەحشەری بوو شیوەکەی لای (پیرمەصوور)**
**گرمەگرمی تۆپی ڕۆمی، هەوهەوی سوارەی (بەبان) (٦٧)**
**پەیکی تەقدیر بوو بە سەققا، ڕاوییەی ظوڵمی بە دۆش**
**ئاوی ئەڵماسی بە تیزی ڕیتە حەلقی پڕدڵان (٦٨)**
**ئارەقی ئابی نەبوو، غەیرەز شڕەنگ، مینایی تیغ**
**بێخودیی نەشئەی خەمۆشی تا حەشر بوو بۆ یەلان (٦٩)**

هەروەهایش، جلّەو لەناو جلّەو کەوتە کۆڵان و شوێنی بێڕێگە.

بێڕێگە (گم): سەرسیلە، واتە سەرەتای کۆڵانی ڕێگە.

(٦٦) واتە: کووچە بە کووچە و کۆڵان بە کۆڵان بوو بە شوێنی بەور و شێر. سەری کۆڵان وەك بێشەی لێ هاتبوو، ئەوەندە سەرە نێزەی گیاندەرکێشی تێدا بەرز بووبووەوە، دەتوت بێشەیە.

کووچە کووچە و (حا، گم): کووچە کووچە.

(٦٧) واتە: شیوەکەی (پیرمەسوور) کە لەناو گەرەکی (مەڵکەندی)دایە و کەوتووەتە بەشی باکووری سلێمانییەوە، ڕەنگی دەشتی مەحشەری گرتبوو، لە لایەك گرمەگرمی تۆپی ڕۆمی و لە لایەك هۆهۆی سوارەی بابان.

(٦٨) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (گم)دا نین.

پەیك: نامەبەر، تەتەر. سەققا: ئاوگێڕ. ڕاویە: ئەو دەفرەی کە ئاوەکەی تێدایە. دۆش: کۆڵ. تیز: تیژ. ڕیتە: ڕشتە. حەلق: گەروو و قوڕگ. پڕدڵ: دڵپڕ، جەنگاوەرانی ئازای بابان.

واتە: تەتەری قەزاوقەدەر بوو بە ئاوگێڕ و دەفری پڕستەمی بە کۆڵەوە بوو. ئەم ئاوگێڕە ئاوی بەسەر خەڵکدا دابەش نەدەکرد، بەڵکوو ئاوی ئەڵماسی تیغ و ژەهری مەرگی بە تیژی دەڕژاندە ناو قوڕگی جەنگاوەران.

(بوو) لە (ن)دا کەوتووە.

(٦٩) شڕەنگ: ژەهر، کاڵەکەمارانە کە زۆر تاڵە. بێخودی: بێهۆشی. یەلان: پاڵەوانان.

واتە: مینای شیر و خەنجەری جەنگاوەران ئارەقی ئاوی نەبوو، تەنها ژەهری پێوە بوو. بێهۆشی و نەشەی بێدەنگی تا حەشر بوو بە بەشی جەنگاوەران.

**بوو بە جاڕووبی مەحەللە هەر طەرەف پەنجەی پەڕیو**
**پەیکراو بێپێ لە مەیدان، پەهلەوان وەك پاڵەوان (٧٠)**
**«سەن سەن»ی سوارەی نیظام و «گێل ئۆڵان»ی تورك ئوشاخ**
**بگرە بگرەی کوردزوبان و ئاخ ئاخی تورکمان! (٧١)**
**قەهرناك و سەربوڕەهنە، ئاتەش‌ئەفشان، حەملەوەر**
**جەنگجۆ بوون یەك بە یەك هەر سوو وەکوو بەبری بەیان (٧٢)**
**هەی خودا ڕۆ، لەو دەمە چیی کرد غەوی تۆپ و تفەنگ؟**
**سەرزەمین تاریك و دونیا تۆز و کەڕ گوێی ئاسمان (٧٣)**

(٧٠) جاڕووب: گسك.

واتە: پەنجەی پەڕیوی خەڵك بووە گسکی گەڕەکەکان، ئەوانەی وا لە مەیدانـدا دەسـتوپەل بـڕاو بوون، بێپێ بوون. پاڵەوانی ئازای نەپێکراو وەك واشەی بەهەڵمەت بوون.

بێپێ (حا): پێ بوو. هەڵەیە. «پەیکراو» شێوەی «پێکراو»یش هەڵـدەگرێ، بـە مانـای بەرکـەوتوو و کوژراو. پەهلەوان وەك (گم): پەهلەوانی. «پاڵـەوان» لـە هـەموو نوسـخەکاندا کـە هـەر «پەهلـەوان»ە، ناگونجێ بەو جۆرە دووبارە کرابێتەوە و دەبێ «پاڵەوان» بێ بە مانای واشە، کە بۆ ئەم جێیە دەست دەدا.

(٧١) سەن سەن: تۆ تۆ. گێل ئۆڵان: وەرە کوڕە. ئوشاخ و ئوچاق: تورکی منداڵ.

واتە: لایەك تورك سەن سەنی بوو، «کوڕە وەرە»ی بوو، لایەك بگرە بگرەی کوردزمان بـوو. لایـەك ئاخ ئاخی تورکان بوو، بگرە و بەردە و من و تۆ بوو، کوشت و هاوار و ناڵین بوو.

نیظام و (گم): نیظامی. «گێل» لە (ن)دا کەوتووە.

(٧٢) قـەهرناك: تـووڕە و ڕقهەسـتاو. سـەربوڕەهنە: سـەرپەتی، سـەرڕووت. ئاتـەش‌ئەفـشان: ئاگروەشێن. حەملەوەر: هەڵمەتبەر. جەنگجۆ: شەڕکەر و ئازار. بـەبری بـەیان: دڕەندەیـەکی ئـازای دوژمنی خوێنەخۆی شێرە.

بەیتەکە وەسفی جـەنگاوەرانی کـردووە و وتوویـە: ئەوانـە تـووڕە و سـەرپەتی و ئاگروەشـێن و بەهەڵمەت و شەڕکەر و ئازا بوون، وەك بەبری بەیان.

(٧٣) غەوی: دەنگی زۆر بەرز.

واتە: ئەی هاوار لە سامی ئەو ڕۆژە، ناڵەی تۆپ و تفەنگ چیی کرد، سەرزەمین تاریك، دنیا پـڕ لە تۆز، گوێی ئاسمانیش لە بیستنی ناڵە کەڕ بوو!

خودا (گم): خوا. غەوی (گم): تەقەی.

**ماهی طالیع ڕووی میحاق و ڕۆژی نەگبەت جیلوەگەر**
**خەرمەنی شادی لەبەر با، بەرقی غەم ئاتەشفشان! (٧٤)**
**لاغەریی طالیع شکاندی، حەسرەتا، بازووی قەوی**
**ئەختەری بورجی موظەففەر، خۆی لە ئێمە کرد نیهان (٧٥)**
**گەرچی پێشاپێش بە هەیبەت چوون و ئازا کەوتنە باڵ**
**حەسرەتا، باز هەم نەیانزانی نیظام وا بێحەیان (٧٦)**
**سێ بلووك لای پشتی گرت و سونگیدووران هاتنە پیش**
**فیرقەیێ لای (پیرمەصوور) و نیوی کۆڵانی (ئەحان) (٧٧)**

(٧٤) واتە: مانگی بەخت ڕووی لە (میحاق) بوو و گیرابوو، خۆری نەگبەتی جیلوەدار بوو. خەرمانی شادی لە بەر بادا بوو، لەباتیی خەمبەبادان شادی بە با درا، خەمیش ئاگری دەوەشاند. یانێ خەرمانی شادی هەم با دەیبرد و هەم ئاگر دەیسووتاند و ئاگر و با پێکەوە کاریان دەکرد.

ڕووی (مان، حا): ری. (گم) ڕێی. وا بزانین هەردووکیان هەڵەن، -وەك نووسراوە- (ڕووی) ڕاستە.

(٧٥) ئەختەر: ئەستێرە.

واتە: داخەکەم بەختی لەڕی کوردان بازووی بەهێزی شکاندن، هەروەها ئەستێرەی بورجی سەرکەوتوو خۆی لە ئێمە شاردەوە.

بازووی. (گم): بازوو و.

(٧٦) باز: دیسان. نیظام: سوپای تورك.

واتە: ئەگەرچی کوردان بە هەیبەت و سام و باڵگرتنەوە چوونە پێشەوە بۆ مەیدانی جەنگ و ئازایانە تێهەڵچوون، بەڵام داخەکەم دیسان نەیانزانی سوپای تورك وا بێشەرم و ئابڕوون.

پێشاپێش (گم): پێشاوپێش. چوون و ئازا کەوتنەباڵ (گم): بوون و ئازا چوونە پێش. (چوون) لە (ن)دا کەوتووە.

(٧٧) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (حا)دا نین.

بلووك: سریەی عەسکەری. سونگی: قەمە. سونگیدووران: ئەوانەی قەمەیان بەدەستەوە بوو دوور بوون، یا بە قەمە دروێنەی خەڵکیان دەکرد، یا سونگیدەوران: قەمەی گەمارۆدەر، یان سەنگی دەوران: بەردی قەزا و قەدەری ڕۆژگار.

هەر چۆن کۆمەڵی جەنگاوەرانی بابان لە هەموو لایەکەوە گەمارۆ دران، سێ سریەی عەسکەری پشتیان لێ گرتن، کۆمەڵی قەمەبەدەست هاتنە پێشەوە، تیپێك هاتنە لای (پیرمەسوور) و نیوەیان بۆ کۆڵانی ئەحان.

**سەربلووکیان خاڵەکەی هەورامی بوو و "قالەی شەریف"**
**هەم ڕەفیقیان بوو "عەزیز"ە حیزەکەی (چووچانییان) (٧٨)**
**پێشی دەمیان ئۆغڵەمەی تۆپ، پشتی سەر ئەو ئاگرە**
**گەییە چەرخی هەفتەمین لەو حینەدا ئاھ و فیغان (٧٩)**
**غەیری تیغی تەڕ، گەرووی لەبتیشنەگان ئاوی نەدی**
**کوشتەگانی کوردزوبان، دەدوت شەهیدی کەربەلان (٨٠)**
**گوێی فەلەك کەڕ بوو لەبەر ناڵە و نەفیری ئەهلی شار**
**لامەکانی گرت صەدای ناڵە و فیغان و ((الأمان)) (٨١)**

سێ بلووك (گم): سەربلۆك. سەربلۆك: سەرۆكی بلۆك. (گم) نیوەی دووەمی بەیتی پێشووی دووبارە داناوەتەوە.

(٧٨) ئەم بەیتە لە (مان، ن)یشدا نییە.

واتە: فەرماندەی سریەكەیان خاڵەی هەورامی و "قالەی شەریف" بوون، عەزیزە نامەردەكەی چووچانییەكانیش هاوڕێیان بوو. ئەم زەلامانە سوارە و نۆكەری توركەكان بوون.

هەورامی بوو و (گم): هەورامی بوو.

(٧٩) ئۆغلەمە: گرمەگرم.

واتە: بەردەمی جەنگاوەرە كوردەكان گرمەگرم و تۆپ بوو و پشتیان ئاگری بلووكەكان بوو، ئەو كاتە ئاھ و ناڵە و هاوار گەیشتە ئاسمانی حەوتەم.

ئوغلەمە (گم) شێلكی. هەفتەمین لەو حینەدا (گم): حەوتەمین لەو عانەدا.

(٨٠) ئەم بەیتە لە (حا، گم)دا نییە.

گەروو: قوڕگ. لەبتیشنەگان: لێو تینووەكان.

واتە: قوڕگی بریندارانی تینوو، جگە لە تیغی تەڕ، دڵۆپی ئاوی نەدی. كوژراوانی كوردزوبان دەتوت شەهیدەكانی كەربەلان، كە بە تینوویەتی سەریان نایەوە.

دەدوت (ن): دەدگوت.

(٨١) لامەكان: دنیای ناماددی كە شوێنێكی دیاریكراوی نییە.

واتە: گوێی ئاسمان لە بیستنی ناڵە و هاواری ئەهلی شار كەڕ بووبوو، ئەو هەموو ستەمەی نەدەبیست. دەنگی ناڵەناڵ نەك تەنها هەموو جێ (مكان)یێكی گرتەوە، كەوتە (لامەكان)یش.

(ناڵە و)ی یەكەم (گم): ناڵەی. (ناڵە و)ی دووەم (گم): ئاھ و.

**مووددەعی کوێر بێ، نیظام ئیفلیج، مەکان زیروزەبەر**
**میری (سووورداش) و "ئەمینە"ی پیاوی، هەردوو ئەنگووان (٨٢)**
**گەر عەشیرەت گریە کەن هەریەك، هەتا دەمرن، کەمە**
**کوشتنی ئەو بای موخالیف بوو لە شەمعی دوودمان (٨٣)**
**ڕۆژی قەتڵ ئەمڕۆیە، ئەلحەق ((وا حوسەین))ی پێ دەوێ**
**بۆ ئەدای قەضیە سەراسەر نیلْگوونە ئاسمان (٨٤)**
**یادگاری حاکمان و جانشینی سیلسیلە،**
**ناموراد و نەوڕەس و مەقصەدنەدیو و نەوجەوان (٨٥)**
**سا فەلەك! کەیخوسرەوی خوێنی سیاوەش گوم مەکە**
**ڕۆستەمی ثانی "عەزیز"ە و مووددەعیی توورانییان (٨٦)**

(٨٢) سووورداش: ناوچەیەکی بەری ڕۆژاوای پارێزگای سلێمانییە.

واتە: چاوی بەدکار و ناحەز کوێر بێ، سوپای تورك ئیفلیج بێ، شوێن سەرەوژێر و کاول بێ، میری سووورداش و ئەمینەی خزمەتکاری هەردوو پێکران و کوژران. دیارە ئەم میرە یەکێك بووە لە ناودارەکانی بابان.

(٨٣) واتە: ئەگەر هەموو عەشیرەتی بابان تا ئەندازەی مردن بۆ ئەم کارەساتە بگرین، هێشتا کەمە. کوشتنی میری سووورداش بایەکی خراپ و پێچەوانەی ڕووی ڕاستەقینە بوو بۆ مۆمی خانەدان و کوژاندیەوە.

دەمرن (گم): ئەمرن. کوشتنی ئەو (حا): کوشتنی میر. (گم): کوژتنی میر. لە (گم): بە.

(٨٤) نیلگوون: شین.

واتە: ئەمڕۆ ڕۆژی کوشتارەکەی کەربەلایە، تەنها حوسەین ڕۆ ((وا حوسەین))ی پێ دەوێ. هەموو ئاسمان شین بووە بۆ جێبەجێکردنی ئەم مەسەلەیە کە پرسە و ماتەمە.

قەضیە (گم): تازییە. وا بووایە جوانتر دەبوو.

(٨٥) نەوڕەس: نۆبەرە، تازە پێگەیشتوو.

سالم درێژەی بە وەسفی میری سووورداش داوە و وتوویە: یادگار و جێنشینی زنجیرەی حاکمانی بابان بوو، ئازا و نەوجەوان و تازەڕەسیو بوو کە لەکیس چوو.

نەوڕەس. (گم) نەورەسی.

(٨٦) ئەم بەیتە و پێنج بەیتی پاشەوەی لە (گم)دا نین.

**قادری قودرەتنوما! تۆ قودرەتی خۆت کردە کار**
**"قادر"ی ئێمەت موسەلسەل خستە بەندی ڕۆمییان (٨٧)**
**وەر نە قادر! تۆ دەزانی قەت کەسێ قادر نەبوو**
**وا بە مەقهووری، بکا "قادر" ئەسیری ڕۆمییان! (٨٨)**
**گوللە وەك تەرزە دەباری، ئەهلی لەشکر کەوتنە باڵ**
**پای ڕیکابیان قورسلەنگەر بوو، سەبوك دەستی عینان (٨٩)**
**هاتنە ناو کۆزیلەکەوە، چەندێك سەلامەت چوونە دەر**
**بەعضێ کوژران، جوملەیێ گیران و چەندێ ڕووت کران (٩٠)**

واتە: دە سا ئەی فەلەك! کەیخوسرەو ئاسا و ئازایانە خوێنی سیاوەش ون مەکە و تۆڵـەی بـسێنە. عەزیز، ڕۆستەمی چەرخی خۆیەتی و موددەعیی تورکانە. مەبەستی ئەوەیە هەروەك سیاوەش بە دەستی ئەفراسیاب و توورانییەکان ڕۆیشت و ڕۆستەم تۆڵـەی سـەندەوە، مـیری سووررداشـیش تورکـەکان کوشتیان و عەزیز ڕۆستەمی دووەمە و تۆڵەی دەستێنێ.

(٨٧) قادر: دوور نییە قادر پاشای سلێمان پاشای ئیبراهیم پاشای بابان بێ، کە ساڵی ١٢٥٨ك (١٨٤٢-١٨٤٣) محەمەدنەجیب پاشای والیی بەغدا -پاش ئەحمەد پاشا- کردیە میری بابـان، بـەڵام نەچووە سەر کار و میرایەتیی نەبینی (بڕوانە: عماد عبدالسلام رؤوف، إدارة العراق- الاسر الحاكمة ورجال الادارة ة والقضاء في العراق في القرون الوسطى، بغداد، ١٩٩٢، ص٢٦١).

واتە: ئەی خودای توانای توانایینوێن، تۆ توانی خۆتت کردە کار و "قادر"ی پیاوی ئازای بابانت بە زنجیرەوە خستە بەندی ڕۆمەکان.

ئێمەت (حا): میرت.

(٨٨) واتە: ئەگینا خودایە تۆ ئاگاداری کەس نەیدەتوانی قادر بەزێنێ و بە شکاوی دیلـی بکـا. قادری یەکەم: خودایە. قادری دووەم: هەر کەسێکی توانا. قادری سێیەم نـاوی یـەکێکی تایبەتـە لـە بابانەکان کە دەشێ قادر پاشای ناوبراو بووبێ.

(٨٩) واتە: گوللە وەك تەرزە دەباری. سوپای ڕۆم باڵی لێ پەیدا بووبوو، پێیان لـە ئاوزەنگیـدا خۆی نەدەگرت و دەستی جڵەویان شل بووبوو.

ئەهلی لەشکر کەوتنە باڵ (حا): ئەسپی کەوتوو کەوتنە ڕەت. قورس (مان، ن): قورص.

(٩٠) کۆزیلکە: کۆز، چەپەر، کۆمەڵ و کۆبووەوە.

واتە: ڕۆمییەکان کەوتنە ناو و گەمارۆ دران، هەندێکیان بە سەلامەتی دەرچوون، هەندێکیان کوژران و

**ئەم لە غەمدا هاتە جۆش، ئەو سێر و ئەمیان بوو غەنی:**
**سەگ لە لاك، عەسكەر لە ماڵ و دڵ لە تیغی قاتیلان (٩١)**
**دەرپەڕین، باز مەیلی ئیقدامیان نەبوو لەو بیدعەتە**
**حەسرەتا! یەكدڵ نەگەینە شیوەكەی گردی (گولان) (٩٢)**
**مەیلی لانیان بوو، وەكوو كەروێشكی پاش ڕاو هاتنەوە**
**دەرنەچوون، چا بوو، بە حەملەی دێڵە (كەهیا) كول كران (٩٣)**
**گەر مەحەللی گریە بوو، ئەو وەختە من زۆر پێكەنیم**
**پوورە "ماتان"، "ئەحمەد ئاغا"ی بردە شكڵی (دۆمەكان)! (٩٤)**

كۆمەڵێكیش ڕووت كرانەوە.

(٩١) سێر: تێر.

واتە: سەگ لە ئەنجامی ئەم شەڕە خوێناوییەدا لە لاك تێر بوو، عەسكەر بە تاڵان دەوڵەمەند بوو، دڵیش لە خەمی ستەمی بكوژان هاتە جۆش.

ئەو سێر و ئەمیان (حا): ئەم سێر و ئەویان.

(٩٢) باز: دیسان. ئیقدام: دەستكردنەوە، هاتنە پێشەوە. بیدعەت: شتێكی لەوەوپێش نەبووە. گولان: گردی (مامەیارە)ی ئێستایە، كە پێشتر لە دەرەوەی نزیكی ڕۆژهەڵاتی شار بووە و مردووانی نەخۆشیی گولیی لێ نێژراون، بۆیە ناوی (گولان)ی لێ نراوە.

واتە: ناكۆكی كەوتە ناو ڕیزی كوردان و بە هۆی ئەو قسەوقسەڵۆكی بڵاوكراوەی ناڕاستانەوە، ئیتر ئارەزووی دەستكردنەوە و شەڕیان نەما. ئەوەیش كارێكی كرد هەموویان یەكدڵ نەبن و نەگەنە شیوی لای گردی (گولان)ی مەیدانی شەڕ.

(٩٣) ئەم بەیتە لە (مان، ن، حا)دا نییە.

كولكران: شەكەت و ماندوو كران، دیلكران، یا كۆڵكران: نوقسان كران.

واتە: ئەوانە وەك كەروێشكی ماندووی ڕاونراو كە خۆی دەشارێتەوە، مەیلی لانیان هەبوو و خۆیان دەشاردەوە و نەیاندەویست دەركەون. بە هێرشی دێڵە كەهیای تورك لە لان دەرنەچوون و نەكەوتنە بەردەست، ئەوپەڕی شەكەت و ماندوو بوون یا نوقسان یان دەستگیركران. ((چا بوو))، دەستەواژەیەكی نەگونجاوە بۆ ئێرە، ڕەنگیشە مەبەست ئەوە بێ كە هەر چاكیش بوو نەكوژران.

(٩٤) واتە: ئەگەرچی ئەو وەختە وەختی گریان بوو، من زۆر پێكەنیم بە ڕووداوە سەیرەكانی ئەم دنیایە دەهات: پوورە "ماتان"م دی، ئەحمەد ئاغای بردە شكڵ و جلوبەرگی دۆمەكان، تا نەناسرێتەوە و

**گەرچی میصرە (شارەزوور)، ئەمما خەرابە بێ "عەزیز"**
**ڕووو دەدا لەم خەڵقە ئاخر، حاڵەتی کەنعانییان (٩٥)**
**شێری بێشەی موڵکی (بابان) بوو "عەزیز"، ئەمما دریغ**
**وەك گرێی داموسکی بێ، ئاو قەومەکەی زوو هەڵوەشان (٩٦)**
**دیدە نابینایە وەك "یەعقووب" لە هیجرانی "عەزیز"**
**تۆی خودا! صاحێبمەکان و تۆی خودایا! لامەکان (٩٧)**
**کەوکەبەی بەختی "عەزیز"م وا لە چاها بێنەدەر**
**شەعشەعەی ئەمری مونەووەر کا، زەمین و ئاسمان (٩٨)**

بەر دەستی دوژمن نەکەوێ؛ یا ئەحمەد ئاغا سەر بە تورکەکان بووە، پوورە ماتان لێی هاتووەتە دەم و ئابڕووی بردووە!

گەر (گم): سەد. ئەو وەختە من (گم): ئەمما ئەمن. شکڵی (گم): شڵی. هەڵەی چاپە.

(٩٥) واتە: ئەگەرچی شارەزوور ئاوەدانە وەك میسر، بەڵام بەبێ "عەزیز"ی بابان وەك وێرانەیە. ئاخری خەڵکی ئەم وڵاتە بەدەست دوژمنەوە، تووشی دەردی کەنعانیەکان بوون بە دەست فیرعەونەکانی میسرەوە. سالم شانازی بە وڵاتەکەی و بە عەزیز بەگی بابانەوە دەکا و وڵاتەکەی ئەوی کردووە بە وڵاتی میسر و ئەمیش بە عەزیزی میسر کە خاوەنی شکۆ و دەسەڵات بووە.

خەرابە (گم): خراپە. دەدا (گم): ئەدا. لەم خەڵقە ئاخر (ن): ئاخر لەم خەڵقە.

(٩٦) دریغ: حەیف. داموسك: مووی کلکی یەکسم.

واتە: بەداخەوە، ئەگەرچی عەزیز شێری بێشەی وڵاتی بابان بوو، بەڵام ڕیزی قەومەکەی شل و شێواو بوو، وەك گرێیەك لە مووی وڵاخی یەکسم بێ کە زوو دەکرێتەوە، وا زوو هەڵوەشان و پەرەوازە بوون.

(ئاو) لێرەدا گونجاو نییە و دەبێ بە هەڵە نووسرابێ و لە بنەڕەتدا (وا) بووبێ، یانێ وەها قەومەکەی لە بەریەك هەڵوەشان.

(٩٧) واتە: چاو، وەك چاوی یەعقووبی باوکی یووسف کە لەتاو دوورکەوتنەوەی کوڕەکەی نابینا بوو، نابینا بووە. خودایە تۆ خاوەنی هەموو شوێنێکی و شوێن و جێوڕێیشت دیار نیە.

خودا (گم): خوای. خودایا (گم): خودایی.

(٩٨) کەوکەبە: ورشەوپرشە. شەعشەعە: درەوشانەوە.

واتە: ورشەی بەختی عەزیزم لە چاڵدایە، دەری بێنە، تا گڕ و ڕووناکیی فەرمانی ئەو زەوی و ئاسمان نوورانی بکا. عەزیز و چاڵ، ئەم بەسەرهاتە لە چیرۆکەکەی حەزرەتی یووسف (د.خ) وەرگیراوە.

**چەنگڵی شەهبازی بازی (بازیان)ی باز نەدی**
**فش هەڵات کەهیا لەسەر بەیضەی طەمەع وەك ماكییان (٩٩)**
**بۆ مەداری نانی عەشرەت، قەت مەدارێکی نەبوو**
**ئاشەکەی طەبعی بە ئاوی کەیدی ڕۆمی هاتە دان (١٠٠)**
**بەختی سووتێ، سا لە ڕێی حەق، حەق حەقی لێ وەرگرێ**
**بەدنمەك گیری نمەك بێ، وەك ئەوانی دا بەمان! (١٠١)**

کەوکەبەی (گم): کەوکەبی. "عەزیز"م وا لە چاها بێنە دەر (حا): بە عیززەت وا لە چاها بێنە دەر. (گم): لە چاهادا بە پرتەو بێتە دەر.

(٩٩) چەنگڵ: چنگ، قولاپ. شەهباز: شاباز. بازیان: ناوچەیەکی باشووری ڕۆژاوای سلێمانییە. باز: دیسان. بەیضە: هێلکە. طەمەع: تەماع، چاوچنۆکی. ماكییان: مریشکەبەکڕ.

واتە: "کەهیا"ی پیاوی تورك ڕۆژیەتی کە چنگاڵی شابازی بازیانی دووبارە نەدی و دیل کرا، فش بووەوە و وەك مریشکەبەکڕ لەسەر هێلکەی تەماع خەوت. دیارە بازی بازیان عەزیزە کە حاکمی بازیان بووە.

چنگڵی (گم) جەنگەڵی. باز (حا): ئاخ. نەدی (ن): بەدی. هەڵەی نووسینە. (گم) نەوین.

(١٠٠) (مەدار)ی یەکەم: تەوەرەی ئاش کە مایەی مانەوە و ڕاگرتنە. (مەدار)ی دووەم: بار و ڕێوشوێن. کەید: فڕوفێڵ و ساختەکاری.

واتە: یا کەهیا بار و ڕێوشوێنێکی نەبوو بۆ دابینکردنی بژێوی خەڵك، ئاشی تەبیعەتی بە ئاوی فڕوفێڵی تورکانە گەڕا و هاتە دان؛ یان عەشیرەت لە پێناوی ڕاگرتنی نانی خۆیدا، ئارامی لێ بڕا و پشتی کردە عەزیز، ئیتر ئاشی تەبیعەتی بە ئاوی فێڵ و دەستبڕی تورکان گەڕا و دانی دا.

بۆ مەداری .. تاد (گم): بۆ مودارای نانی عەشرەت قەت مەدارێکی نەبوو. عەشرەت (گم): عەشیرەت.

(١٠١) (حەق)ی یەکەم: ڕاستی، هەق. (حەق)ی دووەم: خودا. (حەق)ی سێیەم: ماف و بەش. بەدنمەك: بێوەفا. گیری نمەك: چاوشۆڕی ئەنجامی سپڵەیی و تووشی بەڵا هاتن. ئەوان: عەشیرەت و خەڵکی بابان. ئەمان: تورکان.

واتە: سپڵە و بێوەفا بەختی ڕەش بێ و خودا لە ڕێی ڕاستیدا هەقی لێ وەربگرێ و دوچاری بەڵا بێ، وەك خەڵکی بابانی خستە ژێر دەستی تورکان.

(*) -٨-

**حەك بكەم دەفتەری سەعدی، دەمی وەصف، ئەر بە بەیان**

**بێمە سەر مەدحی دەهانت، لە دەما بەندە زوبان (١)**

**بیمی بەدنامییە، گەر نایێمە بەر تیری موژەت**

**کە دڕا پەردەیی دڵ، دەردەکەوێ ڕازی نیهان (٢)**

**نۆشی حاضر لە لەبا، نێشی لە موژگانی سیاه**

**مەگەسی نەحلە بە صەنعەت بوتی زەنبوورمیان (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، ف، غ، ج، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەقسوور.

(١) مەبەستی لە حەك‌کردنی دەفتەری سەعدی: کوژاندنەوەی ناوی "سەعدی"یە. ئەر: ئەگەر. مەدح: ستایش. دەهان: دەم.

واتە: ئەگەر بە ڕوونکردنەوە لە وەسفی هەر شتێکدا سەعدی بخەمە ئەو لاوە و ناوی لە ناواندا نەهێڵم و لەو بالآدەستتر بم، کە بێمە سەر ستایش و پێداهەڵدانی دەمی جوانی تۆ، زمانم لەناو دەمدا دەبەسترێ و لاڵ دەبم و هیچم پێ ناوترێ، چونکە وەسفی دەمی تۆ لە ژوور بیری منەوەیە.

دەمی وەصف (کم): دەمی. (گم): بە دەمی. دەهانت (حا): لەبانت. زوبان (کم، گم): زمان. هەڵەیە.

(٢) بیم: ترس. بەدنامی: بەدناوی، ناوزڕاوی. ڕاز: پەنهانی.

واتە: لە ترسی بەدناوییە کە نایێمە بەر تیری برژانگت. کە دڵ کەوتە بەر تیری چاوت، هەرچی پەنامەکییە نهێنییەکانە هەموویان دەردەکەون، جا بەدناوییەکە بۆ سالم خۆی بێ یا بۆ دڵبەرەکەی. دیارە -سەرەڕای ئەوە- کە یار ستەمکارە، سالم حەز ناکا بەدناو بێ.

بیمی بەدنامییە گەر نایێمە (عا): بیمە بر ناحیّە. هەڵەیە. نایێمە (کم، گم): نایەمە. دەردەکەوێ (کم): دەرئەکەو. هەڵەیە. (گم): دەرئەکەوێ. بیمی (ق): پێم.

(٣) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا نییە.

نۆش: هەنگوین. لەب: لێو. نێش: ئازار، چز. مەگەسی نەحل: مێشهەنگ. بوت: دڵبەر. میان: ناوقەد.

واتە: یار هەنگوینی لە لێودایە و برژانگەکانی چزوون و ئازاردەرن، دڵبەرم لە لایێ مێشهەنگە و لە لایێ زەردەواڵەی ناوقەد باریکە.

نەفعی کوا ناڵەیی بولبول لە چەمەن، گاهی سەحەر؟
لە طەرەف شەکوەیی ئەو، گوێی گوڵە یەکبارە گران (٤)
تا بە خاکی قەدەمت دیدەیی کێ ڕۆشن کەی
فەرشە بۆ مەقدەمی تۆ دیدەیی صاحێبنەظەران (٥)
تەڵخە گەر حاڵەتی دووری بە منی خەستە، چ باك؟
دەمی وەصفی لەبی جانانە، شەکەر دێتە زوبان (٦)
دیدە نابینێ کەسێ گاهی تەماشا، جوز تۆ
نیگەرانت نیەتی خەوفێ لە طەعنەی دیگەران (٧)

نێشی (ج): نیەتی. (ق): نێشە. جوانترە. سیاه (عا): سیا. میان (عا) زیان، واتە: زەردەواڵەی زیاندەر.

(٤) یەکبارە: یەکجارە، بە تەواوی. شەکوە: سکاڵا.

واتە: ناڵەی کاتی بەرەبەیانی بولبول لە گوڵزاردا سوودی چییە؟ گوێی گوڵ سەبارەت بە سکاڵای ئەو بە یەکجاری گرانە و نایبیستێ، یانێ: دڵبەر شکاتی دڵدار نابیستێ.

گاهی (کم، گم) وەختی. سەحەر (ق): خەیاڵ. یەکبارە (ق): یەکباری.

(٥) دیدەیی: دیدەکەی، چاوەکەی.

واتە: چاوی خاوەنبیران فەرشی بەرپێی تۆیە، تا بە خاکی بەری پێت ڕوون بێتەوە.

دیدەیی .. تاد (ف، ج): دیدەیی کێ ڕۆشن ئەکەی. (کم): دیدەی گەلی ڕەوشەن بێ. (گم): دیدەی گوڵ ڕەوشەن بێ.

(٦) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (حا)دا نین.

واتە: ئەگەر بارودۆخی نەخۆشیی دووری لە یار شتێکی تاڵە، منی نەخۆش چ باکێکم هەیە. کاتی ستایشی لێوی دڵبەر شەکر دێتە ناو زمانم و شیرینی دەکا، هەروەها دێتە زمان. لەوانەیە بە واتای هاتنە قسە بێ، یانێ: دەمم ئەوەندە شیرین دەبێ، شەکر دێتە قسە.

تەڵخە (ف، غا، ج، کم، گم): تاڵە. (بە منی) بە دوور نازانرێ (دەهەنی) بووبێ، دەهەنی خەستە. واتە: دەمی نەخۆش. جانانە (ق): تۆیە کە. زوبان (عا، ف، غ، ج): دەهان.

(٧) ئەم بەیتە لە (ق)دا نییە.

جوز: جگە لە. نیگەران: چاوەڕوانیکەران، ئەوانەی سەیری یەکێکیتر بکەن. دیگەران: خەڵکانیتر.

**شەکوە بێحاصڵە "سالم!" لە جەفاهایی حەبیب**
**کێ دەسێنێ، لە مەهی چارْدەهەم، دادی کەتان؟! (٨)**

واتە: چاوم لە کاتی تەماشادا، جگە لە تۆ، کەس نابینێ. ئەوانەی چاوەڕوانی تۆن، یا ئەوانەی بۆ تۆ دەڕوانن، ترسی ئەوەیان نییە خەڵکیتر تانەیان لێ بدەن و پێیان بڵێن: کوێر.

نیگەرانت (غ): نیگەرانی. خەوفێ (ج): خەوف.

(٨) شەکوە: سکاڵا. جەفاها: ستەمەکان. حەبیب: خۆشەویست.

واتە: سکاڵا لەدەست ئازارە زۆرەکانی یار بێسوودە، کێ دەتوانێ حەقی (کەتان) لە مانگی چواردە بستێنێ. کەتانێ لە خوار و مانگێك بەو ئاسمانەوە بێ، کەی دەنگی دەگاتێ. گوایە قوماشی کەتانی ئەو سەردەمە، لەبەر تیشکی مانگی چواردەدا لەتلەت بووە، یا گوڵی کەتان لە بەر تیشکی مانگی چواردەدا تووشی ئازار بووە.

لە جەفاهایی حەبیب (کم): لە جەفا و جەوری حەبیب. دەسێنێ (عا): دێنێ. هەڵەیە.

-٩- (*)

**(عەبدوڕڕەحمان بەگ "سالم" و "مەلا موئمین" پێکەوە وتوویانە)**

**خاڵە بیستوومە، موئمینی جافان**
**کە لە طەبعی کەسێکە وەك حەسسان (١)**
**نەسەبی ئەسپی تۆی بە سەگ داوە**
**سەگساری دەکا بە تۆ و دیگەران (٢)**

(*) ئەمە ناوونیشانی پارچەشیعرێکی درێژە، تەنها لە (نم)دا (لاپەڕە ١٥٨-١٦٠) هەیە، کە لە پەراوێزدا نووسیویە: (("مەلا موومن= مەلا موئمین" ئەم ذاتە جافە لە چاخی خۆیدا مامۆستای مەحموود پاشای جاف بووە، لە چاخی عەبدوڕڕەحمان بەگ "سالم" زیندەگانیی کردووە. بەشی زۆری ئەشعاری "سالم"، مەلا موومن کۆیکردووەتەوە و دەستی مەحموود پاشا کەوتووە. زۆری ئەشعاری "سالم" کە لە دیوانە چاپکراوەکەیدا نییە، لە کەشکۆلێك وەرمگرتووە کە مەحموود پاشا بە خەتی خۆی نووسیویەتیەوە. ئێستە ئەو کەشکۆڵە لای جەنابی مودیری جەریدەی "ژین" حاجی تەوفیق بەگە. ١٩٤٠/٤/٢٤ نەجمەدین مەلا)).

(نم) دەڵێ: سالم و مەلا موومن پێکەوە ئەم قەسیدەیەیان وتووە، ئیتر یەکی بەیتێکی نووسیوە، یا یەکی نیوەبەیتێك؟ ئەوە ئاشکرا نییە. ئێمە بە نزیکتری دەزانین نیوە دووەمەکان هی سالم بن، چونکە فارسییان لە نیوە یەکەمەکان زیاتر تێدایە. دیارە ئەدەبی فارسی زۆر کاری کردووەتە سەر سالم و ڕەنگیان لە شیعرەکانیدا داوەتەوە. پارچەشیعرەکە تێکڕا داشۆرینی تێدایە، بەتایبەتی داشۆرینی ئەسپ، بەڵام ئەسپەکە هی کامیانە؟ نازانرێ. جێی وتنە، مەحموود پاشای جاف لە کەشکۆڵەکەیدا بە ((ئوستاد)) ناوی مەلا موئمینی هێناوە. "پیرەمێرد" کەمێکی ئەم شیعرەی لە (ژ١٠١٣، ١٩٥٠/٦/١، ل٤)ی ڕۆژنامەی "ژین"دا بڵاوکردووەتەوە، سەرناوەکەی ئەمەیە: کاغەذێکی ئەوڕەحمان بەگی سالم بۆ عەزیز ئاغای نووسیوە.

کێشی عەرووز: خەفیفی شەشیی مەخبوونی ئەصڵەمی موسەبەغ.

(١) حەسسان: شاعیری ستایشوێژ و هاوڕێی پێغەمبەر (د.خ). ڕەنگە سالم ویستبێتی ئاماژەیەك بۆ ئەوە بکا کە حەسسان ستایشوێژی حەزرەتی "محەمەد" بووە و مەلا موومینیش هی مەحموود پاشا.

(٢) سەگساری: خراپەکاری کردن. دیگەران: خەڵکیتر.

واتە: بنەچەی ئەسپی تۆی بردووەتەوە سەر سەگ. خەڵکیتر خراپەکاری دەرهەق بە تۆ دەکا.

(و)ی نێوان (تۆ) و (دیگەران) کەوتووە.

**«حاشا لله» نه تۆبه مەرگی تۆ**
**نه سەگئەندامن و نه سكئاسان (٣)**
**شەممەییێکه له وەصفی تۆ و ئەسپت**
**قیصصەیی ڕەخش و ڕۆستەمی داستان (٤)**
**لاكین ئەو جوو[تە] بوون، دروست و درشت**
**ئێوه هەردوو له قاڵبا نوقصان (٥)**
**ئەسپەکەت فیله، لێك بێ خەرطووم**
**تۆ پوڵەنگی وه لێك بێدوندان (٦)**
**تۆ به سواری کەمه بێی، نمایانه**
**گورگی بێكلك و شێری بێشیریان (٧)**
**یۆزی بێکەڵبه، بەبری بێمیخلەب**
**خۆت و ئەسپەکەت به شەكڵ و به شان (٨)**

(٣) واته: حاشا تۆ نه به مەرگ تۆبه دەکەی، نه ئەندامەکانت لە هی سـەگ دەچـن و نـه وەك سکیش به ئاسانی تێر دەبێ.

یەکەم نیوەی بەیتەکه لەنگه و «تۆبه» دەبێ «تۆبەیه» بێ. «ئەندامن» ڕاستتر بوو «ئەندامی» بووایه.

(٤) شەممەیێکه: چەردەییێکه، کەمێکه.

واته: چیرۆکی ڕۆستەم و ئەسپەکەی «ڕەخش»، کەمێکه لـه وەسفی تۆ و ئەسپەکەت. یانـێ ئەوانـه هاوتای وەسفی تۆ نین.

«ڕەخشن» هەڵەیه و «ڕەخش» ڕاستتره.

(٥) دروست: ساغ. درشـت: زبر و بەهێز. جو: دەبێ «جووته» بووبێ.

واته: بەڵام ئەو جووته بوون به ساغی و بەهێزی، ئێوەیش به قاڵبی جەسته نوقسانن.

(٦) لێك: لێکین، بەڵام. خەرطووم: لمۆز. دندان: ددان.

واته: ئەسپەکەی تۆ فیلـه و بێ لمۆزه، تۆیش پڵنگی بێددانی.

(٧) بێشیریان: بێ دەماری خوێنبەر.

واته: ئەگەر تۆ به سواری بێی، گورگی بێكلك و شێری بێ دەماری خوێنبەر دەردەکەوێ.

(٨) یۆز: توڵەپڵنگ، دڕندەیەکی پڵنگشێوەی گۆشـتخۆری سـەرخڕی لـەشدرێژکۆلـەی بـەرز و باریك و خاڵدارتری چابوکی خێرایه. بەبر: دڕندەیێکی دوژمنی خوێنەخۆی شێره. میخلەب: چنگۆڵ.

**چونکه تۆ شێری، با لەطیفە بڵێم:**
**هەر دەبێ خوێن بخۆی و ئێسقان (٩)**
**تۆ کە گورگی بە بەڕڕە قانیع بە،**
**مەلەقێنە دومت لە کەس بۆ نان (١٠)**
**ئەسپی تۆ تازیی و ئەتۆ تازی**
**تا زیانە بە تازی ئەر تا زان (١١)**
**وا دەزانم لە بیمی تازیی تاز**
**دەمنە ڕاکا وەکوو سەگی چۆپان (١٢)**
**بێتە بەندی کەمەندی تۆ، ئیکلیل**
**سەگی کێیە کە بیبڕێ بە تەکان (١٣)**

واتە: خۆت و ئەسپەکەت بە شێوە و شانوشکۆ، هەر لە وێزی بێکەڵبە و بەوری بێچنگۆڵ دەچن.

(یۆز) بە شێوەی (وێز) نووسرابوو، کە هەڵەی نووسینە.

(٩) لەطیفە: قسەی خۆش، نوکتە.

واتە: مادەم تۆ شێری، با قسەیەکی خۆش بکەم: تۆ هەر دەبێ خوێن و ئێسك بخۆی.

(١٠) بەڕڕە: بەرخ. دوم: کلك.

واتە: تۆ لەبەرئەوەی گورگی، بە بەرخ ڕازی بە بیخۆی. کلکت بۆ کەس ڕامەوەشێنە تا نانت بداتێ.

(١١) ئەسپی تازی: ئەسپی عەرەبی یا ڕووتوقووت. تازی: تانجی. تازیانە: قەمچی. یا– تا زیانە: تا زەرەرە. ئەر: ئەگەر.تا زان: تا زایین، کە بۆ ئەسپ نەگونجاوە. یان تازان: بەغار، تیژڕۆ.

واتە: تۆ و ئەسپەکەت هەردوو عەرەبین یا ڕووتوقووتن. ئەگەر تیژڕۆ بێ یا بە غار بێ، زیان بە خۆی دەگەیێنێ؛ یان ئەگەر بە قەمچی تێی بسرەوێنی، بە خێرایی و تیژ دەڕوا.

(١٢) بیم: ترس. تازی: تانجی. تاز: لووسکە، نێرەمووك. دەمنە: چەقەڵ. چۆپان: شوان.

واتە: پێم وایە چەقەڵ لە ترسی تانجیی لووسکە وەك سەگی شوان هەڵبێ.

(١٣) کەمەند: پەتی سەربەئاڵقە بۆ گرتنەوە و بەستنەوەی ڕاکردوو. ئیکلیل: چەپکەگوڵ.

واتە: چەپکەگوڵ بێ بە کەمەندی تۆ، سەگی کێ دەتوانێ بە ددان بیبڕێ.

(بە تەکان) لە بەیتێکی دواییدا دووبارە بووەتەوە، بۆیە دەبێ (بە ددان) بووبێ کە بۆ ئەو شوێنە گونجاوە.

**وای بۆ حاڵیی کەمتیاری فەقیر**
**تووشی ئەم بەبرە ئەگەر لە بەیان (١٤)**
**ئینتیقامی سەگی دەبێ ظاهیر**
**تووتکی هەرچی خواردبێ بە تەکان (١٥)**
**ئەسپی سواریی وەها نییە و نابێ**
**هەر لە (بەربەر) هەتا بە (داغستان) (١٦)**
**جووتی ئەم ئەسپە وا لە موڵکی عەدەم**
**ڕەنگی وا قەت نییە لە ڕوبعی جیهان (١٧)**
**لچی وەك کاڵەکی بڵ، قڵەشاو**
**سەری وەك کوولەکەی درێژی پان (١٨)**

(١٤) بەیان: سبەینان. بەبرە: دەبوو (بەبرە بێ) بووایە.

واتە: وای بە حاڵی کەمتیار، ئەگەر لە بەرەبەیاندا تووشی ئەم بەورە بێ!

(١٥) ئینتیقام: تۆڵە. ظاهیر: دیار و ئاشکرا. تووتك: بێچووەسەگ.

واتە: هەر بێچووەسەگێکی خواردبێ، لێی دەردەهێنرێتەوە و تۆڵەی لێ دەکرێتەوە.

(١٦) بەربەر: بەربەرستان، سەرزەمینی میللەتی بەربەر کە ناوچەکانی تێدا دەژین، لە سنووری میسرەوە دەست پێ دەکا تا کەناری شادەریای ئەتڵەسی لە سەرووی ئەفریقا. داغستان: وڵاتێکی سەر بەری ڕۆژاوای دەریای خەزەر (قەزوین).

واتە: لە وڵاتی بەربەرەوە بگەڕێی تا داغستان، ئەسپی وەهات نە بینیوە و نە دەبینی.

(١٧) (وا)ی یەکەم: هەیە. ڕوبعی جیهان: ئەو چارەکەی گۆی زەوی کە مرۆڤی تێدا نیشتەجێیە، وشکانیی زەوی بەبێ دەریاکان.

واتە: ئەم ئەسپە جووتەکەی وێنەی نییە و لە خاکی نەبووندایە. جۆری وەها لە وشکانیی گۆی زەویدا نییە.

(١٨) لچ: لێو. بڵ: زۆر نەرم. قڵەشاو: درزتێبوو.

واتە: لچی ئەم ئەسپە وەکوو کاڵەکی بڵ و تەپیو قلێشاوە و سەریشی لە کوولەکەی درێژکۆلەی پان دەچێ.

چوارپەلی پانە وەك ترۆزیی چەم:
نەرم و باریك و بێ ڕەگ و لەرزان (١٩)
لەق و شل، كلكی وەك گوڵی هەرزن
وەختی لنگدان دەچێتە ناو لنگان (٢٠)
چاوی هەر وەك ترێی هەتاوبردوو
سیس و بێئاو و قووڵ و نابینان (٢١)
ئەسپی تۆ بۆچی خراپە، خاڵی خۆم
پاك و بێعەیب و ساغ و بێنوقصان (٢٢)
ناڵی بێ و ئەگەر جۆ بخوا، ڕەخشت
ڕۆستەمانە كە لێی خوڕی بە دوودان (٢٣)
شڕی، شەو گەر (گرێژە) بێ مەنزڵ
تا سەحەرگەه دەگەیتە دەشتی (مووان) (٢٤)

(١٩) ڕەگ: دەمار. لەرزان: لەرزیو، لە دۆخی لەرزیندا.

واتە: چوارپەلی وەكوو ترۆزیی چەمیلە پانە و نەرم و باریك و بێدەمارە و نالەرزێ.

(٢٠) گوڵی هەرزن: مەبەستی بێتووكییە. هەرزن: دانەوێڵەیەكی سووری زۆر وردە، زۆرتر خواردنی مامر و مەلە. لنگدان: غاردان و ڕاكردن. لنگ: لاق. ناولنگ: ناوگەڵ.

واتە: ئەم ئەسپە شل و بێداروبارە، كلكی وەك گوڵی هەرزن وردە و كاتی غاردان سەری خۆی بە ناوگەڵدا دەكا و نازانێ غار بدا.

(٢١) هەتاوبردوو: بە تاوی هەتاو سووتانەوە، مەبەستی بێئاوییە.

واتە: چاوی ئەم ئەسپە وەك ترێی هەتاوبردووە، كز و وشك و بەقووڵداچوو و نابینایە.

(٢٢) واتە: خاڵە، بۆچی ئەسپەكەی تۆ خراپە؟ لە كاتێكدا پاك و بێخەوش و ساغ و بێنوقسانییە!

(٢٣) ڕەخش: ناوی ئەسپەكەی ڕۆستەمی زاڵە!

واتە: ئەسپەكەت هەر ئەوەندە ناڵی هەبێ و جۆ بخوا، ئیتر وەك ڕەخشی ڕۆستەم وایە، كە لێی دەخوڕی بە غار دەڕوا.

(ناڵی و ئەگەر جۆ بخوا)، ئەگەر (ناڵی بێ و جۆ ئەگەر بخوا) بووایە، كێشی نیوەبەیتەكە ڕەوان دەبوو. (دوودان) هەڵەیە و (دەوان) ڕاستە بە مانای غاركردن.

(٢٤) شڕ: پەرێشان، حاڵخراپ. گرێژە، موان: دوو دێی ناوچەی شارەزوور و لە پاڵی یەكدان.

**لە (ئەڵەبجە) دەگەی بە (بەکراوا)**
**شەولەناویٚ کە لێیخوڕی چێشتان (٢٥)**
**بە گرەو سواری بە لە (گوڵعومەر)**
**هەفتەیێ دەچیتە خاکی (هەورامان) (٢٦)**
**لە (نەویٚ) لێیخوڕی لە پایزدا**
**دەچیتە (دزڵی) لە ئاخری زستان (٢٧)**
**تا لە (دەق) دەچیتە (قەڵبەزە)، بەهار**
**پایزیٚ ئێڵ دەگاتە بەر (ئالان) (٢٨)**

واتە: حاڵت شڕە، ئەگەر شەو بتەویٚ بچیتە (گرێزە). ئەسپەکەت هێندە تەمەڵ و سستە بەرەبەیان ئەمجا دەتگەیێنێتە (مووان)ی نزیکی گرێزە!

(٢٥) بەکراوا: گردێکی شوێنەواریی نزیکی هەڵەبجەیە. شەولەناو: بە (شەولەتاو) نووسراوە کە هەڵەیە، شەوەکی، کە شەو لە ناودا مابیٚ، بەرەبەیانێك کە هێشتا تاریکیی شەوی ماوە. چێشتان: ناوەڕاستی بەیانی و نیوەڕۆ.

واتە: ئەگەر لە شەولەناوەوە لە (هەڵەبجە)وە بەم ئەسپە بکەویتە ڕیٚ بۆ (بەکراوا)، بۆ چێشتەنگاو دەیگاتیٚ!

(٢٦) گرەو: مەرجدانانی نێوان دوو کەس یا دوو لا لەسەر شتێك، وا کە هەر یەکێکیان لێی لابدا، دۆڕاو بیٚ. گوڵعومەر: خورماڵ، ناوەندی ناحیەیەکی سەر بە قەزای هەڵەبجەیە، زۆر نزیکی هەورامانە.

واتە: گرەو دەکەم، ئەگەر لە خورماڵەوە بچیتە هەورامان کە نزیکیەتی، ئەسپەکوێت حەفتەیەکی دەویٚ تا بیگاتیٚ!

(دەچیتە)، ئەگەر (دەچیە) بووایە، کێشی نیوەبەیتەکە ڕێك دەهاتەوە.

(٢٧) نەویٚ و دزڵی: دوو دێن ئەم دیو و ئەودیوی شاخی (سوورکێو)ن، نەویٚ لە عیراقە و دزڵی لە ئێران، دووریيان لە یەکەوە چەند سەعاتێکی کەمە.

واتە: ئەگەر پایز لە (نەویٚ)وە بەڕیٚ بکەوی بۆ (دزڵی)، ئەسپەکەت ئاخروئۆخری زستان دەیگاتیٚ!!

(دەچیتە)، ئەگەر (دەچیە) بیٚ، دروستە.

(٢٨) دەمە: هەڵەیە و دەبیٚ (دەق) بیٚ کە نزیکی (قەڵبەزە) و (ئالان)ە: ئەم سیٚ دێیە لەیەکەوە نزیك و لە ناوچەی (دەربەندیخان)ن. ئالان: بەری باکووری ڕۆژاوای ناوچەی شارباژێڕیشە، کە بەشێکی لە

**گورزی تۆ گەر لە پشتی گوربە کەویٚ**
**دەمیاویٚنێ تا سەری مەیدان (٢٩)**
**موختەصەر پیٚت بلیٚم، بەلیٚ: واتە**
**ئەسپی شین فیلە، خۆتی شیٚری ژیان (٣٠)**
**حەرفی سەربەستە، بەسیەتی ئیتر**
**با بلیٚم هەرچی مەخفییە بە عەیان (٣١)**
**بە قەراری حەدیثی موئمینی جافان**
**پیٚی وتم دویٚنێ، واضیح و پەنهان: (٣٢)**
**بارگەییٚك کە بەستی بۆ تولەك**
**شاپەڕت کەندبوو بە زۆری ددان (٣٣)**

دیوی کوردستانی ئیٚرانە.

واتە: ئەم ئەسپە دیسان هیٚندە لەشبەبارە، تا ئەم لە بەهاردا لە (دەق)ەوە دەچیٚتە (قەلٚبەزە)، زۆر دەخاییٚنێ و دەکەویٚتە پایز، لە کاتیٚکدا خیٚلٚ لەو ریٚیە دوورەوە دەگاتە بەر (ئالان).

(دەچیتە)، دیسان ئەگەر (دەچیە) بێ، دروستە.

(٢٩) گورز: کوتەك، ئامرازیٚکی سەرئەستووری دەسکداری شەڕە. گوربە: نیٚرەپیشلە. سەر: بەرایی، لا. مەیدان: دیٚیەکی ناوچەی (دەربەندیخان).

واتە: ئەگەر گورزی تۆ بدرێ لە پشتی گوربە، تا لای (مەیدان) هەر دەمیاویٚنێ.

(٣٠) موختەصەر: کورتوپەتی. واتە: وایە. ئەسپی شین: ڕەنگە ڕاستەکەی ئەسپەشێ بێ. شیٚری ژیان: شیٚری تووڕە و تۆسن.

واتە: با بەکورتی پیٚت بلیٚم؛ بەلیٚ وایە، ئەسپەشێ فیلە و خۆیشت شیٚری تووڕە و کیٚویی.

(٣١) حەرفی سەربەستە: قسەی تویٚکلٚدار و ئازاد و دڕکە. مەخفی: داپۆشراو. عەیان: بەرچاو و ئاشکرا.

واتە: با قسەی تویٚکلٚدار بەس بێ و هەرچی شاراوەیە بە ئاشکرا پیٚتی بلیٚم.

(٣٢) قەرار: بڕیار. حەدیث: فەرمووراو. واضیح: بێپەردە. پەنهان: نهیٚنی.

واتە: دویٚنی موئمینی جافان بە ئاشکرا و نهیٚنی پیٚی وتم.

(٣٣) ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی ڕوون نین و ساغنەکرانەوە، هەر شکلٚنووس کران.

**بەڵکە هەر کەس بە بینی پەرەر بوو**
**بێ، بڵێ قەلبی کەس نامودانان (٣٤)**
**پەڕ گزاوە وەك پەڕی توولەك**
**تولەکی تۆ لە تولکان نادان (٣٥)**
**خاڵە سا وەك تەریقی فینۆ بی**
**خاڵە سا بی خەجاڵەتی سەگبان (٣٦)**
**خاڵە! طوعمەی قوشت بە لوقمە بکەی**
**خاڵە! گۆشتت نەبێتە نۆشی جان (٣٧)**
**گورچەوێڵەی مەڕت قوززەڵقورت بێ**
**زیقەتۆرەی مڕت ببێ سندان (٣٨)**
**با قەرەقەش بە گورزی کەللەت بێ**
**جەنُنەت بێتە دۆزەخی نیران (٣٩)**

(٣٦) تەریقی: شـەرمگـرتن و تـەریقبوونـەوە. فینـۆ: ئەسـپ و ئێـسترێ کـورت و کـەمبـاڵا. خەجاڵەتی: شەرمەزاری. سەگبان: سەگوان، پاسەوانی سەگ.

واتە: خاڵە، شەرمی ئەسپ و ئێسترە گایلکە بتگرێ و شەرمەزاری کابرای سـەگوان بی.

(٣٧) طوعمە: چەشە، گۆشتێك کە دەدرێ بە باڵندەی ڕاوی وەك باز. قوش: باڵندە، لێرە بازە. لوقمە بکەی: بیکەیە پاروو. نۆشی جان: نۆشی گیان.

واتە: خاڵە، چەشەی بازەکەت بکەیتە پاروو. گۆشت نۆشی گیان نەکەی.

(٣٨) گورچەوێڵە: گورچیلە. قوزەڵقورت بێ: بە دەرد بێ. زیقەتۆرە: سیقەتۆرە. مڕ: پڕ و تێر، ڕەنگە (مر)یش بێ کە مریشکە. سندان: قوزەڵقورت.

واتە: گورچیلەی مەڕت بە دەرد بێ. سیقەتۆرەی پڕ یا هی مریشکیشت لێ ببێ بە سـندان.

(٣٩) قەرەقەش: مەڕی تەوێڵسپی. نیران: کۆی نار، ئاگر.

واتە: با مەڕی ناوچاوانسپی ببێتە گورز و بە کەللـەسەرتدا بکێشرێ. بەهەشتت لێ ببێتە دۆزەخی ئاگر. (جەننەت) دەبوو (جەننەتت) بێ تا لـەنگ نەبێ.

(٤٠) شکەمتا: سکتدا. ثەمەر: بەر، بەرهەم. جوز: جگە لە.

واتە: هەرچی پۆڕێکی چەم و چغورد هەیە، کە دەبێتە بەش و نسیبی تۆ، زیانت پێ بگەیێنێ و لـە ژانوژوور بەدەر هیچ بەرهەمێکیتری لـە سکتدا نەبێ.

**پۆڕی چەم، هەرچی بێتە قیسمەتی تۆ**
**لە شکەمتا ئەمەر نەدا، جوز ژان (٤٠)**
**دڵی کۆتر دڵت بەدەر بێنێ**
**بە سەلامەت نەخۆی کەوی بوریان (٤١)**
**با ببی مونفەعیل لە لای قوشچی**
**با سەرئەفگەندە بی وەکوو چۆپان (٤٢)**
**دەك ئیلاهی بە میثلی پەڕڕەقەش**
**دەستوپابەستە بیت و تەنلەرزان (٤٣)**

(٤١) کەوی بوریان: کەوی برژاو.

واتە: دڵی کۆتر ببێتە مایەی دەرهێنانی دڵی تۆ. بە سەلامەتی و بێوەی کەوی برژاو نەخۆی.

(٤٢) مونفەعیل: هەڵچوو و شپرزە. قوشچی: ڕاوکەر. سەرئەفگەندە: سەرشۆڕ. چۆپان: شوان.

واتە: با لە لای ڕاوچی شپرزە بی و هەڵچی. با وەك شوان سەرشۆڕ بی.

(٤٣) پەڕ: مەڕی سپی سەروگەردن ڕەش. قەش: تەوێڵسپی. تەنلەرزان: لەشلەرزیو، لەش لە دۆخی لەرزیندا.

واتە: دەك خودایە، وەك مەڕی ناوچاوانسپی دەستوپێ بەستراو و لەشلەرزیو بی.

## -١٠- (*)

**نوکتەیی خاڵت دەکا بۆم سیڕڕی فەردییەت عەیان**
**کردویە قەددت لە دڵما ئەلفی لینییەت عەیان (١)**
**((کلّ شئٍ)) مەظهەری حەققە، وەکوو تێدەفْکرم**
**کەوتە توێی پەردەی ڕوخت، نووری ئیلاهییەت عەیان (٢)**
**من لە خزمەت تۆ چ لازم عەرضی ئەحواڵم بکەم؟**
**خۆت دەزانی، بێ وتن، ئەسراری هەر نییەت عەیان (٣)**
**عەهدی ئەم چاوانە مەستم، مەمدوێنن ئەی حەریف!**
**نەك بکەم لەم وەختەدا ئەسراری کەیفییەت عەیان (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (نم، پ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەقسوور.

(١) واتە: مەعنای ورد و جوانیی خاڵت، مەعنای بێهاوتاییم بۆ ڕوون دەکاتەوە. هەروەها باڵای ڕێکوپێکت پیتی ئەلفی ڕوون کردووەتەوە.

کردویە (پ): کردیەوە. (لبنیت) شێوەنووسی هەردوو نوسخەکەیە. نەمانزانی مەبەست لێی چییە؟ بە دوور نازانرێ (لینییەت) بووبێ. بێگومان پیتی ئەلف (ا) لە زانیاریی (صەرف)دا هەمیشە حەرفی لینە، واتە لە پیتە نەرمەکانە و باڵای ڕاست و ڕەوانە.

نوکتەیی (پ): نوقطەیی.

(٢) واتە: وەك دەزانم حەق (خودا) و دەسەڵاتی خودا لە هەموو شتێکدا دەردەکەوێ ((وفي كلّ شيء له آية تدلّ على انه واحد)). بە واتایەکیتر، ئەگەر نەیبەینەوە بۆ فەلسەفەی (وحدة الوجود)، هەر شتێك دەبینرێ، خودای پەروەردگار و دروستکردنی شتەکە دەکەونە بیر. نووری خودایەتی، بۆ نموونە، لە توێی پەردەی ڕوخی نازدارتدا دەردەکەوێ، کە چەند بەدەسەڵاتە و چەند ناسك و ورد دروستی کردووە؟

(٣) هەر نییەت: هەموو نیازێك.

واتە: پێویست ناکا ئەحواڵی خۆم لە خزمەت تۆدا باس بکەم. هەر نیازێکم لە دڵدا بێ، پێویست بە وتنی هیچ نییە، تۆ خۆت هەموو شتێ دەزانی و ئاگات لێیە.

خزمەت (پ): خدمەت. دەبێ هەر وا بووبێ.

(٤) واتە: من لە سەردەمی دەسەڵاتی ئەم چاوە مەستانەدا مەست و بێهۆشم. مەمدوێنن، نەبادا

**دڵ لە لاتە، با بە تەن دووریم نەبا "سالم" لە ڕووت**
**تا نەبێ بۆ موددەعی ئەحواڵی قوربییەت عەیان (٥)**

پەنامەکییەکانی عیشق بدرکێنم.

مەستم (پ): مەستەم. هەڵەیە. کەیفییەت (پ): هەر نییەت. هەڵەیە.

(٥) واتە: بە دڵ لە لاتم، بەڵام بەدەنم دوورە، با ئەم بەلەشدوورییەم لە بەرچاوتم لانەبا. بۆیە بە لەش لێت دوور دەکەومەوە، تا ڕەقیبی بەدکار بەم نزیکییە نەزانێ!

## (*) -١١-

«أبشروا»، یا ئەهلی ظوڵمەت، پەرتەوی ضەو بوو عەیان
تیغْبەرکەف صوبحْدەم بۆ گەردنی شەو بوو عەیان (١)
مەرکەبی خۆر ئاسمانە، نێزەیی زەڕڕین بە کەف
وەك عەرەب دیسان لە مەیدانا بە هەوهەو بوو عەیان (٢)
دەستی ڕەددم دا لە سینەی جارییەی ئەهلی حەبەش
وا لە لەعلی موڵکی ڕوویی شاهیدی نەو بوو عەیان (٣)
باز نیهان بوو لەشکری زەنگی لە حیصنی نیستی
وا لەبەر تیپی شەهی خاوەر، ڕەواڕەو بوو عەیان (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (م، پ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتی مەقسوور.

(١) «أبشروا» مەبەستی «موژدە بێ»یە. ضەو: ضوء، ڕووناکی. تیغبەرکەف: شمشێربەدەست. صوبحدەم: بەرەبەیان.

واتە: ئەی گیرۆدەکانی دەستی تاریکی! موژدە بێ وا شەوقی ڕووناکی دەرکەوت و بەرەبەیان شمشێربەدەست بۆ بڕینی ملی شەو هاتە مەیدان.

(٢) مەرکەب: هەر شتێ بۆ سواری بەکاربهێنرێ. زەڕڕین: ئاڵتوونین، زێڕین. هەو هەو: دەنگی سواران لە ڕاو و شەڕدا.

واتە: خۆر سواری ئەسپی ئاسمان بوو، نیزەی زێڕین بە دەستەوە، وەك سوارەی عەرەب بە هەیاهوو و هۆسەکێشان هاتنە مەیدان. دیارە نێزەکە تیشکە زەردەکانی خۆرە.

(٣) جارییە: کەنیزەك، مەبەست لە جارییەی ئەهلی حەبەش شەوە. شاهید: دڵبەر، مەبەست خۆرە. نەو: نوێ، تازە. (ڕوویی) ڕەنگە (ڕۆمی)ش بێ.

واتە: دەستی ڕەتکردنەوەم نا بە سنگی کەنیزەکی ڕەشپێستی حەبەشەوە، یا شەوم ڕەتکردەوە. وا بە لێوی سەر ڕوخساری سپیی یار دڵبەرێکی تازە دەرکەوت، یا خۆر لە موڵکی ڕۆمدا کە سپیپێستن، هەڵات و دەمی کردەوە و دنیای پێ ڕووناك بووەوە.

لە لەعلی موڵکی ڕوویی (پ): لە نەسلی موڵکی ڕۆمی. جوانە.

(٤) باز: دووبارە. زەنگی: مەبەستی شەوە. حیصن: قەڵا. نیستی: نەبوون. تیپ: سوپا. شەهی خاوەر: شای خاوەر، خۆر. ڕەواڕەو: ڕاکردوو.

**ئەرمەنیم گەر شەوپەرست بم، چا بوو ئەو چوو، ڕۆژ هەڵات**
**دڵبەرم ناگەهـ وەکوو شیرینی خوسرەو بوو عەیان (٥)**
**شەو ڕەقیب بوو، نووری چاوی بردم، ئەمجا دیق بکا**
**هەر کە دەرکەوت مەرکەبی خۆر، ساعەتەن ئەو بوو عەیان (٦)**
**دڵبەرم وا هات سەحەر، سێ موعجیزە هەمڕاهی بوو:**
**ڕەونەقی خۆر، نووری دیدەم، مەرکەبی شەو بوو عەیان (٧)**

واتە: دووبارە لەشکری شەو لەناو قەڵای نەبووندا شاردرایەوە و ئاشکرا لە بەردەم سوپای خۆردا دەستی کرد بە هەڵاتن.

لەبەر (پ): لەپڕ.

(٥) ناگەهـ: لەپڕ.

واتە: من ڕقم لە شەوە، ئەگەر شەوپەرست بم، ئەرمەنی دەبم. چاك بوو شەو ڕۆیی و ڕۆژ هەڵات، دڵبەرم کە خۆرە، وەك شیرینی خوسرەو دەرکەوت.

ناگەهـ (پ): ناگاه. خوسرەو (پ): ئەرمەن. هەڵەیە، چونکە لەگەڵ سەرواکەی نایێتەوە.

(٦) دیق بکا: مەبەستی ئەوەیە بمرێ لەبەر خەفەتی زۆر.

واتە: شەو بەدکارم بوو، دژم بوو و ڕووناکیی چاوی بردم، کوێری کردم. جا با ئیتر بمرێ، چونکە هەر کە خۆر دەرکەوت، ئەویش ئاشکرا بوو، خۆمی لێ دەپارێزم. یاخۆ: هەر کە هەتاو هەڵات، ڕووناکیی چاوم کە یارە، دەرکەوت.

ئەمجا (پ): ئینجا. (مەرکەبی)، لە بەیتی پاشەوەیدا هەیە و لە جێی خۆیدایە و گونجاوە. لێرە دەبوو (مەوکیبی) بێ، بە مانای تاقمی سوارە و پیادەی یاوەر و هاوڕێی پادشا و پایەبەرزان. دەبێ هەڵە لە نووسینیدا کرابێ، بەتایبەتی کە (مرکبی) و (موکبی) بە ئیملای زوو هەر جیاوازییەکی بچووك لە نێوان دوو پیتی (ر) و (و)یدا هەیە.

(٧) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (پ)دا پاش و پێشن.

واتە: وا بەرەبەیانی دڵبەرم هات، سێ موعجیزە و کاری گەورەی لەگەڵ بوو؛ یەکەم ڕەونەق و ڕووناکیی خۆر، دووەم ڕۆشنایی چاوم کە دەبینم، سێیەم داهاتنی شەو.

مەرکەبی شەو بوو (پ): مەرگی شەو بووبوو. (موعجیزە) لە (م)دا بە (موعجیزەی) نووسراوە، (ی)یەکەی زیادە.

**سیلخی ماهی ڕۆژەیە، وەعدەی منە، یاران نەوید:**
**وا لە ئەوجی عاریضی یارم، مەهی نەو بوو عەیان (٨)**
**پەردەیی شەو چاكْچاك بوو، نووری ظاهیر كرد سەحەر**
**صوورەتی یارم، شوکور، بۆ چاوی بێخەو بوو عەیان (٩)**
**حەمدولیللاه ڕۆژ هەڵات و شەو ڕەقیب بوو، دەفنی کرد**
**قووتی "سالم" دەمبەدەم هەردەم لەدەست ئەو بوو عەیان (١٠)**

(٨) سیلخ: دوادوایی. ماهی ڕۆزە: مانگی ڕۆژوو (ڕەمەزان). نەوید: موژدە، مزگێنی.
واتە: دوادواییەکانی مانگی ڕەمەزانە. مانگی نوێی یارم بوو بەسەر ڕوومەتیەوە دەرکەوت. موژدە بێ یاران ئیتر وادەی منە.

(٩) واتە: پەردەی تاریکی شەو لەتلەت بوو، بەرەبەیانی ڕووناکی دەرکەوت. سوپاس بۆ خودا، وێنەی یارم بۆ چاوی شەوبێدار دەرکەوت.

(١٠) واتە: سوپاس بۆ خودا ڕۆژ هەڵات و شەو کە وەك ڕەقیب بەدفەساڵ بوو، شاردیەوە. ژیانی سالم هەناسە بە هەناسە لەدەست ڕۆژدا دەردەکەوێ. ڕەنگە (قووت) لە ڕاستیدا (فەوت) بووبێ، کە زۆر ڕێی تێدەچێ، ئەو کاتە یانێ: نەمانی سالم و ئازاری لەسەر دەستی شەو بوو، سوپاس بۆ خودا کە شەو باری کرد.

لەوە دەچێ سالم ئەم پارچەشیعرەی لە بارودۆخێکی دەروونیی تایبەت و لە شەوێکی تاریك و نوتەك و درێژی پایزدا وتبێ.

## -١٢- (*)

**به خوڕ خوێن بێنه، ئەی گریه! له چاوەی چاوی تاری من**
**حەنا لازم بووه بۆ پێی سەگی کۆیی نیساری من (١)**
**ڕەفیقان! گەر دەچن بۆ سەیری باغ و گوڵ، خودا حافیظ**
**موهەییایە لە ڕووی یارا گوڵ و باغ و بەهاری من! (٢)**
**ئەگەر فەرقم بگاتە مەرکەزی خاکی کەفی پێی یار،**
**دەگاتە ئاسمان گۆشەی کولاهی ئیفتیخاری من (٣)**
**لە دونیادا جەفای عوقبام هەموو دیوه لەدەس هیجران**
**دەبێ فەردا لەپاشا عەفوی من کا کردگاری من (٤)**
**گوڵ و سەرو و سنەوبەر، هەر طەرەف سەریان فرۆدێنن،**
**بچێتە باغەوە، گەر دڵبەری سیمینعوزاری من (٥)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) نیسار: پێشکەش، دیاری، (نیثار) بووە و لە نووسینەوەدا کراوە بە نیسار.

واتە: ئەی گریان، تکایە بە خوڕ خوێن لە سەرچاوەی چاوی تاریکی من بێنە، چونکە خەنە پێویستە بۆ پێی سەگی بەردەرگای یاری من، با خوێنەکە ببێتە خەنەی پێی.

(٢) واتە: ئەی هاوڕێیان، ئەگەر ئێوە دەچن بۆ سەیری باخ و گوڵ و گوڵزار، خوداتان لەگەڵ. من نایێم، چونکە گوڵ و باخ و بەهاری من لە ڕووی یاردا دەرکەوتوون. کەواتە من پێویستیم بە گەشتوگوزار نییە.

خودا (کم): خوا.

(٣) فەرق: تەپڵی سەر. کەف: بەری دەست. کولاە: کڵاو. ئیفتیخار: شانازی.

واتە: ئەگەر خودا بۆم بکا سەرم بگاتە خاکی بەرپێی یار، گۆشەی کڵاوی شانازیم دەگاتە ئاسمان.

(٤) عوقبا: دوارۆژ، ئەودنیا. فەردا: سبەی.

واتە: هیوایە سبەی، ڕۆژی قیامەت، خودای من لێم ببووری، چونکە هەموو سزای قیامەتم لەدەست هیجران و دووریی یار لە دنیادا چەشتووە.

عەفوی من (کم): عەفوم. لەنگ دەبێ.

(٥) فرۆدێنن: دادەنەوێنن.

**ئیلاهی، ناسەلامەت، ئەی ڕەقیب! هەمدەردی "سالم" بی**
**وەکوو کردت لە کۆی جانانە قەطعی ڕەهگوزاری من (٦)**

واتە: ئەگەر یاری ڕوخسـار زیوینی من بچێتە ناو باخ، گوڵ و سەرو و سـنەوبەر لـە هـەموو لاوە سەری بۆ دادەنەوێنن، یا ڕوویان نییە سەر بەرز بکەنەوە.

سنەوبەر (کم): صنەوبەر.

(٦) واتە: خودایە بەدکار هاودەردی سالم بێ، وەك تۆ ڕێی بەردەرگای یارت لێ گرتم.

## -١٣- (*)

**مەعنەیێ نین، وەکوویەك، شەرحی من و دڵبەری من**
**قەتلی من، صیححەتی ئەو، شەکوەیی ئەو، دەفتەری من (١)**
**خوێنی ظەرفی بەدەنم وشکە لەتاو ئاگری غەم**
**دڵی من، مەجمەری ئەو، دووریی ئەو، ئەخگەری من! (٢)**
**ڕستەیی ذەوق و ئەلەم دێتە موقابیل بە ویصال**
**دڵی من، لالەیی ئەو، دیدەیی ئەو، عەبهەری من! (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، ه، ف، غ، ج، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) واتە: شەرحی حاڵی من و دڵبەری من یەك مەعنایان نییە. کوشتنی من لەش‌ساغیی ئەوە کە زۆر لێك جیان. سکاڵای ئەو و دەفتەری من لە یەك دوورن. شکاتەکەی ئەو ناحەقە، هەرچی لە دەفتەری مندا نووسراوە، زۆر و ستەمی ئەوە کە لە منی دەکا و ڕاستە.

مەعنەیێ نین (ه، کم، گم): معنیانن. (ق): مەعنەیێکن. قەتڵی (عا): قەطعی. صیححەتی (عا): صیححەیی.

(٢) ظەرف: قاڵب، قاوغ. بەدەن: لەش. مەجمەر: ئاگردان. ئەخگەر: پشکۆ.

واتە: خوێنی لەشم لەتاو ئاگری پەژارە وشك بووەتەوە، دڵی من ئاگردانی یارە و دووریی ئەو پشکۆی ئاگردانەکەیە.

ظەرفی (عا): زەرفی. لەتاو ئاگری (ف، غ): لەبەر کیشرەتی. (ج): لەتاو کیشرەتی. مەجمەری ئەو (ف): مەجمەر و ئەو. (کم): مەحجەری ئەو. (ئەو)ی (دووریی ئەو) لە (ق)دا کەوتووە.

(٣) ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی لە (ه، ق)دا نین.

ڕستە: ڕیز.

واتە: ڕیزی خۆشی و ناخۆشی لە کاتی گەیشتن بە یاردا بەرامبەری یەکن. دڵی پڕخوێنی من لە لای یارە و چاوە مەستەکانی ئەو نێرگزی منن. هەڵێشدەگرێ (ڕستە) بە واتای شتی ڕوواو و سەوز بێ، ئەو وەختە لالە و نێرگز هەردوو لە بابەتی ڕوواون.

ڕستەیی (عا، کم، گم): ڕشتەیی. ذەوق و ئەلەم (عا): زەوق و ئەلەم. (ف): ذەوقی ئەلەم. بە ویصال (غ): لە وەیصاڵ. دیدەیی ئەو عەبهەری من (غ): عەبهەری ئەو، دیدەیی من. (کم): دیدەیی ئەو عەنبەری من.

زوو بەری بووم لە بەر و نیعمەتی فیردەوسی بەرین
نەخلی من، قامەتی ئەو، بۆسەیی ئەو، نەوبەری من (٤)
ڕەبطی ئاب و سەمەکن، دووسەرە، هەروەك تەن و جان
سەری من، سایەیی ئەو، خاکی ڕەهی ئەو، سەری من (٥)
وەه چ خوابێکی بە ئارامە هەمئاغۆشییی یار
دەستی من، گەردەنی ئەو، ساعیدی ئەو، بەستەری من! (٦)
لە نیگاهی دو طەرەف تیرەوو لامیع پەیْدا!
چیهرەیی من، شەوی ئەو، گەردەنی ئەو، گەوهەری من (٧)

(٤) نەخل: دارخورما. بۆسە: ماچ. نەوبەر: نۆبەرە.

واتە: من هەر زوو لە بەر و ناز و نیعمەتی بەهەشت بێبەش بووم. باڵای یار دارخورمامە و ماچی ئەو نۆبەرەمە. ئیتر بەهەشتم چۆن دەست دەکەوێ؟ یا بەهەشتم بۆچییە؟

زوو بەری بووم (گم): نەوبەرێ بووم!

(٥) ڕەبط: پێوەبەستراو. سەمەك: ماسی. تەن: لەش. ڕەه: ڕێ.

واتە: سەری من و سێبەری یار، خاکی ڕێی ئەو و سەری من وەك ماسی و ئاو، وەك تەن و گیان بەبێ یەك نایانکرێ.

ڕەبطی ئاب و سەمەکن (عا) ڕەبتی ئاب و ئەمەکن. (ج): وەصفی ئاب و سەمەکن. (کم): ڕەبطی ئاو و سمکەن. (گم): ڕەبطی ئەسپ و سمەکەی.

(٦) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا نۆیەمە.

وەه: وای، ئامرازی سەرسامییە. خواب: خەو. هەمئاغۆشی: هاوباوەشی، لە باوەشی یەکتردا بوون. ساعید: قۆڵ. بەستەر: سەرین.

واتە: ئای چ خەوێکی ئارام و بەتامە لەگەڵ یار باوەش بەیەکدا بکەین! دەستی من لە ملی ئەودا بێ و قۆڵی ئەو سەرینی من بێ.

خوابێکی (عا، ف، ج): خوابێکە. (کم): خاکێکی. بەستەری (گم): پوستەری.

(٧) ئەم بەیتە لە (عا، ه، ق)دا نییە.

تیرە: تاریك. لامیع: ڕووناك. چیهرە: چارە، ڕوخسار.

واتە: تاریکی و ڕووناکی لە سەیرکردنی دوو لا، من و یار، پەیدا دەبێ. ڕوخساری تاری من شەوی یارە، گەردنی زیوینی ئەو گەوهەری منە.

**نامەویٚ شادییی خۆم، شادییی جانانە بەسە**
**ذەوقی من، غوصصەیی ئەو، ڕەونەقی ئەو، جەوهەری من (٨)**
**حەققی تەڵخییی فیراقم لە ویصالا دەستکەوت**
**ڕوویی من، حەنظەلی ئەو، توندییی ئەو، شەککەری من (٩)**
**کوشتنم قیمەتی وەصڵێکە، ئەگەر بیٚ حاضر**
**لەبی من، بۆسەیی ئەو، خەنجەری ئەو، حەنجەری من (١٠)**
**سەقەر و باغی ئیرەم دوورە بە یەك بن "سالم!"**
**بۆنی من، دۆزەخی ئەو، بۆسەیی ئەو، کەوثەری من (١١)**

تیرەوو (کم): تیرەیی.

(٨) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (ھ)دا نین.

غوصصە: خەم و خەفەت.

واتە: من شادیم ناویٚ، با تەنها یار شاد بیٚ، شادیی ئەو بەسە. شادیی من بۆ ئەو خەمە، کەواتە نەبیٚ باشە، بەڵام ڕەونەقی ئەو بۆ من گەوهەرە.

ذەوقی (عا): زەوقی. غوصصەیی (گم): قصەیی.

(٩) واتە: تۆڵەی تاڵی جیاییم لە کاتی بەیەکگەیشتندا لە یار سەندەوە. ڕووی من بۆ ئەو وەك کاڵەکەمارانە تاڵ بوو، توندوتیژیی ڕووی ئەو بۆ من شەکر و شیرینی بوو.

حەققی تەڵخییی فیراقم (گم): عیشقی تەڵخی بە فیراقم. دەست (کم): دەسی. (گم): دەس. ڕوویی من (ق): ڕووی منە.

(١٠) وەصڵ: گەیشتن بە یار. حاضر: ئامادە. لەب: لێو. حەنجەر: قوڕگ.

واتە: ئەگەر یار ئامادە بیٚ، نرخی گەیشتن بەو کوشتنە؛ لێوی من بگاتە ماچی ئەو و خەنجەری ئەو بگاتە قوڕگی من.

کوشتنم (گم): کوژتنم. حاضر (کم، گم): حاصڵ. (ق): حاصر. نوختەکەی کەوتووە.

(١١) واتە: گرانە دۆزەخ و باخی ئیرەم وەك یەك بن، بوونی من دۆزەخی ئەوە و ماچی ئەو ئاوی کەوسەری منە. یانیٚ بەیەکگەیشتن و ماچی یار مەحاڵە، چونکە -ئەگەر ببیٚ- دەبێتە هۆی کۆبوونەوەی بەهەشتی ئیرەم و دۆزەخ، ئەوەیش مەحاڵە.

بە یەك (ھ): لە یەك. بۆنی من (ق): بۆی منە. (ئەو)ی (بۆسەیی ئەو) لە (ق)دا کەوتووە.

-١٤- (*)

**به ئەفسوونی نیگاهی سیحری دیدەی نازەنینی من**
**بە باد چوو، سەربەسەر، مایەی حەیات و عەیش و دینی من (١)**
**لە شۆری بەختی بەد، یاران! لە دونیا شیوەنی خۆم کرد**
**مەنێن، بۆ تەعزییەی فەوتم، بینایی شۆر و شینی من (٢)**
**جودا نابێ ئەبەد سێ ڕەنگ لەسەر سێ ڕوو هەتا دەمرم:**
**دڵ و میحنەت، سەر و زانوو، سروشك و ئاستینی من! (٣)**
**موهەییایە مەکانی تەن لە خاك و خارەوو خارا**
**لە جێگەی ڕەختی خواب و بالشی تەکیە و سەرینی من (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، عا، ق) هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) بەباد چوو: بەبا چوو، لەناو چوو.

واتە: هەموو ژیان و دینم بە فێڵی جادووی چاوی دڵبەری نازداری من بەبا چوون.

بەباد چوو (ق): بەبا چوو. عەیش و (عا): عەقڵ و. دینی (ق): ژینی.

(٢) واتە: من، لەبەر بەدبەختیی خۆم، هەر لە دنیادا شیوەنی خۆمم کرد. ئیتر بنیادی شین و گریان بۆ پرسەی پاش مردنم دامەنێن، من خۆم زوو شینی خۆمم کردووە.

مەنێن (ق): مەیەن. هەڵەیە. تەعزیەی (عا): تەعضیەی. هەڵەیە.

(٣) جودا: جیا. زانوو: ئەژنۆ. ئاستین: قۆڵ.

واتە: تا دەمرم سێ شێوە هەیە لە سێ شت جیا نابنەوە: دڵ هەمیشە ڕووی لە مەینەت و نەگبەتییە. سەرم هەمیشە لەسەر ئەژنۆمە، کە نیشانەی خەمبارییە. فرمێسك و قۆڵ هەرگیز لەیەك جیانابنەوە، فرمێسك هەمیشەییە و بە قۆڵ دەسڕێ.

زانوو (عا) سەودا.

(٤) ئەم بەیتە لە (مان، ق)دا نییە.

ڕەختی خواب: نوێن. بالشی تەکیە: پاڵپشت.

واتە: جێگەم لەباتیی نوێن و سەرین و پاڵپشت، لەسەر خاك و دڕك و بەردی سەخت بۆ ئامادە کراوە.

بنووسن حەرفی میحنەتها لە چاکی کفنی من، یاران!
وەکوو دونیا لە عوقباش غەم ببێ با هەمنشینی من (٥)
دڵم فەللاح و سینەم وەردە، ئەشکم نەهر و غەم بەذرە!
صەدەن دەر صەد دەدا حاصڵ، لە هەر وەرزا زەمینی من (٦)
بە ڕەنگ "سالم!" چ سەهلە صوبحی نەورۆز گەر بە یەلدا بێ
بەبێ ڕوویی جیهانئەفرۆزی یاری نازەنینی من! (٧)

(٥) میحنەتها: کۆی میحنەتە، مەینەت. چاك: داوێن. عوقبا: ئەودنیا. هەمنشین: هاونشین.
واتە: یاران! دەستم بە دامێنتان وشەی مەینەت و خەم و خەفەت لە داوێنی کفنەکەم بنووسن. با لەودنیایش وەك ئەمدنیایە خەم ببێتە هاونشین و هاوڕێم.
کفنی من (عا): کفنەکەم.
(٦) فەللاح: جووتیار. ئەشك: فرمێسك. وەرد: زەویی کێڵراو. نەهر: ڕووبار. بەذر: تۆو. صەدەن دەرصەد: لە سەددا سەد. حاصڵ: بەرهەم.
واتە: هەموو شتێك لای خۆیەتی و چاوەڕوانی کەس نییە، دڵی جووتیارە و سینەی وەردی کێڵراوە و فرمێسکی جۆگەیە و تۆویش خەم و خەفەتە. ئەمانەیش هەموو لە بەردەستدان. کەواتە: وەرزێکی تایبەتی نابێ، وەك فەلاحەتیی خەڵکی خودا، بەڵکوو لە هەموو وەرزێکدا لە سەددا سەدە.
سینەم وەردە، ئەشکم نەهر و (عا): وەرد و ئەشکم نەهر. هەڵەیە. صەدەن دەرصەد: شێوەنووسی (مان) (صد اندر صد)ە کە شێوەنووسێکی فارسییە. دڵم فەللاح و (ق): دڵم فەللاحە. دەدا (عا): ئەدا.
(٧) سەهلە: ئاسانە. صوبح: بەرەبەیان. یەلدا: شەوەزەنگ. جیهانئەفرۆز: جیهانڕۆشنکەرەوە.
واتە: ئەی سالم! بەبێ بوونی ڕوخساری نازداری یار کە دنیا ڕوون دەکاتەوە، ئاسانە ئەگەر بەرەبەیانی نەورۆز ببێتە شەوەزەنگ. یانێ: هەموو شتێك بێ ڕوخساری یار تاریك و نوتەکە.
وشەی "سالم" لە (عا)دا کەوتووە.

## (*) -١٥-

**یادی تۆیه، صەنەما! یەك بە یەك ئەندیشەیی من:**
**شوغڵی من، شێوەیی من، فیکرەتی من، پیشەیی من (١)**
**نەخلی هەستیم بە جەفا سەبزە لە باغی دونُیا**
**شاخی من، غوصصەیی من، میحنەتی من، ڕیشەیی من (٢)**
**بۆ قوبووڵ کەم بە ئەبەد نازشی ساقیی بەچەڕوو؟!**
**ئەشکی من، بادەیی من، دیدەیی من، شیشەیی من! (٣)**
**ڕووبەڕووی هەیبەتی عیشقت لە هونەردا ئەسەدم**
**خوێنی من، طوعمەیی من، کولبەیی من، بیشەیی من! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ق)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) ئەندیشە: بیرکردنەوە. شوغڵ: کار.

واتە: ئەی بتەکەم! هەرچیم هەیە سەرفی یادی تۆیە؛ کارم، شێوەم، بیرکردنەوەم، پیشەم.

(صەنەما) لە (مان)دا (صەفا)یە کە هەڵەی نووسینە. (ق): لە دڵا. شێوەیی من (ق): پیشەیی من. فیکرەتی من، پیشەیی من (ق): فیکرەتی من، شێوەیی من.

(٢) نەخل: دارخورما. جەفا: ئازار. سەبز: سەوز. شاخ: لق‌وپۆپ. غوصصە: خەفەت. میحنەت: مەینەت.

واتە: دارخورمای بوونم لە باخی دنیا بە ستەم سەوز بوو، لق‌وپۆپم خەفەتە و ڕەگ‌وڕیشەم مەینەتە.

(٣) ئەبەد: هەمیشە. نازش: ناز. بەچەڕوو: سادەڕوو، سادەلەوح. شیشە: پیاڵە.

واتە: من بۆچی هەمیشە منەتی مەیگێڕی سادەڕوو هەڵگرم، فرمێسکی خۆم مەیە و چاوم پیاڵەیە و هەمیشە بە چاو فرمێسك دەپێوم، ئیتر مەیگێڕم بۆ چییە!

(٤) هەیبەت: سام. ئەسەد: شێر. طوعمە: چەشە. کولبە: کەلاوە.

واتە: بەرامبەر بە سامی عیشقت، شێرم. خوێنی خۆم دەخۆم و لانەم بریتییە لە کاولە خەماویەکەم.

کولبەیی من (ق): کەللەیی من. بیشەیی من (ق): پیشەیی من.

**حەرەکاتم وەکو فەرهادە، لە ڕێی میحنەتی عیشق**
**کۆهی من، سینەیی من، ناخونی من، تیشەیی من (٥)**
**جەرگ و دڵ پوختە کە "سالم" بە ضیافەت بۆ دۆست**
**دیگی من، سینەیی من، هیممەیی من، پیشەیی من! (٦)**

(٥) حەرەکات: جموجووڵ. ناخون: نینۆك. تیشە: تەشوێ.

واتە: جموجووڵم لە ڕێگای ئازار و مەینەتی عیشقدا وەك فەرهادە. ئەو کێوەی وا دەیتاشم، سینەمە و تەشوێم نینۆکمە.

(٦) کە: بکە. پوختە کە: لێی بنێ، بکوڵێنە. ضیافەت: میوانداری. دیگ: مەنجەڵ.

واتە: جەرگ و دڵ بکوڵێنە و بۆ میوانداریی یاریان ئامادە بکە، مەنجەڵی من سینەمە و سووتەمەنیم ئیسقانی لەشمە.

## -١٦- (*)

## (در وصف پريشانى نوكرانى بابان بعد از رفتن عبدالله پاشا به قسطنطين)

بەدا ئەحواڵی ئەشخاصێ کە خاصصەی موڵکی بابانن
لە بێدادیی فەلەك هەر یەك سەراسیمە و هەراسانن (١)
جەوانانی سەهی‌قەد بەسکی داماون لە بێچیزی
لەژێر باری غەما هەریەك، لە خەمدا میثلی چەوگانن (٢)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، عا، گم) هەیە. ناوونیشانەکەی لە (مان، ن)دا یانێ: باسی ناخۆشی و پەرێشانیی نۆکەران و داروودەستەی بابان، پاش ڕۆیشتنی عەبدوڵڵا پاشا بۆ ئەستەموول. لە (عا)دا نووسراوە: ((ذكر پريشانى نجباى بابان از گفتهٔ نالى در ولايت سليمانيه انشا شده))، واتە: ئەم پارچەشیعرە باسی بابانە نەجیبەکان دەکا و شیعری "نالی"یە و لە شاری سلێمانی وتراوە. لە کۆتایی شیعرەکەیشدا نووسراوە: لە شاری تاران دایناوە. بەڵام دیارە شیعرەکە هیی "نالی" نییە و "نالی" ئەو وەختە هەر لە سلێمانی نەبووە. سەرەڕای ئەوە، ناسناوی سالم بە ڕێکوپێکی لە دوایین‌بەیتی شیعرەکەدا هەیە و لە نوسخە تایبەتیەکەی "سالم"یشدا جێ‌کراوەتەوە. خوالێخۆشبوو "گیوی موکریانی"ش (گم) لە پێشەکیی ئەم پارچەشیعرەدا نووسیویە: ((شیوەن و هاوار و دادی سالم لەدەست زۆرداری و بێدادیی خوێنمژانەی ڕۆمان و ڕووخانی سەرای دەوڵەتی بابان. ئەم چامەی خوارەوە بە پێنووسی دوکتۆر کەمال فوئاد لە ڕۆژنامەی "ژین"ی ژمارە (٣٥) لە بەرواری ١٩٧١/٨/١٢دا بەخش کراوە)).

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) بەدا: تەعبیرێکی فارسییە، بە کوردی یانێ ئای کە خراپە. خاصصە: داروودەستە و نزیکانی سەرای بابانەکان.

واتە: ئەوانەی کە نزیك و داروودەستەی بابانەکانن، حاڵ و باریان لەبەر بێدادیی ڕۆژگار خراپە و پەرێشان و سەرگەردانن.

بەدا (گم): بەدە.

(٢) سەهی‌قەد: باڵاڕێك. بێچیزی: تەنگ‌دەستی و هەژاری. چەوگان: گۆجان.

واتە: جوانانی باڵاڕێك لەبەر هەژاری ئەوەندە داماون، پشتیان لەژێر باری خەمدا وەك گۆچان چەماوەتەوە.

هەر یەك (عا): هەر جا. لە خەمدا (گم): لە خەم وا.

**لە بابانا گرفتارن، پەرێشانخاطر و بێکەس**
**بە جەمعییەت سیەهبەختانە وەك گێسوویی خووبانن (٣)**
**گەدان و بۆ گەدا دەرگانە وا ناکەن لە بێچیزی!**
**وەکوو نەڕرادی دانا هەر لە فیکری خانەبەندانن (٤)**
**لە ظوڵمی چەرخی دوونپەروەر سەخیطەبعانی حاتەمدڵ**
**بە ڕاهی کۆیی دوونانا لە هەر سوو کاسەگەردانن (٥)**
**بە دەستی کەشمەکەش هەر سوو دڕا بەرگی خودئارایی**
**قەبایی نۆکەر و ئاغا هەموو بێ چاك و دامانن (٦)**
**لە بابانا ئەمێستە چونکە قاوەی نۆکەری دۆغە،**
**لە حەلقەی ئەهلی حەسرەتدا هەموو کەممۆڵە فنجانن (٧)**

(٣) سیەهبەختانە: بەختڕەشانە، بەدبەختانە.
واتە: ئەم خاصصانە لە وڵاتی باباندا گیرۆدە و دڵپەرێشانن، لە ڕەشی و کۆمەڵیدا وەك زوڵفی جوانانن.
(٤) وا ناکەن: ناکەنەوە. نەڕرادی دانا: تاوڵەزان و نەردێنکەری زانا. خانەبەندان: یانە و کۆڕبەستن.
واتە: ئەم خاصصەی بابانانە خۆیان گەدان و دەرگا لە گەدا ناکەنەوە و هیچیان نییە بیاندەنێ، هەمیشە خەریکی دەرگاگرتنن، وەك یاریزانەکان لە یاریی تاوڵەدا کە ماوەی هاتەژوورەوەی داشی بەرامبەرەکەیان نادەن. سالم لە شوبهاندنەکەدا هەر مەبەستی خانەگرتنەکە و دەرگانەکردنەوەیە.
هەر لە (ن): لە هەر. هەڵەی نووسینە.
(٥) کاسەگەردان: کاسەگێڕان، کاسە دەسووڕێنێتەوە و داوای شت دەکا.
واتە: حاتەمخووەکانی بابان لە ستەمی چەرخی نامەردپەروەرەوە بە دەهەندە کاسەیان بە ڕێگەی دەوروبەری ماڵی نامەرداندا هەڵگرتووە و داوای خواردن دەکەن.
(٦) خودئارایی: خۆڕازاندنەوە. قەبا: کەوا.
واتە: بەرگی جوانییان بە دەستی کێشمەکێشی چەرخەوە دڕاوە و کەوای نۆکەر و ئاغا چاك و دامێن دڕاو و پچڕاوە.
هەموو (گم): هەمووی.
(٧) ئەمێستە: ئێستە. دۆغ: دۆ. کەممۆڵە: کۆتلك، کاسەی دارینی دۆخواردنەوە.

**ئەوانەی تورمەپۆش و شەهدنۆش و نازپەروەر بوون**
**ئەمێستە خانەبەردۆش و نەخۆش و زار و عوریانن (٨)**
**ئەوانەی جێنشیمەنیان لە گۆشەی تەختی حاکم بوو،**
**بە دەشتی شەهرەزوورا، جوملە، وەك غوولی بیابانن (٩)**
**دەلەرزن هەوری نەو گەر بێتە ڕووی گەردوون لە پایزدا**
**بە ڕووتی، کۆنە خەزپۆشان لە فیکری بەرگی زستانن (١٠)**
**صەفی باشانی (باب ئۆغڵی) لە دێی (کۆستە) و (دەباشان)ا،**
**بە دەوری گەللەدا چۆماغدەرکەف، جوملە چۆپانن (١١)**

واتە: ئێستا قاوە لەناو بابانەکاندا نەماوە، لە جێی قاوە دۆیە. کەمۆڵەی دۆ لە مەجلیسی ئەهلی خەفەت و پەژارەدا، لەباتیی فنجانی قاوە دەگێڕن.

ئەمێستە چونکە (عا): ئێستە چون. کەمۆڵە (گم): کەم و لە.

(٨) تورمەپۆش: قوماشی تورمە لەبەرکەر، تورمە شالێکی گرانبەهایە. شەهدنۆش: هەنگوینخۆر. نازپەروەر: بە ناز پەروەردەکراو. شەهد: هەنگوین. خانەبەردۆش: ماڵبەکۆڵ، کینایەیە لە هەژاری و سەرگەردانی. عوریان: ڕووتوقووت.

واتە: ئەوانەی کە تورمەیان دەپۆشی و هەنگوینیان دەخوارد و بە ناز و خۆشی پەروەردە کرابوون، ئێستا ماڵبەکۆڵ و دەردەدار و داماو و ڕووتوقووتن.

شەهدنۆش (گم): شەهد و نۆش. بەردۆش و (گم): بەردۆشن. ئەمێستە (عا): ئێستە.

(٩) نشیمەن: دانیشتن.

واتە: ئەوانەی کە جێی دانیشتنیان لە گۆشەیەکی تەختی پادشای حوکمداردا بوو، وەك دێوی بیابان بە دەشتی شارەزووردا بڵاوەیان لێ کردووە.

ئەوانەی (عا، گم): کەسانێ. شەهرەزوورا (گم): شارەزوورا.

(١٠) خەز: ئاوریشم.

واتە: ئاوریشمپۆشەکانی ئەوسا لە بیر و ترسی چاری بەرگی زستانیدا، هەر کە هەوری تازە لە پایزدا بێتە ڕووی ئاسمان، بە ڕووتوقووتی دەلەرزن و خەمیان لێ دێ زستان چی لەبەر بکەن؟

نەو (گم): نوو.

(١١) ئەم بەیتە لە (عا)دا نییە.

**موریدی خانەقاە زۆرن لە عەهدی عەدلی ڕۆمیدا!**
**لە ئاغایانی بێبەش، حوجرەها جێی تەوبەکارانن (١٢)**
**ئەگەرچی طاعەتی جەبرە، وەلێ عیللەت بە بێکاری**
**وەکوو قاری یەکایەك حافیظی سی جزمی قورئانن (١٣)**
**لە طوولی ڕۆژگارانا لە هەر لا خادیم و مەخدووم**
**وەکوو ئەصحابی پێغەمبەر -عوموومەن- ڕۆژەدارانن (١٤)**
**سیەهبەختانی بێدەوڵەت، لەبەر بێماڵیی و عوسرەت**
**گەهێ حەممالی مالانن، گەهێ عەللافی مەیدانن (١٥)**

باب ئۆغلی: ئەوانەی وا داروودەستە و کارهەڵسووڕێنی ناو بارەگای میرانی بابان بوون. کۆستە و دەباشان: ئەوسا لە دەرەوەی سلێمانی بوون. گەللە یا گەلە: مێگەل. چۆماغدەرکەف: کوتەكبەدەست. چۆپان: شوان.

واتە: ڕیزی پیاوە باشەکانی باب ئۆغلی، ئێستا لە دێی (کۆستە) و (دەباشان) کوتەکیان بە دەستەوەیە و شوانی مەڕ و ماڵاتن.

دەباشانا (ن): دەباشانە.

(١٢) سالم بە تێکڵەوە قسەی کردووە و وتوویە: موریدی خانەقا لە سەردەمی دادی (؟) تورکاندا زۆر بوون و حوجرەکانی خانەقا بوونەتە جێگەی ئاغایانی بێبەش.

خانەقاە (عا، ن): خانەقەه.

(١٣) واتە: ئەگەرچی ملکەچیی قورئان ئەرکە، بەبێ نرخی نایلێم، بابانەکان لەبەر بێکاری هەموو سی جزمەی قورئانیان لەبەرە و بوونەتە قورئانخوێن.

جەبرە (عا): زۆرە. هەروەها جەبرە دوور نییە (خەیرە) بووبێ. قاری (گم): قارئ.

(١٤) طوولی ڕۆزگاران: بە درێژایی ڕۆژ. ڕۆزەداران: ڕۆژووەوانان.

واتە: بابانی بە نۆکەر و گەورەی خزمەتکراوەوە، لەبەر نەبوونی خواردەمەنی، وەك هاوڕێیانی پێغەمبەر (د.خ) هەموو بە درێژایی ڕۆژان بەڕۆژوون.

طوولی (ن): توولی. هەر لا (عا): هەر جا.

(١٥) واتە: بەختڕەشانی بێسامان، لەبەر بێماڵی و دەسکورتی، جارێ کۆڵکێشی ماڵانن، جارێ دەغڵفرۆشی مەیدانن. دیارە مەبەست لە (عەللاف) بەردەستی عەلافە، ئەگینا عەلاف دەوڵەمەندە و بۆ ئەم باسە ناشێ. سالم مەبەستی هەژاربوونی بابانەکانە.

**نە بانیی و نە باغی ما لە فەوجی لەشکری ئیسلام**
**لە خۆفا طیفلی مەردوم وەك عەیالی ئەهلی زەنگانن (١٦)**
**صەفی مەقرووضی قەرضی ئیلتیزامی حاصیڵی ڕۆمی**
**لەناو هەورامیی و کوردا هەمووو تەبدیل و پەنهانن (١٧)**
**لە فیکری ئیلتیزاما، شەو دەکەن شوورا لەبەر عوسرەت**
**سەحەر بۆ هەوڵی قووتی شەو لە ناو شارا پەرێشانن (١٨)**

(١٦) ئەم بەیتە لە (عا)دا نییە.

زەنگان: زەنجان ڕاستە کە شارێکی باکووری ڕۆژاوای ئێرانە.

بانی: بنیادنەری ئاژاوەکە کە کوردانی دوژمنی بابان بوون. باغی: دەسدرێژیکەران، ئەوانەی کە ئاژاوەکەیان بە هەڵ زانی و ڕژانە ناو شار و دەستیان کرد بە ڕاووڕووت. جەیشی ئیسلام: سوپای تورك.

واتە: فەوجی لەشکری تورك کە کاری بۆ تەخت بوو و ئیشی بە داردەست نەما، نە بنیادنەری ئاژاوەکەیان لە سوپادا هێشت و نە دەسدرێژیکەران، مانەوە تورك و تورك! بۆیە منداڵی خەڵك لە ترساندا وەك زنجییە قولەڕەشەکان بوون بە خزمەتکار. بەکورتی، کە تورکەکان جێی خۆیان قایم کرد، شەپێکیان لە داردەستەکانیان دا و لە سوپا دەریانکردن!

جێی باسە، (بانی) لە دوادوایی ئەم پارچەشیعرەدا، بەم مەعنایە کە ئێمە بۆی چووین، بەکار هاتووە. سالم خۆیشی دەڵێ: لە ئەصلا بانیی ئەم کارە کاسبهای شەهری بوون.

(گم)، لەباتی نە بانیی و نە باغی، چەند نوختەیەکی داناوە بەم جۆرە (...).

(١٧) ئیلتیزام: ئەو ماڵ و پارەیە کە حکوومەتی تورك بەرامبەر بە زەوی‌وزار و کشت‌وکاڵ لە خەڵکی سەندووە. صەف: ڕیز.

واتە: کۆمەڵی ئەوانەی کە قەرزاری حەقی ئیلتیزامی تورك بوون، خۆیان لەناو هەورامی و کورددا ون کرد لە ترسی پێ‌بژاردن. بە دوور نازانرێ مولتەزیمەکان لەنێوان میری و فەلاحەکاندا بووبن، یانێ هەر کەس مولتەزیمی سەرانەی ناوچەیەك بووبێ.

قەرضی (گم): قەرزی. هەورامیی و (عا): هەورامییا. هەڵەیە.

(١٨) واتە: قەرزدارەکانی ئیلتیزام شەو کۆڕ دەبەستن بۆ ڕاوێژکردن، سبەی زوو هەموو بۆ هەوڵی ژیان لە ناو شاردا دەسووڕێنەوە و سەرگەردانن.

**ئەوانەی بەرشکەستی ئیلتیزامی حاصیلّی ڕۆمن**
**لەتاو بێنە و نییە، گاگەلچەرێنی میری جافانن (١٩)**
**ضەرەرکەردەی ئیجارەی پادشاهی چوونە دەروێشی**
**فەقیری موڵکی (هەوشار) و غەریبی شاری (تاران)ن (٢٠)**
**بە دیهقانی بڵاو بوون دایرەی بێکەس بە (قۆپی)دا**
**لە (بەڵخە) و (دۆکەرۆ) و (نەوتی) و (دەلووجە) و (سەیدوسێنان)ن (٢١)**
**بە کەوبازی خەریکن، دەستەیی مەعزوولی بێئاغا**
**موقیمی (قەهرەمان) و (مێوڵی) و (تیمار) و (باغان)ن (٢٢)**
**حەیادارانی بێحورمەت، لەتاو بێماڵیی و عوسرەت**
**فەقیری دێی (فەقیرە) و (تەکیە)وو (ئەستێڵ) و (تافان)ن (٢٣)**

(١٩) بەرشکستە: تێشکاو و زیانکردوو. گاگەلچەرێن: گالەوەڕێن، گاوان.

واتە: ئەوانەی تێشکاون و حەقی ئیلتیزامی تورکانیان پێ نادرێ، لە ترسی بێنە و نییە بوونەتە گاوانی میرانی جاف.

(٢٠) هەوشار: شاهینذژ، ناوچەیەکی نێوان بۆکان و مەراغە و میاندوواو لە کوردستانی ئێران.

واتە: ئەوانەی لە بەکرێگرتنی زەوی‌وزاری میریدا زیانیان کردووە و بۆیان نادرێتەوە، لە وڵاتی (هەوشار) گەدان و نامۆی (تاران) و وێڵی شارانن.

چوونە (مان، ن): چۆتە. تارانن (مان، ن): طارانن. (عا): طەهرانن.

(٢١) ئەم بەیتە لە (عا)دا نییە.

دیهقان: جووتیار. دایرە: دەستەودایەرە.

واتە: کۆمەڵی بێکەسان، بابانەکان، لەبەر نەبوونی بە جووتیاری بە دێهاتی (قۆپی) و (بەڵخە) و (دۆکەرۆ) و (نەوتی) و (دەلووجە) و (سەیوسێنان)دا بڵاوبوونەتەوە. ئەم دێیانە هەموویان لە ناوچەی (قەرەداخ)ی سەر بە پارێزگای سلێمانین.

سەیدوسێنانن (گم): سید سینانن.

(٢٢) واتە: ئەوانەی دەستیان لە کار کێشراوەتەوە و بێگەورەن، لە دێیەکانی (قارەمان) و (مێولّی) و (تیمار) و (باخان)ی ناوچەی (قەرەداخ) خەریکی شەڕەکەون، کورد واتەنی: شەڕ لە بەتاڵی باشترە!

(قەهرەمان)، دێی (قارەمان)ی ئێستایە.

(٢٣) بێحورمەت: بێقەدر، بێڕێز.

**گرووهێ چەمچەتاشن هەروەکوو ئوستادی خوانساری**
**لە دێی (تەنگی‌سەر) و (زەیدۆمەر) و (تیمار) و (دۆڵان)ن (٢٤)**
**نەدیمانی قەدیمی موستەعیددن بۆ خەڕەکداری**
**بە یادی توربەوو کاه و جەو و ئەفسار و پاڵانن (٢٥)**
**قەدیم تەنپەروەری نازن بە بازاڕا غوبارئالوود**
**ئەگەر گاباری کائاوەر، وەگەر هێزمفرۆشانن (٢٦)**

واتە: بەشەرمەکانی سەر بە بابان، کە ئێستا قەدریان نەماوە، لەتاو بێ‌دەستی بوونەتە فەقیر و هەژاری دێی (فەقیرە) و (تەکیە) و (نەستێڵ)ی ناوچەی قەرەداخ.

لەتاو (عا): لەبەر. نوختەی (بێ)ی (بێ‌مالّیی) لە (عا)دا کەوتووە.

(٢٤) چەمچەتاش: کەوچکتاش. خوانساری: لە (خوانسالاری)یەوە هاتووە، واتە سەرپەرشتی سفرەی ماڵ، سەرۆکاریی چێشتخانە. ئەوی ئەو کارەیش دەکا، (خوانسار)ە.

واتە: کۆمەڵێ لەوانەی وا بوونەتە کەوچکتاش وەك مامۆستای سەرپەرشتیی چێشتخانە، لە دێهاتی (تەنگی‌سەر) و (زەیۆمەر) و (دۆڵان) و (تیمار)ی ناوچەی قەرەداخ دادەنیشن.

چەمچەتاشن (مان، ن، گم): چەمچەتاش. لەنگە. لە دێی تەنگی‌سەر و زەیدۆمەر و تیمار و دۆڵانن (گم): لە دێی تەنگێ و ... . تەنگی‌سەر (مان، عا، ن): تەنگی‌بەر. هەڵەیە، دێیەکە ناوی تەنگیسەرە. (زەیدئۆمەر) ئێستا خەڵکی ناوچەکە (زەیۆمەر)ی پێ دەڵێن. (عا): تەنگی‌بەر و زەیدئۆمەر و ئەستێل و تافانن.

(٢٥) نەدیم: هاودەم، نوکتەباز. خەڕەکداری: کار لەسەر دەزگای لۆکەرێسی، کاه: کا. جەو: جۆ.

واتە: هاونشینە کۆنەکان ئامادەن بۆ خەڕەکداری. هەروەها بە یادی توورەکەی ئەسپ و کا و جۆ و هەوسار و پاڵانەوە، کە ئیشی ئەوسایان بووە، کاردەکەن.

نەدیمانی (مان): نەریمانی. کاه و جەو و (عا، گم): کاوو جۆ. (جەو) ئەگەر (جۆ)ی کوردی بێ، بەیتەکە لەنگ دەبێ. سالم خۆیشی فارسییانە وتوویە: کاه و جەو و ئەفسار لەباتیی کا و جۆ و هەوساری خۆماڵی!

(٢٦) کائاوەر: ئەوی کا دەهێنێ. غوبارئالوود: تۆزاوی. هێزمفرۆش: دارفرۆش.

واتە: ئەوانەی لە پێشدا لەش‌پەروەردەی ناز بوون، ئێستا لە بازاڕدا تۆزاوین، یا بارەکا بە گا دەهێنن بۆ مەیدان، یا بارەدار دێنن بۆ فرۆشتن!

**لە بیمی تازییانەی مەردی ڕۆمی، سەیید و صۆفی**
**بە ئوممێدی گەزۆ و مازوو لەبن داری (مەریوان)ن (٢٧)**
**هونەرمەندانی شێرئەوژەن، قەویدەستانی پیلئەفگەن**
**لە ڕووی غەوواصی ئەتراکا وەکوو ڕووبەهـ گورێزانن (٢٨)**
**کوهەنسەوداگەری شاری لە شوورا مەصلەحەتبینن**
**وەلێ نۆکەر بە بەققالی ترازووبازی دووکانن (٢٩)**
**کرێکارانی ناکەس بۆ بناغەی کولبەیی دیهقان**
**لە خانەی کاولی نۆکەر پەیاپەی خشتکێشانن (٣٠)**

(٢٧) بیم: ترس. تازیانە: قەمچی.

واتە: سەیید و سۆفی و پیاوچاکان لە ترسی قەمچیی تورکان و ئازاریان، لەبن دارەکانی ناوچەی مەریوان بە تەمای کۆکردنەوەی گەزۆ و چنینی مازوون.

صۆفی (گم): سۆفی.

(٢٨) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (عا)دا نین.

شێرئەوژەن: شێر بەئەرزادەر. قەویدەست: دەستوەمەچەك بەهێز. پیلئەفگەن: فیل بەئەرزادەر. غەوواص: قەوواس، کەوانکێش و تیرەوشێن. ڕووبەهـ: ڕێوی. گورێزان: ڕاکردوو.

واتە: هونەرمەندانی شێربەزێن و دەستوەمەچەك بەهێزانی فیلبەئەرزادەر، لە ڕووی تیرهاوێژی تورکدا وەك ڕێوی هەڵاتوون.

شێرئەوژەن (گم): تیراوژەن. ڕووبەهـ (گم): ڕۆبەی.

(٢٩) کوهەن: کۆن. شوورا: ئەنجومەنی پرس و ڕاوێژ. مەصلەحەتبین: ئەوی خێر و چاکە لە کاردا ڕەچاو بکا. وەلێ: بەڵام. ترازووباز: فێڵکردوو لە کێشانەدا.

واتە: کۆنە بازرگانانی خەڵکی شار -کە دەبێ لەگەڵ بابان نەبووبن- ئەمڕۆ ئەوانن لە ئەنجومەنی شوورای تورکاندا خێر و چاکە لە کاردا دیاری دەکەن و لە بەرچاوی دەگرن! بەڵام نۆکەرەکانی بابان هیچیان بەدەست نییە، خەریکی بەقاڵی و خشتکێشانن!

(٣٠) کولبە: کەلاوە. دیهقان: جووتیار. پەیاپەی: سەرومڕ.

واتە: کرێکار سەرومڕ دەچن خشتی خانووی ڕووخاوی نۆکەرەکانی بابان دێنن بۆ دروستکردنی کۆلێتی جووتیاران لە دەرەوەی شار. دیارە بابان و نۆکەرانی بابان کە گلۆلەیان کەوتووەتە لێژی، خشتی ماڵەکانیشیان بردوون!

به ڕێی بیم و خەطەردا یەك بە یەك بۆ قاصیدی چاکن
بەبێ تەکلیفی ڕەهزەن، خودبەخود بێچیز و عوریانن (٣١)
صەفی مەقرووضی بێتەوسەن، لە سەهمی «سەن سەن»ی ئەتراك
وەکوو عاشق لە هیجرانا، یەکایەك ئەشکڕێزانن (٣٢)
گەهێ «قلب الاسد» ئەزبەسکی بێسایەن لە وادیدا
وەکوو مەجنوونی صەحرایی لەبن خاری موغەیلانن (٣٣)
کزە و دوودی کەباب دەردێ لە مەطبەخهایی بێدوودا
بە یادی قووتی شامی شەو، جگەرها بەسکی بوریانن (٣٤)

(٣١) بیم: ترس. ڕەهزەن: ڕێگر و جەردە. خودبەخود: خۆبەخۆ. عوریان: ڕووتوقووت.

واتە: بابانەکان و نۆکەرانیان بەبێ ڕووتکردنەوەی ڕێگر، ئەوەندە نەدار و ڕووتوقووتن، بێترس و سام بۆ تەتەری باشن، هیچیان نییە کەس لێیان بسێنێ.

ئەم بەیتە ئەوپەڕی هەژاریی بابانەکان پیشان دەدا، دیارە بە هەزارحاڵ بە سەڵتەزەلام خۆیان بۆ دەرباز کراوە.

(٣٢) صەف: ڕیز. مەقرووض: قەرزار. تەوسەن: ئەسپ. سەهم: سام و ترس. سەن سەن: تۆ کوڕە تۆ! ئەشکڕێز: فرمێسکڕێژ.

واتە: قەرزارە بێئەسپەکان، لە ترسی پرس و وەڵامی تورکان، دوورەوڵاتن و وەك عاشقان فرمێسکی نامۆیی دەڕێژن.

مەقرووضی (عا): مەعزوولی.

(٣٣) ئەم بەیتە لە (عا)دا نییە.

قلب الأسد: ناوەڕاستی هاوین. ئەزبەسکی: ئەوەندە. بێسایە: بێنوا، بێپەنا. وادی: دۆڵ. موغەیلان: دارێکی دڕکاویی دەشتەکییە.

واتە: لە ناوەڕاستی هاوین و قرچەی گەرمادا ئەوەندە بێسێبەرن، وەك شێتی دەشت لەبن دڕکی داری موغەیلاندا دەحەسێنەوە!

(٣٤) مەطبەخها: چێشتخانەکان. دوود: دووکەڵ. بەسکی: زۆر. بوریان: برژاو.

واتە: بابانەکان، لە بیری شێوی شەوانیاندا، زۆر جگەربرژاون، کزەی کەباب لە چێشتخانەی بێدووکەڵیانەوە دێ!

**طەڵەب ناکا گەدا قەد سوویی سفرەی صاحیبی نیعمەت**
**لەتاو ئەحواڵی بێنانی، لە هەر جا خوانەمیهمانن (٣٥)**
**بە ظاهیر خوڕڕەم و شادن لە ڕووی تورکی (ئەرۆملی)دا**
**لە دڵدا گەرچی دیگئاسا بە مەخفی جوملە جۆشانن (٣٦)**
**بە ئەحواڵی ملووکانی گەداپەروەر، دڵم سووتا**
**لە بابانا ئەمێستە موستەحەققی خێر و ئیحسانن (٣٧)**
**لە جەوری چەرخی گەردوون، بەسکی حەیرانن بە ناچاری**
**بە لەب خەندان و شادانن، بە دڵ غەمگین و گریانن (٣٨)**
**بە نامەردی سەراسەر میثلی گەرگینن لە لای ڕۆمی**
**ئەگەر ڕوویین‌تەنی عەهدن، وە گەر سامی نەریمانن (٣٩)**

(٣٥) واتە: خاوەن خوان و نیعمەت گەدا بانگ ناکاتە سەر خوانی خۆی، چونکە بابانەکان –لەتاو دەردی بێنانی– هەر لایێ خوانێ هەبێ، ئەوان بەبێ بانگ‌کردن میوان دەبن.

قەد (گم): قەت. خوانە (ن): خوارە. هەڵەی نووسینە. (گم): خانە.

(٣٦) خوڕڕەم: دڵخۆش. دیگ: مەنجەڵ. مەخفی: لە ناخەوە، ژێربەژێر. ئەرۆملی: ڕۆمەیلی، ڕۆم ئیلی، بەشی ئەورووپای تورکیا. جۆشانن: لە کوڵدان.

واتە: بە دیمەن و سەرزاری لە ڕووی تورکانی ڕۆمەیلیدا بە ناچاری ڕووخۆشن، بەڵام لە دڵدا وەك مەنجەڵ هەموو دەکوڵێن.

ئەروملیدا (عا): أورمیدا. (گم): ئەڕوومیدا.

(٣٧) ئەمێستە: ئێستا.

واتە: بەزەییم بەو پاشا و میرانەی باباندا هاتەوە کە پێشتر یارمەتیدەری هەژاران بوون، ئێستایش شایانی خێر و چاکە لەگەڵ‌کردنن.

(٣٨) شادانن: شادمانن.

واتە: ئەوانە، لەبەر ستەمی ڕۆژگار، بە ناچاری مەست و حەیران بوون. ئەگەرچی بە ڕوخسار شادمان و لێوبەخەندەن، بەڵام لە ناخەوە گریانیان بۆ حاڵی خۆیان دێ و خەمبارن.

(٣٩) گەرگین: گەرۆڵ، گەڕ و گول ناوی پاڵەوانێکی ئێرانیی سەردەمی کاووس و کەیخوسرەوە، لەبەرئەوەی کەیخوسرەو گوێی نەدایێ و وەك ڕێنوێن لەتەك بیژەندا ناردیە شەڕ، دوای شەڕ فریوی بیژەنی دا و ڕەوانەی توورانی کرد، لەوێ گرفتاری عیشقی مەنیژە بوو. کە گەرگین بە

**نیظامانی مولازیمەنصەبی ماضی، ((بِحَمْدِ اللّه))**
**لە لادێدا بە دوو شایی هەموو جۆچێنی دیهقانن (٤٠)**
**خیانەتپیشەکانی فەوجی بیرئینجی لە برسانا**
**بە ناچاری لە دێی (صۆفیلەر)ا وەرزێری دۆمانن (٤١)**
**مەلەخطەبعن لە هێشووی دەغڵی دیهقانی بە هەر لادا**
**لەناو جاڕی گەنم هەر یەك وەکوو داهۆڵی خەرمانن (٤٢)**

ئەسپەکەی بیژەنەوە گەڕایەوە بۆ ئێران، گیـو خـستیە زینـدان. ڕووبـینتـەن: پۆڵابـەدەن، ناسـناوی ئەسفەندیاریش بووە. سام: پاڵەوانێکی سیستانیی کوڕی نەریمان و نەوەی گرشاسپ بووە، یا تـرس و بیم. نەریمان: باپیری ڕۆستەم و باوکی سام بووە.

واتە: بابانەکان ئەگەر جەستە پۆڵای زەمان یا سامی نەریمان بن، یان سام و ترسی نەریمانیان هەبێ، لە لای تورکان گەڕۆڵ و بێنرخن.

گەرگینن (گم): گورگانین. عەهدن (عا): عەصرن.

(٤٠) شایی: شاهی، دراوێکی سـەردەمی قاجـاری بـووە و کردوویەتیـە پـەنجا دینـار. جۆچـێن: خۆشنشین، کەسێکە لـە دێدا زەویی نەبێ و بە کرێ کار بۆ ئەم و ئەو بکا.

واتە: ئەو عەسـکەرانەی بابان کە لـە پێـشدا خاوەن پلەوپایە بوون، سـوپاس بۆ خـودا، ئێـستا لە لادێ کرێکاری دەکەن و بە نرخێکی کەم -دوو شایی- خەریکی چاندنی جۆی جووتیارەکانن!

ئەڵبەت بۆیە دەڵێ: ((بحمد اللّه))، چونکە ئەمانە لەوانە بوون کە لـە دوا شەڕی نێوان بابان و تورکدا لـە (کۆیە) خیانەتیان لە بابانەکان کردووە و لـە بەیتی دواییشدا بە ئاشکرا ئـەو خیانەتـەی داوەتـە پاڵیـان. یـا ڕەنگە مەسەلەی خیانەت لە ئارادا نەبێ و بە تەوسەوە ((بحمد اللّه))ی بۆ حاڵ و گوزەرانیان وتبێ، کە بەس نییە ئەمانە ئەو کارەیشیان دەست کەوتووە.

دووەم نیوەی ئەم بەیتە و هیی بەیتی (٤٤)ەم لە (عا)دا جێگۆڕکێیان پێ کراوە.

(٤١) بیرئینجی: برنجی، وشەیەکی تورکییە بە مانای (یەکەم). ئەڵبەت فەوجەکە لـە کـاتی خۆیـدا باش بووە، پاشان خیانەتیان لـە بابان کردووە و بە قسەی دوژمن هەڵخەڵەتاون، دوایش تووشی ئـەو نوشوستییە بوون کە بوون! صۆفیلەر: ساغ نەبووەوە کوێیە.

واتە: خیانەتکارەکانی فەوجی یەکەم ئێستا لـە برساندا بە ناچاری لـە دێی (صۆفـیلـەر) وەرزێـری دۆمەکانن! دۆم کە خۆی حاڵێکی زۆر باشی نییە، ئەمان لەو نابووتتر بوون.

(٤٢) مەلـەخ: کوللـە.

**دریّغا بۆ سۆارەی خاصی پاتەختی سولەیمانی**
**لە (قرگە) و (قزلەر) و (قۆرخ)، بە ڕووتی جوملە گاوانن (٤٣)**
**بەسێ سەگمەرگ و بێعار و گرانجان و سەبوکعەقڵن**
**ئەوانەی ئەهلی بابانن، بەدڵ لەم عەهدە خەندانن (٤٤)**
**لە ئەوضاعی سولەیمانی، ئەوانەی شاد و ئاسوودەن**
**لە فەرعا نوطفەیی حەیضن، لە ئەصلا جینسی شەیطانن (٤٥)**
**لە ئەصلا بانییی ئەم کارە کاسبهایی شەهری بوون**
**لە ئەمری فیتنەئەنگێزا، سەراسەر، میثلی (مەروان)ن (٤٦)**

واتە: ئەمانە تەبیعەتیان وەك کوللەیە، بە گوڵەگەنمی جووتیارەکانەوە نووساون و لەناو جاڕی گەنمدا ڕەقوتەق ڕاوەستاون، دەڵێی داهۆڵن و پاسی خەرمانیان پێدەکەن!

جێی باسە، خوێندەوار لەم سێ بەیتەدا هەست بەوە دەکا سالم دەست بە سنگیدا دەهێنێ و زۆری پێ خۆشە کە خیانەتکارەکان تووشی ئەنجامی کاری بەدی خۆیان بوون!!

دیهقانی (عا، گم): دێهقانا. بە هەر (ن): لە هەر.

(٤٣) واتە: داخی گرانم بۆ سوارەی تایبەتیی پایتەختی سلێمانی کە ئێستا لەم سێ دێیەدا گاوانن: (قرگە)ی نزیکی سلێمانی، (قزلەر)ی لای (سووورداش)، (قۆرخ)ی ناوچەی (شارەزوور).

پاتەختی (گم): پایتەختی. قرگە (گم): قیرگە. لە قرگە.. تاد (عا): لە لادێدا بە دوو شاهی هەموو جۆچێنی دیهقانن. (گم): لە قیرگە و قزلەر و قۆرخ بە ڕووتی جوملە گاوانن.

(٤٤) ئەم بەیتە لە (عا)دا نییە.

واتە: ئەوانەی کە ئەهلی ولاتی بابانن و بەدڵ ئەم ڕۆژەیان پێ خۆشە و پێدەکەنن، زۆر سەگمەرگ و بێعار و گیانگران و عەقڵسووکن!

بەسێ سەگمەرگ و (گم): ... ... مەرکوو.

(٤٥) واتە: ئەوانەی کە لەم بارودۆخە نالەبارەی سلێمانیدا دڵشادن، بە ڕەگەز دەچنەوە سەر شەیتان و لە لقوپۆپدا نوتفەیەکی ناپاکن!

ئەم بەیتە و بەیتی پێشوو قووڵیی بیری سیاسیی سالم و نەتەوەپەرستیی پیشان دەدەن.

سولەیمانی (ن): سولەیمانیە. حەیضن (عا): حەیظن. هەڵەیە. جینسی (ن): نەسلی.

(٤٦) بانی: بنیادنەر. مەروان: کوڕی حەکەمی چوارەم خەلیفەی ئومەوییە، کە دەسەلاتی لە سوفیانییەکانەوە بردە دەستی مەروانییەکان. لە سەردەمی خەلیفە عوسماندا (خ.ر) وەزیر و ڕاوێژکار

**گەهێ هەمدەردی ئەتراکن، گەهێ هەمعەیشی ئەکرادن**
**لە یەکلا مادەری بەڕڕەن، لە یەکلا یاری گورگانن (٤٧)**
**لە ظولْمی چەرخی چەپگەردش درێغا، حەسرەتا، دادا!**
**بە میثلی "سالم"ی بێکەس، گەلێ کەس وێلْی شارانن (٤٨)**

بوو و بەشداریی لە شەڕی (جەمەل)دا کرد. پاشان کە داوای خەلیفایەتیی کرد، سەرەتا خەڵکی ئوردون بەیعەتیان پێ کرد، ئەمجا چووە شام و لەسەر تەختی خەلیفایەتی دانیشت.

واتە: بنیادنەری ئەم ئاژاوە و شەڕە لە بنەڕەتدا کاسبەکانی شاری بوون، کە لە کاری فیتنە و ئاژاوەنانەوەدا وەك مەروانن.

شایانی وتنە، لەم بەیتەیشەوە بۆنی ئەوە دەکرێ کە بازرگان و کاسبکارانی شار، وەك توێژی تازە دەرکەوتووی کۆمەڵایەتی کە پێویستییەکانی گەشەکردنی شار هێناونیە مەیدان، جۆر نەبوون و ئەوانیش هۆیەکی ڕووخانی بابان بوون.

(٤٧) بەڕڕە: بەرخ.

واتە: ئەم بیچمانە، شەریکی دز و هاوڕێی قافلەن؛ لەگەڵ گورگ گۆشت دەخۆن و لەگەڵ مەڕیش شین دەکەن!!

گەهێ هەمدەردی.. تاد (کم، گم): گەهێ هەمدەردی ئەکرادن، گەهێ هەمعەیشی ئەتراکن. هەمرازی (گم): هەمعەیشی. بەڕڕەن. (گم): بەرخن.

(٤٨) واتە: ئاخ و داخ و ئۆف لە ستەمی چەرخی چەپگەڕ، زۆر کەسی وەك سالم بێکەس و وێڵی وڵاتانن.

سالمی بێکەس گەلێ کەس (عا): نالی بێکەس کەسی! هەڵەیە، چونکە نە شێوەی شیعرەکانی شێوەی نالییە، نە نالیش ئەو کاتە لەو ناوەدا بووە. سەرەڕای ئەوە، نوسخەکەی (مان)، وەك لە پێشەکییەکەدا نووسراوە، بۆ سالم خۆی نووسراوەتەوە. ئەگەر ئەم شیعرە درێژە هیی نالی بووایە، ئەم نەیدەکرد بە شیعری خۆی!

## (*) -١٧-

ئەو کەسانە کە عەدووْی عاشقی سەرگەردانن
بێدڵ و بولهەوەس و کەمخیرەد و حەیوانن (١)
کەس بە سەرحەددی بیابانی مەحەببەت نەگەیشت
وەکو من سالیکی ئەم ڕاهە، هەموو حەیرانن (٢)
ڕێی حەریمی حەرەمی عیشقی نییە، سفڵەیی دز
پاسەبانی سەری ئەم کۆیە جەوانمەردانن (٣)
ئەشکی "سالم" کە بە یادی لەبی تۆ دێتە کەنار
قەطرەقەطرە لە نەظەر ئەهلی بەصەر، مەرجانن (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (حا، کم، گم، ق)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی ئەصلّەم.

(١) بولهەوەس: بوْالهَوَس، ئارەزووباز.

واتە: ئەوانەی کە دوژمنی عاشقی سەرلێشێواون، دڵیان نییە و ئارەزووباز و کەمعەقڵ و لە ئاستی ئاژەڵدان، بۆیە ئەوە کاریانە.

ئەو کەسانە (کم، گم): ئەو کەسانەی. بوالهوس و کەمخیرەد (ق): بێخیرەد و بولهوس.

(٢) واتە: کەس نەگەیشتە سەر سنووری بیابانی خۆشەویستی و ئەوانەی کە ئەم ڕێگایەیان گرتووە، وەك من سەرگەردانن.

بە سەرحەددی (حا، کم، ق، گم): لە سەرحەددی. بەم جۆرە، یانێ: کەس تێی نەگەیشت.

(٣) واتە: مرۆی بەدنەکی سپڵە ڕێی ناکەوێتە خاکی حەرەمی خۆشەویستی. پاسەوانی ئەم دەورووبەرە جوامێرانن، ڕێی سپڵە و بەدنەك نادەن.

سفڵەیی (کم، گم): سپڵەیی. دز (حا): دڕ. (ق): دوزد.

(٤) واتە: فرمێسکی سالم کە بە یادی ماچی لێوی تۆ دەڕژێتە باوەش، دڵۆپ دڵۆپی لای بینایان و لەعیشقزانان وەك مەرجانی سووری بەنرخە.

قەطرە قەطرە (کم، گم): قەطرە قەطرەی.

## (*) -١٨-

**دڵ لەناو چاهی زەنەختا، قەد بە من نایێ بیروون**
**حەبس و زیندانی نییە وەك تۆ چ کافر، سەرنگوون! (١)**
**وا دڵی هێنامە جۆشش، جونبوشی گێسوویی تۆ**
**ئۆف خودا! دیسان صەبا بزواندی زەنجیری جونوون (٢)**
**بەختی لەعلی لێوی تۆ بەستی دو دەستی مەطڵەبم**
**من بە ئەو تیشنەی مەکین، ئەو تیشنەیە بۆ من بە خوون (٣)**
**پێی دەڵێم: عاشقکوشی تا کەی، دەکەی نەرمی؟ دەڵێ:**
**با بپۆشێ، ئاینەی گەردوون لە عەکسا، بەرگی خوون! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، ق، نم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەقسوور.

(١) چاه: چاڵ. بیروون: دەر.

واتە: دڵ لەناو چاڵی چەناگەتدا بەندییە، بۆ من دەرنایێ. هیچ کافرێکیماڵوێران زیندانی وەکوو تۆی نییە کە دیلی تێدا سەرنگوون و بێسەروشوێن بێ!

قەد (حا، ق، نم): قەت. حەبس و (نم): حەپسی.

(٢) سالم وای بڕیار داوە کە خۆی شێتە و بە تاڵی زوڵفی یار بەستراوەتەوە، ئێستا بای سەبا زوڵفی دەجووڵێنێ.

واتە: زنجیرەکەی گەردنی ئەم دەجووڵێتەوە و دڵی دێنێتە جۆش و ڕایدەچڵەکێنێ.

بەختی (ق): بە خەططی. مەکین (ق): نگین.

(٣) مەکین: مژین.

واتە: جەنگە، لەنێوان لێوی لەعلڕەنگی تۆ و دوو دەستی مندا؛ من تینووی مژینی ئەو و ئەو تینوو بە خوێنی منە. ئاخری من لە پێناوی ڕەزامەندیی تۆدا وازم لە مەبەستی خۆم هێنا و هەردوو دەستم بەسترا، لێو گەیشت بە مەبەستی خۆی و خوێنی منی ڕشت.

بەختی لەعلی لێوی تۆ بەستی دو دەستی (نم): بەحثی لەعلی لێوی تۆ بوو، بەستی دەستی. مەکین (ن): مەکێن. تیشنەیە (ن): تیشنە. لەنگە.

(٤) ئەم بەیتە لە (ق)دا نییە.

**نەقدی جانم، نرخی یەك ئیما طەڵەب کەی، حاضرە!**
**بۆ مەتاعی وا کەسێ ناکا لە بەیعا چەندوچوون (٥)**
**کێ بدا غەیری خودا سامانی شێواوی وەها:**
**دەستتەهی، هیممەتبوڵەند، مەطڵەبقەوی، طالیعزەبوون!! (٦)**
**ڕەنگە ناصیح! تەرکی مەنعی "سالم"ی بێچارە کەی،**
**گەر بڵێم جارێ بە گوێتا، ڕەمزی ئەسراری دەروون! (٧)**

ئاینەی گەردوون: ئاوێنەی جیهان، یانێ خۆر.

واتە: مـن بە یار دەڵێم تا کەی خـەریـکی بەزمی عاشق‌کوشـتن دەبی؟ ئاخۆ ئیتر نـەرمی دەنـوێنی؟ ئەو دەڵێ: با ئەوەندە خوێن بڕژێ، تا خۆر لە شەوقدانەوەی خوێندا بەرگی خوێنین لەبەر بکا.

شایانی وتنە، فەرهەنگی فارسی (ئاینەی گەردان)ی بە خۆر لێك داوەتەوە. ئێمـەیش پێمـان وایـە، سالم (ئاینەی گەردوون)ی بەم مەعنایە بەکار هێناوە.

عاشقکوشی (نم): عاشق‌کوژی. دەڵێ (نم): دەبێ.

(٥) وا: وەها.

واتە: ئەگەر گیانم بۆ نرخی یەك ئیشارەت داوا بکەی، گیانەکەم حازربەدەستە، کـەس لـە کـاتی کڕیندا بۆ پارچەی وەك ئیشارەتی تۆ چەندوچۆن ناکا.

لە بەیعا (نم): لەم بەیعەدا. لەنگ دەبێ.

(٦) تەهی: خاڵی. طالیع: بەخت.

واتە: کێ بێ جگە لە خودا سامان بە سەرلێشێواوێ بدا کە دەسـتخـاڵی و هـەژار، هیممـەتی بەرز بێ و ئەوەی کە دەیەوێ، شتێکی گەورە بێ، سەرباری ئەوەیش بەدبەخت و سیاچارە بێ؟

(٧) مەنع: مەبەستی لۆمە و سەرزەنشتە. کەی: بکەی.

واتە: ئەی ئامۆژگاریکەر! ئەگەر جارێ ڕەمزی پەنامەکیی دەروون بە گوێتـدا بـدەم و لـە حـاڵـم حاڵی ببی، لەوانەیە واز لە لۆمە و سەرزەنشتی سالمی بێچارە بهێنی!

شایانی وتنە، دەبوو لەباتیی (بڵێم) بدەم بووایە، چونکە لە کوردیدا دەوترێ بە گوێتدا بدەم، نەك بڵێم بە گوێتدا! هەروەها دەوترێ بە گوێتدا بچپێنم.

بە گوێتا (ن): بە گوێت.

-١٩- (*)

**عەهدی ئەم چاوانە، مەردوم توهمەتی بێجا دەکەن**
**فیتنەوو شۆڕش کە ڕوو دا، حەملی سەر دونیا دەکەن (١)**
**بۆ نیشانەی قەلبی دڵ، ڕەسمی قەجەریان گرتووە**
**چاوەکانت، وا بە قیرقاچی نیگەه داوا ئەکەن (٢)**
**دڵبەران عەینی مەحەببەتیان جەفایە بۆ ڕەفیق**
**زەهری پەنهانی لە خوانی ئامێتەی حەڵوا دەکەن (٣)**
**شێفتەی ڕووتە مەگەر زوڵفی سیاشت، چین بە چین**
**وەك سەری عاشق، لە هەر سوو، سەرقەدەم بۆ پا دەکەن (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (ئم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) واتە: خەڵك لە سەردەمی دەسەڵاتی ئەم چاوە جوانانەی یاردا، بێجێ و بێمەعنا دنیا و چەرخی ڕۆژگار تاوانبار دەکەن و دەڵێن فیتنە و ئاژاوە لەوانەوەیە. نەخێر، هەرچی ڕوو دەدا لە چاوی جوانی یارەوەیە.

(٢) قەلب: ناوەڕاست. قیرقاچ: هەڵگێڕوداگێڕ و سەروخوار کردن. داوا: مەبەستی جەنگە، دەبێ لە بنەڕەتدا (دەعوا) بووبێ و گۆڕرابێ.

واتە: چاوەکانت بۆ پێکانی ناوەڕاستی دڵ ڕێوشوێن و شێوە و خووی پادشاکانی قاجاریان گرتووەتە بەر کە بە سەروخوارکردنی ڕوانین شەڕ دەکەن، یانێ دەیدەنە بەر دەستڕێژی نیگا. ڕەنگە ئەم چاو و قاجارە ئاماژە بن بۆ محەمەدشای قاجار (١٨٣٤-١٨٤٦) کە -دەڵێن- جارێکیان چاوی چل هەزار کەسی لە شاری (کرمان) دەرهێناوە.

(ئەکەن)، دەبێ (دەکەن) بووبێ و گۆڕرابێ.

(٣) عەین: چاو. حەڵوا: مەبەستی قسەی خۆشی یارە.

واتە: دڵبەران چاوی خۆشەویستییان ستەمە بۆ دۆستەکانیان، ژەهری نیگای چاو بە پەنهانی تێکەڵ دەکەن بە خوانی حەڵواییی قسەی شیرینیان و دۆستەکانیانی پێ دەرمانخوارد دەکەن.

(٤) شێفتە: شێواو و تێکچوو. سیاشت: سیاهێشت، ڕەشت. هەر سوو: هەر لا. سەرقەدەم: بەردەوام.

**بۆ جەفای "سالم" عەجایەب موشتەرین یار و فەلەك**
**ڕاهی شادی سەدد و دەروازەیی ئەسەف وا دەکەن (٥)**

واتە: ئەڵبەت زوڵفی ڕەشیشت چینچین وەك سەری عاشق لە هەموو لاوە سەر پێشکەشی پێت دەکەن و سەر دەکەنە پێشوازی پێت.

(٥) وا دەکەن: دەکەنەوە.

واتە: یار و چەرخی گەردوون عەجایەب کڕیارێکن بۆ ستەم و ئازاری سالم، ڕێگای خۆشی و شادمانی دادەخەن و دەرگای خەم و پەژارە دەکەنەوە.

(موشتەری)، دەبێ (موشتەرین) بێ، چونکە یار و فەلەك دووانن. ڕەنگیشە (دەروازەیی ئەسەف) شتێکی وەك (دەروازەی تەئەسسوف) یا (دەروازەی ئەسەف هەر) بووبێ.

## -٢٠- (*)

**لابە سا پەرچەم لەسەر نووری جەبین**
**پایی کافر با نەگاتە فەرشی دین (١)**
**دڵ کە کەوتە زوڵفی تۆ، کەی دێتەوە؟!**
**بێسەروشوێنن ئەوانەی چوونە چین! (٢)**
**جازیبەی لێوت دڵی تونگ گرتۆم**
**دامی باڵی نەحلە، شیرەی ئەنگەبین (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ق، ن، نم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشیی مەقسوور.

(١) جەبین: ناوچاوان.

واتە: سا پەرچەمی ڕەشت لەسەر ڕووناکیی ناوچاوانت لابە، با پێی کافر نەگاتە فەرشی ئایین. دیارە مەبەست لە فەرشی دین ڕوخساری یارە و لە کافر پەرچەمی ڕەشیەتی.

(٢) واتە: کە دڵ کەوتە ناو داوی زوڵفی تۆ، کەی دەتوانێ ڕزگار بێ و بێتەوە؟! بێگومان ئەوانەی کە چوونەتە وڵاتی چین، گەڕانەوەیان بۆ نییە. چین، لێرە چین‌چینی زوڵفی یار و وڵاتی (چین)یش دەگرێتەوە، بەڵام مەبەست یەکەمیانە و وای داناوە کە چین‌چینی زوڵفی یاریش وەك وڵاتی چین دوورەدەستە و کەس بە سەلامەتی لێی ناگەڕێتەوە.

چوونە (ق): دەچنە.

(٣) جازیبە: هێزی ڕاکێشان. تونگ: توند، بە شێوەی ناوچەی سلێمانی. دام: داو. نەحل: هەنگ. ئەنگەبین: هەنگوین.

واتە: هێزی ڕاکێشانی لێوت موگناتیس‌ئاسا دڵی توند گرتووم. بەڵێ، شیرەی هەنگوین دەبێتە داوی باڵی هەنگی بێچارە. یانێ: دڵی من وەك هەنگە و لێوی شیرینی یار شیرەی هەنگوینە. چەند جوانە، هەنگ بە گوڵەوە دەنووسێ و شیرەی لێ وەردەگرێ و دواییش هەنگوینەکە دەیگرێ و بەری نادا.

جێی وتنە، ئەمە یەکەم شوێنە کە سالم (تونگ)ی لەباتیی (توند) تێدا بەکارهێنابێ، دیارە (تونگ) شێوەزاری ئەمڕۆی سلێمانییە و بە ناوچەیی دەدرێتە قەڵەم. نەیشتوانرا بڵێین (تەنگ)ە، واتە دڵی تەنگ کردووم، چونکە (جاذیبە)ی نیوەی یەکەمی بەیتەکە و تەواوی نیوەی دووەمی لێ نەگەڕان.

(جازیبە) بەو شێوەنووسینە هەڵەیە، (جاذیبە) ڕاستە. تونگ گرتووم (ق): تونگ کردووم. (نم):

**چونکە ڕەنجم حاصڵی هەر گریە بوو**
**دەفعەیێ نەمدی بە خوشکی، ئاستین! (٤)**
**ئەشکی خوێن تەغییری دا بەرگی عەزا**
**نایێڵێ ڕەنگی بەقەم، ئەسبابی شین! (٥)**
**تیری ئاهی من ئەگەر نەگرێ ڕەقیب**
**هیچە، گەر بڕواتە چەرخی هەفتەمین! (٦)**
**ئەی برادەر، تۆ و تەلەتتوفهایی صەدر**
**"سالم" و دەرگاهی «ربّ العالمین» (٧)**

تەنگ کردووم. نەحلە (نم): نەخلیە. هەڵەیە.

(٤) ئەم بەیتە لە (نم)دا نییە.

حاصڵ: بەرهەم. گریە: گریان. دەفعە: جار. خوشکی: وشکی. ئاستین: قۆڵی کراس.

واتە: بەری ڕەنج و کۆششم هەر گریان بوو. جارێ نەمدی قۆڵی کراسم وشك ببێتەوە، ئەوەندە فرمێسکم پێ سڕی.

(٥) تەغییری دا: گۆڕیی. بەقەم: ڕەنگی سوور. ئەسباب: کەرەستە. شین: کەوە، أزرق.

واتە: فرمێسکی خوێنین بەرگی پرسە و ماتەمینی گۆڕی، دیارە ڕەنگی سوور ڕەنگی بەرگی شین ناهێڵێ. بە کورتی، دەبێ بەرگی پرسە شینڕەنگ بێ، بەڵام فرمێسکی سوور دەیگۆڕێ و سووری دەکا.

بەرگی (ق): جامەی. نایێڵێ (نم): نایەڵێ.

(٦) واتە: تیری ئاه و هەناسەی من، ئەگەر بیشگاتە ئاسمانی حەوتەم، کە بەدکار نەگرێ و نەیخا، هیچوپووچە. من چی لە ئاسمانی حەوتەم بکەم؟

(٧) ئەم بەیتە لە (ق)دا دوایینبەیتە. (نم)یش لەم بەیتە بەدواوە چوار بەیتی پارچەی پاشەوەی (١٩)ی خستووەتە سەر ئەم پارچەشیعرە.

«تلتّف» کە شێوەنووسی (مان)ە و دەکاتە «تەلەتتوف»، لە عەرەبیدا «تلطّف»ە و یانێ لوتفنواندن. تەلەتتوفهایی تۆ: هەموو لوتفنواندنێکی تۆ. صەدر: سنگ.

واتە: ئیتر برادەر خۆت و هەموو لوتفنواندن و سنگفراوانییەکت، تا بە سنگێکی فراوان و کراوەوە سکاڵا و دەردەدڵم وەربگری. "سالم"یش پەنا دەباتە بەر دەرگای ڕەحمەت و یارمەتیی خودای گەورە. کێ دەڵێ سالم مەبەستی لە «برادەر» ڕەقیب نییە، کە لە دۆخێکی بێدەسەڵاتیدا بە برادەر ناوی هێنابێ؟!

## -٢١- (*)

قادری بۆ نەظمی بەینی کوفر و دین
پەرچەمت وا بگرە، دا نەگرێ جەبین (١)
تا دەنووسێ (سین)ی بۆسەی تۆ، قەڵەم
دێتە سەر کاغەذ مەگەس بۆ ئەنگەبین (٢)
جانشینی "جەم" بە حیشمەت من دەبم
گەر وەکوو لەعلی لەبت بمبێ نگین (٣)
بەرمەدە دەستم لە گۆشەی دامەنت
با لە دونیا هەڵتەکێنم ئاستین (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، غ، ق، ن، نم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەقسوور.

(١) دا: تا. جەبین: ناوچاوان.

واتە: تۆ دەتوانی کوفر و ئایین کۆبکەیتەوە، ئەگەرچی دژی یەکن. پەرچەمت بۆ ئەم مەبەستە وەها ڕابگرە کە پێشانیت دانەپۆشێ. دیارە پێشانی سپییە و ئایینەکەیە، پەرچەمیش ڕەشە و کوفرەکەیە.

جەبین (حا): زەمین.

(٢) مەگەس: مێش. ئەنگەبین: هەنگوین.

واتە: هەر کە قەڵەم (س)ی (بۆس)ی تۆی نووسی، مێش و مەگەز دێنە سەر کاغەزەکە بۆ هەنگوین! تەنانەت پیتی (س) کە دواینپیتی وشەی (بۆس)ە، دەبێتە هەنگوین!

تۆ (حا): بۆ. هەڵەیە.

(٣) ئەم بەیتە لە (ق)دا نییە.

جەم: جەمشید. نگین: بەخت.

واتە: لە دەسەڵات و بەختەوەریدا جێنشینی جەمشید شا دەبم، ئەگەر نگینێکی وەك لێوی لەعلئاسام بێ. جا یا مەبەستی ئەوەیە لەعلەکە بکاتە نقێمی ئەنگوستیلە و جێگەی ئەنگوستیلەکەی حەزرەتی سولەیمان (د.خ) بگرێتەوە، یان مەبەستی لە نگین بەختە، واتە: ئەگەر وەك لێوی ئاڵت بەختەوەر بم .. تاد.

(٤) ئەم بەیتە لە (ق)دا سێیەمە.

**پێچ و خەم بەس وا لە مووتا تا برۆ**
**کەی دەگاتە چینی زوڵفت، حیصنی چین؟ (٥)**
**غەیری "قاروون"، کێ دەزانێ جێی ڕەقیب**
**"مووسە"ئاسا گەر موطیعم بێ زەمین (٦)**
**خوونفشانە، گاهی لوطفیشت نیگاه**
**فەرقی کوا بۆ دڵ زەمانەی صوڵح و کین؟ (٧)**
**فەرضی عەینە حەمدی ئەو، تا بێ نەفەس**
**خالیقێ ئیجادی نووری کرد لە طین (٨)**

ئاستین: قۆڵی کراس.

واتە: دەستم لە گۆشەی داوێنت مەکەرەوە و بەزۆر بەری مەدە، با دەست لە دنیا بشۆم و وازی لێ بهێنم.

(٥) حیصنی چین: شوورای کۆنی دەوراندەوری چین.

واتە: ئەوەندە پێچولوول و چەماوەی کەوانی وا لە زولفتدا تا دەگاتە برۆ، کەی پایەی شووورای بەناووبانگی چین دەگاتە پایەی چینچینی زولفت.

تا برۆ (ق): تا لە ڕوو.

(٦) ئەم بەیتە لە (حا، نم)دا نییە و لە (غ)یشدا دووەمە.

واتە: ئەگەر زەوی، وەك —سەبارەت بە قاروون— گوێی لە حەزرەتی مووسا گرت و نوقمی کرد، بە گوێی منیش بکا، بەدکار نوقم دەکا و قاروون نەبێ کەس نازانێ جێی لە کوێیە؟

قاروون (ق): فارووق. "مووسا"، لەبەر کێشڕاگرتن بە "مووسە" دەخوێنرێتەوە.

(٧) ئەم بەیتە لە (ق)دا نییە.

خوونفشان: خوێنڕێژ. گاە: کات. صولح: ئاشتی.

واتە: تەماشاکردنت لە کاتی لوتف و نەوازشیشدا هەر خوێنڕێژە، کەواتە بۆ دڵ فەرقی نییە ئاشتی بێ یا جەنگ!

گاهی (غ): وەختی. بۆ دڵ (نم): بۆ من.

(٨) فەرضی عەین: ئەوەیە لەسەر هەموو موسوڵمانێ فەرز بێ و بە تاقە کەسێك لە کۆڵی خەڵکیتر نەکەوێ، وەك نوێژە فەرزەکان. ئیجاد: هێنانەبوون. طین: قوڕ.

**خانە وەك زیندانە بۆ "سالم" لە غەم**
**غەیری سایەت، گەر ببینێ هەمنشین (٩)**

واتە: ئەو کردگارەی کە نووری لە قوڕ دروست کرد، لەسەر هەموو کەسێك فەرزە، تا هەناسەی تێدا بێ، ستایشی بکا.

ئیجادی نووری کرد (ق): ئیجادی کرد نووری.

(٩) واتە: ئەگەر سالم هاونشینێ لەگەڵ خۆی ببینێ، جگە لە سێبەری تۆ، لە خەم و خەفەتدا ماڵیشی لێ دەبێتە زیندان.

## -٢٢- (*)

**ڕووه یا گوڵ ئەمە، یا بەرگی نەسرین؟**
**«لب است این، یا شکر، یا جان شیرین» (١)**
**هەموو شەو تا سەحەر بۆ دڵ، خەیاڵت**
**«حکایت میکند بتخانهٔ چین» (٢)**
**چ نەققاشێ شەوی لێك دا لەگەڵ ڕۆژ؟!**
**«تعالی خالِقُ الإنسان مِن طین» (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، هـ، غ، ج، نم، گم)دا هەیە. لە (مان، ن)دا، یەکێکە لە پارچەشیعرە مولەممەعەکان، فارسییەکەیشی هیی "سەعدی شیرازی"یە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی مەقسوور.

(١) سالم باسی جوانیی ڕوومەتی یاری کردووە و وتوویە: لە جوانیی لێو و ڕوخسارت سەرم لێ تێكچووە، ئایا ڕوومەتت ڕووی عادەتییە، یا گوڵە، یان پەڕەی نەسرین؟ هەروەها لێوت لێوی عادەتییە، یا شەکرە، یان گیانی شیرین؟

جان (نم): خال.

(٢) ئەم بەیتە لە (حا)دا سێیەمە.

واتە: هەموو شەوێك تا بەرەبەیان هاوڕازی خەیاڵی تۆ و وێنەی تۆم، تا ڕۆژ دەبێتەوە حیکایەتی بتخانەی چین و شێوە جوانەکانی چینم بۆ دەگێڕێتەوە. پوختەی مەبەست ئەوەیە کە وێنەی یار وەك وێنەکانی چین وایە.

بۆ دڵ خەیاڵت (گم): دڵ بۆ خەیاڵت. میکند (گم): میکنند.

(٣) ئەم بەیتە لە (حا)دا چوارەمە، لە (هـ)یشدا نییە.

نەققاش: نیگارکێش. تعالی: پایەبەرزە.

واتە: چ وێنەگرێکی پەنجەڕەنگین شەو و ڕۆژی پێکەوە کۆکردووەتەوە (زوڵف و ڕوخسار)؟ ئەم وێنەگرە هەر دەبێ خودای گەورە بێ، پایەبەرزە ئەو کردگارەی کە بنیادەمی لە قوڕ دروست کردووە.

شەوی لێك دا لەگەڵ ڕۆژ (گم): ئەتۆی لێك دا لەگەڵ ڕوو. شایانی باسە، نیوەی دووەمی ئەم بەیتە لە پارچەشیعری (٢٧)ی پیتی (ن)یشدا هاتووە کە سەرەتاکەی «ئەوەند باری...»یە.

**له لای تۆ، غەیری خۆم، گەر کەس ببینم**
**«جهانم تیره گردد بر جهان‌بین» (٤)**
**خەوە دەفعی صوداعی من، وەلیٚ ئاه!**
**«سری بی‌دوست کَیْ باشد به بالین؟» (٥)**
**له دڵتا نەنگە من نەخچیری تۆ بم!**
**«نمی‌آید مَلَخ در چشم شاهین!» (٦)**
**گەلیٚ صاحیێبستەم هەن، نەك وەکوو تۆ**
**«جفا بر عاشقان آید، نه چندین!» (٧)**
**له خاطرما نییە، غەیرەز وەفا و صیدق**
**«ترا در دل اگر مهراست، اگر کین» (٨)**

(٤) تیره: تاریك. جهان‌بین: چاو.

واتە: ئەگەر لای تۆ، جگە لە خۆم، کەسی‌تر ببینم، دنیا لە بەرچاوم تاریك دەبیٚ.

لە لای تۆ غەیری خۆم (گم): لە لای خۆم غەیری تۆ. بەم جۆرە نیوەی دووەم دەبیٚتە ڕستەی دوعا و نزا. واتە: ئەگەر لای خۆم جگە لە تۆ کەس بە چاو ببینم، خودایە چاوم کوێر بیٚ. ببینم (گم): بووینم.

(گردد) لای "سەعدی" (باشد)ە.

(٥) صوداع: سەرئێشە. بالین: سەرین.

واتە: خەو سەرئێشەی من لادەبا، بەڵام سەری بیٚیار کەی دەچیٚتە سەر سەرین؟

(سری بی‌دوست کی) لای "سەعدی" (سر بی‌دوست چون)ە.

(٦) نمی‌آید: نانوێنیٚ. ملخ: کولـلە.

واتە: پیٚت سووکیە من نێچیری تۆ بم. بەڵیٚ، کولـلە لە بەرچاوی بازدا هیچ نانوێنیٚ!

لە دڵتا (حا): لە دونیا. نەنگە (گم): عەیبە.

(٧) ئەم بەیتە لە (حا)دا دووەمە و لە (گم)یشدا نییە.

واتە: زۆر کەسی ستەمکار لە دنیادا هەن، بەڵام نەك وەك تۆ. عاشقان تووشی ئازار دەبن، بەڵام نەك بەم ئەندازەیە.

هەن، نەك وەکوو تۆ (ھ): زۆرن، نەوەك تۆ.

(٨) خاطر: دڵ. غەیرەز: جگە لە. مهر: خۆشویستن. کین: ڕق.

**به قەصدی قەتلی من تیغت مەکێشە**

**((مرا خود میکُشد دستِ نگارین)) (٩)**

**لە جورمی عیشقی تۆ، گەر بمکوژن زار**

**((ز دنیا رفتنی باشد به تمکین)) (١٠)**

**بە مەرگی تۆ لە عیشقی گۆشەوارەت**

**((ز چشمانم بیفتاد است پروین)) (١١)**

**لە دینی "سالم"ا میحرابە ئەبرۆت**

**((مباد آن روز کُو برگردد از دین)) (١٢)**

واتە: تۆ ئەگەر منت خۆش بوێ، یا ڕقت لێم بێ، کەیفی خۆتە. بەڵام دڵی من جگە لە ئەمەك و ڕاستی بۆ تۆ، هیچی‌تری تێدا نییە.

مهراست، اگر کین (گم): ڕەحمەت وەگەر کین. (در دل اگر مهراست، اگر) لای "سەعدی" (گر خاطر مهراست، وگر)ە.

(٩) نگارین: نەخشێنراو.

واتە: بە نیازی کوشتنی من تیغت ڕامەکێشە، کوشتنی من تیغی ناوێ. من بە دەستی نەخشێنراوی خەناوی و خوێناویی تۆ کوژراوم.

(١٠) تمکین: مەبەستی ڕێزە.

واتە: ئەگەر لە تاوانی عیشقی تۆدا بە زەلیلی بمکوژن، لە دنیا دەرچوونەکەم بە ڕێز و قەدرەوە دەبێ.

ز دنیا (نم): دو دنیا. (گەر) لە (ج)دا کەوتووە.

(١١) ئەم بەیتە لە (مان، حا، ن)دا نییە.

پەروین: کۆمەڵە ئەستێرەی پێروو (ثُوْر).

واتە: بە مەرگی تۆ قەسەم، لە عیشقی گوارەکانت، کۆمەڵە فرمێسکی وەك کۆمەڵە ئەستێرەی پەروین لە چاوانم دەرژێتە خوار، یان کۆمەڵە ئەستێرەکانم لە بەرچاو کەوتووە و هیچ نانوێنن.

(١٢) مباد: نەبێ.

واتە: برۆت لە ئایینی "سالم"دا میحرابە و دەبێ ڕووی تێبکرێ. خودایە ئەو ڕۆژە نەیێ کە سالم لە ئایین وەرگەڕێ.

لە دینی (ه، گم): لە دونیا. ئەبرۆت (ه): ئەبرۆی.

## -٢٣- (*)

**به ڕووخ ڕەنگین و دڵ سەنگین، میان لاغەر، کەمەر زەڕڕین**
**نیگەهـ شاهین و موو موشکین، زەنەخ سیمین و لەب شیرین (١)**
**لەبت شەککەر، خەطت عەنبەر، موژەت خەنجەر، قەدت عەرعەر**
**لە عیشقت دڵ وەکوو بولبول، لە ڕووتا گوڵ وەکوو گوڵچین! (٢)**
**سەهیقامەت، قەویشەوکەت، قەمەرطەلعەت، مەلەكخەصڵەت**
**کەمانئەبروو، نیگەهئاهوو، فەڕەنگیخووی مووموشکین (٣)**
**به ڕوخ وەك شەم، بە ئەبرۆ خەم، سیەهـ پەرچەم، لە من بێغەم**
**گوارەی توو کە هات و چوو، «موقارین بوو مەهـ و پەروین» (؟) (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (ف، غ، ج، کم، گم)دا هەیە.
کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی موسەببەغ.
(١) میان: ناوقەد. لاغیر: لەڕ و لاواز. شاهین: باز. زەنەخ: چەناگە. سیمین: زیوین.
واتە: تۆ بە ڕوخسار ڕەنگین، دڵت گەورە و سەنگین، ناوقەد باریك و کەمەر زێڕینی. نیگات لـە هیی شاهێن دەچێ، مووی زوڵفت بۆنی میسکی پێوەیە، چەناگەت زیوین و لێویشت شیرینە.
«و دڵ سەنگین» لە (کم، گم)دا کەوتووە.
(٢) واتە: لێو شیرین، موو بۆنخۆش، برژانگ خەنجەر، بەژن ڕێك و بەرز، دڵ وەك بولبـول بـۆت دەخوێنێ و بەرامبەر بە ڕووی تۆ و لە ئاستیدا گوڵ بە گوڵی نەماوەتەوە و بووەتە گوڵچنەوە.
«گوڵ» لە (ف)دا کەوتووە.
(٣) ئەم بەیتە لە (ف، غ، ج)دا چوارەمە.
سەهی: ڕێك. فەڕەنگیخوو: وەك فەڕەنگی ستەمکار.
واتە: بـاڵای ڕێـك و سـەنگینە و شانوشـکۆی بـەرزە. وەك مـانگ دەردەکـەوێ و خەسـڵەتی فریشتەی هەیە. برۆی کەوانییە و نیگای لە هیی ئاسك دەچێ. خوویەکی فەڕەنگییانەی هەیە و مووی زوڵفی میسکدارە.
فەڕەنگیخوویی (گم): فەڕەنگیخوو و.
(٤) ئەم بەیتە لە (ف، غ، ج)دا سێیەمە.
شەم: شەمع، مۆمی داگیرساو.

**به چین زوڵفت ئیحاطەی دا، وەکوو سونبول، لە دەوری گوڵ**
**بە موو هەر سوو، لە ڕێگەی موو، بە ڕووی دڵما دەکەی پەرژین (٥)**
**چوار فەصڵی، لە هەر فەصڵا بە یەکدەم وا لە لای "سالم":**
**بەهار ئەشك و خەزان ڕەنگ و زمستان ئاه و دڵ هاوین! (٦)**

واتە: کە گوارەی تۆ کەوتە هاتوچۆ، مانگ و ئەستێرەی پەروین بەراورد کران.

بە ڕوخ (غ): بە ڕوخم. لەنگ دەبێ. موقارین بوو (کم، گم): متاون بو. دروست نەنووسراوەتەوە و هەڵەیە.

(٥) واتە: زوڵفی وەك سونبول بە چین دەوراندەوری ڕوخساری وەك گوڵی داوە و کەس لێی نزیك نابێتەوە. نەك تەنها ئەوە، بەڵکوو هەر بە چینی موو ڕێی مووی لە ڕووی دڵمدا پەرژین کردووە. یانێ: ناهێڵێ دڵ نزیکی زوڵفیش بێتەوە.

بە چین زوڵفت ئیحاطەی دا، وەکوو سونبول (غ، کم، گم): بە چینی زوڵف وەك سونبول ئیحاطەی دا. لە دەوری (ف، غ): لە دەورەی. بە موو (ف، غ، ج): لە موو. لە ڕێگەی موو (ف، ج): لە ڕێگەی ڕوو. دەکەی (کم): ئەکەی.

(٦) واتە: لە هەر وەرزێکدا بتەوێ، هەر چوار وەرزەکە لە یەك هەناسەدا لای سالم ئامادەیە: فرمێسکی هەمیشەیی نیشانەی بەهارە، ڕەنگی زەرد نیشانەی خەزانی پایزە، ئاهی سارد نیشانەی زستانە و دڵی گەرم نیشانەی هاوین!

چهار (کم، گم): چوار. فەصلا (کم، گم): فەصلێ. زمستان (گم): زستان.

## -٢٤- (*)

**شۆڕشی خستە جیهان، شوهرەتی ڕوویی نەمەکین**
**بێن، بە یادی لەبی ئەو بانەمەکە، لەب بمەکین (١)**
**لەم دەرە ئێمە بە صەد گۆنە جەفا صەعبە بڕۆین**
**دەستوپابەستەوو ئوفتادەیی حوکمی فەلەکین! (٢)**
**مەکە ئەی دڵ! بە ئەبەد قەصدی وەظیفەیی جاران**
**ئیسمەن ئێستاکە لە ڕووی دەفتەری جانانە حەکین! (٣)**
**پشتیوانم هەیە بۆ مەعرەکەوو جەنگی ڕەقیب**
**سەگی دەرگانەیی یار و منی غەمدیدە یەکین (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ق، نم، پ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەقسوور.

(١) نەمەکین: خوێدار، سوێر. بانەمەك: نمەکدار، بەوەفا. بمەکین: بمژین.

واتە: شۆرەتی ڕووی جوانی تۆ شۆڕشی خستە جیهان و عاشقانی ئاڵۆزاند. یاران، وەرن با بە یادی لێوی ئەو نمەکدارە جوانەوە لێوی خۆمان بمژین. سالم بە جۆرێ لە دەریای خۆشویستنی یاردا نوقم بووە، لێوی خۆی دەمژێ و وا دەزانێ لێوی یارە!

شوهرەتی ڕوویی (ق): شۆڕشی لەعلی.

(٢) گۆنە: جۆر. صەعب: قورس، گران. ئوفتادە: لەپێ کەوتوو.

واتە: ئێمە بە سەد سزا و ئازاریش لە دەرگانەی یار دوور ناکەوینەوە، فەلەك دەست و پێی بەستووینەتەوە و لە جموجووڵی خستووین، بەدەست خۆمان نییە.

(٣) قەصد: مەبەست. ئیسمەن: بە ناو. حەك: کوژاوە.

واتە: ئەی دڵ، هەرگیز بە تەمای بارودۆخی جاران نەبی، ئێمە ناومان لە دەفتەری یاراندا کوژاوەتەوە و بە کۆرکۆرەی ئاشدا چووە.

وەظیفەی (نم): وەضعیەی.

(٤) مەعرەکە: شەڕ.

واتە: سالم بۆ جەنگ لەگەڵ بەدکار بە تەنها نییە و پشتیوانەکەی سەگی بەردەرگای یارە، کە ئەویش وەك ئەم کڵۆڵ و بێبەشە.

**"سالم!" ئێمە لە یەما زەحمەتە سالم دەرچین**

**وا لە گێژاوی سروشکا بە شەنا وەك سەمەکین! (٥)**

(٥) یەم: دەریا. "سالم"ی دووەم: ساغ. سروشك: فرمێسك. شەنا: مەلە.

واتە: ئەی سالم! زەحمەتە بە سەلامەتی لەم دەریایە دەربچین، ئەوەتە لە گێژاوی فرمێسکدا وەك ماسی کەوتووینەتە مەلە، ئەلبەت ماسی ناتوانێ لە گێژاودا مەلە بکا.

سالم دەرچین (ق): دەرچین سالم.

## (*) -٢٥-

**من و بادی سەحەر، یاران! عەجایب بێقەرارێکین**
**بە سەرگەردانییا هەردوو، دەڵێی مەشغووڵی کارێکین (١)**
**لە سایەی دەوڵەتی حاجیب، مەکان و ئاشنام دەسکەوت**
**لە کۆی جانانەدا دایم لەگەڵ سەگ یاری غارێکین! (٢)**
**لە هەمددەردت مەکە وەحشەت، وەرە بولبول! ڕەفیقت هات**
**بناڵین با بە جووت، هەر یەك ڕەهەندەی گوڵعوزارێکین (٣)**
**صەدای گریانی خۆم و دەنگی ناڵەی دڵ لەدەس هیجران**
**وەها دێ موتتەصیل شەو، هەر دەڵێی زەنگی زەوارێکین (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ق، کم، پ، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) واتە: یاران، عاشق و بای بەیانیان هەردوو وەستانیان بۆ نییە و هەمیشە لە جموجووڵدان. ئەڵبەتە بای بەیانیانیش بە دوای زوڵفی یاردا وێڵە، بۆیە دەڵێی ئەویش وەك سالم سەرگەردانە و خەریکی کارێکە.

(٢) ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی لە (مان)دا نین، لە (گم)یشدا چوارەمە.

دەوڵەت: مەبەستی دەسەڵاتە. حاجیب: دەرگاوان، کینایەیە لە برۆ. مەکان: شوێن. کۆ: ئاستانە، بەردەرگا. جانانە: یار. غار: ئەشکەوت.

واتە: جێگە و هاوڕێم لە سایەی سەری دەرگاوانی یارەوە دەست کەوت، لەگەڵ سەگی بەردەرگا لە دەوروبەری مەنزڵی یاردا هاوڕێ و هاوشوێنین.

حاجیب (کم، گم): صاحێب.

(٣) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (مان، ق)دا نین.

مەکە وەحشەت: سڵ مەکەرەوە. ڕەهەندە: دوورخراوە. گوڵعوزار: ڕومەتگوڵ.

واتە: سڵ لە هاودەردی خۆت مەکەرەوە، بولبول وا هاودەمت هات. با پێکەوە بناڵێنین، لەبەرئەوەی هەر یەکەمان دوورخراوەی دەستی یارێکی ڕوومەتگوڵین.

(٤) ئەم بەیتە لە (مان)دا نییە.

موتتەصیل: بێپسانەوە، بەردەوام. زەوار: کاروان.

**تەنی زار و ڕوخی زەردم، لە حورمەتدا خەس و پووشن**
**لە مەددی مەوجی بەحری لوطفی یارا بەرکەنارێکین (٥)**
**لەگەڵ زاهید، بە تەقدیری فەلەك، هەرگیز جودا نابم!**
**لە قوربی غەیرە ڕەغبەتدا بە میثلی سیر و مارێکین (٦)**
**ستادەم خۆم و جان و دڵ بە "سالم" وەختێ ڕابووری**
**لە ڕێگەت نەقدەرکەف بۆ نیثارت ئینتیظارێکین (٧)**

واتە: شەو بە هۆی دوورییەوە بە بـەردەوامی دەنگی گریانی خۆم و ناڵەی هەمیشـەیی دڵم دێ، هەردووکمان دەڵێی دەنگی زەنگی کاروانێکین.

زەوارێکین (گم): زووارێکین.

(٥) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا نییە، لە (ق)دا سێیەمە.

زار: لاواز. خەس: گژوگیا و خاشاك. مەد: هەڵکشان.

واتە: لەشی لاواز و ڕوومەتی زەردم وەك پووش و خاشاك بێقـەدرن، بـە هێرشـی شـەپۆلی دەریـای لوتفی یار بەرکەنارین و خراوینەتە لاوە، یانێ لە لوتفی یارەوە دوورین و بێقەدرین.

لە حورمەتدا (ق): لە حەسرەت وەك.

(٦) قورب: نزیکی.

واتە: وەك چەرخ دیاریی کردووە، من هەرگیز لە زاهیدی تەرکی دنیاکردوو جیا نابمەوە. ئەگـەر نموونەی نزیك لە حەزلێنەکراوت پیشان بدەم، من و زاهید وەك سیر و مارین. پەندی پێشینان دەڵێ: مار حەزی لە سیر نەدەکرد، کەچی لە دەرگای کونەکەیدا سەوز دەبوو!

فەلەك (ق): خودا. نابم (کم): نابین. قوربی (کم، گم): قورب و.

(٧) ستادەم: ڕاوەستاوم. نەقد: دراو، کینایەیە لە دڵ. نیثار: دیاری، پێشکەش.

واتە: لە کاتێکـدا بـە لامانـدا ڕابـووری، خـۆم و گیـان و دڵ بـە سـاغ و سـەلیمی ڕاوەستاوین، پارەبەدەست بۆ پێشوازیت چاوەڕوانین. پارەی پێشوازیـەکە ساڵم و دڵ و گیانیەتی.

ڕابووری (ق): ڕابوردی. لە ڕێگەت (ق): کە ڕێگەم. هەڵەی نووسینە.

شایانی باسە، دوایی بەیتەکان لە (مان)دا هەموو (کن) بوون، وەك نوسخەکانیتر (کین)مـان نووسـی، چونکە (کن) تەنها بۆ بەیتی ((تەنی زار و..)) بەکەڵك دێ و بۆ ئەوانیتر ناشێ.

## -٢٦- (*)

**موسکیریی چاوی ڕەشی تۆی نییە، خەمری چلەمین**
**ڕایحەی گێسویی تۆی نییە بۆی نافەیی چین (١)**
**ڕۆژی ئەووەڵ کە دڵم بێخودی ڕووت بوو، زانیم**
**تووشی ئەم دەردە دەبم، بەم دڵە، ئاخر بە یەقین (٢)**
**ڕۆحبەدەربردنی صەیدی دڵی وەحشیم صەعبە**
**تیری ڕاگرتووە دیدەت لە کەمانا بە کەمین! (٣)**
**شەبەهی صەفوەتی سینەت نییە، بێن -فەرضەن- ئەگەر**
**صەدەف و لوئلوء و مەڕمەڕ بکەنە صافی عەجین! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ق)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەقسوور.

(١) موسکیری: سەرخۆشی. خەمری چلەمین: شەرابی چلڕۆژە. ڕائیحە: بۆنوبەرامە. بۆ: بۆن. نافە: ناوك. چین: وڵاتی چین.

واتە: شەرابی چلەمین ڕۆژیش وەك چاوی ڕەشی تۆ مرۆڤ سەرخۆش ناکا. ناوکی ئاسکی خەتای چینیش بۆنوبەرامەی ئەگریجەی تۆی نییە.

موسکیریی (ق): سوکریی. تۆیی نییە (ق): تۆی پێ نییە. چلەمین (ق): چلەبین. گێسووی تۆیی نییە (ق): گێسووی تۆی پێ نییە.

(٢) بێخود: بێهۆش. یەقین: بێچەندوچۆن.

واتە: هەر کە یەکەم ڕۆژ ڕووی تۆم دی و دڵم بۆی بێهۆش بوو، زانیم -بێچەندوچۆن- تووشی ئەم دەردی خۆشەویستییە دەبم.

(٣) بەدەربردن: تەحەمولکردن. صەید: نێچیر. کەمین: سوپەر، بۆسە.

واتە: دڵی کێویم کە نێچیری تۆیە، زۆر گرانە ڕزگار ببێ و گیان بە سەلامەتی دەربەرێ، چونکە دیدەت تیری برژانگی لە کەوانی ئەبرۆتدا ئامادە کردووە و لە بۆسەمدا دانیشتووە.

(٤) ئەم بەیتە لە (ق)دا پێنجەمە.

شەبەه: هاوشێوە. صەفوەت: پوختەیی و بێگەردی. فەرضەن: گریمان، وای دابنێین. عەجین: هەویر.

واتە: ئەگەر گریمان سەدەف و مرواری و مەڕمەڕ هەموو بکەنە هەویر، وەك سینەی تۆ ساف و

**ئەژدەها حەلقەیی وا داوە لە ڕووی گەنجی جەمال**
**مانیعە بۆ گوزەری دڵ لە یەسار و لە یەمین (٥)**
**ظەن مەبە بسرەوێ دڵ قەد بە چ دڵبەر بێ تۆ**
**بێ سەرت، بەو سەرە، سەر ناکەمە سەر ڕوویی سەرین (٦)**
**بە سەرت شۆڕشی عیشقت لە سەرم دەرناچێ**
**گەر بە قەصدی سەر و ماڵ بێنە سەرم، ڕوویی زەمین (٧)**
**خەبەری مردنی "سالم" بەنە لای یار و بڵێن:**
**شینی یەکجارییی تەعزییەشی بکرێ بە شین (٨)**

بێگەرد نابێ.

(٥) گەنج: گەنجینە. مانیع: ڕێگر. یەسار: چەپ. یەمین: ڕاست.

واتە: ئەژدەهای زوڵفت بە جۆرێ گەمارۆی گەنجینەی جوانیی تۆی داوە، زۆر گرانە دڵ لە چەپەوە یا لە ڕاستەوە بەرەو گەنجینەی ڕوخسارت تێپەڕێ.

(٦) ئەم بەیتە لە (ق)دا نییە.

ظەن مەبە: گومان مەکە. چ دڵبەر: هیچ دڵبەرێ.

واتە: گومان مەبە کە دڵ بە هیچ دڵبەرێکی جگە لە تۆ دابکەوێ و بسرەوێ. بە سەری تۆ قەسەم، بەبێ سەری تۆ سەر ناکەمە سەر سەرین.

(٧) واتە: ئەگەر هەموو ڕووی زەوی بە مەبەستی برینی سەر و بردنی ماڵ بێتە سەرم و هێرشم بۆ بهێنێ، بە سەرت قەسەم، شۆڕ و زەمزەمەی عیشقت لە سەرم دەرناچێ!

(٨) ئەم بەیتە لە (ق)دا نییە.

بەنە: ببەنە، بەرنە.

واتە: خەبەری مەرگی سالم بۆ یار بەرن و پێی بڵێن: شینی یەکجارەکییە، با سێ ڕۆژەی تەعزیەکەیشی بکرێتە شین و گریان. با گریە و زاری تەواو بێ.

شایانی باسە، لە واتای نیوەی دووەم زۆر ڕازی نین، سەرەڕای ئەوەی کە لەنگە و بۆ ڕاستکردنەوە دەتوانین بڵێین بەم جۆرە بووە: ((شینی یەکجارییە، با تەعزییەشی بکرێ بە شین)).

## -٢٧- (*)

ئەوەند باری لە چاوم ئەشکی خوێنین
لە لالە قرمزە (ڕەی) تا (وەرامین) (١)
لەناو فرمێسکی چاوما مونعەکیس بوون:
گـوارە و ڕوومەتت، وەك ماه و پەروین (٢)
خودا بۆ خۆی دەزانێ چیی دروست کرد:
میانت موو، وجوودت کێوی تەمکین (٣)
بەشەر بەم حوسنە مەخلووقی لە کوێ دی؟!
((تعالى خالق الانسانِ مِنْ طين)) (٤)
دڵم تەسلیمی چاوت کرد بە شێتی!
بەرم دا یەك کەبووتەر بۆ دو شاهین ! (٥)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ن، حا، ق، نم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەقسوور.

(١) لالە: مەبەستی گوڵی خۆڕسکی سوورە. وەرامین: ناوی شارێکە لە مولکی ڕەی.

واتە: ئەوەندە فرمێسکی خوێنین لە چاوم باری، لە ڕەیەوە تا وەرامین بە لالە سـوور بـوو، دیـارە چونکە بە فرمێسکی خوێنین ئاو دراوە.

(٢) مونعەکیس بوو: شەوقی دایەوە.

واتە: شەوقدانەوەی گوارە و ڕوومەتت لەناو فرمێسکی چاومدا وەك مانگ و کۆمەڵە ئەستێرەی پێروو (کۆ) دەرکەوت.

(٣) ئەم بەیتە لە (نم)دا نییە.

میان: ناوقەد. وجوود: لەش، بوون.

واتە: خودا هەر خۆی دەزانێ چیی دروست کردووە، ناوقەدت وەك موو باریکە و لەشـت وەك کێوی دامەزراوە.

(٤) واتە: مرۆڤ کەی بوونەوەرێکی بەم جوانییە دیوە. ئەو خودایە کە مرۆڤـی لـە قـوڕ دروسـت کردووە، چەند پایەبەرزە.

(٥) کەبووتەر: کۆتر. شاهین: باز.

**بلێم با حاڵی دڵ چۆنه لەدەست چاو:**
**موسوڵمانێکه، مەحبووسی دو بێدین! (٦)**
**حەلاوەت نایێڵێ شۆری له شەهدا**
**لەبی یارم نەمەك کردوویه شیرین!! (٧)**
**موحیطی باغی ڕووته، چینی زوڵفت**
**کەسێ نەیدیوه ماری ڕەش به پەرژین! (٨)**
**شەو و ڕۆژ ذیکری "سالم" ئیسمی تۆیه**
**به ((اَلْحمْد)) و به "طاها"وو به "یاسین" (٩)**

واته: شێت بووم که دڵم دایه دەست چاوت، یەك کۆتری بەستەزمانم بۆ دوو بازی چنگۆڵ تیژ بەردا. جوانیـەکی بەرز لەم بەیتەدا هەیه: کۆتر بێهێز و شاهێن گۆشتخۆره و کۆتر دەخـوا. کەچـی شـاعیر کۆترێکی له دوو شاهێن بەرداوه، ڕاویان دەنێ، تا بیانکاته نێچیر.

(٦) ئەم بەیته له (م)دا نییه.

واته: دڵم بەدەست چاوەوه، وەك موسوڵمانێك وایه دوو کافری بێدین بەندیان کردبێ.

با (ق): تا.

(٧) شۆری: سوێری. شەهد: هەنگوین. نەمەك: خوێ.

واته: ئەگەر سوێری بکەیته ناو هەنگوین، شـیرینییەکەی ناهێڵـێ، کەچـی لێـوی یـارم خـوێ شیرینی کردووه.

نایێڵێ (م): تا بڵێی. هەڵەیه.

(٨) موحیط: چواردەور.

واته: چینچینی زوڵفت دەوری باخی ڕوومەتی تۆی داوه، سەیره! کەس نەیدیوه ڕەشمار ببێته پەرژین.

(٩) واته: سوپاس بۆ خودا و سوێند به ناوەکانی تاها و یاسینیش، شەو و ڕۆژ نـاوی تـۆ بەسـەر دەمی سالمەوەیه.

## -٢٨- (*)

**قامەتت سەروی ڕەوانە، بە حوسەین**
**عاریضت باغی جینانە، بە حوسەین (١)**
**شەربەتم زەهرە لە دووریت، بە حەسەن**
**زیندەگیم دەردی گرانە، بە حوسەین (٢)**
**غەیری دووری، نییە سیل و یەرەقان**
**هەر فیراق قابیلی جانە، بە حوسەین (٣)**
**هێرشی لەشکری غەم نەوعی یەزید**
**وا لە دڵ زەخمی زەمانە، بە حوسەین (٤)**
**دڵ لەبەر تیری نیگاهیی غەمزەت**
**ڕووبەڕوو میثلی نیشانە، بە حوسەین (٥)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (م)دا هەیە. بەوەدا کە سوێندی بە ناوی "حوسەین" خواردووە، ڕەنگە ئەم شیعرەی بۆ کچێکی شیعەمەزەب وتبێ، ئاماژەی وایش لە شیعرەکەدا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشیی مەخبوونی مەقسوور.

(١) قامەت: باڵا. عاریض: ڕوومەت. جینان: بەهەشت.

واتە: سوێند بە حوسەین، بەژن و باڵات وەك سەروی ڕەوان وایە، ڕوومەتیشت وەك باخی بەهەشتە.

(٢) زیندەگی: ژیان.

واتە: سوێند بە ئیمامی حوسەین (خ.ڕ)، لە دووریی تۆدا شەربەتی شیرینم لە دەمدا وەك ژەهر تاڵە، ژیانیشم هەمووی دەرد و نەخۆشیی قورسە. کۆکردنەوەی (زەهر و حوسەین)یش هێمایە بۆ ئەوەی کە حەزرەتی حوسەین بە دەرمانخواردکردن مردووە.

(٣) سیل: دەردەباریکە. یەرەقان: زەردوویی.

واتە: سیل و زەردوویی کە جەستەی پێ باریك و ڕوخساری پێ زەرد هەڵدەگەڕێ، تەنها دووریی یارە، هەر ئەم دوورییەیش شایانی لەشە!

(٤) واتە: وەك چۆن یەزیدی کوڕی موعاویە بە ناهەق هێرشی هێنا، دڵیش برینی ڕۆژگاری تێ کەوتووە.

(٥) واتە: دڵ وەك نیشان ڕووبەڕوو خۆی خستووەتە بەر تیری نیگای چاوەکانت.

## "سالم"ی تیشنەیی هیجرت، بە عەلی
## پەیڕەوی ڕێگەی ڕەوانە، بە حوسەین (٦)

(٦) تیشنە: تینوو.

واتە: سالم کە لە دووریتدا تینووە، قەسەم بە حوسەین، بە دەشتی لمینی ڕەوانی بێئاودا دەڕوا. کۆکردنەوەی (تیشنە و حوسەین)یش هێمایە بۆ ئەوەی کە حەزرەتی حوسەین، دوای ئاولێبڕین و تینوێتیی، شەهید کراوە.

## (*) -٢٩-

**نیگەهـ ناکەی بە لای ئوفتادەگانا، قەد لەبەر تەمکین**
**دڵت کردم بە خوێن، سا بەسیەتی، ئەی کافری بێ‌دین! (١)**
**بە دین صەنعانم و غەم کۆهکەن، مەنزڵ لە لای مەجنوون!**
**بە خوو تۆ دوختی تەرسایی، بە موو لەیلا، بە ڕوو شیرین! (٢)**

(*) ئەم چوارینە لە (مان، غ، ق، ڕ)دا هەیە و ناسناوی سالمی تێدا نییە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی موسەببەغ.

(١) ئوفتادەگان: لەپێ‌کەوتووان، مەبەستی عاشقانە. تەمکین: قورسی و سەرکەشییە.

واتە: لەبەر قورسی و خۆبەگەورەزانین هەرگیز لایەك بە لای داماواندا ناکەی. دڵت کردم بە خوێن، ئەی کچی کافری بێ‌دین.

قەد (ق): قەت. (سا بەسیەتی) لە (مان)دا (با بەسیەتی)یە و نوختەی (با)یەکە کەوتووە. (ق): ها بەسیەتی.

(٢) دوخت: کچ.

واتە: بە ئایین و وازلەدنیاهێنان شێخی صەنعانم، بە خەم و پەژارە فەرهادی کێوهەڵکەنم، بە جێگە و ڕێگە مەجنوونی دەشتگەڕم. تۆیش بە ڕەوشت کچە گاوری، بە مووڕەشی لەیلای یاری مەجنوونی، بە ڕوخسار شیرینی ئەرمەنیت. من نیشانەی سێ دڵدار و تۆیش نیشانەی سێ دڵبەرت هەڵگرتووە.

## پیتی (و)

### -١- (*)

تابی کوا ئایینه، ڕووی تۆ بێته ناو
گەر لە سەنگ بێ، یەك نیگەهـ دەیکەی بە ئاو (١)
بیمی زوڵفت مورغی دڵ دێنێته لەرز
گەر بە سینەمدا بکێشم، نەقشی داو (٢)
گاهێ ڕووتی، موشتەریی ڕووتم بە جان
خۆشە بۆ ڕووتیی گەدا، ڕۆژی هەتاو (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، ف، ج، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەقسوور.

(١) تاب: توانایی، تین‌وتاو.

واتە: ئاوێنە، تین‌وتاوی ئەوەی لە کوێ هەیە شەوقدانەوەی ڕووی تۆی بچێتە ناو. ئەگەر ئاوێنە بەردیش بێ، نیگایەکت دەیتوێنێتەوە و دەیکاتە ئاو.

تابی (گم): ئابی. ئاینە (ق): ئاوێنە. ڕووی تۆ (کم، گم): ڕووی تۆی. سوارترە. (ق): ڕووی بێ. یانێ ڕووی ئەوەی هەبێ بێتە مەیدان. جوانە. یەك نیگەهـ دەیکەی بە (ف، ج، کم، گم): نەقشی تۆ دەیکا بە. (ق): یەك نیگەهـ دەیکاتە.

(٢) بیم: ترس.

واتە: ئەگەر وێنەی داو لەسەر سنگم بکێشم، دڵم پێی وایە زوڵفی تۆیە و لە ترسدا دەکەوێتە لەرزین.

زوڵفت (ڕ): زوڵف. لەرز (ق): جۆش. بە سینەمدا (حا): لە سینەمدا. (عا): سی‌مەند. هەڵەیە.

(٣) ئەم بەیتە لە (ق)دا نییە.

گاهێ: کاتێ. جان: گیان.

واتە: کاتێ ڕووت‌وقووتم، بە گیان کڕیاری ڕوخساری تۆم، گیانم دەکەم بە نرخی. ڕۆژێ هەتاو بێ، بۆ مرۆی ڕووت و هەژار خۆشە. مەبەست لە هەتاوەکە ڕوخساری یارە.

بە جان (ج): بە چاو. گەدا (ج): کەوا. هەڵەیە.

**قەت بە کەس ناچێتە سەر دیواری عیشق**

**ئەم بینایە تا حەشر نابێ تەواو (٤)**

**کەس نەکا وەصفی خەدەنگی پووری زاڵ**

**بەحثی خوونڕێزیی موژەت گەر بێتە ناو! (٥)**

**کێ دەڵێ: ئاهوویی صەیدئەفگەن نییە؟**

**وا شکاری دڵ دەکا دڵبەر بە چاو! (٦)**

**حاصڵی عیشقم کراسی میحنەتە**

**موردە نابا ماڵی دونیا، غەیری چاو! (٧)**

**بۆ دڵی "سالم" موژەت وەختی نەظەر**

**دەم بە دەم دێ، وەك خەدەنگی تازەساو (٨)**

(٤) واتە: هیچ کەس بینای دیواری عیشق تەواو ناکا. ئەم بینایە تا ڕۆژی حەشر تەواو ناکرێ، مەگەر لەو ڕۆژەدا حەقی عاشق لە یارەکەی بسێنرێ.

قەت (حا، عا): قەد.

(٥) خەدەنگ: تیر. پووری زاڵ: کوڕی زاڵ کە ڕۆستەمە.

واتە: کە باسی خوێنڕێژی برژانگی تۆ بکرێ، با کەس ناوی تیری ڕۆستەمی زاڵ نەبا، ئەم لە کوێ و ئەو لە کوێ؟!

کەس (کم): کەسی. لەنگ دەبێ. وەصفی (ق): بەحثی. خوونڕێژی (ج، ق، کم، گم): خوێنڕێژی. موژەت (ق): موژەی. (زاڵ) لە (مان، ن، حا)دا بە (ذاڵ) نووسراوە، کە هەڵەیە.

(٦) واتە: کێ دەتوانێ بڵێ: ئاسك نێچیری خۆی بە عەرزدا نادا، ئەی ئەوە نییە یاری ئاسك بە چاو ڕاوی عاشق دەکا؟!

دەڵێ (کم): ئەڵێ.

(٧) واتە: بەرهەمی خۆشەویستیم کراسی مەینەتە. مرۆ کە دەمرێ، چی لە ماڵی دنیا لەگەڵ خۆی دەبا، جگە لە دوو گەز جاو یا خام!

(نابا) لە (عا)دا کەوتووە.

(٨) تازەساو: تازە لەهەساندراو، تازە تیژکراو.

واتە: برژانگت لە کاتی ڕوانیندا هەمیشە وەك سەری تیری تازە تیژکراو دەمپێکێ.

وەختی (ق): وەقتی. نەظەر (ف، ج، ق، ڕ، گم): نیگەه.

## -٢- (*)

دەزانی ئاینەی دڵ کەی لە میعراجی جەلادا بوو؟
لە عەکسی ڕوویی تۆ وەختێ لە ئاغۆشی لیقادا بوو (١)
زەمانێ ڕەوغەنی وەصڵت چراغی عومری ڕۆشن کرد
بە سروەی بادی هیجرانت، لە حالاٚتی فەنادا بوو (٢)
بە دەمتا ئیسمی من هات و دەبێ سککەی ئەبەد لێدەم
دەمێنێ تا حەشر، ناوم لەناو ئابی بەقادا بوو (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، کم، نم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی لە (نم)دا نین، بەلاٚم بە هەڵە دووەم بەیتی پارچەشیعری (٨) هەشتەمی ئەم پیتەی لەم پارچەیەدا هێناوەتەوە.

میعراج: بەرزبوونەوە. جەلا: ڕووناکی. ئاغۆش: باوەش. لیقا = لیقاء: بەیەکگەیشتن.

سالم دڵی خۆی بە ئاوێنەیەك داناوە، شەوقدانەوەی ڕوومەتی یاری تێدا دەربکەوێ. جا لەم ڕووەوە وتوویە: دەزانی کەی ئاوێنەی دڵ دەگاتە بەرزترین پایەی ڕووناکی؟ کاتێ بەهۆی شەوقدانەوەی ڕووی تۆوە لە باوەشی بەیەکگەیشتندا بێ. وای داناوە کە تەنها بوونی وێنەی ڕوخساری یار لە ئاوێنەی دڵدا بەیەکگەیشتنە. جا ئەگەر وابێ، دڵ هەمیشە لەو پایە بەرزەدا دەمێنێتەوە، چونکە وێنەی یار هەمیشە لە دڵی عاشقدایە.

لیقادا (گم): لەقا.

(٢) واتە: کە سروەی بای دووریت نەما، ئەوکاتە ڕۆنی بەتۆگەیشتن چرای عومری ڕۆشن کردمەوە. بەڵێ، با ناهێڵێ چرا بگرێ، بەتایبەتی بای دووری و چرای دڵی عاشق. بە دوور نازانرێ «حالاٚتی فەنا» ئاماژە بێ بۆ حاڵەتی فەنای صۆفییانە، ئەگەرچی لێرە بە هیچ جۆرێ ناگونجێ!

زەمانێ (گم): زمانی.

(٣) واتە: تازە ناوی من بە دەمتدا هات. دەبێ سککەیەك بۆ خۆم لێدەم، کە تاهەتایە بمێنێ، چونکە دەمت سەرچاوەی ئاوی ژیان بێ، تا ڕۆژی حەشر ناوم دەمێنێ و نافەوتێ.

بە دەمتا (گم): بە دەمتان. ئیسمی من (کم، گم): ناوی من. ئابی (کم، گم): ئاوی. حەشر (کم، گم): ئەبەد.

**که ناوی موددەعیت هێنا بە لەبدا، من لە خۆم بوردم**
**درێغا، شەربەتی مەرگم لەناو ئەصڵی دەوادا بوو! (٤)**
**لەناو زوڵفا بە زاری هاتە گوێم ناڵینی دڵ ئەمشەو**
**گەزیم ئەنگوشتی حیرەت، دیم لە کامی ئەژدەهادا بوو (٥)**
**بەدڵ باوەڕ مەکەن مەعشووقە هەرگیز تەرکی عاشق کا**
**نیهانی لوطفی دڵدارم لە هەنگامی جەفادا بوو! (٦)**
**تەرەققی بوو بە وەصڵت، دەردی عیشقی "سالم"ی موشتاق**
**شکستی ئیستیخوانی ئەو لەژێر سەر مۆمیادا بوو (٧)**

(٤) موددەعی: بەدکار.

واتە: کە ناوی ڕەقیبت بە لێودا هێنا، ناوی منیش هەر لەوێ بوو، لە داخاندا بوورامەوە. داخەکەم هۆی مردنەکەم کە ناوی بەدکارە، لەناو ئەسڵی دەرمانەکەدا بوو کە لێوی تۆیە!

(٥) ئەنگوشت: پەنجە. کام: دەم.

واتە: ئەمشەو ناڵینی دڵی خۆمم لەناو پێچی زوڵفتدا دەبیست، پەنجەی خەفەتم گەست کە دیم دڵم لەناو دەمی ئەژدەهادایە.

(٦) نهانی: نهێنی.

واتە: هەرگیز باوەڕ مەکەن یار بەدڵ واز لە عاشق بێنێ، تەنانەت یار لە کاتی دڵئازاردانیشدا بە پەنهانی میهرەبانیی لەگەڵم هەبووە، ئەڵبەت میهرەبانییەکە بریتییە لە ئازاردانەکەی.

مەکەن (کم، گم): مەکە.

(٧) ئەو: مەبەست سالمە.

واتە: دەردی عیشقی سالمی ئارەزوومەند، بە گەیشتن بە تۆ زیادی کرد. زۆر سەیرە، شکان و وردوخاشبوونی ئێسقانی سالم لەژێر سەری مۆمیادا بوو. بە کورتی، یار بۆ دەردی سالم وەك مۆمیایە بۆ چاككردنەوەی شكاوی، كەچی ئێسقانیی شكاند و نەیگرتەوە.

تەرەققی (حا): طەرەققی. هەڵەیە.

-٣- (*)

ئەی حاریث، ئەگەر دەوڵەت و جاه و حەشەمت بوو،
دوڕڕ و گوهەر و لوئلوء و لەعل و دڕەمت بوو،
مەهڕوویی سیەهمووییی سەمەنبوو، خەدەمت بوو
«هەرچەندْ کە عومری "خضر" و عەیشی "جەم"ت بوو،
چونکە ئەمەلت زۆرە، چ عومرێکی کەمت بوو؟!» (١)

گاهێ بە دوعا ڕوو دەکەیە قیبلەیی حاجات
گاهێ لە ڕەعییەت دەبییە مەرگی موفاجات!
ناکەی بە ئەبەد، قەد لە دڵا، فیکری موکافات!

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، غ، کم، گم)دا هەیە. لە (مان، ن)دا، یەکێکە لە پێنج‌خشتەکییەکان (مخمسات)، ئەسڵەکەیان هی "نالی"یە و (٧) بەیتە، بەڵام سالم هەر چوار بەیتی لێ کردووە بە پێنج‌خشتەکی. (دیوانی کوردی، بەرگی یەکەم، ل٤٣١-٤٣٢) ئەم پێنج‌خشتەکییەی بە هەڵە داوەتە پاڵ "کوردی"، لە کاتێکدا بەڵگەی بێ‌چەندوچۆن نوسخەکەی (مان)ە کە بۆ سالم خۆی نووسراوە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

(١) حاریث: کشت‌وکاڵکەر، یا ناوی زەلامێکی تایبەتی بووە، یا (حارس) بووە و بە مەبەستی پاسەوانی ماڵی دنیایە، یان (حارص= حریص) بووە بە واتای خاوەن‌تەماعی بە هیچ تێرنەخواردوو، ناسناوی (ئیبلیس)یشە. هەر چۆن بێ، لەوە دەچێ ئەم مرۆیە کە سالم تێی‌بەستووە، کابرایەکی بە سیما دیندار و بە سك دنیاخۆر بووبێ، وای بۆ خۆی حیساب کردبێ کە هەم دینیشی هەیە و هەم دنیایش، دوایی مردووە و هیچیانی بۆ نەبووە. خضر: حەزرەتی خدری زیندە کە هەندێ دەڵێن پێغەمبەر و هەندێکیش دەڵێن وەلی بووە، بە هەرحاڵ وا مەشهوورە کە نەمردووە و عومری درێژە. جەم: مەبەستی جەمشید شایە کە دەسەڵاتێکی زۆر گەورەی بووە.

واتە: ئەی هەمیشە خەریکی کشت‌وکاڵ! ئەی پاسەوانی پارە و ماڵ! ئەی بەرچاوتەنگی بە هیچ تێرنەخواردوو! ئەگەر سامان و پارە و خزمەتکارت، مرواری و گەوهەر و لەعل و مرواریت هەبێ، ئەگەر تەمەنی حەزرەتی خدری زیندە و دەسەڵاتی جەمشید شات هەبێ، مادام هیوات زۆرە و فریای هەمووی ناکەوی، ئای چ تەمەنێکی کەمت هەبوو!

**«ئەی جامیعی دونیاوو قیامەت بە خەیاڵات!**
**ئەو ڕۆژە کە ڕۆیی، نە ئەوت بوو، نە ئەمت بوو!!» (٢)**

**ئەی مونکیری ئەفسوردەیی ظاڵمدڵی بەدذات!**
**ئەی زاهیدی باطینبەد و ظاهیر لە عیبادات!!**
**بێ تەربییەتی مورشید و بێ طەییی مەقامات**
**«دوێنێ چ بوو دەتدا بە زوبان لافی کەرامات؟!**
**ئەمڕۆ نە دەمت بوو، نە دەمت بوو، نەدەمت بوو!!» (٣)**

دوررِ و گـوهەر و.. تاد (کم، گم): دوررِ و صـەدەف و لوء لوء و لەعل و گــوهەرت بـوو. مـەه ڕووی.. تاد (غ): خووبانی سیەهموو و پر سەرو. (کم، گم): خووبانی سیەهموو، پـەری ڕوو، خـەدەمت بوو. هەرچەند (غ، کم، گم): هەرچەندە. لە «دیوانی نالی»شدا «هەرچەندە»یە. عەیش (کم، گـم): جـامی. لە «دیوانی نالی»شدا هەر «جامی»یە.

(٢) گاهێ: کاتێ. مەرگی موفاجات: مەرگی لەپڕ. موکافات: پاداشی ڕۆژی قیامەت.

واتە: جارێ ڕوو لـە بارەگای خودای گەورە دەکەی کە نیازی خاوەننیـازان دێنێتـە دێ، جـارێکیش زوڵم لە ڕەعیەتی بەردەست دەکەی و وەك مەرگی لەپڕ بینەقاقەیان دەگری. هەرگیز بەدڵ بیر لـە پاداشی پاشەڕۆژ ناکەیتەوە. ئەی ئەوەی کە بە خەیاڵ دنیا و قیامەتت کۆکردووەتەوە! ئەو ڕۆژە کە هاتی بـە لادا، نە سامانی فراوانی دنیا فریات کەوت، نە پاداشی دواڕۆژیشت دەست دەکەوێ!

قیبلەیی (کم، گم): قوببەی. ناکەی بە ئەبەد .. تاد (حـا): ناکـەی لـە دڵا قـەت بـە ئەبـەد فیکـری موکافات (غ): تا کەی لە دڵا قەد بە ئەبەد فیکری موکافات. (کم، گم): ناکەی لە دڵا قـەت بـە ئەبـەد فیکری حیکایات. ڕۆیی (کم، گم): مردی. لە «دیوانی نالی»شدا «مردی»یە. نە ئـەوت بـوو.. تـاد (کـم، گم): نە ئەمت بوو نە ئەوت بوو.

(٣) ئەفسـوردە: ژاکاو، مەبەستی دڵمردووە.

واتـە: ئـەی نکـوولی لەڕاسـتیکـردووی دڵمـردووی سـتەمکار و بـەدخوو! ئـەی بـە دیـەن وازلـەدنیاهێناو، کـە دیـوی دەرت خوداپەرسـتیی بەڕەونەقـە! دوێنـێ، بەبێئـەوەی ڕێنیـشاندەر و مورشیدێکت هەبێ و بەبێ ئەوەی پلەکانی خوداناسیت بڕیبێ، چ بەڵایەکت بوو کە بە زمـان لاف و گەزافی کەرامەتت لێ دەدا؟! ئەمڕۆ کە مردی، نە دەمت بوو قسەی پـێ بکـەی، نـە هەناسـەت بـوو هەناسەیێ بدەی، تەنها پەشیمانیت هەبوو!

ئەووەڵ فەرەحی دا فەلەك، ئاخر غەمی هێنا
گوم بوو لە دەهەن خەندەوو دڵ ماتەمی هێنا!
باقڵ دەمی مەرگە، کە هەناسەت کەمی هێنا
((عومرت، نەفەسێکی کە هەموو عالەمی دێنا،
بمرە لە غەمیدا، کە هەموو صەرفی غەمت بوو!!)) (٤)

ئەی مونکیری .. تاد (کم، گم): همین گەر افسردەی ظاڵم دڵی بەد ذات. ئەی زاهیدی (حا، کم، گم): وەی زاهیدی. تەربیەتی (کم، گم): تەربیەت و. دوێنی چ بوو .. تاد (کم، گم): دوێنی چ بوو داتە زوبان لافی کەرامات. نەدەمت بوو .. تاد (کم، گم): کە نەدامەت بوو نەدامەت بوو نەدامەت بوو. (گم) لە پەراوێزدا باسی کەموکووڕیی کردووە.

(٤) دەهەن: دەم.

واتە: چەرخی زەمان لە پێشدا خۆشیی دا و دوایی پەژارە، دەم پێکەنینی نەما و دڵ ماتەم بوو. دیارە ساتی مەرگ کە هەناسەت کورتی هێنا، بمرە لە خەمی ئەو عومرەتدا کە تاقە هەناسەیەکی لای تۆ هەموو دنیای دەهێنا، ئەوا هەمووی لە خەمی کۆکردنەوەی ماڵی دنیادا سەرف بوو.

گوم (کم، گم): کەم. خەندە و (کم و گم): خەندەیی. نەفەسێکی (کم): نەفیکی. هەڵەی چاپە.

نوسخەی (حا) پێنجخشتەکیی دوو بەیتیتریشی تێدایە، کە بە شێواز و داڕشتن و زمانەکەیدا دیارە هیی "سالم" نییە و لە بەندەکانی پێشوو جیاوازە. ئەمە جگە لەوەی کە لە نوسخەی (مان)یشدا نییە:

ئەم شوهرەتی بەدناوییە کەوا دائیم لە دووتە
تاکەی هەوەسی پیرێژنی کۆهنە، تۆ خووتە
پڕ وەسوەسەوو بێهونەر و پڕ لە برووتە؟
((بمرە لە غەمیدا کە هەماغۆشی عەدووتە
دونیا کە بە عوشرەت حەرەمی موحتەرەمت بوو))

سەر هەڵبڕە، ئەی دڵ، لە خەوی غەفڵەت، هەتا کەی
ڕەحمێ بکە بەو حاڵی قیامەتەت، خودا کەی
وا چاکە سەر و ماڵت بە یەکبارە فیدا کەی
((نالی چییە وا میثلی جوعەل غەرقی شیاکەی
خۆ تۆ بە حیسابێ وەکو پەروانە شەمت بوو))

-٤- (*)

**ئەگەرچی سینە بۆ دڵ وەك سیپەر بوو**
**وەلێ زەخمی خەدەنگت کاریگەر بوو (١)**
**لە وەختی حاصلا زانیم، بە تەحقیق،**
**نیهالی سەروی قەددت بێثەمەر بوو (٢)**
**لەبت سەرچەشمەیی ئاوی حەیاتە،**
**وەلێ بۆ کشتی من قەطرەی شەرەر بوو (٣)**
**لە ڕەشکی لێوی تۆ، غونچە شەقی برد**
**لە خەندەت موعجیزەی «شقّ القمر» بوو! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، ڕ، ق، کم، گم)دا هەیە.
کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) نیوەی دووەمی ئەم بەیتە لە (ڕ)دا نیوەی دووەمی یەکەم بەیتی پارچەی شەشەم (٦)ی ئەم پیتەیە.
واتە: ڕاستە دڵم لە سینەمدا شاردراوەتەوە و سینەم وەك سوپەر بوو بۆی، بەڵام برینی تیری برژانگت کاریگەر بوو و سینە و دڵی سمی.
وەلێ (غ): دڵی. کاریگەر (ق، ڕ): کارگەر. «وەك» لە (مان)دا کەوتووە.
(٢) حاصل: بەرهەم. نیهال: نەونەمام.
واتە: کات و وەرزی بەروبووم، بە ڕاستی بۆم دەرکەوت سەروی باڵات بۆ من بێبەر بوو.
لە وەختی (عا): بە وەختی.
(٣) ئاوی حەیات: ئاوی زیندەگانی. کشت: کشتوکاڵ. شەرەر: پزیسکی ئاگر.
واتە: ڕاستە لێوت سەرچاوەی ئاوی زیندەگانییە و هەر کەس لێی بخواتەوە نامرێ، بەڵام بۆ کشتوکاڵ و هەوڵ و کۆششی من قەترەی پزیسك بوو، گڕە «سەمووم» بوو.
کشتی من قەطرەی شەرەر (کم): کشتی من بەرقی شەرەر. (گم): کوژتنی من بەرقی شەرەر.
پێمان وایە لەم شوێنەدا ئەوەی نوسخەکەی (کم) لە (مان)یش باشترە، (مان) بە زەحمەت واتا بەدەستەوە دەدا. بەڵام نوسخەکەی (کم) بەرقی شەرەری لەباتیی گڕە بەکارهێناوە. جگە لەوە، بزیسکی شەرەر خۆی لە خۆیدا بەجێیە و زۆر جوانە.
(٤) ڕەشك: حەسوودی، داخ، قین. شق القمر: دوولەتکردنی مانگ کە موعجیزەی پێغەمبەر بووە (د.خ).

**دەسووتێ دڵ بە یادی ڕەنجی "فەرهاد"**
**ئەویش وەك من غەریب و دەربەدەر بوو (٥)**
**بەبێ ڕووی تۆ، فەضای باغی «سەنەندوج»**
**لەناو دڵما وەکوو ناری سەقەر بوو (٦)**
**لە زاهید مەگرە دڵ "سالم!"، کودوورەت**
**لە ئەسراری مەحەببەت بێخەبەر بوو! (٧)**

واتە: غونچە کە دەمی کردەوە، لە خۆشیی خۆی نەبوو، بەلْکوو لە حەسوودی و داخی جوانی و ئالْیی لێوی تۆ بوو لە کاتی پێکەنینتدا کە شەقی برد، دلّی شەقی برد! بەلّێ، پێکەنینەکەت موعجیزە بوو، مانگ دوولەت بوو، دیارە مانگیش هەر بەخیلیی پێ بردووە؛ یان دەمی یار وەك مانگ جوانە و پێکەنینەکە وەك «شقّ القمر»ە کە لێو دەکرێتەوە، یانێ مانگ دوولەت بوو.

خەندەت (ق): خەددت. غونچە (ن): غونچەی.

(٥) واتە: دلّ کە یادی ڕەنجی بێهوودەی فەرهادی بیر دەکەوێتەوە، لە خەمدا دەسووتێ. بەلّێ، ئەویش وەك من نامۆ و دەربەدەری ولاّتان بووە. سالم لێرەیش کەفوکولّی خۆشویستنی نیشتمانی داگیرکراوی سەرڕێژ دەکا و دەکەوێتە سکالاّی دەردی دووری. ڕاستە بۆ مرۆی نامۆ چی لە ولاّتی خۆی خۆشەویستترە؟! مەگەر ڕۆلّەی ئەو نیشتمانە نەبێ.

ڕەنجی (عا): زەنجی. هەلّەی نووسینە.

(٦) واتە: دەشتی باصەفا و هەوای شاری سنە، بەبێ ڕوخساری تۆ، لە قوولاّیی دلّمدا وەك ئاگری دۆزەخ بوو. دیارە سنەیش لەوکاتەدا گیرۆدەی دەستی حوکمی قاجار بووە، ئیتر لە کوێ دلّ تێیدا خۆش دەبێ؟!

ڕووی تۆ فەضای (عا): ڕووی صەفای. لەنگە.

(٧) واتە: سالم لەو کەسە دلّتەنگ و زویر مەبە کە بە دیمەن تەرکی دنیای کردووە و هەستی وەك تۆ نییە، چونکە ئەو لە نهێنییەکانی خۆشەویستی بێخەبەرە.

زاهید (ڕ): ذاهید. هەلّەیە.

### -٥- (*)

**میزاجی طارەمی قەلبم لە (ڕەی)دا میثلی (طالْش) بوو**
**بە هاوینیش لە هەوری چاوی تارم، تاوی بارش بوو (١)**
**لە هەنگامی نەظەردا وەختی غەفلەت بۆ نیشانەی دڵ**
**موژەت هەر یەك، بە ئوستادیی نیگەه، وەك تیری ئارش بوو (٢)**
**لە عاریضتا دەبینم ئاگری گەش وا لەناو ئاوا!**
**چ سیحرێکە لە بەینی ئاگر و ئاوا کە سازش بوو؟ (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، حا، نم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) طارەم: خانووی دارین، هەیوانگومەزی. ڕەی: تاران. طالْش: ناوچەیەکە لە باکووری ئێران. بارش: بارانبارین.

واتە: میزاجی خانوو یا هەیوانی دڵم لە تاران وەك تالْشە، بە هاوینیش باران لە هەوری تەموژی چاوی تاریکم دەبارێ.

تارەم (نم): خۆم.

(٢) ئارش: ئارشی شیواتیر پاڵەوانێکی تیرهاوێژی کۆن بووە، بە تیرهاوێشتن سنووری ئێران و تووراني دیاری کردووە. ڕەنگیشە ئاماژە بێ بە (ئارش)ی شوێنی دوایینشەڕی نێوان بابانەکان و عوسمانییەکان لە نزیکی کۆیە، کە بابانەکانی تێدا بەیەکجاری شکان.

واتە: ئەی یار! کاتی بێئاگایم، کە تیرت هاوێشت بۆ دڵم، هەر برژانگێکت بە وەستایی وەك تیری (ئارش)ی پاڵەوانی ئێرانی وا بوو، یا وەك تیرێکی ئەو شەڕەی بابان و عوسمانی بوو کە کۆتایی بە حوکمی بابان هێنا، بەو شێوەیەیش کۆتایی بە ژیانی من دەهێنێ.

(٣) عاریض: ڕوومەت، کولم.

ڕوخساری یاری سالم ئەوەندە سپی و صاف و بێگەردە، دەڵێی ئاوی صافە، کولمیشی وەك پشکۆ سوورە. ناهەقی نییە سەرسام بێ کە دیویە ئاو و ئاگر وەها پێکەوە گونجاون.

سیحرێکە (حا): سیحرێکی.

**دەوایی زەخمی هیجرانم کە زانیی وەصڵە، لێم تۆرا**
**چ مەوقیع بوو جەفا؟! لەم وەختەدا فەصڵی نەوازش بوو (٤)**
**بە دەوری تیغی جەللادا دەڕەقصێ جان بە خۆشنوودی**
**کە طوغرای پڕ لە نازت بۆ سەری "سالم" نیگارش بوو (٥)**

(٤) فەصڵ: وەرز. نەوازش: میهرەبانی.

واتە: کاتێ یار زانیی دەرمانی برینی دووریم لێیەوە گەیشتنە بەو، لێم زیز بوو و تۆرا. ئازار و ئێشەکەی لە جێی خۆیدا نەبوو، چونکە کاتەکەی سەردەمی دڵدانەوە و میهرەبانی بوو.

لەم وەختەدا (نم): لەم وەقتەدا.

(٥) دەڕەقصێ: لە سوورِ و سەمادایە، دەسووڕێتەوە. جان: گیان. خۆشنوودی: شادمانی. طوغرا: ئەمری شاهانە. نیگارش: نووسین، نەخش و نیگار کێشان.

واتە: کە فەرمانی پڕنازت بۆ برینی سەری سالم نووسرا، گیانی سالم بە شادمانییەوە بە دەوری سەرەکەدا دەکەوێتە سوورِ و سەما و خۆی بە قوربانی دەکا، خۆی لە دەوری خوێنڕێژێ دەگێڕێ.

## -٦- (*)

**ئەگەرچی شەو ئەنیسم وەك مەلەك بوو**
**بەبێ تۆ، تیری ئاهم تا فەلەك بوو! (١)**
**كە ئەڵماسی موژەت گێڕا بە دڵما**
**بە جوز تۆ، هەرچی مەوجووداتە حەك بوو ! (٢)**
**كە فەصصاد قەصدی فەصدی لێوی تۆی كرد**
**لە جێی نیشتەر، لەباتیی خوێن، نەمەك بوو! (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، غ، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەوەجی شەشیی مەحزووف.

(١) ئەنیس: هاودەم. مەلەك: فریشتە.

واتە: ئەگەرچی هاوڕێی وەك فریشتە پاك و خاوێنم هەبوو، بەڵام بێ تۆ كە تیری ئـاه و هەناسـەم دەگرتە بەدكارم، تا ئاسمان بڕی دەكرد، بەڵكوو كاری كردبێ لێی.

تیری ئاهم، كە لە (مان)دا (تیرآهم) نووسراوە و واتاكەی بەجێیـە، ڕێـشی تێدەچـێ (تیرەئـاهم) بووبێ، بە واتای ئاهی تاریك.

(٢) واتە: ئەی یار، كە برژانگی وەك ئەڵماست بە دڵمدا گێڕا، هیچی تێدا نەما و جگـە لـە تـۆ هەموو شتێك كوژایەوە.

گێڕا (ڕ): كرا.

(٣) فەصـصـاد: خوێنگر، كەڵەشاخگر، مەبەستی لێوی عاشقە. قەصد: نیاز. فەصد: خوێن گـرتن، مەبەستی لێومژینە. نەمەك: خوێ.

واتە: كە عاشق لێوی تۆی مژی، لە باتیی خوێن خوێ دەردەهات. ئەمەیش شـتێكی سـەیر نییـە، لێوی یار سوێرخوێیە. سالم لێرەدا لێوی دڵداری شوبهاندووە بە نەشتەر و لێوی یار بەو شوێنەی كـە خوێنی لێ دەگیرێ.

(قەصدی) لە (عا)دا كەوتووە. كرد (ن): گرت. لەباتیی (عا): لەبانی. هەڵەی نووسینە.

جێی باسە، نیوەبەیتی ((كە فەصصاد قەصدی فەصدی لێوی تۆی كرد)) لە نیوەی یەكەمی سـێیەم بەیتی پارچەشیعری (٩) دەیەمی پیتی (ر)دا دووبارە كراوەتەوە.

دەڵێی فیردەوسە گوڵزاری (سەنەندوج)
وەلێ بێ تۆ، لە لای من، وەك دەرەك بوو! (٤)
دڵ و جان و سەرم تەسلیمی تۆ کرد
کە زانیم بۆ جەفا جوملەت گەرەك بوو! (٥)
کە دامی شانە کەوتە مەوجی زوڵفت
دڵی "سالم" لە خاکا وەك سەمەك بوو (٦)

(٤) فیردەوس: بەهەشت. دەرەك: قووڵاییی دۆزەخ.

واتە: گوڵزارەکانی شاری سنە وەك بەهەشت وان لە خۆشیدا، بەڵام کە تۆیان تێدا نەبێ، لای من وەك ناخی دۆزەخن.

لە لای من وەك دەرەك بوو (ق): لە دڵما وەك سەقەر بوو. هەڵەیە. (من) لە (عا)دا کەوتووە.

(٥) ئەم بەیتە لە (حا، کم، گم)دا نییە.

جوملە: هەموو.

واتە: من کە زانیم تۆ پێویستت بە دڵ و گیان و سەرمە بۆ ئازاردانیان، هەموویانم دایە دەستت، چییان لێ دەکەی بیکە.

جوملەت (ق): حیجلەت.

(٦) دام: داو. مەوج: شەپۆل. سەمەك: ماسی.

سالم زوڵفی یاری شوبهاندووە بە دەریا کە شەپۆلی هەیە، دیارە شەپۆلیش هیی دەریا و ڕووبارە، ماسیش زیاتر لە ئاوی دەریا و ڕووباردایە.

ئەمە بەپێی زانیاریی ڕەوانبێژی (ئیستیعارەی مەکنییە)یە. واتە: شانە، دەنکەکانی وەك قولاپی ماسیگر تیژن. کە ئەم شانە نامەردە کەوتە ناو شەپۆلی دەریای زوڵفی یار، دڵی سالمی گرت و فڕێی دایە وشکانی و کوشتی.

دامی (کم، گم): دانی. کەوتە (عا، غ، کم، گم): هاتە. دیارە (کەوتە) بەهێزترە.

## -٧- (*)

**به غەمزەی چاوی مەخموورت بەطاڵ بوو**
**لە مەشریق تا بە مەغریب، سیحر و جادوو (١)**
**غەریب و گۆشەگیر و فەردە وەك من**
**لە تورکستانی ڕووتا، خاڵی هیندوو! (٢)**
**بە حەلقەی موویی زوڵفت تا میانە**
**میانت چۆن تەفاوت کەم لەگەڵ موو؟ (٣)**
**لە بەزمت تا بە ناکامی جودا بم**
**جودا نابێ، سەرم یەكدەم لە زانوو (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، غ، ج، ڕ، کم، گم)دا هەیە.
کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.
(١) مەخموور: مەست.
واتە: هەموو ئەفسوون و جادوویەك لە ڕۆژهەڵاتـەوە بـۆ ڕۆژاوا بـە نیگایـەکی چـاوی مەسـتت پووچەڵ بووەوە.
بە غەمزەی (عا): لە غەمزەی. سیحر و (مان): سیحری. (عا): سیحر.
(٢) ئەم بەیتە لە (غ)دا نییە.
خاڵی هیندوو: خاڵی ڕەش.
سالم ڕوخساری یاری بە وڵاتی تورکستان شوبهاندووە، کە خەڵکەکەی سپیپێستن. دیارە خـاڵی هیندوو، کە وەك زنجی ڕەشە، لە تورکستانی سپیپێستدا تاك و بێهاوتایە.
(٣) میان: ناوقەد.
واتە: زوڵفت بە حەلقەکانی گەیشتووەتە ناوقەدت، ئیتر من چۆن باریکیی ناوقەدت لـە بـاریکیی مووی زوڵفت جوێ بکەمەوە؟! چۆن بزانم کامیان زوڵفە و کامیان ناوقەدە؟!
چۆن تەفاوت کەم (عا): کەی تەفاوت کەم. (غ): کەی تەفاوت بوو. (ڕ): چۆن تەفاوت بوو.
(٤) ناکام: ناموراد، بەئاواتنەگەیوو. جودا: جیا. زانوو: ئەژنۆ.
واتە: تا من ناموراد بم و بە ئاهەنگی گەیشتن بە تۆ شاد نەبم، سەرم یەك هەناسە لە ئەژنۆم جیا نابێتەوە.
نوسخەی (عا، غ): طورڕەی. ظوڵمەتی. (عا، غ، ج، کم، گم): نوسخەیی.

**سەوادێکە لە نوسخەی چینی زوڵفت**
**سیاهیی ظوڵمەتی پەڕڕی پەرەستوو (٥)**
**بە قەصدی گەردنی دڵ، تورکی چاوت**
**بە ڕووما تیغی ڕاکێشا لە ئەبروو (٦)**
**صەفا و ذەوقی نییە "سالم!" لە لای من**
**بەبێ ڕوخساری دڵبەر، باغی مینوو! (٧)**

(٥) پەرەستوو: پەڕەسێلکە.

واتە: ڕەشیی پەڕی پەڕەسێلکە، ڕەشییەکەی لە نوسخەی ڕەشی چینچینی زوڵفتە.

(٦) گردن: گرتن، یاخۆ گەردن: مل.

واتە: چاوی جوانت بە نیازی گرتنی موڵکی دڵ، یا بە نیازی بڕینی گەردنی دڵ، تیغی برۆی لە ڕوومدا هەڵکێشا.

گەردنی (کم، گم): گرتنی. دیارە (گردن)ی بە واتای (گرتن)یش، شێوەزاری ناوچەیەکی کوردستانە.

(٧) مینوو: بەهەشت.

سالم لەگەڵ خۆی دوواوە و وتوویە: سالم! لای من باغی بەهەشت بەبێ ڕوخساری جوانی یار، هیچ خۆشی و زەوقێکی نییە.

## (*) -٨-

**سەروکاری خەیاڵت ئیبتیدا وەختێ لەگەڵ دڵ بوو**
**نە بەحتی سەرکەشیی گوڵ بوو، نە عەهدی شۆری بولبول بوو (١)**
**هەتا نەکرا لە طورڕەی زوڵفی تۆ، مەشقی پەرێشانی**
**نە پێچ و تابی سونبول بوو، نە حەلقە و چینی کاکوڵ بوو (٢)**
**لە سیڕڕی مەطلەبی ئیما، بە جوز من، کەس نەبوو واقیف**
**نیگاهی چاوی مەستی وا لە حاڵاتی تەغافول بوو (٣)**
**لە وەرعا زاهیدی ئەفسوردە نەیدی حاڵەتی مەستی**
**بە عەفوا چوو سەراسەر ڕۆژگاری، چونکە بێدڵ بوو (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، ه، ف، غ، ج، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) سەروکار: پێوەندی. ئیبتیدا: سەرەتا. گوڵ: مەبەست یارە. بولبول: مەبەستی خۆیەتی.

واتە: کە خەیاڵت لە سەرەتاوە پێوەندیی بە دڵمەوە هەبوو و لەگەڵی ئاشت بوو، نە تۆ سەرکەش بوویت و نە منیش شێت و شەیدا.

سەروکاری (کم، گم): سەرەوکاری. بەحتی (عا): بەختی!

(٢) طورڕە: خەت. مەشق: خەتنووسین بۆ فێربوون و دەستڕاهاتن. پەریشانی: ئاڵۆزی.

واتە: تا لە زوڵفی تۆوە فێری ئاڵۆزی نەبووبوون، نە گوڵی سونبول پێچپێچ و نە کاکۆڵی لاوان چینچین بوو. هەموو ئەمانە لەبەر خەتی زوڵفی تۆ مەشقیان کرد و فێر بوون.

مەشقی (ه): نەقشی. نە پێچ و تابی سونبول بوو، نە حەلقە و چینی کاکوڵ بوو (ه): نە حەلقەی چینی گێسوو بوو، نە پێچ و تابی سونبول بوو. (کم، گم): .. بە پێچ و .... . نە حەلقە و (گم) ... لە حەلقە و.

(٣) ئیما: هێما، ئیشارە. جوز: جگە. واقیف: مەبەستی ئاگادارە.

واتە: نیگای چاوی مەستی یار ئەوەندە بە پەلە و لە کاتی بێئاگایی دڵداراندا بوو، جگە لە من کەس لە نهێنیی واتای ئەو هێمایە نەگەیشت. هەر من تێگەیشتم، واتە هەر من عاشقی ڕاستەقینەی یارم.

لە سیڕری (ف): بە سیڕری. ئیما بەجوز من (ه): نا بە جوزوی. (غ): ئیما بە جوزوی من. هەڵەیە. (ج، کم): یارم بەجوز من. تەغافول (گم): تەعامول.

(٤) بە عەفوا: بە خۆڕایی و بێهوودە.

**برۆ نەزدیکە "سالم!" دڵ لە زوڵفا، وەختی شادیتە**
**ئەگەرچی طەییی ڕاهی ئیبتیدا پڕپێچ و موشکڵ بوو (٥)**

واتە: زاهیدی پەژموردە و ژاکاو، لەبەر خۆپاراستن لە گوناه حاڵەتی مەستیی عاشقی نەدی، ڕۆژگاری تەمەنی سەراسەر بە خۆڕایی و بێهوودە ڕۆیشت. چونکە خاوەنی دڵ نەبوو، عاشق نەبوو!

حاڵەتی (عا، کم، گم): لەززەتی. ڕۆزگاری (گم): ڕۆژگاری. چونکە (کم): چنکی. (گم): چنکی. هەڵەی چاپە. (لە)ی (لە زوڵفا) لە (ج)دا کەوتووە. (بوو)ی (بێدڵ بوو) لە (غ)دا کەوتووە.

(٥) طەیی ڕاه: بڕینی ڕێگا، مەسافەبڕین.

واتە: سالم! برۆ، وەختی شادی و کامەرانی نییە. دڵ لە یار نزیک بووەتەوە و خۆی لەناو زوڵفانیدا حەشارداوە، ئەگەرچی سەرەتا ڕێگاکەی پێچاوپێچ بوو و گران بڕیی!

شادیتە (ه، غ، کم، گم): شادیمە.

(*) -٩-

ئەو یارە کە دایم وەکو پارەی جگەرم بوو

تا بوو لە دڵا، مەیلی بە فەرمانی سەرم بوو (١)

دەیدا لە دڵی خەستە، بە یەك غەمزە، دوصەد تیر!

هەردەم بە طەرەفیا کە نیشانەی نەظەرم بوو (٢)

کووچەی گوزەری تیری لە دڵ دەرچووە، ئیما

گەرچی هەمە جا سینەیی سەختم سیپەرم بوو! (٣)

بۆ شەمعی فەرەح، بادی فیراقت بووە ئافەت

ئاخر شەوی وەصڵت، کە ویداعی سەفەرم بوو! (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

(١) نیوەی دووەمی ئەم بەیتە و هیی بەیتی پاشەوەی لە (حا)دا پاش و پێشن.

پارە: پارچە.

واتە: ئەو یارە کە هەمیشە وەك پارچەی جگەرم بوو، تا لە دڵمدا بوو، حەزی بە سەربڕینی من بوو.

لە دڵا (عا): لە دڵدا. نیوەبەیتەکە لەنگ دەکا. سەرەڕای ئەوە، سالم لەم جۆرە شوێنانەدا (دا)ی بەکارنەهێناوە.

(٢) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا نییە.

واتە: کاتێك یار نیشانی تیری ڕوانینی من بوو و بۆم دەڕوانی و سەیری ئەملاوئەولایم دەکرد، بە یەك غەمزە دووسەد تیری دەگرتە دڵم. دەربڕینێکی زۆر جوانە، یار نیشانی ڕوانینی سالە و دڵی ئەمیش نیشانی غەمزەی ئەوە، بەڵام چۆن غەمزەیەك؟ غەمزەیەکی دووسەد تیری.

(٣) کووچە: کوڵان. گوزەر: تێپەڕین. ئیما: هێما، ئیشارەت. هەمە جا: هەموو شوێنێ.

واتە: ئەگەرچی سینەی سەختم لە هەموو لایەکەوە سوپەرم بوو، تیری ئیشارەی یار کۆڵانی هاتوچۆی لە دڵ دەرچوو، نەك تەنها دڵمی کون کرد، بەڵکوو کردیشی بە کۆڵان.

سیپەرم (عا): سپەری. جوانە، (ی) جێناوە و بۆ دڵ دەگەڕێتەوە. بەڵام (سپەرم) کە هیی (مان، حا، کم، گم)ـە، سینەی بە سوپەری دەستی سالم داناوە، یانێ سالم سینەیی کردووە بە سوپەری خۆی کە تیری غەمزەی یار لێی نەدا. (گـــذری) شێوەنووسی (گوزەری)ی نوسخەی (مان)ە.

(٤) واتە: دوا شەوی بەیەكگەیشتن، کە کاتی خوداحافیزیی سەفەرم بوو، بای جیابوونەوە مۆمی

**جانانە، کە وا مەیلی بە ئازاری ڕەقیبە!**
**تەحقیقە لە تەئثیری هەناسەی سەحەرم بوو! (٥)**
**دەموت نییە قەد تەڵخییی دووری لە ویصالا**
**شیرینقەدی جانانە هەتا نەیشەکەرم بوو (٦)**
**زاهید بە تەکەببور بەڵەدی عیشقی دەکردم!**
**کەودەن ئەوە "سالم!"، کە نەزانێ خەبەرم بوو! (٧)**

خۆشی و شادمانیمی کوژاندەوە و لێی بووە بەڵا.

بادی (کم، گم): یادی. جوانە. بەڵام (باد) لەگەڵ (شەمع)دا گونجاوترە.

(٥) جانانە: یار.

واتە: یار، کە مەیلی لە ئازاردان و ڕەنجاندنی بەدکارە، شتێکی سەیرە! کەی وا بووە؟ بەڵام بێگومان ئەمە کاری هەناسەی ساردی بەیانیانی من بوو کە نزام لە بەدکار دەکرد.

تەئثیری (حا، عا): تەئسیری.

(٦) قەد: هەرگیز.

واتە: تا قەدی شیرینی یار لە کاتی بەیارگەیشتندا نەیشەکەرم بوو، بەیەکگەیشتنەکە ئەوەندە شیرین بوو، دەموت: هەرگیز تاڵیی دووری ناچێژم. بەڵام وا نەبوو، چونکە ژیان هەمووی شیرین نییە.

قەد (کم، گم): قەت.

(٧) واتە: زاهید بە فیزەوە خەریك بوو شارەزای خۆشەویستیی دەکردم! نازیرەك و تێنەگەیشتوو زاهیدە، کە ئاگای لە دەنگوباسی نییە و نازانێ من لەو سەریەوە دێمەوە.

دەکردم (کم): ئەکردم. سالم (گم): زاهید.

-١٠- (*)

پارساڵ لە وەصڵدا بە صەفا عەیشی جەمم بوو
لەو کەوْنەدا شەوکەتی شاهی عەجەمم بوو (١)
وەك ڕاهیبی پازەند بە ئەدەب مەحوی نەظەر بووم
تەزیین بە طەلاّ و خشڵی مولەووەن صەنەمم بوو (٢)
لەو خەڵوەتە خاصصەم لە لەب و عاریض و دیدەی
پەیوەستە شەراب و مەزەوو شەوقی شەمم بوو (٣)
وەك تاجیری دەوڵەت بە هەوای خەزنەیی ڕووی یار
بۆ شاهیدیی گەنجْ بیشارت عەلەمم بوو (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە(عا)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

(١) جەم: جەمشید. کەون: جیهان.

واتە: پار کە لەگەڵ یار بووم، بە خۆشی و شادی ژیانی جەمشید شاهم بوو، هێز و دەسەڵات و دەبدەبەی پادشای ئێرانم لەم دنیایەدا هەبوو.

شایانی باسە نیوەی دووەم کەمێك لەنگە، وەك وشەیەکی کەوتبێ وایە. ئەگەر ((لەو کەونەیەدا)) یا ((لەو کۆنەیەدا)) یا ((لەو کەونەدا من)) بووایە، ڕاست دەبووەوە. هەروەها ئەم بەیتە تێکڕا یەکێکە لەو شوێنە کەمانە کە سالم پاشگری (دا)ی تێیدا بەکارهێناون.

(٢) ڕاهیب: لەخوداترس، تەرکیدنیاکردوو. پازەند: تەفسیری زەندی زەردەشت. مەحوی نەظەر: نوقومبوون لە بیرکردنەوەدا. تەزیین: مەبەستی موزەیەنە، واتە: جوانکراو و ڕازاوە.

واتە: ئەو سەردەمە کە لەگەڵ یار بووم، وەك ڕاهیبی زەردەشتی زۆر بە ئەدەب لە تەماشاکردن و تێفکرین قووڵ بووبوومەوە. مەبەستی تەماشاکردن و نوقومبوونە لە جوانیی ڕوخساری یاردا و بتەکەی، واتە یارەکەی، بە ئاڵتوون و خشڵی ڕەنگاوڕەنگ جوان کرابوو.

(٣) لەب: لێو. عاریض: ڕوومەت و کولم. پەیوەستە: هەمیشە. شەم: شەمع.

واتە: لێو و چاو و ڕوخساری یار لەو بە تەنها پێکەوەبوونە تایبەتەدا، هەمیشە بووبوونە مەی و مەزە و ڕووناکی؛ چاو: پیاڵەی مەی، ڕوخسار: شەمع، لێو: مەزە.

(٤) بیشار: هەر شتێ کە ئاڵتوون و زیوی پێدا داکوترابێ و ئاڵتوونڕێژ و زیوڕێژ کرابێ، بۆ نموونە کلاوزەڕ. هەروەها بە واتای نیثاریش هاتووە، یانێ ئەو ئاڵتوون و زیوەی کە بەسەر یەکێکدا

**دەمدا بە لەبم لەعل و دولەب، گۆیی بلووری**
**پەیوەستە لەگەڵ خۆم وەکو حاتەم کەرەمم بوو (٥)**
**شادیم لە هەوای صوورەتی ئەو گەییە مەقامێ**
**صەد شاهیدی وەك شەككەر و شیرین خەدەمم بوو (٦)**
**تا ئامەدی طالیع بوو وەکوو خوسرەوی پەروێز**
**گەه بادە بە لەب، گەه لە لەبا غونچەدەمم بوو (٧)**

دەڕژێنرێ بە نیشانەی پادشایی.

دیارە بازرگانی دەوڵەتی ئاڵای دەوڵەتەکەی خۆی بەکاردێنێ، سالمیش بازرگانی ڕوخساری یارە و کاتی نزیکی لێیەوە لە خۆشیدایە و ئاڵاکەی بریتییە لە کڵاوزەڕی دیاریی یار، یا ئەو زێڕ و زیوەیە کە بەسەر یاردا پەخش دەکرێتەوە بۆ سەلماندنی ئەوەی کە پادشای جوانانە. یا: وەك بازرگانی دەوڵەتی کە ئاڵای دەوڵەتی خۆی هەڵداوە و پارێزگاریی گەنجینەکەیی بۆ دەکا، منیش بە خولیای ئەوەوە کە بگەمە سەر گەنجینەی ڕووی یار، چی زێڕ و زیوێك کە بە خۆیدا کردووە، بووەتە ئاڵام، تا ئەوە ببێتە شایەتی و بەڵگە و بیسەلمێنم من گەنجینەی ڕووی یار -کە پادشامە- دەپارێزم.

(٥) گۆی بلووری: مەبەستی مەمکی یارە.

واتە: ئەو کاتە کە ڕۆژی خۆم و دنیا بە دڵم بوو، لەعلی سووری دوو لێوی یارم دەدا بە لێوی خۆم، یانێ ماچم دەکرد. ماچی مەمکی یاریشم دەکرد کە وەك گۆی بلوور بوو. هەمیشە وەك "حاتەمی تەی" لەگەڵ خۆم بەخشندە بووم و هەرچی خۆشییە بۆ خۆمم ئامادە دەکرد.

(لەعل و دو لەب) بە واوی عەتف لەبەر ڕووناکیی ئەم نوسخەیەدا، وا دەزانین (لەعلی دو لەب) بە (ی)ی ئیزافە تەواو و بەجێیە، چونکە لەعلەکە دوو لێوە ئاڵەکانی یارە. حاتەم (عا): حاطەم. دیارە هەڵەیە.

(٦) هەوا: مەبەستی خۆشییە. شاهید: جوان، یار. شەکەر: کە سالم لەبەر کێش بە (شەككەر)ی نووسیوە، ناوی ژنێکی جوان بووە خوسرەو پەروێز لە داخی شیرین خواستوویە و مارەی کردووە.

واتە: لە خۆشیی وێنەی یار، کە هەمیشە لە لام بوو، ئەوەندە دڵخۆش بووم، شادمانیم گەییە پایەیەك سەد جوانی وەك شەككەر و شیرین لە بەردەستمدا بوون.

(٧) ئامەد: هات، دژی نەهاتی و نەگبەتی. طالیع: بەخت. بادە: مەی. گەه: کات، کاتێ.

واتە: تا ڕۆژم بوو و بەخت یارم بوو، وەك خوسرەو پەروێزی ساسانی بووم. دەمێ مەی بە لێومەوە و دەمێ خونچە بە دەممەوە بوو. مەبەستی لە خونچە، دەمی بچووکی نەپشکووتووی یارە.

نامەد کە ترازاندی لەب و لەب لە لەب و مەی
"سالم!" لە فیراقا نە ئەوم بوو، نە ئەمم بوو (٨)

(٨) نامەد: نەهات، نەگبەتی و بەدبەختی.

واتە: ئەی سالم! کە نەگبەتی لێومی لە لێوی یار و لە مەی جیا کردەوە، دوو لێوم لە کاتی جیاییدا نە دوو لێوی یاری هەبوو و نە لێوی مەی! سالم قسە لەگەڵ خۆی کردووە. شایانی باسە، (نە)ی دووەم کەوتبوو، بۆی دانرایەوە.

جێی ئاماژەبۆکردنە، یەکێتیی بابەت (وحدة الموضوع)ێکی زۆر رێکوپێک لەم پارچەشیعرەدا هەیە و بەیتەکان وەك ئەڵقەی زنجیر بەیەکەوە بەستراون و یەکتری تەواو دەکەن. بە دووریش نازانرێ پارچەشیعرەکە رەمزی بێ، مەبەستی سالم بەراوردکردنی ژیانی سەردەمی دەسەڵاتی بابان و سەردەمی رووخانیان بێ.

## -١١- (*)

**لەبەر تەعمیری ئەم وێرانە، جەننەت موڵکی ئادەم بوو**
**حەقیقەت پادشاهیی کرد، وەلێکین موددەتی کەم بوو (١)**
**خۆشا ئەییامی گریانم لە خاکی کەعبەیی مەقصەد**
**هەموو قەطرەی سروشکم، بۆ شەرەف وەك ئاوی زەمزەم بوو (٢)**
**خەمیری خاکی من ئەووەڵ بە بارانی فەرەح نەکرا**
**جەوانی و طیفلیی و پیریم، سەراسەر جوملەگی غەم بوو (٣)**
**بە دۆشا تا پەرێشانیی بینا نا، زوڵفی موشکینت**
**نە هەر بۆ بەختی من تەنها، سیەهڕۆژیی عالەم بوو (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (عا، ف، غ، ج، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) واتە: ڕاستە ئادەم سەردەمێ بە مەینەت پادشایی کرد، بەڵام ماوەی پادشایەتییەکەی کورت بوو، چونکە خودای گەورە لە بنەڕەتدا بۆیە لە بەهەشت دایینا، تا ئەم دنیا وێرانەیەی پێ ئاوەدان بکاتەوە.

دوور نییە سالم (لەبەر)ی بە واتای (لەپێش) بەکارهێنابێ، واتە: بەهەشت لەپێش ئاوەدانکردنەوەی ئەم جیهانە وێرانەدا جێگای ئادەم بوو، بە ڕاستی باشی ڕابوارد، بەڵام ماوەکەی کورت بوو.

(جەننەت)ی نوسخەکانی (ف، غ، ج، کم، گم) ڕاستە و بۆ ئێرە دەست دەدا، نەك (میحنەت).

(٢) خۆشا: ئای کە خۆش بوو. کەعبەیی مەقصەد: مەبەستی دەورووبەریماڵی یارە.

واتە: ئای لە خۆشیی ئەو ڕۆژانەی وا کاتێك لە دەورووبەری ماڵی یار دەگریام و فرمێسکی ناهومێدیم دەڕشت، هەموو دڵۆپێکی لە موبارەکی و بەنرخیدا وەك ئاوی زەمزەم وا بوو.

خۆشا (گم): خۆشە.

(٣) خەمیر: هەویر، مەبەستی قوڕە. جوملەگی: هەمووی.

واتە: قوڕی ئەو بەشە خاکەی کە منی لێ دروست کرام، بە بارانی خۆشی نەشێلرا، بەڵکوو بە ئاوی خەم و پەژارە گیرایەوە. لەبەرئەوە منداڵی و لاوی و پیریم هەموو هەر خەم بوو، خۆشیم لە خۆم نەدی.

طیفلیی و پیریم (ج): پیر و طیفلیم. لەنگە. (کم، گم): پیریی و طیفلیم.

(٤) واتە: تا ئەگریجەی میسکدارت بەسەر شانتدا پەرش‌وبڵاو بووەوە، ئەوە نەك تەنها بەختڕەشی بوو بۆ من، بەڵکوو سیاڕۆژیی هەموو خەڵك بوو و بەری خۆری لێ گرت.

لەسەر سەبزەی چەمەن یاری سەهیقەددم کە جیلوەی کرد
لە سوجدەی خاڵی لای لێوی، بەنەفشە گەردەنی خەم بوو (٥)
بە قوربی خەڵوەتی دڵبەر نەنازی، ئەی صەبا، زینهار!
لە جێی تۆ، «پیش ازین»، "سالم" دەمێ هەمڕاز و مەحرەم بوو (٦)

بە دۆشا تا پەرێشانیی بینا نا (ج، کم، گم): بە دووشا تا پەرێشانی بـە تاتـای. مـن تـەنها (ف، کـم): تەنهای من. (گم): تەنهای. سیەهرۆژیی (کم، گم): سیەهڕووزیی.

(٥) سەهی: ڕێك. بەنەفشە: وەنەوشە.

واتە: کە یاری باڵاڕێکم لە باخ و بێستان و چیمەنی سەوز و سەفاداردا خـۆی نوانـد، وەنەوشـە ملکەچی بوو و کڕنووشی بۆ خاڵی لای لێوی برد.

لەسەر سەبزەی (ف): بەسەر سەبزیی. (ج): بەسەر سەبزەی. چەمەن (کم): چـیمەن. لای لێـوی (ج، کم، گم): لالێوی. بەنەفشە (کم): بنەوشە.

(٦) قورب: نزیکی. پیش ازین: بەر لەمە. دەمێ: سەردەمێ، یا گەلێ.

واتە: ئەی بای سەبا! بەوە مەنازە کە لە یارەوە نزیکـی و دووبـەدوون و کەسـتان لا نیـە، چـونکە منیش پێش ئەم ڕۆژە ماوەیەك لە جێی تۆ هاوڕاز و مەحرەمی لای یار بووم و شەرمی لێ نەدەکردم.

بە قوربی (غ): لە قوربی. صەبا (گـم): سـەبا. پـیش ازیـن (ف، غ، کـم، گـم): پێـشتر. (ج): پێشترە. هەمڕاز و (کم، گم): هەمڕازی.

-١٢- (*)

**فەرەح بۆ دڵ لە طالیعما، چ کەم بوو!**
**بە تەڵخی عومری شیرین صەرفی غەم بوو (١)**
**چ زووی کردم لە کۆی جانانە مەحرووم!**
**لەگەڵ من چەرخی گەردوون پڕستەم بوو! (٢)**
**دەزانن بۆ موصیبەت دێتە ڕێگەم؟**
**شکارم «پیش ازین» صەیدی حەرەم بوو! (٣)**
**لە وەختێکا بە خوێنم تیشنە بوو، یار**
**کە بۆ من خاکی ڕاهی جێی قەسەم بوو (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، غ، کم، ق، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەحزووف.

(١) تەڵخی: تاڵی.

واتە: خۆشی دڵ لە بەختی مندا زۆر کەم بوو. تەمەنی شیرینم بە تاڵی لە خەمخواردندا خەرج بوو.

بۆ دڵ (ق): بۆ من. کەم (کم، گم): لەم. هەڵەیە.

(٢) جانانە: دڵبەر. کۆ: دەورووبەری ماڵ.

واتە: چەرخی گەردوون زۆر ستەمکارانە مامەڵەی لەگەڵ کردووم. زۆر زوو لە دەورووبەری دۆستانی بێبەش کردم.

(٣) صەیدی حەرەم: نێچیری حەرەمی کەعبە کە بە شەرع ڕاوی تێدا حەرامە. وا دەزانین تێکڕای پارچەشیعرەکە ڕەمزییە و لە دواینبەیتدا تەقاندوویەتیەوە، مەبەستی لە حەرەم خاکی موڵکی بابان بووە.

واتە: دەزانن لەبەر چی من هەر بەڵا و نەهامەتی دێتە ڕێگام، لەبەرئەوەیە کە من لە ژیانمدا کابرایەکی گوناهبار بووم و پێشتر هەر نێچیری حەرەمی کەعبەم ڕاو کردووە کە ئەوەیش کارێکی گوناهە.

ڕێگەم (ق): ڕێگام. پیش ازین (کم، گم): موددەتێ.

(٤) تیشنە: تینوو. ڕاه: ڕێ.

واتە: ئەو لە کاتێکدا بە خوێنم تینوو بوو، کە من سوێندم بە خاکی ڕێگای ئەو دەخوارد.

ڕاهی جێی (ق): ڕێگەی ئەو.

**به جان تەسکین دەدا، بۆی غونچەیی دڵ**
**لە زوڵفا، چونکە گاهێ موحتەرەم بوو! (٥)**
**فەرەح بێ تۆ لە دڵ وا بوو پەرێشان**
**حەدیثی گورگ و ئەحواڵی غەنەم بوو (٦)**
**بە عەقڵ ئەو ڕۆژە پێم زانی دەفەوتێ:**
**کە "سالم" عازیمی موڵکی عەجەم بوو! (٧)**

(٥) جان: گیان.

واتە: بۆنی خونچەی دڵی گیرۆدەی زوڵفی یار تەسکینی بە دڵم دەدا، چونکە سەردەمێ زوڵفی ئەو شوێنی دڵم بوو، بۆنی ئەوی گرتبوو و لەوێ بەڕێز بووم.

غونچەیی دڵ (ق): غونچە بۆ دڵ.

(٦) ئەم بەیتە هەر لە (مان، ن)دا هەیە.

واتە: خۆشی بە شێوەیەك لەناو دڵدا پەرێشان بوو، بوو بە باس‌وخواسی گورگ و حاڵ‌وباری مەڕ.

گورگ (غ): کرکر. هەڵەیە.

(٧) واتە: ئەو ڕۆژە زانیم سالم دەفەوتێ کە ڕووی کردە وڵاتی عەجەم (ئێران)، یا ئەو ڕۆژە زانیم عەقڵم نامێنێ کە ڕووم کردە ئەوێ.

(بە عەقڵ ئەو) بە (بە عەقڵەو) دەخوێنرێتەوە.

سالم، جگە لە شاعیری، سیاسییەکی زیرەکیش بووە، زانیویەتی عەجەمیش وەك ڕۆم هیچ بۆ کورد ناکا!

پێم زانی (ق): دەمزانی.

## (*) -١٣-

**به مەخفی شەو لەناو دڵما خەیاڵی زوڵفی جانان بوو**
**هەتا وەختی سەحەر، هەرچەندە خاوم دی، پەرێشان بوو (١)**
**لە دیققەت مووی میانی تۆ، خیرەد داما لە حیرەتدا**
**چ فیکرێکە کە نازکتر لە فیکری خوردەبینان بوو؟! (٢)**
**دەزانی بۆ لە چاوت پاسی سیڕڕی دڵ بە من نەکرا؟**
**لە بەینا قاصیدی ڕازی نیهانی، تیری موژگان بوو! (٣)**
**دەمی ئارایشْت، وەختی بڕینی طوڕڕە، دڵ لەرزی**
**سەرت ناحەق بڕی، ئەو کافرە مەیلی بە ئیمان بوو (٤)**
**لە دڵما ڕاسْتەی سەرمەشقی فیکرم بوو قەدت، بۆیێ**
**هەموو شیعرم کە مەوزوونتر لە باڵای نازەنینان بوو (٥)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە بەشی (غزلهای جدیدە)ی (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) خاو: خەو.

واتە: شەو خەیاڵی زوڵفی پەرێشانی یار بە پەنهانی لەناو دڵمدا بوو، لەبەرئەوە تا بەرەبەیان هەرچی خەوم دەبینی، خەوی پەرێشان بوو. دیارە بەو هۆیەوە کە هاوڕێی زوڵفی پەرێشان بووم.

(٢) خیرەد: عەقڵ و هۆش. خوردەبینان: وردبینان، زیرەکان.

واتە: عەقڵ و هۆش سەرگەردانی بیرکردنەوە لە ناوقەدی وەك مووی تۆ بوو و سەری لێ دەرنەکرد. ئەمە چ جۆرە بیرکردنەوەیەك بوو کە لە بیری وردبینان وردتر بوو؟!

(٣) واتە: دەزانی بۆچی پاسی نهێنیی دڵم پێ نەکرا و نەمتوانی لە چاوتی بشارمەوە؟ لەبەرئەوەی تیری برژانگت نامەبەری ڕازە پەنهانەکە بوو.

(٤) ئارایشت: ڕازاندنەوە. طوڕڕە: زوڵف. مەیل: حەزلێکردن، لاربوونەوە. ئیمان: مەبەستی ڕوومەتی یارە کە سپییە و دژی تاریکیی زوڵفە.

واتە: کاتی خۆڕازاندنەوە کە سەری زوڵفت بڕی، دڵم لەرزی، پێی ناخۆش بوو. سەری ئەو زوڵفە ڕەشە کافرەت بە ناحەق بڕی، چونکە حەزی لە ئیمان بوو، یانێ بە لای ڕوومەتتدا لار بووبووەوە.

(٥) سەرمەشق: بەو دێڕە دەڵێن کە مامۆستا لە سەرەوەی لەوح و کاغەز دەینووسێ و قوتابی

**کەماڵی حوسنی لەیلا، خاصە بۆ مەجنوون، تەجەللیی دا**
**لە یار ئەو ئانە من دەمدی، لە دیدەی غەیرە پەنهان بوو (٦)**
**پەناهی بردە بەر نەشئەی شەرابی گەرم و تەڕ "سالم"**
**لە وەعظی سەرد و خوشکی واعیظی بێدڵ، هەراسان بوو (٧)**

مەشـــقی لەبـەر دەکا. دیـارە قوتـابی بۆئەوەی دێڕەکان ڕێك بنووســێ، پێویســتی بە ڕاستەیە. بـیری سالم قوتابییە و مەشق دەکا، فێری ڕستەی جوان و هەڵبەستی ڕێك دەبێ. قەدی ڕێکی یـار –بـۆ ئـەم مەبەستە– ڕاستەیەتی. هەر لەبەرئەمەیشە هەموو شیعرەکانی لە باڵای نازەنینان ڕێکتر بوون.

(٦) ئان: جۆرە جوانی و قەشەنگییەکە هەستی تایبەتیی عاشق دەیبینــێ، کەسـانیتـر هەسـتی پــێ ناکەن. غەیرە: بێگانە.

واتە: جوانیی لەڕادەبەدەری لەیلا، تەنها بۆ مەجنوونی شەیدا دەرکەوت. سەبارەت بە منیش ئـەو جۆرە جوانییە کە لە یاردا دەمدی، چاوی خەڵکیتر نەیدەبینی. بە کورتی، هەستی خـۆی و جـوانیی یاری بە هەستی مەجنوون و جوانیی لەیلا شوبهاندووە.

(٧) واتە: دڵی سالم لە داخی پەندی سارد و وشکی ئامۆژگاریکـەری لـە عیـشق بێئاگـا وەڕس بوو، بۆیە پەنای بردە بەر خۆشی و شادیی بادەی گەرم و تەڕ.

(*) -١٤-

**هەموو ئەشعاری دۆشینم لە وەصفی لێوی نۆشین بوو**
**دەچەسپا لەب بەسەر یەکدا، حیکایەت بەسکی شیرین بوو! (١)**
**گرانمیهریی دەهانی تۆ بڕیی بەندی ترازووی دڵ**
**دەڵێن: یەك نوقطە وەزنی هیچە، بۆچ ئەم نوقطە سەنگین بوو؟ (٢)**
**مەڵێن "مەجنوون" شکا شانی لە بۆسینی سەگی "لەیلا"**
**لە لای عاشق، خیلافی عاقڵی، ئەو هەتکە تەمکین بوو! (٣)**
**عوبووری دڵ بە چینی زوڵفتا، بۆ ماچی ڕوخسارە**
**قەلەندەر ڕاستە بۆ (چین) چوو، وەلێ مەیلی بە (ماچین) بوو (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) دۆش: دوێشەو. نۆش: هەنگوین. نۆشین: هەنگویناوی. بەسکی، بەس کە: ئەوەندە.

واتە: هەموو شیعرەکانی دوێشەوم لە وەسفی لێوی وەك هەنگوین شیرینی تۆدا بوو. حیکایەتەکە ئەوەندە شیرین بوو، لێو بە لێودا دەلکا.

نۆشین (کم): ڕەنگین.

(٢) میهر: خۆشەویستی.

واتە: کە بە ترازووی دڵ کێشانەی خۆشویستنی دەمی تۆم کرد، ئەوەندە قورس بوو، بەنی ترازووی دڵ پچڕا. خەڵك دەڵێن: خاڵێك کێشی هیچ نییە. ئەگەر وایە، ئەی بۆچی دەمی تۆ کە بە قەد خاڵێکە، ئەوەندە سەنگین بوو؟ سالم واتای بەنرخیشی لە (سەنگین) مەبەستە.

(٣) شان: پایە. تەمکین: ڕێز و جێداری.

واتە: مەڵێن: مەجنوون بە ماچکردنی سەگی بەر ماڵی لەیلا پایەی نزم بووەتەوە، عاشق، بە پێچەوانەی عاقڵەوە، ئەو سووکییە پایەبەرزییە بۆی.

شانی (حا): شەئنی.

(٤) قەلەندەر: ئەوی وازی لە دنیا هێناوە. ماچین: ماچاوی.

واتە: دڵ کە بە چینچینی زوڵفتدا هەڵزنا، بۆ ماچی ڕوومەتت چوو. بەڵێ، ڕاستە قەلەندەر بۆ چین چوو، بەڵام مەبەستی ڕوومەت بوو کە ماچاوییە. وشەئاراییەکی جوان لەنێوان (چین و ماچین)دا هەیە،

**له کوڵمت هەرچی خاریج بێ سەری ئەگریجە، قەیچیی کە**
**بڵێن با: سەربڕینی خاریجی بۆ ڕەونەقی دین یوو! (٥)**
**قەراری عاشق و قانوونی حیکمەت ضیددی یەك هاتن**
**کە تەسکینی برینی دڵ لە نەفحەی زوڵفی موشکین بوو! (٦)**
**بە ئیمای دیدەیی مەعشووقە، عاشق کێو لەبن دێنن**
**لە لای "سالم" کەنەندەی (بێستوون) موژگانی "شیرین" بوو (٧)**

سەرەڕای ئەوەی کە لە کوردەواریدا دەوترێ: چین و ماچین، وەك ماچین ناوی وڵاتێك بێ!

(٥) قەیچی: مەقەست. کە: بکە.

واتە: مووی زوڵفت هەر کە لە عاستی کوڵمت لای دا، قەیچیپاچی بکە و سەری ببڕە، با بڵێن: سەربڕینی (خاریجی) بۆ دەرخستنی ڕووناکیی ئایین زۆر چاك بوو.

سالم لە بەکارهێنانی (خاریجی)دا تەوریەی کردووە، (خاریجی) لە عورفی زانایانی ئایینـدا، بەوانە دەڵێن، کە لەگەڵ "ئیمام عەلی" بوون. بەڵام کە مەسەلەی حوکمدان کەوتە نێوان موعاویە و ئیمام عەلی، جیاوازی لە نێوان ئەوان و ئیمام عەلی (د.خ)دا پەیدابوو، بە حوکمدانەکە ڕازی نەبوون و لە ڕێگەی ئیمام عەلی دەرچوون. بەڵام سالم لێرەدا بۆ زوڵفی بەکار هێناوە کە لە سنووری کوڵم دەربچێ، کوڵمەکە ڕووناك و ورشەدارە و بە بڕینی سەری زوڵفەکە دەردەکەوێ.

بێ (گم): بێ و.

(٦) کۆن لەناو خەڵکدا باو بووە بۆنی خۆش بۆ برین خراپە و چاکبوونەوەی دوادەخا. سالم وتوویە: بڕیاری دڵدار و یاسای پزیشکی دژی یەك هاتنە ڕوو، ئەوەتە ئارامیی برینی دڵ بە بۆنی خۆشی زوڵفی میسکداری یارە.

قانوونی (کم، گم): قانوون و. نەفحەی (حا، کم): نەفخەی. هەڵەیە.

(٧) واتە: دڵداران بە ئیشارەتێکی چاوی دڵبەر کێو لەبن دێنن. ڕای سالم وایە کە بێستوونی لەمەڕ فەرهاد، هێزی برژانگی جوانی شیرین -کە لە تیر تیژترە- هەڵیکەند، نەك فەرهاد.

ئیمای (کم و گم): ئیما. دێنن (کم، گم): دێنێ، ئەمە باشترە چونکە عاشق تاکە و (دێنێ)ش فیعلی تاکە. ئەوەی (مان)یش کە دانراوە، ڕاستە، چونکە سالم مەبەستی هەموو ڕەگەزی عاشقانە.

-١٥- (*)

کەوکەبی سەعدم لە بورجا، دەفعەیێ، باڵا نەبوو
(ذوذَنَب) بۆ بەختی واروون، قەت دەمێ ئاوا نەبوو (١)
ئەهلی دڵ! بێنە تەماشای دڵبەر و ئەحواڵی من
دەفتەری "فەرهاد" و "شیرین" جوملەگی ئەفسانە بوو (٢)
"وامیق"یش وەك من لە ڕێی عیشقا جەفا و جەوری نەدی
گەر بە میثلی ڕوویی دڵبەر عاریضی "عەذرا" نەبوو (٣)
جانی شیرینم لە جۆشی غەم بە خوێن پالوودەیە
حەسرەتا بۆ بەختی من، لەم حاڵەشا حەڵوا نەبوو (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە تەنها لە (پ، نم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) کەوکەب: ئەستێرە. سەعد: بەختیاری. باڵا: بەرز.

ذو ذنب: ئەو ئەستێرانەی کە بە شەو دەبینرێن دەکشێن و لە ڕاستیدا نەیزەکن و لە ئەستێرەکە جیادەبنەوە. گوایا ئەوە نیشانەی نەگبەتی و کارەساتە! دیارە کە هەرگیز ئاوا نەبێ و نەکوژێتەوە، نەگبەتییەکەی زیاترە!! واروون: سەرەوخوار، هەڵگەڕاوە. قەت: هەرگیز.

واتە: ئەستێرەی بەختەوەریم هەرگیز لە بورجدا دەرنەکەوت و هەرگیز ئاوا نەبوو و نەکوژایەوە!

سەعدم (پ، گم): بەختم. واروون (گم): واژك. قەت (پ): قەد.

(٢) ئەهلی دڵ: مەبەستی ئەوانەن کە هەست بە ئازاری خۆشەویستی دەکەن، عاشقان. جوملەگی: سەربەسەر، هەمووی. ئەفسانە: سەرگوزشتەیێ کە زیادەڕەویی تێدا کرابێ.

واتە: ئەی خاوەن دڵان! وەرن سەیری حاڵی من و جەوری دڵبەر بکەن، کە چ دەردەدڵێکە. بێگومان کتێبی فەرهاد و شیرین لە چاو دەردی مندا هەمووی سەرگوزەشتەی بێبنچینە بووە.

جوملەگی. (گم): سەربەسەر.

(٣) عاریض: ڕوومەت.

واتە: ئەگەر ڕوومەتی "عەذرا" وەك ڕوومەتی دڵبەری من جوان نەبووبێ، شتێکی سەیر نییە، چونکە دەردی "وامیق"یش وەك دەردی من نەبوو، دەردی من قورستر بوو.

(٤) پالوودە: حەڵوایەکی تایبەت کە لە نەشە و شەکر و بادامی کوتراو و ئاو دروستدەکرێ. ئەی درێغ: داخەکەم، حەیف.

**مەنزڵی ئەصحابی کەهفە، خانەیی مەعشووقی من**
**هەر کە دیم دەرگانە بوو، لەوسەر کە دیم دەرگا نەبوو (٥)**
**جان و دڵ ئەمساڵ بە نرخی بۆسەیی دوو ساڵیتر**
**قەد بە مەشرووطی سەلەم لەم بەیعەشا سەودا نەبوو (٦)**
**فەرعی ناقابیل دەبینێ، مادەری پیری فەلەك**
**حاڵەتم وەختی شەبابیش شێوەیی پیرانە بوو (٧)**
**وا ڕەقیب شۆخی دەکا، ئەی ئاسمان! تۆ موخبیری**
**بەختی بەد تا وا نەبوو، دڵبەر لەگەڵ من وا نەبوو (٨)**

واتە: گیانی شیرینم لە گەرمایی خەم و پەژارەدا بە خوێن شێلراوە و کراوەتە حەڵوا. داخ بۆ حاڵی من کە لەم بارەیشدا حەڵوا ساز نەبوو (ئەگەرچی گیان وەك شەکر شیرین بوو، بەڵام بە خەم شێلرا کە تاڵە).

جانی (پ، گم): گیانی. شیرینم (نم): شیرین. هەڵەیە. پالوودەیە (گم): پاڵاوتەیە. حەسرەتا بۆ بەختی (پ، گم): ئەی دریغ بۆ حاڵی. حەڵوا نەبوو (پ، گم): حەل وا نەبوو.

(٥) دەرگانە: دەرگا.

واتە: دڵبەری من وەك ئەشکەوتەکەی یارانی ئەشکەوت (أصحاب الکهف)ـە، یەکەمجار کە دیم دەرگای هەبوو و کراوە بوو، بەڵام لەو سەرەوە کە ویستم دەرچم، دیم دەرگا نەبوو. مەبەستی ئەوەیە هەر کەس گیرۆدەی عیشقی دڵبەر بێ، گرفتار دەبێ و ڕزگاربوونی بۆ نییە.

خانەیی (گم): مەسکەنی.

(٦) واتە: ئەمساڵ گیان و دڵم بە نرخی تاقە ماچێکی دوو ساڵیتر دەدەم، سەلەم و سەوزخڕ دەکەم. بەڵام لەمەیشدا هەر سەرنەکەوتم، سەودا و مامەڵەم لەم سەلەمەیشدا جێبەجێ نەبوو!

جان و دڵ ئەمساڵ بە نرخی بۆسەیی (پ، گم): گیان ئەدەم ئەمساڵ بە نرخی ماچێکی. بە مەشرووطی (نم): مەشرووعی.

(٧) مادەر: دایك.

واتە: چەرخی گەردوونی پیر کوڕوکاڵی ناچیز دەبینێ. ئەوەتە من کە زادەی ئەوم، گەنجیشم پیری بوو و خۆشیی تێدا نەبوو.

ناقابیل (گم): ناکامڵ، یانێ منداڵی ناتەواو. شەبابیش (نم): شەباشبیش. هەڵەی نووسینە.

(٨) شۆخی: گاڵتە. موخبیر: مەبەستی ئاگادارە.

**تووشی دەردێ هاتۆم "سالم!" لە عەهدی چاوی یار**
**شێخی صەنعان بەم سیاقە شێفتەیی تەرسا نەبوو (٩)**

واتە: ئەوەتا بەدکاری ناحەز گاڵتەم پێ دەکا و بە نەگبەتیم پێدەکەنێ! ئەی ئاسمان! ئەی چەرخ! تۆ بە ڕاست سەرمەوە ئاگاداری. تا بەختی بەدم بەم جۆرە هەڵگەڕاوە نەبوو، یار بەم جۆرە لەگەڵم دڵڕەق و بێبەزەیی نەبوو، منیش ڕۆژێکم هەبوو!

شۆخی (گم): شەرحی. تا وا (گم): ئاوا.

(٩) عەهد و چەرخ: سەردەم. بەم سیاقە: مەبەستی بەم جۆرەیە، بەم پێودانە.

واتە: لە سەردەمی جوانی و دەسەڵاتی چاوی یاردا تووشی دەردێ بووم، شێخی سەنعانیش بەو جۆرە گیرۆدە و سەرلێشێواوی دەستی دڵبەرە گاورەکەی نەبووبوو.

## -١٦- (*)

**دڵی شێرئەفگەنی من، صەیدی چ جادوویێ بوو؟**
**غوللی ئەم شێرە لە گێسوویی ئەوا موویێ بوو! (١)**
**شەوی حەیرانییی مووسایی خیرەد بۆ دەمی قورب**
**سووخْتەطوور، دڵئەفرووخْتەیی ڕوویێ بوو (٢)**
**یادی ئەحواڵی گرفتارییی ئەو عەهدە بەخێر**
**کە کەمەندی ملی من حەلقەیی گێسوویێ بوو! (٣)**
**نوێژی بێغایلە هەرگیز نەکْرا بۆ "سالم"**
**ڕووی دڵی شام و سەحەر مەیلیی ئەبروویێ بوو (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی ئەصڵەم.

(١) شیرئەفگەن: شێربەئەرزدادەر. غولـل: زنجیر، تەوق.

واتە: دڵی ئازای بەهێزی من بوو بە نێچیری چ جادووگەرێ؟ زنجیر و تەوقی ملـی ئـەم شـێرە – یانێ دڵـم– تاقە موویەك بوو لـە زوڵفی یار.

(٢) سووختەطوور: کێوی سووتاوی طوور. دڵئەفرووختە: دڵ داگیرساو و گڕگرتوو.

سالم لێرەدا عەقڵی خۆی شوبهاندووە بە مووسا (د.خ) و دڵیـشی بـە کێـوی (طـوور). وتوویـە: شەوی سەرگەردانیی عەقڵ و هۆش کاتی نزیکی بوو لـە یارەوە و (طوور)ی سـووتاو بریتـی بـوو لــە دڵێك کە بۆ دڵبەرێ داگیرسابوو.

سووختەطوور (کم، گم): سوختەیی طووری.

(٣) سالم ئەوەندە گیرۆدەی زوڵفی یار بووە، وتوویـە: یـادی ئـەو ڕۆژە بـەخێر، کـە کەمەنـد و زنجیری ملی من حەلقەی زوڵفی یار بوو.

عەهدە (کم، گم): وەختە. ملی (ق): دڵی.

(٤) واتە: لەبەرئەوەی دڵی سالم هەمیشە ڕووی لە برۆی یـارە، هـەرگیز نوێـژێکی بـێوتوویرە و ساغی بۆ نەکراوە.

هەرگیز نەکرا (کم، گم): نەکرا بە ئەبەد. مەیلی (ق): قیبـلەیی.

(*) -١٧-

**تا طاقە لە سینەم دڵی غەمدیدە لە کۆی توو**

**مەشغووڵە، وەکو کووکوویی وێرانە، بە کووکوو (١)**

**وەصڵت ئەمەری ڕەنجی منی زاری چ دێر دا؟**

**وەك مەوسیمی گوڵ، عەهدی چ دێر هات و چ زوو چوو! (٢)**

**بۆ تەرکی جەفا بێهودەیە لابەوو خواری**

**خۆ تا بە ئەبەد جەوهەر و قانوونە لەگەڵ ڕوو (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، عا، غ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

(١) طاق: تاق، تەنیا. (کووکوو)ی یەکەم: مەبەستی کوندەپەپووە. (کووکوو)ی دووەم: ئاوازی کۆتری کێویی خاڵەمل (فاختە)یە کە ڕەنگی خۆڵەمێشییە.

سالم سینەی بە کەلاوە و وێرانە شوبهاندووە و دڵی خەمباریشی بە کوندەپەپووی وێرانەنشین، کە خەڵك بە نەگبەتی دادەنێن. واتە: تا دڵی خەمگین لە وێرانەی سنگمدا بە تەنیایی بمێنێتەوە، هەمیشە وەك کوندەپەپووی وێرانەنشین خەریکی کووکووە.

((کووکوو))ی یەکەم -بەپێی ئەم لێکدانەوەیە- هەڵەیە، دەبێ یا (کۆکە) یا (کووکووە) بێ، کە هەردووکیان بە فارسی ناوی کوندەپەپوون (جُغد).

(٢) دێر: درەنگ.

واتە: گەیشتن بە تۆ درەنگ بەری منی لاواز و خەمباری بەدەستەوە دا، وەك گوڵ کە درەنگ پێ‌گەیشت و زوو لەناوچوو و ژاکا.

چ دێر (عا): چلۆن.

(٣) لابە: پاڕانەوەیە.

واتە: بۆ تەرکی ئازار لە لایەنی تۆوە پاڕانەوە و خۆکزکردن بێ‌سوودە، چونکە خوو و ڕەوشتی دڵبەر لەگەڵ ڕوخسارەکەی وەك جەوهەر و قانوونی نەگۆڕ وایە، تا ڕوویان ناسکتر و نازەنینتر بێ، دەبێ خوویان توندتر و ستەمکاتر بێ. ئیتر پاڕانەوە بێ‌سوودە.

خواری (غ): زاری. خۆ تا (عا): خو خو. (بیهدیە- بێهوودەیە) لە (مان)دا هەڵەی نووسینە.

**پڕموشکیله لەم حاڵە بکا چارەیی دەردم**
**بێ بۆیی شیفادارویی تۆ، فیکری ئەرەستوو (٤)**
**وا سیڕڕی ((هو الحق))، بە یەقین، کەشفە لە خاطر**
**هەر ((هو هو))ە شوغڵی دڵی غەمدیدە لەگەڵ ((هو)) (٥)**
**ئەبنای حەبەشی‌زادە چ مەقبوولە لە لای ڕووم؟**
**دانیشتوە بە زانووی ئەدەبا، چاکیری هیندوو (٦)**
**بۆ صیدقی قصەم بادی صەبا شاهیدە، با بێ**
**بێ بۆیە لە لای طوڕڕەیی تۆ، نافەیی ئاهوو (٧)**

(٤) پڕموشکیلە: زۆر گرانە. داروو: دەرمان. شیفادارو: دەرمانی شیفابەخش.

واتە: زۆر گرانە بیری ئەرەستوو، بەبێ بۆنی تۆ، کە دەرمانی شیفابەخشە، چاری دەردم بکا.

لەم حاڵە (غ): ئەم حاڵە. (ارسطو) شێوەنووسی نوسخەی (مان)ە.

(٥) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (عا، غ)دا پاش و پێشن.

هو الحق: سالم لەباتیی ((انا الحق))ی حالّی ((فنا في الله))ی سۆفییان بەکاری هێناوە. ئەم لێرەدا (هُوَ)ەی لەباتیی (انا) بەکارهێناوە، کە مەبەستی پێ دڵە. مەبەستیش لە (حەق)ەکەی ئەم خودا نییە، بەڵکوو یارە. (هو)ەی کۆتایی ضەمیری غائیبە و بۆ یار دەگەڕێتەوە.

پوختەی واتا: وا بە ڕاستی و دڵنیایی نهێنیی ((هو الحق)) و توانەوەی دڵدار لە زاتی دڵبەردا دەرکەوت. ئەوەتە کاری دڵی خەمباری ستەمدیدە هەمیشە هەر ((هووهوو))ە لەگەڵ یار و لە گیانی دڵبەردا مەحو بووەتەوە.

((هو الحق)). شێوەنووسی (عا): ((هو الە حق))ە، کە دەکاتە ((هو الە الحق)).

(٦) حەبەشی‌زادە: زنجیی پێست‌ڕەش. ڕووم: ڕۆم کە سپی‌پێستن. ئەبنا (ئەبناء): کۆی ئیبنە، یانێ کوڕان. زانوو: ئەژنۆ. چاکیر: خزمەتکار. هیندوو: زوڵفی ڕەش.

واتە: ئای، کوڕی ڕەش‌پێست لای ڕۆمییانی سپی‌پێست پەسەندە!! سەیر کەن زوڵفی ڕەش چۆن وەك خزمەتکار لە بەردەمی ڕوخساری یاردا بە ئەدەبەوە بە ئەژنۆدا هاتووە و لەسەر چۆك دانیشتووە.

حەبەشی‌زادە (غ): حەبەش‌زادە. (دانیشتوە) شێوەنووسی (عا)یە، لە (مان)دا (دانشتوە)ی. دیارە (عا) کە لە ١٣٢١ی کۆچیدا نوسخەکەی خۆی نووسیوەتەوە، نووسینەکەی لە هیی (مان) تازەتر و کوردیترە.

(٧) طوڕڕە: زوڵف. نافە: ناوك.

**"سالم" به سەرت تا (قەرەسوو)م لێوە دیارە**
**بارە لە دڵی خەستە، ئەلەم وەك کەلی (شاهوو) (٨)**

واتە: ناوکی ئاسك -میسك- لە چاو زوڵفی تۆدا بێ بۆنە. بۆ ڕاستیی ئـەم قـسەیەم بـای صـەبا شایەتە کە بۆنی زوڵفی یارم بۆ دێنێ، دە با بێت شایەتی بدا.

قصەم (عا): ڕووی گێسـووی. جوانترە.

(٨) قـەرەسوو: بەشێکی چەمی کەرخە کە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی کرماشانەوە سەرچـاوە دەگـرێ، پاش تێکەڵبوون بە ئاوی (گراب)، ناوەکـەی دەبێتـە قەرەسـوو و ڕوودەکاتـە باشـووری ڕۆژهـەڵات و دەڕژێتە چەمی (گاماسیاب). پاشان لـەگەڵ ئاوی (گشـانی) یەکانگیر دەبێ و چەمی (سەیمەرە) پێكدەهێنێ و لـە درێژەی ڕێڕەوی خۆیدا ناوی دەبێتە (کەرخە) و دەڕژێتە (هـور العظـیم). دیـارە بەیتەکـە هێمایـە بـۆ نامۆیی سالم لـە ئێران.

واتە: سالم، سوێند بە سەری تۆ، من لێرەوە تا ئاوی ڕەشم لێ دیارە و دەیبینم. ئـێش و ئـازار ئەوەنـدە لەناو دڵمدا کەڵەکە بووە، هێندەی چیای (شاهۆ) گەورە بووە و بەرز بووەتەوە.

-١٨- (*)

**ئەی ڕومووزی شەهریاری، واضیحە بۆ ڕایی توو**
**«زینت تاج و نگینت از گوهر والای تو» (١)**
**ظاهیری کرد شەعشەعەی خورشیدی نەصرت هەر طەرەف**
**«از کلاه خسروی، رخسار مەسیمای تو» (٢)**

(*) ئەم پارچەشیعرە نۆ بەیتییە تەنها لە (مان، ن، نم)دا هەیە و ناسناوی سالمیشی تێدایە. لە (مان، ن)دا هەر پێنج بەیتی هەیە و ناسناوی سالمیش نییە. شیعرەکە تێکڕا مولەممەعە و نیوە فارسییەکەی هی "حافظ شیرازی"یە و نیوە کوردییەکەیشی کە هی سالمە، زۆر لە نیوە یەکەمەکانی حافظەوە نزیکە و هەندێکی دەڵێی تەرجەمەیە!

شایانی باسە، بابەتی شیعرەکە ستایش و پێداهەڵدانە، بەڵام ئەم گەورەیە کێیە کە ئەم پێداهەڵدانەی بەنسیب بووە؟ نازانرێ. دوور نییە سالم تاریفی ئەحمەد پاشای کوڕی سلێمان پاشای بابانی لەم پارچەشیعرەدا کردبێ کە -لە ڕاستیدا- لە ئەهلی زانست و خوێندەواری بووە.

دەبێ بڵێین: هەرچەندە سالم شاعیرێکی سیاسی و نیشتمانپەروەر و بابانخواز بووە، پێداهەڵدان یا ناوهێنانێکی ئەحمەد پاشای لە هەموو ئەو شیعرانەی بەردەستدا نییە، بەڵام بەخێرهاتنەوەیەکی زۆر گەرمی لە عەبدوڵڵا پاشای بابان کردووە کە -گوایە- پاش ڕووخانی میرایەتیی بابان لە ئەستەمبووڵ ڕزگاری بووە و گەڕاوەتەوە بۆ نیشتمان. کێ دەڵێ ئەمەیشی لە ستایشی ئەودا نەوتووە؟

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) ڕومووز: کۆی ڕەمزە، نیشانە.

واتە: ئەی ئەو کەسەی کە نیشانەی پادشایەتی لە ڕا و ڕاوێژتدا ئاشکرایە، جوانیی تاج و بەخت لە گەوهەری بەنرخی بوونی خۆتەوەیە.

والای (ن): لالای. «نگینت» لای حافظ «نگین»ە.

(٢) ئەم بەیتە لە (مان، ن)دا نییە.

خورشید: خۆر. نەصر: سەرکەوتن. کلاه خسروی: کڵاوی شاهانە. مە سیما: شێوە وەك مانگ.

واتە: ڕوومەتی وەك مانگت، ورشەی خۆری سەرکەوتنی لە کڵاوی پادشاهانەوە بە هەموو لایەکدا دەرخست.

**مەسکەنی ئاسایش و جێگەی ئومێدە، هەر مەکان**
**«سایه اندازد همای چتر گردون‌سای تو» (٣)**
**ڕەمز و شەرع و حیکمەت و ئەشکال و جەبر و هەندەسە**
**«نکتهٔ هرگز نشد فوت از دل دانای تو» (٤)**
**بێتە گەردش یەك نیگەه، پەنجەی عەطارید سست دەکا**
**«طوطی خوش‌لهجه، یعنی کلكِ شکّرخای تو» (٥)**
**مەیلی سورمەی کێوی طوور ناکەم ئەبەد بۆ چاوی یار**
**«روشنائی‌بخش چشم ماست خاك پای تو» (٦)**

از. (نم): در. حافظ خۆی (از)ی وتووە!

(٣) سایە: سێبەر. اندازد: فڕێ دەدا. گردون سا: وەك چەرخی فەلەك بەرین و فراوان.

واتە: هەر شوێنێ هومای چەتری وەك گەردوون فراوانی تۆ سێبەری لەسەر بکا، دەبێتە شوێنی ئارامی و جێگەی هیوا.

سالم دەسەلات و فەرمانڕەوایی ستایشکراوەکەی بە هوما شوبهاندووە. دەڵێن هوما سێبەر لەسەر هەر کەسێك بکا، بەختەوەر دەبێ.

هەر مەکان (نم): هەر طەرەف. سایە اندازد (نم): سایە اندازت. هەڵەیە. سای (ن): رای.

(٤) دڵی دانا: دڵی زانا.

واتە: هەرچی ڕەمز و شتی نادیار و شەرع و فەلسەفە و زانیاریی ئاسمانناسی و جەبر و ئەندازە هەیە، لە دەستت دەرناچێ و نوکتەیێ نییە لە دەستی دڵی زانای تۆ دەرباز ببێ؛ یانێ تۆ زۆر زیرەکی و هەموو زانستێ دەزانی.

(جرّ و هندسی) لە (مان، ن)دا هەڵەیە و (جەبر و هەندەسە)ی نوسخەی (نم) ڕاستە.

(٥) گەردش: جووڵانەوە، سووڕانەوە. عەطارید: یەکێکە لە حەوت ئەستێرە گەڕۆکەکان. کلك: قەڵەم. شکرخا: شەکرخۆر، شیرین‌کەلام.

سالم قەڵەمی ستایشکراوەکەی بە تووتیی شەکرخۆر شوبهاندووە و وتوویە: قەڵەمی ئەو کە یەك سەعات بکەوێتە کار و دەست بداتە نووسین، پەنجەی عەتارید لە کەڵك دەخا و بەسەریدا زاڵ دەبێ. ئەڵبەت نووسینەکەی ئەو لە عەتارید جوانتر دەبێ.

(٦) ئەم بەیتە لە (مان، ن)دا نییە.

**شاهی ئەسکەندەر ئەوەی بۆی مرد و دەستی بۆ نەدا**
**«جرعهٔ بود از زلال جام جان‌فرسای تو» (٧)**
**عەرضوحاڵی هەر گەدایێ، گفت‌وگۆ مەعلوومە لێت:**
**«راز کس مخفی نماند با فروغ رای تو» (٨)**
**پادشاها! سەروەرا! "سالم" لە دەرگات کەوتووە**
**«بر امید عفو جان‌بخش گنه‌فَرسای تو» (٩)**

چشم: چاو. ما: ئێمە.

واتە: حەز لە سورمەی کێوی (طوور) ناکەم بۆ کلەی چاوی یار، خاکی بەری پێی تۆ ڕووناکی بە چاوی ئێمە دەبەخشێ و هیی کێوی (طوور)مان ناوێ.

(مااست) هەڵەیە و لە لای حافظ (اوست)ە.

(٧) ئەم بەیتە لە (ن)دا سێیەمە.

جرعه: قوم. زلال: ئاوی خۆش و سازگار. جان‌افزا: گیان‌زیادکەر، ژیانبەخش.

واتە: ئەوەی ئەسکەندەری (ذوالقرنین) بۆی دەگەڕا و دەستی نەکەوت، کە ئاوی زیندەگانییە، قومێك بوو لە ئاوی سازگاری جامی گیان‌بەخشی تۆ.

(افزای) لە هەرسێ نوسخەکەدا (فرسای)یە، دیارە هەڵەیە، چونکە فەرسا بە واتای لەناوبەرە. جگە لەوە، حافظ خۆی (ئەفزای)ی وتووە.

(٨) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (مان، ن)دا نین.

ڕاز: نهێنی. فروغ: ڕووناکی.

واتە: تۆ بەبێ پێوتن سکاڵا و عەرزوحاڵی هەموو گەدا و داماوێك دەزانی، چونکە نهێنیی هەر کەس هەرگیز لە ڕووناکیی بیر و ڕا و زیرەکیی تۆدا ناشاردرێتەوە.

(گەدایێ) بە (گەدا بێ) نووسراوە، کە گونجاو نییە.

(٩) گنه‌فرسا: گوناهلابەر.

واتە: گەورەم! سالم بە هیوای لێبووردنی گیانبەخشی گوناهلابەری تۆ لە بەردەرگاتدا کەوتووە.

## -١٩- (*)

**لێوی تۆ ئەو وەختە سەر ساغەر دەچوو**
**لێوی ساغەر خۆزگە لێوی من دەبوو! (١)**
**نابڕێ ئاوی حەیاتیش، تیشنەگیم**
**ئاوی تیغی تۆ مەگەر تەڕکا گەلوو! (٢)**
**چاوت، ئاخر، بۆ بە خوێنم تینووە؟!**
**قەد لە هیچ جێ نەبوە ئاهووی شێرْخوو! (٣)**
**زوڵفی وەك جەوشەنلەبەر کێ دیویەتی؟!**
**غەیری دڵبەر، کەس زرێ ناکا لە موو! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشیی مەحزووف.

(١) ساغەر: پیاڵەی مەی.

واتە: کە لێوی تۆ دەچووە سەر لێوی پیاڵەی مەی، خۆزگە لەباتیی لێوی پیاڵەکە لێوی من دەبوو.

ئەو (حا): لەو. لە (مان)دا کەوتووە.

(٢) تیشنەگی: تینوێتی. گەلوو: گەروو، قوڕگ.

واتە: تەنانەت ئاوی زیندەگانیش تینوێتیم ناشکێنێ، مەگەر ئاوی تیغی تۆ سەرم ببڕێ و قوڕگم تەڕ بکا.

(٣) واتە: ئاخر بۆچی چاوت بە خوێنم تینووە؟ هەرگیز و لە هیچ شوێنێکدا نەبووە ئاسك خووی شێری هەبێ.

شوێن (کم): جێ.

(٤) جەوشەن: کراسی زرێ.

واتە: کێ کەسێکی وەهای دیوە زوڵفی وەك کراسی زرێداری لەبەردا بێ؟ غەیری یار، کەس نییە کراسی زرێدار لە موو دروست بکا.

جەوشەنلەبەر کێ (کم): جەوشەن لە بەرگی. هەڵەیە.

**دڵ نەپەرژا تیری نازت بۆسە دا**
**وەك لە ئاوی دەی، بە پەڕڕان دەردەچوو! (٥)**
**"سالم"ی بۆ دڵ لە زوڵفا زەحمەتە:**
**جوملە ئەعضا زەخم و مەنزڵ موشكبوو (٦)**

(٥) ئەم بەیتە لـە (كم)دا نیـە.

بۆسە دا: بشارێتەوە.

واتە: دڵ فریا نەكەوت تیری نازت لای خۆی بشارێتەوە، وەك بەردی پان بە توندی لـە تـەختی ئاو درا و بە فڕین دای لـە دڵم و دەرچوو. دیارە كە بەردی پانی بچووك بە توندی لـە تەختی ئاوەكـە بدرێ، بە تیژی دەپەڕێتەوە.

(٦) ئەعضا: ئەندامەكان. مەنزڵ: ماڵ. موشكبوو: بۆن وەك بۆنی میسك.

واتە: زەحمەتە دڵ بە سەلامەتی لەناو ئەگریجەدا بهێنێتەوە. هەموو ئەندامەكانم برینـدارن و ماڵیـشم بۆنی میسكی گرتووە.

-٢٠- (*)

**کودوورەت کوشتمی یاران! لە دڵهادا صەفا کوێ چوو؟**
**جەفاجۆم جەمعی ئەحبابن! بڵێن ئاخر وەفا کوێ چوو؟ (١)**
**بە خوێنم تیشنە جەمعێکن کە هەر یەك خوێشخۆن ڕەسمەن!**
**میانجی بوو وەفا، هەستا لە بەینا، بەس حەیا کوێ چوو؟ (٢)**
**جەسارەت بەرزەخی شەرمی لە ڕووها دایە لا، هەر سوو**
**غەرەضها ئاشکارا بوو، لە دڵها مەیلەها کوێ چوو؟ (٣)**
**لە دڵما شەکوەها بوو، ئەی صەبا! تۆ موختەصەر بیڵێ**
**حوقووقی صوحبەتی دێرێن و ڕەنجی ساڵەها کوێ چوو؟ (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە بەشی (غزلهای جدیدە)ی (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) دڵها: دڵەکان، دڵی زۆر. جەفاجۆ: ئەوی ئازاردانی یەکێکیتری بوێ.

واتە: ماتی و خەمگینی کوشتمی، هاوڕێکانم! کوانێ پاکی و خاوێنیی دڵان؟ ئەوەی دەیەوێ ئازارم بدا، کۆمەڵی خۆشەویستانە. دە بڵێن، توو خودا وەفا بۆ کوێ چوو؟

(٢) تیشنە: تینوو. خوێشخۆ: خوێشخۆر، خزمخۆر. ڕەسمەن: رسماً، بە شێوەیەکی ڕەسمی. میانجی: ئەوی بکەوێتە نێوانی دوو کەس و بیانخاتە یەك و ئاشتیان بکاتەوە.

واتە: کۆمەڵێ بە خوێنم تینوون. هەر یەکێك لەوانە خزمخۆر بوون، وەفا لە نێوانماندا بوو، کەچی هەستا و ڕۆیی! ئەی حەیا و شەرم بۆ کوێ چوو؟

(٣) بەرزەخ: لێرەدا مەبەست هەر شتێکە کە لەمپەری نێوان دوو شت بێ. ڕووها: ڕووەکان. هەر سوو: بە هەموو لایەکدا. غەرەض: مەبەست و نیاز. ئاشکارا: ئاشکرا. دڵها: دڵەکان. مەیل: مەبەستی خۆشەویستییە.

واتە: پەردەی شەرم لە ڕووەکان لادرا و نیازی شارراوە دەرکەوت، چی لە دڵاندا بوو هەموو دەرکەوت! ئەی دۆستی و خۆشەویستی بۆ کوێ چوو؟

بە دوور نازانرێ لەباتیی (بەرزەخ) بەرقەع یا پەردە بووبێ. بەرقەع: واتە چارشێو، ڕووپۆش.

(٤) شەکوەها: سکاڵای زۆر.

واتە: دڵان سکاڵای زۆریان بوو. ئەی بای سەبا، تۆ بە کورتی بیڵێ، مافی هاوڕێیەتی کۆن و ڕەنجی ساڵانی پێشوو چیان لێ هات؟!

**چرای صەد قەصری دڵ کوژرا، هەتا یەك زاخە بوو مەعموور**
**بەرابەر زاخە ئاخێ کەن، چراغی قەصرەها کوێ چوو؟ (٥)**
**بە قەصدی کوشتنی "سالم" چ بێڕەحمانە کۆشیون؟!**
**حەدیثی ((یَرْحَم وتَرْحَم)) لە شەئنی ئاشنا کوێ چوو؟! (٦)**

(٥) کوژرا: کوژێنرایەوە. زاخە: زاغە، چوار دیواری تەنگ و پەرپووتی جێی ژیانی کۆچەران و هەژاران، عەماری ژێرزەمین، تەویلە، ئەشکەوت.

واتە: چرای سەد کۆشکی دڵی عاشقان کوژایەوە، تا کەلاوەیەك ئاوەدان بووەوە. ڕووبکەنە زاخەکە و ئاخ هەڵکێشن و بڵێن: کوا چرای کۆشکەکان؟ بۆ لەبیر چوون؟

(٦) واتە: ئەوانە چەند بێبەزەییانە هەوڵیان داوە بۆ کوشتنی سالم؟! ئەی فەرمایشتی ((یرحم وترحم)) دەربارەی ئاشنا و برادەران چیی لێ هات؟!

مەبەست لە ((یرحم وترحم)) عیبارەتی ((إرحَمْ تُرْحَمْ))، یا ((إرْحَموا مَنْ في الارض، يرحمكم مَن في السماء))، یا ((إرحَموا تُرْحَموا))وە. پوختەی مەبەست: بۆچی دۆستان ناوەڕۆکی ئەم فەرمایشتەیان لەبیر چووە؟!

وا بزانین سالم ئەم پارچەشیعرەی دەربارەی کۆمەڵێ دۆست و خزمی بێوەفا کە مافی دۆستایەتی و برادەریان ڕانەگرتووە، وتووە. دووریش نییە ئەمانە لە سلێمانی بووبن، کە بابان تێشکاوە، ئەوانیش هەموو شتێکیان لەبیر چووبێتەوە!

## -٢١- (*)

### (هجو بله سکه‌وان از گفته عبدالرّحمن بگ)

فه‌ڕه‌نگ و داسنیی و گه‌بری به‌دخوو،
نوصه‌یریی و ئه‌رووس و ده‌یله‌م و جوو (١)
به‌ حاڵی من نه‌بن هه‌رگیز ئه‌مانه
هه‌زار جار ئۆف، برایم ئاغا له‌ده‌ست توو! (٢)

(*) ئه‌م پارچه‌شیعره‌ له‌ (عا، ف، نم)دا هه‌یه‌. ئه‌م سه‌رناوه‌ هیی (عا)یه‌، واته‌ هه‌جووی بله‌ -یانێ ئیبراهیم- سه‌گه‌وان که‌ عه‌بدوڕڕه‌حمان به‌گ وتوویه‌. ئه‌ڵبه‌ت ئه‌و برایمه‌ ڕاوچی بووه‌ و سه‌گی ڕاوی ڕاگرتووه‌. هه‌روه‌ها له‌وانه‌یشه‌ (سوێسکه‌وان) بێ و سوێسکه‌ی ڕاگرتبێ. جا -هه‌رچۆن بێ- بابه‌تی شیعره‌که‌ داشۆرینی برایم ئاغایه‌ که‌ که‌و و سوێسکه‌ی ڕاگرتووه‌، له‌وانه‌یه‌ ده‌نگی سوێسکه‌ و که‌وه‌کانی هه‌راسیان له‌ ساڵم هه‌ڵگرتبێ. ئیتر ئه‌م برایم ئاغایه‌ کێیه‌ و له‌ کوێ بووه‌؟ دیار نییه‌. هه‌روه‌ك له‌ پارچه‌شیعره‌که‌دا ده‌رده‌که‌وێ، ئه‌م برایم ئاغایه‌، جگه‌ له‌ سوێسکه‌، حه‌وت که‌وی به‌م ناوانه‌ هه‌بووه‌:

١. که‌وه‌شین ٢. که‌وه‌لۆتی ٣. قاره‌مان ٤. قه‌جه‌ر ٥. شه‌پۆل ٦. که‌وه‌دۆم ٧. که‌وه‌لاڵ.

کێشی عه‌رووز: هه‌زه‌جی شه‌شیی مه‌حزووف.

(١) فه‌ڕه‌نگ: گاوره‌کانی ڕۆژاوا. داسنی: ئێزدی. گه‌بر: ئاگرپه‌رست. نوصه‌یری: کۆمه‌ڵه‌ خه‌ڵکێکن دانیشتووی شاخی عه‌له‌وییه‌کان و باکووری سووریان، دوور نییه‌ ئازارده‌ر و شه‌ڕانی بووبن. ئه‌رووس: مه‌به‌ستی عرووس، یانێ ڕووسه‌، که‌ هه‌میشه‌ له‌گه‌ڵ عوسمانی و ئێران له‌ شه‌ڕوشۆڕدا بوون و خه‌ڵکی موسوڵمان به‌ چاوی دوژمن سه‌یریان کردوون. ڕه‌نگیشه‌ مه‌به‌ست گه‌ڕووس بێ. ده‌یله‌م: به‌شه‌ شاخاوییه‌که‌ی وڵاتی گه‌یلانی باکووری قه‌زوێنه‌. هه‌ندێك له‌ دانیشتووانی ئه‌م ناوچه‌یه‌ ئیسلام بوون و له‌ خیلافه‌تی عه‌بباسییه‌کاندا کاریان کردووه‌.

واتای به‌یته‌که‌ له‌گه‌ڵ به‌یتی پاشه‌وه‌ی ته‌واو ده‌بێ. واته‌: فه‌ڕه‌نگ و داسنی و ئاگرپه‌رست و نوصه‌یری و ڕووس و ده‌یله‌می و جووله‌که‌، حاڵیان به‌ حاڵی من نه‌بێ! هه‌زار جار ئۆف له‌ده‌ست تۆ، ئه‌ی برایم ئاغا!

فه‌ڕه‌نگ و .. تاد (کم، گم): فه‌ڕه‌نگ و داسنی و ئه‌رمه‌نی و جوو، نه‌صیری و ده‌یله‌می و گه‌بری به‌دخوو. نوصه‌یری (عا): نوسه‌یری. ئه‌رووس (ف): عه‌رووس. ده‌یله‌م (ف): ده‌یله‌می.

(٢) واته‌: ئه‌وانه‌ که‌ ناوم هێنان حاڵیان به‌ حاڵی من نه‌بێ، چونکه‌ من گیرۆده‌ی ده‌ستی برایم ئاغام.

قوڕمساخە! ئەوەندە بەدسروشتە
بە دایم خوێڕییە وەك شبری سەر كوو (٣)
لە دەنگی جووڕەجووڕی سوێسكەكانی
دوگوێی سووكم بە جارێ هەردو كەڕ بوو (٤)
دەسا سەیر كەن لەبەر چینەی كەوی شین
كە عالەم گەردە هەروەك تۆزی هۆردوو (٥)
كەوی لۆتی! بە كەیفی خۆت بخوێنە،
خوا وای كرد كە حاڵی من وەها بوو! (٦)
ئیلاهی! قارەمان، قاڕەت نەمێنێ
چەقەڵ بدخوا سەر و سینە و پەل‌وپوو (٧)

ئۆف (ف): ئاخ.

(٣) قوڕمساخ: بێناموسی فڕوفێڵاوی. بەدسروشت: تەبیعەتخراپ. شبر: شێت و بێئاگا، دەوترێ شێت و شبر. كوو: كێو، شاخ.

واتە: ئەو قوڕمساخە ئەوەندە تەبیعەتی خراپە، بێكارە و تەوەزەل وەك شێت و شبری ڕووكردووە كێوان وایە.

قوڕمساخە (كم، گم): قوڕمساغە.

(٤) واتە: سوێسكەكانی ئەوەندە جووڕەجووڕیاریان كردووە، گوێم كەڕ بووە.

(٥) هۆردوو: سوپا. گەرد: تۆز.

واتە: وەرن سەیركەن چۆن لە چینەی (كەوەشین) جیهان بووەتە تۆز، وەك سوپا هەڵسابێ و تۆزی سمی ئەسپ بەری ئاسمانی گرتبێ.

دەسا (كم، گم): وەرن. هۆردوو (كم، گم): ئۆردوو.

(٦) ئەم بەیتە لە (كم)دا چواردەیەمە.

واتە: وەك چۆن ڕێڕۆیشتنی لەشكر تەپوتۆزێكی زۆری لێ هەڵدەستێ، كەوەشینیش بە چینەكردن ئەو ناوەی كردووە بە تۆز و خۆڵ.

لۆتی (عا): سوطی!

(٧) ئەم بەیتە لە (كم)دا پازدەیەمە.

بدخوا: بتخوا.

برایماغا لە قوڕ نیشێ سەراپا
وەکوو باب‌مردووان بۆت کا خوداڕوو (٨)
قەجەر! ناوت بە چاوی خۆم ببینم
کە قوشچی بازی تێبەردا بە قووقوو (٩)
شەپۆلت زۆر کەوی چاك و پەسەندە،
شەپۆل دا سا لە خوێنیا ئەی خودا! زوو (١٠)
کەوی دۆمت شەڕانی و کەوبەزێنە
ئیلاهی! دۆمەژن لێت نێ بە کاردوو (١١)

واتە: خودایە قارەمان! -کە ناوی یەکێکە لە کەوەکانی برایم ئاغا- دەنگت نەمێنێ و چەقەڵ سەر و سنگ و پەلوپۆت بخوا.

(قارە) لەناو کوردەواریدا بۆ باڵندە بەکار نایێ، بەڵام دیارە سالم ئەوەندە لە کەوەقارەمان وەڕس بووە، بە باڵندەی حسێب نەکردووە، یاخۆ وشەی (قارە)ی لەبەر نزیکی لە وشەی قارەمانەوە بەکارهێناوە و وشەئارایی کردووە.

ئیلاهی.. تاد (کم، گم): ئیلاهی قارەکەرتان قەت نەمێنێ، چەقەڵ بیخوا سەر و سینگ و پەلوپۆ. بدخوا (ف): بتخوا.

(٨) ئەم بەیتە لە (کم)دا شازدەیەمە.

سالم هێشتا ڕووی قسەی لە کەوەقارەمانە و دوعای لێ کردووە و وتوویە: خودایە بمری و برایم ئاغایش وەك باب‌مردوو خۆی لە قوڕ هەڵکێشێ و ڕۆڕۆت بۆ بکا.

(٩) ئەم بەیتە لە (کم)دا شەشەم بەیتە.

قوشچی: ئەوی بازی ڕاو ڕادەگرێ.

واتە: کەوەقەجەر، بتبینم بازەوان بە قووقوو بازت تێبەردا.

(١٠) واتە: ئەو کەوەت کە ناوی شەپۆلە و زۆر لات خۆشەویستە، خودایە زوو بە زوو لەناو خوێنی خۆیدا شەپۆل بدا.

زۆر کەوی (کم، گم): شەڕکەر و. لە خوێنیا ئەی خودا (ف): لەنێو خوێندا خودا. (کم): لە خوێنیا یا خوا.

(١١) کاردوو: گیایەکی گەڵاپانە لەناو سماقاودا زەردی دەکەن و بە چێشتی لێ دەنێن. دۆمەژن: ژنی دۆم.

**کەوەلالّت -مەظەننە- زۆر عەزیز بوو**
**شوکر بۆیە لە بەر بینی دەرات لوو (١٢)**
**بە غەیرەز ئەم کەوانە، باڕەکانیش**
**بە مردوویی لە دەوری تۆ بکەن بوو (١٣)**
**خوداوەندا! غەضەب بۆیان بباریّ**
**بە یەك شەو خاص و عامیان بن قەلاّچوو (١٤)**
**کەو و سویّسکە و قەفەس دانیّن لە لاییّ**
**دەلّی زەرد و برایماغاش بە مردوو (١٥)**

سالم لەبەرئەوەی کەوەکە ناوی کەوەدۆمە، ژنەدۆمی پەسەند کردووە بۆ لیّنانی. وتوویە: کەوەدۆمت شەڕەنگیّز و ئازایە، خودایە ببەزیّ و وەك چۆن ژنەدۆم کاردوو لیّ دەنیّ، ئەویش بکوژریّ و لیّی بنیّن بە چیّشت.

(١٢) مەظەننە: باقلّم، لام وایە. بین: قورِگ. لوو: گریّ (غُدّة).

واتە: کەوەلالّت -وابزانم- زۆر لات خۆشەویست بوو، بۆیە لوو لە بەربینی دەرهاتووە و ناتوانیّ بخویّنیّ.

مەظەننە (کم، گم): مەزەندە. عەزیز بوو (ف): عەزیزە. دەرات لوو (کم، گم): دەراتبوو.

(١٣) بارِ: بیّچووە کەو.

واتە: جگە لە نەمانی ئەم کەوانەت، خودا بکا هەرچی بیّچووەکەویشت هەیە، هەموو بمرن و لە دەوروبەری تۆ بۆگەن بکەن.

باڕەکانیش (ف): سویّسکەکانیش. بە مردوویی .. تاد (ف): بە مردوویی لە دەوری تۆ بکەن گوو. (کم، گم): سەری ئاغا بە .. ی ژنیدا چوو.

(١٤) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا نییە.

واتە: خودایە! غەزەبیان لیّ بباریّ و چاك و خراپیان بە شەویّك قەلاّچۆ بین.

(١٥) ئەم بەیتە لە (ف)دا نییە.

واتە: غەزەبەکە بە جۆریّ بباریّ کە کەو و سویّسکە بە مردوویی لە لایەك و قەفەزی چۆلّ لە لایەك، دیّلّەسەگە زەرد و برایم ئاغایش بمرن.

لاییّ (کم، گم): هەرلا.

**لەسەر من عەهد و شەرط و فەرض و قەرض بێ**
**ئەگەر حاڵی برایماغا وەها بوو (١٦)**
**بە سورمەی شادییانە هەردو چاوم**
**وەهای ڕەش کەم وەکوو پەڕڕی پەرەستوو (١٧)**

دەڵی (کم): دلی و. (گم): دلّی. دیارە شێوەنووسی کۆن لە (عا)دا زیاتر «دەڵی» هەڵدەگرێ، کە بۆ ئەم جێیە گونجاوە.

(١٦) واتای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوە بەستراون.

عەهد و شەرط و .. تاد (ف): عەهد و شەرط و قەرض و فەرض بێ. (کم): قەرض و فەرض و شەرط و عەهد بێ. (گم): قەرز و فەرض و شەرط و عەهد بێ.

(١٧) سورمە: کلە. شادیانە: کە لە شادیدا بەکار دەهێنرێ. یاخۆ «شادیە»، وەك «شادنە»، بە دەرمانی چاو دەوترێ. پەرەستوو: پەڕەسێلکە.

واتە: ئەگەر کاروباری برایم ئاغا بەم جۆرە بڕوا، کە من ئاواتەخوازیمی، پەیمان و پێویست و قەرزبژاردنەوە بێ لەسەرم کە لە خۆشیدا چاوم وەك ڕەشیی پەڕی پەرەسێلکە بە کلە ڕەش بکەم.

بە (کم، گم): لە. شادییانە (کم، گم): شادمانی. وەهای (کم، گم): وەها. پەرەستوو (عا): پەرەسطوو.

شایانی باسە، سالم لەم پارچەشیعرەدا ناسناوی خۆی دانەناوە. بەڵێ، سالم کەم ناوی خۆی لە شیعری داشۆریندا هێناوە.

-٢٢- (*)

**به حەسرەت ئەشکی ئاڵم دێتە سەر ڕوو**
**بەسەر ڕووتا کە ئیفشا بوو سەحەر، موو (١)**
**دەکا "شیرین" بە عاشق، گۆشەگیری**
**لە کونجی لەعلی لێوت، خاڵی هیندوو (٢)**
**دەزانن خەرمەنی من بۆ گڕی بەست؟**
**بپرسن گەر لە یاری ئاتەشیخوو (٣)**
**لە کوێ بێنێ ئیشارەی چاوەکانت،**
**ئەگەرچی مەستە وەك ئەو، چاوی ئاهوو (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، ف، غ، ق، ڕ، کم، گم)دا هەیە و ناسناوی سالمی تێدا نییە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) ئیفشا: دەرکەوتن.

واتە: سەرلەبەیانی کە مووی زوڵف و پەرچەمت بەسەر ڕوخسارتدا بڵاو بووەوە، فرمێسکی سوورم لە داخ و خەفەتدا دێتە سەر ڕوومەتم. مەبەستی ئەوەیە لە بینینی ڕوخساری یار بێبەش بووە، یا پێی ناخۆشە زوڵف ڕوخساری یار بگرێتە ئامێز و ئەم لێی بێبەش بێ.

ئیفشا بوو (ف، ق): ئیفشا بێ.

(٢) واتە: جوانیی شێوەی گۆشەگیریی خاڵی تۆ لە گۆشەی لێوی وەك لەعلی ئاڵتدا، شێوەی گۆشەگیریی بۆ عاشق شیرین کردووە.

لەعلی (غ): خاڵی.

(٣) واتە: ئەگەر لە یاری تووڕەی خووئاگرین بپرسن، دەزانن خەرمانی دڵی من بۆچی گڕی گرت و سووتا؟ ئاگری یارە و بەریداوەتە دڵی عاشق.

گڕی (کم، گم): گڕەی. ئاتەشیخوو (کم، ق): ئاتەشینخوو.

(٤) ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی لە (ق)دا نین.

واتە: ڕاستە چاوی ئاسك مەستە و جوانە، بەڵام لە کوێ دەتوانێ ئیشارەی چاوەکانت بێنێ، ئەو ناتوانێ ئیشارە بکا.

**به مەرگی تۆ، لەبەر تۆ شەو بە میحنەت**
**سەرم نابینێ بەستەر، غەیری زانوو (٥)**
**دەناڵێنێ دڵی زارم وەکوو زیر**
**لە شاما شانە کەی، گەر شامی گێسوو (٦)**
**عەجەب ئاسایشێکم دی لە هیجرت!**
**لە خارا ڕەقترە بۆ من پەڕی قوو! (٧)**

کوێ (کم، گم): کوێی. چاوەکانت (غ): چاوی مەستت.

(٥) بەستەر: سەرین. زانوو: ئەژنۆ.

واتە: بە مەرگی تۆ قەسەم، شەو سەرم لەبەر مەینەت و خەم و پەژارە سەرین نابینێ، هەر لەسەر ئەژنۆیە!

تۆ شەو (کم، گم): تۆشە.

(٦) زیر: سازێك بووە ئاوازێکی نەرم و ناسکی لێ هەستاوە، دەنگی پەست و نازکی دژی (بەم)یشە. (شام)ی یەکەم: سەرەتای شەو. شامی دووەم: شەو و تاریکییە.

واتە: ئەگەر لە سەرەتای شەودا بە شانە زوڵفی وەك شەو ڕەشت دابێنی، دڵم وەك زیر دەناڵێنێ.

(٧) خارا: بەردی سەختی لەشکاننەهاتوو. قوو: مراوی.

واتە: سەیرە! چاك لە دووریتدا حەسامەوە! ئەوەندە ماندووم پەڕی قوو بۆ سەرینی ژێر سەرم لە بەردی خارا ڕەقتر و سەخترە و خەو ناچێتە چاوم.

ڕەق (عا): زەق.

## -٢٣- (*)

**وێڵ و فیراری عیشقی تۆم، شەهر بە شەهر و سوو بە سوو**
**پوشتە بە پوشتە، تەل بە تەل، دەشت بە دەشت و کوو بە کوو (١)**
**قەیدە لە گەردنی دڵم زوڵفی سیاهی پڕخەمت،**
**حەلقە بە حەلقە، چین بە چین، عوقدە بە عوقدە، موو بە موو (٢)**
**تەنگدەهانیی دڵبەرم حەسرەتی دا بە گوڵڕوخان**
**وا دڵی غونچە بوو بە خوێن، پەردە بە پەردە، توو بە توو (٣)**
**کەوتە کەناری موڵکی ڕووم، جۆششی ئەشك و مەوجی خوێن**
**سەیل بە سەیل و شەط بە شەط، دەجلە بە دەجلە، جوو بە جوو (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (کم، نم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەجەزی هەشتیی مەتویی مەخبوون.

(١) شەهر: شار. سوو: لا. پوشتە: تەپۆڵکە. تەل: گرد، تەپە. کوو: کێو.

واتە: وێڵ و سەرگەردان و هەڵاتووی عیشقی تۆم، شار بە شار، لا بە لا، تەپ بە تەپ و کێو بە کێو، لە هەموو شوێنێك سەرگەردانم.

شەهر بە شەهر (کم، نم، گم): دەشت بە دەشت.

(٢) واتە: حەلقە بە حەلقە، چین بە چین، گرێ گرێ، تاتای مووی زوڵفی ڕەشی پڕ لە پێچت بووەتە زنجیری گەردنی دڵم.

(٣) دەهان: دەم. گوڵڕوخ: گوڵڕوو- ڕوومەت جوانی وەك گوڵ.

واتە: بچووکی و تەسکیی دەمی یارم، خەفەتی دەرخواردی هەموو جوانان دا. پەرەپەرە و توێتوێی دڵی غونچە لە پەژارەدا بوو بە خوێن.

دا بە (گم): دایە.

(٤) واتە: جۆشی فرمێسك و شەپۆلی لافاو و ڕووبار، دیجلە بە دیجلە و جۆگە بە جۆگە دەوراندەوری موڵکی ڕووم یا ڕۆمی داگیر کرد.

شایانی باسە، وشەی (ڕووم)، مانای ڕوومەتم، یا ڕۆم -موڵکی ڕۆم- هەڵدەگرێ.

کەوتە کەناری موڵکی ڕووم جۆششی ئەشك و مەوجی خوێن (کم، نم، گم): جۆششی ئەشك و مەوجی خوێن کەوتە کەناری موڵکی ڕووم.

**چەرخی زەمانە کەی دەدا بەزمی ویصالی یار و من؟!**
**بۆسە بە بۆسە، لەب بە لەب، دیدە بە دیدە، ڕوو بە ڕوو (٥)**
**نەفحە بدا لە عەطری زوڵف، لەو دەمە بۆ دەماغی خوشك**
**تەپلە بە تەپلە، موشك بە موشك، نافە بە نافە، بوو بە بوو (٦)**
**خەرمەنی "سالم"ی فەقیر سووخْتەیە بە ناری عیشق**
**خۆشە بە خۆشە، گوڵ بە گوڵ، دانە بە دانە، جوو بە جوو (٧)**

(٥) واتە: چەرخی ناهەمواری زەمانە کەی ماوەی بەزمی بەیەك‌گەیشتنی من و یـار دەدا، تـا مـاچ لەگەڵ ماچ و لێو لەگەڵ لێو و چاو لەگەڵ چاو، ڕوخسار بە ڕوخسار بگا؟!

(٦) تەپلە: پێچ.

ئەم بەیتە تەواوکەری بەیتی پێشووە، یانێ چەرخی زەمانە کەی ڕێی ئەوە دەدا عەتری زوڵفـی یـار لە ساتی بەیەك‌گەیشتندا بۆنوبەرامەی پێچ بە پێچی زوڵف و میسکی ناوکی ئاسك و هەموو بـۆنێکی خۆش بە دەماغی وشکم بدا.

نەفحە (کم، نم): نەفخە. هەڵەیە.

(٧) سووختە: سووتاو. خۆشە: چەپك، هێشـوو. جوو بە جوو: کەم کەم.

واتە: خەرمانی سالمی هەژار، چەپك بە چەپك، گوڵ بە گوڵ، دانە بە دانە و کەم کەم بـە نـاگری عیشق سووتا.

## -٢٤- (*)

**دا بێنه به پەهلوویی ڕوخا، حەلقەیی گێسوو**

**مەطبووعه به ئەطرافی گوڵا، سونبولی خۆشبوو (١)**

**ئەندازەیی حەوشی حەرەم و جیلوەگەریی یار**

**دێنێته نەظەر دەشتی خەتاوو ڕەمی ئاهوو (٢)**

**خۆ زوڵف و ڕوخی ضیددی یەکن، سیحره که سازان!**

**خستوویەته ژێر ماری سیەه، دۆشەکی پشکوو (٣)**

**بۆ ظوڵمی لەئەندازەبەدەر وەك یەکی خوڵقاند،**

**خەللاقی ئەزەل مەشرەبی تۆ و طەبعی هۆلاکوو (٤)**

**دەستم به فەریبت که شکا، حەسرەتی ناخۆم**

**ئەڵبەتته شکاندووته، دەبێ بیخەیه ئەستوو (٥)**

(*) ئەم پارچەشیعره لە (مان، ن، حا، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

(١) واته ئەڵقەی زوڵفت به پاڵی ڕوخسارتدا دابێنه، دەڵێی سونبوڵی بۆنخۆشه به دەوری گـوڵی سووردا، که گۆنای یارە.

دا بێنه (ق): وا بێـنه. ڕوخا (حا): گوڵا. هەڵەیە. سونبولی (ق): غونچەیی.

(٢) واته: حەوشی ماڵی یار، به پانی و گوشادی لەگەڵ شـێوەی دەرکـەوتن و خۆنوانـدنی یـار، دەڵێی دەشتی خەتا و سڵەمینەوەی ئاسکه.

جیلوەگەریی (کم): جیلوەی گڕی. (ق): جیلوەگەهینی. هەڵەیە.

(٣) واته: خۆ زوڵف و ڕوومەتی یار دژی یەکتڕن، ئەی چۆن پێکەوە گونجان؟

(خۆ) لە (ن، ق)دا کەوتووە. ڕوخی (کم، گم): ڕوخت. خستوویەته (کم، گم): خستووەته!

(٤) واته: خودا، بۆ ستەمی لەئەندازەبەدەر، خووی تۆ و خووی هۆلاکـۆی خوێنڕێـژی وەك یەك خوڵقاند.

(یەکی) لە (حا)دا کەوتووە.

(٥) فەریب: فریو، خەڵەتاندن. ئەستوو: مل.

واته: خەفەت ناخۆم بۆ ئەوەی دەستم به فێڵی تۆ شکا. ئەڵبەت که خۆت شکاندووته، دەبێ بیخەیته

**حاصڵ لە یەکێکایە، پەشیمانییە دوومەیل**
**جێی نابێ لە کولبەی دڵما خەڵوەتی دووڕوو (٦)**
**مینادڵیی و بازییی وەصڵت لە میانا**
**ئەو شیشەیە دەشکێنێ، یەقین، "سالم"ی بەدخوو (٧)**

ملی خۆت، چش با بشکێ! زۆر جوانە، دەستی شکاو بە ملی خاوەنەکەیەوە دەبەسترێ، دەستەکە هی سالمە و دەبێ بە ملی خۆیەوە ببەسترێ، بەڵام ئەم بە یاری وتووە: گوناهی خۆت لە ئەستۆی خۆت، دەستی تۆ شکاندووی من بە ملی تۆ.

ئەڵبەتە (کم، گم): خۆت چونکە. (ق): ئەڵبەت کە. (اسطو) شێوەنووسی نوسخەی (مان)ە.

(٦) ئەم بەیتە لە (ق)دا نییە.

حاصڵ: بەرهەم. کولبە: کاولە، وێرانە.

سالم ویستوویە یارەکەی هەر بۆ خۆی بێ، یاری دووڕوو لە کاولە دڵەکەیدا نەبێ، وتوویە: بەرهەم و سوودی من لە تاقە یارێکدایە، دوومەیلی پەشیمانیی لە دوایە. کەواتە یار یا دەبێ بۆ من بێ، یا بۆ ڕەقیبی بەدکار.

لە یەکێکایە، پەشیمانییە (حا): لە یەکێکە نە. هەڵەی نووسینە. (کم، گم): لە یەکێکا بە پەشیمان نییە.

زۆر جوانە، واتە: ئەی یار! پوختەی مەبەست ئەوەیە کە لە یەك دڵدا بە: یا دڵی من، یا دڵی بەدکار.

(٧) مینا: ئاوێنە، شووشە.

واتە: دڵی سالم مینایە، ئاوێنەیە و یاری کاتی بەیەك گەیشتنت لەناودایە. بێگومان سالمی بەدخوو ئەم دڵە دەشکێنێ و بە ڕەحەتی دانانیشێ. بەم جۆرە دڵەکە هی سالمە. لەوانەیشە لە (دڵی) مەبەستی دڵی یار بێ و بە غائیبی دانابێ، دوایی بە شێوەی ئاوڕلێدانەوە (ئیلتیفات) یاری بە قسەبۆکراو (مخاطب) دانابێ. ئەمەیش جۆرە جوانکارییەکی زانستی بەدیعە. یا مەبەستی ئەوەیە: ئەی یار! تۆ دڵت مینای سافی بێگەردە و یاری بەیەك گەیشتنت لەمیاندایە. دەترسم سالمی بەدخوو دڵت ڕانەگرێ و بیشکێنێ و لە ئەنجامدا لێم بڕەنجێ.

مینادڵیی و بازییی (ق): مینایی لەب و بازیی. میانا (ن): میانە.

-٢٥- (*)

یاری ساحیرنەژادی سیلسیلەموو
دڵی بردم بە دیدەیی جادوو (١)
دڵی ڕەوشەن مەکانی لەیلایە
مونعەکیس بوو میانی ئاینەڕوو (٢)
«بعد ازین» کاری من بە زوننارە
دینی بردم نیگاهی تەرساخوو! (٣)
هەڵسە، ئەی دڵ! بچینە لای مەجنوون
ڕشتەیی عاقڵیی لەدەست دەرچوو! (٤)

(*) ئەم چوار تەرجیعبەندە لە (مان، ن، حا، غ، ڕ، کم، نم، گم)دا هەیە، سێیەمیان نەبێ کە لە (کم)دا نییە. لە (مان، ن)دا خراوەتە خانەی «تەرجیعات». لەبەرئەوە ناوی تەرجیعاتی لێ نراوە، کە چەند پارچەشیعرێك لە پیتی جیاجیا هەن، بەڵام هەموویان بەم بەیتە دواییان پێ هاتووە: «هەر یەکێکە خودایی حەق، نەك دوو ** وَحْدَهُ لا إله إلاّ هو». دەتوانین بڵێین شیعرێکی ئایینییە. کێشی عەرووزی یەکەم و دووەم: خەفیفی شەشی مەخبوونی ئەصڵەم، سێیەم: خەفیفی شەشی مەخبوونی مەحزووف و چوارەم: خەفیفی شەشی مەخبوونی مەقسوورە.

(١) نەژاد: ڕەگەز.

واتە: یاری بە ڕەچەڵەك سیحربازی زوڵف وەك زنجیر، بە چاوی ئەفسووناویی دڵمی بەرەو لای خۆی ڕاکێشا.

دیدەیی (کم، نم، گم): نێرگسی.

(٢) واتە: دڵی ڕووناك جێگەی لەیلایە، بەهۆی بوونی ئەوەوە ڕووناکە. دیارە دڵی من لە پاکی و وەفاداریدا وەك ئاوێنەیە و ڕوخساری یاری تێدا دەبینرێ.

(٣) بعد ازین: لەمەوپاش. زوننار: ملەوانەیەکە بتپەرست و ئاگرپەرست دەیکەنە ملیان. تەرسا: بە ئاگرپەرست و گاوریش دەوترێ.

واتە: لەمەوپاش دەبێ زوننار هەڵگرم، چونکە نیگا و ڕوانینی ئەو ئاگرپەرستخووە ئایینی بردووم.

(٤) واتە: ئەی دڵ! ڕشتەی هۆش و فام پچڕا، کار لە کار ترازا و عەقڵ لەدەست دەرچوو. کەواتە هەستە بچین بۆ لای مەجنوونی دێوانەی هەردەگێڵ، ماوەی ژیری نەما.

دڵی پێکا بە عیشوە، تیری موژە
تورکئەندێشەیی کەمانئەبروو (٥)
کەرەمی کرد سیاهیی و مەستی
نەرگسی ئەو، بە دیدەیی ئاهوو (٦)
باد، ئەگەر ڕێی نییە بە طورڕەیی یار
بۆ دەماغم بە بۆ موعەططەر بوو (٧)
مەستییی من وەرایی یارانە
«ساقیا! خمْ بِدِهْ بە جای سَبُو» (٨)

ئەی دڵ (حا): یەکدەم. «دڵ» لە (غ)دا کەوتووە. لەدەست (کم، نم، گم): لە دەس.

(٥) عیشوە: ناز. تورك: دڵبەر، مەبەستی ستەمکارە.

واتە: یاری ستەمکاری ستەمئەندێشە بە تیری نازی برژانگی دڵمی پێکا و سمی.

پێکا (کم، نم، گم): پێکام. عیشوە، تیری (غ): عیشوە و تیری. هەڵەیە. موژە (حا، ڕ، کم، نم، گم): موژەی. تورك (کم، نم، گم): تورکی.

(٦) سیاهی: ڕەشی. نەرگس: مەبەستی چاوی مەستی یارە.

واتە: چاوی مەستی وەك نێرگزی یار، ڕەشی و مەستیی بە چاوی ئاسك بەخشی. چاوی ئاسك لە یارەوە ڕەشی و مەستیی دەستکەوت.

نەرگسی (کم، نم، گم): نێرگسی. ئاهوو (ڕ، کم، نم، گم): جادوو!

(٧) باد: با، سروە.

واتە: ئەگەر با ڕێی ناکەوێتە زوڵفی یار و بەوێدا تێناپەڕێ، ئەم بۆنی عەترە چییە لە دەماغی مندا؟

باد (کم): با. هەڵەیە. (گم): باز. بە طورڕەیی (حا، ڕ):لە طورڕەیی.

(٨) ئەم بەیتە نیوەی یەکەمی کوردییە و نیوەی دووەمی فارسی.

وەرا: مەبەستی جیایە، یا هەر مەبەستی دوایە. خوم: کووپەی مەی. سەبوو: کاسەی مەی.

واتە: مەستیی من جیایە لە مەستیی یاران، یا مەستیی من لە دوای مەستیی یارانە. لەباتی کاسە، بە کووپە شەرابم بدەرێ، بەوە نەبێ مەست نابم.

وەرایی (ن): وایی. هەڵەی نووسینە. ساقیا.. تاد (گم): ساقییا خوم بدە بە جامی سەبوو! ساقییا .. سبو (ڕ): ساقییا .. صبور. هەڵەیە.

**گڕی بەست دڵ بە شەو لە نەشئەی ڕام**
**هاتوچۆم بوو لە مەستییا هەر سوو (٩)**
**شەهپەڕی دا لە دڵ، خەرووسی سەحەر**
**دای غوباری کودوورەتم، جاڕوو (١٠)**
**چووە سەر شاخی گوڵ، وتی بولبول**
**هەر کە زانیی لە داوی شەو بەربوو: (١١)**
**هەر یەکێکە خودایی حەق، نەك دوو**
**«وحده لا إله إلاّ هُو» (١٢)**

**

**بازْ دڵ بێقەرار و شەیدایە**
**شێفتەیی زوڵف و خاڵی لەیلایە (١٣)**

(٩) ڕام: شاد، کەیف‌خۆش. هەروەها ناوی دڵداری «وەیس»ە، کـە هەمیـشە شـاد و سـەرخۆش بووە و بە "ڕامین" ناوی دەرکردووە. سوو: لا.

واتە: دڵم، شەو بە نەشئەی وەك نەشئەی شادمان یا وەك نەشئەی ڕام ئاگری تێبەربوو و لـە مەسـتیدا بە هەموو لایەکدا هاتوچۆم بوو.

«ڕام» هەڵدەگرێ «زام» بووبێ، واتە: زەخم.

ڕام (حا): ڕاه. هاتوچۆم (کم، گم): هات‌وچۆ. لە مەستییا (ڕ): لـە مەستیدا.

(١٠) شەهپەڕ: یەکەم پەڕی باڵی باڵدار. خەرووس: کەڵەشێر. جاڕوو: گـسـك.

واتە: کە کەڵەشێری بەرەبەیان خوێندی، شاپەڕی دا لـە دڵم و تۆزی خەم و پەژارەی گسـك دا.

شەهپەڕی (کم، نم، گم): شاپەڕی. دا (کم): وا. دای .. جاڕوو (کم، نم، گم): وای .. جادوو!

(١١) ئەم بەیتە لـە (کم، گم)دا نییە، لـە لایەنی واتاوە بە بەیتی دواوە بەستراوە.

شاخ: لق.

«سەر» لـە (غ)دا کەوتووە.

(١٢) واتە: هەر کە بولبول لـە داوی تاریکی نارەزای شەو ڕزگار بوو، چووە سـەر لقـی گـوڵ و وتی: خودای حەق هەر یەکێکە، نەك دوو «وَحْدَهُ لا إلهَ إلاّ هو».

(١٣) باز: دیسان. بێقەرار: بێئارام. شیفتە: شێواو.

بێ ڕەوانم، ئەگەر نەدا بۆسە
لەبی دڵبەر، مەگەر مەسیحایە؟! (١٤)
هەر ثەمەر دڵ هەوا دەکات دەستکەوت
وەصڵی دڵبەر درەختی طووبایە! (١٥)
ئەی صەبا، لادە موو لەسەر چیهرە
مەرگی عاشق شەبانی یەلدایە (١٦)

واتە: دیسان دڵ بێئارام و سەوداسەرە، شێواوی زوڵف و خاڵی لەیلایە.

باز دڵ بێقەرار (کم، نم، گم): بازی دڵ بێقەرار. شێفتەی (ڕ): سیفتەی. هەڵەیە. زوڵف و خاڵی (ن، ڕ): خاڵ و زوڵفی.

(١٤) دووەم نیوەی بەیتی پاشەوەی لە (مان، حا)دا نەبێ، لەوانیتردا خراوەتە سەر یەکەم نیوەی ئەم بەیتە و دوو نیوەکەیتر کەوتووە.

ڕەوان: گیان. بۆسە: ماچ. لەب: لێو. مەسیحا: عیسا پێغەمبەر.

واتە: ئەگەر دڵبەر ماچم نەداتێ، بێگیانم و دەمرم. بۆچی لێوی دڵبەر مەسیحە مردوو زیندوو بکاتەوە؟!

(١٥) ئەم بەیتە لە (کم، نم، گم)دا نییە.

ثەمەر: بەر، بەرهەم. هەوا: ئارەزوو، حەز. وەصڵ: بەیارگەیشتن. طووبا: درەختێکی بەهەشتە، میوەی جۆراوجۆری بۆنخۆشی هەیە و لقی دەگاتە هەرماڵێکی بەهەشتی.

واتە: دڵ هەر میوە و بەرێکی حەز لێ کردبێ، دەستی کەوتووە، چونکە بە یار گەیشتووە و وەك ئەوە وایە درەختی تووبای هەبێ.

هەر ثمەر .. تاد (حا): هەر ثمەر دڵ هەوا دەکا.

(١٦) صەبا: بای لە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە هاتوو. چیهرە: چارە، ڕوخسار. شەبان: شەوان. یەلدا: درێژترین شەوی ساڵ.

واتە: ئەی بای سەبا وەرە و هەڵکە، مووی ئەگریجە لەسەر ڕوخساری یار لادە، چونکە مانەوەی بۆ ماوەیەکی درێژ وەك شەوی درێژی یەلدا وایە و مایەی مەرگی عاشقە.

لادە (حا، کم، نم، گم): لابە. چیهرە (ڕ): چیهرەی.

**حەسرەتا! دڵ لە فیکری گێسوودا**
**وەکوو صەنعان بە دینی تەرسایە! (١٧)**
**ساڵ و مەهـ بۆ صەبووحییی ڕەندان**
**دەری مەیخانە صوبحْدەم وایە (١٨)**
**چوومە مەیخانە صوبحْدەم بۆ سەیر**
**دیم لەوێشا خورۆش و غەوغایە (١٩)**
**هاتە گوێم، کافرێ بە گریە وتی:**
**کاری هەر کەس بە فەردی یەکتایە (٢٠)**
**هەر یەکێکە خودایی حەق، نەك دوو**
**«وحدهُ، لا إله إلاّ هو» (٢١)**

(١٧) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (غ، ڕ، کم، نم، گم)دا پاش و پێشن.

حەسرەتا: حەیف، بەداخەوە. گێسو: ئەگریجە. صەنعان: شێخی سەنعان کە لەبەر خاتری کچە مەسیحیەك بوو بە مەسیحی و پاشان بووەوە بە موسوڵمان. تەرسا: مەسیحی.

واتە: بەداخەوە، دڵ بە خەیاڵ و بیری ئەگریجەی وەك (خاچ) دامەزراوی یارەوە، وەك شێخی سەنعان سەری لێ تێكچووە و ئارەزوویەتی بچێتە سەر دینی مەسیحی.

حەسرەتا ... گێسوودا (ن): لە حەسرەتا .. تاد. لەنگە. (کم): حەسرەتا .. گێسووتا.

(١٨) مەهـ: مانگ. صەبووحی: هەر شتێکی وەك شیر و شەراب کە بەیانیان بخورێتەوە. ڕەندان: کۆی ڕەند، مێرخاس و هێژا. دەر: دەرگە. صوبحدەم: دەمی بەیانی. وایە: کراوەیە.

واتە: دەرگای مەیخانە بە ساڵ و مانگ بۆ ناشتاکردنی مێرخاسان کراوەیە.

(١٩) خورۆش: جموجووڵ. غەوغا: ئاژاوە.

واتە: بەرەبەیان بۆ تەماشاکردن چوومە مەیخانە، ڕوانیم ئەوێش هەر جموجووڵ و ئاژاوە و ژاوەژاوی تێدایە.

خورۆش و (ڕ): غورۆش و.

(٢٠) فەردی یەکتا: خودا.

واتە: بیستم کافرێك بە گریانەوە وتی: هەموو کەسێك پێویستی بە خودا هەیە کاری بۆ مەیسەر بکا.

فەردی یەکتایە (کم): فەرد و یەکتایە.

(٢١) واتە: خودای هەق هەر یەکێکە، نەك دوو، تاك و تەنیایە و هیچ هاوبەشێکی نییە.

**

**زوڵفی تۆ موو بە موو خەریکی خەمە**
**دڵی من توو بە توو غەریقی غەمە! (٢٢)**
**ساغەری تۆ لە بادە دایم پڕ**
**خاطری من هەمیشە پڕئەلەمە! (٢٣)**
**قەد بە ئوممێدی مەرحەمەت نابم**
**لە طەرەف تۆوە، قیسمەتم ستەمە! (٢٤)**
**بوو بە خوێن جەرگ و دڵ لە تیری موژەت**
**ڕەنگی ئەشکم لە دیدە وەك بەقەمە! (٢٥)**

(٢٢) خەم: چەمیوە. توو بە توو: توێ بە توێ. غەریق: خنکاو، نوقم.

واتە: ئەگریجەی تۆ موو بە مووی خەریکە لوول بێ و بچەمێتەوە. دڵی منیش توێ بە توێ لە خەم و خەفەتدا نوقوم بووە و خنکاوە.

توو بە توو (گم): نەو بە نەو.

(٢٣) ساغەر: پیاڵە. بادە: شەراب، مەی. خاطر: دڵ. ئەلەم: ئازار.

واتە: پیاڵەی تۆ هەمیشە پڕە لە شەراب، دڵی منیش هەمیشە پڕە لە ئێش و ئازار.

(٢٤) مەرحەمەت: ڕەحم و بەزەیی. طەرەف: لا. قیسمەت: بەش.

واتە: هەرگیز هیوام بەوە نییە بەزەییت پێمدا بێتەوە و لوتف و ڕەحمت لەگەڵم بێ. بەشی من لە لایەنی تۆوە هەر ستەم و زۆرە.

قەد بە ئومێدی مەرحەمەت نابم (نم، گم): قەت .. تاد.

(٢٥) موژە: برژانگ. ئەشك: فرمێسك. دین: چاو. بەقەم: دارێکی بەرزی گەڵا بادامیی بەر خڕ و سوورە، دارەکە خۆیشی سوورە و ئەو ڕەنگە بۆ ڕەنگ‌کردنی خوری و ئاوریشم بەکار دەهێنرێ.

واتە: جەرگ و دڵم بە تیری برژانگەکانت بریندار و خوێناوی بوون. ڕەنگی فرمێسکم لە چاومدا وەك داری بەقەمە و بەرەکەی سوورە.

بوو بە خوێن جەرگ و دڵ لە تیری موژەت (ڕ): بوو بە خوێن جەرگ و دڵ لە سەیری ڕەنگ. (گم): بە خوێنی جەرگ و دڵ لە فیرقەتدا. لەنگە. لە دیدە (گم): بە ڕاستی.

**ئەشکی نوقرەم ڕژاندە دامەنی یار**

**دا نەزانێ حەریفی بێدرەمە! (٢٦)**

**بێکەسانە مەخۆ، دڵا! میحنەت**

**نییە ڕێگەت، ئەگەرچی، لەو حەرەمە (٢٧)**

**کەسی بێکەس کەسێکە بۆ هەر کەس**

**مەنبەعی جوود و مەعدەنی کەرەمە (٢٨)**

**هەر یەکێکە خودایی حەق، نەك دوو**

**«وحده لا إلهَ الاّ هُو» (٢٩)**

**

(٢٦) ئەم بەیتە لـە (گم)دا نییە.

نوقرە: زیو. دامەن: داوێن. دا: تا. حەریف: هاونشین. درەم: درهەم، پارە.

واتە: فرمێسکی وەك زیو سپیم ڕژاندە بـەردەمی یـار، تـا وا نـەزانێ هاوپیـشە و هاونـشینەکەی بێپارەیە.

ئەشکی (ڕ): ڕەنگی. ڕژاندە (ڕ، نم): ڕژانە. دا نەزانێ حەریفی (ن): د نزانـە حـەرفی. هەڵـەیـە. (ڕ): دا بزانێ حەریفی.

(٢٧) دڵا: ئەی دڵ. میحنەت: مەینەت. حەرەم: حەرەمی یار، کەعبە.

واتە: ئەی دڵ، با ڕێی گەیشتن بە حـەرەمی یاریـشت نـەبێ، کـە ڕوخـساریەتی، وەك بێکـەس تاڵاوی مەینەت مەچێژە.

بێکەسانە مەخۆ دڵا، میحنەت (ڕ): بێکەسانە مەحوی .. تاد. (گم): بێکەسانە مەچـۆ .. تـاد. نییە ڕێگەت گەرچی لـەو حەرەمە (غ، نم، گم): نییە .. بۆ حەرەمە.

(٢٨) (کەس)ی یەکەم: خـزم و خـوێش، یاریـدەدەر. مەنبـەع: سەرچـاوە. جـوود: بەخـشش، پیاوەتی، بەخشندەیی. مەعدەن: کانگا.

واتە: کەس‌وکار و خزمی یاریدەدەری بێکەسێکی وەك من، کەس و یاریدەدەری هەموو کەسێکە، سەرچاوەی چاکە و پیاوەتی و کانگای بەخشندەییە، کە خودای گەورەیە.

(نم): مەنبەعی جوود و مەخزەنی. (گم): مەنبەعی جوود و چەشمەیی.

(٢٩) حەق: ڕاست، هەق.

واتە: خودای ڕاستەقینە هەر یەکێکە و نابێ بە دوو. هەر خۆیەتی و خودایەکی وەك ئەو نییە.

**غەم وەکوو کۆه و تەن ضەعیف و نەزار**
**دڵ یەکێ، غایلەی زەمانە هەزار (٣٠)**
**لەبی بەستم لە گفتوگۆ دڵبەر،**
**تا نەکەم دەردی دڵ بە کەس ئیظهار (٣١)**
**غەیری دڵبەر کە مەحرەمی ڕازە،**
**ناکەسم گەر بە کەس بڵێم ئەسرار (٣٢)**
**ڕشتەیی مەعریفەت لەدەست دەرچوو**
**دڵ نەماوە لە فیرقەتی دڵدار (٣٣)**
**ئەی خیرەد، توو خودا لە دڵ دەرچۆ**
**عارە بۆ من ڕەفاقەتی ئەغیار (٣٤)**
**بە حەقیقەت جیهانی بێبونیاد**
**نییەتی بۆ کەسێ ثەبات و قەرار (٣٥)**

(٣٠) کۆه: کێو. نەزار: لاواز و بێهێز. غائیلە: پەژارە.

واتە: خەم وەك کێو زل و لەش لاواز و بێهێز، دڵیش تاقە یەکێکە و پەژارەی زەمانە هەزار. ئیتر خەم چۆن هەڵدەگیرێ و پەژارە چۆن جێی دەبێتەوە؟!

کۆه (کم، نم، گم): کوهی. غایلە (کم، نم، گم): غائیلە.

(٣١) واتە: دڵبەر لێوی لە گفتوگۆ بەستم و لاڵی کردم، تا دەردی دڵم بە کەس نەڵێم!

لە گفتوگۆ (غ): بە گفتوگۆ.

(٣٢) واتە: من لەو جۆرانە نیم ڕاز بدرکێنم. ئەگەر جگە لە یار، کە مەحرەمی نهێنییەکانە و پێیان دەزانێ، نهێنیی عیشق بە یەکێکیتر بڵێم، ناکەس بم.

(٣٣) نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە و نیوەکەیتری بەیتی پاشەوەی لە (کم، نم، گم)دا پاش و پێشن.

(٣٤) واتە: ئەی هۆش و فام، توو خودا بار بکە و دەرچۆ، عارە. هاوڕێیەتیی بێگانە بۆ من شوورەییە، بەڵام کە تۆ، ئەی عەقڵ، نەمای، ئیتر کەس لۆمەم ناکا!

عارە بۆ .. تاد (غ، ڕ): عارە بۆ من ڕەفیقیی ئەغیار. (کم، گم): دڵ نەماوە لە فیرقەتی دڵدار.

(٣٥) بونیاد: بناغە.

واتە: لە ڕاستیدا دنیای بێبناغە و کاول و بێوەفا تاسەر بۆ کەس نامێنێ!

نییەتی بۆ کەسێ ثەبات (کم، گم): نییەتی بۆ کەس ثەبات.

**مەکە زاهید منی بە شەوقی ضەمیر**
**هەر ئەتۆ نیی بە سیڕڕی حەق، هۆشیار (٣٦)**
**وا لەسەر بامی بوتکەدە، ڕاهیب**
**ئەم کەلامە دەڵێ بە ناڵەیی زار: (٣٧)**
**هەر یەکێکە خودایی حەق، نەك دوو**
**((وحده لا إلهَ الاّ هو)) (٣٨)**

واتە: ڕشتەی هۆش و وریاییم –بە هۆی دووریی یارەوە– لە دەست دەرچوو، هێزی دڵ نەماوە.

(٣٦) منی: خۆپەرستی، ئەنانییەت، منیەتی، تەنها هەر خۆ بە شت زانین!

واتە: ئەی بە دیمەن زاهید و تەرکیدنیاکردوو! هەر خۆت بە زانا مەزانە و وا پیشان مەدە کە تەنها تۆ دەروونت ڕووناکە و پەنامەکییەکان دەزانی. تەنها تۆ نیت، خەڵکیتریش هەن نهێنییە ڕاستەکان دەزانن و خۆیشیان پێشان نادەن.

مەکە زاهید .. تاد (ڕ): مەکە داهید منی لە شەوقی ضەمیر. هۆشیار (کم، نم، گم): ئیظهار.

(٣٧) بام: بان. بتکەدە: بتخانە. ڕاهیب: خوداپەرست، تەرکیدنیاکردوو کە موسوڵمان نەبێ.

ماناکەی لەگەڵ بەیتی دوایی لێك دەدرێتەوە.

بامی (کم، نم، گم): بانی. بوتکەدە (غ): تەکیەدا. (کم، نم، گم): مەیکەدە، واتە مەیخانە. ڕاهیب (کم، نم): زاهید.

(٣٨) واتە: ئەوەتا وازلەدنیاهێناوەکانیش لە سەربانی بتخانە بە ناڵەیەکی زەبوون هاوار دەکەن و دەڵێن: خودای ڕاست هەر یەکێکە و دووان نییە، بە تەنها ئەو خودایە و خودایتر نییە.

هەر یەکێکە خودایی حەق، نەك دوو (کم، گم): هەر یەکێکە خودای .. تاد.

ناسناوی سالم لەم تەرجیعبەندەدا نییە.

## -٢٦- (*)

### (در وصف ماموی سنندجی)

**چاکە حەفتا حوجرە بێ دایم لەناو خانەی مەموو:**
**چاوەیێکی بۆ نشیمەن، شەصت‌ونۆی بۆ چاڵی گوو! (١)**
**نەفخی ڕوودەی پڕپفی، گەر دابدا بۆ مەقعەدی**
**سەددی با نابێ، ئەگەر تێی‌ئاخنێ پێچی کلوو (٢)**
**گەر لە ڕوویا تڕ موجەسسەم بێ بە مورغی تیژباڵ**
**بۆ گرفتی هەر یەکە داوێکە، ڕیشی موو بە موو (٣)**
**ژێ‌صیفەت ڕوودە لە چەرخە، شیشەکی وا دێتە خول**
**ڕەنگە چەپ چەپ گەر کلوو بخوا، بەرێ کول‌کول دەزوو (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان)دا هەیە، داشۆرین‌بابەتە و لە هەجووی "مامۆی سنەیی"دا نووسراوە، کە نەزانراوە کێیە؟

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) حوجرە: ژوور، جێی بازرگانی. خانە: خانوو. چاوە: ژوور، هۆدە. نشیمەن: دانیشتن.

واتە: چاك وایە خانووی مامۆی سنەیی لە حەفتا ژوور بێ، یەکێکی بۆ دانیشتنی خۆی بێ و ئەوانی‌تر وەك چاڵی گوو بەکاربهێنێ.

(٢) نەفخ: باکردن. ڕوودە: ڕیخۆڵە. پف: فوو. دابدا: بدەڵێنێ، بێتەخوارێ. مەقعەد: کۆم. سەد: بەرگرتن. پێچی کلوو: کلووی لۆکەی خاو.

واتە: ئەگەر ڕیخۆڵەی باکردووی پڕ تڕ و تسی فووی پێدا بێ و دەرپەڕێ، کلووی لۆکە و خوریشی تێ‌بئاخنی، بەری ئەو بایە توندەی پێ ناگیرێ.

(٣) موجەسسەم: بەرجەستە. مورغ: پەلەوەر. تیزباڵ: تیژباڵ، تیژڕۆ. گرفت: قەبزی، گیرانی ڕیخۆڵە.

واتە: ئەگەر تڕی لە خێراییدا بشوبهێنرێ بە باڵندەی تیژڕۆ، ئەوا کە قەبز دەبێ، هێندەی داوەموویەك باریك دەبێتەوە.

(٤) ژێ: ڕیخۆڵەی بادراو بۆ کەوان. چەرخە: سوور و خول. شیشەکی: جرت. چەپ چەپ: چەپك چەپکی موو. کلوو: پێچراوی لۆکە و خوریی خاو. بەرێ: ببا. کول‌کول: چین چین.

واتە: ڕیخۆڵەی وەك ژێ دەسوورێ و باوبژی لە کاردایە، لەوانەیە بە چەپك کلوو بخوا و چین‌چینیش دەزوو لەگەڵ خۆی بەرێ.

**هەڵمی فەسوەی نایێڵێ سەرما لە ئەندامی بدا**
**تایی طوممانی لە قەوسا گەرمە، وەك كەوڵی پەتوو! (٥)**
**تا بینای بونیەی لەسەر گوو بێ، ئەگەر بگرێ لە سەر،**
**نامژێ دەم جوز عوفوونەت، جەذبی پڕزۆری زەلوو (٦)**
**ڕاستە گەر مەعمووره مابەعدی بە خەیلێ فەسوە، سا**
**بۆ سەحەرگەهـ دێ لە ئاوازی تڕی، دەنگی پەپوو؟! (٧)**
**گاهی نەفخی، نۆك ئەگەر بخوا، بە شەرطێ بیمی بێ،**
**ئاسمان بینێ، لە حوكمی گوللەدا دەكوژێ هەڵوو! (٨)**
**گەر سەری بێنێتە جێی پێی، پێ بەرێ بۆ جێی سەری**
**شیشەكی جوستەن دەكا دەهـ گەز لەسەر ئوشترگەلوو (٩)**

(٥) فەسوە: تس. تا: لنگ. طوممان: تەومان، ژێردەرپێ. قەوس: نۆیەم بورجی ئاسمان كە بەرامبەر بە دوا مانگی پایزە، سەرماوەز. كەوڵ: كورك، باڵاپۆشی لە پێستەی بەرخ بە مووەوە. پەتوو: لێفە، بەتانی.

واتە: هەڵم و هاڵاوی تسی ناهێڵێ سەرمای بێ و گەرمی دەكاتەوە. ژێردەرپێكەیشی لە كۆتاییی پایزدا وەك لێفەی كەوڵدار گەرمە.

(٦) بینا: خانوو. بونیە: بنیات و جورمی لەش. جوز: جگە لە. عوفوونەت: بۆگەنی. جەذب: هێزی ڕاكێشان. پڕزۆر: بەتین، بەهێز. زەلوو: زەروو، كرمی خوێنی پیس‌مژ.

واتە: تا بینای خۆی بە گوو دروست كرابێ، ئەگەر لە سەریی بگرێ، وەك زەروو كە خوێنی پیس دەمژێ، ئەمیش هەر بۆنی ناخۆش هەڵدەمژێ.

(٧) مەعموور: ئاوەدان. مابەعد: پاشەوە، كۆم. نەحیل: باریك و لەڕ. فەسوەسا: وەك تس. سەحەرگەهـ: كاتی بەرەبەیان. پەپوو: كوندەپەپوو.

واتە: با پاشەوەی بە تسێكی زۆر ئاوابووبێتەوە، دەنگی پەپوو لە ئاوازی تڕیەوە هەڵدەستێ.

(٨) بیم: ترس. هەڵوو: هەڵۆ كە باڵدارێكی ڕەشی ڕاوكەری بەهێزە.

واتە: ئەگەر نۆك بخوا و سكی با بكا و بە مەرجێك بترسێ، هەڵۆ بە ئاسمانەوە ببینێ دەیكوژێ.

(٩) شیشەكی: جرت. جوستەن دەكا: هەڵدەبەزێتەوە، بەرز دەبێتەوە. دەهـ: ١٠، دە. گەز: یەكەی پێوانی درێژی كە ١ مەترە (جاران ١٠٤ سم بووە). ئوشترگەلوو: گونجی سواڵەتی تێكخراو بۆ ئاوگواستنەوە، كینایەیە لە كۆم.

زرتەیێ بەحری زگی صەد گۆمی دی، تا کەوتە بێخ
کەی ئەدەب دەگرێ لە مەنعا، بوو بە میچی ئاوەسوو (١٠)
وا لەپڕ لێی دا، بە جارێ سەقفی خانەی کردە تۆز
وەك لەژێر ئاگر بتۆقێ، گاهی برژانی بەڕوو (١١)
سیحری فەسوەی شەو لە جێدا دۆشەکی بای بۆ دەکا
وەك زیاد بێ پێچی بەطنی، بایی ئەو با بێ بە قوو (١٢)
وا لە هەڵمی گەرمی دیزەی ئەو، ڕوطووبەت کەوتە ماڵ
تا بە ڕەوزەن سەقف و دیواری هەڵیهێنا کەڕوو! (١٣)
دارووی بێهۆشییە بۆی گەند لە مەغزی مەردوما
یەك نەفەس لادا لە مەجلیسدا، ئەگەر دەرکی قوتوو (١٤)

واتە: ئەگەر جێی سەر و پێی بگۆڕێتەوە و بیانخاتە شوێنی یەکتری، جرتلێدانەکەی دە گەز لەسەر کۆمی بەرز دەبێتەوە.

(١٠) زرتە: زرتەبۆز، کەتەی زەبەلاح. بەحر: دەریا. بێخ: بنك. ئەدەب گرتن: شەرمکردن. مەنع: نەهێشتن، ڕێگرتن. میچ: جگ، قاپ. ئاوەسوو: سفت و سواو بە ئاو.

واتە: دەریای پڕ لە پیسایی ناوزگی ئەم زرتەبۆزە، سەد گۆمی لێ بووەوە، تا چۆڕەبڕ بوو و گەییە بنکەکەی. ئەم کابرایە کەی شەرم دەیگرێ و ڕێ لە درێژەکێشانی ئەم دۆخە دەگرێ و ئەوەندە دانانیشێ؟ خۆ وەك میچی ئاوەسووی لێ هاتووە!

(١١) سەقف: سایتە، میچی خانوو. بتۆقێ: بتەقێ، بقەڵشێ، بترسێ.

واتە: وەك چۆن بەڕوو لە کاتی برژاندندا هەڵدەتۆقێ، ئەویش ئەوەندە ڕیاوە، تەنانەت میچی خانووەکەیشی هەڵگرتووە.

(١٢) سیحر: جادوو. بەطن: سك. قوو: قاو، دەنگی بەرز.

واتە: تسی بە شەو ئەفسوونێکی تێدایە، دەبێتە دۆشەکێك لە با. مادەم پێچی زگی زیاد دەبێ، با دەنگی تسی بەرز بێتەوە.

(١٣) دیزە: دەفری گڵێن. ڕوطووبەت: شێ و تەڕی. ڕەوزەن: کون. کەڕوو: برش.

واتە: دیزەی پاشەوەی ئەوەندە هەڵمی لێ هەڵساوە، ماڵەکە تەڕ و شێدارە. میچ و دیواری کونیان تێبوو و کەڕوویان هەڵێنا.

(١٤) داروو: دەرمان. بۆی گەند: بۆنی ناخۆش. مەغز: مێشك. مەردوم: خەڵك. نەفەس: هەناسە.

**دەرکی خیگەی با کە بەردا، دوزدی خەو شەو تا بە ڕۆژ**
**دەنگی دەڕوا کوو بە کوو، وەك بۆڵەبۆڵی کوندەبوو! (١٥)**
**بۆی هەلاڵی فەسوەیی ئەمڕۆی لەپاش دەه ڕۆژی‌تر**
**بۆگەنی هەر دێ بە لووتا، عەطری گوڵ کەن گەر بە بوو (١٦)**
**هەر بە قووەی ئاوی ئیمالەی ئەوێ قووەت دەکەن**
**شەڵغەم و ترپ و پیاز و سلق و بیبار و کەدوو (١٧)**
**هات لە ڕیشی موددەعیی دا، بای موخالیف دەرنەهات**
**ڕووبەڕووی دوشمن لە غەوغادا، دەمانچە دەرنەچوو! (١٨)**

دەرك: دەرگا، سەرقاپ. قوتوو: دەفری بچکۆلەی سەرداپۆشراو.

واتە: ئەگەر ئەوەندەی هەناسەیەك سەری قوتووی پاشەوەی لەناو مەجلیسدا لابدا، بۆنی ناخۆشی وەك دەرمانی بێهۆشی کار لە مێشکی مرۆڤ دەکا.

(١٥) خیگە: هیزە، پێستەی ڕۆن‌تێداهەڵگرتنە نەك با، بە تەوسەوە بۆ باوبڕێکی زۆر بەکارهاتووە. دوزد: دز. کوو بە کوو: کێو بە کێو. کوندەبوو: کوندەپەپوو.

واتە: ئەگەر دەرکی هیزەی ترِ و تسی بکاتەوە، شەو و ڕۆژ خەو لە خەڵك حەرام دەکا و دەنگەدەنگەکەی وەك پرتە و بۆڵەی کوندەپەپوو کێو بە کێو دەڕوا.

(دەڕوا) بە (دڕدا) نووسراوە، کە هەڵەی نووسینە.

(١٦) هەلاڵ: دەرمانی چەرم خۆش‌کردن. عەطر: عەتر، بۆن. بوو: بۆن‌وبەرامە.

واتە: تسی، وەك دەرمانی پێستە خۆش‌کردن ناخۆشە و هیی ئەمڕۆی تا دە ڕۆژی‌تریش لە کاردا دەبێ، مەگەر عەتری گوڵاو بڵاوبکەنەوە تا نەیهێڵێ.

(١٧) قووە: هێز، تەوژم. ئیمالە: هۆقنەلێدان بۆ ڕەوان‌بوون. شەڵغەم: شێلم. ترپ: توور. بیبار: بیبەر. کەدوو: کوولەکە.

واتە: شێلم و توور و بیبەر و کوولەکە، هەر بە هێزوپێزی تەوژمی ئاوی ڕەوانیی ناو ڕیخۆڵەی ئەو بەهێز دەبن و گەشە دەکەن.

(١٨) موددەعی: بەدکار. موخالیف: پێچەوانە. دوشمن: دوژمن. غەوغا: شەڕ و ئاشووب.

واتە: کە هات ترِ و تس بکا بە ڕیشی بەدکاردا، بای پێچەوانەی مەرامی خۆیی لێ نەبووەوە، وەك ئەوەی دەمانچە لە بەرەنگاریی دوژمندا تەقەنەکا.

**چونکە وەختی قورمیشی سەمتووری پەس، بەس طوولی دا**
**شەرح و کەششافی هیجا، بۆیێ بە "سالم" طەی نەبوو (١٩)**

(١٩) قورمیش: کۆك‌کردنی سەعات و شتی وا. سەمتوور: ئامێرێکی ژێداری مۆسیقایە، دەوری ٧٢ ژێی هەیە و بە دوو دەسك لێ دەدرێ. پەس: پاشەوە. بەس: زۆر. طوولی دا: درێژەی پێ دا. شەرح: لێکدانەوە و ڕاڤەکردن. کەششاف: ئاشکراکەر. (شەرح و کەششاف) ناوی دوو کتێبن جاران فەقێ خوێندوویانن. هیجا: هەجووکردن، داشۆرین. سالم: ناسناوی شاعیر، سەلامەت و بێوەی. طەی نەبوو: نەپێچرایەوە.

واتە: ڕێکخستنی کاروباری سەمتووری پاشەوەی زۆر درێژەی کێشا، بۆیە سالم نەیتوانی کۆتایی بە شەرح و کەششافی داشۆرینی کابرا بێنێ.

-٢٧-(*)

شەرحی ئەشعاری من ئێستاکە لە باڵایە هەموو
چونکە بەو نیسبەتە هەستاوە، چ باڵایە هەموو (١)
دەردی گێسووتە کە سەرگەشتە بە دەورا دەگەڕێم
موویی تا موویی لە سەرما هەم و سەودایە هەموو (٢)
عیشق ئەگەر خەیمە بدا، مەشریق و مەغریب کەمە بۆی
لە دڵی تەنگی من ئەو خەیمەیە بەرپایە هەموو! (٣)
میهری ذەڕڕەی دەهەنت داوێیە بە قەلبم پەرتەو
هەرچی ئەنداممە وەك ذەڕڕە لە ڕەقصایە هەموو (٤)
بە صەدای گریەوە بێ، سەمعی قوبووڵت، بکرە
ئەشکی ئالوودەیی من، لوئلوئی لالایە هەموو (٥)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە بەشی (غزلهای جدیده)ی (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) واتە: شیعرەکانی من ئێستا هەمووی شەرحی باڵای بەرزی یارە. هەر لەبەرئەوەی کە بست بە بست لەگەڵ باڵای یارە، دەیانبینی بەرز و جوانن، چونکە لە باڵای یار دەچن.

(٢) سەرگەشتە: سەرگەردان. هەم: خەفەت.

واتە: هۆ زوڵفەکە! من سەرگەردانم و دەسووڕێمەوە، تاتای مووی تۆیە هەمووی لە سەرمدا بووەتە خەم و سەودا.

(٣) واتە: مەیدانی ئەڤین پانە، ئەگەر بێت و خێوەت هەڵدا، ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا کەمە بۆی، کەچی ئەو خێوەتە گەورەیە لە دڵی تەنگ و خەمباری مندا هەڵدراوە!

(٤) واتە: خۆری دەمی وەك زەڕڕە بچووکت یا خۆشەویستیی دەمی وەك زەڕڕەت ڕووناکیی داوە بە دڵم، بە جۆرێ کە هەرچی ئەندامی لەشم هەیە لە ڕووناکیی ئەو خۆرە یا ئەو ئەڤینەدا لە سەمادایە، وەك چۆن خۆر لە کونی پەنجەرەوە یا لە کلاورۆژنەوە لەناو ماڵ بدا و گەرد و زەڕڕە وردەکان بکەونە سەما.

(٥) لوئلوئی لالا: مرواریی ورشەدار.

واتە: گوێی قوبووڵت با بە دەنگی گریانمەوە بێ. فرمێسکی بە خوێن تێکەڵی من هەمووی مرواریی

هەرچی عومرم هەیە بێ تۆ سەکەراتییی مەوتە
هەرچی ڕۆژم هەیە بێ تۆ شەوی یەلدایە هەموو (٦)
ڕەنگ و بۆی دا بە ڕوخت ئاه و سروشکم، ئارێ
باد و بارانی بەهاری چەمەنئارایە هەموو! (٧)
جوز نەباتی لەبی تۆ، سازشی طەبعم نییە هیچ
قەندی میصری لە دەمم تەڵخییی صەفرایە هەموو (٨)
کە حەکیم حاذیقە، "سالم" مەکە ئیظهاری مەرەض
خۆی بەصیرێکە کە بەم عالەمە بینایە هەموو (٩)

درەوشاوەیە، بیکرە. هەڵدەگرێ دوا وشەی نیوەی یەکەمی بەیتەکە ((بکرە)) نەبێ و ((بگرە)) بێ، واتە: بە دەنگی گریانمەوە بێ، گوێ بگرە لە گریانم، فرمێسکی من خۆڕایی نییە، مرواریی درەوشاوەیە.

(٦) سەکەراتیی مەوت: حاڵەتی سەرەمەرگ، گیانەڵا.

واتە: هەرچی عومرم هەیە، هەمووی بێ باڵای تۆ وەك حاڵەتی گیانەڵایە. هەرچی ڕۆژم هەیە، بێ تۆ شەوی تاریکە.

(٧) ئارێ: بەڵێ. چەمەنئارا: ئەوەی باخ و گوڵزار دەڕازێنێتەوە.

واتە: ئاه و فرمێسکم ڕەنگ و بۆی داوە بە ڕوخسارت و ڕازاندوویەتەوە. دیارە هەموو ئاهم بایە و هەموو فرمێسکم بارانە و باغ و گوڵزار دەڕازێننەوە.

(٨) نەبات: شەکری پاڵێورای بلوورین. سازش: گونجان. صەفرا: سەفرا، زەرداو، ئەو ئاوە زەردە تاڵەیە کە نەخۆش لە ڕشانەوەدا هەڵیدێنێتەوە.

واتە: هیچ شیرینییەك، جگە لە لێوی وەك نەباتت، لەگەڵ زەوق و چەشەم ناگونجێ، تەنانەت شەکری میسری لە دەممدا هەمووی وەك زەرداو تاڵە.

(٩) واتە: سالم! مادام پزیشك -یانێ یار- زیرەکە، ئیتر پێویست نییە نەخۆشیی خۆت دەربخەی و باسی بکەی. پزیشك خۆی بینایەکە ئەم دنیایە هەمووی دەبینێ.

جێی باسە، ئەگەر پارچەشیعرەکە هەمووی باسی عیشق نەبووایە، دەوترا سالم مەبەستی لە (حەکیم)ی ئەم بەیتە خودایە.

(*) -٢٨-

**له مەهتابا کە دڵ دیی ئەگریجەی وەك عەقرەبت ئەمشەو**
**گوریزی دا لە عەقرەب، کەوتە چاهی غەبغەبت ئەمشەو (١)**
**لە وەصڵام و لە بەدگۆ خۆفناکم، ئەی فەلەك! ئامان**
**بە کامی من بدە تەغییری نەحسی کەوکەبت ئەمشەو (٢)**
**بڵێ ئەی دڵ! ئەگەر هەمداستانی زوڵفی دڵبەر بی**
**لەناو جەمعی پەریشانا، جەمیعی مەطڵەبت ئەمشەو (٣)**
**لە سوجدەی خاکی کۆی جانانە، ئەی دڵ! غەفڵەتت تا کەی؟**
**دەترسم وەرگەڕابێ، مولحیدئاسا، مەذهەبت ئەمشەو (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، غ، ج، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) مەهتاب: تریفەی مانگ. عەقرەب: دووپشك. چاه: چاڵ. غەبغەب: چەناگە.

واتە: ئەمشەو کە دڵ زوڵفی وەك دووپشکتی لە تریفەی ڕوومەتتدا دی، لە دووپشك ڕای کرد و کەوتە ناو چاڵی چەناگەت.

مەهتابا (ج): مەهتابە. هەڵەیە. ئەگریجەی (کم): پەرچەمی.

(٢) کام: ئارەزوو. کەوکەب: ئەستێرە.

واتە: لە حاڵی گەیشتندام بە یار و لەگەڵ یارم، بەڵام لە بەدکاریی بەدگۆ دەترسم ئەم خۆشییەم لێ تێك بدا. دەستم بە دامانت، ئەی چەرخ! ئەمشەو شوومی و نەگبەتیی ئەستێرەکەت بە ئارەزووی من بگۆڕە.

نەحسی (ق): بەختی.

(٣) هەمداستان: هاوقسە، هاوبەسەرهات، دوو کەس کە بەیەکەوە قسە بکەن. جەمعی پەریشان: مەبەستی زوڵفی بڵاو و پەریشانی یارە.

واتە: ئەی دڵ! ئەگەر ئەمشەو بوویتە هاوڕێ و هاوبەسەرهات و هاوقسەی زوڵفی دڵبەر، هەلە و لە کیسی مەدە، هەرچی داخوازیت هەیە لەناو زوڵفی ئاڵۆزدا باسی بکە.

بڵێ (کم، گم): بەڵێ. پەریشانا (حا، کم، گم): پەریشانی. جەمیعی (ق): جەمیعە.

(٤) ئەم بەیتە لە (حا)دا نییە.

جانانە: دڵبەر.

**وەکوو ئەشکم پەیاپەی خوێنی ئاڵم، ئەی عوقابی غەم!**
**بەسەر جەرگا لە دڵ دەڕژێ، لە جێگەی میخلەبت ئەمشەو (٥)**
**سەحەر گەر بۆ شکارم دێیە صەحرا، با مورەخخەص بم**
**حەنایی کەم بە ئەشکی دیدە سممی مەرکەبت ئەمشەو (٦)**
**بە پەنهانی لە کۆی یارا، سەگئاسا، مەسکەنت دەستکەوت**
**تەشەککور کە، گەلێ بالآیە "سالم!" مەنصەبت ئەمشەو (٧)**

واتە: ئەی دلبەر! تا کەی بێئاگا دەبی لە کوڕنووشبردن بۆ خاکی دەورووبەری مەنزڵی یار؟ دەترسم ئەمشەو مەزهەب و ڕێبازت وەك بێدین گۆڕابێ و وازت لە عیشق هێنابێ.

خاکی کۆی (کم): خاکی. (گم): خاکی تۆ. وشەی (کۆی) لە هەردووکیاندا کەوتووە.

(٥) عوقاب: هەڵۆ. میخلەب: چنگۆڵ، چڕنووك.

واتە: ئەی هەڵۆی خەم و پەژارە، ئەمشەو خوێنی ئاڵم لە جێچنگۆڵت وەك فرمێسك بێبڕانەوە بەسەر جەرگمدا دەڕژێ.

وەکوو (مان): وەك. لەنگە. (خوێنی ئاڵم) لە (حا)دا کەوتووە. لە جێگەی (ج): لە ضەربی.

(٦) ئەم بەیتە لە (حا)دا نییە.

سەحەر: بەرەبەیان. شکار: ڕاو. مورەخخەص: ڕێپێدراو و ئازاد. حەنایی: خەنەیین. مەرکەب: مەبەستی ئەسپ و ماینە.

واتە: بەرەبەیان ئەگەر دێی بۆ ڕاوکردنم لە دەشتدا، لێمگەڕێ با بەرەڵا بم و فریای ئەوە بکەوم سمی ئەسپەکەت، لە پاداشی ئەوەدا کە دێی بۆ ڕاوکردنم، بە فرمێسکی ئاڵ ڕەنگ بکەم.

دێیە (گم): دێ بە. صەحرا (کم): سەحرا.

(٧) سەگئاسا: وەك سەگ.

واتە: سالم، ئەگەر وەك سەگی بەردەرگا لە دەورووبەری مەنزڵی یار شوێنت دەستکەوت، شوکرانەبژێر بە، ئەمشەو جێگە و پایەت گەلێ بەرز و بالآیە.

(*) -٢٩-

لەبەر پەیکانی تیری ئاهی من، مۆمە حەجەر ئەمشەو
دریغا، گەر نەکا دڵبەر لە ناڵینم حەذەر ئەمشەو (١)
لە وەصڵا چونکە پەروەردەم بە بۆسەی لێوی شیرینت
دەدا هیجرت لە ڕیشەی دڵ، دەمادەم نیشتەر ئەمشەو (٢)
بە ئاهیستە لەبم گەر بێتە سەر ڕووی نازکت یەکدەم
لە جێی بۆسەم دەبینن موعجیزەی «شَقّ القَمَر» ئەمشەو! (٣)
لە نێشی ئەژدەهای زوڵفت وەها کەوتوومە ڕووی بالین
بە جوز موهرەی لەبت، ناکا عیلاجی من بەشەر ئەمشەو (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، ف، غ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) پەیکان: سەرەتیر.

واتە: ئەمشەو بەردی سەخت لەبەر لێدانی بەتینی سەرەتیری ئاه و هەناسەم دەتوێتەوە و دەبێتە مۆم. جێی داخە کە دڵبەر ئەمشەو خۆی لە تیری ناڵەم دەپارێزێ. بێگومان تیری ئاهەکەم دەیگرێ و ئازاری دەدا.

(٢) دەمادەم: پەیوەستە، هەمیشە.

واتە: لەبەرئەوەی لە کاتی گەیشتن بە تۆدا بە ماچی لێوت پەروەردە کراوم، ئەمشەو دەردی گرانی دووریت بەردەوام نەشتەر لە ڕیشەی دڵم دەدا.

چونکە (کم، گم): چونکی. دەدا (ف): دەوای. ڕیشەی (ف): ڕیشی. هەڵەن.

(٣) ئاهیستە: ئارام، لەسەرخۆ.

واتە: ئەگەر ئەمشەو یەك هەناسە بە ئارامی لێوم بگاتە سەر ڕوومەتت و ماچی بکەم، لە جێی ماچەکەم موعجیزەی لەتکردنی مانگ دەبینن. سالم مەبەستی ئەوەیە: ماچکردنی ڕوومەتی یار وەك موعجیزەی بە ئیشارەتی پەنجە مانگ لەتکردن گرانە. مەبەستی ئەوەیشە کە ماچەکە ڕوومەتی ناسکی وەك مانگی یار دوولەت دەکا.

دەبینن (غ، کم، گم): دەبینی.

(٤) ئەم بەیتە لە (ف)دا نییە.

**مەهی پەردەنشین "سالم" لە پەردە هاتە دەر، بێشك**
**خەجاڵەت دەیگرێ، گەر مەه لە پەردە بێتە دەر ئەمشەو (٥)**

بالین: سەرین. موهرە: مۆر.

واتە: ئەمشـــەو بە جۆرێ لـە ئازاری گەستنی ئەژدەهای زوڵفت کەوتوومەتە ناو جێگە و سـەرم لـەسەر سەرینە و نەخـۆش کەوتووم، مۆری بادامیی لێوت نەبێ، بەشەر چارەسەری منی پێ ناکرێ و لـەم دەردە گرانە ڕزگارم ناکا. سالم دەمی یاری بە مۆر شوبهاندووە، شوێنماچەکەیش وەك مۆری کاغەزە.

موهرەی (کم، گم): حەددی.

(٥) ئەم بەیتە لـە (ف)دا چوارەمە.

مەهی پەردەنشین: مانگی لـە پەردەدا دانیشتوو، مەبەستی یارە.

واتە: ئەمشـەو یار، کە مـانگی لـەماڵدانیـشتووە، لــە مـاڵ هاتـەدەر. جـا ئەگـەر مـانگی ئاسمـان دەرکەوێ و هەڵبێ، شەرمەزار دەبێ، چونکە جوانیی ئەو ناگاتە جوانیی یار.

(لە پەردە)ی دووەم (عا، ف، غ، گم): لە بورجا. جوانە. (کم): لـەبەر جـاە. ئـەمیش هـەر (لــە بورجا) بووە و خراپ خوێنراوەتەوە.

هەموو (ئەمشـەو)ەکانی ئەم پارچەشیعرە لـە (کم، گم)دا (ئیمشەو)ن.

## -٣٠- (*)

به تەنگە دڵ لە سینەمدا، وەکوو مورغی قەفەس ئەمشەو
بە جان شیوەن دەکەم، یاران، لە هیجرا ناهەوەس ئەمشەو (١)
خەو و طەرف و فەراغەت زەحمەتە بۆ عاشقی بەدبەخت
موژەم یەك یەك لە چاوا بوو بە نێشی خار و خەس ئەمشەو (٢)
کە مینقاری هەوەس ناگاتە سەر شەککەر، وەکوو تووتی
بەسەر خۆما دەدەم دەستی تەئەسسوف وەك مەگەس ئەمشەو! (٣)
جڵەوڕێز وا بە چوستی هات و لێی‌دام، ڕەهزەنی ئەندووە
لە جەڵدەڕاهی حەلقووما بڕیی ڕێگەی نەفەس ئەمشەو (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (عا)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) ناهەوەس: بێ ئارەزووی خۆی، بە نابەدڵ.

واتە: ئەمشەو دڵم لە سینەدا وەك باڵندەی ناو قەفەس بەتەنگ هاتووە. لە دووریی یاردا بە گیان شیوەن دەکەم و بێ کەیف و شەوقم.

(٢) طەرف: گۆشە، کەنار. نێش: چزوو.

واتە: خەوتن و حەسانەوە و کەنارگرتن و بەتاڵیی دڵ، بۆ ئەڤینداری بەدبەختی وەك من زۆر گرانە. ئەمشەو هەرچی برژانگی چاوم هەیە، یەك‌یەك چزی دڕك‌وداڵە و ناهێڵن خەوم لێ بکەوێ.

(٣) واتە: مادەم ئەمشەو دەنووکی ئارەزووی دڵم وەك دەنووکی تووتی نەگاتە شەکر، وەك مێش دەستی خەم و پەژارە بە سەرمدا دەدەم.

(٤) جڵەوڕێز: جڵەوکراو، جڵەوکێش. ڕەهزەن: ڕێگر، جەردە. جەڵدەڕاه: (جەلدە) مانای قامچییە، (جەڵد) شووڵەماسی و (جەلد) داردەستی درێژ و باریکە. دەبێ مەبەست ڕێی باریك و درێژ بێ. لەوانەیشە (جەردەڕاه)یش بێ، بە مانای ڕێی جەردە و چەتە کە خەڵك بە کەمی پێیدا دەڕۆن. حەلقووم: گەروو.

واتە: خەفەت وەك جەردە و ڕێگر جڵەوکێش هات و لێی دام، لە ڕێگای باریك و درێژی قورگمدا ڕێی لە هەناسەم گرت و خنکاندمی.

**سەر و پێچ و دەم و ڕیشی ڕەقیب سەیر کەن، ڕەفیق ئامان!**
**بە چۆکا هاتووە، ئەفگەندەسەر، هەروەك تەرەس ئەمشەو (٥)**
**لە مەیدانی بەلاغەتدا قەڵەم سەرخۆشە بۆ نووسین**
**لە هاتوچۆ و تەڕەددوددا، دەکا مەشقی فەرەس ئەمشەو (٦)**
**ئەگەر دڵبەر بپرسێ حاڵی "سالم"، پێی بڵێن: تۆ خۆش!**
**لە کێوی میحنەتا ناگا بەسەریا هات، هەرەس ئەمشەو (٧)**

(٥) ئەفگەندەسەر: سەرشۆڕ.

واتە: تەماشای سەر و سەرپێچ و دەم و ڕیشی بەدکار بکەن، چۆن ئەمشەو وەك تەرەسی بێئابڕوو و سەرشۆڕ کزبووە و بەچۆکدا هاتووە.

(٦) واتە: قەڵەم ئەمشەو لە مەیدانی ڕەوانبێژی و قسەئاراییدا سەرخۆشە، بۆ نووسین لە هاتوچۆ و گەڕاندایە، وەك ئەسپی ڕەسەن دەرسی مەشق دەخوێنێ.

(٧) ناگا: لەپڕ.

واتە: ئەگەر یار پرسیی حاڵی سالم چۆنە؟ پێی بڵێن: تۆ خۆش، مرد. ئەمشەو لە کێوی خەم و پەژارەدا هەرەس هات و خستیە ژێر و لەناوی برد.

## -٣١- (*)

**شەپۆلی بەحری ئەشکم تەڕ دەکا پشتی سەمەك ئەمشەو**
**صەدای ڕەعدی فیغانم کەڕ دەکا گۆشی فەلەك ئەمشەو (١)**
**مەزەی بەزمت لە کوورەی سینەما برژا بە تەڕدەستی**
**لە ئەشکم بۆ کەبابی دڵ موهەییایە نەمەك ئەمشەو (٢)**
**ئەگەر یەد بێ، هەموودەم غیرەتم جۆیایی پاداشە**
**لە ڕیشەم دەردەهێنا، وەك دڵم، چەرخی فەلەك ئەمشەو (٣)**
**بەبێ بەزمی ئیرەمئارایی دڵبەر بەسکی دڵتەنگم**
**فەضای دونیا لە من پڕنارە، وەك عەینی دەرەك ئەمشەو (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (ف، غ، ج، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) وتراوە گۆی زەوی لەسەر شاخی گایەکە و گاکە لەسەر پشتی ماسییەکە. کە ماسییەکە بجولێتەوە، دنیا خاپوور دەبێ! سالم وتوویە: ئەمشەو شەپۆلی دەریای فرمێسکم، گۆی زەوی دەبڕێ و دەگاتە سەر پشتی ماسییەکە! هەروەها دەنگی هەورەگرمەی هاوار و فیغانم ئەوەندە بەرز دەبێتەوە، گوێی ئاسمان کەڕ دەکا!

تەڕ (کم): پڕ.

(٢) بە تەڕدەستی: بە گورجی، بە لێزانی و دەستڕەنگینی. نەمەك: خوێ.

واتە: ئەمشەو مەزەی بەزمی خواردنەوەت دڵمە، گورج لە کوورەی سینەمدا برژا، فرمێسکیشم خوێی کەبابەکەیە.

ئەشکم (ف): ئەشك. لەنگە.

(٣) ئەم بەیتە لە (غ)دا نییە.

یەد: دەست، لێرەدا مەبەست دەسەڵاتە.

واتە: ئەگەر دەستم بڕۆیشتایە، غیرەتم هەموو جار بە دوای تۆڵەدا دەگەڕا و ئەمشەو ڕیشەی چەرخی فەلەکم دەردەهێنا، وەك ئەو ڕیشەی دڵی منی دەرهێنا.

(٤) ئەم بەیتە لە (غ)دا سێیەمە.

بەسکی: ئەوەندە زۆر. دەرەك: دۆزەخ.

**لە صەحرای تەجرەبەی عیشقا، دەبن ڕامم گەلەی ئاهوو**
**لە صیدقا نالّەیی مەجنوون و من نابن بە یەك ئەمشەو (٥)**
**مونەووەر کەی لە ڕێی میهرا، ئەگەر بێی کولبەیی "سالم"**
**دەڕێژێ بۆ نیثارت ئەشك وەك دوڕ، مەردومەك ئەمشەو (٦)**

واتە: ئەمشەو بەبێ بەزمی دڵبەر، کە باخی ئیرەم دەڕازێنێتەوە، ئەوەندە دڵتەنگم پانایی و فراوانیی دنیا بۆ من پڕ لە ئاگرە و وەك دۆزەخ خۆی وایە.

ئارایی (غ): لـدی لـە. هەڵەیە. (ج): ئارامی. (گم): ئاوایی.

(٥) واتە: گەلەئاسکی کێوی، لە دەشتی تاقی‌کردنەوەی خۆشەویستیدا، لەگەڵم رام و هۆگرم دەبن. ئەمشەو ناڵەی مەجنوونی عامیری و ناڵەی من نابن بە یەك، هی من بەرزترە.

گەلەی (ف، کم): گەلی.

(٦) مونەووەر: ڕووناك‌کراوە و نوورانی‌کـراو. میهـر: خۆشەویـستی. کولبـە: کاولـە، وێرانـە. مەردومەك: گلێنەی چاو.

واتە: ئەمشەو ئەگەر بێی کاولەکەی دڵی سالم لە پێناوی خۆشویستندا ڕووناك بکەیتەوە، گلێنەی چاوم فرمێسکی وەك مرواریت بۆ دەڕێژێ و دەیکاتە پێشوازت.

کەی (گم): کە.

-٣٢- (*)

له گریان چوو، هەمیسان خاوم ئەمشەو
بە خوڕ خوێن دێ لە چاوەی چاوم ئەمشەو (١)
بە ناسۆر کەوتەوە، دیسان، برینم
سەری کرد باز لە جێی زووخاوم ئەمشەو (٢)
شەرارەی ئاگری دووری بەتاوە
عیلاجم کەن، دەخیل! سووتاوم ئەمشەو (٣)
نیشانەی مەرگمە، تەحقیق ئەزانم
لەسەر ڕوو ظاهیرە جواناوم ئەمشەو (٤)
لە دڵ سۆز و لە سەر شۆر و لە چاو خوێن
لە حاڵی خۆم تەعەججوب ماوم ئەمشەو (٥)
بە زنجیری فیراقت قەیدە "سالم"
خەیاڵی زوڵفی تۆیە داوم ئەمشەو (٦)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (نم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەحزووف.

(١) واتە: ئەمشەو دیسان، بە هۆی گریانەوە، خەوم نەماوە و بەخوڕ خوێن لە سەرچاوەی چاوانمەوە سەر دەکا.

(٢) ناسۆر: برین کە چاك نەبێتەوە و کۆن بێ. باز: دووبارە.

واتە: برینم دووبارە کەوتەوە ئازار و دیسان کێم و خوێناوەکەی لە جێی زووخامەوە پەیدا بوو.

(٣) واتە: ئاگری دووری لە یار بەتینە. دەستم بە دامێنتان، وا ئەمشەو سووتام، چارەسەرم بکەن.

(٤) جواناو: ئارەقی دەموچاو و لەشی نەخۆش لە کاتی گیانەڵاّ و پێش مردنیدا.

واتە: بەوەدا کە جواناو بە ڕوخسارمەوە دەرکەوتووە، دەزانم ئەمە بە دڵنیاییەوە نیشانەی مردنمە.

(ئەزانم)، دەبێ (دەزانم) بووبێ و گۆڕرابێ.

(٥) واتە: دڵ پڕیەتی لە شەوق و ئارەزوو و سەر پڕیەتی لە شۆری عیشق، چاویش خوێناو دەڕێژێ، من ئەمشەو لە کاری خۆم سەرسامم!

(٦) واتە: سالم، بەندی جیایی تۆیە و ئەمشەو خەیاڵی زوڵفت زنجیر و داویەتی.

-٣٣- (*)

**عیلاجی ئێشی دڵ ناکا بە صەد مەرهەم، حەکیم ئەمشەو**
**لە زەخمی تیری موژگانت بە نەوعێ بەستەریم ئەمشەو (١)**
**لە لەب نەقدی حەیاتم خوونبەهای یەك بۆسە داناوە**
**ئەگەر یاری قەمەرطەلعەت قوبووڵ کا، موشتەریم ئەمشەو (٢)**
**هەوای ئابی بەقای بۆسەت، شەرارەی مەزرەعەی عومرە**
**لە باغی زیندەگی بۆ نۆبەرەی وەصڵت بەریم ئەمشەو (٣)**
**خەطایە گەر هەوای بۆی عەطری گوڵ کەم، تا حەیاتم بێ**
**ئەگەر بێنێ لە موشکینزوڵفی تۆ بۆیی نەسیم ئەمشەو (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، غ، ج، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) بەستەری: نەخۆشی لەجێداکەوتوو.

واتە: ئەمشەو بەهۆی زامی تیری برژانگتەوە بە جۆرێ نەخۆش کەوتووم، پزیشك بە سەد مەڵهەم چاری ئازاری دڵ ناکا.

دڵ ناکا بە صەد مەرهەم ئەمشەو (غ): ناکا حەکیم ئەمشەو بە صەد مەرهەم. لە زەخمی (حا): بە زەخمی. بەستەریم (کم): بستزم. (گم): بوستەرم.

(٢) خوونبەها: خوێنبایی. بۆسە: ماچ. قەمەرطەلعەت: ڕوومەت وەك مانگ.

واتە: ئەگەر یاری ڕوومەت وەك مانگم ڕازی بێ ماچێکی لێویم بداتێ، من کڕیارم و ئەمشەو گیانی شیرینم دەکەمە خوێنبایی ئەو ماچە.

حەیاتم (عا): جانم. لەنگە. داناوە (عا): داماوە. هەڵەیە.

(٣) ئەم بەیتە هەر لە (غ، ق)دا هەیە.

هەوا: ئارەزوو. ئابی بەقا: ئاوی ژیان. شەرارە: پریشکی ئاگر. مەزرەعە: مەزرا و دێمەر.

واتە: ئارەزووکردنی ئاوی ژیان بە ماچی لێوت، بووە پریشکی ئاگر و لە مەزرای تەمەنی دام. بۆیە ئەمشەو لە باخی ژیاندا بێبەریم لە نۆبەرەی گەیشتن بە تۆ.

بۆسەت (ق): بۆت. لەنگە.

(٤) ئەم بەیتە لە (غ)دا چوارەمە.

واتە: ئەگەر ئەمشەو سروەی نەسیم لە زوڵفی میسکینی تۆوە بۆنێکم بۆ بهێنێ، تا گیانم تێدا بێ،

**هەتیتەی دڵ بکا گەر تەجرەبەی قەددت بە باریکی**
**بەرابەر ئەو دەبێ مووی کاکوڵی هیندی زەخیم ئەمشەو (٥)**
**لە خاکی ئاستانەی دڵبەرا ئوفتادەوو شادم**
**دەگاتە طاقی کیسرا، ڕیفعەتی جێگەی سەگیم ئەمشەو (٦)**
**سەحەر جێی سوجدە شاهید بێ، لە ئەشکی سورخ و ڕووی زەردم**
**لە خاکی کۆیی تۆ ئالوودەیە مەرجان و سیم ئەمشەو (٧)**
**ئەگەرچی ئیحتیاجی، ڕوو لە قاپیی کەس مەکە "سالم!"**
**بە ئوممێدی کەرەم ئیللا خوداوەندی کەریم ئەمشەو (٨)**

هەڵیە بۆنی عەتری گوڵ بکەم.

خەتایە (ج): خەتای. هەڵیە. هەوای بۆی (حا): هەوای. ناتەواوە. (کم): هەوایی. (گوڵ) لە (ف)دا کەوتووە. لە موشکینزوڵفی (عا): تەمکین زولفی. هەڵیە. بۆیی (ق): بێنی.

(٥) هەتیتە: پارچە پۆڵایەکی کون‌کونە زەڕەنگەران تاڵە زیو و زێڕی پێ دەگوشن و ڕاست دەکەنەوە.

واتە: ئەمشەو ئەگەر هەتیتەی دڵی من باریکیی قەدت تاقیبکاتەوە، مووی کاکۆڵی هیندی بەرامبەر بە قامەتت، ئەگەرچی باریکە، ئەستوور دەنوێنێ.

بە باریکی (غ، ج، ق): لە باریکی. دەبێ (عا): دەکا. هیندیی (کم): هیندووی. زەخیم (ف، غ، ق): ضەخیم.

(٦) واتە: ئەمشەو لە خاکی بەردەرگای یاردا کەوتووم، بەڵام دڵشادم، ئەو جێگەیە، ئەو بەردەرگایە کە جێی سەگی وەفادارە، لە بەرزیدا دەگاتە تاقی کیسرا.

دڵبەرا (کم): دولبەر. (گم): دڵبەرم. ئوفتادەوو (کم): ئوفتادەم و.

(٧) ئەشك: فرمێسك. ئالوودە: تێکەڵ. سیم: زیو.

واتە: بەرەبەیان جێی کڕنووشی ئەمشەوم شایەت بێ کە مەرجان و زیو لە خاکی بەردەرگاتدا تێکەڵی فرمێسکی سوور و ڕووی زەردمن.

جێی (عا): حی. هەڵەی نووسینە. لە ئەشکی (ف): ئەشکی، (لە) کەتووە. (ج): بە ئەشکی. ئالوودەیە (ق): ئالوودەیی.

(٨) ئیحتیاج: موحتاج.

واتە: سالم! هەرچەند ئەمشەو موحتاجیت، ڕووی داوا لە خودای بەخشندە بەولاوە، مەکەرە کەس.

کەرەم ئیللا (عا): غیراز= غەیرەز. (کم): کرم للّه! (گم): کرم اللّه!

## -٣٤- (*)

**هەمیسان ڕۆح لە تەن بێزارە ئەمشەو**
**لە دڵما باز خەیاڵی یارە ئەمشەو (١)**
**لە چیهرەم شێوەیی عیبرەت ظوهوورە،**
**برای یەکدڵ لە من ئەغیارە ئەمشەو (٢)**
**لە ئاهی سەرد یەخی بەست، ئەشکی گەرمم**
**موژەم یەکیەک دەڵێی بزمارە ئەمشەو (٣)**
**لە دەوری نوقطەیی خاڵی لەبی یار،**
**خەیاڵی دڵ دەڵێی پەڕگارە ئەمشەو (٤)**
**«أنا الدلْبَرْ» دەڵێ دڵ وا لە سینەم**
**وەکوو مەنصوور سزای سەر دارە ئەمشەو (٥)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (نم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەحزووف.

(١) باز: دووبارە.

واتە: ئەمشەو دیسان گیانم لە لەشم بێزارە، دووبارە خەیاڵی یار کەوتووەتەوە بیرم و دڵم بۆی نائارامە.

(٢) چیهرە: ڕوخسار. عیبرەت: بەپەندکراو، ڕەنگیشە هەڵەی نووسینەوە بێ و ڕاستەکەی (حیرەت) بێ.

واتە: ئەمشەو لە ڕەنگ و ڕوخسارم شێوەی مرۆی بەپەندکراو یا سەرسام بەدی دەکرێ، کە برای گیانیبەگیانی لێم بووەتە بێگانە!

(٣) واتە: ئەمشەو ئاه و هەناسەم ئەوەندە ساردە، فرمێسکی گەرمی کردم بە سەهۆڵ. برژانگم، یەك یەك بووەتە بزمار و دەچەقێتە گیانم.

(٤) واتە: ئەمشەو خەیاڵی دڵ وەك پەڕگار بە دەوری خاڵی لێوی یاردا دەسووڕایەوە و تەنها بیری لە جوانیی ئەو دەکردەوە.

شایانی باسە، (نم) (دەورەی) نووسیبوو، کرایە (دەوری) و وای بەڕاست دەزانین.

(٥) أنا الدُلْبَرْ: وشەی (أنا) عەرەبییە و واتە: من، بەڵام وشەی (دلبەر) کوردییە و (أ)ی خراوەتە سەر.

**وەها بێئیختیار کەوتوومە شیوەن**
**لە ناڵینم ڕەفیق بێزارە ئەمشەو (٦)**
**بە بادی لەعلی لێوی ئاڵی دڵبەر**
**سروشکم شێوەیی گوڵنارە ئەمشەو (٧)**
**نیهالی شادمانیم ڕیشەکەن بوو**
**درەختی میحنەتم پڕبارە ئەمشەو (٨)**
**خەیاڵی نێشی موژگانی دڵارام**
**لە دڵما یەك بە یەك سووفارە ئەمشەو (٩)**
**طەبیبی دەردی من، یاران! خەبەر کەن،**
**بڵێن: "سالم" لە غەم بیمارە ئەمشەو (١٠)**

سالم، وەك ((أنا الحق))ەکەی لەمەڕ مەنسووری حەلّلاجی شەهید، ((انا الدلبر))ی بەکارهێناوە، واتە: هەر من یارم و گیانم لە گیانیدا تواوەتەوە.

واتە: ئەمشەو دڵم لە قەفەزی سینەمدا ((أنا الدلبر)) دەڵێ، لەبەرئەوە وەك مەنسووری حەلّلاج سزای لەداردانە.

(٦) بێئیختیار: ناچار و بێدەسەڵات.

واتە: بە شێوەیەکی وا ناچاری و دەستەوەستانانە خەریکی گریانم، تەنانەت هاوڕێکانیشم لێم وەڕس بوون.

(٧) واتە: ئەمشەو نەوەندەم بیر لە لێوی ئاڵی یار کردووەتەوە، فرمێسکم وەك گوڵنار سوور هەڵگەڕاوە.

(٨) نیهال: نەونەمام. پڕبار: بەر زۆر.

واتە: بەوەدا کە نەونەمامی شادیم لە ڕەگەوە هەڵکێشرا و درەختی مەینەتم بەری زۆر گرت، ئیتر من خۆشیم نەماوە و لە دەردەسەریدا دەژیم.

(٩) سووفار: کون.

واتە: ئەمشەو خەیاڵی چزووی برژانگی یار لە دڵمدا یەك بە یەك کونە، یانێ تەنانەت خەیاڵەکەی، دڵی کونکون کردووم و ئاژنیویەتی.

(١٠) واتە: یاران! هاوسەران! پزیشکی دەردی من ئاگادار بکەنەوە، بڵێن: سالم ئەمشەو نەخۆشی خەم و پەژارەی دووریی یارە.

## (*) -٣٥-

دریغا، باز دڵم پڕچاکە ئەمشەو
سروشکی دیدە ئاتەشناکە ئەمشەو (١)
موهەییایە بەبێ تۆ ڕەختی خوابم،
بە پەهلوو خار و باڵش خاکە ئەمشەو (٢)
بە یادی چاوی مەستی مەیسروشتت
لە پێچش خاطرم وەك تاکە ئەمشەو (٣)
سەمەك ئاوی نەمەك دەخوا لە ئەشکم
هەناسەم پەیکی هەفت ئەفلاکە ئەمشەو (٤)
موژەت ئەڵماسە بۆ کاووشیی دڵ
بە ئیما دیدە وەك حەککاکە ئەمشەو (٥)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (م)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) باز: دووبارە. پڕچاك: زۆر شڕ و لەتلەت. ئاتەشناك: ئاگراوی.

واتە: ئەمشەو دیسان دڵم لەتلەت بووە. فرمێسکی چاوم گەرم و ئاگراوییە.

(٢) موهەییا: ساز و ئامادە. ڕەخت: جێی نوستن. خواب: خەو. پەهلوو: تەنیشت. خار: دڕك. باڵش: سەرین.

واتە: ئەمشەو شوێنی خەوتن و نوێنم بەبێ باڵای تۆ بۆ ئامادە کراوە، ئەوەی دەیخەمە ژێر پاڵم و لەسەری دەنووم، دڕکە و ژێر سەرینم خاکە.

(٣) پێچش: پێچخواردن. تاك: داری مێو.

واتە: ئەمشەو دڵم بە هۆی یادی چاوی مەستتەوە، کە وەك مەی مرۆڤ سەرخۆش و بێهۆش دەکا، وەك داری مێو پێچ دەخوا و سەری لێ شێواوە.

(٤) واتە: ئەمشەو ماسیی ناو دەریا یا ماسییەکەی (گاو و ماهی) بە هۆی فرمێسکمەوە ئاوی خوێ دەخواتەوە. هەناسەی ساردم نامەبەرە و لە حەوت ئاسمانەکان تێپەڕ دەکا.

(٥) کاووش: هەڵکۆڵین. ئیما: ئاماژە. حەککاك: مۆرهەڵکەن.

واتە: ئەمشەو برژانگت بۆ هەڵکۆڵینی دڵم وەك ئەڵماسی تیژە، چاوەکانت وەك مۆرهەڵکەن بە ئیشارە خۆشەویستیت لە ناخی دڵمدا هەڵدەکۆڵێ.

**ضەعیف و بێخودە بەختم، لە خەودا**
**غەمت بۆ حاڵی من تریاکە ئەمشەو (٦)**
**سەری زوڵفت سەری کردە دەماغم**
**لە دۆشت ئەژدەهای ضەحاکە ئەمشەو (٧)**
**دەنووسێ غەم لە دڵ فەرمانی قەتلم**
**فیراقت ظاڵمی سەففاکە ئەمشەو (٨)**
**دەسا غەمخواری "سالم" بە، خودایە!**
**لە شەوها بیشتەر غەمناکە ئەمشەو (٩)**

(٦) واتە: ئەمشەو بەختم لاواز و بێهۆشە لە خەودا. دیارە خەم و پەژارەی دووریت بۆ حاڵی من وەك تریاكە و سڕم دەكا.

(٧) دۆش: سەرشان.

واتە: ئەمشەو سەری زوڵفی وەك مارت سەری كردووەتە دەماغم و لێی دەخوا. ئەڵبەت زوڵفت لەسەر شانت ئەژدەها مێشكخۆرەكانی سەرشانی ئەژدەهاكە.

(٨) سەففاك: خوێنڕێژ.

واتە: ئەمشەو خەفەتی ناو دڵم فەرمانی كوشتنی داوم. جیاییت بووەتە زۆردارێكی خوێنڕێژ.

(٩) شەوها: شەوان. بیشتەر: زیاتر.

واتە: خودایە، مشووری سالم بخۆ و خەمخۆری بە، چونكە ئەمشەو لە هەموو شەوێكی‌تر خەفەتبارترە.

## -٣٦- (*)

وا دڵ لە خەیاڵاتی نیهان پڕغەمە ئەمشەو
ڕووی گونبەدی دەوران لە هەناسەم تەمە ئەمشەو (١)
گەر خاکی تەئەسسووف بەسەرا کەم لە فیراقت
بۆ حەسرەتی من، طوڕڕەیی عالەم کەمە ئەمشەو! (٢)
غەرقم لە غەمی یادی برۆت بەسکی لە هیجران
وەك ماڵی کەمان قەددی ضەعیفم خەمە ئەمشەو (٣)
وەك جەیشی مەلەخ لەشکری غەم موڵکی دڵی گرت
بۆ کشتی ئەمەل داسی طەڵەب بێدەمە ئەمشەو (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، غ، ج، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

(١) واتە: ئەمشەو، بە هۆی خەیاڵاتی پەنهانەوە، دڵم بە جۆرێ پڕ لە خەمە، ڕووی گومەزیی چەرخی فەلەك تەمی هەناسەم گرتوویەتی.

نیهان (ج، کم، گم): کەسێ. دەوران (ج): گەردوون.

(٢) واتە: ئەمشەو ئەگەر خاکی خەم و پەژارە لە دەردی جیاییت بەسەردا کەم، خاکی هەموو دنیا کەمە و بەشم ناکا.

(من) لە (عا)دا کەوتووە.

(٣) بەسکی: ئەوەندە. ماڵی کەمان: مەودای نێوان بەشە چەماوەکەی گۆچان. خەم: چەماوە.

واتە: ئەوەندە لە دووریتدا تووشی پەژارەی یادی برۆی کەوانیتم، باڵای لاوازم وەك ماڵی کەوان چەماوەتەوە. سالم ئەوەندە بیری لە برۆ کەوانییەکەی یار کردووەتەوە، باڵای وەك کەوان چەماوەتەوە.

بەسکی (کم، گم): هێندە. (ماڵی) لە (کم، گم)دا کەوتووە. کەمان (حا): چەمان. یانێ چەمینەوە و نوشتانەوە.

(٤) مەلەخ: کوللە. کشت: کشتوکاڵ، مەزرا و دێمەر.

واتە: ئەمشەو سوپای خەم موڵکی دڵی داگیر کردووم، وەك سوپای کوللەی پێ‌کوڕە کە کشتوکاڵ داگیر دەکا و تا ڕەگ دەیکرۆژێ. داخەکەم داسی هەوڵم دەمی نیە و کولە، فریا ناکەوم کشتی هیوام بدوورمەوە و ڕزگاری بکەم.

ها سینەوو ئەشك و دڵ و غەم بێنمە حیمایەت

بوریان و کەباب و نەمەك و سفرەمە ئەمشەو (٥)

وەك خاتەمی تۆ نەقشە لە جێی ناخونی حەسرەت

ئەم زەخمە لە شەوقت کە لە ڕووی سینەمە ئەمشەو (٦٧)

مەعلوومە کە گریەم لە هەوای کەعبەیی ڕووتە

بەم ئەشکە لە دیدەم، کە دەڵێی زەمزەمە ئەمشەو (٧)

سامانی دڵی غەمزەدە، جانا، لە فیراقت

وەك سیلسیلەیی زوڵفی خەمت دەرهەمە ئەمشەو (٨)

لەشکری (عا): جۆششی. طەڵەب (غ): ئەمەل.

(٥) ئەم بەیتە لە (عا)دا نییە.

واتە: ها با ئەمشەو سینە و فرمێسك و دڵ و خەم بێنمە سایەت؛ سینە بوریان و دڵ کەباب و فرمێسك خوێیە و خەم سفرەمە.

ها (کم، گم): با. بێنمە حیمایەت (حا): بێنمە جەماتت. (غ، ج): بێنە جەمالت. (کم): بێنە حیمایەت. نەمەك و (ج): نەمەك.

(٦) خاتەم: ئەنگوستیلە.

واتە: ئەم زامە کە نینۆکی خەفەت ئەمشەو لە شەوق و ئارەزووی دیدار و بینینی تۆدا لە ڕووی سینەم هەڵی کەندەوە، وەك ئەنگوستیلەی تۆ نەخشە و ناکوژێتەوە.

لە جێی ناخونی حەسرەت (ج): بە ناخونی حەسوودان. زەخمە (عا، ج، کم، گم): نەقشە.

(٧) واتە: ئەمشەو بە نیشانەی ئەم فرمێسکە کە سوێرە و دەڵێی زەمزەمە، دەزانرێ گریانم بە هۆی ئارەزووی چاوپێکەوتنی کەعبەی ڕوخسارتەوەیە.

مەعلوومە (ج): مەعلووم.

(٨) ئەم بەیتە لە (مان، حا)دا نییە.

غەمزەدە: ئەوی خەم لێی دابێ، خەمبار. دەرهەم: تێکەڵ و ئاڵۆز.

واتە: ئەی دڵبەرەکەم! ئەمشەو دارایی و سامانی دڵەی خەمبارم وەك زنجیرەی زوڵفی خەم و ئاڵۆزت تێکەڵ و بەیەکداچوو و پەرێشانە.

سیلسیلەیی (عا): عوقدەیی. دیارە لەنگ دەبێ.

**"سالم!" له هەوای مەجلیسی ئەو جێگەیە، قەددم**
**وەك بەربوط و نەی تا بە سەحەر ناڵەمە ئەمشەو (٩)**

(٩) واتە: سالم! بە ئارەزوو و پەرۆشیی مەجلیسی یارەوە، قەد و باڵام بووەتە بەربوت و نەی، تا بەرەبەیان ناڵەم لێ دێ.

مەجلیسی ئەو جێگەیە، قەددم (حا): مەجلیسی ئەو، چەنگییە قەددت. (عا، غ، ج): بەزمی ڕەفیق چەنگییە (چنکیە) قەددم. واتە: قەدم چەماوەیە، کە بەپێی نیوەی دووەمی بەیتەکە بۆ ئێرە دەست دەدا. (کم): مەجلیسی ئەو جێگەیە، قەددت.

هەموو (ئەمشەو)ێکی ئەم پارچەشیعرە لە (کم، گم)دا (ئیمشەو)ە.

(*) -٣٧-

**هیلاکیی جانی بیمارانە ئەمشەو**

**سیەھ، وەك طورڕەیی یارانە ئەمشەو (١)**

**لە چاو ئەشك و لە دڵ ئاهم بیرون دێ**

**دەڵێی طۆفانی با و بارانە ئەمشەو! (٢)**

**لە نوسخەی مووتە، یا تەئثیری بەختم**

**جیهان یەکسەر وەکوو قەطرانە ئەمشەو! (٣)**

**لە گوێما دەنگی «دقّ الباب»ی دڵ دێ**

**خەیاڵی دڵبەرم میهمانە ئەمشەو! (٤)**

**بینات نا عەهدەکەی ضەححاکی تازی**

**لە طورڕەت موو بە موو مارانە ئەمشەو (٥)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، ف، ج، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەحزووف.

(١) واتە: ئەم شەوە هۆی نەخۆشی و دەردەداریی دڵی دەردەدارانە، وەك زوڵفی یاران ڕەشە و چاو چاو نابینێ و سەر و دڵیان گیراوە.

(٢) واتە: بە خوڕ فرمێسك لە چاوم دەڕژێ و ئاهی گەرمی خەفەت لە ناخی دڵەوە سەردەکەوێ، دەڵێی ئەمشەو بە جارێك زریانی با و بارانە.

طۆفانی (ن): طۆفانە. (گم): تۆفانی. با و بارانە (ن): باد بارانە.

(٣) واتە: لەبەرچی ئەمشەو دنیا سەرانسەر وەك قەترانی ڕەشە؟ نوسخەی مووی ڕەشی تۆیە، یا کاری بەختی ڕەشی من؟!

تەئثیری (حا، عا): تەئسیری. (ف): تەسخیری. یەکسەر (ق): هەر سوو. وەکوو (عا، ف، ج، ق، ڕ): دەڵێی. قەطرانە (گم): قەترانە.

(٤) «دق الباب»: لەدەرگادان.

واتە: گوێم لێیە، لە دەرگای دڵ دەدرێ، وا بزانم خەیاڵی دڵبەرە لە دەرگای دڵ دەدا و ئەمشەو میوانە لام.

گوێما (عا): گلوێما. هەڵەی نووسینە. دڵ (ج): عیشق. لەنگە. دڵبەرم (حا، عا، ف، ڕ): یارەکەم.

(٥) واتە: چەرخ و سەردەمی زوحاکت تازە کردەوە. کە زوڵفت موو بە موو وەك مارە ئەمشەو،

**لە مەیلی سەرد و قەهری وەك سەموومت**
**لە باغی دڵ گەڵاڕێزانە ئەمشەو (٦)**
**لە گەرمیی دڵ، گوڵی شادی وەریوە**
**شکۆفەی غەم لە نەو خەندانە ئەمشەو (٧)**
**شەبەیخوونی نیگەهـ قەلعەی دڵی گرت**
**بە جوز غەم، هەرچی بێ، تالانە ئەمشەو (٨)**
**بە ئوممێدی بەهاری وەصڵەکەی تۆ**
**لە هەوری دیدە هەر بارانە ئەمشەو (٩)**

بە تایبەتی کە بەسەر شانتدا داوە. دیارە مارەکانی زوحاك مێشکی گەنجانیان دەویست، بەڵام مارەکانی یار مێشکی ماندووی دڵدار.

نا (کم، گم): کرد.

(٦) واتە: باخی دڵ بە دوو هۆ گەڵاڕێزانیەتی؛ یەکەم مەیل و خۆشەویستیی وشك و ساردت کە لە وشکەسەرمای پایز دەکا، دووەم گەرمایی ڕق و قینت کە وەك گڕەی هاوین گەڵا هەڵدەپرووزێنێ.

سەرد و (گم): صەبر و! گەڵاڕێزانە (ج): گەڵاوریزانە. هەڵەیە.

(٧) شکۆفە: گوڵی هێندێ درەخت کە تازە پشکووتبێ. لە نەو: سەرلەنوێ. خەندان: پێکەنیو.

واتە: ئەمشەو دڵ بە هۆی گەرمییەوە گوڵی شادیی وەریوە و هەڵپرووزاوە، گوڵی خەم سەرلەنوێ دەمی بە پێکەنینە.

لە نەو (ف): لەنێو. (ق): لە نوێ.

(٨) شەبەیخوون: هێرشی لەپڕ کە دوژمن بە خۆی نەزانێ. نیگەهـ: نیگا و تێڕوانین. بەجوز: جگە لە.

واتە: هێرشی لەپڕی نیگات، قەڵای دڵمی گرت. ئەمشەو هەرچیم هەبوو و نەبوو، جگە لە خەم و پەژارە، هەمووی بەتاڵان چوو، بەڵام کەس خەمی ناوێ!

(٩) ئەم بەیتە لە (ف)دا نییە.

واتە: ئەمشەو لە هەوری دیدەوە سەروەمڕ باران دەبارێ، بە هیوای ئەوەی وەرزی بەهاری گەیشتن بە تۆ بێتە ڕووی کار.

**له ڕووی عەکسی خەیاڵی لەعلی لێوت**
**دوڕی ئەشکم وەکوو مەرجانە ئەمشەو (١٠)**
**لە لای "سالم"، ئەگەر ئەکلە و ئەگەر شورب**
**بەبێ تۆ، دوور لە تۆ، سندانە ئەمشەو (١١)**

(١٠) واتە: ئەگەرچی مرواریی فرمێسك سپییە، بەڵام ئەمشەو فرمێسکی من خەیاڵی وێنەی لەعلی ئاڵی لێوی تۆی تێدایە، بۆیە وەك مەرجان سوورە.

عەکسی خەیاڵی (حا): تۆ عەکسی خاڵی.

(١١) دوور لە تۆ: ڕستەی نزایە، وەك بڵێی (دوور بێ لە ڕووت). ئەکل: خواردن. شورب: خواردنەوە.

واتە: ئەمشەو لای سالم بێ باڵای تۆ، دوور بێ لە ڕووت، هەرچی خواردن و خواردنەوەیە سندان و ژەهری مارە.

ئەگەر شورب (ف): گەر شورب. لەنگە. سندانە (کم): سنگانە.

هەموو (ئەمشەو)ەکانی ئەم پارچەشیعرە لە (کم، گم)دا (ئیمشەو)ە.

(*) -٣٨-

ڕەفیق بێن و تەماشا کەن، دەمی بووکبردنە ئەمشەو
هەوای بووکێ بە دان و مەیلی زاوا کردنە ئەمشەو (١)
موهەییای کرد فەلەك طەوقی بلووری بۆ ملی داماد
چەلیپا، هەردو پێی بووکی دوشاخەی گەردنە ئەمشەو!! (٢)
لەگەڵ کارواندا ئاوازی پۆێلە وەك جەرەس هەستا
لە دەست زاوا، لە دەست بووکا، خڕنگەی بازنە ئەمشەو (٣)
دەڵێن: بەربووکی باوان دەستەخوشکی مادەری بووکە
لە زاوا خۆی دەپرسم: بیکرە بووکێ، یا ژنە؟ ئەمشەو (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (عا، غ)دا هەیە و یەکێکە لە شیعرە داشۆرینبابەتەکان و ناسناوی "سالم"یش دیار نییە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) دان: ئامادەگیی ئافرەت بۆ کاری جینسی. کردن: ئامادەگیی پیاو بۆ کاری جینسی.

واتە: هاوڕێیان وەرن بڕوانن، ئەمشەو کاتی بووکگواستنەوەیە. بووکێ ئارەزوویەتی بدا! زاوایش حەزی لێیە بکا!

بە دان (عا): بران. هەڵەیە.

(٢) موهەییای کرد: ئامادەی کرد. طەوقی بلووری: مەبەستی پـووزی سـپیی بووکـە. دامـاد: زاوا. چەلیپا: دوو داری ڕاست و چەپی نیشانەی بەرداکردنی مەسیح لای گاوران.

واتە: ئەمشەو چەرخی ڕۆژگار تەوقی بلوورینی بۆ ملی زاوا ئامادە کـرد، هـەر دوو پێـی بـووك خاچن و بوونەتە دوو لق لەسەر گەردنی زاوا.

(٣) واتە: ئەمشەو، لەگەڵ کاروانی بووکبەران، ئاوازی پۆیلەی بـووك و بـەربووك وەك زەنـگ هەستا و دنیای پڕکرد. خزنگەی بازنیش لە دەستی بووك و زاوادا دێ.

شایانی باسە، خزنگەی بازن لە دەستی بووکدا بەجێیە، بەڵام لـە دەسـتی زاوادا چـۆن؟ ئەڵبـەت مەبەستی ئەوەیە: چونکە زاوا یاری لەگەڵ بووك دەکا و دەنگی بـازنی دەسـتی بـووك دێ، وەك لـە دەستی زاوایشدا بێ وەهایە.

(٤) واتە: بە قسـە دەڵێن بەربووکی باوانی بووکێ دەستەخوشکی دایکی بووکێیە. من ئەمشەو لە

**خەزوورەی بووك لە ڕەقصایە وەكوو ئوشتر لە ڕووی بەچچەی**
**خەسووی زاوا لەبەر دوختەر لە حالی مردنە ئەمشەو (٥)**
**هەتیو و پیرەژن فیتنەن، بلێ: سا قاو دە، با دەرچن**
**لە دەوری پەردە، جوز مەحرەم، دەمی دەركردنە ئەمشەو! (٦)**
**نەفیری شادییانەی مادەری زاوا بوڵەند نابێ!**
**چ بوو عیننینە زاوا، یا مەگەر بووك بێبنە ئەمشەو؟! (٧)**

زاوا خۆی دەپرسم: بووكێ كچە، یا ژنە؟

(٥) واتە: ئەمشەو خەزووری بووك، باوكی زاوا، لە خۆشیی ئەوەی كە كوڕی بووەتە پیاو و ژن دەهێنێ، هاتووە وەك وشتر كە بە دەوری بەچكەی تازەبوویدا دەسووڕێتەوە، سەما دەكا. كەچی خەسووی زاوا، دایكی بووكێ، لەبەر بەدحاڵیی كچەكەی لە حاڵی مردندایە!

(خەزوورەی) بە شێوەی (خەذوورەی) نووسراوە.

(٦) قاو: دەركردن، لە هەندێ ناوچەی كوردستان دەوترێ: فلان كەسیان قاو دا، یانێ دەریان كرد.

واتە: بوونی هەتیو و پیرەژن لەم ناوەدا مایەی ئاژاوەیە. بلێ سا كاتی دەركردنە، با بچنە دەرێ. ئەمشەو دەبێ كەسانیتر، جگە لە مەحرەم، لە دەوروبەری پەردەی بووك دەربكرێن.

(٧) نەفیر: بانگەواز، هاوار. شادییانە: زەماوەند، داوەت. عینین: شلەپەتكە، ئەوی هەرگیز دەعباكەی هەڵناسێ!

واتە: مەسەلە چییە؟ ئەمشەو دەنگی شادی و بانگی داوەتی دایكی زاوا بەرز نابێتەوە. دەبێ چی بووبێ، داخۆ دەعبای زاوا بێكەڵكە، یا بووكێ خۆی كچ نەبووە و پێشتر بێبن كراوە؟

(مادەری) لە (غ)دا كەوتووە.

## -٣٩- (*)

**ئەژدەها یەك شەو ببینێ ماری زوڵفت، گەر بە خەو**
**ئەم دەسێنێ ئینتیقامی هەرچی ئەزیەت بێ لە ئەو (١)**
**قەد نەبوو نەشئونوما کا مەزرەعەی عومرم، بەهار**
**لێی نەدا بای خوڕڕەمی، تا کەوتە حاڵاتی درەو (٢)**
**طوڕڕەیی هێنا بە ڕوودا، ڕووبەڕووی من خۆی نوواند**
**لێی موشەخخەص بوو کە نەهیە دیدەنی ئایینە شەو (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، ف، غ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) واتە: ئەگەر ئەژدەها شەوێك زوڵفی وەك مارت بە خەو ببینێ، زوڵفەکەی تۆ تۆڵەی هەرچی ئازارە لە ئەژدەهای دەستێنێ. مەبەستی ئەوەیە: زوڵفی یار بە جوانی و بە ڕەشی لە ئەژدەها کوشندەترە، یا مەبەستی ئەوەیە ئەژدەها عاشقی زوڵفت دەبێ و زوڵفت تۆڵەی بەرودوای لێ دەکاتەوە.

بە خەو (عا، غ، کم، گم): لە خەو. دیارە «بە خەو» بەهێزتر و کوردیترە. جگە لەوە، ئەگەر «لە خەو» بێ، دەبێ «لە خەودا» بوترێ. (بێ) لە (غ)دا کەوتووە. ئینتیقامی (کم، گم): ئینتیقام.

(٢) واتە: کشتوکاڵی عومرم لە بەهاردا نەشونومای نەکرد و بای خۆشی لێی نەدا، ئاخری زەرد بوو و گەیشتە حاڵەتی درونە. یاخۆ مەبەستی ئەوەیە، بای بەهاری شادی و خۆشی لە کاتی لاویدا هەرگیز لێی نەدام، بەڵام لە کاتی پیری و لێکەوتوویدا کە هیچ سوودێکی نییە، لێم دەدا.

قەد (حا، کم، گم): قەت. نەشئو (گم): نەشەو. مەزرەعەی (حا، عا): مەذرەعەی. هەڵەیە. حاڵاتی (غ، ق، کم، گم): هەنگامی. (تا) لە (عا)دا کەوتووە.

(٣) موشەخخەص: مەبەستی زانراوە.

واتە: یار، زوڵفی بەڕوودا هێنا و دایپۆشی و ڕووبەڕووی من خۆی نوواند، چونکە دەیزانی و دڵنیا بوو بە شەو سەیرکردنی ئاوێنە باش نییە و نەهیی لێ کراوە؛ گوایە ئەگەر بنیادەم شەو لە ئاوێنەدا سەیری خۆی بکا، دەچێتە غەریبی! دیارە ئاوێنەکە لێرەدا ڕووی یارە و شەوەکەیش زوڵفیەتی. یار چاکەی لەگەڵ سالمی بێچارە کردووە کە نەیهێشتووە سەیری ئاوێنە بکا، نەبادا بکەوێتە غەریبی، کەچی سالم عومرێکی درێژی بە نامۆیی بردووەتە سەر!

لێی (گم): وا.

**خەط بدا وەختێ لە صەحرای سینەما، ئاهووی خەیاڵ**
**دەردەکا ئەسپی هەوەس هەر جا لەدەست عەقڵم، جڵەو! (٤)**
**سامیعە و نوطقم لە تەکلیفاتی دونیا فاریغن**
**نیمە بێ تۆ، قەد لەگەڵ کەس، طاقەتی گوفت و شنەو (٥)**
**کەی بە سالم دەردەچێ "سالم" لەبەر تیری نیگاه**
**دیدەیی ئاهوو دەپێکێ، تورکی دیدەت گاهی دەو! (٦)**

(٤) خەط بدا: دەربکەوێ.

واتە: کە خەیاڵ لە دەشتی سینەمدا دەربکەوێ و سەر هەڵبدا، ئیتر عەقڵ نامێنێ و ئەسپی ئارەزوو جڵەو لە دەستی عەقڵ دەستێنێ. ئەڵبەت مەبەستی ئەوەیە؛ کاتێ خەیاڵ نەبێ، جڵەوی ئەسپی ئارەزوو بەدەست عەقڵەوە دەبێ و بە فەرمانی ئەو دەجووڵێتەوە. بەڵام کە ئاسکی خەیاڵ دەرکەوت و کەوتە بزووتنەوە، ئیتر هۆش دەوری نامێنێ و ئارەزوو جڵەوی لە دەست دەردەکا. یا مەبەستی لە ئاهوو یارە، یانێ کە یاری وەك ئاسك بە خەیاڵ لە دەشتی سینەمدا دەرکەوت، ئەسپی ئارەزوو جڵەو لە دەست عەقڵم دەردەکا و هۆش و عەقڵ دەوری نامێنێ.

خەط بدا (گم): خەطیدا. صەحرای (حا): سەحرای. (عا، ف، غ، کم، گم): وادی. بەڵام وابزانین هەڵەیە، چونکە (خیرەد)یش واتە عەقڵ، ئیتر چۆن ئەسپی عەقڵ جڵەو لە دەست عەقڵ دەردەکا. لە کاتێکدا –بەپێی نوسخەکانی ئەوان– عەقڵ سواری ئەسپی ئارەزوو دەبێ و بە کەیفی خۆی دەیئاژوێ، تا ئاسکی خەیاڵ، یا یاری وەك ئاسك، لە دەشتی سینەی "سالم"دا دەردەکەوێ، ئەوکاتە عەقڵ هیچی بەدەستەوە نامێنێ.

دەردەکا (غ): دەردا. (ق): دەردەدا. هەڵەن. (کم): دەردەچێ.

(٥) سامیعە: گوێ. نوطق: مەبەستی زمانە. قەد: هەرگیز.

واتە: گوێ و زمانم لە کاروبار و لێپرسینەوەی خەڵك خاڵییە و هەقم بەسەر کەسەوە نییە، نە لەگەڵ کەس دەدوێم و نە گوێیش لە کەس دەگرم، چونکە بەبێ تۆ هەرگیز یارای قسەکردن و قسەبیستنم نییە.

قەد (حا): قەت. (عا، ف، غ، کم، گم): تا.

(٦) "سالم"ی یەکەم: سەلامەت و بێدەرد. نیگاه: تەماشا. تورك: مەبەستی ستەمکارە. دەو: ڕاکردن.

واتە: سالم، کەی بە سەلامەتی لە دەست تیری نیگات ڕزگار دەبێ؟ چاوی ستەمکاری تۆ ئەوەندە نیشانشکێن و دەستی ڕاستە، چاوی ئاسك لە کاتی ڕاکردندا دەپێکێ.

نیگاه (عا، غا، کم، ف، گم): نەظەر. دیدەت (عا، کم، ف، گم): چاوت.

## -٤٠- (*)

ئاسْمان دیهقان و عومرم کشت و داسی ماهی نەو
سەرفگەندە و ئیسْتادەم خۆشەئاسا بۆ درەو (١)
تا بە ڕەنجی عیشقی یاری گەندومینڕووم جووتە غەم
نائُوێنێ خەرمەنی دونیا لە لام یەك دانە جەو (٢)
سازشی چوار جینس لە چوار نەوع، چوارْ یار نادەن بەهەم:
ئاب و ئاتەش، گورگ و گەللە، عەقڵ و مەستی، عیشق و خەو (٣)
یاری صاحیبمروەتم ئوفتادەگانی دا صەدا
سەگ بە گورگەلۆقە هات و "سالم"ی مسکین بە دەو! (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (عا)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) دیهقان: جووتیار. کشت: کشتوکاڵ. ماهی نەو: مانگی تازە. سەرەفگەندە: سەرشۆڕ. ئیستادە: بەپێوە ڕاوەستاو. خۆشەئاسا: وەك گوڵەگەنم یا گوڵەجۆ.

واتە: ئاسمان وەك جووتیار و تەمەنم کشتوکاڵ و مانگی تازەیش داسە. خۆیشم وەك گوڵەگەنم سەرنەوی و لارەمل ڕاوەستاوم، درەو بکرێم.

(ئیستادەم)، بە هەڵە بە (ئیستادیم) نووسراوە.

(٢) گەندومینڕوو: ڕوخسار گەنمڕەنگ. خەرمەن: خەرمان. جەو: جۆ.

واتە: تا خەم لەگەڵ مەینەت و ئازاری عیشقی یاری گەنمڕەنگ جووت بێ، یا تا خەم لەو ڕەنجەی عیشقی یاری گەنمڕەنگمدا جووت بکا، خەرمانی دنیا لای من ئەوەندەی دەنکەجۆیەك نانوێنێ.

(٣) سازش: سازان. جینس: ڕەگەز. نەوع: جۆر. بەهەم: پێکەوە. ئاب: ئاو. ئاتەش: ئاگر. گەللە: ڕان. مەستی: سەرخۆشی.

واتە: سازانی چوار ڕەگەزی هەمەجۆر، هەر چواریان پێکەوە یەکناخا: ئاو و ئاگر، گورگ و ڕانەمەڕ، عەقڵ و سەرخۆشی، عیشق و خەو.

(٤) مروەت: پیاوەتی، مەردایەتی. ئوفتادەگان: کۆی ئوفتادە، کەوتووان. دا صەدا: دەنگی دا، بانگی کرد. گورگەلۆقە: قەڵەمباز، خێرا ڕۆیشتن. میسکین: داماو. دەو: غار.

واتە: یاری خاوەنمەردایەتیم لەجێکەوتووانی دەنگ دا و بانگی کردن: سەگ بە گورگەلۆقە و "سالم"ی داماویش بە غار هات.

-٤١- (*)

**گەر مویەسسەر بێ لە هیجرا، خۆشە خەو**

**مەحضی چاولێکنان دەبینم، خۆم و ئەو! (١)**

**بێتە خەو هەر شەو حەبیبم، یا ئیلاھ!**

**بێ بەقەد ڕۆژی قیامەت طوولی شەو (٢)**

(*) ئەم چوارینە هەر لە (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشی مەحزووف.

(١) مویەسسەر بێ: بلوێ، بڕەخسێ. هیجر: دووری. مەحضی: تەنها بە.

واتە: ئەگەر لە ڕۆژانی دوورکەوتنەوەدا بۆم بلوێ بخەوم، خەو شتێکی خۆشە، چونکە هەر بە چاولێکنان، خۆم و یار دەبینم.

(٢) حەبیب: خۆشەویست. یا ئیلاھ: خودایە. قیامەت: ڕۆژی زیندووبوونەوە و حەشر. طوول: درێژی.

واتە: خودایە هەر شەوێك خۆشەویستەکەم بێتە خەوم، ئەو شەوە ئەوەندەی ڕۆژی قیامەت درێژ بێ، هەر شەو بێ و خەبەرم نەبێتەوە.

# پێڕست

پیتی (ب)

پیتی (ن)

پیتی (و)

